# بیرەوەریەکانم

لەساڵانی ١٩٤٣-١٩٧٧ دا

زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی





ناوی کتێب: **بیرەوەریەکانم**
نوسەر: **زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی**
دیزاینی بەرگو ناوەوە: **ئارام لوقمان**
چاپخانە: **چاپخانەی رەهەند-سلێمانی (٠٧٧٠١٥٠٨٢٥٣)**
تیراژ: **(٢٠٠٠)دانە**
**ژمارەی سپاردنی ( ٩٨٥) لەوەزارەتی رۆشنبیری-هەولێر پێدراوە.**

# پێشکەشە بە :

* هەموو ئەوانەی لە پێناوی خاکی نیشتمان و بیروباوەڕیاندا گیانی خۆیان بەخت کرد.

* بەوانەی لەنوسینەوەی مێژووودا راستگۆن.

# پێشەکی:

ئەوەی دەمەوێ دیاری بکەمو بەخوێنەرە بەڕێزەکانی ڕابگەیەنم ئەوەیە ئەو نوسینە تەنیا بیرەوەری نین، بەڵکو مەبەستی ئەو نوسینەم زیاتر بۆ ڕوون کردنەوەی ڕوداوو بەسەرهاتە مێژووییەکانە لە ماوەی خەباتو تێکۆشانی بەردەوامم، بۆ ئەوەی ڕاستیەکان بخرێنە بەرچاوی کۆمەڵو خوێنەرانی هەست بەرزو نیشتمان پەروەر، بێگومان ئەو بەسەرهاتو ڕووداوانەی بەدرێژای زیاتر لە ٥٠ ساڵ لە ژیانی تێکۆشانمدا بەشێك بووە لە مێژووی بەشداریم لە شۆڕشو ڕاپەرینەکانی نەتەوە ستەمدیدەکەمدا.

هەموو دیاردەکان بەدیاریان خست ڕوداوو بەسەرهاتەکانی ڕابردوو وەك پێویست نەخراوەنەتە بەرچاوی خەڵك، بەڵکو بەشێوەیەکی پڕ لە کەمو کوڕی خراوەنەتە سەر لاپەرەی نامیلکەو گۆڤارو ڕۆژنامەکان، ئەمەش وای لە بەشێکی زۆری خەڵكو تەنانەت خوێنەرانیش کردوە کەوا بزانن ئەوەی نوسراوەو دەنوسرێتو دەخرێتە سەر لاپەڕەی نامیلکەو گۆڤارو ڕۆژنامەکان هەموویان ڕاستن!! بەدڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم ئەو نوسینانەی دەربارەی دەستو بردو جوڵانەوەکانی (١٩٤٣-١٩٥٩) نوسراون کە بەشی زۆریانم خوێندونەتەوە بەداخەوە لەڕاستی دوورن، وا هەست دەکرێت بەبێ سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو نوسینەکان نوسرابن، ئەوەی دیارە هەندێکیان لایەنگیری پێوە دیاربووەو تەنانەت ئارەزومەندی نوسەریشی گرتۆتەخۆ، وە هەندێکیشیان تەنها خۆپیشاندانو خۆبەدەرخستن مەرامیان بووە بۆ بەرژەوەندی تەسکیان دوور کەوتونەتەوەو لایانداوە، ئەمەش بەدکاریە دەرهەق بەڕووداوە مێژوویەکان دەکرێت. ئەو نوسینانەی نوسراون پێیانەوە دیار نیە هەموو شتێکیان لە ڕووداوەکان بەڕاستی نوسیبێتو هیچیان لێ زانیبێت، بێگومان ئەمەش کردەوەیەکی دەستپاکی نییە بەرامبەر بەمێژوو، چونکە دەبێتە هۆی شاردنەوەی ڕاستیەکان لە نەتەوە بریندارو ستەمدیدەکەمان، هەر ئەو ناپاکییەش ئێمەی توشی گێژاوی سەر لێ شێوانو ماڵ وێرانیو دواکەوتن کردووە.

لێرەدا بەسەربەرزیەوە دەڵێم بیرەوەریەکانم بەگشتی بەشێکی زیندون لە ڕاستیو بەسەرهاتەکانی سەردەمی ڕابردوو هەر لە ساڵی (١٩٤٣) وە تاوەکو نزیکەی ساڵی

(١٩٧٧)، لە وێشەوە تا دەگاتە ساڵی(٢٠٠٠)، ڕووداوەکان چۆن ڕوویانداوە وەکو خۆیان باس کراون‌و زیادیان نەخراوەتە سەر ئەگەر کەمیان تێدا نەبێت.

ئەوەی ئێستا لەبەر دەستتان دایە لە ساڵی (١٩٤٣) وە تاوەکو نزیکەی ساڵی (١٩٧٧)ە، دەمەوێت تەواوی خەڵکی کوردستان بەگشتی‌و خوێنەرە بەڕێزەکان بەتایبەتی لەو ڕاستیە بگەن کەسەرچاوەی ئەو نوسین‌و بەسەرهات‌و ڕووداوە مێژووییانەی نوسراون‌و دیارکراون تەنها خۆمم، ئەوەی من لەگەڵی نەبووبم شتێکم لەملاو ئەملا نەهێناوە بینوسم، چونکە ئەگەر بەتەواوی بۆم ڕوون نەبوبێت‌و نەمزانیبێت کە ڕووداوەکە یان بەسەر هاتەکە ڕاستە نەم خستۆتە سەر لاپەڕەی بیرەوریەکانم، بەلاّم لەڕاستیدا خەبات‌و تێکۆشان‌و ڕاپەڕینی خەڵك‌و جەنگاوەرە خۆبەخت کەرەکانی کوردو خەباتە نەپچڕاوەکەی دەخاتە بەرچاو، بۆ ئەوەی لەڕاستی ڕووداوەکان ئاگاداربن‌و بزانن ئەو نوسینەی من دوورە لە پڕوپاگەندەو خۆ بەدەرخستن، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە هەندێ شت هەبوبێت نەنوسرابێت ئەمەش مافی نوسەرە یان لەوانەیە نەتواندرابێت بنوسرێت!!.

ئەوەی من بۆی پەرۆشم تەنها ئەوەیە کە ئەم نوسینە زۆر دواکەوت، دەبوایە زۆر زووتر بلاّو بکرێتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ پێش ڕاپەڕین حوکمڕانەکان ڕێگایان نەدەدا ئەوەی بۆنی چالاکی کوردانەی لێ بێت بلاّوبکرێتەوە، بێگومان ئەگەر ڕژێم ئەو نوسینەی منی دەست کەوتبایە تەنها نوسینەکە نەدەفەوتا، بەڵکو خۆشم بێ سەرو شوێن دەکرام، ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر دەبێ ئەوەش بڵێم هۆیەکی تری دواکەوتنی بلاّوبونەوەی بیرەوەریەکانم بەشێکیشی پەیوەندی بەباری دارابیمەوە هەبووە، چونکە ئەو توانایەم نەبووە بتوانم بیرەوەریەکانم لەکاتی پێویست بگەیەنمە بەردەستی خەڵکی کوردستان بۆ ئەوەی لەڕاستی بەسەر هاتەکان‌و چالاکی ڕۆڵەکانیان لەخەبات‌و تێکۆشانی چەندین ساڵەیان لە پێناو کوردایەتیەکی ڕاستەقینەو کوردستانێکی سەربەخۆ بگەن‌و چیتر چاوبەست نەکرێن بەشاردنەوی ڕاستیەکان.

زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی

٢٠٠٢/١٠/١٠

بەشی یەکەم

# سەرەتای ژیانم لەگوندی ماویلیان دەست پێ دەکات

## هەڵکەوتنی گوندی ماویلیان:

گوندی ناوبراو دەکەوێتە رۆژئاوای گوندی دەرگەڵە لەدیوی (دۆڵەمەنجەڵ)و دەکەوێتە بناری (زێی تەلانی) ڕوو لەکێوی هەندرێن، لەرۆژهەلاتی کێوی (ڕووەڵە)یە لەرۆژئاوای گوندەکانی (میراجیانو جنێراوەو خەڵکانو دەشتی ڕواندز)ە ئەو شوێنەی شارۆچکەی سۆرانی لە سەر دروست کراوە.

دۆڵە منجەڵ چەند گوندی بەخۆیەوە گرتووە(ماویلیان- بەرسرین- پیروسوان- زێوە- میراجیان- جنێراوە- خەلکان- وارەکۆن- کەورین - گوان).

گوندی ماویلیان خاوەن مێژووە مرۆڤی بەدەستو بردو ئازای تێدا هەڵکەوتوە، گوندی وەستا (برایم)ە ئەو وەستایەی بنیات نەری قەلاو پردەکانی سەردەمی پادشای گەورەی ڕواندزە.

بەزار گۆتەی بەسالا چووەکان وا دیارە لە پێش ساڵەکانی (١٩٢٠) ناکۆکی تووندو نارێك هەبووە لەناو خەڵکی گوندی ماویلیان، ئەو ناکۆکیە ناچاری کردوون کۆمەڵێك لە پیاوە ڕیش سپیەکان برۆنە دەرگەڵە داوایان لە(میرحمدامین) کردوە بەڵکو یارمەتیان بدات بۆ چارەسەری ئەوناکۆکیانەی هەبوونە دیارە میر ئامۆزایەکی خۆی دیاریکردوە بڕوات سەرپەرشتی گوندەکە بکات بۆ چارەسەری ئەوناکۆکیانەی لەنێوانیاندا هەبووە، وەك زاندراوە (میر حمدامین بەگ) لەسەر داوای ڕیش سپیەکانی ماویلی (سلێمان بەگ)ی ئامۆزای خۆی دەست نیشان کردوە بڕوات سەرپەرشتی گوندەکە بکات. دەڵێن سلێمان بەگ لاوێکی بەراپەڕو لێ هاتوو بوە بەرێ کراوەتە ماویلیان، ناوبراو چالاکانە بۆ کارەکانی رۆیشتوە هەر زوو لەداوێنی گوند کۆشکێکی دروست کردوە بۆ نیشتەجێبوونی لەوێ، ئەوەی دیارە بەماوەیەکی کورت توانیوەیەتی دەست بەسەر کەم وکوریەکان دابگرێت، ناکۆکیو ناتەباییەکان نەهێڵێت، لە دوای ئارام گرتنو چەسپاندنی دەسەلات دیارە (سلێمان بەگ)یش وەك

پیشەی ئاغایەکان چەند ژنێکی هێناوە، پێش دایکم ژنێکی تری هێناوە، بەڵام زۆر لای نەبوە بەری داوە دووەمیان دایکم بووە بەزارگۆتەی دایکم چەند ساڵ منداڵی نەبووە نۆبەرەی منداڵی من بویمە، بەڵام وەك دیارە هەر لەسەرەتای ژیانم بەشم بێ بەشی بووە، لەگەڵ پەیدابوونم دایکم بەنەخۆشی گرانەتا کەوتوە لە شیری مەمکی دایك بێ بەش بوویمە، بەڵام ئەو زانیاریانەی دەستم کەوتوون، دیارە باوکم پێش پەیدابونی من ژنێکی بەتەمەنی لەخۆی گەورەتری هێناوە بەناوی (هەمین)، بێ گومان دایکم سێ مانگ بەو نەخۆشیە کەوتوە ئاگای لە من نەمابووە، دیارە (هەمین)ی زڕ دایك منی گرتۆتە باوەشی، بەشیری ئاژەڵ بەخێوی کردوم، هەتا ئەو کاتەی دایکم هەستاوەتەوە، دەڵێن باوکت لە سەرەتای پەیدابوونم منی خۆش ویستوە، من ئەو خۆشەویستیەم نەبینی بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامانەی نیشاندەدەن وا بەدیارە کەوتوە لە ساڵی(١٩٢٧) لە گوندی ماویلیان لە دایك بووم لەکاتی نەخۆشی دایکم، دیارە شیری مەمکی کۆمەڵێك ئافرەتی ئەو گوندەم خواردوە لەوانە(ئاجەر) ژنی (حەسەنی عەباسی)، (رابیەسۆر ژنی صالحی محمدامین)و چەندی تریش، بێگومان من بەشیری مەمکی دایکی منداڵانی ماویلی گەورە بوویمەو لە مردن رزگارم بووە تا تەمەنم بۆتە دوازدە ساڵ لەو گوندە ژیاوم.

دێتەوە یادم سەردەمی منداڵیم لە گوندی ماویلیان بەزۆری لەگەڵ منداڵەکانی (قادرئاغا، خدرو ڕەشید) بەسەر دەبردو بەدرێژایی ڕۆژ بەیەکەوە دەگەڕاین، تاوێك لێیان دوور نەدەکەوتمەوە، ئەگەر چی زوو زوویش بەگژ یەکدا دەچوین، بەڵام هەر ئەو دەمەش پێك دەهاتینەوە، جیا لەوان ئەوەی زۆر لێم نزیك بوو(ئیسماعیل مامە شێخی حاجی)بوو، ناوبراو دراوسێمان بوو دەرگایماڵیان ڕووبەڕووی دەرگای دیواخانەمان بوو بەدائیمی لە ماڵی ئەوان دەبووم دایکی(ئیسماعیل) پورە(حەلیم) وەك کوڕی خۆی سەیری منیشی دەکرد زۆر شەوان لە ماڵیان دەمامەوە، دەیان زانی لەوێم.

دێتەوە یادم ناوە ناوە دەیان بردمە لای (سلێمان ئاغا)، ناوبراو بە(گویزان) سەری دەتراشیم، بەڵام چی هەتا سەری دەتراشیم ئەوەندەم ئەزیەت دەدیت باسی ناکرێت، کاتێك دایان نامە بەر خوێندن لای فەقێیەکان ئەو کاتەش خاڵم (مەلا خدر) لە ماویلیان دەیخوێند زۆری نەمابوو خوێندن تەواو بکات، هەر ئەویش دەست نووسێکی

بۆ نووسیبوومەوە، هەموو بەیانیان دەڕۆیشتمە مزگەوت لای فەقێیەکان، ئەوەی زۆر گران بوو لە پێش هاتوو چۆم ئەوە بوو زۆر لە سەرتراشین دەترسام وەك لە سەرەوە نوسراوە هەر جارەی سەری دەتراشیم ئەوەندەی ئەزیەت دەدام هەتا لەبەر دەستی نەجاتم دەبوو هەر ئەوەندە بوو گیانم دەر نەدەچوو، دەبوایە بەیانی کە دەچووم بۆ مزگەوت بەبەر دەرگای ماڵی (سلێمان ئاغا)دا بڕۆم هەر کاتێ دەگەیشتمە ڕاستی ماڵیان سەرم هەڵنەدەبڕی وامدەزانی ئەگەر(سلێمان ئاغا) بمبینێ بانگم دەکاتو دەڵێ وەرە باسەرت بتراشم!.

دایکم گوتی: (تۆ تەمەنت دوو ساڵ بوو باوکت ژنێکی تری هێنا منداڵ بوو لە دوای ساڵێك ژنە تازەکەی منداڵی بوو کوڕی ئەو ژنە بووە تاجی سەری باوکت هەر لەوکاتەوە ڕووی بەزەیی نەماو بەچاوی ڕوحم سەیری ئێمەی نەکردوە).

لە دوای دوو ساڵ خوێندن لە خوێندن بێ بەش کرام لەگەڵ کوڕی شوان بەڕێ کرام کارو بەرخو پەلەورم دەلەوەڕاند لە جیاتی خوێندن، ئەوەی زۆرم پێ خۆش بوو لە لەوەڕاندنی کارو بەرخ ئەوەبوو لەوکاتەی کارو بەرخ تێك بەردەدران دیمەنێکی زۆر جوان دەکەوتە بەرچاوم کارو بەرخەکان بەباعە باع بازیان دەهاویشت بۆ گەیشتنیان بەدایکەکانیان، هەر بەو شێوەیەش مەڕو بزن بەبارەبارە بەپیر بێچوەکانیانەوە دەچوون دەنگی کارو بەرخو بزنو مەڕ تێکەڵ دەبوو، وەك ئاوازی مۆسقایەکی دڵگیر لە گوێی مرۆڤ دەزرینگایەوە، لەو کاتەی بەیەك دەگەن دیمەنێکی ئەوەندە جوانە هەر ئارەزوو دەکەی سەیری بکەیت، لەو کاتەی کە تێکەڵاوی یەك دەبن هەر بێچوەیەك بەدوای دایکی دەگەڕێت، دایکیشی بەدوای بێچوەکەیدا دەگەڕێت، وێنەیەك دەکەوێتە بەرچاو بەتایبەتی لە دوای بەیەك گەیشتنی کارو بەرخەکان بەدایکەکانیانو شیر خواردنیان، لە دەوروبەری دایکەکانیان هەڵ دەپەڕن وەك سەمایەکی ئارەزوومەند دەکەوێتە بەرچاو، ڕەوشتی هەرە نایاب ئەوەیە لەکاتی ئاوێرکردنی کارو بەرخ ئەوەندە ئاسان لێك جیا دەبنەوە، مەڕو بزن بەلایەکداو کارو بەرخ بەلایەکی تردا، دیدارێکی تر هەیە دەبێ بخرێتە بەرچاو ئەویش (بێریە) لە کاتێکا مێگەلی مەڕو بزن ڕیز دەبن بۆ دۆشینی یەکێك لە سەر بەردێك دادەنیشێو دوو ئافرەتیش لەملاو ئەولادا دادەنیشن ئەوەی لە سەر بەردەکە دادەنیشێ بزنو مەڕە بەشیرەکان دەگرێت ئافرەتەکانیش دەیان دۆشن، بەو ئافرەتانە دەڵێن (بێرێ) لە کۆتاییدا بێریەکان

تێلەکەو شیر مەشك بەکۆڵیاندا دەدەنو دەگەڕێنەوە، وەك دەزاندرێت لە کوردستان زۆر گۆرانیو بەندو هەڵبەست لە سەر بێریو شوان گۆتراون.

## ژیانی دانیشتوانی گوندی ماویلیان

ئەوەی دیارەو زانراوە لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم کۆمەڵگا بەتێکرایی توشی ژیانی سەخت هاتووە لە ئەنجامی ماڵ وێرانیو خەراپ کاریو برسیەتیوگرانیدا، لە ئەنجامی وێرانکاریوشەڕ بەشێکی زۆری گوندەکانی دەوروبەری(ڕواندز)و ڕواندزیش سوتێنراون، خەڵك لە ترسی سوپای (ڕووس)دەربەدەر بوونو ئاوارەی چۆڵو چیا بوون،گوندی ماویلیانیش یەکێك بووە لەگوندە سوتاوەکان،لەکاتێکا گەڕاونەتەوە هەریەکەی کاولە خانوەکەی چاك کردۆتەوەو هەنوانێکی پێکەوە ناوەتەوە.

لە بەر نەبوونی بەرووبوومو بێ دەرامەتی ئەو خەڵکە توشی برسیەتیو دەردەسەری بووە، خەڵکێکی زۆریش مردووە، هەر لە سەردەمی (تورکەکان)دا خەڵك پەریشان بووەو دەسەڵاتە تازەکەی عێراقیش بۆتە بارێکی گرانترو برسیەتی زیاتری بەسەریاندا سەپاندوە، لەوکاتەی باوکم بووە بەسەرکاری گوندی ماویلیان دانیشتوانی گوندەکە لەوانەیە ژمارەیان گەیشتبێتە سی ماڵو زیاتر، وەك دیارە کارو پیشەی گوندیەکان کشتوکاڵە، دیارە گوندی ماویلیان بەرووبوومو داهاتی زۆرکەم بووە لە بەرئەوەی زەویو زاری داچاندنیان زۆر کەمە بەشێوەیەکی تایبەت زەویو زاری بەراویان هەر نیيە زەوی دێمیش ئەوەندە نییە بەشی ژیانی دانیشتوانەکەی بکات بەڵکو بەشێکی زۆری دانیشتوان زەویان نەبووە ئەوانەی هەشیان بووە هەر ماڵە یەك دوو پارچە زەویان هەبووە، ئەویش کێڵگە نەبووە، بەڵام بەناچاری کاریان تێدا کردوە. بەکورتی دەتوانین بڵێین ئەوکاتە لەو گوندە چەند ماڵێك خاوەن گاو جۆت بوون، لە ڕاستیدا پلەی گوزەرانی ژیان لەو پەڕی نزمیدا بووە!.

داهاتو بەرووبوومی خەڵکی ئەوگوندە سێ شت بووە کە پشتیان پێ بەستووە (أـ دەرامەتی دانەوێڵەیی کە دەچاندرا وەك گەنمو جۆو نیسكو نۆك.

ب ـ بەرووبوومی ڕەزەکان تریو مێوژو دۆشاو. ج ـ بەرووبوومی ئاژەڵی) ئەوانەی خاوەن مێگەڵی بزنو مەڕ بوون، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین ئەو داهاتەی

دەستیان دەکەوت زۆرکەم بووە بەشی نەکردوون، بەڵکوو بەژیانی دەردەسەری پێی دەژیان، بەشی زۆری پیاوەکانیان لە وەرزی هاویندا بۆ سەپانیو دروێنە دەڕۆیشتنە دەرەوە، بەڵکوو هەندێ دانەوێڵە پەیدا بکەن. گوزەرانی خەڵکی ئەو گوندە بەشێوەیەکی گشتی نەمرو نەژین بوو تەنیا ئەوانەی جۆتوگایان هەبوو کەمێك چاکتر بوون، خۆ ئەوانەی جۆتو کێڵگەیان نەبوو لەو پەڕی کەسادیو پەڕپووتی دا بوون، تەنیا ئەوەی جێگای خۆش حاڵی بوو ئەوەبوو خاوەن جۆتەکان لە گوند بەپێی توانا یارمەتی دەری ئەوانە بوون کە بێ دەسەڵات بوون، ئەوەی دێتەوە یادمو بەبیرمە باری ژیانی خەڵکی گوندەکە کەتێیدا دەژیا زۆر بەنزمی دەکەوتە بەرچاو ئەگەرچی منداڵیش بووم هەرکاتە ئەو سەردەمم دێتەوە یاد زۆر بەپەرۆشی دەزانم، لەبەرئەوەی خەڵك زۆر بەکەسادی دەژیا، دەمبینیو بەبیرمە ژیانی ئەو خەڵکە چۆن بوو ئەوەی نانی هەبوایە ڕازی بوو باسی خۆراكو پێ خۆری تر نەکات مەرجی بنەڕەتی تەنها پەیداکردنی نان بوو، ئەو خۆراکەی کە هەش بوو ئەوە بوو کەلە گەنمو دانەوێڵە دروست دەکرا، وەك ساوارو بڕوشو گەنمەکوتاوو هی تریش ئەوانو هەندێ لە دانەوێڵەکانی تریش نۆكو نیسكو ماش، ئەمانە خۆراکی گشتی بوون ئەوەش لە توانای هەموو خێزانێك دا نەبوو هەمووکەس ئەوەی دەست نەدەکەوت، خۆ باسی شەکرو برنجو چا زۆر شاز بوو، پێ خۆر بەهارو هاوین ئەگەر نانو دۆ دەست کەوتبا زۆر شوکر بووین لە وەرزی پاییزان ئەوەی دۆشاوی هەبوایە پێ خۆرێکی دروست بوو، ئەویش ئەوەی هەیبوایە زۆربەیان ئەوەشیان دەست نەدەکەوت نانو ئاو خۆراکی بوو، لەگەڵ ئەو نەبوونیو بەو دەست کورتیەش هەست دەکرا خەڵك لەگەڵ یەکتر تەباو هاوکاربوون، یارمەتی یەکتریان دەداو چاودێری بێ دەسەڵاتەکان دەکرا لەلایەن ئەوانەی بەتوانابوون. هەندێ هۆکار وەك ڕەوشت لە گوندەکان هەن یارمەتی دەری کۆمەڵن ئەو گوندانەی نیزیك چیایەکانن لە سەرەتای بەهاران ڕوو دەکەنە چیا بۆ کۆکردنەوەی (کەوش)یانی ئەوگیایانەی کە دەخورێن، ئەو گیایانەی کۆدەکەنەوە هەندێك بەخاوی دەخورێن هەندێکیش بەکوڵاوی، ئەو گیایانە ماوەیەك سوودیان لێ دەبینرێت، گوندی ماویلیانیش یەکێکە لەو گوندانەی بۆ کۆکردنەوەی کەوش ڕوویان دەکردە چیای هەندرێن بۆ (کاردی، کەنگر، ڕێواس، کوارگ، سلێرك)و هی تریش، لە وەرزی پاییزان بەزۆری ئافرەت بۆ کۆکردنەوەی (گێووژو بەڕوو و قەزوان) ڕوو دەکەنە

چیا، سەردەمی ڕابردوو (مازو)ش کۆدەکرایەوە بۆ فرۆشتن ئەویش کەلێنێکی پڕ دەکردەوە.

ئەوەی بێدادی بوو ئەوەبوو چەند پلەی ژیان نزم بوو لە ڕووی خۆراك ئەوەندەش کەسادی بوو لە ڕووی جلو بەرگو پیسو پەلۆسیەوە، خۆ باسی خانووبەرە ناکرێت خەڵك ڕووت بوون، بەرگی ئافرەت بەزۆری خامی شین بوو دەکرایە کراس، کاتێك دەیکردە بەری ڕەنگی دەدایەوە سەر لەشی، ئەویش بەدەست هەموو کەس نەدەکەوت، پیاوەکانیش ئەوەی ساڵی جارێك بیتوانی بوایە ڕانكو چۆغەلێك دەست بخات ئەویش بەشی زۆریان بەپینو پەرۆك دەبوون. ئیتر ژیان ئەوها بوو مندالْ گەورە دەبوون بەشی زۆی لەشیان بەدەرەوە دیار بوو، بەرگی نوێ زۆر کەم دەبینرا. دەربارەی خانو و ناوماڵ ئەوەندەی دەڵێیت نارێكو پەرپووت بوو، وەك باس دەکرا لە دوای شەڕ خەڵك لە ناوکەلاوەی خانوەکان هەریەکەی بەپێی توانا هەنوانێکیان دروست کردبوو، واش دیاربوو بەشی زۆری خانووەکانی گوند لەسەر کۆلەگ* ڕاوەستاو بوو لەناوەوە بەپێی پێویست ناوبڕیان لێ کردبوو بەجیا بۆ دانیشتنی خۆیانو ئاژەڵەکانیانو کاووگیاوکەلو پەلەکانیان، ئەو شوێنەی خۆیان لێیی دادەنیشتن لە ناوەندی دا ئاگردانێك چاك دەکرا بەدار ئاگری تێ هەڵ دەکرا، ئەو ئاگردانە چێشتی لەسەر لێ دەندرا، لە کاتی سەرماش دەوریان دەدا لە جیاتی سۆبەهەر ئاگرەکە چرای ناو ماڵیش بوو، شەوانی سەرما کوورە دارێکی ئەستوریان دەخستە سەر ئاگردانەکە لە دەوری دەنوستن ئەو هەموو دووکەڵەی بەماڵدا بلاّو دەبوەوە لە بەری خانوو دەبوو بەلوولەك سەیری بەری خانوەکانت دەکرد لە جیاتی سپی بێت یەك پارچە ڕەش دەبوو، کاتێك سەیری بەری خانووت دەکرد لە زۆر شوێن لوولەکی تۆزی دوکەڵ پیێدا شۆڕ ببوەوە، زۆر جار لوولەکەی باس کراو دەکەوتنە خوارەوە، لەو شوێنەی لیّی دەکەوت واتدەزانی قومبەلەی لێ تەقیوە یان شتێك لە شوێنەکە سوتێنراوە! ئەگەر میوانیش هەبوایە لە دەوری ئاگرەکە دادەنیشتن، لە دەوری ئاگردانەکەش دەخەوت لەگەڵ ژنو مندالّی خانەخوێ. ئەوکات پزیشك ناوی هەر نەبوو، لەگوند تاکە پیرەژنێك هەبوو پورە (فات) ئەو پوورە فاتە پزیشکی گوندەکە بوو ناوبراو

---

* کۆڵەگ: واتە ئەستوندەك (لە دار دروست دەکرێت بۆ ڕاگیرکردنی کاریتەکانی خانوو)

بوخچەیەکی پڕ لە گریّو پرتکی هەبوو لە گیای ڕێك خستبوون خەڵك پەنایان بۆ دەبرد بۆ تیمارکردن، پوورە (فات)یش بەپێی توانا هەوڵی بۆ دەدان، ئەوەی تر خەڵك پشتی بەچاكو پیرو دووعاو ڕەحمەت دەبەست!!.

نەخۆشیەکان بەشی زۆر لە پیسیو پەڵۆسیەوە دەبوو، بەلاّی هەرە گەورە لە دوو شتەوە دەهات جلو بەرگ زۆر کەم بوو سابوونیش دەست نەدەکەوتو زیندەوەر لەو پیسو پەڵۆسیەوە پەیدا دەبوو، دەتوانم بڵێم خۆشوشتن بەدەگمەن بوو، ئافرەتەکان لەسەرکانی ئاویان دەکولاّندو زیندەوەرەکانیان بەئاوی کولاّو دەکوشت وەك (سپیّ ورشك) ئەوەش ئەوە دەگەیێنیّ جلو بەرگ زۆر کەم بوو، بۆ پیاوان کراسو دەرپیّ لە خامی سپی دروست دەکران خەزنەش شازبوو، ڕانكو چۆغەڵ لە مەرەز دروست دەکران، وە بۆ ئافرەتەکانیش وەك باس کراوە لەخامی شین جلو بەرگ دروست دەکرا، بەدەگمەن چیت* دەبیندرا ئەو بەرگەی نە دەشۆردرا دوای ماوەیەك بۆر دەبوو، پیسو پەڵۆسی بەشێوەیەکی گشتی دەردێکی گرانی ناو کۆمەڵ بوو، ئەو زیندەوەرانەی پەیدا دەبوون تەنیا بەکولاّندن کەم دەبونەوە، ئەوکاتانە خەڵك چاوبرسیو چاوچنۆك نەبوون، لەگەڵ یەك ڕاستو ڕووخۆش بوون، بەشی زۆری خەڵکی گوند لەو پەڕی فەقیری دەژیان ئەوجا ئەوەی هەشی بوو لەپێش میوانی دادەناو ڕووی لەمیوانی وەر نەدەگێڕا.

ئەوەی دانیشتوانی گوند پێی دەژیان داهاتێکی کەمی کشتوکاڵی بوو ئەویش کەم کەس ئەوەندە داهاتەی دەست دەکەوت کە بەشی وەختا وەختی بکردبایە یان بەرووبومو داهاتی ئەوەندە دەست کەوتبا ساڵێك پشتی پیّ ببەستیت، ئەو بەرووبومەی دەهاتە دەست لەو گەنمو جۆیەی دەچاندرا چەند ماڵێك بوون توانای چاندنیان هەبوو، لەگەڵ گەنمو جۆ بڕێك نیسكو نۆکیش بەرهەمیان بەدەست دەکەوت.

ئەوەی زۆر پەسندو دیاریدە بوو ڕەوشتێك لە ئارادا هەبوو ئەویش خزمەت گوزاریو هاوکاریو یارمەتیدانی یەکتری ڕەچاو دەکرا، هاریکاریو یارمەتیدانی یەکتری چ بەشێوەی تاك بەشێوەی هەرەوەزی وەك زبارە بۆ جۆتو ڕەزبڕینو چڵوکردنو کۆکردنەوەی تولانە .مێوو هی تریش ڕەوشتێکی مرۆڤانەی بایەخدار بوون بۆ ژیانی

---

* چیت : واتە پشتدێن

گوندیەکان، ئەوەی زۆر بەبایەخدار بوو ئەوەبوو بەهاران لاوانی کچ‌وکوڕ بۆ هەڵگرتنەوەی توولانە مێو دەردەکەوتن بەبەزموو گۆرانی بۆ کارەکەیان دەڕۆیشتن، ئەوها بەکۆمەڵ بەیەك گەیشتن سوود بەخش بوو لە بارەی ئاڵوگۆڕی بیرو ڕاو یەکتر بینین، کچەکان تولانە مێویان کۆ دەکردنەوەو کوڕانیش بەکنۆرە دەیان بردە سەرتخووب لە شێوەی پەرژین دایان دەنا، هەر بەو شێوەش بەکۆمەڵ دەڕۆیشتنە ڕاووکاردیو ڕێواس، ئەمە خۆشیەکی تێدا بەدی دەکرا.

## دێتەوە یادم مێوانی بێگانە هاتنە ماڵمان

بەهار بوو ڕۆژێك سەرلەبەیانی کۆمەڵێك میوانی بێگانە لە ماویلیان پەیدا بوون، لە دیوانخانەی ئێمە دابەزین دیاربوو ئینگلیز بوون سوپایەکەیان لە دەشتی ڕواندز بوو کە ئێستا پێی دەڵێن (دەشتە دیان)، هاتبوون بۆ لای باوکم بەنیازی ئەوەی لەگەڵ (سلێمان بەگ) بچنە ڕاوە (بەراز)و ڕاوی (بزنە کێوی)، لەوکاتەی ئەوان گەیشتن (سلێمان بەگ) ئەو ڕۆژە چوو بووە دەرگەڵە، هەر ئەو دەمەی ئەوان گەیشتن یەکسەر یەکێکمان نارد بەدوای باوکم کە زوو بەگەڕێتەوە لەبەر مێوانەکان، میوانەکان لە دوای پشوێکی باش دوایی بەسەرکەوتنە سەربانی دیوەخانە، لەوبەری بەرامبەر قەلاَت نیشانەیان داناو تفەنگیان دەهاویشتنێ، بۆ ئێوارە کاتی ڕۆژئاوا (سلێمان بەگ) گەڕایەوە هەر ئەو شەوە خۆیان ڕێکخستو بەری بەیانی زوو ڕۆیشتن بۆ چیای (بن کێلان)، باوکم زوو ڕاوکەرەکانی بەڕێ کرد بوون بۆ ئەو شوێنەی بۆی دەست نیشان کردبوون، ئینجا خۆیو چەند چەکدارێك لەگەڵ میوانەکان بەڕێ کەوتن، لە سەر ڕاسپاردەی باوکم کەلوپەلی پێویست ناردرا بۆ ئەشکەفتی (بیدزی) چونکە بەنیاز بوون شەو بمێننەوە، بەڵێ شەوێك لەوێ مانەوە، میوانەکان دوو ئینگلیزو دیانێکی موتەرجیمو خزمەت گوزارێك بوون. بۆ ڕۆژی دوایی کە گەڕانەوە دیار بوو چەند نێچیرێکی چاکیان ڕاوکردبوو دوو سێ نێریە کێوی گەورەیان کوشتبوو لە سەرخواستی ئەوان نەکوژرابونەوە بەو شێوەیان بردنەوە بۆ سەربازگەکەیان لە (دیانە) وەك دواتر زانیمان هەر زوو بەڕێیان کردبونەوە (بەریتانیا) ئەوەی دیار بوو

زۆر بەدڵخۆشی گەڕانەوە، چونکە بڕوایان نەکرد ئەوەیان بۆ دەکرێ ئەوەی بۆیان کرا، زۆری پێ نەچوو ڕۆژێك پێش نیوەڕۆ دوو فڕۆکە گەیشتنە سەر گوندی ماویلیان، یەکێك لە فڕۆکەکان زۆر بەبەرزی بەسەر گوند دەسوڕایەوە، ئەوەی تریان زۆر نەوی بەسەر گوند دەوری دەدان هەرئەوەندە بوو خۆی لە ئەسپینداره‌کان نەدەدا زۆر نزم بەدەوری قەلاتێ دا دەسوڕایەوە ئەوەندە نەوی بوو خەڵکی گوند مەترسیان لێ پەیدابوو هەندێکیان خۆیان شاردبوەوە وایان دەزانی فڕۆکەکان بەنیازی خراپ بەسەر گونددا دەسوڕێنەوە، فڕۆکەکان کە زانیان(سلێمان بەگ) دیار نییە لە دوا سوڕانەوەیدا فڕۆکە نزمەکە شتێکی فڕێ دایەخوار لە خوارەوەی قەلاَت کەوت، فڕۆکەکان بەرەو دەشتی ڕواندز گەڕانەوە، کاتێك فڕێدراوەکەیان هێنایەوە دیار بوو هەندێ جگەرەی (گۆڵدن فلاك)ی ئینگلیزی بوون لەگەڵ هەندێ بسکویت جوان پێچرابوون. ئەوەی ڕاستیە فڕۆکەکان زۆر نزم بەسەر گونددا دەسوڕانەوە بەتاییەتی یەکێکیان هەر ئەوەندە بوو خۆی لە دارە بەرزەکان نەدەدا لەوکاتەدا ئافرەتێك (پورەسار) نانی بۆ ئێمە دەکرد نانی بەجێ هێشتبووخۆی شاردبوەوە لە هۆدەی خوارەوە لە قوژبنێك لبادی بەسەر خۆی دا دابوو، پورە (سارێ)ی بەستە زمان نیوەی ڕوحی چوو بوو لەترسی هاڕەی فڕۆکەکان لەبن لبادی گوایا دەستەو دوعا وەستا بوو لە خوا دەپاڕایەوە ماڵی میر لەو بەلاَیە دوور بیت، پیرەژنی بەستەزمان هاڕو هۆڕەی فڕۆکەکانی بەبەلاَیەکی گەورە دانا بوو، لەو تەنگاویەدا خێری وەخۆی گرتوەو کۆمەڵێك ئایات کورسی خوێند بوون بۆ ئەوەی ئەو بەلاَیە لەماڵی میر دوور بێت، پورە سارەی سەر شێواو خەڵکی گوندی بەبیر نەبوە تەنیا لە غەمی میر دابووە.

دوای ڕۆیشتنی فڕۆکەکان پورر (عەیشەخان) دەیگێڕاوە چۆن پورە سار لە ژوورەکەی بنەوە لە ترسان لەرزی گرتوەو هاواری کردوە بۆ ناچن ئەو کوڕە لەسەر بانی بیننە خوارەوە ئەو سەگبابانە نیازیان خراپە، بەپیرە ژنی ماڵ وێرانیان گۆتبو زرارو مەلاکۆر لە سەر بانی دەستیان بۆ هەڵدەوەشێنن.

لە دواییدا دەرکەوت فڕۆکەکان ئەو ئەفسەرە ئینگلیزانە بوون ئەوانەی لەگەڵ باوکم چووبوونە ڕاوێ، لە دوای ماوەیەك (سلێمان بەگ)یان دیبو گۆتبویان زۆر سوڕاین لەسەر گوند ئێوەمان نەبینی تەنیا مندالێك‌و پیاوێك لەسەر قەلاَتێ دیار بوون، هەستمان کرد خەڵکی گوند دەترسان لە سەرەتاوە خەڵکمان دەبینی لەسەر

بانەکان دوایی هەموویان خۆیان شاردەوە تەنیا پیاوێكو منداڵێك لەسەر خانوەکەتان وەستا بوون.

## کەسایەتیە دیارەکانی ئەو کاتەی گوند

ئەو کەسایەتیانەی دیاربوون وەك ڕووی گوند چەند مرۆڤێك بوون لە بەرچاو، ئەوانەی پرسو ڕایان پێ دەکرا کە خەمخۆری گوند بوون:-

***۱- قادر ئاغا:*** ناوبراو پیاوێکی بەتەمەن بوو لای سلێمان بەگ ڕێزی دەگیرا، زۆریش دوونیا دیتەو لە سەرخۆبوو، بەڵام دەست کورت بوو توانای کاسبی نەمابوو کوڕە گەورەکەی چەك هەڵگری سلێمان بەگ بوو، لەو ڕێگایە کەمێك یارمەتی دەدرا.

***۲- سلێمان ئاغا:*** ناوبراو پیاوێکی وەستا کار بوو بەردەوام خەرێکی ساز کردنی تامێرەکانی جوتیارەکان بوو شووێنی وەستا کاریەکەی جێگای دانیشتنی پیرە پیاوە بێکارەکانی گوند بوو سلێمان بەگیش بەردەوام لای دا دەنیشت سلێمان ئاغا مرۆڤێکی گفتوگۆخۆشو گاڵتەچی بوو شتی سەیری لێ دەگێڕنەوە خاوەنی سەر بردەی خۆشە دەڵێن: جارێك بەسلێمان بەگی گۆتبوو مێرا فلان کەس ڕایسپاردوم پێتان بڵێم کە کچە خزمەتکارەکەی لە ماڵتانە بیدەی بەناوبراو، سلێمان بەگیش گۆتبووی ئەگەر کچە ڕازی بێت دەیدەینێ، ئەتو برۆ بەکچە بڵێ، سلێمان ئاغاش چۆتە لای کچە پێی گۆتبوو ئەمن هاتووم کە مێرد بەفلاڵن کەس بکەیت، کچە گۆتبووی وەلا مام سلێمان مێرد بەو شەپو شۆڕە ناکەم ئەو بەخۆی لە خۆی بەلایە ئەمنیشی لێ ببمە بەلایەکی تر. سلێمان ئاغا بەکچەی دەڵێت: مادام بەوی ناکەی مێرد بەمامی خۆت بکە. خۆ ئەمن شەپو شۆڕ نیم قیتو قۆزم، کچە دەڵێت ڕزیوو گەندەڵی وەکو تۆم بۆچی یە!. سلێمان ئاغا دەڵێت: ماکەر تەماشی سەر توزم مەکە شەرتی بنەرەتی بن توزە، دەست دەکات بەپێکەنین.

سلێمان ئاغا کوڕە گەورەکەی کەریم کاسبەکی باش بوو، لە هەمان کاتیش ڕاوکەرێکی سەرکەوتوو بوو بچوبا چیای بێ نێچیر نەدەهاتەوە.

**٣- وەستا حسن:** ناوبراویش وەستا کار بوو کاسبی هەبوون بەخۆی پیربوو، بەلاّم منداڵەکانی چالاك بوون ئەو پیاوە کەم دیار بوو لە ناو خەڵکی گوند ڕێزی دەگیرا، کوڕە گەورەکەی وەستا علی ئەوەندەی بڵێی کەسێکی پیاوانەو ڕوو خۆش بوو لەگەڵ خەڵکی گوندگونجاو بوو.

**٤- وەلی بەگ:** ئەو پیاوەش زۆر خۆشەویست بوو لە ناو خەڵکی گوند، زۆریش کاسب بوو، هەوڵدەر بوو منداڵەکانی بەخێو بکات ژیانێکی هەراسانی بەڕێوە دەبرد.

**٥- حمە ڕەش:** ئەو پیاوە خاوەنی جۆتوگای خۆی بوو، ناوبراو مرۆڤێکی زۆر ناندەر بوو یاریدەری لیّ قەوماوان بوو چ کوڕی نەبوون دوو سێ کچی هەبوون ژنەکەی (خەجە درێژ) لە پیاوان چالاك تربوو ئافرەتێکی ئازاو بەدەستو برد بوو چاوکراوە بوو جێگای لەکۆمەڵ دیار بوو.

**٦- ساڵحی حمدامین:** ناوبراو کاسبێکی باش بوو مێگەلە بزنێکی باشی هەبوو لەگەڵ خەڵك گونجاو بوو ڕێزی هەبوو لە ناو خەڵکی گوند، منداڵەکانی کاسب بوون.

**٧- فەتاحەڕەش:** پیاوێکی ڕێكوگونجاو بوو لەناو کۆمەڵی گوند مرۆڤێکی بەدەستو قام بوو، بەلاّم دەست کورت بوو، هەوڵ دەربوو بۆ بەخێو کردنی منداڵەکانی.

**٨- حەسەنی عەباسی:** پیاوێکی کاسب بوو، بەلاّم تووندڕەوبوو چ لەگەڵ ماڵو منداڵی چ لەگەڵ خەڵك، ناوبراو دوو ژنی هەبوون ماڵیان لێك جیا بوو.

**٩- حاجی الیاس:** ناوبراو پیاوێکی دیار بوو، دەستی دەڕۆیشت، واتا هەبوویی بوو یارمەتی لیّ قەوماوانی دەداو لەناو کۆمەڵدا ڕێزی لیّ دەگیرا هیچ کوڕی نەبوون، ئەویش دوو سێ کچی هەبوون.

**١٠- مەلاسادیق:** مەلای گوند بوو، پیاوێکی خۆشەویست بوو ڕێزێکی زۆری لیّ دەندرا لەلایەن خەڵکی گوند بەشێوەیەکی تایبەت لەلایەن سلێمان بەگ ناوبراو مرۆڤێکی ئاین پەرستی ڕاستەقینە بوولەبەرئەوە ڕەوشت بەرزبوو، ببوو بەشێخ، بەلاّم شێخێکی بەناوەدەنگ خەڵکێکی زۆرڕووی تیّ دەکرد.

سلێمان بەگ چەند نۆبەتدارێکی خەڵکی گوندی هەبوون شەوان نۆبەتیان لەقەلاّتی دەگرت ئەوانەش (حەسەنی قەلاّشی، سێمانی عەیشە گۆجی، حوسێنی

دەلۆ، مەلاکۆر، عەلی شێرکاوەیی) نۆبەتداری تایبەتی خۆی بوو بۆ هەر شوێنێك ڕۆیشتبا لەگەڵی دەڕۆیشت.

لەزارگۆتەی عەلی شێرکاوەیی دەڵێت: دوو یان سێ ساڵ دوای هاتنی ئاغە ژنە(ئایش) یانی ژنە نوێیەکەی سلێمان بەگ ناتەبایی سەری هەڵداو ئاڵۆزی پەیدا بوو لە ئەنجامی قڕەو کێشەی نێوان ژنەکان ئاغەژنە(هەمین) ڕۆیشت گەڕایەوە لای منداڵەکانی مێردی پێشوو لە(چۆمباڵوك)* کاتێك (هەمین) ڕۆیشت ئاغەژنە (حەلیم) لەگەڵ مێگەلە بزنو مەڕ بەڕێ کرا کوێستانان هەتا پاییزێ دوور کەوتەوە بۆ بەخێوکردنی بزنو مەڕ(بادین)ی کردە شوان جێوو ڕێی بۆ ڕێکخست، ناوبراو خۆیشی هەندێك بزنی هەبوون ئەو پیاوە، مرۆڤێکی لەسەرخۆ بوو، بەلاّم زۆر دەست کورت بوو، چونکە مرۆڤێکی پاك ڕەوشت بوو، ببوە جێگای باوەڕی سلێمان بەگ ئەویش مەڕو بزنی لە شوانکاری وەرگرتەوە دایە دەستی (بادین) بۆ ئەوەی زیاتر سوود لە بەروبوومی ئاژەڵەکەی وەربگرێت بەو نیازەی هاوینان بنکەیەکی ماڵی لەگەڵ مێگەل بڕاوەتە کوێستان پاییزانیش لە دەرەوەی گوند خۆراکی پێویستی بۆ دابین بکرێت، مەرامی سلێمان بەگ زیاتر ئەوە بووە بۆ ماوەیەك قڕەو بۆڵە بۆڵی ژنەکانی بێ دەنگ بکات جاری یەکەم لە سەرەتای هاوین کۆچباریان ساز کرد ڕۆیشتنە کوێستانی (بن کارۆخ) کوێستانی ناوبراو لە ژێر هەستو مستی بنەماڵەی میرەکانی دەرگەڵەدا بوو.

لەزار گۆتەی دایکم دەڵێت: مەرامی ئاغا گوایا بەخۆی چاودێری مەڕو ماڵاتەکەی دەکات بەمەبەستی بەدی هێنانی بەروبوومی ئاژەڵی کەچی وانەبوو، (هەمین) ڕۆیشتەوە لای منداڵەکانی منیشی بەناوی کوێستان دورخستمەوە. ئەوەی دیارە کوێستان ماوەی چوار پێنج مانگ ڕەشماڵیان هەڵ دەدا دەمانەوە هەتا سەرما دادەهات. پاییزانیش لە دەرەوەی گوند لە هاوارگەی (بن شینك) دەمانەوە هەتا سەرما دەری دەکردن.

مام (بادین) وەك لەسەرەوە باسی کراوە پیاوێك بوو ئەوەندەی بڵێیت لەسەرخۆو مەند بوو بەڕێزبوو، بەلاّم دەربارەی ژنەکەی خۆی (سەید ڕابی) چەندی بڵێیت بێ

---

* چۆمباڵوك گوندێکە دەکەوێتە دۆڵی ڕۆست لەناوچەی باڵەکایەتی.

ڕوحمو بێ ویژدان بوو، ئەو ئافرەتە زۆر بێ دەسەلاتو بێ چارە بوو وێنەی زۆر کەم بوون، مام بادین کە لەو ئافرتەی دەدا وای دەزانی ئاژەڵە لەبن دەستی ئەوهای لێ دەدا.

دێتەوە یادم بەهار بوو مەڕو بزن لە بێردا بوون، لایەك دایکم دانیشتبوو لایەکەی دی سەید ڕابی بزنی دەدۆشین، لەکاتی دۆشینی بزنێك هەڵپەڕی شیری دەستی سەید ڕابی بەستەزمان ڕژاو بەگۆڕێ وەربوو مام بادین بەگۆپاڵی دەستی وەرگەرایە ئەو ئافرەتە بێ دەسەلاتە، لەو دەمەدا سلێمان بەگ لەگەڵ چەند پیاوێك لە نیزیك وەستا بوون کاتی سلێمان بەگ بینی چۆن بەشێوەیەکی دڕندانە لەو ئافرەتە دەدات یەك دوو جار بانگی کرد بادین بەسە، بادین زیاتری لێ دەدا سلێمان بەگ بەچووستی غاریدا گۆپاڵی لەدەستی دەرهێنا، چوار پێنج گۆپاڵی لە بادینی دان پێی گوت: ئەوە ئاژەڵە بەو شێوەیە لەو بەستە زمانە دەدەیت؟. ئەوەی ڕاستیە زۆرم پێ خۆش بوو باوکم لەمام بادینی دا لە بەر ئەوەی پەرۆشی سەید ڕابی بێچارە بووم.

وەك لە سەرەوە نووسراوە هاوینان مێگەلی مەڕو بزن دەڕۆیشتە کوێستانی (بن کارۆخ) کوێستانی ناوبراو بەو شێوەی خوارەوە هەڵکەوتوە: کوێستانی بن کارۆخ کوێستانێکی بەر فراوانە هەر لەزینی (ئەستێرۆکان) بگرە بەبن کێوی کارۆخ دا ڕاکشاوە تا دەگاتە گەرووی سەران، کوێستانێکە پڕە لەکانیاوی سازگاری ساردو مێرگو هەوارگەی خۆشو دڵگیری بڵند، کوێستانی باسکراو کەوتۆتە ژێر زنجیرە کێوە بەرزەکەی کارۆخ هەر لەبەر ئەوەش پێی دەگوترێت کوێستانی بنی کارۆخ لەوەڕگایەکانی دیارنو دابەشن بەسەر ئەو گوندانەی خاوەن ئاژەڵنو دەچنە کوێستان سێ ڕێگای بۆ دەچێت:

١- لە وەرتێ بەسەر دەکەوێتە هەوارگەی (مەکێ)و واری ماڵ کاکی
٢- لەگەڵی کەڵێتێ بەسەر دەکەویتە باسکە ڕووالّ دەڕوات بۆسەرجۆی.
٣- لەگەڵی دەرگەڵە سەر دەکەویت بۆ لەوەڕگاکانی سارکێو سەرەنێرو ترشینان سەرگۆمی سەر ئەستێرێ.

کوێستانی بن کارۆخ ئاوی زۆرن ئاوەکانی کارۆخ دەڕژێنە چۆمەکانی وەرتێو دەرگەڵە هەتا دەگەنە ناو ڕوباری دۆڵ ماوان، ڕوبارەکانی دۆڵی باڵەییانو وەرتێ لە گوندی خانەقا بەیەك دەگەن ڕوباری دۆڵ ماوانی لێ پێك هاتووە ئاوی چۆمی

دەرگەڵەش لە نیزیك گوندی (ڕەزانۆك) لەگەڵ ڕوباری باڵەکایەتی تێك هەڵ دەبێت ڕوباری ڕواندزی لێ پێك دێتو دەڕواتە ناو گەلی علی بەگ.

لەو ساڵانەی ماڵمان دەڕۆیشتە کوێستان، ساڵێك کۆچبار ڕۆیشتبوە کوێستان منیان بەجێهێشتبوو لە گوند لە دوای ماوەیەك باوکم دەڕۆیشتە کوێستان منیشی لەگەڵ خۆی برد لەپاڵ پشتی خۆی دانام، لە گوند دەرکەوتین بەرەو دەرگەڵە، سێ چەکداریشمان لەگەڵ بوون لە گۆڕستانی سەری ملی تێپەر بووین گەیشتینە هەڵدێرەکەی شکەوتوان ڕێگایەکە زۆر سەخت بوو لەوێ دەربازبووین بەڕێگای بەرگراوێدا ڕۆیشتین گەیشتنە بن شینکانو پێچاو پێچ لە شینك سەرکەوتین، بەڵام چۆن سەرکەوتنێك، ئەزیەتێکی تەواومان چێشت بەتایبەتی من لە بەرئەوەی لە پاڵ پشتی باوکم سوار ببووم زۆرم ئەزیەت خوارد تا بەسەرکەوتین لەو هەوارازە، تووند فیشەکدانی باوکم گرتبوو بۆ ئەوەی نەکەوم، کاتێك بەسەرکەوتین لەسەرەوە گۆڕەپانێکی زۆرخۆشی پڕ لە گوڵی وەرزی بەهاری بوو لەوێ دابەزین، بەڵام چی گۆڕەپانەکە وەك مافورێکی ڕەنگاو ڕەنگ دەکەوتە بەرچاو، جۆرەها گوڵ سەریان هەڵدابوو گوڵی سروشتی وەرزی بەهار ئەو گوڵە هەمە تەرزە گۆڕەپانەکەیان ڕازاندبوەوە ئارەزووت دەکرد سەیریان بکەیت، لەو شوێنە خۆشە پشوویەکی باشمان کێشا لەوێ هەستاین بەرەو زینی دەرگەڵە بەناو دارستانێکی چڕدا تێپەڕبووین لە پێچەکانی (کەڵەکی عالی مێران) سەرکەوتین بەسەر زین سەرکەوتین لەسەر زین لەوێ وەستاین، باوکم دابەزی من لەسەر پشتی ماینەکە مامەوە ئەوەی زۆری دڵخۆشی کردم ئەوە بوو لەسەر گەرووی زینی ئەم دیوو ئەودیوی هەتا چاو بڕبکات دیارە، چ لە دیوی دۆڵە منجەل چ لە دیوی دەرگەڵەو باڵەکایەتی دیمەنێکی ئەوەندە دڵگیر دەکەوتە بەرچاو جێگای ئەوەیە هەردەم لە یاد بێت ئەوەندە خۆش دیار بوو، لەوێوە بەشێکی گوندی دەرگەڵەش گەرەکی قەڵاتێو کۆشکی ماڵی میرو گوێزەکانی ئاوە ڕێژیش دیار بوون، ئەو دیمەنە جوانە چاوی مرۆڤی لێ تێر نابێت حوسێن سەری ماینەکەی دەکێشاو منیش لەسەر پشتی بووم بەڕێگای گەرەکی سەر باسکی دا ڕۆیشتینە ناو گوند کاتێك گەیشتینە (کانی مێردان) کۆمەڵێك پیاو دانیشتبوون هەستان هاتنە پێشوازی باوکم بەخێر هاتنیان لێ کرد لەوێ ڕۆیشتینە خوارەوە لە دەرگای قەڵات چووینە ناو حەوشی قەڵاتێو دابەزین دیار بوو هەمویان هاتنە بەخێر

هاتنی باوکم‌و منیشیان دەگرتە باوەش باوکم ڕۆیشتە ساباتە لای (میرحمدامین بەگ) ئەو شەوە لە دەرگەڵە ماینەوە.

لە دوای ماوەیەك لەگەڵ یەکێك لە چەکدارەکان (مەلا کۆر) ڕۆیشتینە ماڵی مامەکانم سەیدئاغاو بەکرخان بەگ، زۆر یان هەوڵ دا لایان بمێنمەوە بەتایبەتی پورە (سوڵتان)، بەلام لەبەر باوکم نەمتوانی گەڕاینەوە بن سابات، بەیانی ڕۆژی دوایی لەدەرگەڵە دەرکەوتین، بەناو گونددا ڕۆیشتین لە (کانی مێردان) لا ماندایە ڕێگای ناو ڕەزان بەژێر دارەکاندا دەڕۆیشتین لەکانی ژنان تێپەر بووین بەژێر دار تاوکەکی سەر باخچەکاندا باوکم گوتی: کوڕە سەرت نەویکە لەگەڵ قسەی باوکم پەلەك بەکلاوم کەوت‌و کەوتە خوارەوە زوو بەباوکم گۆت بابەکلاوم کەوت. باوکم یەکسەر جڵەوی وەلاغی سوڕاندەوە بەلولەی تفەنگی کلاوی هەڵگرتەوە داینا وە سەرم، لە باسکی(هۆرێ) تێپەر بووین بەڕێگای ناوڕەزان ڕۆیشتین تا گەیشتینە (دەرەشکەفتان) لەوێ بەسەر کەوتینە ناو گەلی سەرو بەژێر دار گوێزەو ئەسپینداراەکاندا لە ئەشکەفتیێ(جمکان) دەربازبووین، چەند جارێك ئەو بەر ئەوبەری ئاوی چۆممان کرد گەیشتینە بناوانی جۆی سۆران لەناو ئەو چۆمە شۆڕە شۆڕی ئاوی جۆی سۆران لەگەڵ دەنگی باڵندەکانی ناو دارستان تێکەڵی یەکتر دەبوون‌و ئاوازێکی خۆشی دەدا، لەو ساتەدا بوو ئەوەندەم زانی لە ڕێگای گشتی لاماندا بەژێر دار گویزەکاندا دەڕۆیشتین کاتێك لە دەرگای خانوێك وەستاین دیار بوو کۆمەڵێك بارە گەنم لە شێوەی باراش داندرابوون یەك لە تەنیشت یەك، دیتم پیرە ژنێکی تۆزاوی دەرکەوت چاوی بەباوکم کەوت بەپەلە ڕۆیشتەوە ژوور چارۆکەکەی خستەسەری‌و هاتەوە، گوتی میرا بفەرموو دابەزە. باوکم پرسی (حەلیم: قادر لێرەیە؟) پیرە ژنە تۆزاویەکە گوتی: (بەڵێ میرا خەریکی چاکردنەوەی ئاشیە)، باوکم بەحوسێنی گوت (زراری بینە خوارەوە)، مەلا جڵەوی ماینەکەی گرت‌و حوسێن منی هێنایە خوارەوە دیار بوو (قادر) لە بن ئاشی دا بوو، باوکم لە ژێرەوە سەیری دەکردە بن قۆتەڵەی ئاشی بەدەنگێکی بەرز بانگی دەکرد قادر دوو سێ جار بانگی کرد کاتێك قادر لە ژێر قۆتەڵەکە دەرکەوت چاوی بەباوکم کەوت بەڕوویکی زەردەخەنەی گەشەوە باوەشیان لێك گرت قادر گوتی: (یاخوا بەخێر بێیت بەڕاستی بیرم دەکردیەوە)، زۆر بەگەرمی چاك‌و خۆشیان لە یەکترکرد مام قادر زوو دەستی منی گرت‌و بەسەری

خستمە سەر بانی ئاشەکە، دیار بوو پیرە ژنە تۆزاویەکە بەپەلە(بەرە)یەکی هێناو ڕایخستو ڕۆیشتە ژوورەوە بالیفێکی گەورەی هێناو داینا پاڵ پشتی باوکمو گۆتی یاخوا بەخێر بێیت.

باوکم لە پیرە ژنەکەی پرسی: (حەلیم ڕەسوە خێل لەکوێیە؟) ئافرەتەکە گوێی لێ نەبوو ڕۆیشتە خوارەوە ئەوجا زانیم (مام قادر) خاوەنی ئاشەکەیەو بەخۆیشی لە ئاشەکەی وەستایەو خەریکی چاکردنەوەی بوو، دوایی زانیم ناوبراو مرۆڤێکی دڵسۆزی باوکمەو لەناو کۆمەڵ ڕێزی لێ دەگیرێت.

پیرەژنی ئاشەوان زوو ئاگری کردەوە خەریکی چا لێنان بوو دوایی چادانەکەی برد لە پێش مەلای داناو گۆتی: (ڕۆڵە پلکت بەقوربان بیت، تۆش بۆیان تێبکە) لەو سەینو بەینەدا باوکمو مام قادر زۆر بەگەرمی دەدوان، دیار بوو دووانەکەیان دڵ خۆشی بوو، ناوە ناوە دەیاندا لە قاقای پێکەنین، لە دواییدا باوکم هەستاو خواحافیزی لە مام قادر کردو بەپیرە ژنە ئاشەوانەکەی گوت (حەلیم بەڕەسوە خێل بلێ بێتە ماویلیان، بەڵکو یارمەتیەکی بدەین) پیرە ژنە دەستی کرد بەدووعاو لە خوا دەپاڕایەوە خودا تەمەنی میر درێژ بکات لە دەردوو بەلا بەدووربێت.

مەلا ماینەکەی هێناو باوکم پێی نایە ڕکێفو سواربوو، مام قادر منی بلند کردم داینامە پاڵ پشتی باوکم ئەویش جلەوی ماینەکەی بەرەو ڕێگای گشتی سوڕاندەوەو ئاشمان بەجێهێشتو بەناو گەلی دا سەرکەوتین بەژێر دارگویزەکاندا دەڕۆیشتین بایەکی فێنك ڕوو بەڕوومان دەهات ئەوەندەی بڵێیت دڵی خۆش دەکردین هەر لەبەر ئەو خۆشیەش یادی ئەو ڕۆژە قەت لەبیر ناکەم!.

کاتێك گەیشتینە ناو گۆڕستانە گەورە کۆنەکە بەناو (مام شێخ هەمزە) بەلامەوە سەرنج ڕاکێشەر بوو ئەو ڕێگایەی بەناو گۆڕستاندا دەڕوات بەبەردکراوە بۆئەوەی ڕێبوارەکان لانەدەنە ناو قەبرەکان ئەو کەڵەکە بەردەی بەدرێژایی ڕێگا کراوە تەواوێك بلندەو زۆر داری گەورە گەورەی دار مازو دار بەڕوو گۆڕستانیان داپۆشیوە، لەوێ تێپەڕ بووین گەیشتینە سەرچاوەی ئاوی کانی (فەقێیان) ئاوی ئەو کانیاوە لەبن قاپی گوێزێك دەر دەقوولێ، بەڵام چ ئاوێك ئەوەندەی بڵێیت ساردەو شوێنەکەشی زۆر خۆشە ئەو ئاوە ساردە دەڕژێتە ناو چۆم کاتێك گەیشتینە سەر کانیاوەکە حوسێن منی دابەزاند هەر زوو دەمم بەئاوەوەنا، بەڵام نەمتوانی زۆری بخۆمەوە ئەوەندە

ساردبوو، پشوودانێکی کورت لەوێ ماینەوە. هەستاین بەڕێگا پێچاو پێچەکەی (وارکادین)دا سەرکەوتین بەناولێڕەواری قەد پاڵی چیادا دەڕۆیشتین، لە گەروێك وەستاین لەوێ بەولاوە دارو درەختی کوێستان کەوتە پێشمان وەك گوێنیوەدەژنۆكو تێرو جۆری تر.

ئەوەندەی بەسەر دەکەوتین زیاتر دیمەنی کوێستان بەدیار دەکەوت لە کەندو شیوەکانی شۆڕە شۆڕی ئاو لە باسکەکان دەنگی باڵندەکان بەشێوەیەکی تایبەتی قاسپەی کەو گوێ بیست دەبووین، کاتێك بەسەر کەوتینە سەر باسکە (ڕووال) جوانترین دیمەنی دەکەوتە بەرچاو لەم دیوو ئەو دیوو ئەوەندەی دەبیندراو دیار بوو نەخش‌و نیگاری کێوە بەرزەکان‌و لە کوێستانیش مێرگ‌و هەوارگەی هۆبەڕەشماڵەکانی خاوەن ئاژەڵەکان، هەڵکەوتنی کێوە بەرزەکەی (کارۆخ) بەسەر کوێستانەکەدا دەڕوانێت نیگارێکە مرۆڤ ناتوانێت ڕووی لێ وەربگێڕێت، لەسەر باسکە ڕووال وەستاین پشووێکمان کێشا نەمزانی سەیری کاملا بکەم ئەوەندەم بەلاوە خۆش بوو، لەسێ ڕێیانەکە ڕوومان کردە ئەو ڕێگایە کە دەڕۆیشتە گەرووی سەران، دوو ڕێگایەکەی تر یەکێك بەرەو زینی ئەستێرۆکان دەڕۆیشت بەپشتی (وەرتێ)دا دەڕوات، ئەوەی تریش سەرەو ژێر دەڕواتە خوار بۆ گوندی (کەلێتە). لەوێ بەرێکەوتین گەیشتینە ناو هۆبەڕەشماڵەکانی ئاژەڵدارانی گوندی (ڕەژیکەریان) لە هەوارەکەی (سەرجۆ) کاتێك لە ڕەشماڵەکان نیزیك کەوتینەوە سەگەکان بۆمان هاتن، بەلاّم زوو ئافرەتێك لە ژێر ڕەشماڵێك دەرکەوت لە سەگەکانی خوڕی‌و هاتە پێشمان ماندوو نەبوونی لێکردین، بەباوکمی گۆت:(بفەرموو میرا دابەزە) دیاربوو ئافرەتێکی ڕەوەندانی ڕێك بوو بەرهەڵبێنەیەکی بەبەرەوە بوو خەریکی مەشك ژاندن بوو، باوکم لێی پرسی: (میری خدرە شینی لە ماڵ نییە؟) ئافرەتەکە لە وەلاّمدا گوتی: (نەخێر ناوەڵلاّ میرا لە دوێنێ وە ڕۆیشتۆتە گەرمیان بۆ هەندێ کەل‌و پەلی پێویست) باوکم پێی گوت (دانانیشین دەڕۆین ئەگەر خدرەشین هاتەوە بادوا نەکەوێت‌و بێ بۆ لام من چەند ڕۆژێك لێرە دەمینم). ئافرەتەکە گۆتی: (بەڵێ میرا هەر بێتەوە زوو دەینێرم بێتەلاتان. خـواتان لەگەڵ بێت).

لەوێ بەرەو هەوارگەی (ترشینان) سەرکەوتین کاتێك نزیك کەوتینەوە لە ڕەشماڵەکانمان لە دوورەوە سەگەکان سەرەویان بۆ هێنایین کە نزیك بوون ئێمەیان

ناسین کشانەوە، لە پێش ڕەشماڵ منیان دابەزاندو دایکم زوو گرتمیە باوەش، ئەو شوێنەی ڕەشماڵی لێ هەڵدرابون زۆرخۆش بوو، شوێنەکە نزیك بوو لە گۆمی(سەرئەستێرێ)گۆرەپانێکی سەوزی پڕلەگیای هەمەجۆر بوو ئەودیووئەمدیوی ئاوی پێدا دەڕۆیشت.

ڕۆژی دووەم سەر لە بەیانی ڕۆیشتینە سەر گۆمێ دیار بوو گۆمێکی گەورە بوو داوەستا بوو، دیار نییە ئاوەکە لە کوێوە بۆی دێت کەچی هەمیشە پڕە. لەخوارەوەش جۆگاوێك ئاوی لەبەر دەڕوات، ئەو گۆمە ساردە زۆر ماری لە ناودابوو، لە تەنیشت گۆماوەکە کانیاوێك هەیە بەناوی (کانی بەگی)ئاوی ئەو کانیە زۆر ساردە لەئاوی بەفری ساردترەو بەناوبانگە بەساردی، سەردەمێك گەڕاینەوە دیاربوو لەدیوی میوانەکان سەماوەر داندرابوو، بەلاّم پیاوەکان چووبوونە نوێژ، کاتێك گەڕانەوە بۆ ڕەشماڵەکان پیاوێك لە پێشەوە دەڕۆیشت نەمناسی دوایی گوتیان ئەوە کاك (عەلی)یە لە شێخەکانی سەرانە، کاتێك دانیشت زۆر بەوردی سەیری ئەو مرۆڤەم دەکرد مرۆڤێکی سۆرو سپیو مۆرو زەرد بوو، دیار بوو کلی لە چاوان کردبوو بەلامەوە زۆر سەیر بوو چۆن پیاو کل دەکەنە چاو!!...

ئەو پیاوەی میوانمان بوو مرۆڤێکی ڕووخۆشی دەم بەزەردەخەنە بوو، لەدواییدا بەباوکمی گۆت: (سلێمان بەگ بەنیازم مرداوەکەی کانی کنێرێ ئەوەی دەکەوێتە سەر ڕێگای گەروی ڕەشمالاّن دەست کاریەکی تێدا بکەم هەندێ کۆلی تێ بەگرم لەداهاتوودا دەبێتە هاوارگەیەکی زۆرخۆش).

لەوەلاّمدا باوکم گۆتی: (کارێکی زۆر باشەو خێرە ئەوەی لەدەستم بێت منیش بەپێی توانا یارمەتیتان دەدەم، هیوادارم لەکارەکانتان سەرکەوتووبن)، دوای نیوەڕۆ کاك عەلی گەڕایەوە بۆ (سەران)، لەدوای دووسێ ڕۆژ باوکیشم گەڕایەوە بۆگوند. ئەوەی دەزاندرێت ڕەوشتی کوێستان ئەوەیە ناوە ناوە هەوارگە دەگۆرێت، سەردەمێك کە بینیم لەو هەواگەی لێی بوین کۆچباریان لێ ناو ڕۆشتنە هەوارگەی (سەرە نێر) هەوارگەی ناوبراو ئەوەندەی بڵێیت شوێنێکی هەڵکەوتووی دڵگیرە، لە بەرزاییەکە بەسەر چۆمو گوندی دەرگەڵەدا دەڕوانێت، ڕەشماڵیان لەنزیك گردە بەرزەکە هەڵدا لەتەنیشت ڕەشماڵ دارێکی (گێوژ)ی گەورەی لێ بوو، جۆگەی ئاوی بەژێردا دەڕۆیشت ئاوێکی سارد، بەردەوام دەنگی شۆڕەشۆڕی دەهات وەك ئاوازێکی دڵگیر گوێ بیستی

دەبوین، بێگومان لەملاو ئەولای ڕەشماڵی ئێمەش کۆمەڵێك ڕەشماڵی تر هەبون، خاوەن ئاژەڵەکانی (ڕەزانۆك) بوون، لەسەر گردە بەرزەکەی هەوارگەی (سەرەنێر) گۆڕی دوو خوشکی منی لێ بوو بەمندالی لەوێ مردونو لەوێ نێژراون، هەمنوو ساڵ ماوەیەك لەو هەوارگەیە دەماینەوە تا کاتی گەڕانەوە بۆ گوند، کاتێك سەرماو ساردی پەیدا دەبوو دەگەڕاینەوە، بەیانیەك هەستامەوە دیم ڕەشماڵ نەماوە کەلوپەلەکان پێچراونەتەوە پیاوەکان باریان بار دەکردن، کاتێك کۆچ کەوتە ڕێ سەرەو ژێر بۆ ناو چۆمی دەرگەڵە بارەکان یەك بەدوای یەکدا دەڕۆیشتین بەناو گەڵێدا دەرباز بووین بۆ سەرجۆی سۆرانو تێپەڕ بووین، کۆچ بارەکەیان لە(جیزان) خست، ئێوارەی ئەو ڕۆژە من لەگەڵ یەکێك لە پیاوان (عەلی شێرکاوەیی) ڕۆیشتینە ناو گوندی دەرگەڵە، لەسەرەتاوە ڕۆیشتینە دیوانخانەی میر (حمدامین بەگ) ناوبراو لای خۆی داینام، ئەو ماوەی لە سابات دانیشتبوین زۆر بەوردی سەیری دانیشتنی میرو ساباتم دەکرد، سابات لە شوێنێکی بڵند بوو، بەشی زۆری گوندی لێ دیاربوو سابات دوو سەکۆی درێژ مافوری لەسەر داخرابوون، سابات لەسەر چەند کۆڵەگەی بەرز وەستابوو توولانی مێو دای پۆشی بوو لەلای خوارەوە کورسی داندرابوون کورسی میر مێزەکی لە پێش بوو لایەکەی تریش مێزێکی گەورە داندرابوو سەماوەرێکی گەورەی لەسەربوو چاپەزی لە تەنیشت وەستا بوو، لەناوەندی سابات کانیاوێکی چوار گۆشەی پڕ لە ئاوی ڕۆن هەبوو، لە دەوروبەری سابات داری جۆراو جۆری بەری لە شێوەی باخچە هەبوو لەگەڵ جۆرەها گوڵ.

کاتێك لای میر هەستاین سەرماندا لەماڵی مامەکانم بەدرەنگەوە گەڕاینەوە (جیزان) بەیانی کۆچ بار کراو کاتێك بەسەرکەوتینە سەر زینی دەرگەڵە دیسان دیمەنە جوانەکانی کەوتنە بەرچاو زۆر بەئارەزووەوە سەیرم دەکرد، وەك جارەکانی پێشوو ڕێگایەکەی پێیدا هاتبوین پێیدا گەڕاینەوەو گەیشتینەوە گوند، پیاوەکان بارەکانیان لێ کردەوە دوای گەڕانەوەمان زۆری نەخایاند ڕەمەزان بەسەر داهات.

بۆ مانگی ڕەمەزانی ئەو ساڵە دیارە پیاوە پیرەکانی گوند داوایان لە سلێمان بەگ کردبوو چاودێری ئەو کەسانە بکرێت ئەوانەی ڕۆژو ناگرن سزا بدرێن ئەگەر بەدیارکەوت بەرۆژو نین، دیارە لە سەر خواستی پیرە پیاوەکان سلێمان بەگ لە مزگەوت بانگەوازێکی ڕاگەیاند کە هەندێ پیاو هەنە ڕۆژی ناگرن بەپێویست

دەزاندرێت ئەوەی ڕۆژی ناگرێ سزا بدرێت، بەپێی ئەو داواکاریە ئەو بانگەوازەی بەخەڵکی گوند ڕاگەیندرا، دیارە سلێمان بەگ بەتوندی چاودێری ئەو کەسانەی کردوە، ئەوانەی لێیان بەشك بوە ڕۆژو ناگرن، لە ناوەڕاستی ڕەمەزان ئاگاداری سلێمان بەگ دەکرێت کەوا (عەولاّ خووس)ی شوان بەڕۆژ دەڕواتە بەرزاییەکانی کێوی (هەندرێن) ڕۆژێك دەیبینن کەوا (قەلنە) دەکێشێو سەریشی خستۆتە ژێر کەپەنەكو بۆ ئەوەی دووکەڵەکەی دیار نەبێت کەچی دیتبویان دووکەڵی قەلنەی (مام عولاّ) لە گوێچکەکانی کەپەنەك وەك بۆڕی سۆبەدەردەچوو، زاندرا بوو مام عولاّ ئێواران کە نزیك دەکەوتەوە لە گوند کیسەو سەبیلەی لەناو کلاّوو جەمەدانی دەشاردەوە، دیارە ئەو زانیاریانە زۆر بەڕێكو پێکی بەسلێمان بەگ گەیشتوون، ناوبراو دەنێریتە دوای عەولاّ خووس لەو کاتەی مام عولاّ بەرەو دیوانخانە دەڕوات پێش بگاتە لای میر لا دەداتە ماڵی (شێخەی حاجی) داوا لە (پورە حەلیم) دایکی (ئیسماعیل) دەکات نانو دۆشاوەکی بداتێ (عەولاّ) گۆتبوی: (حەلیمە ستور) ئەو زاڵمە ناردیتی بەدوامدا دەزانم زۆر تورەیە شەڕو نیوە شەڕ هەریەکن لە براتە هەستە نانو دۆشاوەکم بدێ با تێری بخۆم پێش ئەوەی بڕۆمە بەر دەستی میر، دیارە لەسەر خواستی مام عولاّ پورە حەلیم نانو دۆشاوێکی زۆر پوختی داوەتێ ناوبراو تێر دەخواتو هەڵ دەستی دەڵێت: (حەلیم یارەبی بچیتە بەهەشتێ). دەڕواتە دیوان سەلام دەکات پێی دەڵێن دانیشە عەولاّ دانانیشی هەتا سلێمان بەگ خۆی پێی گۆتبوو (مالمۆك) دانیشە ئەوکاتە دادەنیشیت ئەوجا سلێمان بەگ لەگەڵی دەکەوێتە دوانو پێی دەڵێت: (عەولاّ ئەو پرسیارانەی لێت دەکەم ئەگەر ڕاستی بلێیت بەڵێن بێت هیچت پێ نەڵێم تەنانەت ئەگەر شتەکەش ڕاست بێت ئەوا سزات ناکەم، بەلاّم ئەگەر ڕاستی نەڵێیت دەزانی چیت لێ دەکەم؟!(.

عەولاّ: (میران بەسەری جەنابت ئەوەی وا بێت دەڵێم وایەو نای شارمەوە).

سلێمان بەگ: (عەولاّ بیستوومە دەڵێن تۆ ڕۆژێ لە چیا بەنهێنی لە بن کەپەنەك سەبیلە دەکێشیو ئێوارانیش کە لە گوند نیزیك دەکەویتەوە کیسەو سەبیلە لەناو کلاّوو جەمەدانی دەشاریتەوە، ئەمە ڕاستە؟)

عەولاَ:(میران خوا دەوامت بدات ئەوەکێ ئەو خەبەرەی بۆهێنای، یان مەلائیکەت پێیان گوتی، بەڵێ وەلاَهی دەق وایەو ڕاستە لە جەنابت ناشارمەوە چ ئەمرێکی بفەرمووی بەر ئەمرم).

سلێمان بەگ: (عەولاَ مادام ڕاستیت گوت برۆ، هیچت پێ ناڵێم، بەلاَم سزات دەدەم بەو مەرجەی چیدی ڕۆژوان نەخۆیت). عەولاَ دەڵێت بەڵێ، دەڕواتە دەرەوە، دەچیتەوە ماڵێ مام شێخە بەدایکی ئیسماعیل دەڵێت: (حەلیمە ستور ئەوا ئەو جارەش نەجاتم بوو بۆ جارێکی تریش خوا گەورەیە!).

دیارە (عەولاَ خووس) سزا درا بەبزنێك، ئەویش کراوەتە چێشتە جەژنی ڕەمەزانێ بۆ ئەو میوانانەی هاتبوونە جەژنانەی (سلێمان بەگ)، ڕۆژی جەژن گوندەکانی (دۆڵە منجەل، بەرسیرین، زێوە، کەورین) ئەوانی تریش هاتبوونە جەژنانەی (سلێمان بەگو مەلا صادیق)، لەو جەژنە خەڵکێکی زۆر داڕژابوونە گوندی ماویلیان، خەڵکێکی زۆری گوند بۆ ئاهەنگ گێڕان لە گۆڕستانی خوار کۆشکی ئێمە سەرگەرمی ڕەش بەڵەك بوون لە دارە گەورەکانیش جۆلانەیان هەڵ خستبوون شاییەکی زۆر گەورەیان دابەستبوو ئەو میوانانەی ئەو لاوانەی لەگەڵیان بوون دەستی شاییان گرتبوو ئاهەنگ تەواو ببوو، یەکێك لە میوانەکان گۆرانی دەگوتن، بەشێوەیەك شایی وەجۆش خستبوو، ئەوانەی خەریکی جۆلانەش بوون جۆلانەکانیان بەجێهێشتوو ڕۆیشتنە شایی، تا دەهات شایی گەرمتر دەبوو وای لێ هات بەشی زۆری خەڵکی گوندیش داڕژانە سەر گۆڕستان بەدوای دەنگی گۆرانی بێژەکەوە هاتبوون، شاییەکە ئەوەندە بەگەرمی دەکرا پیرەکانیش بەهەموو دڵیانەوە هەڵ دەپەڕین، دەنگی ئەو گۆرانی بێژە ئەو خەڵکەی تێکڕا هێنا بوە جۆشو دەستی شاییان گرتبوو.

## وەك ڕەوشتساڵی دووەمیش بەرەو کوێستان ڕۆیشتین

ساڵی دووەمیش لە ماویلیان کۆچ کەوتەڕێ بەرەوکوێستان، سەیری باربەرەکانم دەکرد، لەوکاتەی لە پێچاوپێچەکانی شینکی ماویلیان بەسەر دەکەوتنو وێنەیەکی زۆر جوان دەکەوتە بەچاو بەئارەزووەوە سەیرم دەکرد، هەر ئەوەندەم بینی یەکێك لە باربەرەکان هەڵدێراو گلۆز بووەوە خوار بەبارەکەیەوە، پیاوەکان بەپەلەوە بەدوای

کەوتن، بەلامەوە زۆر سەیر بوو لەو کاتەی گلۆز بوو لە پڕێکا لە دارێك گیر بوو بەدارە کەوە مایەوە پیاوەکان گەیشتنیّو یەکسەر بارەکەیان لیّ کردەوە، سەیر ئەوە بوو وەلاّخەکە هەستاوە هیچی لیّ نەهاتبوو ئەو دەمە بارەکەیان لیّ بارکردەوە بەسەریان خستەوە بەزەحمەتێکی زۆرەوە کۆچ لە شینك سەرکەوت بەهەمان ڕێگادا ڕۆیشتن، ئەوەی پێشان پێیدا دەڕۆیشتن هەتا گەیشتینە دووڕیانی گۆڕستانەکەی (مام شێخ هەمزە) ئەو جارە کۆچ لایدایە ئەو ڕێگایەی بۆ(سەران) دەڕۆیشت، دیار بوو لەسەر ڕاسپاردەی باوکم دەڕۆیشتنە هەوارگە نوێیەکەی (کانی کنێر) ئەو ڕێگایەی بۆ ئەو هەوارگەیە دەچوو زۆر ناهەموارو ناخۆش بوو، کاتێك سەرکەوتین‌و گەیشتینەجیّ دیار بوو شوێنێکی زۆر نارێك‌و سەخت بوو، هەوارگەی ناوبراو ئەوە بوو کە(کاك عەلی) سەرانەیی سازی کردبوو، کۆمەڵێك کۆلی داری دروست کردبوون‌و ئاویان دەڕژایە ناو بۆ خواردنەوەی مێگەلی مەڕو بزن، کەلە لەوەڕگا دەگەڕانەوە.

هەوارگەی (کانی کنێر) دەکەوێتە بەری (هەندرێن) بەدیوی کوێستانی (کارۆخ)دا لەخواروی گەروی سەران لە (گۆڕمێکوك) ڕێگایەك بۆ هەندرێن دەڕوات بەسەر دەکەوێتە گەرووی ڕەشمالاّن، دیوەکەی هەندرێن بەسەر دۆڵە منجەل دا دەڕوانیّ، لەوێوە کێوەکانی (زۆزك‌و سیرین‌و هەڵگۆرد)دیارن، هەروەها کوێستانی (بن کارۆخ‌و بەشی زۆری باڵەکایەتی‌و کێوی قەندیل)یش دیارن.

هەوارگەی کانی کنێر لە شوێنێکی هەڵدێرو نارێك بوو، بەلاّم ڕووی لە کێوە بەرزەکەی کارۆخ بوو تەواوی بەرباری کارۆخت لیّ دیارە هۆبەڕەشماڵەکان لە بەرچاون بەتایبەتی شەوان ئاگری هۆبەڕەشماڵەکان لە دورەوە دیارە، دیمەنێکی زێدە جوان دەکەوێتە بەرچاو، مرۆڤ بەئارەزووەوە سەیری دەکات ئەو دیدەنیەم هەردەم لە یادەو دەکەوێتەوە بەرچاوم.

لە دوای جێنشین بوون لە هەوارگە، ڕۆژێك لەگەل یەکێك لە چەکدارەکانمان (عەلی شێرکاوەیی) بەسەر کەوتینە گەرووی ڕەشمالاّن، لەوێوە سەیری (دۆڵە منجەل)مان دەکرد، ماویلیان ڕووبەڕوو بوو زۆر چاك دیاربوو خەڵك لەناو گوند هاتو چۆیان دەکرد دەمان بینی لەسەر (کانی گوێزی) مەلاکۆر ماینەکەی سلێمان بەگی دەشوشت.

هەوارگەی (کانی کنێر) خۆشیەکەی لەوەدا بوو شوێنەکەی بەرزبوو دەوروبەری دارو درختی چیایی هەمە جۆر بوو، شەوان گوێت لە دەنگی ئەو باڵندانە دەبێت کە شەوان دەخوێنن وەك (کوندە پەپۆو قەرەباشکە)و بەیانیانیش زوو پەپۆو بولبولو تۆپ تۆپەو قاسپەی کەو)ئاوازێکی خۆشت پێ دەبەخشن، جیا لەوەش شەوان ئاگری هۆبەڕەشماڵەکانو ئاگری هەوێزی شوانەکان لە هەموو کوێستانی بن کارۆخ دەبیندراو دەنگی چەمارۆی سەگەکانی نزیك دەبیسترا، ئەمە یادگاریەکی تۆمارکراوی مێشکی منداڵیەو لەیاد ناکرێت!

لە ناوەڕاستی هاوینی ئەوساڵەدا باوکم بەسەردان هاتە لامان، لەو شەوانەی لای ئێمە بوو شەوێك بەدرەنگەوە لە(گۆڕِ مێکوك) لە خوار گەرووی سەران نیزیك بەهەوارگەکەمان بوو بەهاتوو هاواری شوانو چەمارۆی سەگەکان، باوکم لە ڕەشماڵ دەرکەوت چەند گوللەیەکی تەقاندو زووبەزوو دوو چەکداری بەدوای هاوارەکەدا ناردن، بێگومان لەگەڵ دەنگی تەقە هەمووومان لە خەو هەستاین نەمان دەزانی ئەو هاوارە چییە!؟ هەتا لای بەیانی ئەوانەی بەدوای هاوارەکە دا چووبوون گەڕانەوە ئەوکاتە زاندرا کە هەرس (ورچ) بەناو مێگەلی (عەولاٚخوسی) ماویلی کەوتوونو زیانێکی زۆریان لێداوە، ئەوکارەساتە کرداری تاکە هەرسێك نەبوو، بەڵکو کرداری چەند هەرسێك بووە، ئەوەی ڕاستیە ئەوکارەساتەو ئەوکوشتارەی لەو مێگەلە بزنەی عەولاٚ خووس کرابوو جێگای سەر سوڕمان بوو!.

ئەوەی بەیادمە ئەوکاتەی باوکم هاتە سەردانمان لەهەوارگەی کانی کنێر (مام حەمەشریفو مەلا سمایل بێشوکی) لەگەڵ بوون، چەند ڕۆژ لەوێ مانەوە ڕۆژێك نیشانیان دانابوونەوە زۆریان تفەنگ هاویشتن، لەکاتی تەقە دەکرا هاشەی دەنگی تەقە لە کێوەکان دەنگی دەدایەوە زۆرم هاشەکە پێ خۆش بوو، باوکم لەگەڵ میوانەکان چەند ڕۆژێك مانەوە، شەوان هەتا درەنگ کاغەزانەیان دەکردو بەگاڵتە لەگەڵ (مەلا سمایل) ڕایان دەبوارد.

لە گەڕانەوەیان بەهەندرێن دا ڕۆیشتنەوە بەو نیازەی ڕاوی کێویەکان بکەن لەڕێگایاندا، ئەوە بوو لە دوای گەڕانەوەی ئەوان بەچەند ڕۆژێك لەگەڵ دایکم لە هەوارگە دابەزینە خوارەوە بۆ ناو دارستانی بنار، بەنیازی چنینی (گلوان) بۆ خۆش کردنی مەشکە لەگەڕانەوەمان درەنگ داهات تاریك داکەوتبوو، ڕێگا هەوراز بوو

بەسەر دەکەوتین بەرەو ماڵ دەگەڕاینەوە من لەپێشەوە دەڕۆیشتم کاتێك دیتم گیانەوەرێك لە ناوەندی ڕێگا دەجوڵێتەوە، زوو وەستام بەدایکم گوت: (دایە ئەوە چییە؟) وامزانی سیخورە! دایکم زوو گوتی: (کوڕە بگەڕێوە مارە، ماڵ وێران ئەوە ئەژدیهایە ڕێگای گرتوە!) لەگەڵ قیژاندنی دایکم یەکسەرگەڕامەوە دواوە زۆر دوور کەوتینەوەو لەڕێگا لاماندا و بەسەرکەوتین کەهەستی ئێمەی کرد دەستی کرد بەکیفە کیف، دیاربوو مارێکی زۆر گەورە بوو نەیدەتوانی بجولێتەوە، ئەو شەوە بەدرێژایی شەو مارەکە دەهاتە خەونم لێی ترسابووم، لەدوای ماوەیەك یەکێك لەچەکدارەکانی لامان مارەکەی کووشتبوو کە کوژرا ئەوکاتە زانرا کە زۆر گەورەیە.

سەرەتای پایز لە کوێستان بوو بەسەرما، لە کێوە بەرزەکان بەتایبەت لە کێوی کارۆخ دەنگی هاشەی با لە بەرزاییەکان لە گەڵی (خرێنە) دەهات بەیانیەك زوو کۆچ باری ماڵ گواستنەوە کەوتەڕێ کاتێك بەناو گەڵیدا دەڕۆیشتین بەسەر جۆی سۆراندا بەرەو(چنێران) ڕۆیشتین شەو لەنزیك ئاوی چنێران ماینەوە، بەیانی لەگەڵ گەزنگی هدتاو کۆچ باری کرد، لەو ڕێگایە دەڕۆیشتین ئەوەی جارەکانی پێشوو پێیدا دەڕۆیشتین گەڕاینەوە ماویلیان، ئەوەی دێتەوە یادم ئافرەتانی گوند دەهاتنە لای دایکم بەبۆنەی هاتنەوەی لە کوێستان منیشیان دەگرتە باوەش و ماچیان دەکردم لە دوایی وای لێهات خۆم دەشاردەوە لە دەستیان.

## بنەماڵەی شێخەکانی ماویلیان

ئەوەی زاندراوە (شێخ نەبی) کەناسراوە بە(پیری ماویلی) هەڵکەوتوی گوندی ماویلیان بووە، پیری ماویلی شێخێکی بەناوبانگ و ناسراوی دیاربووە، بەڵام وا دیارە شێخ لە گوندی خانەقا دانیشتوە ژیانی بەسەر بردوە، بەڵام کەس وکارەکانی لەماویلیان ژیاون، ئەوکاتەی ئێمە هاتینە ماویلیان تەنیا دوو منداڵی بنەماڵەی پیری ماویلی تازە پێگەیشتوو، پاش بابی ئەو بنەماڵە لەپیری ماویلی مابوون، هەردووکیان ئامۆزا بوون (شێخ تاهیرو شێخ قادر) تەمەنیان (١٣- ١٤) ساڵی دەبوو دەیان خوێند لەگەڵ فەقێیەکان لەلای (مەلاصادیق)ی مەلای گوندی ماویلیان، ئەو دوو لاوە لە بنەماڵەی پیری ماویلی بوون بابیان نەمابوو، هەریەکەی

ماڵی خۆی هەبوو، دایكیان بناوانیان بوون‌و چاودێریان دەكردن، ماڵی(شێخ تاهیر) نیزیك بوو لە ماڵی ئێمە، ماڵی (شێخ قادر) لەسەرووی گوند بوو، ئەو لاوانە هەڵكەوتوو خۆشەویست بوون ڕێزی زۆریان لێ دەگیرا لەناو كۆمەڵ ئەگەرچی گەنجیش بوون تاقانەی دایكەكانیان بوون.

دێتەوە یادم گەورەترین تاوانی بەدكاری لەگەڵ ئەو دوو تاقانەیە كرا، تاوانی ئەوها ڕووی نەداوە، شەوێك نیوەی شەو لە گوند بووە هات‌و هاوارو بانگ‌و ڕۆ ڕۆی دایكەكانیان، خەڵك دەڕۆیشتنە مزگەوت گوتیان لە حوجرە فەقێیان (شێخ تاهیرو شێخ قادر) كوژراون! ئەوەندەم بەبیرە چەكدارەكان بەگورجی ڕۆیشتن بەدوای ئەو فەقێیەی ڕای كردبوو فەقێی ڕاكردوو خەڵكی بادینان بوو لەگەڵ ئەوان لە حوجرە بوو، وا بەدیاركەوت لەو كاتەی خەڵك ڕۆیشتنە مزگەوت سەیر دەكەن لە حوجرەی فەقێیان (شێخ تاهیر) تەواو بوەو (شێخ قادر)یش بریندار بوەو بەبرینداری خۆی گەیاندۆتەوە ماڵیان، بەلام بەپەرۆشەوە ئەویش لە ڕێگای ڕواندز تەواو بوو!.

ئەوەی زاندرا كارەساتەكە بەو شێوە باس كراوەو دەڵێن، زیاد لەهەموو شەوێك ئەو دوو لاوە ئەو شەوە لە حوجرەی فەقێیان خەوتوون‌و لەوێ ماونەتەوە، ئەوشەوە تەنیا فەقێیەكی تریان لەگەڵ بوە بەناوی (فەقێ حەسن) خەڵكی بادینان بووە، كاتی نان خواردنی مەغرەب بەدرەنگەوە (حەمە حوسێن)ی چاپەزی میری دەرگەڵە دەڕواتە لایان شەو لەوێ ماوەتەوە، ناوبراو گوتویەتی: (من لەناڵەی شێخ تاهیر بەخەبەر هاتم لەناو دەستم دا تەواو بوو، شێخ قادریش بریندار بوو فەقێ حەسەنیش نەمابوو، هەر ئەوەندەم بۆ كرا شێخ قادرم گەیاندەوە ماڵیان‌و خەڵكەكەشمان لە گوند ئاگاداركردەوە ئەو كارەساتە خوێناویەمان پێ ڕاگەیاندن).

لەوكاتەی جەنازەكانیان لە ڕواندز گەڕاندەوە ماویلیان بۆ ئەو دوو شەهیدە لاوە زۆر بەپەرۆش بووم كوڵی پەرۆشی دڵی زۆر تەنگ كردم لە كاتێكدا دایكەكانیان شینیان بۆ دەگێڕان، بەتایبەتی كە جەنازەكانیان دەبردن بۆ سەر گۆڕستان‌و تێكڕای خەڵكی گوند بەپەرۆشەوە لەگەڵ جەنازەكانیان دەڕۆیشتن بەشین‌و گریانەوە ئەوەی دەنگی دایكە جەرگ سووتاوەكانی گوێ لێ دەبوو خۆی پێ ڕانەدەگیرا.

ئەو دوو شەهیدە لە گۆڕستانی نیزیك كۆشكی ئێمە بەخاك دەسپێردران، لە دوای ماوەیەك سەر پۆشێكی جوانیان لە سەر گۆڕەكانیان دروست كردن، خەڵكێكی زۆر دەرۆیشتنە سەر گۆڕەكانیان بۆ خواستنی مرادو داخوازی.

ئەوەی شایەنی باسە ئەو كارەساتە زۆر دڵتەزێنە بەراكردنی فەقێ بادینیەكەو ون بوونی داپۆشراو بێ دەنگی لێكرا، ئەو دوو لاوە بێ تاوانە ڕۆنایی چاوی دایكەكانیان بوون لە بەدكاری (فەقێ حەسەن) بەولاوە هیچ هۆیەك دیار نەبوو، ئەو دوو لاوەی پێ بكوژرێن. بەڵێ گەورەترین تاوان بوو دەرحەق ئەو دوولاوە ئەنجامدرا بەبێ ئەوەی بزاندرێت هۆی كوشتنی ئەو دوو جوانەمەرگە چی بوو؟ كێ بوو بەو تاوانە گەورەیە هەستا؟!.

وەك لەسەرەوە باسكراوە مەلای ئەو كاتەی گوندی ماویلیان (مەلا صادیق بوو كوڕی خەلیفە حارس)بوو ناوبراو مرۆڤێكی زۆر خۆشەویستو بەڕێز بووە لەناو كۆمەڵو جەماوەر بەشێوەیەكی گشتی، لەبەر ئەو ڕەوشتە بەرزەی لە دوایدا بوو بەشێخ، ناوبراو لە ماویلیان جێگای دیار بوو ڕێزێكی تایبەتی لە ناو خەڵك هەبوو، هەر ئەوەش بوو خەڵكێكی زۆری دەوروبەری ڕواندزو باڵەكایەتی ڕوویان كردبووە تەكیەی ئەو مرۆڤە هەست بەرزە.

(شێخ مەلا صادیق) مرۆڤێكی ڕاستو پاكی ئاینی بوو، بەڕاستی ئاین پەروەر بوو لە ئاین بەو لاوە مەرامێكی تری لە دڵ نەبوو، ناوو دەنگی بەربلاو بوو بەشێخ مەلا صادیقی ماویلی ناسرا.

كوڕە گەورەكەی (شێخ محمد) برادەرم بوو هەر پێكەوەش بووین بەسەربازی كۆماری كورد لەمەهاباد لەساڵی (١٩٤٦)دا، هەڵسوكەوتی محمد بەكوڕە شێخ نەدەچوو!.

## ساڵی ١٩٣٢ سلێمان بەگ چۆتە بەغدا

ئیسماعیل بەگی ڕواندزی لاوێكی تازە پێگەیشتووی بنەماڵەی پادشای ڕواندز بوو، تاقانەی ئەو بنەماڵە گەورەیە بوو، دەسەلاتداری ڕواندز بوو، ئەو كاتە لەلایەن كوڕی (نوری باویلی ڕواندز)ی تەقەی لێ كراو لە هەولێر بریندار كرا بۆ تیمار كردن

ڕۆیشتبوە بەغدا، لەوێ ناردبووی بەدوای سلێمان بەگ کە بڕواتە لای لە بەغدا، ناوبراو ڕۆیشتبوە بەغداو ماوەی سێ مانگ لای ئیسماعیل بەگ ماوەتەوە.

ئەوکات شەوان چەکدارەکان بۆ نۆبەت گرتن دەهاتنە ماڵمان (حەسەنی قەلاشی‌و سێمانی میشە گۆج)ی، ئەوانە ماڵ‌و منداڵیان هەبوو لەکاتی نۆبەت دەهاتن نۆبەتیان دەگرت‌و دەڕۆیشتنەوە ماڵیان، (مەلا کۆرو حوسێنی دەلۆو عەلی عەجەم) ئەوانە هەر لەناو ماڵ بوون‌و کارەکانی ناو ماڵیان دەڕۆیاند، عەلی عەجەم ئەوەندەی بڵێیت بەتواناو بەتێنو تاقەت بوو، لەگشت ڕوێکەوە ئیشوکارەکانی ماڵ ئەو پیاوە ڕای دەپەڕاندن، ئەوەی ئەو پیاوە دەیکرد کاری چەند کەسێك بوو بیکەن، ناوبراو مرۆڤێکی پتەوی تێك چەقی بوو خۆی لەکار نەدەشاردەوە.

شەوان کە دادەنیشتین لە زۆر ڕووەوە دەدوان، شەوێك کەباسی سلێمان بەگ زۆر گیر بوو لە بەغدا عەلی عەجەم بەدەنگ هات‌و گۆتی: (لەو نزیکانەدا سلێمان بەگ دەگەڕێتەوە پشتێنەکی کەسکی بەستوە، بەلاَم بگاتەوە جێ مەلا صادق ئەو پشتێنەی پێ دەگۆڕیت، لەبەر ئەوەی کەسك تەنیا ئەوەی سەید بێت دەی بەستێت)، ئەوانەی دانیشتبوون گاڵتەیان بەقسەی عەلی دەهات، بەلاَم چی گووت وا دەرچوو ئەو کاتەی سلێمان بەگ گەڕایەوە پشتێنی کەسك بوو، لەسەر داوای مەلا صادق پشتێنی فڕێ دا ئەوکاتە دەیان گووت(عەلی عەجەم) سیحربازە.

ئەوکاتەی لە بەغدا بوو زوو زوو دەیان ناردم برۆم بە(حەسەن)ی قەلاشی بڵێم بێتە ماڵمان کاریان پێیە، سەیری ئەو پیاوەم دەکرد ئەوەندە لەسەر خۆو شل‌و خاو بوو داگیرساندنی سەبیلەکەی ماوەیەکی درێژی دەویست، دونیا وێران بوبایە قەت خۆی شێلو نەدەکرد هەتا دەگەیشتە ماڵێ کاتێکی زۆری پێ دەچوو، جار جاریش دەچوومە ماڵی (مام سلێمان) دەمبینی کۆمەڵێك منداڵیان هەبوون لە تەمەنی من‌و هەورازتریش، هەموویان تێکڕا ڕووت‌و پێ خواس بوون، ئەوەش ئەوە دەگەێنێ (مام سلێمان) دەست کورت بوو هەر ئەوەندەی پێ دەکرا نانیان بۆ دابین بکات.

بەشی زۆری کاتم لەگەڵ (ئیسماعیل مامە شێخە) بەسەر دەبرد، زۆر جار دەڕۆیشتینە دەرەوەی گوند بەدوای بارەکەو زۆر لەماڵی ئەوان دەبووم، بەشی زۆری شەوانیش هەتا درەنگ لەماڵیان دەمامەوە، دەم بینی زۆر دەست کورت بوون ژیان‌و گوزەرانیان ناساز بوو ئەوەی هەیان بوو چیلك‌و کەرەکیان هەبوون خانوێکی گەورەی

نەسەر كۆڵەگە ڕاوەستاو چەند ناوبڕێكی تێدا كرابوو بەقیسپو تانۆك شوێنێك بۆ خۆیانو شوێنی كەرو چێڵو كەڵو پەلی ئاژەڵ بۆ كاو گیاو هێریش، ئەو ناوبڕەی بۆ خۆیان جیا كردبوەوە لەناوەندی ئاگردانێك هەبوو ئاگری تێدا دەكرایەوە، ئەو ئاگردانە لە جیاتی سۆبەو چراو چێشتی لەسەر لێ دەنرا، بەزستانیش لەدەوری دادەنیشتن ئەو دوكەڵەش لەبەری خانوو لەسەریەك كۆ دەبوەوە سەیری بەری خانووت دەكرد ڕەش دا دەگەڕا لولەكی پێدا شۆڕ دەبوونەوە ناوە ناوە دەكەوتن وات دەزانی ئاخۆ چی تەقیوەتەوە، جیا لەوەش لەدیوەكەی تری ناوبڕ چێڵ دەبەسترایەوە كاتێ میزی دەكرد پشكی بەوانە دەكەوت كە لەدەوری ئاگردانەكە دادەنیشتن، هەرتەنیا ماڵی مامە شێخەوانەبوو، بەڵكو گوند تێكڕا ئەوهابوو، خەڵك وەها دەژیان.

## صۆفی سلێمان لەداری قەبرستانێ دەبەسترێتەوە

زاندرا (صۆفی سلێمان) كە مجێوری مزگەوت بوو لەگەڵ (حوسێنی دەلۆ) كە یەكێك بوو لە چەكدارەكانی سلێمان بەگ بەقرە دێتو (پەنگر كێش)* ێك لەسەری حوسێن دەدات سەری دەشكێت، ڕۆژێكی زستانی دژوار باو كرێوە بوو صۆفی لە داری قەبریستان دەبەستنەوە، بەڕێكەوت من لەگەڵ كوڕی شوانی لە دەرەوەی گوند بووین، زۆر تەڕ ببوم لە دیواخانە لە تەنیشت سۆبەدرێژ ببوم، كاتێك لە دەنگە دەنگی پیاوان بەئاگا هاتم دیتم كۆمەڵێك لە پیاوە ڕیش سپیەكانی گوند دانیشتبوون چاوەڕێی سلێمان بەگ بوون بێتە دیواخانە زوو هەستام بەخێر هاتنم لێ كردن چوومە دەرەوە دیتم ئافرەتێك منداڵێكی بەباوەشەوە بەو سەرمایە دەیویست بڕواتە ماڵمان لە ترسی سەگەكان نەی دەوێرا بڕوات زوو دەربازم كرد، ئافرەتەكە دەگریا، دیاربوو دایكم بەخێری هێناو دانیشت، بەدایكم گوت ئەوەچی بەسەر هاتوە؟ دایكم گوتی نابینی مێردیان لە داری قەبریستانێ بەستۆتەوە؟. لەگەڵ قسەكانی دایكم ڕۆیشتم سەیری قەبرستانم كرد، باو كرێوەیەك بوو كەس خۆی پێ ڕانەدەگیرا بینیم چۆن بەگوریس لە دار بەستراوەتەوە.

---

*پەنگر كێش: واتا مقاش

کاتێك گەڕامەوە لای دایکم پرسیم دایە ئەوە بۆچی بەو سەرمایە بەستراوەتەوە ئەدی نامریت؟ دایکم گوتی کورِم خوا ڕوحمی پێ دەکات، بەدرەنگەوە لەسەر خواستی ڕیش سپیەکانی گوند لە داری قەبرستان کرایەوەو خرا تەویلەی وەلآغەکان ئەو شەوە لە تەویلە بەند بوو بەیانی بەربوو لەسەر داوای (خەجە درێژی ژنی حمدە ڕەشی).

## بۆجاری دووەم لەسەر خواستی ئیسماعیل بەگ باوکم چووە بەغدا

لەبەهاری ١٩٣٣دالەسەر خواستی(ئیسماعیل بەگ)، (سلێمان بەگ) دەڕواتەوە بەغدا لەدوای ڕۆیشتنی باوکم بۆبەغدا مام میرۆ هاتە ماویلیان لە گەڕانەوەی بۆ دەرگەڵە منیشی لەگەڵ خۆی بردم چەند ڕۆژێك لەوێ ماوە، شەوێك لەگەڵ خۆی بردمی ڕۆیشتمە دیوانخانەی (میر حمدامین بەگ) ئەوەی دێتەوە یادم مانگە شەوبوو، سەردەمێك لەدیوان دەرکەوتمە سەربانی پێش دەرگای دیوانخانە لەوێوە بەشی زۆری گوند دیاربوو دیدارێکی ئەوەندە جوانی چۆمی پڕلە گوێزو ئەسپینداری ئاوەڕێژ دەکەوتە بەرچاو هەردەم شایانی یادکردنەوەیە، ئەوەی زۆر دڵی شادکردم ئەوە بوو گوند بێدەنگ بوو تەنیا هاشەی سۆلاوی ئاوی ئاوەڕێژ دەهات، ئەوەندە دڵگیر بوو وەك شریتی تۆمارکراو هەرکاتێ دێتەوەیادم وا دەزانم لەهەمان شوێن وەستاوم، ئەودیمەنەی دیتبوم ئەوها دەکەوێتەوە بەرچاوم، دڵم بێ گوشاد دەبێت یادێکی زیندووی دەکەمەوە، دوای ماوەیەك لەگەڵ حاجی غەریب گەڕامەوە ماڵ.

## ڕاگەیاندنێکی بەپەرۆشی دڵتەزێن

وەك لەسەرەوە دیاری کراوە لەسەرخواستی (ئیسماعیل بەگ)، (سلیمان بەگ) گەڕایەوە بەغدا، لەهاوینی (١٩٣٣) لەپڕێکا دەنگوباسێکی دڵتەزێن دەگاتە دەرگەڵە بەکەسوکاری (سلێمان بەگ) ڕادەگات کە لەبۆسەیەکی دوژمنکاری

لەدۆڵی (نیشاوێ)[*] (ئیسماعیل بەگو سلێمان بەگ) کوژراون. لێرەدا خوێنەدەوارانی بەڕێز ئاگادار دەکەمەوە دەربارەی ئەو کارەساتە دڵتەزێنە لە مێژووی باوکم بەدرێژی لە کتێبەکەی دەرگەڵەو بنەماڵەی میرەکان نوسراوەو دیار کراوە. یادی ئەو ڕۆژەم دێتەوە بیر، بەیانیەك زۆر زوو بوو خەڵکێکی زۆر لە ژنو منداڵ لەدەرگەڵە ڕا بەهاوارو شینو گریان هاتبوونە ماویلیان بەدوای ئەو هاوارە دڵتەزێنەدا، دیار بوو دەستە دەستە چەکدار بەرەو ڕواندز دەڕۆیشتن زۆری نەخایاند (میر حمدامین بەگ) بەسواری وەڵاغ دەهات گەیشتە نزیك قەڵات، بەغار چوومە پێشی پێم گوت: (باپیر دەچی بابم بینیەوە؟!) ئەوەی بەیادمە میر دەستە سرەکەی لەبەر پشتی دەرهێناو چاوی پێ دەسرینەوەو بە(فەتاح ماویلی) گوت هەڵی گرە بیبەوە. لەدوای ئەوەی ئەوان بەرەو ڕواندز ڕۆیشتن بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە ڕاگەیاندرا کە(سلێمان بەگ) بریندارە نەکوژراوە بۆ بەیانی ئەو خەڵکەی لە دەرگەڵە هاتبوون بۆ ماویلیان گەڕانەوە، دیارە لە دەرگەڵە گۆڕیان بۆ هەڵکەندبوو ئامادەکرابوو، بەڵام کاتێك دەنگ گەیشت (سلێمان بەگ) نە کوژراوە سەریان داپۆشی، ماوەیەکی زۆر بەداپۆشراوی مایەوە لە دواییدا پیاوێکی ناوداری شۆڕشی (شێخ سەعیدی پیران) بەناوی (جەلال بەگ) کە ئاوارەبوو لە دەرگەڵە مرد باوکم ڕێگایدا ئەو پیاوەی لە ناودا بنێژن.

بێگومان ماوەیەکی زۆر شین بۆ (ئیسماعیل بەگ) داندراو خەڵکێکی زۆر لەو شینە بەشداریان کرد، بەدیارکەوت نەمانی ئەو پیاوە زیانێکی زۆری بەخشی.

ئەوەی دیار بوو باوکم بەچەندگوللەیەك برینداربوو، ماوەیەکی درێژ لە نەخۆشخانەکانی موصلو بەغداد خەریکی تیمارکردنی برینەکانی بوو، هەتا مردیش گوللەیەك لەناو ڕانیدا مایەوە زیاتر لە سیوپێنج ساڵ.

لەوکاتەی لە سۆڤیەت بووین باوکم شتێکی بۆ باس کردم دەربارەی (ئیسماعیل بەگ) گوتی: (ئەو مرۆڤە یانی ئیسماعیل بەگ بەنیاز بوو ئەو سەفەرەی دەگەڕاینەوە ڕواندز لەگەڵ ماڵی (نوری باویل ئاغا) پێك بێتەوەو خوینیان بداتیو ماڵیشی لە ڕواندز بگوازیتەوە هەولێر، بەڵام پێ ڕانەگەیشت ئەو کارەساتە ڕوویدا، ئەو مرۆڤە

---

[*] دۆڵی نیشاوێ دەکەوێتە نێوان گوندی کەڵەکینو شارۆچکەی خەلیفان.

بەنیازی کۆمەڵێك پرۆژە بوو ئەگەر بمابایە. ئەگەرچی دایکی زۆر شتی لێ تێك دابوو بەدوای قسەی نەدەهات، وەك هەستم کرد وا دیاربوو ئەوجارە خەریك بوو گوێی نەداتێ‌و بەدوای قسەی نەکەوێت کارەکانی وەك پێویست ئەنجام بدات.

بەگۆتەی باوکم (ئیسماعیل بەگ) گەنجێکی پێ گەیشتوو بوو پێی خۆش بوو پەیوەندی لەگەڵ خزمەکانی هەبێت‌و بەتێبینی بێت بەبەردەوامی، بەلاّم دایکی رێی لێ گرتبوو نەی دەهێشت ئەو پەیوەندیە هەبێت.

لە دوای نەمانی ئەو مرۆڤە هەڵکەوتوە، ئەو هەموو سەروەتەی ماڵی پادشا کەوتە ژێر دەستی پیرەژنێك، لە دوای نەمانی ئەویش ئەو هەموو موڵك و سامانەکە تەڕاو بەرِا کراو بێ سەرو شوێن بوو تەواوی دەشتی هەریرو باتاس لەگەڵ دەشتی رواندزو دیانا هی ماڵی پاشا بوون.

باوکم دەڵێت: لە دادگا بڕیار درا (نوریو خدری حمدە شینی) لە سێدارە بدرێن، مەلیك (فەیسەل) ئیمزای نەکرد، جاری سێیەم بڕیاری لە سێدارە درانیان درا مەلیك (فەیسەل) هەر رازی نەبوو ئەوە بوو بەموئەبەد بەندکرانو دواییش بەردران.

(حازم بەگی) زاخۆیی لەگەڵ (ئیسماعیل بەگ) نائب بوو، زۆر دۆست بوین گۆتبوی: (مەلیك فەیسەل زۆر نارازی بوو لە ئیسماعیل بەگی رواندزی).

## بەیەکجاری ماڵمان لەماویلیانەوە گواستەوە دەرگەڵە

لەسەرەوە نووسراوە لەسەر خواستی ریش سپیەکانی ماویلیان (سلێمان بەگ) رۆیشتۆتە ماویلیان دیارە ماوەیەکی تەواو لەوێ ئاغای ئەو گوندە بووە، لە ئەنجامی سەرهەڵدانی هەندێ ناکۆکی نێوان (سلێمان بەگ)و ماویلیەکان بەوە گەیشت (سلێمان بەگ) بگەرێتەوە دەرگەڵە، شوێنی بابو باپیرەکانی.

ئەو ساڵەی گەرِاینەوە دەرگەڵە هاوین بوو، کەپرو ساباتێکیان بۆ کردین لەناو باخچەی (مستەفا بەگ) لە بەری گەرەکی گوند لە نزیك (کانی ئەحمەد بەگ) جێگای کەپرو سابات ئەوەندەی بڵێیت خۆش بوو لەژێر سێبەری دار گوێزە گەورەکان، ئەوەی دەمەوێت لێی بدوێم ئەوەیە گەرِانەوەی ماڵمان بۆ دەرگەڵە گۆڕانکاریەکی زۆری پێوە دیاربوو ئەوەی پێشان بۆمان دەکرا لەوە بەدوا بۆمان ناکرێ ئەو بەروو

داهاتەی دەهات لەمەودوا نایێت، ئەوەی جاران بۆت دەکرا دەبێ ئێستا بەخۆت بیکەی!.

ئەوساڵەی گەڕاینەوە دەرگەڵە بەڕێکەوت ئەوساڵە مازی زۆر بوون، وەك ڕەوشت پێش بەردانە مازی زۆر کەس دەڕۆیشتنە چیا بۆ دەست نیشان کردنی مازی دیارە، هەر بەونیازەش فەقێیەکانی خەڵکی دەرگەڵە(فەقی ئەحمەدی وەستا قادریو فقێ خدری حاجی حمدامینو فقێ حەسەنی جۆلاً) کەوتبونە ڕێ بەرەو دارستانی دەووروبەری (کانی داوەری)، گۆیا بۆ بەسەرکردنەوەی مازو هاتون، لەوکاتەی ئەوان بەسەر دەکەوتن من چوو بووم چڵو بۆکاوڕ بێنم، لە دوورەوە ئەوانم بینی خۆم لە ناو تەڕاشێك پەنادا بۆ ئەوەی نەمبینن دەبێ ئەوە بڵێم ئەوان زۆر لەمن گەورە تربوون ئەوان لە تەمەنی چوارده پازده ساڵی دا بوون من لەتەمەنی حەوت هەشت ساڵیدا بووم ئەوان بەپێکەنین هەوراز دەهاتن کاتێك گەیشتنە ناو دارە گەورەکان سەیری دارەکانیان دەکرد(فقێ ئەحمەد) بانگی کرد: (کوڕە وەرن سەیری ئەو دارە بکەن ئەوەندەی مازو پێوەن، مەگەر قەدەکانی بیڕین ئەگینا زۆر زەحمەتە چنینی)، دیاربوو لە ژێرەوە دیتیان مازی زۆر پێوەن دەستیان کرد بەمازی کردن بەبێ ئەوەی ڕێزی قەدەغە بەگرنو قەدەغەیان شکاندو ڕەوشت ویاسای گوندو کۆمەڵگەیان بەبیر نەبوو دەستیان کرد بەمازی کردن لەوکاتەی سەرگەرمی مازی کردن بوون بەدەنگێکی ناشاز بانگم کردن هۆهۆ (فقێ ئەحمەد)، ناوبراو کەمێك گوێی ڕاگرت جارێکی تریش بانگم کرد، ئەوجارەی بانگی ئەوانی تریشم کرد دیاربوو هەستیان ڕاگرت دیتیان کەس دیار نییە جارێکی دیکە بانگم کرد کوڕە (فقێ ئەحمەد) زۆر بەئاڵۆزی بەوانی تری گۆت: کوڕینە بەقورعان ئەوە دێوەزمۆکەیە!!... هەرئەوەندەم بینی (فقێ خدر) لە سەرداریێ خۆی فڕێدایە خوارەوە سەرەو ژێر هەلاتنە خوارەوە کەس بەکەس ڕانەدەگەیشت ئەوها ڕایان دەکرد لە دووسێ جێگا سەرپەلۆیان دەبردو لەپو لەپ دەکەوتنە خوارەوە، ئەوەندەم گوێ لێ بوو (فقێ ئەحمەد) بەوانی تری گۆت: (کوڕە دۆخینتان بکەنەوە)، بەلاّم ئەوەی دیاربوو دۆخینو هیچیان بەبیر نەمابوو لە هەلاتن بەدەر، ئەوەی هەلاتنی ئەوانی بینی بوایە دەتگۆت ئەوانە دەبێ چیان لێ قەوما بێت ئەوها ڕادەکەن، بەشێوەیەك ڕایان دەکرد (مەلاسید) دیتبورنی چۆن هەڵدەهاتن!.

لەدوای هەلاتنی ئەوان بەدوای شوێنی ئەواندا ڕۆیشتم ئەو مازوانەی لێیان ڕژابوون هەموویانم کۆکردنەوەو گەڕامەوە گوند (فقێ ئەحمەد)م دیت لە بەردەرگای مزگەوت پێم گۆت: (بۆ ئەوها هەلاتن لە کانی عروسان ئاوڕێکتان لە دوای خۆتان نەدایەوە؟!.

(فەقێ ئەحمەد) گوتی: بۆ تۆ لەکوێ بووی؟ گوتم من لە(کانی داوەری) لەسەر دارێك مازوم دەچنین. (فەقێ ئەحمەد) ئەوەندە بەقیتو قۆزی وەلامی دامەوەو گۆتی: (بۆ ئەگەر تۆ گوێت لەدەنگی کابووس بیت بەناوی خۆت بانگت بکات ڕاناکەیت؟!).

لەقاقای پێکەنینم داو گۆتم: کوڕە کابوسی چیو تەڕەماشی چی من بووم ئەوسێ زەلامەم تووشی هەلاتنێکی واکرد هەتا مردن ئەو ترسەیان لەبیر نەچێتەوە، ئەگەر باوەڕیش ناکەن ئەوە ئەو مازوانەی لێتان ڕژابوون هەمووم کۆکردنەوە، باسی ئەوەم بۆ کردن چۆن هاتنو چیان کردو چۆن هەلاتن، چەند سەرپەلۆیان بردنو کەوتنەخوارەوە زۆر بەوردی ڕوداوەکەم بۆ گێڕانەوە ئەوجارە گۆتی وەلّلا وایە.

دەنگ بلاوبۆوە کە زرار فەقێیەکانی ترساندون لە(کانی داوەری) هەر لەوێوە هەلاتوون کەسیان بەکەس ڕانەگەیشتوون هەتا ناوگوند هەلاتوون.

بۆ پایز مالّمان گواستراوە گەڕەکی سەرباسکی لە دەرگەلّە، ڕۆیشتینە ناو خانوەکانی (خەلیفە خدر بەگ)و جێنشین بووین، دوای جێنشین بوون بەچەند ڕۆژێك جەژنی ڕەمەزانی بەسەردا هات، خەلّکی گوند بۆ ئاهەنگ گێڕان تێکڕا ڕژانە ناو گۆڕستانی (ئاوەڕێژ) ئاهەنگ گێڕان خەریکی شاییو ڕەش بەلّەك بوون هەندێکیان خەریکی جۆلانە بوون لەگەرمەی بەزم و ڕەش بەلّکدا ڕاسپاردەی (میر محمد شریف بەگ) کوڕەکەی میر خۆی هاتوو ڕای گەیاند ڕەش بەلّەك نەکەن شێخو مەلا زادەکانی دۆلّ ماوانو بەردگردکەو سەردرەوخانەقا میوانی میرن هەتا ئەوان دەڕۆن ڕەش بەلّەك تێك دەن!!

بەڕاسپاردراوەکەیان گۆت: برۆ شایی ناکەین، کەچی ڕاسپاردراوەکە نەگەیشتە ناو گوێزەکان ڕەش بەلّەك دەستی پێکردەوە، زۆر لە پێشان گەرمتر زۆری پێ نەچوو (محمد شریف بەگ) هاتەوە گۆیا شایی تێك بدات، بەلام لە دورەوە دەستمالّی دەرهێنا دەستی سەرچۆپی گرتو دەیگوت بکوتن میوانەکانی میر سەرگەرمی چای خواردنەوەن.

ئێوارە ئاهەنگ گواستراوە دیوی (دەرشکەفتان)، لەژێر گوێزەکان شایی دەکرا، ئاهەنگی ئەو جەژنە سێ ڕۆژ درێژەی کێشا، لەو سەردەمەدا ئاستی گوزەران نزم بوو، بەڵام شادیو خۆشیو بێ غەمی کەمتر بوو ئەوەش وا دەگەێنێ خەڵك لەگەڵ یەك دڵ پاكو بێ غەرەز تربوون، ڕێزی یەكتریان دەگرتو خۆشەویستی زیاتر بوو.

لێرەدا باری گران دەكەوێتە سەرشانی من لەوەرزی زستان (ئەحمەدی خەدیجە كەر) مرۆڤێكی فەقیر بوو دیار كرابوو داری سووتەمەنیمان بۆ بهێنێ، بەیانیان دەهات لەماڵ هێستری دەبرد بارە دارێكی بۆ دەهێناینو دەڕۆیشتەوە، بەخێو كردنی هێسترو ماین كەوتبوە سەرشانی من، زستانی ئەو ساڵە زۆر دژوار بوو بەفر زۆر باری ڕێگایەكان گیران بۆ ماوەیەك، ئەو ماوەیە دەبوایە وەڵاغەكان چاودێری بكرێن.

وەرزی زستان بەسەر چوو وەرزی بەهار هات سەردەمی چونە دەرە بەتایبەت لەو گوندانەی دەكەونە نێو كێوەكان و بناری كێوەكان، دانیشتوانی ئەو گوندانە هەر لەسەرەتای بەهار بەشی زۆری ڕۆژەكانیان لە دەردوەی گوند لە قەدپاڵی چیا بەسەر دەبرد، بەدوای خواردەمەنیەكانی وەرزی بەهاردا دەگەڕان كەلەلای خۆمان پێی دەگوترێت (كەوش) ئەو كەوشەش پێك هاتوەو لە(كەنگرو ڕێواسو كوارگ)و شتی تریش.

لەوەرزی هاوینیشدا سەرگەرمی كۆكردنەوەی دانەوێڵەو بەرووبوومی باخچەكان دەبوون، بۆ بەردانە مازیش چەند ڕۆژێك خەڵك بەكۆمەڵ دەڕۆیشتنە مازی چنین.

لەوەرزی پایزدا بەشێكی زۆری خەڵك بەدوای (قەزوانو گێوژو بەڕوو) دا دەگەڕانو كۆیان دەكردنەوەو ڕۆژیان بەسەر دەبرد.

لەسەرەتای بەهار لەگەڵ هاتنی ئەو وەرزەو بارینی بارانی بەخوڕ بەفری قەدپاڵی كێوەكان دەتوێتەوەو كەندو دۆڵو شیوەكان ئاوی بەفراویان پێدا دەڕژێتە خوار، گوڵزاری سروشتی بەر ڕۆژو نزارەكانو بەرزاییەكان دەڕازێنێتەوە، دانیشتوانی گوندەكان دەكەونە جموجۆڵ، بۆ هەروەدەری بەهاری ئەوساڵە ڕۆژێك تێكڕای (كارد)ی كەرانی گوندی دەرگەڵە لە گوند دەركەوتن دەڕۆیشتنە ڕاوو كاردی كاتێك سەیری ڕێگای چنێرانم كرد بەڕای خۆم وا بوو كەس لە گوند نەماوە هەموویان دەركەوتوون وا بەرەو (هەندرێن) دەڕۆن هەركەس توورەكەی بەشانەوەیە وا لەهەورازی چنێران سەردەكەون سەرەتای گەیشتبوە (گۆڕێ شایی) پێش ڕەوەكانی پێشەوە لە گۆڕی

شایی دایان بەستە شایی هەتا ئەوانی تریان گەیشتنێ ئەو کاتە دەستە دەستە بەرەو زینی دەرگەڵە سەرکەوتن، لەسەر زینی تیپە شاییەك کراو ئەوجا کەوتنە ڕێ بەبناری (هەندرێن) دا تێپەڕچوون لەناو دارستاندا بلاو بوون هەریەکەی بۆ لایەك بەنیازی کۆکردنەوەی کاردی بەلاّم پێش بلاّوە بکەن شوێنی بەیەك گەیشتنەوەی نیوەڕۆ دیاری کرا ئەوەی، جێگای یاد کردنەوەیەو بەردەوام دێتەوە یادم ئەوەیە لەدڵی خۆمدا کچێکم خۆش دەویست واشم هەست دەکرد ئەویش منی خۆش دەوێت، کەچی ئەوەندەی دەمکرد نەمدەتوانی ڕاستەوخۆ بیدوێنمو مەرامی دڵمی پێ بڵێم لەوکاتەی کاردی کەرەکان بلاّوەیان کردبەهەڵم زانی چاودێری کچە بکەم بۆ کوێ دەڕۆیشت وردە وردە لابەلا بەدوایدا ڕۆیشتم سەردەمێك بۆم هەڵکەوت لێی نزیك کەوتمەوە بەیەك گەیشتین‌وکەوتینەئاخاوتن، لەوئاخاوتنە توانیم مەرامی خۆمی پێ ڕابەگەیێنم ئەویش مەرامی ئەوەبوو بەیەك بگەین، لەو بەیەك گەیشتنەمان تەواو ڕێك کەوتین دڵمان یەك بوو، لە دوای ئەو دڵ خۆشیەدا هەریەکەی بەلایەکدا ڕۆیشتین بەرەو ئەو شوێنەی دیار یکرابوو نیوەوڕۆ لێی کۆببینەوە.

ئەوەی شایەنی لێ دوانە ئەوەیە ئەو ڕۆژەی قەدپاڵی (هندرێن) بەڕۆژێکی یادگاری مێژوویی دڵ خۆشی خۆمی دەژمێرم، لەو ڕۆژەدا بوو توانیم مەرامم بەڕێکی بەدی بێنم لەگەڵ خۆشەویستەکەم، ئەگەرچی هەردووکمان بچوك بووین لەگەڵ ئەوەش دڵمان لەگەڵ یەك بوو، لەو ڕۆژەدا ئارەزووی هەردووکمان یەکی گرتەوە.

ئەو ڕۆژەی ناو دارستانی کێوی (هەندرێن) پڕ بوو لە کاردیکەران لە هەموو کەندو دۆڵو باسکێك دەنگی لاوان تێك هەلاّوی یەکتربوون، هەریەکەی بەئارەزووی خۆی گۆرانی دەگۆتن لە هەموو شوێنێك گوێ بیستی ئاوازی ناسکی کچە دەنگ خۆشەکان دەبووم. شایانی ئەوەیە بڵێم ئەو ڕۆژە یادێکی تایبەت بوولە ژیانی مندا.

خۆشی هەروەدەری* بەهاران لەوەدایە زیاتر بۆ خۆشی‌و ڕابواردن دەڕۆنە کەوش، ئەوانەی دەڕۆنە چیا دەبینی هەرچەند کەسێك بەیەك دەگەن تێلەکەکانیان دادەنێن‌و دەستی یەکتر دەگرن‌و دەست دەکەن بەشایی.

---

* هەروەدەری: چوونە دەر لەبەهاران.

ئەوەی زۆر جوانە ئێواران کە دەگەڕێنەوە هەریەکەی چەپکێك گوڵی شلێر دەخاتە ناو تێلەکەکانیان کە نیشانەی کاردی کەرانە.

وەك لە سەرەوە نوسراوە لەگەڵ گواستنەوەی ماڵمان لە ماویلیان وردە وردە کارەکانی ماڵ بەرەو پەشێوی دەڕۆیشت، ئەوەی دیاریدە بوو باری گران لەسەر شانی من زیاد دەبوو لە دوای ئەوەی باوکم مێگەلی مەڕی بەشوانی دا بیست سەر بزنی بۆ دۆی ماڵ گێڕایەوە، بردمانە لای شوانی گوند (قادر خلیل)کەبە(قادرە لاڵ) ناسرابوو بزنەکانمان بەئەو سپاردن. لە سەرەتای هاویندا ڕۆژێك بیری ڕایگەیاند کەوا دوو بزن دیار نین، بەشوان گۆترابوو گوتبوی دەڕۆمەوە شوێنی دوێنێ، دەیان دۆزمەوە دیارە بەجێ ماون، دوو سێ ڕۆژ بزنەکان نەدۆزرانەوە بێ سەرو شوێن بوون، شوان گۆتبوی یەکێکم لەگەڵ بێت بەیانی بزنەگەل بێنێتەوە گوند من دەڕۆمە ناو مێگەلەکانی بن کارۆخ، بەڵکو سەر پەڕ بووبن لەسەر خواستی شوان ئێوارە لەگەڵی چووم، ئێوارە درەنگ بوو لەگەڵی سەرەوە دەرکەوتین کاتێك گەیشتینە ناو گۆڕستانی (مام شێخ هەمزە) بزنە گەل بەبناری کێوی هەندرێن دا بەدیوی بن کارۆخ بەلەوەڕ دەڕۆیشت ڕوو لە (برێشك) تەواو تاریك داکەوت بزنە گەل بەناو گیا بەرزەکانی قەد پاڵی چیا سەر دەکەوت ببوە چرپە چرپ وات دەزانی ئاخۆ چییە؟

ئەوەی بەلامەوە زۆر سەیر بوو دەنگی باڵندەکانی بەشەو دەخوێنن گوێ بیست دەبووم هەستم ڕا دەگرت نەمدەزانی کە باڵندەن، وامدەزانی دڕندەیە، دوایی لە شوانم پرسی قادر ئەوە دەنگی چییە دێت؟ گوتی دەنگی مەڕە دێت؟ شوان کەمێك زمانی لەنگ بوو تێ دەگیرا گوتی: کو نازانی دەنگی چییە؟ هەر ئەو جارەت گوێ لە دەنگی ئەوها بووە؟ گوتم ئەرێ وەڵلا یەکەم جارە ئەو هۆرەم گوێ لێ بێت ئەو دەنگە زۆر سەیرە وەك دەنگی مەڕ وایە؟ شوان پێکەنیو گوتی: ئەوە قەرەباشکەیە، ئەو قەرە باشکە بەچەند جۆرێك دەخوێنن، وەك شوان فیتە فیت دەکات، وەك مەڕ بارە بارە دەکات جۆری تریش دەخوێنێ.

بەدرەنگەوە گەیشتینە بن چیا (قادر) بزنەگەلی کۆکردەوە شوێنێك، گۆتی: ئێرە هەوێزە یانی مۆڵگەی شەو، ئەوەی بەلامەوە زۆر سەیر بوو ئەوەبوو ئەو بزنە گەلە وات دەزانی بەدەم پێیان دەلێن هەریەکەی جێگایەك بۆ خۆی خۆشبکات بۆ نووستن دیارە هەر لەوە شەوە دەڵێن: بزن بۆ شەوێك جێگای خۆی خۆش دەکات.

کاتێك مێگەل لە هەوێز مۆڵ بوو، شوان بەپەلە ڕۆیشت بارەشێك داری وشكو هەندێ چیلكو گەلاو کرشی هێناو زوو ئاگرێکی کردەوە، دیار بوو ئاگر خۆش بوو، شوان لە تەنیشت ئاگر خۆی لەناو کەپەنەك لوول داو لە دوای ماوەیەك هەستا چوو دوو مۆرە داری ئەستوری هێناو داینایە سەر ئاگر، ڕۆیشتەوە ناو کەپەنەك بەمنیشی گوت ئەتۆش جێگایەك بۆخۆت خۆش بکەو بنوو هەتا بەیانی.

لەلایەکی ئاگرەکە منیش شوێنێکم خۆش کرد، بەردێکم خستە ژێر سەرم خەوم لێ کەوت، کاتێك ئەوەندەم زانی سەگەکان زۆر بەئالۆزی چەمارۆیان بردە پشتی هەوێز لەگەڵ دەنگی سەگەکان شوان سەری بەرز کردەوە بەدەنگێکی بەرز تانی سەگەکانی دەدا دەیگۆت: ئۆیها. وەڵا ئەوشەو دەعبا هەنە بۆیە سەگەکان ئەوەندە ئالۆزن!.

پرسیم: قادر دەعبا چییە؟ شوان گوتی یانی دڕوندەی گۆشت خۆر دەگەڕێن، گورگو ورچ، لە دوای ئەو هەرایە بەدرەنگەوە خەوم لێ کەوت لای بەیانی دیارە شوان مێگەلی دەنگ دابوو ڕۆیشتبوە شەوین یانی (شەو لەوەڕ) منی لەوێ جێ هێشتبووم بەبێ ئەوەی بیر بکاتەوە ئەوە منداڵە هەڵ بستێتەوە دەترسێت؟

کاتێك هەستامەوە گەزەنگی هەتاو دابووی لە لووتکەی بەرزی کارۆخو چیایەکان، سەیرم کرد مێگەلی بزن وا لەنزیك گۆڕ مێکوك دەلەوەڕێت، کەمێك لەسەر پەنگرەکانی ئاگرە دامرکاوەکە دانیشتم، دیتم سەگێك لەوێ ماوە لە دواییدا سەرەو ژێر ڕۆیشتمە خوارەوە پەڕیمەوە بەری لای کۆڵێت لەسەر ڕێگا دانیشتم لەوێوە بەری هەندرێن باش دیارە، سەیرم دەکرد لە پڕێکا بزنە بزر بوەکان کەوتنە بەر چاوم لە بەرزایی چیا لەناو شاخەکان دەلەوەڕان، ئەو شوێنەم دەست نیشان کرد ئەگەرچی دوورو سەختیش بوو بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشتم هەتا شوان هاتە خوارەوە، پەڕیمەوە بەری (هەندرێن) بەچیادا سەرکەوتم کاتێك دەبینم گەیشتوومەتە سەری (بەستەڕێواس) لەو شوێنەی دەست نیشانم کردبوو زیاتر سەرکەوتبووم کەمێك گەڕامەوە بزنەکانم دۆزیەوە دامنە پێش خۆم دام گێڕانە خوارەوە کەوتمە دوویان هەتا هێنامنە ناو گەڵی، ئەوەندەیان ئاو خواردەوە باسی ناکرێت لەوێش هێنامنەوە ناو گوند زۆر لە پێش مێگەل گەیشتمەوە جێ.

کە ئەم گۆت بزنەکانم لەسەری بەستە ڕێواس هێناونەتەوە باوەڕیان پێ نەدەکردم دەیان گۆت چۆن توانیوتە بگەیتە ئەو شوێنە ! وایان دەزانی من ڕاست ناکەم، بەلآم (ئەحمەدی مام شەرە) منی دیبوو کە بزنەکانم لە چیا هێنا بوونە خوارەوە، گوتبووی: (من لە سەرە نێری بینیم منداڵێك لە ناو گاوان لە سەر بەستە ڕێواس بەدوای دوو بزن کەوتبوو دەی هێنانە خوارەوە، کاتێك گەیشتە باسکی بارۆیان ئەوجا ناسیم زرارە، ئەوکاتە باوەڕیان کرد لەکوێ بزنەکانم هێناونەتەوە.

مازو: مازو بەری داری مازوە، دارەکەش لە درەختەکانی قەد پاڵی چیایە، لە سەردەمەکانی ڕابردودا مازو دەفرۆشرا بۆ دەباغ بەکار دەهێنرا، خەڵکی گوندەکانی ناوچیا مازویان کۆ دەکردنەوە، ئەوەی دیاریدەیە ئەو گوندانەی نزیك بەدارستان بەکۆمەڵ دەڕۆیشتن بۆ مازو چنین، مازو چنین ببوە ڕەوشتێکی ساڵانەی گوندەکان لەبەر ئەوە لە گوندەکان یاسایەك داندرابوو نەدەبوو هیچ کەسێك پێش ڕۆژی بەردانە مازو بڕوات تاکە مازوێك بکات ئەوەی پێش ئەو ڕۆژە قەدەغەی شکاندبا بەسزای دیاریکراوی دەگەیشت مازوش ساڵێك هەبوو ساڵێك نییە. وەك ڕەوشت پێشی بەردانە مازو زووتر خەڵك خۆیان ساز دەداو چۆلاکیان دروست دەکردن. چۆلاك دارێکی درێژی بەسەرکە تایبەتە بۆکردنی ئەو مازوانەی دەستیان نەدەگەیشتێ، منیش ئەو ساڵە خۆم ئامادە کرد لەگەل منداڵەکانی مامم (سەیدئاغا) بڕۆمە مازو چنین بۆ ئەو مەبەستە ئێوارەی ڕۆژی بەردانە مازو ڕۆیشتمە ماڵی مامم لەوێ نوستم، لەبەرئەوەی دەبێ لەگەڵ تاریكو ڕۆنی بەیانی لەو شوێنە بن کە مازوی لێ دەچنن، سەیر لەوەدابوو ئەو شەوە هەتا بەیانی خەوم لێ نەکەوت! چییە دەڕۆمە مازو چنین، ئەوەش ئەوە دەگەینێ جاری یەکەمم بوو بچم بۆ مازو، کاتێك خەوم لێ کەوت بوو ئەوەندم زانی یەکێك لەکچە مامەکانم وشیاری کردمەوە، دیار بوو هەر شەو بووکەوتینە ڕێ، بەشەویش گەیشتینە ناو دارستانی چیا ماوەیەك دانیشتین هەتا دونیا ڕۆناك بوو، بەچاوی خەوالۆ بەباشی دارەکانم نەدەدیت کەچی دیاربوو هەردارێك زەلامێکی لەسەربوو مازویان دەچنین، خۆشی لەوە دابوو لەگەڵ گەزەنگی هەتاو لەهەموو لایەکەوە دەنگی مازیکەران دەهات، هەرکەسەی بەئارەزووی خۆی تێی هەڵکردبوو چی ئارەزووی بوو دەیگوت. بێگومان لەوکاتەدا گوێت لەجۆرەها ئاواز دەبوو لەبەرئەوەی هەر کەسەی لەڕاستی خۆی بیزانیبا یان نەیزانیبایە دەیگوت وای دەزانی

دەنگی خۆشە، بەو شێوەیە لەهەموو كەندودۆڵ وباسكێك لەناو دارستان هەڵا بوو ئەوەی زۆر خۆش بوو دەنگی كوڕوكچ تێك هەلآوی یەكتر ببوون وات دەزانی تەواوی گوندی دەرگەڵە لەناو ئەو دارستانەیە، ئەوگۆرانیانەی گوێم لییان بوو خۆشترینیان ئاوازی بەلۆرە بوو، كچان دەیانگووت، ئاوازی بەلۆرە ئاوازێكی فۆلكلۆری كۆنی كوردیە لەشێوەی مەنۆلۆج بەكار دەهێنرێت، ئەوگۆتنە زارگۆتەی لاوانە بەتایبەتی ئەوانەی یەكتریان خۆش دەوێت!.

خۆشیەكەی ڕۆژانی مازو چنین لەوەدایە، لەكاتی نوێژی نیوەڕۆ، دەستە دەستە كچ وكوڕو پیرو لاو تێلەكە بەشانەوە دادەرژێنە سەر ئەو ئاوەی بۆ پشووی نوێژی نیوەڕۆ دەڕۆنە سەری، یەكەم ڕۆیشتینە سەركانی كۆلآن لەبناوی (بەستی شەمێ) لەدیوی (دۆڵەمنجەل) ئاوی ئەوكانیاوە سازگارە، ئەوەی جێگای دڵخۆشیم بوو ئەوەبوو ئەوكچ وكوڕانەی دەگەیشتینە سەر ئاوەكە بەپەلە تێلەكەیان دادەناو چاویان دەشووشتن، زۆریان شەڕە ئاویان دەكرد، ئاویان بەیەكتردا دەكرد زۆریان بەبەرگی تەڕیان دەرۆیشتنە بەر هەتاو خۆیان وشك دەكردەوە.

لەسەردەمی مازوكردن یاریەك هەبوو كە ئێستاش ماوە، یاریەكە پێی دەڵێن (كەت یان جۆت) ئەوەش جۆرە قومارێكە مازو كەرەكان دەیان كرد، وا دەبوو زۆر كەس ئەو مازوانەی بەدرێژایی ڕۆژ كۆی كردبونەوە دەی دۆراندن و بەدەست بەتاڵی دەگەڕایەوە، ئێستاش بەزۆری لە ناو منداڵان بەگوێز دەكرێت ئەو یاریە زۆر كۆنە لە ناو كۆمەڵگادا، دیارە هەر لەوەشەوە هاتوە دەڵێن (مازوكەری كون دەپاشۆڵێ) بەو مانایەی ئەوەی مازو كەرەكان دەدۆڕێنن جانتای بەتاڵ دەبێت، پاشۆڵ لە چارۆگەی ئافرەتانەوە هاتوە، ئافرەت كاتێك كە دەڕوات پەلكە مێو كۆبكاتەوە چارۆگەی لەپشتێنی قایم دەكات و دەیخاتە ناوی پێی دەڵێن پاشۆڵ.

## زستانێکی ساردو دژوار لەگەڵ مام محمود

کارەکانی ماڵمان ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو ئاڵۆزیو پەشێوی دەچوون، باری گرانیش لەسەر شانی من زیاد دەبوو، لەکۆتایی پایزی ئەو ساڵەدا لەسەر ڕاسپاردەی باوکم بزنە دۆیەکانم بردنە گوندی (ڕەژوکەریان) لەویّ دابەشی سەر خاوەن مێگەلەکان کران بۆ بەخێوکردن، شەو لەماڵی مام خدرە جۆلی مامەوە.

ئەوەی بەدیارکەوت باوکم لەگەڵ (مەحمود بەگ برای قادری وەسمانی) ڕێك کەوتبوون ئەو زستانە من لەگەڵ (مام محمود) بڕۆم بۆ هێنانی داری سووتەمەنی، بەگوێرەی ڕێك کەوتن دەبوا هەموو ڕۆژێك بەیانی زوو هێسترەکەم ببەم بڕۆمە دەرگای ماڵی (مام محمود) لەوێش لەگەڵی بڕۆمە چیا بۆ دار هێنان.

بەڵێ بەیانیان زوو دەڕۆیشتمە ماڵی مام محمود بەڕاستی ناوبراو مرۆڤێکی بەدەستو برد بوو زۆر تەڕدەست بوو لە دارکردن، بەیانیان دەڕۆیشتینە شوێنی دارکردن بەماوەیەکی زۆر کەم دوو بارە داری دەکردنو باریشی دەکرد پێش دارکەرەکانیش دەگەڕاینەوە، ئەو مرۆڤە چەند چالاك و بەڕاپەڕ بوو ئەوەندەش توندو ئاڵۆزو تووڕەو زوورت بوو، بەلاّم کەدەیگرت جنێوی ناشیرنی دەدا، تەنانەت بەخۆیشی. بەدبەختی من ئەوساڵەش زیاد لەساڵەکانی ڕابردوو زستان ئەوەندە ساردو دژوار بوو، بەفرێکی زۆر کەوتبوو ڕێگای ناو گەلی کە ئێمەی پێدا دەڕۆیشتین بەیانیان یەك پارچە دەبووە سەهۆڵ ئەگەر بەفر بکەتبایەو مێگەلی ئاژەڵ بەسەریدا دەڕۆیشت دەکوتراوە بەتایبەتی کە دەبووە ساماڵ بەشەو دەیبەست دەبوو بەجەڵیتو ولاّغ نەیدەتوانی بەسەریدا بڕوات، بەیانیان بەچ دەردە سەریەك تا لەگەڵی دەرباز دەبووین ولاّغەکان بەسەریەلۆ دەڕۆیشتن بەتایبەتی ئەوانەی بەناڵ بوزن. ئەوەی شایانی لێدوانە ئەو ڕۆژە ساردو دژوارانەی زستان بەبەردەوامی لەماڵ دەردەکەوتینو لە سەرمان دەلەرزین، بەتایبەتی من هەتا دەگەیشتینە شوێنی دارکردن ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ بەرگ وپێلاّوی من پەرپووتو ناتەواو بوون. ئەوەی دەمەوێت بیلّێم ئەوەیە ئەو ڕۆژەی مام مەحمود لە ماڵ دەردەکەوت ئەوا ئەو ڕۆژە بەباشی دەڕۆیشت هەر دەگەیشتینە شوێنی دارکردن زوو دەی گووت لەمامتە زوو برۆ هەندێ پووشو چیلکەدار بێنە با ئاگرت بۆبکەمەوە، زوو بەزوو ئاگرێکی بۆ دەکردمەوە، ئەوجا

دەستی دەکرد بەدار قەدکردن کاتێ داری قەد دەکردن بەبەری ڕا نەدەگەیشتم لەکۆکردنەوەی دار، کەبارەکان تەواو دەبوون یەکسەر باری دەکردن‌و دەگەڕاینەوە، لەپێش هەمووداركەرانی گوند. بەدەردە سەری زستان تەواو بوو لەگەڵ ئەزیەتێکی زۆر.

هەروەردەری ڕەشەمێ: ڕەشەمێ ڕەوشتێکی سەردەمەکانی پێشووە، ساڵانە لە سەرەتای بەهلو ڕۆژێك خەڵك دەردەکەون، چ لەشار چ لەدێهات ڕۆژەکە لەدەرەوە بەسەردەبەن، خواردنیش سازدەکەن. ساڵێك لەکۆتایی مانگی دوو بەشی زۆری خەڵکی گوندی دەرگەلە دەرکەوتبوونە سەرگۆڕستانی ئاوڕێژ، دەرکەوتنی ئەوخەڵکەم وەك ئاهەنگ دەکەوتە بەرچاو پرسیم ئەوخەڵکە بەبۆنەی چی ئاهەنگ دەگێڕن؟

دایکم گوتی: ڕۆڵە مانگی ڕەشەمێیە سەرەتای بەهاران یادی ڕەشەمێ وەك ڕەوشتێکی کۆن دەکرێتەوە، هەمووساڵێك لەو مانگەدا کۆمەڵە ڕۆژێك ئەڕۆنە دەرەوە زستان بەرێ دەکەن، باوەش بۆ بەهار دەکەنەوەو خواردن ئامادە دەکەن، ڕۆژەکە بەبەزم‌و شایی بەناوی ڕەشەمێ دەبەنە سەر. کاتێك ڕۆیشتمە شوێنی ئاهەنگ سەیرم کرد جەماوەرێکی زۆر خەریکی خۆراك سازکردن بوون، خۆراکیش بەزۆری پلاوماش بوو لێیان دەنا، دوایی پرسیم ئەرێ ئەو خەڵکە بەگشتی پلاوماش لێ دەنێن بۆ؟ حەمدامین (گچکە) لە وەڵامدا گوتی ئەوە ڕەوشتی ڕەشەمێیە، ئەوەی پلاوماش نەخوات ڕەشەمێی لێ ناکەوێ ئەوە نیشانەی بەرێکردنی ڕەشەمێیە.

بێگومان لە ڕۆژی ڕەشەمێشدا وەك ئاهەنگەکانی ترخۆیان دەڕازێننەوە، ئەوەی شتێکی هەبێت دەیکاتە بەری، بەنیازی بەزم‌و شایی‌و هەڵپەرکێ دەردەکەون، هەندێکیان خەریکی ئامادەکردنی خۆراك دەبن، ئەوانی تریش شایی دەکەن‌و جۆلانە هەڵ دەبەستن.

ڕەشەمێی ئەو ساڵە زیاد لە ساڵەکانی پێشوو بەشی زۆری خەڵکی گوند دەرکەوتبوون، ڕەشبەڵەك دەکرا ئەوەندە گەرم بوو پیرەکانیش هەستیان جولاً بوو، دەستی ڕەشبەڵەکیان گرتبوو هەڵ دەپەرین، لەگەرمەی ئەو شاییە خۆشەدا گوتیان ئاها ئەوە بزنە کێویە ڕۆیشتە پشتی گۆڕستانی ناو تەڕاشەکان ئەو شاییەگەورەیەو ئەو خەڵکە تێکرا سەیری ئەو شوێنەیان دەکرد. یەکسەر یەکێك بەگورجی ڕۆیشتەوە گوند تفەنگی ساچمەی بۆ (جەلال بەگ) هێنا، ناوبراو لەگەڵ (گچکە) ڕۆیشتن بۆ

ئەو شوێنەی بزنەکەی بۆچوو ئاهەنگ گێڕان دایان بەستەوە شایی، هەندێکیان سەیری شوێنەکەیان دەکرد، لەو سەین و بەینەدا دەنگی تەقە هات زۆری پێ نەچوو دیاربوو کەلەشی بزنەکەیان هێنا خوارەوە بەچوار چەنگە هەڵیان گرتبوو، کاتێ هێنایان دیاربوو(شوور) بوو بزنە کێوی نەبوو. ئەوەی دیار بوو دابەستراوە ڕەش بەڵەك، بەوردی سەیری ئەو گۆڕستانەت بکردبا جێگای بەتاڵت بەرچاو نەدەکەوت، کاتێك خەڵکەکە خەریکی خواردن بوون، بوو بەشەڕە منداڵ لە نێوان منداڵەکانی گەڕەکی سەرباسك و گەڕەکی گوند، زۆری نەمابوو شەڕەکە ببێتە شەڕی گەورەکانیش، بەڵام پیرەکان زوو پێ ڕاگەیشتن لێکیان دوورخستنەوە، ئەوەی زۆر سەیر بوو لە منداڵەکانی هەردوولا خزمیان لەگەڵ لایەکەی دی هەبوون کەچی لەسەر گەڕەکایەتی شەڕیان دەکردو بەگژ خزمەکان دادەچوونەوە، وایان دەزانی گەڕەکایەتی لە پێشەوەی خزمایەتییە.

## لافاوێکی ناوەخت

ئەوەی باسی لێدووانە زەبرو زەنگی بەهار نەمابوو سەرەتای مانگی پێنج ڕۆژێك کاتی تاو هەڵات ساماڵ بوو بەوە نەدەچوو باران ببارێت، کەچی لە ناکاو ئەوەندە زاندرا بووە گرمەی هەورەکان لەئاسمان و دایکوتا بارانێك ئەوەندە بەگوڕو بەتاو لەماوەیەکی زۆرکەمدا ئەو ڕێژنە بارانەکردی بەلافاوێك لە هەموو بەرزاییەکان ئاو بەگوڕ بەسەر گونددا دەهاتە خوارەوە ئەو ڕۆژە ڕۆناکە بوو بەتاریك ئاوی ئەو ڕێژنە بارانە بەیەك گەیشت، بوو بەلافاو، بەڵام چ لافاوێك هەموو کەندو دۆڵ و شیوێك پڕ بوون لە ئاو بەلێشمت بەسەر گونددا دەهاتە خوارەوە، مەترسیەکی ترسناکی پێوە دیار بوو، ئەوەی بەوردی سەیری کەندو دۆڵەکانی (بەرڕۆژو بن زین و وارکوڕێش)ی بکردبایە وای دەزانی ئەو بەرزاییانە دەڕوخێن ودێنە خوارەوە، ئاو دارو بەردی لەگەڵ خۆی ڕادەپێچاو دەی هێنایە خوارەوە، ئەگەر هاتباو بارانەکە نیوکاتژمێر بەو شێوەیە درێژی کێشابا بەشێك لە گەڕەکی بەر گوندی دەبرد، بەڵام باش بوو باران تاوێك بوو زوو ڕاوەستا لەگەڵ ئەوەش بەشێکی زۆری خانوەکانی نزیك ڕووبار پڕ ببوون لەقوڕاو هەندێ کەل و پەلی ماڵەکان و چەند کاریلەی بردن هەربەو شێوەیە چۆمە پڕ دارو

درەختە جوانەکەی ڕامالّیو زیانێکی زۆر بەدارەکانی بەریو باخچەکانو زەویەکان گەیاند.

لەو کاتەی بوو بەگرمەو هۆڕەی هەورەکان من لە گەڕەکی سەر باسکی بووم هەر بەئەوەندەی ڕاگەیشتم خۆم گەیاندە ژێر قاپی چناری (کانی مێردان)، لە گەرمەی بارینی باران بوو بەهاوارو دەنگ دیار بوو جەماوەری گەرەکەکانی سەرباسكو گەڕەکی قەلاّتێ لەسەر بانان سەیری لێمشتەکانیان دەکرد کە ئەمەم بینی بەپەلە ڕۆیشتمە خوارەوە سەیربوو شەپۆلەکانی لافاو ئەوەندە بەرز دەبوونەوە مرۆڤیان دەترساند، بنەداری وای دەهێنایە خوارەوە جێگای سەرسوڕمان بوو. لە دوای دامرکانەوەی لافاو بەدیارکەوت ئەو خانوانەی نیزیك روباربوون ماڵەکان پڕ بوبوون لە قوڕاو، چەند ڕۆژ بوو خەریك بوون پاکیان دەکردنەوە، زۆر شتی ناو ماڵ وەك دانەوێڵەو کەلو پەل لە ناو خانووەکان لە قوڕاو بزربببوون ئەوەندە باش بوو زیانی گیانی نەبوو.

## کۆچباری ڕەوەندە کۆچەرەکان

ڕەوشتێکی دیاریدەی ڕابردووی هۆزە خاوەن ئاژەڵەکانی (هەرکیو هەروتیو خەیلانیو بلباس) لە هاوین کۆچیان دەکرد بەرەو کوێستانانو پایز بەرەو گەرمیان دەگەڕانەوە، لەو کۆچو باریە ڕێگایان دەکەوتە لای ئێمەلە ڕێگای گەرووی بێجانو ڕواندز بەدۆلّی ئاکۆیاندا سەر دەکەوتنە بن کارۆخو دەهاتن بەدەرگەڵەدا دەڕۆیشتنە ناوچەی باڵەكو لەوێش بۆ سنورەکانی کوردستانی ئێران، لەوێ دەمانەوە تاکو پایز.

کۆچباری ڕەوەندە کۆچەرەکان کۆمەڵێك دیداری جوانی پێوە دەبیندرا کەشایانی باسکردن بن، یەکێك لەوانە لێهاتویی ئافرەتی ڕەوەندە ئەوەندەی بلّێیت ئافرەتی کۆچەر بەرابەروو چوستو چالاکن، بەڵگەش بۆ ئەو ڕاستیە ئەوەیە لەکاتی کۆچو بارکردن لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر، ئافرەتی کۆچەری جیا لەکارەکانی خۆیان یارمەتی پیاوەکانیشیان دەدەن لە دەست باوگرتنو بارکردن، لەڕێ ڕۆیشتی کۆچ دیداری جوان ئەوەیە ئافرەتی کۆچەر تێلەکەی بەشانەوەیە لەگەڵ پیاوەکان ڕێ ڕەوی کۆچن، جوانترین دیدار لەوەدایە دەبینین ئافرەتی شۆخونازدار لە پێشەوەی کۆچ سەری

یەکێك لە وەلآخەکانی باربەر دەکێشێت دەڕواتە ڕێ، بەلآم چی؟ وێنەیەك ئەوەندەی سەیری بکەیت لێی تێر نابیتو باسی لێوەشانەوەی ناکرێت ئەوەندە دڵگیرو نارەزوومەندە هێندەی سەیری ڕۆیشتنی بکرێت بەو دیمەنە جوانەی توورەگەی ڕەنگاو ڕەنگی نەخشاندراوی بەشانیەوە سەرو پۆشی زێدەجوانی بەسەریەوە دەبینی گوفکەی پۆشینەکەی بەولاو ئەولادا بەسەر شانی شۆڕ دەبنەوە ڕێشمەی وەلآخی بەدەستەوەیە بەلەنجەو لارەوە هەنگاو دەهاوێژێ وردە وردە (گۆری)شی دەچنیو دەڕواتە ڕێ، ئەوە جوانترین دیمەنی ڕێ ڕۆیشتنی ئافرەتی کوردە.

دیدەنی تری جوانی ئافرەتی کوردی کۆچەر ئەوەیە لەوکاتەی دەستە دەستە بێریەکان بەرهەڵبێنە لەخۆیان دەدەن تورەگەو شیرمەشك بەشانیانەوە، دەکەونە دوای یەکتر دەڕۆنە مەڕدۆشین.

دیدارە جوانەکەی تریان ئەوەیە لەوکاتەی کۆچ دەخەنو ڕەشماڵەکانیان هەڵ دەدەن ئافرەتەکان یەکسەر دەکەونە دەستو برد هەندێکیان دەڕۆن بۆ ئاو هێنان، هەندێکیان دەڕۆن داری سووتەمەنی کۆدەکەنەوەو بەرهەڵبێنەکانیان لە خۆ قایم دەکەن خواردنیش سازدەکەن، جیا لەشیر کولآندنو مەشك ژاندن.

ئەوەی دێتەوە یادم هۆزە ڕەوەندەکانی ناویان لەسەرەوە هاتوە، هاتو چۆیان بەدەرگەڵەدابوو، کە دەگەیشتنە دەرگەڵە بەرپرسی هۆزەکان لایان دەدایە دیوانی میری دەرگەڵە کوشتەو ژاژیو پەنیریان بۆ دەبرد.

ساڵێك لەوەرزی پایز هۆزی خەیلانیەکان لە گەڕانەوەیان بەرەو گەرمیان ڕەشماڵەکانیان لە (بانەساردکان) هەڵدابوو چەند برادەرێك لە منداڵەکان هەوڵیان لەگەڵ دەدام بڕۆم لەکاتی تێپەڕبوونی مێگەلەکان دزیان لێ بکەین، ڕازی نەبووم لەگەڵیان بڕۆم لە دواییدا پەشیمان بوومەوە دەم گوت بۆچی لەگەڵیان نەچووم، بەڵکو شتێکم دەست دەکەوت هەرنەبێت پێلآوێکم پێ دەکڕی، ئەوەبوو بەتەنیا ڕۆیشتمە ناو گەڵی لەناو باخچە ئەسپیندارێك خۆم بوارد لەکاتی تێپەڕچوونی مێگەلەکان بۆم هەلکەوت کاوڕێکم ڕاکێشا ناو باخچە ئەسپیندار، دوایی بیرم کردەوە دزی کردن کارێکی ناپاکەو بۆ من نابێت کاری وەها ناڕەوا بکەم کاوڕەکەم بەرداوە ناومێگەل.

## زستانی دووەمیش لەگەڵ مام محمود بەگ

بۆ ساڵی دوەمیش گەڕامەوە ژێر بۆڵە بۆڵی ئەو پیاوە دەمار توندە، ئەوەی غەمم بوو، یەك سەرماو ساردی زستان، دوو زوورتو زویری ئەو مرۆڤە ئاڵۆزە، سێ ناپەسندی زرِ دایك سەربارو بن بار.

بەڵێ وەك ساڵی پێشو دەبوا بەیانیان زوو برۆمە بەردەرگای ماڵی (مام محمود) کە برۆینە چیا، ئەو پیاوە ئەوەندە دەمار توندو تورەو ئاڵۆز بوو، ماشاءالله ئەوەندەش نەفامو نەزان بوو لەهیچ نەدەگەیشت لەدار قەدکردنو هێستر لێ خورینو سەبیلەکێشان زیاتر، ئەوەی بەلامەوە زۆر گران بوو دوو شت بوون سبەینان زوو هێستر کورتان کردنو بەیانیان زوو دەکەوتینەرێ بەناو گەڵی دا دەرۆیشتین زۆرم ئەزیەت دەخوارد ئەوەش ئەوە دەگەیینێ بەرگم شورو پەرپوت بوو.

ئەوەی راستی بێت هەر لەسەرەتاوە خۆشی ژیان لە من دوور بووە دەبێ بڵێم بێ بەش بووم، تاڵیو دەردەسەری بەشم بووە، زۆرم غەم دەخوارد بەرگی نوێم بەبەر خۆمەوە نەدەدیت بەو سەرماو ساردیەش دەبوا چووبامە چیا، وا هەڵکەوت رۆژێك کەمێك لە رۆژان دوا کەوتم کاتێك گەیشتمە بەردەرگای ماڵی مام محمود کچە گەورەکەی دەرکەوت بەروێکی زەردەخەنەوە گۆتی (باوکم رۆیشت گوتی بەزرار بلێ بێتە شوێنی دوێنێ). منیش لەسەر راسپاردەی ئەو بەرەو شوێنی رۆژی پێشو رۆیشتم، بەلام چی ئەوەندەی بلێیت رۆژێکی تەرو تووش بوو بەدرێژایی رێگا بارانو کرێوە بە(با) لە دەمو چاوی دەدام تەمو مژ تەواو تارێکی کرد بوو کەس کەسی نەدەدیت چارەش نەبوو دەبوایە هەر بچوبام ئەگەر توشی نەمانیش بووبام لەبەر ئەوەی نابوا سۆبەی (ئاغاژن) بێ داربێت، هەرچۆنێکی هەبوو گەیشتمە شوێنی دیاریکراو لەوێ هەستم راگرت هیچ شتێك گوێ بیست نەبووم دونیایەکی کشو ماتوبێ دەنگ هەتا دەنگی باڵندەکانیش نەدەهات ئەوەندە ساردبوو بەدیارکەوت کەس لەوێ نییە تەواو بێ هیوا بووم ناچار هەوڵم دا هەندێك دار کۆبکەمەوە، ئەوەبوو لەولاو ئەولا هەندێك دارم کۆکردنەوە ئەو دارانەی کۆم کردبوونەوە لە شوێنێکی بەر کەندم دانابوون بۆ ئەوەی بەڵکو بتوانم لە هێسترەکەی باربکەم.

هەموو بیرم ئەوەبوو چۆن ئەو دارانەی کۆم کردونەتەوە باریان بکەم؟ ئەوەندە لەغەمی ئەوەدا نەبووم کە لە ژێر ڕێژنەی بارانو کرێوەو بەفرو تاریکی تەمو تۆغان دەلەرزیم، ئەوەندەی لەغەمی ئەوە دابووم ئەگەر بێ دار بگەڕێمەوە بەر دەمو لووتی ئەو زڕ دایکە قین لەدڵە! ڕۆیشتم هێسترم کێشا بەر باری زۆرم هەوڵ دا گرێی گوریسم پێ نەکرایەوە ئەوەندە ساربوو، هەتا کردمەوە چەند جار دەستەکانم دەگوشینو دەم خستنە ناو دەمم هەتا کەمێك فەرامۆشیم دەهاتەوە بەر، لەگەرمەی بارینی بەفرو کرێوەدا چەند جارێك هەوڵم دا بن بارەکان باربکەم گوریسم پێ گرێ نەدەدرا لە دوای هەوڵێکی زۆر دارەکان دەکەوتنە خوارەوە ئەوەندە هیلاك بوبووم لەخۆم بێزار بووم لەگەڵ ئەوەش هەوڵم دەدا بارەکە باربکەم بێ دارنەگەڕێمەوە، دوا جار هێسترم هێناوە ژێر بار، خەریکی پێچانی بن باربووم لەو دەمەدا لەناو دارستاندا لەو شوێنەی بارم لێ بار دەکرد ڕەوە بەرازێك بەدەرکەوت بەرەو لای من دەهاتن ئەوەی ڕاستیە زۆریان لێ ترسام، بەلاَم هەرچاویان بەمنو هێسترەکە کەوت بەرەو دواوە گەڕانەوە بەڕاکردن ڕۆیشتن، بەلاَم هێسترەکە هەرکە چاوی پێکەوتن گورج ڕاپەڕیو پێم ڕانەگیرا، بن بارەکانی فڕێ داو بەرەو گوند گەڕایەوە، دوایی منیش بەدڵێکی تەنگەوە لە دوای ماندوبونێکی زۆر ناچار گوریسەکانو بیورم بەکۆڵ شانی دادانو بەرەو گوند گەڕامەوە، لەژێر بارینی بارانو کرێوەدا، کاتێك گەیشتمەوە گوند نەوێرام برۆمەوە ماڵ، لەسەرووی گوند لەماڵی (مام حمد) لەبەر ئاگردان خەریکی خۆ وشك کردنەوە بووم دەستو پێم لە شەختە سڕببوو زۆر دەهێشان!

دایکم تەنگاو دەبێت هێستر گەڕاوەتەوە کوڕ دیار نییە، بەو سەرماو ساردیە باوکم دەنێرێتە دوای (محمود بەگ) لێی دەپرسێت ئەو کوڕە نەهاتۆتەوە لەگەڵ تۆدا نەبوو؟ ناوبراو گۆتبووی ناوەڵلاَ سووچی من بوو پێش ئەو بێت من دەرکەوتبووم بەمنداڵەکانم گوتبوو بابێتە شوێنی دوێنێ کەچی من نەچوومەوە شوێنێ دوێنێ، لەو کاتەی ئامادەبوون بەدوامدا بێن کوری(مام حمد) دەڕوات پێیان دەڵێت: (مەڕۆن زرار لەماڵی ئێمەیە کەوتوە)، لەدوای ئەو هەموو ئەزیەتە زڕ دایك کردبووی بەبۆڵە بۆڵ، چی؟ داری کەم بووینە. .

هەرچۆنەکی هەبوو ئەو شەوە نووستم بەیانی وەك ڕۆژانی پێشوو ڕۆیشتمەوە بەردەرگای (مام محمود) کاتی بەڕێ کەوتین لەڕێگا ناو براو گوتی: (بەڕاستی تاوانی

من بوو تۆ تووشی ئەو ئەزیەتە بووی منیش ئەوەی ڕوویدا بەوردی بۆم باس کرد. کاتێك گەیشتینە شوێنی دارکردن زوو دارەکانی ئامادەکردن هێسترەکەی خۆی بارکرد خەریك بووین هێسترەکەی ئێمە باربکەین دیسان هێسترە ناپەسندەکە ڕاپەڕیو ڕۆیشتەوە پێمان نەگیرایەوە هەر ئەوکاتە بەمام محمودم گۆت: (من نایەمەوە لەبەر ئەوەی دوێنێش دارم نەبردونەتەوە لە دەستی ئاغاژن ڕزگاریم نابێت دەڵێت خۆت وادەکەیت). مام محمود دیتی ڕەنگم گۆڕاوە هەرزوو گوتی: (ئازیز خۆت ئالۆزمەکە بارەداری خۆمیان بۆ دەبەم نایێلم هیچت پێ بڵێن خۆ خەتای تۆ نییە هێستر شەموسە)، کاتێك گەڕاینەوە گوند مام محمود بارەکەی خۆی بۆ ئێمە خستبوو پێی گۆتبورن چۆن هێستر ڕاپەڕیو ڕای کرد.

بەو شێوەیە دوو ساڵ زستانی سەرماو ساردی پڕ دەردەسەریم لەگەڵ مام محمودی تورەو توند بردەسەر، ئەوە لەلایەك، ئەوەی زۆری بێزار کردم هەڵوێستە چەوتە بێڕێزەکەی زڕدایك ئەزیەتی دام ئەو ئافرەتە ئەوەندە بەڕقو قین بوو لە من وای دەزانی بابەکوشتەی ئەوم ماشاءالله باوکیشم جڵەو بەدەستی ژنەکەی بووئەوەی ئەو پێی دەگوت ئەگەر دووریش بایە لەڕاستی ئەو بەڕاستی دەزانی لەبەر ئەوەی هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە چی بکەم، چۆن لەو دەردەسەریە دەردەچم. زستانی ئەو ساڵەش ڕۆیشت پێمان نایە بەهاری نوێو سەرهەڵدانی هەردەوەری.

هەردەوەری: ئێوارەیەك لاوەکان خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون بەنیازی ڕاووکاردی برۆنە (بن کێلان) ئەو شوێنە دەکەوێتە دیوی کێوی (ڕوەڵە) بەدیوی حافیزو بەرسیرینەوەیە، ئەوە بوو بۆ بەیانی زۆر زوو دەنگی تەقە هات، ئەوە نیشانەی دەرکەوتنی کاردیکەران بوو دەڕۆیشتنەچیا، کاتێك سەیرم کرد کچو کوڕ تێکەڵاو دەڕۆنە خوارەوە بەرەو ڕێگای کۆسپان، بەپەلە چوومەوە بەدایکم گۆت زوو هەندێك نانم بۆ ڕانوشتە منیش دەچمە ڕاووکاردی، دیار بوو دایکم بەڕووێکی گرژەوە گوتی: (کوڕم مەچوو باوکت لێت دەدات بەقسەی من بکە مەڕۆ)، گوێم نەدایە دایکم ڕۆیشتم، دباربوو کاردی کەرەکان لەسەر جۆخینی (تیسوانی) دایان بەستبوە ڕەش بەڵەکو دەنگی کچەکەی دەهاتو شایی گەرم بوو ئەوەی دەیگۆت ئالۆز وبلۆز بوو هەر بەخۆی دەیزانی چی دەڵێت، خۆشترین شایی لەبەر دەگەڕا. ئەوەش ئەوە دەگەیێنێ یەکەم دەرکەوتنی لاوان بوو برۆنە چیا، لەوێ بەرەو کۆسپی ناو خەراب

بەرێ کەوتین کۆسپی ناوبراو تاکەرێگایەکی تەنگی هەیەو هەڵدێریشە هەر ئەو رێگایەش هەیە پێیدا تێپەڕبن، لە کۆنەوە رەوشت بوە کوڕان رێگا لە کچان بگرن گۆیا دەبێ باج لە کچان بستێنن لە کاتی دەربازبوونیان باجەکەش ماچ بووە.

پێش بگەینە کۆسپە(حمدامین گچکە) سەری هێنایە بن گوێم گۆتی: (برۆ کـۆسپە بگرە داوای باچیان لێ بکە کەس بۆتۆ هیچ نالێت لەبەر ئەوەی نیوە پیاوی بەمنداڵ دادەندرێت). بەقسەی (گچکە) رۆیشتم لەسەر کۆسپە لە شوێنەبەر تەنگەکە دانیشتم هەڵدێربوو بەکچەکانم دەگۆت باجم دەوێت. بێگومان ژن و پیرەژنەکان دەڕۆیشتن هەندێکیان لە کاملەکچەکان بسکیان بلند دەکرد دەیان گۆت، هاوەرە ماچ کە بەڕاستی شەرمم لێیان دەکرد ناچار کۆسپم بەجێ هێشت و رۆیشتمە خوارەوە.

مامۆژنە(خەدیج) پیرەژنێکی قسە خۆش و دڵ پاك بوو لێم نزیك بووەوە گوتی: (مامۆژنت بەقوربان بیت چاکت کرد کیژۆڵەکانت ئیزن نەدان ئەوانە پاوانن دڵیان مەشکێنە).

لەکۆسپان دەربازبووین بلاوی ناو دارستان بووین لە نزیك شاخە سۆر کۆمەڵێك بزنەکێوی راپەڕین بازیان دایە چیا ئەوەندە چووست بوون زۆر بەدڵەوە سەیرم دەکردن یەکەم جار بوو کێوی بەزیندویی ببینم، لەوێ سەرکەوتم رۆیشتمە بەردی نێریان لای سەرەوە لە تەراشە گەورەکە نزیك بوومەوە ئەوەندەم دیت بەرازێك لە ناو تەراشەکە دەرچوو سەرەو ژێر رۆیشتە خوارەوە لەگەڵ راپەڕینی گوێم لە قیژەی هاوارێك بوو بەغار رۆیشتمە خوارەوە دیتم (هەمین کچی قادری وەسمان)ی کەوتوەو لەکاتی بەراز راپەڕیوە بەتەنیشتی دا رۆیشتوە ترساوە، راستم کردەوە بانگی کچەکەم کرد هات بەهەردووکمان بردمان بۆ سەر بەهارەکانیەکەی سەر رێگا سەروچاوی شوشتن لەوێ کەمێك درێژ بوو لەدواییدا لەگەڵی رۆیشتم بۆ (گۆمەویان) ئەو شوێنەی دیار کرابوو نیوەرۆلێی کۆببینەوە لەوێ درێژ بوو خەوی لێ کەوت لای دانیشتم هەتا نیوەرۆ کاردی کەران گەیشتنە ئەوێ، هەر کاردی کەرێکی دەگەیشتە ئەوێ بەپەلە تێلەکەی دادەناو دەچوو دەستی شایی دەگرت بەوشێوەیە هەتا درەنگ لە گۆمەویا رەش بەڵەك دەگەڕا.

دیار بوو دوای نیوەڕۆ لە توانای دا نەبوو بڕواتە چیا ناچار لەگەڵی ڕۆیشتمەوە بۆ گوند بەڕێگای (بەستێ شەمێ)دا ڕۆیشتینەوە (وارکورێش) کاتێك گەیشتینە (کانی داوەری) کچەویستی چاوان بشوات ئەوەندەم دیت خەریك بوو بکەوێتە ناو کانیەکە، بەلاّم زوو باوەشم لێ گرت نەم هێشت بکەویت، سەیری کچەم کرد ڕەنگی تەواو تێکچوو بوو ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو زۆر ترسام نەوەك بمرێت، زۆری نەخایاند کچە هاتەوە سەرخۆ لەوکاتەش دا (مەلا ئەحمەدی مام قادر)ی گەیشتە سەر کانیاوەکەو وردە وردە ڕۆیشتین هەرچۆنێك بوو کچەم گەیاندەوە ماڵیان پورە(فاتم) نەنکی هەمین منی گرتە باوەش زۆر بەگەرمی ماچی کردم. دیارە(هەمین) بەڕێکی بەسەرهاتەکەی بۆ ماڵەکەی گێڕاوەتەوە بۆیە تێکڕای ماڵەکەیان بەچاوێکی خۆشەویستی سەیری منیان دەکرد، بەتایبەتی پورە (فاتم)ی نەنکی، ئەو بەسەر هاتە بەباوکم گەیشتبوو، لە بەرئەوە هیچی پێ نەگوتم، کەچی دایکم هەر دەترسا لەوەی باوکم لێم بدات لەسەر ئەوەی چوومەتە ڕاووکاردی.

## سەرەتای چلەکان ماڵمان گواسترایەوە دۆڵە منجەل

دوای کارەساتەکەی لەناوچوونی تاکە تاقانەی بنەماڵەی پادشای ڕواندز (ئیسماعیل بەگ) پیاوێکی فەلە بەناوی (وەستا ئیسماق) ببوە سەر پەرشت کاری ماڵە گەورەکەی بەجێ ماوی(ئیسماعیل بەگ) لەساڵی (١٩٣٣)وە هەتا سەرەتای (١٩٤٠)لە کاتێکا(یحی بەگ) یەکێك بوو لەخزمەکانی (ئیسماعیل بەگ) کاروباری بەڕێوەبردنی بنەماڵەی گرتەدەستی وەك زاندرا ناوبراو بەهەندێ کاری پێویست هەستا یەك لەوانە ئەو گوندانەی ماڵی پاشا، ئەوانەی لە (دۆڵە منجەڵو وارەکۆنو میراجیانو جنێراوە)ی دابە(سلێمان بەگ) لەبەدەل ئەو دەستوبردەی لەکاتی کارەساتەکە کردبوویو لەجیاتی ئەو هەڵوێستە نەگۆڕەی سلێمان بەگ بەرامبەر دەست وەشێنەکان.

(یحی بەگ) بۆ جێ نشین بوونی (سلێمان بەگ) لەو گوندانەی ناویان هاتوە یارمەتیشی دا، دوو هێسترو دوو گای بۆ کڕین خیوەتێکی زۆر گەورەی بۆ نارد، هەندێ پارەشی پێدابوو. (سلێمان بەگ) پێش ئەوەی ماڵەکەی بەگوازێتەوە بۆ دۆڵە

منجەل چەند مالّی هەناردنە وارە کۆنو جێنشینی کردن مالّی (عەلی شێرکاوەیی‌و حەسەن خاسکەو عزیزە کوری ماویلی) وەك دیار بوو پێش ئەو مالانەی ناویان هاتوە بێنەوارەکۆن تەنیا مالّی (عەولاّغا گەرۆی)ی لیّ بوە ناوبراو خاوەنی مەرو ئاژەلێکی زۆر بوو هەموو هەستو مستێکی بەدەستی خۆی بوە کەس لە خۆی هەوراز تر نەبوە، کاتێك گوندەکان دراون بەسلێمان بەگ بە(عەولاّغا)ی راگەیاندوە دەبیّ ئەویش وەك سەپانەکانی تر، مەرجەکانی جیّ بەجیّ بکات، ناوبراو ئەو راگەیاندنەی پیّ دەگات دیارە پەست بووە، دەلێن لەسەر باگوردانێك دانیشتوە قاچی لەسەر قاچی داناوە گوتبوی (ناوەللا قەت ناگونجێت دوو سەرکە بەران لە مەنجەلێکدا بکولێن) یانی نابیّ دوو ئاغا لەو گوندەدا هەبن. ئەوەی بەدیار کەوت (عەولاّغا) پیاوێکی ئەوەندە زانا نەبوو وای دەزانی دەبیّ هەروابێت کە خۆی دەیەوێت، مرۆڤێك بوو دوور لەکۆمەلّ دەژیا وای دەزانی دایکی (ئیسماعیل بەگ)پێی گوتوە برۆ وارەکۆن تەواو کەس نییە بەرهەلّستیت بکات.

ئەوەی دێتەوە یادم بەهار بوو مالّمان گواسترایەوە دۆلّە منجەل لە وارەکۆن لە سەر گردەکەی نزیك گۆرستان چادرەکەی(یحی بەگ) ناردبووی هەلّیاندا، زاندرا کە سلێمان بەگ مالّی هاتۆتە دۆلّە منجەل،(سلێمان بەگ)دەست بەکار بوو لە بەرزێوە (کەریم شەریف) بەرو بوومی زەویەکانی دەهێنا بەرهەم وردە وردە کۆ دەکرایەوە، گوندە چۆلّەکان رویان لە ئاوەدانی دابوو لە وەرزی زستان هەندیّ مالّی خاوەن ئاژەلّ بۆ پووش خۆرانە داندرانە سەر پاوانەکان، بەهاتنی ئەو مالانە بۆ سەر پاوانەکان(عەولاّغا)ی بەتەواو پەست کردبوو لە دوای دامەزراندنی مالّمان وا هەلّکەوت لەگەلّ یەکێك لە پیاوەکانی باوکم (عەلی شێرکاوەیی) رۆیشتمە رواندز، کاتێك لە سەربازگەی رواندز نیزیك کەوتینەوە دیاربوو لە هەموو کەندو بن تەراشەکان (کەرووك شێران)و دەوروبەری قشلّە(حامیە)لە هەر بن تەراشێك دووسیّ سەرباز خۆیان بواردبوو خوودەی ئاسنیان لەسەری بوو لە چەند شوێنێك مەترەلۆزیان لەسەر پایەکان دانابوون لوولەیان بۆ ئاسمان بەرز کردبوەوە زۆر بەوردی سەیری سەربازەکانم دەکرد لەبەر ئەوەی یەکەم جاربوو شتی ئەوها ببینم لە(مام عەلی شێرکاوە)یم پرسی: (ئەو سەربازانە بۆچی ئەوها ئالۆزن خۆیان بواردوە لەچی دەترسێن؟) مام علی گوتی: (شەرە لەگەلّ ئینگلیز لە ترسی فرۆکە خۆیان

شاردۆتەوە دەبینی لوولەی مەترەلۆسەکانیان بۆ فرۆکە لێدان بەرز کراونەتەوە ئەگەر فرۆکە بۆ سەر بازگەیان بێن، تەقیان لێ دەکەن. لە سەربازگە تێپەڕبووین لە ڕێگا بیرم لە سەربازەکان دەکردەوە، لە پێچەکان سەرکەوتین گەیشتینە ڕواندز، دیاربوو خەڵکی شار ئالۆزبوون باسی ئەوە دەکرا کە فرۆکەکانی ئینگلیز زۆر بەبێ بەزەیی لە بەغدا دەدەن زیانێکی زۆریان بەبەغدا گەیاندوە.

دەنگوباسێکی وا بلاو بۆوە کەوا خەڵك ناو نووس دەکرێت بڕۆنە شەڕ دژی داگیرکەرانی ئینگلیزوشەڕ گەرم بوو لە بەغداو حەبانیە. ڕواندز یەك ڕادیۆی لێ بوو کاتی دەنگوباس خەڵك دەچوون گوێیان دەدا دەنگوباس بەتورکی، ئەو شەوە لەڕواندز مابینەوە لەماڵی(نادرئاغا)، دوای نان خواردنی مەغریب (نادرئاغا) لەگەڵ خۆی بردمی بۆ چایخانە کە، ئەوەی ڕادیۆی لێ بوو دیاربوو گوێیان لە دەنگوباس دەگرت، دیاربوو کۆمەڵێك پیاوی کامڵە پیاو لەتورکی دەگەیشتن لەکاتی ڕادیۆ دەستی کرد بەکار خەڵك کشومات گوێیان ڕاگرتبوو ئەوانەی گوێ ڕاگربوون کامڵە پیاو بوون کەمێك تورکیان دەزانی لەوکاتەی ڕادیۆ دەستی کرد بەقسە زۆر بەوردی سەیرم دەکرد، ڕادیۆکە زۆر گەورەبوو، ئەنجامی دەنگوباسەکە بەوە گەیشت کەوا ئینگلیزەکان گەڕانەوە بەغداو (ڕەشید عالی) ڕای کردوە، هەست دەکرا بەگرتنەوەی بەغدا لەلایەن ئینگلیزەوە خەڵك دڵتەنگ بوونە، بەشی زۆری جەماوەر نیگەران بوون.

هاوینە هەوار: گوندی وارەکۆن بەهاوین گەرمەو ئاوەکەشی ناسازو گەرمە لەهاوین ماڵمان ڕۆیشتە گوندی جنێراوە، گوندی ناوبراو پڕە لە دارو درەختی جۆراو جۆر ئاوێکی سازگاری لە ئاوی (دەنگار) بۆ دەچێت، جنێراوە کەوتۆتە بناری هەندرێن بەرامبەر چیای زۆزك ڕوباری ڕواندزی بەبەین دا دەڕوات لەناو یەکێك لە باخچەکان کەپرو ساباتێکی گەورە دروست کران ئاوە ساردەکەی لە(دەنگار)ێ دەهات بەناوساباتەکەدا دەڕۆیشت، لەڕاستیدا هاوینەهەواربوو کە تەواو سەرما دادەهات ئەوجا دەگەڕاینەوە گوندی وارەکۆن.

لەسەرەتای بەهاری (١٩٤١)سەربازگەیەکی ئەندازیاران(هەندەسە) چادریان لەو بەری ڕوبار هەڵدا دیار بوو خەریکی سەنگەر لێدان بوون لەسەر گردێك سەنگەریان دروست کرد لەو بەرو ئەو بەری بناری چیایەکانی زۆزكو هەندرێن دیاربوو

سەنگەرەکانیان زۆر بەپتەوی‌و قایم دروست دەکردن رووی سەنگەرەکان بەرەو رێگای (حاجی ئۆمەران) داندرابوون، چونکە مەترسیان لەورێگایە هەبوو. دوو ئەفسەری بەشی ئەندازە کە کورد بوون(ملازم علی عزیز ئامێدی‌و ملازم فتاح شالی سلێمانی) بوو، ئەو ئەفسەرانە بوونە ناسیار زوو زوو دەهاتنە ساباتی ئێمە بەتایبەتی رۆژانی هەینی لەوکاتەی ئەفسەرەکانی کورد لە حامیەی رواندز دەهاتنە سەر ئاوی (دەنگار) لەوێ بەیەك دەگەیشتن و یەکتریان دەبینی، (جەلال ئەمین بەگ، ملازم نوری حکیم، جەلال بالتەوعبدالرحمن قازی) زوو زوو دەهاتن جار جار هی تریشیان لەگەڵ دەهاتن.

وا هەڵکەوت رۆژێك ئەفسەرەکانی بەشی ئەندازیاری لەسەر گۆرستانی پشتی گوند کاریان دەکرد لە ماڵەوە هەندێ ترێ‌و هەنجیریان دایە دەستم بۆ یانم برد(ملازم علی) گوتی: (زرار دایکی تۆ جیایە لە دایکی عزتی برات؟) هەر زوو روی کردە ئەفسەرەکەی لەلای دانیشتبوون گوتی: (بزانە چۆن زانیم باوکی وەك برایەکەی سەیری ئەوە ناکات تەواو هەست دەکرێت بەجیاوازی کردن لەنێوانیان)، ئەوەی دیاربوو بێگانەش هەستیان بەو جیاوازیە دەکرد کە باوکم دەیکرد.

لەهاوینی (١٩٤٢)، (وریا ئەمینی رواندز)ی بۆ پشووی هاوین لە کەرکووك هاتبوە ماڵمان ناوبراو قوتابی دواناوەندی بوو بۆ بەسەر بردنی پشووی هاوین هاتبوە لامان، لەوکاتەی ئەوهات سەربازگەیەکی سەربازە ئاوارەکانی(پۆلۆنی) لە بەرزێوە بەرامبەر جنێراوە چادریان هەڵدان، (وریا) کەمێك ئینگلیزی دەزانی زۆر جار دەچووینە لایان چەند ئەفسەرێکیان بووبونە ناسیاو وا هەڵکەوت رۆژێك ئەفسەرەکان هاتنە ساباتی ئێمە لەکاتی دانیشتنیان سندوقی قەوانیان بۆلێدان ئەفسەرەکان تێ نەدەگەیشتن سەریشیان لەبەر دەنگی (مریەم خان) دەهەژاند ئەوەی بیدیبیایە وای دەزانی تێ دەگەن، لەکاتێکا سەماواریان هێنا بۆ سابات یەکسەر یەکێك لە ئەفسەرەکان چاوی بەسەماوار کەوت‌و هەستا سەیری کردو نووسینەکەی خوێندەوە دەستی کرد بەگریان‌وگوتی: (ئەو سەماوارە لە کارگەی مامم لە وارشۆ دروست کراوە)، (پۆلۆنی)ە، ئاوارەکان ماوەیەك لەوێ مانەوە ناوە ناوە دەهاتنە ناو باخچەکان ئێمەش دەرۆیشتینە لایان.

ئەو ماوەیەی (وریا) لامان بوو بیرمان لەوە کردەوە بیەینە ڕاوە (ژوژك)، باسی ئەوەمان کرد دەڕۆینە ڕاوە (ژوژك) وریا گۆتی منیش دێم. بەگاڵتە پێمان گۆت تۆ نابەین چۆن دڵمان دێت تۆ ببەین ماندو دەبی ناوبراو گڕی گرت ودەیگۆت هەردێم نابێ بەجێم بێڵن لە دواییدا گۆتمان باشە دەتبەین تەنەکە کوتان دەدەینە تۆ ئاسانە، گوتی غەمتان نەبێت چۆن دەڵێن ئەوها تەنەکە دەکوتم، ئێوارە تاریك داکەوت لە گوند دەرکەوتین تەنەکەمان دا دەستی(وریا)پێمان گـوت چۆن تەنەکە بکوتیت گەیشتینە ناوگۆڕستانی پشتی گوند لەبناری (هەندرێن) لەوێ (وریا) مان بەجێهێشتو بەبیانووی ئەوەی ئێمە دەڕۆین ژووژك ڕا دەپەڕێنین، ئەویش دەستی کرد بەتەنەکە کوتان، ئێمە هەریەکەی بەلایەکدا گەڕاینەوە، کاتێك باوکم زانی(وریا) مان بردۆتە ڕاوە (ژوژك) وا تەنەکە دەکوتێت زۆر تورە بوو گوتی: (زوو بڕۆن بەدواییدا بزانن بەتەنیا ماوەتەوە ئەو مندالە لەشار گەورە بوە لەو چۆلە ماوەتەوە دەترسێت ئەو نازانێ ڕاوە ژوژك گاڵتەیە) لە دوای دوانی باوکم بەپەلە ڕۆیشتین و(وریا) مان هێنایەوە لەگەڕانەوە ناوبراو دەی پرسی: (کوا چەند ژوژکتان گرتوون؟) دیاربوو زۆر ماندو بووبوو دیاربوو تەنەکەی باش کوتابوو، بەدرەنگەوە زانی گاڵتەیان لەگەڵ کردوە کەمێك تێکچوو ئەوەی سەیر بوو ئەوە بوو لە دواییدا دەیویست نەزانەکان بباتە ڕاوە ژوژك.

ئەوەی شایەنی لێ دوانە ڕۆژگار وای بەسەر هێناین هەردووکمان دەربەدەر بووین لە دەرەوەی نیشتیمان دەژیاین ئەو لە(ڤیننا)و منیش لە(تاشکەند) یەك لەڕۆژهەلات ئەوەی تر لە ڕۆژئاوا وا ڕێکەوت لە ساڵی (١٩٥٧) (وریا) نامەیەکی دورو درێژی بۆ من نووسی زۆر شتی بۆ نوسیبووم یادی ڕابردوی تێدا دیارکردبوو لە بارەی ڕاوە ژوژك نووسی بوی(کاکی ئازیز زرار سەد خۆزگەم بەو شەوەی کە لە جنێراوە منتان بردە ڕاوە ژوژك). کۆمەڵێك وێنەی بۆ ناردبووم. وەڵامی نامەکەم بۆ نوسیی یەوە پێم ڕاگەیاند دیارە گۆڕاوی پێشان لەگەڵ کۆمونیستەکان بوی ئێستا شتێکی تری، پارچە هەڵبەستێکی خۆشم بۆ نووسی لە ژێر ناوی (پەرۆشم).

# هاوین بوو باسكم شكا

(مەجید بەگ كوڕی میر حمدامین) لە باوكی زیز بوبوو لای ئێمە دەژیا، ناوبراو لاوێكی چووستو چالاكوبەڕاپەڕبوو، بەشی زۆری كاروبارەكانی ماڵمان ناوبراو ڕای دەپەڕاند، چەكدار بوو تفەنگی جام بێزاری هەبوو.

ڕۆژێك بەیانی (مجید بەگ) بەمنی گوت: (ئامادەبە دەڕۆینە ڕواندز وەڵاخەكان دەبەین ناڵیان دەكەین)، لە دوای چێشت خواردن لە ماڵ دەركەوتین بەڕێگای (بەنی هەندرێن) دا ڕۆیشتین، ئەو سواری ماینی باوكم بوبوو منیش سواری هێستر بوبووم، لە بێشوك گەیشتینە سەر ڕێگای ئۆتۆمبێل، هەر لە گەروك (شیران) مجید بەگ لە من دوور كەوتەوە، ئەو لە پێشەوە دەڕۆیشت نزیك قشلەی سوپا لەناكاودا ئۆتۆمبێلێكی پاس لە دواوە بۆڕاندی لەگەڵ ئەو دەنگە گەورەیەدا هێسترەكەم ڕاپەڕیو من كەوتم، كە هەستامەوە زانیم باسكم شكاوە، هەرئەوەندەم بۆ كرا توانیم یەكسەر دەسەسرەكەم بەهەر شێوەیەك بێت لە باسكم بپێچمەوەو هێسترەكەش ڕۆیشت بەدوای (مجید بەگ)دا، كە ناوبراو دەبینێ وا هێسترەكە بێ زرارەو بەدوایدا دەڕوات یەكسەر جڵەوی ماینەكەی دەسوڕێنێتەوەو دەگەڕێتەوە، كە گەیشتەلام دیتی باسكم شكاوە، بەسەرهاتەكەم بۆ گێڕایەوە، ئینجا لەوێ ڕۆیشتینە كاولۆك، لە ماڵی (عزیز ئاغا) ناردیان پیاوێك هات گوایا لە شكەست دەزانێ، تا هەڵی بەستەوە ئەوەندەی ئەزیەت دام زۆر لە شكانەكە بەئازار تر بووم بەدەستیەوە.

من لە ماڵی (عزیز ئاغا) مامەوە (مجید بەگ) چووە ڕواندز وەڵاخەكانی ناڵ كردو گەڕایەوە لای من، لەوێ بەرەو ماڵ گەڕاینەوە بەئێشو ئازارێكی یەكجار زۆرەوە دوو شەو هیچ خەوم لێ نەكەوت، ماوەیەكی زۆری بەسەردا تێپەڕی تاكو خۆی گرتەوە، ئینجا بەدیار كەوت خوار هەڵبەستراودتەوە، باوكم كە بینی دەستم خوارە ناردی بەدوای (كوێخا ئەحمەدی كۆیلەیی)، ناوبراو پسپۆری شكەست بوو، كە كوێخا گەیشتە جنێراوەو زوو سەیری باسكی كردمو گوتی: (ماسیەكم بۆ پەیدا بكەن)، ماسیان بۆ هێنا دیار بوو ماسیەكەی كوتا، گۆشتە كوتراوەكەی لە شوێنی شكاوەكە بەستو ئەو شەوە پێیەوە نوستم، بەیانی زوو بانگی كردمو داینامە تەنیشت خۆیو

قسەی سەیرۆکەی بۆ دەکردم، دەیگوت: (زانیوتە شا بۆتە عەجەم)!! لە پڕێکا تیە دەستێکی لە شوێنە شکاوەکەدا هەرئەوەندەم زانی چاوم تاریك بوو، کوێخا کۆمەڵێك پەلە داری لە داری (بی) ئامادە کردبوون‌و پوشیەکەی ڕوناسیان کردبوە هەویر، لە دوای ئەوەی شوێنە شکاوەکەی داناوە جێگای خۆی زوو ڕوناسەکەی دانایە سەرو پەلە دارەکانی پێوە پێچایەوە، هەر ئەوەندەم خۆ دیتەوە ئێش‌و ئازارەکە نوێ بوەوە، دوو شەوو ڕۆژ چاوم نەچوە خەو وەك جاری پێشو ئازارم هەبوو، کوێخا ڕۆیشتبوەوە من لە بەر ئازار ئاگام لێ نەبوو، هەڵبەتە ماوەیەك دەستم بەهەڵبەستراوی مایەوە، زیاتر لە بیست ڕۆژ پەلەکان بەباسکمەوە بوون، ئینجا پەلەکان لێ کرانەوەو تەنها پەڕۆی بەڕوناسی پێوە مایەوە.

ڕووت کردنی ئەحە کەچەڵ: لە پایزی هەمان ساڵ هێشتا ماڵمان هەر لە (جنێراوە)بوو، بەیانیەك باوکم لە سابات دانیشتبوو بەنیازی ئەوە بوو بڕواتە ڕواندز، لەو کاتەدا بوو لەبەری ئەو بەر لە ڕێگای ئۆتۆمبێل پیاوێك دیاربوو بەسواری گوێ درێژێك بەرەو ڕواندز بەپەلە دەڕۆیشت، لە سەرەتاوە نەیان ناسی لە دواییدا (علی شێرکاوەیی) گوتی: (ئەوە ئەحە کەچەڵی پیاوی فتاحە کوێرە) باوکم بەدەنگ هات‌و گوتی: (ئەبێ بەردێك بخەمە بەر ددانی ئەو سەگ بابە) چەند جارێك میر داوای لێ کردوە (قادری سەعیدی) بکاتە نۆبەتدار هەر گوێشی نەداوەتێ قادرە درێژ هیچی نیەو وەزعیشی لەوپەڕی پەرێشانیدایە، (فەتاحە کوێر)ی بێ ڕێز لەسەر زەوی ئێمە دەژی‌و مراقیبەو ئێمەش بەهیچ نازانێ ! لەوکاتەش هەستاو لە سابات دەرکەوت‌و وەڵاخیان بۆ هێناو سوار بوو ڕۆیشتە ڕواندز، لە دوای ڕۆیشتنی باوکم (مجید بەگ) خۆی پێچایەوەو فیشەکدانی لە خۆی بەست‌و بەمنی گوت: (هەستە بابڕۆینە وارەکۆن) ئەو بەپەلە دەرکەوت منیش بەدوایدا ڕۆیشتم، نێوان (وارەکۆن‌و جنێراوە) مەودایەکی دورەو ناوبراو بەپەلە دەڕۆیشت منیش بەدوایدا، بەڵام نەیدەگەیشتمێ، کە گەیشتینە (وارەکۆن) لەسەر کانیاوەکەی گوند دەم‌و چاومان شوشت، لە دوای پشودانێکی کورت (مجید بەگ) دەستی دایەوە تفەنگ‌و گوتی هەستە با بڕۆین! سەرم سوڕماو بەلامەوە زۆر سەیر بوو ئێمە بۆ وارەکۆن هاتبوین ئێستا بۆ کوێ دەڕۆین!؟ بەسەر سامیەوە پرسیم: (ئەرێ ئێمە بۆ کوێ دەڕۆین؟) وەڵامی نەدامەوەو ڕۆیشت، ناچار بەدوایدا ڕۆیشتم بەرەو پردی کۆنی پاشا کەچی نەڕۆیشتە سەر پرد بەڕێگای

بەری (کەنگرێنە)دا ڕۆیشت کە گەیشتینە بەرامبەر (کۆسپێ سپی) لە دەم ڕوبار لە شوێنێك لە ژێر داربیەکان دانیشتین ڕوو لە ڕێگای ئۆتۆمبێل ئەوکاتە بەمنی گوت: (زوو لە ڕوبار بپەڕەوەو برۆ سەرجادە لەگەڵی برۆ تا دواوەی پیروسوان هەتا منتان دەگەمێ). بەپەلە لە ڕوبار پەڕیمەوەو ڕۆیشتمە سەرجادەو(ئەحە کەچەڵ) یش گەیشتەلام، ماندوو نەبوتم لێ کردو وەڵامی دامەوەو گوتی خۆت ماندوو نەبی. لەگەڵی ڕۆیشتم ناوبراو بەسواری گوێ درێژێك بوو منیش بەپیادە، نزیك کەوتینەوە لە چناری مازوکەران لەوکاتە پێم گوت مامە توتنت پێیە؟ (ئەحە) گوتی: (بەڵێ)، دەستی برد کیسەی توتن دەربێنێ و(مجید بەگ) لەدواوە بانگی کرد (ڕاوەستن!) دیاربوو پیاوەکە ڕەنگی گۆڕاو گوتی: (باوکم لەسەرچی دەمکوژن؟) هەر لەسەر پشتی گوێ درێژەکە چاوی (ئەحەی) بەستن‌و دایە پێش خۆی بەکەندی(زەروان)دا سەرکەوتین بۆ ناو دارستانەکەی سەرەوە، لەوێ لە شوێنێك دامان بەزاند، (مجید بەگ) کەڵو پەلەکەی کە پێی بوو بردی لە شوێنێك شاردیەوەو گەڕایەوە (ئەحە)مان بەچاوو دەست بەستراوی بەرو پشت سواری گوێدرێژەکە کردەوە بردمان لەسەر ڕێگای ئۆتۆمبێل بەرەو بەرسیرین بەڕێمان کرد، بەخۆشمان بەو ڕێگایەدا گەڕاینەوەکە پێیدا هاتبوین، (ئەحە) بەوشێوە بەچاوو دەست بەستراوی بەسواری گوێدرێژ لە گۆڕستانی(کاولان) لە خوار بەرسیرین دەگاتە(سمایل ئاغا)ی بەرسیرینی، ناوبراو(ئەحە) بەو شێوەیە دەبینی‌و ڕای دەگرێت‌و دەست‌و چاوی دەکاتەوە، لێی دەپرسێت: (ئەوە کێ وای لێ کردی؟) ئەحە بەلالوتی دەڵێت: (لە ئێوە بەولاوە کێ دەتوانێت ڕێگری بکات؟) سمایل ئاغا لە قسەکانی ئەحە سەرسام دەبێت‌و دەکەوێتە بیر کردنەوە، مەگەر ئەحە توشی بەلایەکی بکات، لەوێ (ئەحە) دەڕواتە حافیز، بەیانی ڕۆژی دوایی زوو دەگاتە (جنێراوە) هێشتا زۆر زوو بوو لەخەو هەڵیان ستاندم‌و گوتیان برۆ سەماوار ببەبۆ سابات میوانی لیبە. کاتێك لەجۆگەی ئاو بازمدا دەبینم خۆ ئەوە (ئەحە کەچەڵ)ە دانیشتوە، یەکسەر بەسەماوارەوە گەڕامەوە ڕۆیشتمە لای (مەجید بەگ) لەخەو هەڵم ستاندو پێم گوت: (ئەوە ئەحە لەبن سابات دانیشتوە چاوەڕێی باوکم دەکات)! (مجید بەگ) بەچاوی خەواڵۆوە گوتی: (تۆ بەڕاستیتە یان گاڵتە دەکەیت، چۆن بەم بەیانیە گەیشتۆتە ئێرە؟)! کاتێك باوکم ڕۆیشتە سابات بانگی منیان کرد بەناچاری سەماوارم بۆ سابات برد، لەوکاتەدا

(ئەحە) نامەیەکی دایە باوکمو گوتی (میرم دوێنێ نیوەڕۆ لە کۆسپی سپی منیان ڕووت کردو ئەو کەڵو پەلانەی لە ڕواندز بۆ ماڵی فەتاحم کڕی بوون لێیان ستاندم) باوکم لێی پرسی (ئەوانەی تۆیان ڕووت کرد نەت ناسین کێ بوون؟) ئەحە لە وەڵامدا گوتی: (بەڵێ میرم ناسینم پیاوەکانی ئێوە بوون منیان ڕووت کردەوەو بەرەوپشت بەسواری گرێدرێژەکەم بەرێیان کردمەوە بەرەو حافیز) باوکم گوتی: (پیاوی باش بەئێمە پیاوی وامان نییە تۆ ڕووت بکەنەوە، بەهەڵەدا چووی، ئەوانە نابێ پیاوی ئێمە بووبن)، ئەحە هەر زوو پەنجەی بۆ من درێژ کردوگوتی: (میرم بەساقەت بم یەکێکیان ئەمە خۆیەتی لەوانەی کە منیان ڕووت کردەوە) باوکم گوتی: (ئەحە ئەو کوڕە باسکی شکاوە لەماڵ دەرناچێتو کاری واش ناکات، ئەوەی تۆ دەیڵێیت نەگونجاوە) ئەحە گوتی: (میرم وەڵڵا ئەمە خۆیەتی انشاءالله درۆ لە ڕووی ئێوە ناکەم حەز دەکەم دڵتان لێم نەرەنجێت) باوکم هەستاو ڕۆیشتەوە لای ماڵ بانگی کردمو پرسی: (ئەو پیاوە پەنجە بۆ تۆ درێژ دەکات ڕاستە شتی واتان کردوە؟) گوتم: (بەڵێ هەر ئێوە ڕۆیشتن بۆ ڕواندز مەجید منی لەگەڵ خۆی برد بەناوی ئەوەی دەچینە وارەکۆن، لەوێش بۆ کۆسپی سپیو لەگەڕانەوەی ئەحە کەڵو پەلەکانی لێ ستاندو لە زەروانی لێ شاردەوە) باوکم گوتی: (هەر ئێستا لەگەڵی دەڕۆیت شتەکانی بەبێ دەنگی دەدەیتەوە) خۆی ڕۆیشتەوە ساباتو بە(ئەحە)ی گوت لەگەڵ ئەو کوڕە دەڕۆیتو ئەشیاکانت دەداتەوەو بەبێ دەنگی دەڕۆیتەوەو کەس نەزانێ).

لەگەڵ (ئەحە) ڕۆیشتم چوینە (زەروان)و شتەکانم نیشاندانو خۆم گەڕامەوە، ناوبراو شتەکانی بار کردو گەڕایەوە حافیز. باوکم لەگەڵ (مەجید بەگ) قسەی کردبوو پێی گوتبو(ئەوەی ئێوە کردوتانە کارێکی زۆر نارێكوناساز بوو، کاری ئەوها دەبێ بەوەستایی بکرێت، نەك بەوشێوەیەی کەئێوە کردوتانە، ئەوەی من گوتم بەردێك دەخەمە بەر ددانەکانی فەتاحە کوێر، ئەوەنەبوو وەك ئەوەی کە کردوتانە بچن کەڵو پەل لە ئەحە کەچەڵ بستێنن).

چارە چییەو ئەبێ چی بکەم: بەڵێ وەك لەسەرەوە باس کراوە ژیانم بەد بەختیو دەردەسەری بووە هەر لەمنداڵی خراوەمە ژێر زەبری باری گرانو کوێرەوەری کاری نارەواو ناپەسندی زرِدایكو تێ هەڵدانی بێ بەزەیی باوکم، ئەوەی دەربارەی من لە ئارادا هەبوو خەڵکیش ئەو هەڵوێستە چەوتەی باوکمیان دەزانیو تێ گەیشتبوون،

هەر ئەو هەڵوێستە نالەبارەی باوکم پاڵی دام بۆ بیرکردنەوەی داهاتووم لە زۆر کاری جۆراو جۆر، بەلاَم توانیم بەهەر جۆرێك بێت خۆم لە کرداری خەراب دوور بگرم، ئەگەر چی لەناو دەریایەکی بێ سنور دەسوڕامەوە، ئەگەر بەوردی باسی ژیانی خۆم بکەم بەڕاستی دەرچوون لەناو ئەو دەریایە بێ سنورە زۆر زەحمەت بوو، خۆم دەبینی بێ بەرگو بێ پێڵاو، گومانی تێدانییە تەمەنی لاوی سەردەمێکی تایبەتە لەژیانی گەنجایەتی تازە پێگەیشتودا، بێ شکە هەموو گەنجێك ئارەزویەتی خۆی بلاوێنێتەوە بەبەرگی نوێو پێڵاوی تازە، بەلاَم دەتوانم بلێم تەمەنم گەیشتۆتە پازدە ساڵ نەبەرگی نوێو نەپێڵاوی تازەم بەبەر خۆمەوە دیوە، دەبی ئەوەش بزاندرێت گەنج دڵ ناسکە حەز ناکات دڵ شکاو بکرێت، کەچی هەردەم غەمبارو دڵ شکاو بووم، بەچاوێکی سوك سەیر دەکرام، خۆ ئەگەر ئەو بەدکاریە هەر لەلایەن باوکمەوە بوایە ئەوەندە بەپەرۆش نەدەبووم، لەبەر ئەوەی باوکمە، بەلاَم ئەو بەدیە لەلایەن زڕدایك‌و نۆکەری ناومالێش (حەیدەرە ڕەش) کە بوبوە باوەڕ پێکراوی (ئاغاو ئاغا ژن) وای دەزانی ئەوکوڕی میرە، ئەوەش وا دەگەیێنێ جلەوی هەست‌و مست لە میرەوە بۆ ئەو پیاوە خۆنەناسە شل کرابوو ئەوەندە لە باوکم‌و زڕدایك بێزار نەبوبوم، ئەوەندەی لەو پیاوە پڕو پوچە بێزا ببوم.

ئەو بێزابیەو نارەزاییە زۆر جار پاڵی دەدام بۆ دەست وەشاندن لە زڕدایك یان نۆکەری (ئاغاو ئاغاژن)، بەلاَم توانیم خۆم ڕابگرم، لە خراپە خۆم بەدوور بگرم.

جیا لە دڵ شکان‌و بێ بەرگی‌و شپرزەیی ئەوە لەلایەك، کاری واشیان پێ دەکردم زۆر لە توانای من هەوراز تربوو، چارەش نەبوو خۆش یان نەخۆش دەبوایە بیکەم چارەڕەشی لەوەدا بوو.

لەڕاستیدا ئەوەی زۆر دڵمی ئاڵۆز کردبوو شەرمم لەخۆم دەکردەوە کە خۆم بەبێ بەرگی دەدیت، تەمەنم لە پازدە ساڵ زیاتر بوو بەرگی نوێم بەبەر خۆمەوە نەدیت کە دڵم پێ خۆش بێت، بەخۆم نەمتوانی بیکڕم باوکیشم بۆی نەدەکڕیم، لێرەدا ئەوەبوو کەوتمە بیرکردنەوە، چارە چییە؟

دوا بەدوای بەسەرهاتەکەی (ئەحەکەچەڵ) بەماوەیەك ڕۆژێك دەگەڕامەوە لە ڕێگا لەگەڵ (ڕەسولی مەلا ئەحمەد)ی، ناوبراو دار فرۆش بوو ماڵی لە جنێراوە بوو کاتێك گەیشتمە تاتی (مەلا شێخ)ی دیتم جەڵەبێکی زۆر لە خوار باخچەکانی خەلکان

بلاّوی ناو قامیشەلاّنی سەر ڕوبار مۆڵ بوینە، شوانەکانیش لەسەر کانیاوەکە چایان لێ نابوو دیتم هەڵکەوتە بە(مام ڕەسول)م گوت زەحمەت نەبێت هێسترەکەم بۆ ببەوە من دەگەڕێمەوە بێشوك شتێکم لەبیر چوە، بەو بیانوە گەڕامەوە یەکسەر ڕۆیشتمە سەر پردی (خەڵکان)و پەڕیمەوەو چومە دەم ڕوبار خۆم گەیاندە، مەڕەکان یەکسەر دوو بەرانم بەپشتێن لە یەك بەستن‌و لەوێم بەجێهێشتن، ڕۆیشتمەوە بێشوك تاکو تاریك داهات، کە دیتم جەڵب گەیشتەوە کەندە کەورین ئەوکاتە ڕۆیشتم زانیم پۆلیسەکانی مەخفەریش خەریکی خواردنی نانی مەغریبن، کاتێك چووم بەرانەکان هەر لە شوێنی خۆیان مابونەوە، لەسەرەخۆ بەهێواشی بردمنە سەر ڕێگا بەو شەوە بردمنەوە (جنێراوە) لەوێ لەناو باخچەیەك بەستمنەوە بەو نیازەی بیان فرۆشم‌و دەستە جلێك‌و پێلاّوێکی پێ بکڕم بۆ ئەوەی جاروبار بیان کەمە بەرم، بەو شێوەیە بەرانەکانم لە پەنایەك لە ناو باخچەکە بەستبونەوە بۆ ئەوەی دوو سێ ڕۆژی بەسەردا بڕوات ئەوجا بیانبەم بیان فرۆشم، کەچی لە بەدبەختی من باوکم زانیبوی‌و ناردبوی یەکێکیان بۆ بردبوو یەکسەر کوشتبویەوە، بۆ ئەوەی تریش گوتبوی ئاگاداری بن لەوماوەیەدا مێوانمان دێت، مانای ئەوەیە ئەویش ڕۆیشت، بۆیە کەوتمە بیر کردنەوە ئاخۆ چی بکەم، چارە چیە!!

لەوماوەیەدا باوکم لەسەر داوای (محمود بەگ)ی برادۆست چووە (مجێسەر) لە ناوچەی برادۆست، ڕۆیشتنی باوکم هەلێکی لەبار بوو توانیم بەرانەکە ببەم بۆ ڕواندزو بیفرۆشم، بەپارەکەی دەستێك جلم پێ کڕی‌و گەڕامەوە، شایانی باسە ئەو کردارەی من ڕێگا خۆشکەرێك بوو بۆ زڕ دایکم‌و حیدەرە ڕەشی (بەکرۆکە) کە باوکمی پێ هان بدەن لەدژی من.

دەمزانی کە باوکم بگەڕێتەوە ئەزیەتم دەدات، کاتێك گەڕایەوە من خۆم شاردەوە لەگەڕانەوەیدا یەخەی دایکمی گرتبوو داوای لێ کردبوو ئەو جلانەی کە کڕیبوم بیدەنە دەستی بۆ ئەوەی بیانسوتێنێ! ڕۆژی دووەم کاتی بەیانی زوو لە ناو گۆڕستانی پشتی گوند درێژ ببوم بینیم (ڕەئیس بەشیرو ملازم علی عزیز) هاتنە لام دەچون سەری سەربازەکان بدەن ئەوانەی خەریکی سپیر چاك کردن بوون، ملازم علی گوتی: (ئەوە بۆ لێرە درێژ بووی؟) منیش بەسەر هاتەکەم بۆ باس کرد، دیار بوو زۆر پەرۆش بوون بەقسەکانم بۆیە گوتی:(کێتان نەخۆشە لەماڵ بەپەلە داوای تەبیبیان کردوە

ئێمەش تەبیبمان بۆ ناردن؟) گوتم: (برام جانگیر چەند ڕۆژێکە زۆر نەخۆش‌و هیلاکە)، ئێمە لەو قسانە دابووین بوو بەهاوارو گریان دیار بوو (جانگیر) تەواو بوبوو، باوکم ئەو کوڕەی ئەوەندە خۆش دەویست وای دەزانی هەر ئەوەندە کوڕەی هەیە، زۆر ئالۆز بوو خەڵکێکی زۆر کۆبونەوەو منی لەبیر چوو، هەرئەو کاتە سەربازەکان گۆڕیان بۆ هەڵکەندو شاردیانەوەو تازیە داندرا. چەند ڕۆژێك بەبەردەوامی خەڵك دەهاتن بۆ تازیە، لەوناوەدا من لە بیر کرام، بەڵام من هەر دەترسام‌و دەمگوت ئاخۆ کەی‌و لەچ کاتێك توشی نگبەت ببم! لەوەرزی پایز بەدرەنگەوە مالّمان گەڕایەوە (وارەکۆن) ئەوکاتانە لە بارێکی نالەبار دەژیام، بەڕۆژ وەلأخم دەبردن بۆ لەوەڕگاکان‌و ئێوارەو بەیانیان دەبوایە بیان لەوەڕێنم، بەو شێوەیە من خزمەت کار بووم و(حیدەرە ڕەش) یش یاوەر بوو! بەدرێژایی ئەو زستانە ساردو بەفراویەش دارکێش بووم، جیا لەوەش بۆ ئەمەلاو ئەولاش دەنێردرام، زۆر شەوان دەڕۆیشتمە مالّی (علی شێرکاوەیی) ناوبراو پیاوێکی زۆر باش بوو هەر لە گەنجیەوە چەکداری باوکم بووە، خێزانی (زوول) منی زۆر خۆش دەویست، شەوێك پێی گوتم: (نازانم هۆی چیە باوکت تۆی لە بەرچاو کەوتوە؟) لەوەلأمدا گوتم: (پورە زوول ئەوەش چارەنوسی منە، دیارە چارەنوسم تەنها بەد بەختی‌و چارە ڕەشیەو لە ژیان بێ بەشم).

ئەو زستانە زۆر سەخت بوو، بەفرێکی زۆریش باری، بەو سەرماو ساردیە جەڵەب بەرەو ئێرانەوە دەڕۆیشت، ئێوارەیەك نزیك مەغریب لە پردی (وارەکۆن) پەڕیمەوە ئەو بەری جادەکە، کوتەکە بەفر ئەوەندە بەرز بوو منداڵ لە ناویدا دیار نەدەبوو، کاتێك مێگەلی جەڵەب گەیشتە ڕاستی پردەکە توانیم دوو مەڕ لە جەڵەب دابڕم‌و بیان بەم بۆ سەر پردەکەو لە شوێنێکی پەنا ڕایان بگرم تاکو جەڵەبەکە لە پێچەکە ئاودیوو بوو، ئەوکات بەتەواوی دونیا تاریك داهات، مەڕەکانم بردنەوە گوندو بردمنە لای (مستەفا حسێنی ڕەسوکەی) ڕوستایی داواشم لێکرد کەس نابێ بیزانێ، کەچی بۆ ڕۆژی دوەم باوکم پێی زانی‌و یەکێکی کوشتەوەو ئەوەی تریشی دەست بەسەردا گرت، ئەویشم چوو بۆم بەدیارکەوت لە هەموو شتێك چارە ڕەشم‌و نازانم چارم چیە؟.

زستان ڕۆیشت بەئەزیەتێکی زۆرەوە سەرەتای بەهاری (١٩٤٣) کەوتمە گێژاوێکی پڕ لە ئەزیەت‌و سەر شێوانێکی ئالۆزو زۆر گران، لە کۆتایی مانگی دووی ئەو ساڵە ڕۆژێك دوو باری باراشیان لە هێسترەکان بار کردو بەمنیان گوت: (برۆ ئەو باراشە

بەئاشی دەرگەڵە)، بەڵێ کەوتمە دوای هێسترەکان بەرەو دۆڵ ماویل کەوتمە ڕێو ڕێگای درێژی دۆڵ ماویل کۆتایی هاتو هەورازی (شینك) هاتە پێش بەسەلامەتی سەرکەوتین‌و چووینە سەر (زینی دەرگەڵە)، پێش ئەوەی بگەمە گوند لە (چنێران) بەڕێگای سەر جۆی سۆراندا ڕۆیشتمە ئاشی سەروو، خاوەنی ئەو ئاشە (قادر وەسمان) بوو ناوبراو یەك ماڵە بوو لەگەڵ باوکم، کە گەیشتمە بەردەرگای ئاش وادیار بوو ئاشەکە لەگەڕ وەستابوو ئیشی نەدەکرد، لەوکاتەدا (مام قادر) لە ژێر ئاش دەرکەوت دیار بوو خەریکی چاك کردنەوەی ئاشەکە بوو، کە چاوی بەمن کەوت گوتی: (بەخێرهاتی بەڕاستی لە کاتێکی زۆر باش هاتی زۆر پێویستیمان بەهێسترەکان هەیە)، بارەکانمان خستن‌و لەگەڵ (مام قادر) چوینەوە گوند، پێش بڕۆین (مام قادر) بەئاشەوانی گوت: (باراشەکانی مام سلێمان بەگ ببەژوورەوە)، کە گەیشتینە گوند من چوومە ماڵی (مام سەید ئاغا) سێ ڕۆژ بەسەرچوون تا ئاشەکە بەگەڕ کەوتەوە، لەو ماوەیەدا چاوم بەزۆر لە برادەران کەوت ئەوانەی پێویست بوو بیان بینم، ئێوارەی ڕۆژی دووەم لەسەر جۆگای سۆران چاوم بەخۆشەویستەکەم کەوت، کە لەگەڵ کۆمەڵێك بێری دەڕۆیشتنە بێرێ، کەمێك قسەمان کردو گوتی: (ئارەزومە بەتەنیا بتبینم)، وا ڕێککەوت بەتەنیا بینیم‌و گوتی: (ماوەیەك لە مەوبەر حەیدەری نۆکەرتان لای پیاوەکانی ئێمە دەدواو لۆمەی تۆی دەکرد بەشێوەیەکی ناشیرین دەیگوت: (ئەو کوڕە زۆر ناپەسندەو توشی نگبەتی دەبێت، بۆیە ئاگاداری خۆت بە) لەگەڵ پێ ڕاگەیاندنەکە بۆم بەدیارکەوت کچەکە دڵسۆزەو لە غەمی مندایەو هەستی کردوە (حەیدەرە ڕەش) هاندەری باوکمە لە دژی من. ڕۆژی چوارەم سەر لە بەیانی بارەکانیان بۆ بارکردم‌وگەڕامەوە، بەڵام دڵم هەر لەسێ‌و دوودا بووکە پێم دەڵێن بۆچی ئەوەندە دواکەوتی؟ لە زینی (دەرگەڵە) بەسەرکەوتم، وەك هەموو جارێك بەئارەزووەوە سەیری ئەم دیوو ئەو دیوم دەکردو سەرەو ژێر بەناو دارستانی پاڵ زیندا دەڕۆیشتم‌و هەستم بەدڵتەنگیەك دەکرد، لە کۆتایی پێچەکانی شینك لامدایە ڕێگای (ماویلیان)، لە ناوەڕاستی ڕێگای (بەرد گراو) وەهاب ئاغای جندیان خەریکی ڕێگا خۆشکردن بوو، کۆمەڵێك کرێکار خەریکی کارکردن بوون، پێش ئەوەی بگەمە لای کرێکارەکان لە دوورەوە دیتم ماینەکەی باوکم لەوێ بەستراوەتەوەو خۆشی لای (وەهاب ئاغا) دانیشتبوو، هەرمن

لێیان نزیك کەوتمەوە باوکم هەستاو بۆم هاتو گوتی: (ئەوەندە ڕۆژە لە دەرگەڵە چیت دەکرد؟) ڕێگای نەدا وەڵامی بدەمەوە، خۆئەگەر (وەهاب ئاغا)و ئەوانەی لەوێ بوون نەیانگرتبایە خراپی بەسەر دەهێنام، لەگەڵ ئەوەشدا لە ناو دەستی ئەواندا بەردێکی ڕاوەشاند بەڕانم کەوت وامزانی ڕانم شکا لەگەڵ لێدانەکە دڵم سست بوو، ئەوکات (وەهاب ئاغا) پێی گوت: (توخوا ئەو منداڵەت بۆ کوشت؟)! وەك دیار بوو لە هەڵوێستو کرداری باوکم ڕازی نەبوو بەپەرۆشەوە گوتی: توخوا زوڵم بەو دەرەجەیە؟) لە دوای ماوەیەك بەناچاری هەرچۆنێکی بێت بەشلەشلەیی‌و ئێش‌و ئازارەوە کەوتمە دوای هێسترەکان‌و ڕۆیشتم، لە ڕێگا ناوە ناوە دادەنیشتم لەبەر ئێشی زۆر نەمدەتوانی بڕۆم، ئیتر هەر لەوێ کەوتمە بیرکردنەوە دەربارەی ئەو ژیانە پڕ لە تاڵی‌و دەردەسەریەی من دەیچێژم، ئەوە ژیانی مرۆڤ نییە، بەڵکو دەردەسەریەو داهاتوی تاریکە.

بۆ دۆزینەوەی چارەیەك‌و دەرباز بوون لەو دەردەسەریە کۆمەڵێك ڕێگام ڕەچاو کرد، بێگومان کوشتنی زڕ دایك‌و حەیدەرە ڕەش‌و ڕووبەڕوو بونەوەی باوکم چارەی دەردی منی ناکردو ئەم کارانەم بەلاوە پەسند نەبوو، بۆیە بیرم لەوە کردەوە لە ماڵ دەرکەوم‌و بڕۆم هەوڵبدەم ببم بەسەرباز لە ڕیزی سوپا ئەگەرچی باری سەربازی زۆر گران‌و ناخۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئەزیەت‌و ناخۆشیەم پێ باشتر بوو کە بیچێژم لەو دەردە سەرییەی کەمن تێدامە لەماڵەوە، بەو شێوەیە لە ناو دەریایەکی بێ سنوردا دەسوڕامەوە، تەنها خۆم دەزانم بەچ دەردەسەریەك گەیشتمەوە ماڵەوە، بارەکانم فڕێ دان‌و بەپەلە چوومە ژوری دیوەخان‌و درێژ بووم، لەبەر ئێش‌و ئازار زۆر بەئەزیەت بووم ئەوەندەی بڵێی هیلاك‌و پەرێشان بووم‌و تەواو لە خۆم بێزار بووم، لەگەڵ ئەوەشدا ئاغاژن کەوتبوە بۆڵەبۆڵ‌و گوتبوی چۆن ڕۆیشتوە درێژ بێت بۆ هێسترەکانی نەبردونەتە شوێنی خۆیان؟!

لە کاتێکا دایکم هات دیتی زۆر هیلاکم‌و ماندوم نەمدەتوانی هەڵگێڕو وەرگێڕ بکەم‌و زۆر بەئەزیەتم پرسی: (ئەوە چیە کوڕم ئەوە چیت بەسەر هاتوە؟) وای دەزانی هێستر لوشکی لێداوم، لە دوایيدا پێم گوت ئاغا لە ڕێگا لێی داوم، کە سەیری شوێنی بەردەکەی کرد خۆی پێ ڕانەگیراو دەستیکرد بەگریان، گوتم: (دایە مەگری گریان دەردی من دەرمان ناکات، هێشتا زۆری بەدواوەیە، دەردی من تەنیا دۆزینەوەی

ڕێگا چارەیەکە ئەویش ڕۆیشتنە لەو ماڵە زیاترنا، چونکە مانەوەم مەترسیەکی ترسناکی بەدواوەیە بۆیە ناتوانم زیاتر لێرە بمێنم بۆ ئەوەی توشی هیلاکی زیاتر نەبم)، ئەوەی دیاربوو دایکم ئەو کارەی منی بەلاوە باش نەبوو، بەلاّم دڵە بەسۆزەکەی دایکم شکاندو هەرئەو ڕۆژە بەدرەنگەوە ڕۆیشتم بۆ ڕواندز بۆ ئەوەی بەڵکو بتوانم ڕێگایەك بدۆزمەوە بۆ ئەوکاتەی ئەگەر نەکرام بەسەرباز چی بکەم!! ئەبێ ئەوەش بڵێم ئەوکاتەی من هەوڵم دەدا ببم بەسەرباز خەڵك لەبەر سەربازی ڕایان دەکردو خۆیان دەشاردەوە، کەچی من لە تاوی دەردی خۆم داوام دەکرد ببمە سەرباز هەر بۆ ئەوەی بەڵکو لەو دەردەسەریە نەجاتم ببێت.

ئێوارەیەك درەنگ دونیا تاریك داهاتبوو گەیشتمە(ڕواندز) شەو چوومە حوجرەی فەقێیان خالّم لەوێ دەیخوێند، ئەو شەوە لەلای ئەوان مامەوەو بەدرێژایی شەو خەوم لێ نەکەوتو هەر بیرم دەرکردەوە ئاخۆ ئەبێ بکرێم بەسەرباز؟ زۆر بەپەلە بووم زوو ڕۆژ دابێت، بەیانی زوو ڕۆیشتمە تەجنید، کە بەکارمەندانی تەجنیدم گوت: (هاتوم بمکەن بەسەرباز)، بەسەرسامیەوە سەیریان دەکردمو یەکێکیان گوتی: (تۆ بەڕاستیتە یان شێتی؟)، بەقسەی ئەو کاتبەزۆر ئالۆز بووم، بەنیگەرانیو بەبێ پرسی ئەو چوومە ژووری ئەفسەری تەجنید سەیرم کرد لاوێکی ڕوو خۆش دانیشتبوو، سەلامم کردو زۆر بەڕوو خۆشی وەلاّمی دامەوەو گوتی: (فەرموو چیت دەوێ؟) پێم گوت: (هاتوم یارمەتیم بدەیت بمکەیت بەسەرباز بۆ ئەوەی لە مردن ڕزگارم ببێتو هیچ چارەی ترم نیە، چونکە ژیانم لە مەترسیدایە، تەنیا بونم بەسەرباز لە مەترسی نەمان دوورم دەخاتەوە)، ئەفسەرەکە بەڕوێکی خۆشو زەردەخەنەوە پرسی: (دەزانی لەچ ساڵێك لە دایك بووی؟) گوتم: (نا وەللاّ نازانم لەچ ساڵێك لە دایك بوبمە، هەرچۆنێك بێت بۆ ئەوە هاتوم ڕوحمێکم پێ بکەیو بمکەیتە سەرباز بۆ ئەوەی لەو دەردەسەریو بەدکاریە ڕزگارم ببێت، ئەگەر نەکرێمە سەرباز ئەوا ناچارم خۆم لەو خەرەندە فرێدەمە خوارێ، چونکە چارەی من تەنها ئەو دوو ڕێگایەیە) سەیری ئەفسەرەکەم کرد لەگەڵ قسەکانی من ڕەنگی گۆڕاو گوتی: (کوڕی باش بۆ ئەوەندە بێزاری لە ژیانو خۆت لە خەرەند فڕێ دەدەی؟ تۆ هێشتا ئەوە نیت بکرێیت بەسەرباز)! لە دواییدا ئەفسەری هەست بەرز هەستی کرد کارلەکار ترازاوەو بەپێویستی زانی چارەیەك بدۆزێتەوە بۆیە هەستاو گوتی: (وەرە)، لەگەڵی

ڕۆیشتم بردمی بۆلای قائمقامو خۆی چووە ژورەوەو زۆری نەخایاند هاتەوەو گوتی: (قائمقام لێرە نیەو بەیانیش هەینیە، دوو بەیانی وەرەوە هەوڵدەدەم کارەکەت بۆ بکرێت). بەدڵ تەنگی دەرکەوتم ڕۆیشتمە ناو شار لەوێش چوومە (فەقیان) تا ڕۆژی شەممە لەماڵی خاڵەکانم مامەوە، ئەوکاتەی من چوومە (فەقیان) ئێوارەی پێنج شەممە بوو، شەو لەوێ ئەو بەسەرهاتانەی خۆمم بۆ خاڵەکانم (قادروسەعدی) گێڕانەوە، دیاربوو زۆر نیگەرانو بەپەرۆش بوون،بەتایبەتی کاتێ شوێنی ئەو بەردەیان بینی کە لێم درابوو، بانگی نەنیان کردو بۆی داماڵیمو چەوری کرد.

ڕۆژی شەممە بەیانی زوو لەگەڵ خاڵ (قادر) ڕۆیشتینە (ڕواندز) لەوێ یەکسەر بۆلای ئەفسەری تەجنید چوینو ناوبراویش یەکسەر منی بردە لای قائمقام، لە پێشدا خۆی چوە ژوەروەو کەمێك دواکەوتو ئینجا هاتە دەرەوەو بردمیەوە بۆ تەجنید گوتی: (من بەڕێت دەکەم، بەلاَم دەترسێم پزیشکی سوپا لەحامیە وەرت نەگرێت بلێت بچوکە)! ئەوەی جێگای دڵخۆشیم بوو لەتەجنید کارەکانیان زۆر بەپەلە بۆ کردمو کاروباری ئیختیارو موختاریشیان هەر بەخۆیان بۆ کردم. ئینجا بانگی سەربازێکی کرد ناوی (سمایل ئاغا) بوو ئەفسەرەکە ناردی بۆلای موختاری ڕواندز (ڕەئوف ئەفەندی)و پێی گوت: (پێی بلێ ملازم محمد گوتی ئەو ئەوراقانە مۆر بکات)، (سمایل ئاغا) ئەوراقەکانی بردنو ڕۆیشت بۆلای موختار، زۆری پێ نەچوو گەڕایەوەو ئەوراقەکانی تەواو کردبوونو لەگەڵ (سمایل ئاغا)ی سەرباز بەڕێیان کردین بۆ حامیە، لەوێش بردنی بۆ لای ئەو پزیشکەی وەری دەگرتین، لەوێ زۆر چاوەڕوان بووین ئەوە بوو پزیشك وەری گرتینو بەڕێ کراینە مەرکەز تەدریب.

## بەشی دووەم

# لەسەرەتای بەهاری (١٩٤٣)
# بەرگی سوپای عێراقم لەبەر کرد

بەرگی سەربازیان پێدابن، بەلاّم ئەو بەرگەی پێیاندام گەورە بوو بۆم لە دوای وەرگرتنی کەل وپەلی سەربازی بردیانین بۆ یەکێ لە هۆلە گەورەکانی نهۆمی دووەم، زۆری پێنەچوو یەکێك لە نائب عەریفەکانی مەرکەز تدریب هات فێری کردین چۆن لەفافەکان ئەبەسترێن و بەرگ چۆن ئەکرێتە بەر لە دواییدا بەکورتی دەربارەی ڕەوشتی سەرەتایی سەربازی دواو کەمێك لەرێ و رەسمی سەربازی دوا باسی بۆ کردین، لەوکاتەوە کەوتمە ژێر فەرمانی سەربازیەوە سێ مانگ لە حامیەی (ڕواندز) لە مەرکەز تدریب مەشقی سووپاییان پێ کردم، لەماوەی ئەو سێ مانگەدا لە زۆر کاروبار شارەزا بووم و کۆمەلێك ناسیاوم پەیدا کردن، زۆریشم لەوانەی کورد ناسینەوە، ئەوانەی ڕۆژانی هەینی دەهاتنە ناو باخچەکانی ئێمە لە جنێراوە.

لەسالّی (١٩٤١) هەندێ لە سەربازەکانی بەشی ئەندازیاری (هندسە) هاتنە بەرزێوە بۆ سەردانی سەربازەکان، دوو ئەفسەری کوردیان لەگەلّ بوو(ملازم فەتاح شالّی) سلێمانی بوو ئەوەی تریان (ملازم علی عزیز) ئامێدی بوو، ناوە ناوە ئەفسەرە کوردپەروەرەکانی سەربازگەی ڕواندز دەهاتنە (بەرزێوە) لەوێش دەهاتنە ناو باخچەکانی ئێمە لە (جنێراوە)، ئەوانەی لە یادم بوون(جەلال ئەمین)سلێمانی بوو، (جەلال بالّتە) ئامێدی بوو، (نوری مەلا حکیم) سلێمانی، (رەفیق تۆفیق) کۆیی، (عبدالرحمن قازی) ئامێدی، (بەکر سامی)م ئەناسی شەقلاّوەیی بوو، ئەمانە بەناوی سەیران لە بەرزێوە بەیەك دەگەیشتن، بۆ مەرامی خۆیان دەهاتنە (بەرزێوە).

لە مەرکەز تدریب دەست کرا بەمەشقی سەربازی هەر چەند سەربازێك درانە دەستی نائب عەریفێك بۆ فێرکردن، نائب عەریفەکان بەشی زۆریان سلێمانی و کەرکوکی بوون عەریفی بەڕێوەبەری مەرکەزی تدریب ناوی (فقێ) بوو، مرۆڤێکی ماندوو لەسەرخۆ بوو خەلّکی چەمچەمالّ بوو، سەربازەکان لێی ڕازی بوون. لەماوەی

ئەو سێ مانگەی لە مەرکەز تدریب بووم، بەزۆری ڕۆژانی هەینی دەڕۆیشتمە ماڵی خاڵەکانم لە (فقیان) ئەگەرچی ماڵی خۆمان زۆر نزیك تربوو دەمتوانی بڕۆمەوە ماڵ، هەندێ ڕۆژانی هەینی دەکرام بەنۆبەت داری قاوش یان دەرگایەکانی سەربازگە، ڕۆژێك کرام بەنۆبەتداری دەرگای ڕوو لە (جوندیان)ئەو نۆبەتدارەی لەو دەرگایە ئەوەستا بێ چەك نۆبەتی دەگرت تەنیا نێزەیەکی هەڵئەگرت ئەو ڕۆژەی من نۆبەت دار بووم ڕۆژی هەینی کات ژمێر دەی بەیانی یەکێك لە نائب عەریفەکان (جلیل) دەهات لە دەرگایەکە بڕواتە دەرەوە بۆ ئاو دەست، بەلاّم بەشێوەیەك قاپوتی داناوەتە سەرسەری بەدەرپێ کورتو پێلاّوی سوپایی پانی شکاندۆتەوەو هاتو تێپەڕ بوو، منیش لە سەر تەنەکەیەك دانیشتبووم ئەوەندەم زانی (جلیل) گەڕایەوە بەڕوو گرژی گوتی (گوم ولك) منیش گوێم پێ نەدا لێم نزیك کەوتەوە گوتی: (سەگ باوك بۆ هەڵ ناستی ڕێزی ئامر حەزیرەکەت ناگری؟) دەستی بەرز کردەوە بەنیازی لێدانم، بەلاّم من دەست پێشخەریم کردو قونکە نێزەیەکم داوەشاندە سەری، سەریشی کەچەڵ بوو، خوێنی پێدا هاتە خوارو دەستی بەسەریەوە گرتو گوتی: (سەگباب خۆ منت کوشت).

پێم گوت: (جارێکی تر بڵێیت سەگباب نێزەیەکت لێدەدەمو تەواوت دەکەم، خۆت سەگبابی) لەدوای ئەم مشتومڕە (جەلیل)یان بردە نەخۆشخانەومنیشیان بردە بەندیخانە، بەلاّم پێش ئەوەی بمبەن بۆ بەندیخانە بردمیان بۆ لای ئەفسەری نۆبەتدار کە ناوی (ملازم زنون) بوو ناوبراو عەرەب بوو، پرسی: (ڕوداوەکە چۆنەو چۆن ڕویداوە؟) منیش بۆم باس کرد بەتەواوی، ئەو شەوە لە بەندیخانە مامەوەو بەیانی ئەو ئەفسەرانەی ماڵیان لە ڕواندز بوو بەسواری ولاّخ دەهاتن لە بەر دەرگای گەورەی سەربازگە دادەبەزین، کاتێك یاریدەدەری ئامیر (بەکر سامی) دابەزی لەبەر دەرگا، چاوی بەمن کەوت لە دەرگای بەندیخانە وەستاو پرسی: (بۆچی بەندکراوی؟) منیش وتم: (توشی شەڕێك بووم).

(بەکر سامی) بەسەرۆکی نۆبەتدارەکانی وت: (لەدوای دەرکەوتنی فەوج بۆ مەشق، ئەوەو ئەوەی شەڕی لەگەڵ کردووە بیانهێنن بۆ لای ئامیر)، خۆی ڕۆیشت، کاتێك رئیس عورەفای وەحدەی فەوج (غەفورئاغا کۆیی)بوو، هاتە بەردەرگای بەندیخانەو منیان بردەدەر دیتم (جلیل) وەستاوەو واتدەزانی مەلایەو مەندیلی بەستوە

ئەوەندە لەفافیان لە سەری پێچابوو، هەر ئەوکاتە بردیانین بۆ بەر دەرگای ئامیر لەوێ کەمێك وەستاین ئینجا رۆیشتینە ژوورەوە دیار بوو (رەئیس بەکر) خۆی لە جێگای ئامر دانیشتبوو لە پێشان لە (جلیل)ی پرسی. ناوبراو وای خستە رووکە من لە خۆمەوە شەڕم بەئەو فرۆشتوەو بەنا هەق سەرم شکاندوە، کاتێك نۆرەی من هات ئەوەی بەڕاستی رووی دابوو بۆم باس کرد (ڕەئیس بەکر) توڕە بوو گوتی: (ئەوەیە ڕەوشتی نائب عەریفی مەرکەز تدریب، پێویستە تۆ بەند بکرێی نەك زرار تۆ شەڕت بەئەو فرۆشتوە، جارێکی تر بەو شێوەیە بدیترێیت دەزانم چیت لێ دەکەم). بەمنیشی گوت: (بڕۆ دەست وەشێن مەبەئێرە عەسکریە دەرگەڵە نییە بەئارەزوی خۆت دەست بوەشێنی). لەوێ دەرکەوتین هەریەکەی ڕۆیشتینەوە شوێنی خۆمان، بەربوونی من بووە دەنگێکی بەرز بۆمن وایان دەزانی چەند مانگێك بەند دەکرێم، لە دوای ئەم ڕووداوە زۆری نەخایاند دابەشی سەر فوج کراین، من کەوتمە سریەی دوو، لەوێش کەوتمە ژێر فرمانی عەرێفێك ئەوەندەی باسی بکەین مرۆڤێکی ناپەسند بوو ناوی (مهدی) بوو، بەلاّم باش بوو ئەوەندە لای ئەو نەمامەوە بەفەرمانی (بەکر سامی) کرام بەئینزیباتی نادی لە ڕواندز، نادی سوپایی لەناو خانووی (ئەمین ڕواندزی) دا بوو، لەو ماوەیەی ئینزیبات بووم بەزۆری لەگەڵ سەربازەکانی (فەقیان) لەوانە (عولاّ ڕەش و خدر و قادری) خالّم دەڕۆیشتمە (فەقیان) لە پایزی هەمان ساڵدا بڕیار درا بڕۆینە (مێرگە سۆر).

## لە پایزی (١٩٤٣) بەڕێ کراینە مێرگە سۆر

بەگوێرەی ئەوبڕیارەی دەرچوو بوو بەیانیەك لە ڕواندز دەرکەوتین بەرەو (مێرگە سۆر) ڕۆیشتین کاتێك گەیشتینە ئەوێ لەخوار قشڵەی پۆلیسەکان لە گۆڕاییەك چادر هەڵدران فوج جێنیش بوو لە چوار دەوری سوپا سەنگەر داندران، چەند ڕۆژێك هیچ نەبوو. ڕۆژێك لەکاتژمێر دەی سەرلەبەیانی لەگەڵ سەربازێکی عەرەب ڕۆیشتینە سەرکانیاوەکەی خوار قشڵە، فەنتازێکمان بەدەستەوە بوو، پڕ لە ئاو دەگەڕاینەوە، ئەوەندەمان زانی بوو بەتەقە لە چەند لایەك سوپاکە درایە بەر دەست ڕێژی گوللەو گوللەیەك بەفەنتازەکە کەوت و ئاوی لێ هاتە خوارەوە، هەر ئەوەندەمان

بۆ کرا خۆمان دایە پەنایەك، لە دوای وەستانی تەقە فەنتازە لێدراوەکەمان بردەوەو دیتیان چۆن لێی دراوەو کون بوە.

لەو کاتەوە بەشی زۆری شەوەکان دەبوو بەتەقە.(بارزانی)یە چەکدارەکان لە سەنگەرەکان نزیك دەکەوتنەوەو تەقەیان دەکرد ئەوە بوو بەیانیەك بەشێك لە سەربازەکانی فەوج لەسەربازگە بەرەو گوندی (لەشکریان) بەرێ کەوتن گوندی ناوبراو دەکەوێتە بەرامبەر (مێرگەسور)، ئەوەی بەدیار کەوت هێرش بەرەکان کەمێك سەرکەوتن، کاتێك لێیان درا هەر ئەوەندەیان بۆ کرا سەرەو ژێر گەڕانەوە دواوە تا ناو سەربازگەکە، کۆمەڵێك سەربازی کوژراوو برینداریان هەبوون. لە دوای چەند ڕۆژێك ئێوارەیەك دوای نیوەڕۆ لە گوندەکانی خوار (مێرگەسۆر) چەند چەکدارێکی (بارزانی) بەرچاوکەوتن (ئامیر فەوج عەقید عوسمان) فەرمانی دایە (عبدالرحمن قازی) گوندەکان تۆپ باران بکرێن، (عبدالرحمن) لە سەر داوای ئامیر چەند گوللە تۆپێکی بەرەو گوندەکان هاویشت بێ نیشان، لە دوای هاویشتنی تۆپەکان ئەفسەرە کوردەکان لەبەر دەرگای چادری (عبدالرحمن قازی) دانیشتبون (نوری ملا حکیم) گوتی: (توخوا ئامیرەکەمان کەر نیە؟) وا دەزانی بارزانیەکان لەوێ بەستراونەتەوە تا تۆپی (عبدالرحمان)یان پێ بکەوێت. (عبدالرحمن) وەڵامی دایەوەو گوتی: (بۆ بەنیازە تۆپی بۆ باوێمە ئەو شوێنەی مرۆڤی لێبن، وا دەزانێ ئەوانی بۆ دەکوژم!).

## لێدانی ماڵی حمد ئاغای مێرگە سۆری

وا هەست دەکرا ئەفسەرە کوردەکانی فەوج بەو نیازە بوون (حمد ئاغای مێرگە سۆری) دڵشکاو بکەنو پاڵی بدەن بڕواتە دەرەوەو بگاتە ڕیزی چەکدارەکانی (بارزانی) بێ گومان بەدوای هەلێکدا دەگەڕان بۆی ساز بکەن، بەرێکەوت ڕۆژێك کاروانێکی ئۆتۆمبێلەکانی سوپا لەڕواندز بەرەو (مێرگەسۆر) دەهاتن لە دۆڵاییەکەی خوار (مێرگە سۆر) ڕێگایان لێ گرتن، بوو بەشەڕێکی دژوار داوا کرا یارمەتیان بۆ بچێتو فەرمان درا سریەی ئێمە بڕوات، پێش ئەوەی ئێمە بڕۆین فەصیلێك لە سریەی یەك ڕۆیشتبوو ئێمە لەسەربازگەکە دەرکەوتین بەرەو شوێنی

شەڕەکە دەڕۆیشتین کاتێك گەیشتینە پشتی کۆشکی (حمد ئاغا) تەقە لەئێمە کراو هەندێ لە سەربازەکان بریندار کران، سەربازەکان پەرتو بلاوی دەوری مالّی (حمد ئاغا) بوون، ئەفسەرەکان هەلّیان بۆ هەلّکەوت (حمد ئاغا) دلّ شکاو بکەن بۆ ئەوەی بڕواتە ڕیزی شەڕ کەرەکانی دەرەوە، هەر ئەو دەمە (ملازم نوری حکیم) فەرمانی دا تەقە لەکۆشکی (حمد ئاغا) بکرێت ئەوەبوو سەربازەکان ڕووی چەکەکانیان کردە مالّی (حمد ئاغا) لە گشت لایەکەوە تەقە لە کۆشك ئەکرا، لە گەرمەی شێلکی گوللە بارانی تفەنگو مەترەلۆز ئافرەتێك بەسەر کەوتبووە سەربانی کۆشکەکە ئالایەکی سپی بەدەستەوە بوو ڕای دەوەشاندو هاواری دەکرد، لەوکاتەش فەصیلی ئێمە گەیشتبوونە بن دیواری کۆشكو فەرمان درا تەقە بوەستێ (ملازم نوری) گەیشتە لامان، دەرگای کۆشك کراوەو ئێمە چەند سەربازێك بەسەرکەوتین و دیمان (حمدئاغا) لەگەلّ چەند مرۆڤێك دانیشتبون، وای دەزانی هیچ نەبووە لەو دەمەش (ملازم نوری) بەسەرکەوت ئەوەندەی بەنوری گووت: (ئافەرین نوری ڕێزتان لێنام با وابێت).

نوری بە(حمد ئاغای) گوت: (بفەرموو بڕۆ لای رەئیس شێخ معروف، ئەو لە جێگای ئامیرە). لەوێ دەرکەوتین بەرەو شوێنی شەڕ ڕۆیشتین، لە گۆڕستانەکەی خوار (مێرگەسۆر) گەیشتینە هەندێ سەرباز دەگەڕانەوە ئەفسەرێکی برینداریان پێ بوو، ناوی (ملازم حامد کۆیی) بوو برینەکەی ئەوەندە نەبوو بەخۆی دەڕۆیشت، لەوکاتەشدا قافلّەیەکیش هات دیار بوو لۆرییەکی پڕ لە گەنم لە پێچەکان سوتێندرا بوو، لە دوای بەسەرکەوتنی قافلەکەو وەستانی تەقە ئێمەش گەڕاینەوە سەربازگەکە، ئەوەی دەمەوێ بیلێم ئەوەیە کە لەم تەنگوچەلّەمەیەدا زۆری نەمابوو بکوژرێم، یەکەم جاریش بوو توشی شەڕ هاتم لە نزیك مالّی (حمد ئاغا)و چەند جارێك شوێنی خۆم گۆڕی لە بەر ئەو گوللانەی بۆم دەهاتن. ئەوەی لەیاد ناکرێت ئەوەیە نائب عەریفێکمان هەبوو بەناوی (عۆدە) ناوبراو تەمەنی لە پەنجا بەسەرەوە دەبوو، کاتێك دەبوو بەتەقە ئەو مرۆڤە ئەوەندە دەترسا هەموو لەشی دەلەرزیو خۆی پێ ڕانەدەگیرا، زۆر جار دەیپرسی:(ڕاستە ئەو کوردە شەڕکەرانە چەکێکیان پێیە هەر کە بەمرۆڤ بکەوێت ئاگری تێبەر دەداو دەسوتێت!!؟).

# ١٩٤٣/١١/٦ شەڕی گۆڕەتوو

بەرە بەیانی ئەو ڕۆژە فەوج لە (مێرگە سۆر) دەرکەوت بەنیازی ئەوەی بڕواتە (شێروان مەزن) لە (گۆڕەتوو) تێپەڕ بوو لە نزیك (خوێ ڕیزۆك) پێشیان لێگرت بوون و ببوو بەشەڕێکی دژوار لەگەڵ زرێ پۆشەکانی کەلە پێش سوپا دەڕۆیشتن، شەڕگەرم بوو لە گەرمەی شەڕدا ئەفسەرێکی بەریتانی لە سەربازگەکە بوو داوای کرد بڕواتە شوێنی شەڕ فەرمان درا دەستەی ئێمە لە فەصیلی (٣) لەگەڵی بچین، ئامادەبووین بڕۆین نائب عەریف (عۆدە) نەی توانی لەگەڵمان بێت جندی ئەوەل (حوسێن نەجەف)ی لەجیاتی (عۆدە) هات، لەوێ بەپیادە کەوتینە ڕێ دیاربوو شەڕ زیاتر گەرم دەبوو، سەردەمێك گەیشتینە ناو گوندی (گۆڕەتوو) دیاربوو سەربازەکان بەشکاوی بەرەو دواوە دەگەڕانەوە زۆر ئالۆزو تەنگاو بوون ئەفسەری ئینگلیز چاوی بەو شکستەی ڕاکردوەکان کەوت تەنگاو بوو لەسەر ڕێگای ئۆتۆمبێل دیتی زرێ پۆشێك دەهات، لەو دەمەشدا گوللەیەك بەجندی ئەوەل کەوت لەوکاتەش ئۆتۆمبێلێك پڕ لەبریندار لەگەڵ زرێ پۆشێك گەیشتە لای ئێمە ئەفسەرەکە خۆی فڕێدا ناو زرێ پۆشەکەو ڕۆیشتەوە مێرگەسۆر، لەدوای ئەوان هەر ئەوەندەمان بۆکرا خۆمان بشارینەوە، خۆم فڕێدایە ناو تەڕاشێك خۆم بوارد، ئۆتۆمبێلێك وەستابوو زۆر لەمن نزیك بوو دیار بوو پەکی کەوتبوو کاتێك دیم چەند چەکدارێك گەیشتنە سەر ئۆتۆمبێلەکەو سەیریان کرد هیچی تێدا نەبوو ڕۆیشتن، لەناو تەڕاشدا دڵی لەدڵی دەدام خۆیان بدەمە دەست، دوایی گوتم نا ئەگەر بەخۆشم بڕۆمە لایان هەر دەڵێن کوڕی (سلێمان بەگ)ی دەرگەڵەمان بەدیل گرت، لەبەر ئەوە خۆم ئاشکرا نەکرد لەوێ مامەوە هەتا تەواو شەو داهات کاتێك دونیا بێ هەست بوو دەستم دایە ڕەشاشەکەم و بەرەو سەربازگەکە گەڕامەوە ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو هەتا گەیشتمەوە ناو سەربازگە کەس نەبوو بڵێت تۆ کێی زەلام؟! لەکاتێکا ڕۆیشتمەوە سریە، ڕەئیس عورەفا چاوی پێکەوتم سەرسام وەستاو گوتی: (کوڕە ئەتو ماوی؟) بردمی بۆ لای (حسن تحسین) ئەویش بردمی بۆلای ئامر فوج (عقید عوسمان)، ناوبراو پرسی چۆن توانیت لەدەستیان ڕزگار بیت؟).

زۆر بەرێکوپێکی سەربردەکەم بۆ باس کرد بەوشێوەی لەسەرەوە باس کراوە. ئەوانەی لەگەڵ مندا بوون جندی ئەوەل زوو کوژرا ئەوانی تریش هەر یەکە بەلایەکدا راپەرینو خۆیان شاردەوە ئامر گوتی: (ئەوانی تۆیان هێنایەوە سەربازگە کێ بوون؟ دیارە ناسیارن تۆ دەناسن؟)، منیش گوتم: (کەس منی نەهێناوەتەوە، کەسیش ناناسم، کەس منی نەدیوە هەتا هاتومەتە ناو سەربازگەکە، لە دواییدا ئامر گوتی: (ئافەرین برۆ سریەکەت)، زۆری پێنەچوو عقید (عوسمان) رۆیشت مقدم (ئەحمەد حمدی) هاتە شوێنی ئەو لەگەڵ گەیشتنی دا فەرمانی داو فوج گواسترایەوە سەرەوە لە دەورو بەری قشڵەی پۆلیسەکان چادریان هەڵدا هەرچوار دەوری خیوەتەکانی کردە شورە بەبەردی گەورە ناوە ناوە شوێنی نۆبەت دارانی تێدا دروست کرد بۆ ئەوەی لەدوورەوە گوللە نەیگرێتەوە، زەلام بەناوی دا دەرۆیشت دیار نەدەبوو، دروست کردنی ئەو شورەیە نیشانەی ئەوە بوو زستان لەوێ دەماینەوە کە بەراستیش لەوێ ماینەوە لەدوای تەواو بوونی شورە لەرێگای (ملازم نوری حکیم) چەند رۆژێك ئیجازەم وەرگرتو گەرامەوە رواندز، لەدوای چەند رۆژ مانەوەم لەگەرانەوەمدا رۆیشتمە حامیە بۆ ئەوەی لەگەڵ قافڵە بگەرێمەوە مێرگەسۆر گوتیان رێگەگیراوە ئەو رۆژە نەمان توانی بگەرێینەوە، پێیان گوتین رۆژی شەممە سەرلەبەیانی وەرنەوە، بەرێکەوت رۆژی هەینی لەدەرگای مەکتەبی رواندز چاوم بەئەفسەری تجنید کەوت چاك وچۆنیەکی زۆر گەرمی لەگەڵ کردم لەدواییدا پرسی: لەکوێی؟ گوتم: لەمێرگەسۆرم. ناوبراو پرسی کەی دەگەرێیتەوە مێرگەسۆر نامەیەك دەنووسم بۆ رەئیس (شێخ معروف) بۆی ببە، ئەگەر ئەولەوێ نەبوو بیدە بەملازم (نوری ملا حکیم)، گوتم فەرموو بنووسە، لەدوای ماوەیەك رۆیشتمەوە لای ملازم (محمد قودسی) دیار بوو نامەکەی ئامادەبوو لێم وەرگرت و رۆژی شەممە سەر لەبەیانی رۆیشتمەوە حامیە، دیار بوو خەریکی ئەشیا بارکردن بوون، کاتژمێر (١٠)ی بەیانی لە رواندز بەرێ کەوتینو زرێپۆشێکمان لە پێش دەرۆیشت یەکێکیش لە دواوە دەرۆیشت ئەو رۆژە هیچ لە رێگا روی نەدا بەئاسودەیی گەراینەوە (مێرگەسۆر) دیار بوو هەندێ گۆرانکاری بەرچاو دەکەوت، دەوری سەربازگەکە هەر بەرزاییەك سەنگەرێکی لێ داندرابوو، ئەو سەنگەرانەی کە لێ درابوون فەسیلێکی سەربازی بۆ ماوەی پازدە رۆژ لە ناویدا دەمانەوە، ئەم سەنگەرانەش بۆ پارێزگاری فەوج بوون. (ئەحمد حەمدی)

زۆربەی شەوەکان دەگەڕا بەسەر نۆبەتداراندا قسەی لەگەڵ دەکردن‌و میوژوگوێزی پێ دەدان نۆبەتدارەکان شەو نە دەنوستن دەیان گووت ئامیر دێت. ڕۆژێك داوای چەند سەربازێك کرا برۆنە ڕواندز لەگەڵ ئۆتۆمبیلەکان باریان لێ بار بکەن منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم‌و قافلەکە کەوتە ڕێ پێش بگەینە (مەزنێ) بووبەتەقەو لێکدان، لەوکاتەدا ئێمە ئەوانەی بێ چەك بووین دابەزین و خۆمان دابیە پەنایەك، کاتێك تەقە نەما ڕۆیشتینەوە لای ئۆتۆمبیلەکان دیار بوو ڕۆیشتبون، ڕۆژیش درەنگ بوو، من‌و سەربازێکی خەڵکی بادلیان مابوین ناچار کەوتینە ڕێ بەپێیان بەرەو گوندی (بادلیان)، سەربازەکە شارەزا بوو شەومان بەسەر دا هات کاتێك گەیشتینە سەر ڕوبارێك لە ڕوبارەکە پەڕینەوە ئەوبەر، لەوێ خۆمان پێچایەوەو کەمێك ڕۆیشتین وگەیشتینە بەردەرگای ئاشێك، دەنگی لەقە لەقی چەقەنەی ئاشەکە دەهات کەسیش دیار نەبوو، تاریك بوو قەندیلەك لەسەر دیوارەکە بەکزی دادەگیرسا کۆمەڵێك جەواڵی باراشی ئاش لە دەرگای ئاشەکە بەریز داندرابوون، کاتێك چوینە ژووری ئاشەکە، ئەوەی لەگەڵ من بوو ئاشەوانی دەناسی‌و بانگی ئاشەوانی کرد، کاتێك ئاشەوان هات دیار بوو مرۆڤێکی کورتە بالآی ڕیش درێژ وامزانی ڕیشی تەواو سپییە ئەوەندەی تۆز لەسەر هەڵ نیشتبوو، لە دواییدا دەرکەوت ئەوەندە پیر نەبوو، ئەوەندەی من بۆم دانابوو، لەگەڵی کەوتینە قسەو پێمان گووت برسیمانە، پیاوەکە ڕۆیشت هەندێك چنگەنانی ڕەقی بۆ هێناین‌و بادیە ئاوێکی لەپێش داناین چنگەنانەکە ئەوەندە بەتام بوو زیاد لەپێویست، ئەویش ئەوە دەگەیەنێ زۆر برسی بووین لەوێ کەمێك خەوتین لای بەیانی ڕۆیشتین‌و ماڵ ئاوایمان لە ئاشەوان کرد، ماوەیەك ڕۆیشتین لە هەورازێك بەسەرکەوتین زۆری پێنەچوو گەیشتینە گوندی (بادلیان) ڕۆیشتینە ماڵی سەربازەکە لەوێ نوستین تاکو کاتژمێر دەی بەیانی، ئەوەی بۆی بەپەرۆشم ناوی سەربازەکەو ئاشەوانەکەم بزر کردوە بەتەواو ناوەکانیان نایەتەوە یادم، پێم وایە سەربازەکە ناوی (عوسمان) بوو.

هەر ئەو ڕۆژە ڕۆیشتمە ڕواندز لە حامیە چوومە لای لێپرسراوی سوپا زۆر بەڕێکی بەسەر هاتەکەم بۆ گێڕایەوە ناوبراو هەندێك شتی لای خۆی نووسی‌و گوتی: (قافڵە دوای چوار ڕۆژی تر ئەڕوات ڕۆژی یەك شەممە سەر لەبەیانی وەرە بەڕێت دەکەم).

لەرۆژی دیاریکراو سەر لەبەیانی ڕۆیشتمەوە ڕواندز، لە حامیە گوتیان ئەمڕۆش قافلە ناڕوات، کەوتەوە ڕۆژی چوارشەممە ناچار ڕۆیشتمەوە (فەقیان) تا ڕۆژی چوارشەممە، ڕۆژی چوار شەممە لە حامیە دەرکەوتین باوو بارانێك بوو تا گەیشتینە (مێرگەسۆر) بەهیلاك چوین، کاتێك گەیشتینەوە سەربازگەکە دیار بوو فەصیلی ئێمە ڕۆیشتبوە سەنگەری سەرباسك، لە خوارەوەی ئێمە یەك سەنگەر هەبوو بەسەر (مێرگە سۆری) خوارودا دەیڕوانی، لە سەنگەری باس کراو جندی ئەوەلێکی سورچی (حەسۆ) بەمەترەلۆز تەقەی لە گوند کرد یەکێکی لەسەر بانی کوشت.

ڕۆیشتمەوە فەصیل زۆر سەرمابوو بەفر زۆر لەگۆڕێ بوو، ڕۆژی دووەم دوای گەڕانەوەم باو بارانو بەفرو کڕێوە بوو تەمو مژو تاریك بوو لە دەوری کات ژمێر دە لە دەورو بەری سەنگەر بوو بەتەقەو لێکدان، لەلێکدانەکەدا عریف (مهدی)کوژرا سەربازێکی خەڵکی (گەزنێ)ش بریندار بوو، کە سەر بەناحیەی باڵەکە.

ئەوەی زۆر سەیر بوو ئەوەبوو لەکاتی گەرمەی تەقە مەتارەیەکی ئاویان فڕێ دایە ناو سەنگەر کاتێك سەیرم کرد دوکەڵی لێ دەردەکەوت دەمو دەست هەڵمگرتو فڕێم دا دەرەوەی سەنگەرەکە زۆری پێنە چوو مەتارەکە تەقیەوەو ئەوەندەی نارنجۆکێك دەنگی هاتو نەزانرا چی تێدا بوو!!

## دەنگی ووتوویێژ

وەك بەدیارکەوت لە کۆتایی مانگی (١١ی ١٩٤٣) (نوری باویل ئاغا)ی ڕواندزی ناردرا بۆ دیدەنی (مەلا مستەفا) بارزانی، ناوبراو گەیشتە (مێرگەسۆر)و بەڕێ کرا بۆ ئەو شوێنەی (مەلا مستەفا)ی لێ بوو بۆ ڕێ ڕۆن کردنەوەو سازکردنی وت وویێژ لەگوندی (بیستڕێ) لە بەرامبەر (مێرگەسۆر) بەیەك گەیشتن ئەوەی زاندرا (نوری باویل ئاغا) داواکاریەکانی بارزانی برد بۆ بەغدا.

زۆر ڕۆژان تەقە لە دوورەوە لە سەربازگە ئەکرا، ڕۆژێك لە بن دیواری قشڵەی پۆلیسەکان گوللەیەك بەملازم (ڕەفیق)کەوتو بریندار بوو لەو کاتیش ڕێگا گیرا بوو، بەفرێکی زۆر کەوتبوو نارەحەتی ملازم (ڕەفیق) ئەفسەرە کوردەکانی ناچار کردو ڕاسپاردەیەکیان بەڕێ کردە لای (مەلامستەفا) بۆ ئەوەی ڕێگا بدات ملازم

(رەفیق) بەرێ بکرێتە ڕواندز (مەلامستەفا) وەڵامی دابۆوە با بیبەن بەو مەرجەی ئەو سەربازانەی لەگەڵی دەچن بێ چەك بن، بێگومان ڕێگا ئەوکاتە لە دوولاوە گیرا بوو لەلایەك چەکدارەکان لەسەر ڕێگا بوون، لە لایەکی تر بەفر گرتبووی، ملازم (رەفیق) ئەفسەرێکی خۆشەویست بوو، لەکاتێکا بەرێ کرا بەشی زۆری سەربازەکانی کورد لەوێ کۆبوو بوونەوە تا بڵێی بۆی بەپەرۆش بوون لەبەر ئەوەی ئەفسەرێکی بەرێز و پاك رەوشت ولێهاتوو بوو، رۆڵەی شاری حاجی قادری نەمر بوو، لە ئەفسەرە نیشتیمان پەروەرەکانیش بوو. رۆژێك فرۆکەیەکی بارهەڵگر گەیشتە سەر سەربازگەکە، هەندێك شتی فرێدا خوارەوە شتەکان کەوتنە نێوان سەربازگەو چەکدارەکان، سەربازەکان هەوڵیان ئەدا برۆن بێ هێننەوە، چەکدارەکانیش تەقەیان لێ دەکردن، لە دواییدا سەربازەکان لە سەر شورەی دیوار ئاودیو بوون توانیان شتەکان بێننەوە ناو سەربازگەکە، دوا بەدوای ئەو ڕووداوە ڕۆژێك لە سەربانی قشڵەی پۆلیسەکان گوللەیەك بەجندی ئەوەل حسێن کەوت‌و کوژرا جوندی ناوبراو سلێمانی بوو، سەربازێکی خۆشەویست بوو.

بۆجاری دووەم (نوری باویل ئاغا) هاتەوە (مێرگەسۆر)و ئەم جارە (پوشۆی)کوڕی (سەید تەها)شی لەگەڵ دابوو، ڕۆیشتنە لای (مەلامستەفا) شەویش لەوێ مانەوە لەدوای گەڕانەوەی ئەوان زۆری نەخایاند لەسەرەتای مانگی یەك واتە لە (١٩٤٤/١/٧) وەزیری دیاری کراوی عێراق (ماجید مستەفا) بۆ وتوووێژ گەیشتە (مێرگەسۆر) لەگەڵ جەنابی (مەلامستەفا)کەوتنە وتوووێژ، ئەوەی بەدیار کەوت لەسەر چەند خالێك ڕێکەوتن:

١. ماڵی شێخەکان لە خواروی عێراق بگەڕێنەوە بارزان.
٢. چەکدارە بارزانیەکان چەکەکانیان لابێنێتەوە.
٣. ئازوقە بدرێت بەخەڵك لە ناوچەی بارزان.
٤. بارزانی بڕواتە بەغدا بۆ دیدەنی کاربەدەستانی بەغدا.
٥. مەخفەرەکانی پۆلیس بگەڕێنەوە شوینەکانیان‌و سوپاش لە مێرگەسۆرو بلەی بارزان بگەڕێنەوە شوێنەکانی پێشویان.

لەبەر ڕۆشنایی ڕێکەوتننامەکە لە ناوەڕاستی مانگی (١٩٤٤/٢) ڕێگا درا بەماڵی (شێخ احمد) برا گەورەی (مەلامستەفا)کە بگەڕێنەوە (بارزان)و ئازوقەش

گەیشتە (مێرگەسۆر)و گەنمو جۆش دابەش کرا بەسەر بارزانیەکان. بەپێی ئەو ڕێکەوتنە فەوجی ئێمەش لە(مێرگەسۆر) لەکۆتایی مانگی سێ دا گەڕایەوە ڕواندز، لەکاتێکدا گەیشتینەوە حامیە چەند ڕۆژێك ماوە درا بەسەربازەکان بۆ خۆ ڕێکخستنەوەو پاكو خاوێنی، لەدواییدا دەست کراوە بەمەشقی سەربازی، ئەوەی بەلامەوە زۆر زۆر گران بوو ئەوە بوو هەموو بەیانیان زوو چوار پایەکان بەسەر بخەینە سەر بانی قشلەو لە کۆتایی مەشقدا بیانهێنینەوە خوارو بۆ ناو قاوشەکان لەوێش ڕێك بکرێنەوە بەو شێوەیەی دیاریان کردبوو.

بەیانیەك لە گۆڕەپانی مەشق کردن وەستا بووین ئەفسەری مەشق پێکەر قسەی بۆ دەکردین دەربارەی کارو باری سەربازی، کاتێك ئینزیباتێك هات نامەیەکی دایە دەستی ئەفسەرەکە ئەویش گوتی: (زرار بڕۆ لەگەڵی بزانە لە قەڵەم چیان ئەوێت). لەگەڵ ئینزیبات ڕۆیشتم لەڕێگا بیرم لەوە دەکردەوە بۆ بەندیخانەم دەبەن، ئەمگوت لەوانەیە بمکەنەوە ئینزیبات، کاتێك گەیشتینە دەرگای گەورەی حامیە ئینزیباتەکە بانگی سەرۆکی نۆبەتدارەکانی کرد پێی گوت: (دەرگای بەندیخانە بکەنەوە) ناوبراو دەرگای کردەوە هەرئەوکاتە ڕاپێچی بەندیخانەکرام بەبێ ئەوەی هیچ شکێك لەخۆم بکەم.

## دادگای سوپای عورفیی کەرکوك

لە دوای گەڕانەوەی فەوج لە مێرگەسۆر لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٤)دا بەند کرام بەبێ ئەوەی شك بەهیچ شتێك ببەم، کاتێك خرامە بەندیخانە ئەوانەی ناو بەندیخانە ئەیانپرسی: (لەسەرچی بەند کراوی؟).

وەڵامم ئەوەبوو خۆشم نازانم لەسەرچی بەند کراومو بۆچی هێناویانم بۆ ئێرە! بێ سەرو پرسیار چەند ڕۆژ لەبەندیخانەی حامیەی ڕواندز مامەوە، ڕۆژی دووەم بوو بەهەرجۆرێکی هەبوو (فەقێ خدر) کاتبی قەڵەم فەوج توانی پێم رابگەیێنێو بڵێت: (ئاگاداربەزۆر خەرابیان لەسەر نووسیوی، نووسینەکە مەترسی بەدواوەیە، ئەگەر بتوانی بڕۆی هەوڵ بدە پێش ئەوەی بەڕێ بکرێیت بۆ دادگای کەرکوك بڕۆ). (فەقێ خدر) خەڵکی گوندی (ئاکۆیان) بوو برادەرم بوو پەیوەندی بەماڵی خاڵەکانمەوە

هەبوو. بەندیخانەی سووپا كۆمەڵێك بەندی تێدابوون، لەوانە هەندێ سەربازی گوندی (گـەرۆیان) ڕایان كردبوو لە (مێرگەسۆر)، بەلاّم پێش بگەنەوە گوندەكەیان (ملازم حكیم) ڕواندزی لـەسەر جۆخینی (بێرۆ) گرتبوونی‌و ڕاپێچی بەندیخانەی كردبوون لە مێژبوو لەوێ بوون.

بەڕاستی لەدوای ڕاگەیاندنی (فەقێ خدر)كەوتمە بیركردنەوە بۆ ئەوەی ئەگەر بۆم هەڵ بكەوێت ڕابكەم، بەلاّم هەلێكی گونجاوم بۆ نەڕەخسا، ئەوەبوو بەیانیەك پاسێكی شەق‌و شلۆق هاتە بەر دەرگای حامیەو ڕەئیس عورەفایەك هات ناوی كۆمەڵێك لەبەندیەكانی خوێندنەوە، ناوی منیش خوێندرایەوە، هەر لەوێ دوو دوو كەلەپچە كراین‌و بەڕێ خراین بۆ هەولێر ئێوارە سەری ڕۆژ ئاوابوون گەیشتینە سەربازگەی هەولێر ماوەیەكی زۆر چاوەڕوانی ئەوە بووین هەتا لەوێ وەریان گرتین، ئەوەی ئێمەی وەرگرت ئاگام لێ بوو بەسەرۆكی نۆبەتدارانی گووت: (زۆر ئاگاداری ئەو سەربازە بچكۆلەیە بن) یەك بەیەكیان بردینە ژووری بەندیخانەكە. بەلاّم چ بەندیخانەیەك لەشێوەی هۆڵی مەڕ تاریك ئەوەندەی بڵێیت پیس‌و پەلۆس بوو، هۆدەیەكی گەورەی چوار گۆشە دوو كۆڵەگەی لەناو دابوون پڕبوو لە سەربازی بەندكراو جێگا نەبوو، زۆر بەكەساسی لە ژێر یەكێك لە كۆڵەگەكان دانیشتم لەگەڵ ئاگاداری ئەو مرۆڤەی لێپرسراو زیاتر كەوتمە بیركردنەوە بۆ زیاد لەهەموو ئەو بەندیانە ئاگاداری من بن؟ لەگەڵ دڵ تەنگیم سەیری قەندیلەكەم ئەكرد دادەگیرساو دوكەڵێكی ڕەشی لێ دەرئەچوو، واتدەزانی دووكەڵی شەمەندەفەرە، لەو كاتەدا سەربازێك هات زۆر بەگەرمی چاك و چۆنی لەگەڵ كردم لەسەرەتادا نەم ناسی دوایی زانیم ئەو سەربازە (شێمحمدە) دانیشتوی (بێشوك) ئەوەی دەمەوێ دیاری بكەم ئەو مرۆڤە زیاد لە پێویست ڕێزی گرتم‌و بەتانی خۆی بۆهێنام، دواتر چایان بۆ هێنام، دوایی لێی پرسیم بۆچی بەندكراوی؟ گوتم: (وەڵلاّ بەخۆشم نازانم بۆچی بەندم ئەوەی شكە بەخۆم نابەم)، دوو شەو لەو بەندیخانەیە پیس‌و پەلۆسەماینەوە، ئەوەی جێگای دڵ خۆشیم بوو، تەنها ئەو شێمحەمەدە بوو، ئەو دوو شەوە وای نەكرد هیچ نیگەران بم و زۆر چاودێری كردم.

ڕۆژی سییەم بەڕێ كراین بۆ كەركوك، لەكاتێكا لە (ئاڵتون كۆپری) وەستاین ئەوانەی لەگەڵ من بوون كەلەپچەیان لەدەستی كردنەوە تەنها هی منیان نەكردەوە،

هەتا گەیشتینە کەرکوك، لەوێش بردنیانین بۆ بەندیخانەی فرقە، ئەوەی منی نیگەران کردبوو پارەی تاکە جگەرەیەکم پێ نەبوو، ئەو رۆژەی گەیشتینە ئەوێ هیچیان پێ نەداین، نەخواردن نە رایەخ. زیاد لەپانزە رۆژ لەو بەندیخانەیە ماینەوە بەبێ سەرو پرسیار هەموو رۆژێك ناوی بەند کراوەکانیان دەخوێندەوە گوێم دەگرت بەڵکو ناوی منیش دەخوێندرێتەوە، بەلاّم بەنا بەدڵی دەگەرامەوە لەدواییدا وام لێ هاتبوو لەشوێنی خۆم هەڵ نەدەستام، لەپرێکا رۆژێك بانگ کرام پێیان گوتم: (خۆت ئامادەبکەو وەرە بەر دەرگا) کاتێك رۆیشتم لە دەرگا نائب عریف ئینزیباتێك دەستی کەلە پچەکردمو لەگەڵ سەربازێکی چەکدار دامیە پێش خۆیو هەتا بارەگای فیرقەو بەسەر کەوتینە قاتی دووەم، لە بەر دەرگا وەستاین، لە دواییدا رۆیشتینە ژوورەوە و منیان بردە ناو قەفەس وەستام سەیرم کرد کۆمەڵێك ئەفسەر دانیشتبون لە سەرەتادا ئەفسەرێکی سێ ئەستێرە گوتی: (دەستت بخەرە سەر ئەو قورئانەو بڵێ بەو قورئانە ئەوەی لێم دەپرسن بەراستی وەلاّمی دەدەمەوە). منیش دەستم دانا سەر قورئانو گوتم: (بەو قورئانە ئەوەی لێم دەپرسن بەراستی وەلاّمتان دەدەمەوە). ئەفسەر گوتی: (پێمان بڵێ لەو کاتەی لە شەڕی گۆڕە توو بەشەو گەڕایتەوە بۆسەربازگەکە ئەوانەی تۆیان گەیاندەوە نزیك فەوجەکە کێ بوون؟) گوتم: (کەس منی نەگەیاندۆتەوە نزیك فەوج وکەسیش منی نەدیوە لەوکاتەی گەڕاومەتەوە بۆ فەوج). ئەفسەرەکە گوتی: (باشە تۆ بەئامرت گوتوە من لێرە کەس ناناسم کەچی شاهید هەیە کەتۆ گوتوتە ماڵی ئێمە لەمێرگەسۆر بووە، چی ئەڵێیت؟) گوتم: (بەڵێ وەك زانراوە کاتی سوپای ئینگلیز هاتۆتە رواندز باوکم بەرهەڵستی سوپای ئینگلیزی کردوە لە دواییدا رای کردوە چۆتە لای شێخ ئەحمەدی بارزانی، سوپای هێرش هێنەر ماڵی ئێمەی تالاّن کردوەو ژنو منداڵ بەسەڵتی هەلاّتوون لە مێرگەسۆر ماونەتەوە تاکو عفو کراونو ئەوکات گەڕاونەتەوە رواندز). ئەفسەر گوتی: (ئەو راستیەمان پێ بڵێ ئەو رۆژەی لە رواندز ملازم محمد قودسی تۆی بانگ کرد چی راسپاردیو چی پێ گوتی؟ ئەونامەیەی دای پێت بۆ کام ئەفسەرت برد؟) گوتم: (بەڵێ ملازم محمد منی بانگ نەکرد، بەڵکو من خۆم رۆیشتم چاكو چۆنیم لەگەڵ کرد، ئەویش پرسی لەکوێ سەربازی؟) گوتم: لە(مێرگە سۆر) ئینجا ناوبراوگوتی: (نامەیەك دەنوسم بیبەبیدە بەرەئیس شێخ معروف)، نامەکەم لێ

وەرگرت، کاتێ گەڕامەوە مێرگە سۆر نامەم دایە مراسیلی شێخ معروف کەناوی بنیامین بوو زیاتر نا).

ئەفسەرەکە گوتی: (وەهاب ئاغای جوندیان دەناسی؟ ئەو پیاوە چ کارەیە لە ڕواندز؟) گوتم: (بەڵێ وەهاب ئاغا دەناسم خزمانە، دایکی ئەو پوری باوکمە، بەلاّم نازانم چ کارەیە). ئەفسەر گوتی: (کە وابێ تۆش لە کۆمەڵەی هیوای، خۆ بەڕاست ناوت لەلیستی ئەوان دایە). گوتم: (کۆمەڵەی هیوا چی یە؟) لەکام دائیرە کار دەکەن بۆ نایان ناسم‌و ناوی منیان نوسیوە!؟) ئەفسەر لەگەڵ قسەکانی من هەستا سەرپێ‌و گوتی: (دەتەوێ خۆت گێل بکەیت ئەگەر ڕاستی نەڵێی بەو دەمانچەیە دەتکوژم) لەگەڵ قسەی بێ ڕێزیش فەرمانیدا بیبەنە دەرەوە، بردمیانە دەرەوەو لەدەرێ هەر دوو دەستیان کەلەپچە کردم‌و بردمیانەوە بەندیخانە.

ڕۆژی دوایی دیسان بەهەمان شێوە بردمیانەوە ناو قەفەسی دادگاو دەستیان کرد بەلێپرسینەوە هەمان ئەفسەر بوو. ئەفسەر گوتی: (وا دیارە لە شەڕی مەزنێ لە ڕۆژی (١٠/١١/١٩٤٣) لەگەڵ بووی، بەلاّم خۆت لە شەڕ شاردۆتەوە لەبەر چی؟ یان ئاگاداربووی ڕێگرەکان دێنە سەر ڕێگا؟) وەلاّم: (بەڵێ لە شەڕی مەزنێ لەگەڵ قافلە بووم وەك سەربازێکی بێ چەك بۆ بارکردنی ئۆتۆمبیلەکان کاتێك بوو بەشەڕ ناچار خۆمان دایە پەنایەك لەدوای وەستانی شەڕ ئۆتۆمبێلەکان ئێمەیان بەجێهێشت‌و ڕۆیشتبوون، لەوێ خۆمان بوارد تا تاریك داهات بەڕێگای بادلیان دا ڕۆیشتین بەرەو سەربازگەی ڕواندز لەوێش بەدرێژی بەسەر هاتەکەم بۆ ئەفسەری بەر پرسی حامیە ڕوون کردۆتەوە، ئێوە ئەتوانن بنێرن بەدوای ئەو ڕوون کردنەوەیەداو سەیری بکەن ئەگەر وانەبوو ئەوکاتە بزانن ڕاستیم لە ئێوە شاردۆتەوە). لە دوای ئەو وەلاّمەم ئەفسەری پایە بەرزی دادگا ڕووی تێکردم‌و گوتی: (وا دیارە ناتەوێ ڕاستیمان پێ بڵێیت ئەوەش مەترسیە بۆ تۆ ئاگاداربەخۆت توشی مردن مەکە، ڕاستیمان پێ بڵێ با لە مردن ڕزگارت بکەین).

وەلاّم: (ئەوەی وتومە هەر ئەوەیە زیاترم لەلا نیە ناشتوانم زیاتر بڵێم لەبەر ئەوەی سوێندم خواردوە ڕاستی بڵێم ئەگەر باوەڕیتان هەبێت هەر ئەوەیە). هەمان ئەفسەر پرسی: (پێم ناڵێیت ئەونامەیەی ملازم محمد دای پێت بۆ شێخ معروفت برد چی تێدا نوسرابوو، نووسینەکە دەربارەی چی بوو؟) وەلاّم: (ئەوەی ڕاستی بێت نەمزانی چی

تێدا نوسرابوو لەبەر ئەوەی نامەکە قایم کرابوو مافی ئەوەشم نەبوو دەستی لێ بدەم لەبەر ئەوەی دەست لە ئەمانەت دان تاوانە). ئەفسەر: (ماوەت پێ دەدەین بۆ بیر کردنەوە بەڵکو چاك بیر بکەیتەوە ڕاستیمان پێ بڵێی ئەوکاتە ئازاد ئەکرێیت)!.

دیسان بردمیانەوە بەندیخانەو ماوەیەکی زۆر کەس لێی نەپرسیم، نزیکەی دە دوانزە ڕۆژ چاوەڕوان بووم هیچ نەبوو، تەواو بێزار بووم زۆریش پەرپوت بووم تا لە دواییدا ئێوارەیەك بەدرەنگەوە بانگ کرام لە دەرگای بەندیخانە دیار بوو یەك دوو چەکدار وەستا بوون منیان برد زۆر ترسام، گوتم دیارە بۆ کوشتن دەم بەن کاتێك لە دەرگای فرقە چوینە ژوورەوە بردمیان بۆ لای ئەفسەرێك ناو براو گوتی: (ماوەمان پێدا بووی بیر بکەیتەوە بۆ ئەوەی ڕاستیمان پێ بڵێیت بابزانین چی نوێمان پێ دەڵێیت؟).

گوتم: (ئەوەی بەئێوەم گوتوە ئەوە ڕاستیە هیچی ترم لانیە لەوە زیاتر ئەگەر باوەڕ بکەن هەر ئەوەیە، ئەوەی بەئێوەم گوتوە). گوتی (ئەوە دواجارە ئەگەر ڕاستیمان پێ نەڵێیت ئەوا ئەو سەربازانە دەتبەن دەتکوژن خۆت بەکوشتن مەدە زوو ڕاستیمان پێ بڵێ، ئێمە دەزانین پەیوەندیت بەکێوە هەیەو بۆ چیان تۆ کردۆتە سەرباز). ئەفسەرەکە کەمێك وەستاو دوایی گوتی: (بیبەنەوە) سەربازەکان منیان بردە دەرەوەو نائب عەریفەکە گەڕایەوە لای ئەفسەرەکە، کاتێك دەرکەوت منیان دایە پێش خۆیانو بردمیانەوە بەندیخانە.لە دوای دوو ڕۆژ بردمیانەوە دادگاو لەناو قەفەسەکە کەمێك وەستام ئەفسەرە پایە بەرزەکە هەستاو بڕیارەکەی دادگای خوێندەوە لەدواییدا گوتی: (لە بەر ئەوەی ڕاستیت پێ نەگوتین لەگەڵ ئەوەش دادگا ڕوحمی پێ کردووی کە گەنجی بڕیار درا پانزە ساڵ بەند بکرێیت، دەبێ ئەوەش بزانی دادگا ڕوحمی پێ کردووی ئەگینا تاوانەکەت لەو حوکمە زیاتر دەگرێتەوە).

منیش گوتم: (من تاوانبار نیم خۆم بەتاوانبار نازانم، کەڕازی بم دان بەبڕیاری دادگا بنێم بێگومان بڕیارەکە دوورە لە ڕاستیو دادپەروەری لەبەر ئەوەی شاهیدێك نییە دانی پێدا بنێتو تەنیا گۆتەیەو هەڵبەستە). ئەفسەرەکەگوتی: (یانی ڕازی نیت بەبڕیاری دادگاو مۆری ناکەی، ئەوە بڕیاری دادگای عورفیە)؟

گوتم: (نەخێر ڕازی نیمو مۆری ناکەم)، هەر ئەو دەمە بردمیانەوە بۆ بەندیخانە، دیاربوو ئەمە دوا جاربوو دادگا کۆتایی هات. ڕۆژی سێ یەم بردمیان بۆ بەندیخانەی

کەرکوکی مەدەنی کاتێك گەیشتینە بەر دەرگای بەندیخانە ئۆتۆمبێلێك وەستا بوو، دیاربوو پڕ بوو لە بەندیەکان بەرێ دەکران، ماوەیەك وەستاین دوایی منیشیان خستە ناو هەمان ئۆتۆمبیل لەوێ بەرێ کەوتین ڕوو لەهەولێر ئێوارە درەنگ بوو گەیشتینە هەولێر، بردمیان بۆ بەندیخانە لەوێ ڕاپێچی هۆدەیەکی درێژی پڕ لەبەندی کراین لە نزیك دەرگا لە شوێنێك دانیشتم سەردەمێك ناگاگا دەستم بەپلاکی کارەبا کەوت وایەری ڕووت بوو، کارەبا لێیدام‌و کەوتم زۆری نەمابوو بمرم. ئێوارەی ڕۆژی دوایی لەناو حەوشی سەرا بوو بەقرەو هات‌و هاوار دوایی زانرا (عەونی یوسف) کە پارێزەر بوو لەگەڵ بەرێوەبەری پۆلیسەکانی کردبوە کێشە،ئەوکاتە ناوبراویش دەست بەسەر بوو لەوێ، بۆ بەیانی کۆمەڵێك بەندیان بەپاسێکی شڕو بێ سەرو بەر بەرێیان کردینە بەندیخانەی موصڵ.

## دوو ساڵ بەندیم لە موصڵ

ڕۆژی سێیەم لە بەندیخانەی هەولێر کۆمەڵێك بەندیان بەرێ کردینە موصڵ ئەو سەربازانەی کەلەوەوپێش لەگەڵ بوون حەوت کەس بوون، ئێوارە درەنگ بوو گەیشتینە بەردەگای بەندیخانەی گەورە لەموصڵ پێش ئەوەی بمانبەنە ژورێ بەرگی سەربازیان لێ وەرگرتینەوەو هەریەکەو کراس‌و بێجامەیەکی جاوی دەست کردی بەندیخانەیان پێداین‌و سەریشیان تاشین‌و بردنیانین بۆ شوێنێك لەناو بەندیخانە کە تایبەت بوو بۆ ئەوانەی یەکەم جار دەگەیشتنە ئەوێ، زۆر تەنگ‌و ناخۆش بوو، پێی دەوترا (ڕەزالەت خانە) بەڕاستی ناوی خۆی بەخۆیەوە بوو بەیانی لەپەنا شیشەکان سەیری بەندیەکانمان دەکرد لەکاتی ڕیز بووندا بۆ ژماردن، بەلامانەوە سەیر بوو لەبەر ئەوەی ئەوە جاری یەکەم بوو ئەو دیمەنە دەکەوتە بەرچاومان، لە دوای تەواو بوونی ژماردن بەندیەکان لە حەوشە بلاوەیان کردو هەندێکیان بۆ لای ئێمە هاتن لەپەنا شیشەکان کەوتنە قسە من زۆر بەشپرزەیی لەوێ وەستابووم یەکێك لە بەندیەکان پرسی (ئێوە لە کوێ هاتون‌و خەڵکی کوێن؟) گوتم: (لە هەولێر هاتوین‌و من خەڵکی ڕواندزم ئەوانی تریش خەڵکی دەورو بەرن هی تریش هەیە نایان ناسم)،

یەکێك گوتی (منیش ڕواندزیم دەبێ بتناسم من بەحەسەن نۆپل ناسراوم‌و ئارەزومە بزانم تۆ کێی؟)

گوتم: (من دەرگەڵەییم کوڕی سلێمان بەگ)م، (حەسەن) هەر زوو پرسی (بۆ بەند کراوی؟) گوتم: (کاکی بەڕێز سەرباز بووم زستانی ڕابردوو لە مێرگە سۆر بووم ئاگام لە هیچ نەبوو کۆمەڵێك بەندو بالۆرەیان بۆ هەڵبەستووم بوختانی بێ سەرو بەریان بۆ ساز کردوم، ئەوە ماوەیەکە لە کەرکوك لە پێش دادگای عورفی چاوەڕوانی بەزەیی ئەوان بووم). حەسەن منی وەها دیت بەزەیی پێدا هاتم ڕۆیشت زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە قاپ قاپەیەکی دارو دەسرۆکێکی سپی (گۆترە) بۆ سەربەستنی بۆ هێنام بەڕاستی جێگای ڕەزامەندیم بوو لەبەر ئەوەی سەرکۆت و پێ خواسبووم. بێ گومان بەندیەکان ڕۆژانی بەیەك گەیشتنی کەس‌و کارەکانیان هەبوو کەل‌و پەلیان بۆ ئەهێنان ئەوەی پێویستیان پێ هەبایە، بەلاّم من لەوەش بێ بەش بووم، لە دوای چەند ڕۆژی ڕەزالەت خانە دابەشی سەر قاوشەکان کراین من لە قاوشی ژمارە (٥) دانرام، قاوشی پێنج چەندین دەزگای دارتاشی‌و دار شەق کردنی لەناو دانرابوون، لەژێر یەکێك لەو دەزگایانە بەتانیە شوڕەکەم ڕاخست‌و لەسەری دانیشتم، سەیری بەندیەکانم دەکرد هەریەکەی کەل‌و پەلی خۆیان هەبوو، ڕۆژی دوایی لە کۆتایی ژماردن ئێمەیان دابەش کردینە سەر ئیش، هەریەکەی لە شوێنێك دانراین کاربکەین، من ناوم بۆ ئاشخانە دەرچوو، ڕۆیشتمە شوێنی کارو دیار بوو کۆمەڵێك دانیشتبوون خەریکی پاك کردنەوەی شێلم بوون، مرۆڤێکی موو زەردی چوار شانەی چڵکاوی زنجیرێکی ئەستوری لە پێدا بوو سەبیلەیەکی کوردەواری بەدەستەوەبوو کاتێك سەلامم کرد ئەو پیاوە هەر زوو گوتی: (مام خەنی دانیشە، چەقۆیەکی بۆ بێنن دوایی زانیم ئەو پیاوە ئاشپەزی* گشتییەو ناوی (چیچۆ)یە بیست ساڵ حوکمە، زۆری پێنەچوو بەندیەك هات سەلامی کردو ڕۆیشتە ژورێك عەرەب بوو، ئەویش زنجیرێکی لە پێدا بوو وتیان ئەوە بەرپرسی ئاشخانەیەو ناوی (سید محمد)ە.

کاری من لەوێ ئەوە بوو خواردنم بۆ ئەوانەی لە ژووری ئیعدام بوون دەبرد، کارە سەرپییەکانیشم دەکرد کەمێك شارەزای بەندیخانە بووم، دیار بوو بەندیەکان ئێواران

* ئاشپەز: طباخ

دەیان خوێند منیش چووم ناوی خۆم بنووسم، مامۆستای بەپرس گوتی: (خوێندەواریت هەیە؟) گوتم: (بەڵێ کەمێك خوێندەواریم هەیە)، کاتێك سەیری کرد خوێندنەوەو نوسینم چۆنە گوتی: (ئەوانەی دەیان بینی هیچیان ئەوەندەی تۆ نازانن مەگەر بێیت قورئان بخوێنی).

ئەڕۆیشتم عەرەبیو قورئانم دەخوێند، عەرەبیەکەم لاواز بوو دەمویست باشتر فێرببم، ڕۆژێك لەبن دیوار دانیشتبووم عەرەبیم دەنوسیەوە دیتم کەسێك لەسەرسەرم وەستا بوو زۆر بەوردی سەیری نووسینەکەمی دەکرد، سەرم هەڵبڕیو ویستم هەستم نەیهێشت سەیرێکی کردم دیتی بەمرۆڤێکی شیرزە دەچم. پرسی: (چەند ساڵ حوکمیو لەسەر چ بەندکراوی؟) ئەوەی ڕاستی بێت باشی تێ نەدەگەیشتم لەبەر ئەوەی عەرەبیم باش نەبوو، برادەرێکی کوردی بانگ کرد لە بەندیەکان بۆ ئەوەی تەرجەمەمان بۆ بکات، گوتم: (پانزە ساڵ حوکم کراوم)، سەرباز بووم ئەو تاوانەی لە دادگای کەرکوك پێی حوکم کرام بۆم باس کرد، پیاوەکە کەمێك وەستاو چاوەکانی دانایە سەریەکترو گوتی: (دوای ژماردن وەرە لام لە قاوشی دوو نامەیەکی داواکاریت بۆ ئەنوسم بۆ مەلیك بۆ سوککردنی حوکمەکەت)، پرسی: (خۆ بڕیاری دادگات مۆر نەکردوە؟) گوتم: نەخێر مۆرم نەکردوە.

ئەو مرۆڤە بۆ ژماردن نەدەهات کاتێ پرسیم بۆ نایەت بۆ ژماردن، گوتیان سیاسیەو دەڵێن شیوعیە ناوی (غەنی) بوو. لەسەر ڕاسپاردەی خۆی ڕۆیشتمە لای ئەو مرۆڤە، ئەوەی ڕاستی بێت بەڕویێکی گەشەوە بەخێر هاتنی کردمو هەر زوو دەستی دایە قەڵەمو کاغەزو دەستی کرد بەنوسین لەکۆتاییدا بەمەرەکەب ئەنگوستی تەڕ کردمو بەکاغەزی وەناو گوتی: (تۆ بڕۆ دوو بەیانی خوشکم دێتە سەردانم ماڵیان لەبەغدایە وا ئەکەم نامەکە باوێتە سندوقی ماڵی (مەلیك) هیچ غەمت نەبێت.

کاتێك لای ئەو مرۆڤە بەسۆزە دەرکەوتم بیرم لەوە کردەوە ئەگەر بی گوتبایە دە فلس چیم دەکرد!، خۆ یەك فلسم نەبوو، بەڵام ماڵی ئاوا بێت هەموو شتی بەخۆی ڕێکخست. ئەوەی دیار بوو لەو بەندیخانە گەورەیە کەسی لە خۆم بێ کەس ترم نەدەدی، تەواو ئاڵۆزو شێواو بووم، چونکە هەر من بووم کەس نەدەهاتە لام، پەرۆشیم

لەوە نەبوو کە کەس نەدەهاتە لام، بەڵکو پەرۆشیم ئەوە بوو بڵێن ئەو گەنجە کەسی نیە بۆیە نایەنە لای.

نامەی ئەو مرۆڤە بۆی نوسیم ماوەی چەند مانگێك دەنگی نەبوو. پیاوەکەش لەوێ گواسترایەوە بۆ شوێنێکی تر منیش لێی بێ ئومێد بووم، کەچی ڕۆژێك بانگ کرام بۆ لای مدیر کە چوم ناوبراو پرسی: (تۆ نامەت ناردوە بۆ مەلیك بۆ سوك کردنی حوکمەکەت؟) منیش گوتم: (بەڵێ من نامەی داواکاریم داوە بەمەلیك زۆر لەمێژە تاکو ئێستا بێ وەڵامە). مدیر گوتی: (باشە چەند حوکم کراوی). گوتم: (١٥ساڵ) گوتی: (بەچەند ساڵ ڕازی دەبی ئێمە بۆت دیاری بکەین؟) گوتم: (بەیەك ڕۆژیش ڕازی نیم لەبەرئەوەی تاوانبار نیم تا ڕازی بم یان نا). مدیر گوتی: (بۆت بکەین بەپێنج ساڵ ڕازی دەبی؟) گوتم: (نەخێر بەپێنج ڕۆژیش ڕازی نابم ئەگەرچی نزیکەی ساڵێکە بەندم غەدرێکی زۆر لە من کراوە لەجیاتی ئەوەی خەڵات بکرێم بەند کراوم).

مدیر گوتی: (کوڕم ئەوەی ڕاستیە ئەمرت گەڕاوەتەوە بەدوو ساڵ کەیفی خۆتە مۆر بکەی یان نا، بەڵام پێت دەڵێم دەستی لێ مەدە دوور نیە زیاد بکرێت! لەو کاتەی نزیکەی ساڵێك بوو بەندکرابووم بەگوێرەی بڕیارەکە ساڵێکم مابوو دەربچم.

## ڕابواردنم لە بەندیخانە

ڕابواردنم بەزۆری لەگەڵ ناسیاوەکانی جەماعەتی گەرەوەییەکانو (حسن نۆپل)و زۆر جاریش (عەلی ئاغای سپینداریو کەریم خۆرانی)و ئاشنایەکانی تر بوو.

ڕۆژێك باش چاوەش (کامیل) ناسراو بوو بەجەلادی بەندیخانە ئەوەندەی باسی بکەیت مرۆڤێکی ناپەسەندو بێ ڕێز بوو چەند نارێكو ڕەوشت ناشیرین بوو، جولانەوەو هەڵسو کەوتی ئەو پیاوەو کارەکانی کە پێی سپێردرابون پڕ بەپێستی خۆی لێی دەوەشانەوە، لەقاوشی (٥) بەژور کەوت لەگەڵ پۆلیسێك، کاتێك گەیشتە لای من گوتی: (هەستە)، منیش هەستامو سەیری بەتانیە شوڕەکانی کردم لەژێر سەرم گۆڤارێکی گەلاوێژ هەبوو برادەریك لە کاتی دەرچونی لە بەندیخانە بۆی جێ هێشتم، گۆڤارەکەیان برد بەلامەوە سەیر بوو بۆچیان برد، لە دوای دوو کاتژمێر

منیشیان برد بۆ لای مدیر، ناوبراو پرسی: (ئەو گۆڤارە هی تۆیە؟) گوتم: (بەڵێ هی منە، برادەرێك بەربوو ئەم گۆڤارەشی بۆ من بەجێ هێشت). مدیر گوتی: (نازانی ئەو ژمارەیە قەدەغەیە، ئەوەی لێی بگیرێت بەتوندی سزا دەدرێت). گوتم: (نەخێر نەمزانیوە لەکوێ بزانم کەس باسی نەکردووە کەوا قەدەغەیە ئەوە ئێستا لەئێوەی دەبیستم کەوا قەدەغەیە). مدیر بە(کامیل)ی جەلادی گوت: (برۆ بیبە دە داری لێ بدە با جارێکی تر کاری وا نەکات). کامیل بردمی‌و پێیەکانی بەقایش بەستم (١٠) داری لەبەری پێ دام، کاتێ ویستم هەڵبستم برۆم نەم توانی، چونکە پێم (گۆد) ببون دەستم کرد بەجنێو دان ئەوەی هاتە سەر دەمم نەم گێرایەوە، رئیس عورەفا (هیلال) لەوێ بوو پیاوێکی باش بوو گوتی: (کورم هەستە برۆ ژوورەوە خۆت ماندوو مەکە). لە دوای ئەم بەسەر هاتە رۆژێك کاتژمێر١٠ی بەیانی لە دائیرە بانگ کرام نەمزانی بۆ چیە بێ گومان بەو هیوایە نەبووم کەس بێتە لام ترسام نەوەك دیسان بۆ لێدان بێت! بردیانم بۆ لای مدیر کاتێك چومە ژوورەوە دیتم رئیس (بەکر سامی) لەوێ دانیشتبوو بەخێر هاتنم لێ کرد کەوتە قسە لەگەڵم وای راگەیاند کە بەمدیری گوتبو ئەوە خزمەو چاوت لێ بێت زەرفێکی دامیٚ‌و گوتی: (نەمتوانی چیت بۆ بێنم ئەوا ئەرۆمە زاخۆ لە گەرانەوە بێرەدا دێمەوە، بەلاَم لەوانەیە دوا بکەوم)، رۆیشتمە دەرەوە و ئەوانیش لەگەڵ مدیر دەرکەوتن مدیر پێی گوتم: (هەر کارێکت هەبوو وەرە لام شەرم مەکە).

ئەوەی جێگای دڵخۆشیم بور هاتنی ئەو پیاوە بوو بۆ لام، بوژامەوە لەدوو لاوە لە رووی ئابوری ناوبراو زەرفێکی دامێ سێ دیناری لە ناو دابوو یارمەتیەکی زۆر باش بوو لەو دەمەدا، دوەمیان هەڵوێستی کاربەدەستانی بەندیخانە بەرامبەر بەمن گۆرا بەڵگەش ئەوە بوو رۆژی سێیەم مفەوەز (فازڵ) ناردی بەدوامدا گوتی: (چیتر مەرۆ ئاشخانە لەمەو دوا رۆژێ وەرە ئێرەو سەرم لێبدە ئەو نامانەی بۆ بەندیەکان دێن بۆیان ببە، لە ئەمرۆ بەدواوە ئەمە کاری تۆیە).

لەو کاتەدا ویستم هەڵوێستی کاربەدەستان بخەمە گەڕ یەکەم جار داوام لە مدیرکرد کە زنجیری (عەلی ئاغا) بگۆرێت، چونکە ناوبراو زنجیرێکی ئەستوری لەپێ دابوو نەی دەتوانی باش هاتوو چۆ بکات، مدیر بەڵێنی پێدام بۆی بگۆرێ. ئەبێ دان بەو راستەدا بنێم کەوا ئەو دووساڵەی بەندیخانە قوتابخانەیەکی ئەوەندە بەسوود بوو

لە ژیانی مندا فێری زۆر شتی کردمو لە زۆر ڕووەوە وشیار بومەوە، لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا لە زۆر شت گەیشتم کە سود بەخش بوون بۆ ژیانی داهاتووم. بەدرێژایی ئەو دوو ساڵەی بەندیخانە تەنیا خۆم بەبێ کەس دیت، کەس ڕوی تێ نەکردم وتەنها (عزەت)ی برام کە لە ڕواندز دەیخوێند دوو جار پارەی بۆ ناردم جارێك (١) دینارو جارێکی تریش (٧٥٠) فلس ئەویشی لەمەسرەفی خۆی دەیگێرایەوە و بۆ منی دەنارد، سەردانیش تەنها (محمود شیعه) جارێك هاتە لام، وامزانی دونیای داوەمەتێ ئەوەندە شاد بووم ئەو سەردانەم تاکو مردن لەیادە. زۆرم نەمابوو دەربچم لەبەندیخانە ئەو کاتە (یحیا بەگ) قائمقام بوو هاتە سەردانم سەردانەکەی ناوەخت بوو ئەگەر زوتر بایە کارم زۆر چاك دەبوو، دیار بوو برادەری مدیری بەندیخانە بوو. ڕۆژی هەرە خۆش ئەو ڕۆژەبە کەلە بەندیخانە دەردەچی، ڕۆژی بەربون خۆشترین مژدەی شادیە بەتایبەتی بەیانیان ناوی ئەوانەی بەر دەدرێن دەخوێندرێتەوە، ئەو بەیانیەی ناوم خوێندرایەوە لەخۆشترین شادی دابووم بەتایبەتی لەو کاتەی بەرگی بەندیم داناو بەرگی کوردیم کردە بەرم ئەو کاتە وام دەزانی تازە چاوم بەدنیا هەڵێناوە. پێش دەرچونم ڕۆیشتمە لای هەموو ئەو دۆست و برادەرانەی پەیوەندیم لەگەڵیان خۆش بوو ماڵ ئاواییم لێکردن هیوای دەرچونی ئەوانیشم بەئاوات خواست. بەڵێ لە بەندیخانە دەرکەوتم بردیانین بۆ سەرای (موصل)گوایە لەوێ بەرمان دەدەن تەواوێك چاوەڕوان بوین، ئێمە ئەوانەی سەربازبوین بەرێیان کردینە ئینزباتخانەی (موسڵ) لەوێش ڕاپێچی بەندیخانە کراین ئەوەی شایەنی باس کردنە ئەوەندەی ئەو دوو شەوە لەوێ ئەزیەتم خوارد لە دوو ساڵی بەندیخانەی گەورە ئەوەندەم ئەزیەت نەدی بێ خۆراکی لەلایەكو پیسو پەلۆسیو پێوە دانی تەختە کالۆسیش لەلایەکی ترەوە. ڕۆژی سییەم یەکێك لە ئەفسەرەکان بانگی کردم پێی ڕاگەیاندم کە دەبوایە بەپێی یاسا نە گەڕێیەوە ڕیزی سوپا، بەڵام لەبەر ئەوەی مەلیك حوکمی سوك کردووی دەبێ بگەڕێیتەوە ئەگەر لە دووساڵ زیاتر بوایە نە دەگەڕایەوە سەربازی، بەڵام ئێستا دەبێ خزمەتی سەربازی تەواو بکەی لەبەر ئەوە ئێمە بەرێت دەکەینەوە بۆ کەرکوك.

# گەڕانەوەم بۆ ڕیزی سوپا

لەگەڵ چەند سەربازێك لە (موصڵ) بەڕێ کراین بۆ کەرکوك بەپاسێکی شوڕی شەقو دەق، کاتێك گەیشتینە (ئالتون کۆپری) لەوێ هەموویان دابەزین من لەناو ئۆتۆمبێل دانەبەزیم لەبەر ئەوەی پارەم پێ نەبوو چایەکی پێ بکڕم، لە دواییدا نائب عەریفێك لەوانەی لەگەڵ ئێمە ناردرابوون هات گوتی: (ئەوە بۆ نایەیتە خوارەوە؟) گوتم: (برا چیت پێ بڵێم، ئەوەی راستی بێت یەك فلسم پێ نییە لەبەر ئەوە دانابەزم)، نائب عەریفەکە ناوی (سعدالله) بوو دەستی گرتم بەزۆری داییەزاندم پارەی خواردنو خواردنەوەی منیشی دا بێگومان وام دەزانی دنیای داومەتێ، چونکە نائب عەریفەکەم نەدەناسی، درەنگ بوو گەیشتینە کەرکوك بردنیانین بۆ هەمان بەندیخانەی فرقە، سێ ڕۆژی تریش لەوێ مامەوە لەدوای سێ ڕۆژ بردمیان بۆ لای ئەفسەرێکی پایە بەرز ئەفسەرەکە بەڕوویێکی خۆش گوتی: (تۆ دەبێ خزمەتی سەربازی تەواو بکەیتو بڕۆیتەوە شوێنی خۆت بۆیە ناردومە بەدوات تا بزانی لە ڕیزی سوپا دەرنەکراوی). گوتم: (باشە ئەوە دوو ساڵە بەندم، دوور بووم لەماڵ و کەس و کار ڕێگام بدەن چەند ڕۆژێك بڕۆمەوەو سەردانێکیان بکەمو بگەڕێمەوە).

ئەفسەرەکە گوتی: (بڕۆوە فەوجەکەت ئاگاداریان دەکەین ڕێگەت بدەن بڕۆیتەوە ماڵەوە)، لە دوای ئەو چاو پێکەوتنە گەڕاینەوەو ڕۆیشتینە بەردەرگای ئینزیباتخانە لەوێ ئینزیباتێکیان لەگەڵ ناردم ناو براو فایتۆنێکی ڕاگرت سوار بووین ڕۆیشتینە سەربازگەکەو بردمیانەوە فوجی سێ لیوای سێ، کاتێك گەڕامەوە فەوج چوار ڕۆژ بەبەرگی کوردی بووم کاتێك بەرگی سەربازیان پێدام پێڵاو نەبوو، لەبەر ئەوەی پێڵاووم نەبوو نەیان دەبردم بۆ تدریب هەر لە قاوش دەمامەوە، بەیانیەك ئەوەندەم زانی مقدم لیوا لەگەڵ دوو ئەفسەری تر پەیدا بوون دەگەڕان، لە شوێنێك لەناو حەوشە وەستان بانگی منیان کرد کە چوم مقدم لیوا گوتی: (بۆچی ئێرە ئەوەندە پیسە؟) لەکاتی قسەکردنی چاوی کەوت بەقۆندەرەکەم زۆر بەتوڕەیی گوتی: (ئەوەچی یە سەربازو پێڵاوی مدنی ناوی بنوسنو بیهێنن بۆ لام)، ڕێگای نەدا پێی

بلێم تازە لە بەندیخانە بەر دراوم‌و پێلاو نییە بمدەنێ، ڕۆیشت ئەفسەرێکی لەگەڵ بوو ناوی (ملازم ئەوەل عبدالغنی) لەکاتی ناوی نووسیم گوتی (مەترسە هیچ نییە).

لەگەڵ ئەوەشدا دڵ تەنگ بووم کاتێك سەربازەکان لە تدریب گەڕانەوە زوو ڕۆیشتمە لای (ملازم نوری حکیم)و شتەکەم پێ گوت، ناو براو گوتی: (کەریمە شێت ناوی نووسیوی مەترسە ئێستا دەڕۆم ئەوەندەی تر شێتی دەکەم). شەوی دوایی ڕۆیشتمە ماڵی(ئەمین ڕواندزی)، لەوێ مامەوە ئێوارە ڕادیۆی کردەوە، ڕادیۆی (تەورێز) بەکوردی دەدواو ناوی هەندێ لە ئەفسەرەکانی کوردی خوێندەوە ئەوانەی پلەی سوپاییان پێدرابوو لە کۆماری مهابات.

بەڕێکەوت شەوی دوایی ڕۆیشتمەوە لای (صالح نادرا ئاغاو مستەفا حاجی ڕەزاق ڕواندزی)، هەردووکیان نائب زابت بوون لە قەڵەمی فەوج، (صالح) برای مامۆژنم بوو لەکاتی قسە کردندا گوتم: (لەماڵی ئەمین ئەفەندی شەوی ڕابردوو گوێیان دابوە ڕادیۆی تەورێز بەکوردی قسەی ئەکرد)، من قسەم تەواو نەکردبوو (صالح) زۆر بەزویری‌و تووڕەیی گوتی: (بێ قەزابی تۆ دوو ڕۆژو کەرکێکە لەبەندیخانە دەرکەوتووی تکات لێ دەکەم لای ئێمە باسی ئەو شتانەمەکە سەری ئێمەش مەخەرە قوڕێ)، من لەسەر خۆم سارد بوومەوە، بەڵام ئەوەی جێگای ڕەزامەندیم بوو ئەوەبوو (مستەفا) زوو بەدەنگ هات‌و گوتی: (صالح جێگای پەرۆشییە بەو هەڵوێستە چەوتە خۆت نیشان دەدەی کوڕە هیچی نەگوت تۆ بەوشێوەیە جوابت دایەوە، خۆ کەسی بێگانە لێرەنییە بچێت خەبەر بدات تۆ ئەوەندە دەترسێیت).

ئەو ماوەیەی لە کەرکوك مامەوە هەر شەوێك نۆبەتدار نەبوام دەڕۆیشتمە ماڵی (ئەمین ئەفەندی)، شەوێك ئەمین ئەفەندی چەند پیاوێکی لا بوون ڕادیۆی تەورێزیان کردبۆوە کەناوی کۆماری مەهابادی دەهێناو ناوی فەرماندەکانی دەخوێندەوە گیانم تەزی تێ هەڵ دەهات بەتایبەتی لەوکاتەی کە سروودی سەیرانگای بەهارانی لێ دەدا، دڵم پڕبوو لە شەپۆلی کوڵی شادی، ئەمین ئەفەندی هەستی کرد من زۆرم پێ خۆش بوو دوایی پیاوەکان ڕۆیشتن بەمنی گوت: (ئاگاداربەلای کەس باس نەکەی).

لەناوەڕاستی مانگی دووی ١٩٤٦ ڕۆژێکی هەینی لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازی برادەر لەناو شار دەگەڕاین، لە شوێنێك هەندێك (فاڵ)گرەوە دانیشتبوون هەر

یەکەیان کتێبێکی لە پێش بوو ڕۆیشتمە لای یەکێکیان سەیری سەر بەرگی کتێبەکەم کرد گشت پیتەکانی بەعەرەبی لەسەر نوسرابوون پیاوەکە گوتی: (ئەوپیتانە دەبینی پەنجەت بخەرە سەر یەکێ لەو پیتانە بەئارەزوی خۆت)، کەوای گوت پەنجەم خستە سەر پیتی (ح) پیاوەکە دەستی دایە کتێبەکەو گوتی: (یاحەزرەتی نوح لە دوای کەمێك سەیری کتێبەکەی کردو سەری بەرز کردەوەو گوتی: (تۆ ڕێگایەکی زۆر دوورت لەپێشە ئەوەندە دوور دەڕۆیت هەتا کێوەکانی قەفقاس ماوەیەکی زۆر گیر دەبیتو ماوەیەکی دوور دەکەویتەوە، بەڵام دەگەڕێیتەوە کەهاتیەوە لێرە لەو کەرکوکە دەبی بەفەرمانبەر، دووەمیان دڵت داوە بەکچێك وازی لێ بێنە بۆ تۆ نابێت).

ئەوەی ڕاستیە ئەوکاتە باوەڕم بەقسەکانی نەبوو تەنانەت نەمدەزانی کێوەکانی قەفقاس لە کوێن کەچی لە دواییدا قسەکانی دەقاودەق دەرچوون، کچەکە بۆ من نەبوو خۆشم لەناو کێوەکانی قەفقاس دیتەوە، لەدوای بڕینی ڕێگایەکی دوورو مانەوەم زیاتر لە دوانزە ساڵ بەدەربەدەری کاتی گەڕانەوەش یەکەم جار لەکەرکوك بوم بەفەرمانبەر.

دەنگێك پەیدا بوو کەسوپا دەڕواتە ڕواندز، پێش ئەوەی لە کەرکوك بڕۆین ئێوارەیەك ڕۆیشتمە ماڵی (ئەمین ئەفەندی) لەگەڵ (وریا) لەتارمەکە دانیشتبووین کاتێك (ئەمین ئەفەندی) لەگەڵ هەمان پیاوەکانی جاری پێشو هاتنە ژوورەوە (وریا) ڕۆیشتە ژوری خوێندنی خۆی، ئەوان دانیشتن (ئەمین ئەفەندی) بەیەکێکیانی گوت: (ئەوەش کوڕی برادەرتە لێرە سەربازە). پیاوەکە گوتی: (بەڕاستی کوڕی سلێمان بەگە؟) ناوبراو گەڕایەوەو گوتی: (خۆ ئەویش ناوی هەبوو بگیرێت نە ڕۆیشتوە بۆ ئێران؟) لەوکاتە یەکێك هاتەلایان و دیار بوو ئەفسەر بوو لەکاتی قسەکردن ئەو ئەفسەرە گوتی: (ئەمرۆ گوێم لەنزیك ترین باوەڕ پێ کراوی (لایەن) بوو گوتی: (لایەنو دارو دەستەکەیان زۆر بەپەرۆش بوون بەچونی مەلامستەفا بۆ ئێران). ئەمین ئەفەندی بەدەنگ هاتو گوتی: (ئەگەر مەلامستەفا بۆی کرابایە نەدەڕۆیشتە ئەو دیو، بەڵام شێخ ئەحمەدی برا گەورەکەیو هەندێك ئەفسەر پڕۆژەی مەلامستەفایان تێکدا و هاتنی ئەفسەرەکانی ڕوس بۆ بارزان لێرە باوەڕیان لەسەر نەمانو یارمەتیان لێ بڕین).

لەو کاتەی لەبەندیخانە دەرکەوتم لەسەرەتای (١٩٤٦) بەنیاز بووم سەبازی نەکەم گوتم دەڕۆم بەئیجازەو نا گەڕێمەوەو دەڕۆمە ئەو دیو دەبم بەسەربازی سوپای نیشتیمانی لەمەهاباد، بەلاّم پەشیمان بومەوەو بڕیارمدا نابێ بەدەست بەتاڵی بڕۆم لەو دەمانەش دەنگێکم بەر گوێ کەتبوو کە لیوایەکەمان دەڕواتە ڕواندز ئەوە هیوایەکی بۆدروست کردم کە بەدەست بەتاڵی نەڕۆم، هەر چاوەڕوان بووم کەی فەرمانی ڕۆیشتن دەردەچێت، لە ناوەڕاستی مانگی دووی (١٩٤٦)دەست کرا بەخۆ ئامادەکردن، ئەوە بوو بەیانیەك زوو لیوا لە کەرکوك دەرکەوتو پیادە بەرەو سەرو کەوتەڕێ، شەو لەنزیك ئاڵتون کۆپریماینەوەو ڕۆژی سێ یەمی ڕۆیشتن گەیشتینە هەولێر دووسێ ڕۆژ لە هەولێر ماینەوە لە وێش بەخانزادو بەستۆڕە تێپەڕین هەورازو سەرەژێری پیرمامو کەندو دۆڵی کۆڕێ مان بڕی لە خوار شەقلاّوە باران ڕای گرتین بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، دواتر لەوێش بەڕێ کەوتین بۆ(میراوەو سیساوەو باویانو حەریرو گولەك)مان بەجێهێشت بەرەو لۆفەکانی(سپیلك) شەو لە خوار کەلەکین ماینەوە دوا قۆناغ گەیشتینە (زار گەڵی عەلی بەگ)، لەدیوی دەشتی ڕواندز لەنزیك گوندی(باڵەکیان) دابەزین ئەو شوێنە بوو بەسەربازگەی جێنشین دەست کرا بەدامەزراندنی سەنگەر لە دەوری سەربازگەکە، سەنگەرەکەی پشتی قشڵەی پۆلیسەکان بەسەر گوندی (باڵەکیان)ی دا دەڕوانی بەئێمە سپێردراو بەدڵی من بوو.

ئەوەی دیارە ڕێگایەکی دوورمان بەپێ بڕی هەتا (زار گەڵی عەلی بەگ) لە ژێر تەڕو تووشی ڕۆژانی باران، ڕۆژانی لە هەولێر بووین بلاّو کراوەیەکم دەست کەوت دەربارەی کۆماری دامەزراوی (مەهاباد)و وێنەی (پێشەوا قازی) لێدرابوو تەواو دڵی شادکردم. سوپا لە(زارگەڵی) خەریکی خۆ ڕێکخستنو دامەزراندنی سەنگەرەکان بوو، کەچی من کەوتبومە بیر کردنەوە بۆ دەست نیشان کردن وڕەچاو کردنی ڕێگایەکی گونجاوو لەبار بۆ پێدا دەرباز بوون لەکاتی ڕاکردن، زۆر بەوردی ڕێگایەکانم خستنە بەرچاو (دێلیزیان سەری بەردیو باپشتیانو جندیان) ئەم ڕێگایانەم پەسند نەکردن. دەرچوون بەو ڕێگایانەدا مەترسی زۆی هەبوو لە بەر ئەوە ڕێگایەکم ڕەچاو کرد ئەگەر چی دوورو پڕ زەحمەتیش بوو، بەلاّم لەسەدا سەد سەرکەوتنی تێدا بەدی دەکرا ئەویش ڕێگای (گۆڕەزو بەسەر کەوتنی بەنی باڵەکیانو

دابەزین بۆ ناوگەلی عەلی بەگو پەڕینەوە بۆ بەری هەندرێن) بێگومان ئەو نهێنیە هەر لای خۆم بوو تاکو کاتی دەرکەوتن.

هەر لەو کاتەی گەیشتینە (زارگەلی) چەند جارێك رۆیشتمەوە گوندەکانمانو بۆ چاو پێکەوتنی هەندێ لە گەنجە باوەڕ پێ کراوەکان، لە(دۆلەمنجەل) چاوم کەوت بەچەند لاوێکی خوێن گەرم توانیم ڕازیان بکەم لەکاتی پێویست بێن بڕۆین بۆ مەهاباد بۆ خزمەتی (کۆماری کوردستان)، هەروەها لەناو سەربازگەکەش لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازی دۆستو برادەر لەو ڕووەوە قسەمان کردبوو، ئێوارەیەك زانیم (مستەفای حاجی رزاق) بەند کراوەو چومە لای دیار بوو لەژێر خیوەتێك داندرابوو نۆبەتداری لابوون، ناوبراو لەسەر ئەوە گیرا بوو لەگەڵ زابتی خۆی بەشەڕ هاتبوو ئەو ڕۆژە بوو چاوم بە(ئیسماعیل عارف) کەوت ناوبراو عریف حاشای فەوج بوو دیار بوو بەنیاز بوو بڕوات بۆ (مەهاباد)، ئەگەر چی برادەرم بوو بەلاّم نەوێرام خۆی لێ ئاشکرا بکەمو بڵێم منیش بەو نیازەم، هەستم کردهەلوێستی زۆر باش بوو پێیەوە دیارە گیانی کوردایەتی هەیەو مرۆڤێکی کورد پەروەرە لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی پێی بڵێم لەگەڵ خۆمت دەبەم! لەو گەنجانەی لەگەڵیان دوابوم لە (دۆڵە منجەل) پێش بڕۆم ئاگاداری (ئیسماعیل مامەشێخە)م کرد بێت بۆ ئەو شوێنەی بۆی دیاری دەکەم بۆ بردنی چەك، لەسەر ئەو ڕۆشناییە لەسەرەتای مانگی (١٩٤٦/٤)ڕۆژێك ڕۆیشتمە ماویلیان بۆ ئەوەی (ئیسماعیل) ئاگاداربکەم و ڕۆژو کاتی بۆ دیاری بکەم، ئەوە بوو چاوم بەناوبراو کەوتو شوێنو کاتم بۆ دەست نیشان کردکە کەی بێت، پێش (ئیسماعیل) بێت ئەو دوو سەربازەی بەلێنم پێدابوون کە بیان گەێنمە گوندی (وەرتێ) ئاگادارم کردن لەو شوێنە ئامادە بن کە بۆم دیاری کردبوون. پێم گوتن (کاروانێك دێت دەچێتە لای ئێمە لەگەڵ خۆیان دەتان بەن هەتا وەرتێ)، هەر بەوشێوەیەش بە(ئیسماعیل)م ڕاگەیاندبوو کەوا دوو سەرباز دێنە ئەو شوێنەی بۆ تۆ دیاری کراوە بیان غافلێنە تا من دەردەکەوم لەسەنگەر، ئەگەر من نەهاتم پێیان بڵێ کاروان دورە هەتا ئەگاتە ئێرە زۆری پێ دەچێت بانەزانن من دێمو تۆ چاوەرێی من دەکەیت نەوەك بۆم ڕێك نەکەوێت چەکەکان دەربخەم ئەو کاتەی من دەرکەوتم با ئەو کاتە بزانن مەترسی نیە. ئێوارە (ئیسماعیل) لە شوێنی دەست نیشان کراو دەرکەوت لەگەڵی ڕۆیشتمە دوکانی سوپا هەندێ شتی پێویستم بۆ ڕێگا کڕیو دامە

دەستی، ناوبراو ڕۆیشت بۆ شوێنەکەومنیش گەڕامەوە بۆ سەنگەر (ڕەبیە) بەخۆم جێگری ئامیر(حەزیرە) بووم نائیب عەریفمان لە نەخۆشخانە بوو، نۆبەتدارم دیارکردن بەشێوەی پێویست، لە دیوی لای دەرگای سەنگەر خۆم نۆبەتدار بووم لەلایەکەی تری خیوەت سەربازێکی عەرەب (حسن جمعە) نۆبەتدار بوو خەڵکی دیوانیە بوو ئەوانەی گۆرێمانن خەویان لێ کەوت شەو ڕاکشا بوو لەو کاتەش لەخوار سەنگەرەکە چەمارۆی سەگەکانی شوان بوو ڕۆیشتمە لای حسن پێم گوت: (وشیار بەسەگەکان ئالۆزن دیارە شتێك هەیە).

گەڕامەوە ناو خیوەت هەموویان نوستبوون تفەنگەکانم خستنە باوەش بردنم بۆ لای(ئیسماعیل) دیاربوو دوو سەربازەکانیش لەوێ بوون گەڕامەوە فیشەكو ڕەشاشم لە دەرگای سەنگەر بەجێ هێشت لەبەر ئەوەی دەمزانی پێمان دەرناچێت زوو بەزوو هەریەکەی هەندێ فیشەکم دا پێیان هەریەکەی تفەنگێکی زیادیان هەڵگرتو کەوتینە ڕێ بەو ڕێگایەدا کە دەست نیشان کرابوو بەڕێگای گۆڕەزدا سەرکەوتین بۆ سەر بەنی باڵەکیان، شەوێکی بەهاری بوو...

## ڕاکردنم لەڕیزی سوپای عێراق

وەك لە سەرەوە باسکراوە دادگای سوپای (عورفی) کەرکوك لەسەر هیچ بڕیاری بەند کردنی دام، دوو ساڵ بەندیو ئەزیەتو دەردە سەری بەنیاز بوون گوایە خزمەتی سەربازیان بۆ تەواو بکەم، بەلاّم بەپێی ئەو بڕیارەی بەخۆم دابوو کە ڕابکەم لەریزی سوپا لە ناوەڕاستی مانگی ١٩٤٦\٤ بۆم هەڵکەوت بڕیارەکەم گەیاندە جێو لەسەنگەر دەرکەوتم لەگەڵ هاوڕێکانم ڕێگای سەرکەوتنم گرتەبەرو بەگۆڕەزدا سەرکەوتین. شەوێکی بارانی بوو لەگەڵ دوو سەربازی تر لە فەوج کەناویان(حمە عزیزو نورەدین)و (ئیسماعیل مامە شێخە) لەگەڵ دەرکەوتنی ئاسۆی بەیانی لەکێوی بەنی (باڵەکیان) سەرکەوتین، بەلاّم تا سەرکەوتین زۆر هیلاك بوین، لەبەر ئەوەی پاش باران بوو (٧)تفەنگو (٨٠٠) فیشەکمان پێبوو باشیش شارەزای ڕێگا نەبوین لەگەڵ ئەوەشا باش ڕۆیشتین لەکاتێکی باش سەرکەوتینە سەر لوتکەی بەرزایی کێوی (بەنی بالەکیان)، دوای پشودان بوو بەڕوناك لەوێوە سەیری

سەربازگەورێگاو بانەکانی دەشتی ڕواندزمان دەکرد، ئەو دەشتەی ئێستا پێی دەڵێن (دەشتە دیان)، زۆر باش دیار بوو سەربازەکانی سەربازگە لەو دەشتە پەرتو بلاو ببون لەسەر ڕێگایەکانی (بادلیانو سەری بەردیو ناوڕۆینو هاودیانو مەزنەو باپشتیانو گەروی سۆرە پەلۆکیو جندیان)، ئەگەڕان بەدوای مندا. لەرێ خۆمان بوارد تا ئێوارە نزیك ڕۆژئاوا هەندێ مەخزەنی ڕەشاشمان پێ بوو پڕبوون لەفیشەك بەتاڵمان کردنو مەخزنەکانمان لەوێ شاردنەوە، پێش تاریك دابێ سەرەو ژێر بۆ ناو(گەڵی) دابەزینە خوارو لەگەڵ داکەوتنی تاریکی گەیشتینە سەر پردی (کانی ماران) یەکەم جار(ئیسماعیل) دەربازی ئەو بەر بوو لەپردەکە پەڕیەوەو لە دوای ئەو سەربازەکان پەڕینەوە لە دوای ئەوانیش من پەڕیمەوە دوایی بەسەر کەوتینە سەر ئەو ڕێگایەی بۆ(بێخاڵ) دەڕۆیشت بەوڕێگایەدا ڕۆیشتین تاوەکو گەیشتینە سەروچاوەی ئاوی (بێخاڵ)لە پردەکان چەندجار ئەو بەرو ئەو بەرمان کردو دەرباز بوین لەگوندی (بێخاڵ)یش دەرباز بوین، ئەو دوو سەربازەی لەگەڵمان بوون یەکیان پەکی کەوت، ئەوەی تریش گوتی زیاتر ناتوانین بڕۆین لەبرسان، شەوردرەنگ لەوێ ناچار بووم (ئیسماعیل)م جیا کردەوە، بەڕێم کردە گوندی (کانیە قوڕ) بۆ نان هێنان بەخۆم لایان مامەوە (ئیسماعیل) شتەکانی پێی بوون لەگەل خۆی بردنو رۆیشت، بێگومان نابوا بەجێیان بێلین ئەوان هیچیان لەسەر نەبوو، لەوە دەترساین بەجێیان بێلین ئاشکرامان بکەن ئەو ئەشیایەی پێیان بوو لیمان وەرگرتبوون لەگەڵ ئەوەشا نەیاندەتوانی بڕۆن هەرچۆنەکی بوو وردە وردە ڕۆیشتین بەسەر کەوتینە سەر ئاوی (مێگر) کە بۆ ڕواندز دەڕوات لەگەڵ گەیشتنی ئێمە (ئیسماعیل)یش گەڕایەوە تەواوێك نانی هێنابوو، لەوێ نانو ئاوێکی بەتامان خواردو کەمێك پشوومانداـ ئەوجا هەستاین زۆر بەگورجی بەرەو دۆڵی (ئاکۆیان) ڕۆیشتین شەوێکی مانگە شەو پنکە هەوری لەبەر بوون بەناو گیای سەوزی بەهاردا دەڕۆیشتین، بێگومان سەربازەکانیش کاتێك تیریان خوارد زیندو بوونەوە، زۆر بەچووستو چالاکی دەڕۆیشتین. لە ڕاستی (کێلی بەکون) گەیشتینە سەر ڕوبار، ڕوباریش ئەوەندە زۆر دەهات لەوکاتەی خەریك بووین بپەڕینەوە گوێمان لەرەقە رەقی پێخوستی ولاخ بوو خۆمان دایە پەنای ژێر کەند دیار بوو پۆلیس بوون، ئەوانیش بەدوای ئێمەدا دەگەڕان، کاتێك دوورکەوتینەوە ئەوکات ئێمە لە ڕوبار دەربازبوینە بەری هەندرێنو

بەکۆسپەکانی (دەروك)دا سەر کەوتین بەبنەی هەندرێندا تێپەڕ بووین، لای بەرەبەیانی گەیشتینە (گەڵی بەتاوك) لە پشتی بێشوك بەسەر (جندیان)دا دەیڕوانی لەوێش (ئیسماعیل) مان بەرێ کردە بێشوك بۆ نانو بش زانیت دەنگ وباس دەربارەی ئێمە چی هەیە. ناو براو چوو بووە ماڵی (مەلا سمایل)، ئەو کەسە خۆشەویستی باوکمو هەموومان بوو.

کاتێك (ئیسماعیل) ڕۆیشتە بێشووك بەسەربازەکانم گوت: (من کەمێك دەخەوم هەتا (ئیسماعیل) دەگەڕێتەوە وشیار بن، ڕۆیشتمبە پەنا بەردێك نووستم کاتێك گوێم لە دەنگێك بوو یەکسەر سەرم هەڵبڕی، سەرێکی زەردم بەرچاو کەوت، زوو تفەنگم سوار کرد، بەنهێنی خۆم گەیاندە (نوری) دەبینم خەوتون هەڵم ستاندن لەوکاتەدا جەنگۆی کوڕی (مەلا سمایل)ە، منداڵ بوو هەستاسەرپێو گوتی: (وەڵڵا کەس لێرەنییە) دیاربوو لەگەڵ (ئیسماعیل) دەدوا، ئەوکاتە بانگم کرد وەرە ئێرە لێرەین. ئەوکاتە هاتن دیاربوو نانو ماستو چایان بۆ هێنابوین، لە دوای نان خواردن هەر دۆو منداڵەکانی (مەلا سمایل، قادرو جەنگۆ)مان بەرێ کردنەوە بەقادرم گوت: (لای کەس نەڵێن ئەوانمان دیت ئەگینا دەتان گرنو باوکتان دەخەنە بەندیخانە (قادر) گەورەتر بوو لە (جەنگۆ)ی برای، ئەوان گەڕانەوە ئێمەش بەبناری هەندرێن دا بەناو دارستانو کەندو دۆڵە سەختەکان دا بەرەو گوندەکانی (دۆڵە منجەل) ڕۆیشتین .

لەڕێگا(ئیسماعیل) بۆی گێڕامەوە لەوکاتەی چوو بوە ماڵی (مەلا سمایل) ئەڵێت: (هەر چاوی بەمن کەوت زوو پرسی لەکوێ وە هاتوی پێم بڵێ ئەو نێو چاوان ڕەشە هیچ خەبەری هەیە یان نا؟ ئەوە چەند ڕۆژە باوکی لەوارەکۆن چاوەڕوانیەتیو ماڵیشی بەرێ کردۆتەوە دەرگەڵە حکومەت ئالۆزە خەڵك ئەڵێن زرار ڕۆیشتوە چەکی زۆر بردووە بەدوای باوکیاندا ناردوە نەچووە، بێشوکیان بەوردی پشکنیوە).

(ئیسماعیل) ئەڵێت: (مەلا سمایلم لە ماڵ دەرخست لە پەنا دیوار پێم گوت من لەگەڵ زرارم ئەوا لێرەین لە گەڵی بەتاوك بۆ نان هاتووم)، مەلا سمایل دەستی بەردێنی داهێناو گوتی الحمدلله. زوو بەمنداڵەکانی نانو شتومەکێ سازکرد بە(قادرو جەنگۆ)ی بەرێ کرد بەو بیانوە کەنانی بۆ جوتیارەکان ئەبەن، منیش بەدوایاندا هاتم.

لەناو دارستانی بنەی (هەندرێن)دا دەڕۆیشتین دیاربوو ئۆتۆمبێلی سوپا پڕ لەسەرباز بەرەو سەرەوە دەڕۆیشتن سەری ڕۆژئاوا گەیشتینە سەروچاوەی ئاوی (دەنگارە) مام (رسول)ی ماویلی لەسەروچاوەی ئاوی ناوبراو چاوی بەئێمەکەوت سەرسام بوو کەدیتی ئەوەندە کەسە بەبەرگی سەربازی لەچیادا بەزینە سەر ئاو بەچەکەوە لە دوابیدا منو(ئیسماعیل)ی ناسی، ناوبراو شوان بوو دەی گوت: (ئەگەر تفەنگێکم بدەنێ لەگەڵتان دێم بزنەکان بەجێ دێڵم، بەڵام لەگەڵی کەوتمە دوان کە بزنەکانی بەخێو بکات باشترە لەتفەنگ، تفەنگ نان پەیدا ناکات بەڵکو نگبەتە...

لەدوای پشوێکی کورت لەسەر ئاوەکە بەرەو (وارەکۆن) ڕۆیشتین لە ڕێگای بانی (میراجیان) بیرم لەوە دەکردەوە خودا بکات باوکم نەڵێت منیش لەگەڵتان دێم. ئێوارە درەنگ بوو دیاربوو ئۆتۆمبێلی پڕ لە سەرباز ئەڕۆیشتنە سەرەوە ئێمە دانیشتین هەتا ئەوان تێپەڕ بوون.

چەکدارەکانی لەگەڵ باوکم دا بوون چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد لە پشتی (وارەکۆن) لەناو کێلە شاخەکان، کاتێك ئێمە ئەبینن لەبانی (میراجیان) دەڵێن ئەوە پۆلیسن دێن خۆیان ئامادە دەکەن، لە دوابیدا بەدووربین سەیر دەکەن چوار چەکدار بەرەو (وارەکۆن) دەڕۆن نەیان دەزانی من سەربازم لەگەڵن، دەڵێن ئەوانە چەکی زیادیان پێیە، لەدوابیدا زانیبویان ئێمەین منیان ناسی بوو لەگەڵ داکەوتنی تاریکی گەیشتینە ناو گوندی (وارەکۆن) ئەوانیش دابەزین لەسەر بانی ماڵی (حسن خاسکە) بەیەك گەیشتین باوکم پرسی: (بۆچی ئەوەندە گیر بووی ئەوە سێ ڕۆژە ئێمە لێرە چاوەڕێین ئەگەر ئەمڕۆکە نەهاتبان بەیانی ئەڕۆیشتین بیری ئەوەمان دەکردەوە ئەبێ بەلای (سیدەکان)دا ڕۆیشبن لەبەر ئەوەی دەربارەی ئێوە هیچ دەنگ وباسێك نەبوو ئاخۆ چیتان بەسەر هات بۆ ئەوەندە گیربوون حکومەتیش ئاڵۆز بوو ڕێگای گشتی چۆڵ نەبووە لە هاتو چۆی سوپا!)

لەقسەکانی باوکم بۆم دەرکەوت کەوا بەنیازە لە گەڵمان بێت، لەو قسانەدا بەسەر هاتەکەم بۆ باس کرد چۆن گەیشتوینو بەکوێ دا هاتووین. هەر ئەو دەمە بەرگەکەمان گۆڕی لەگەڵ سەربازەکانیش کەوتمە قسەکردن گوتم: (ئێمە دەڕۆینە (مەهاباد)و دەبینە سەربازی (کۆماری کوردستان)، ئەگەر ئێوەش بەشداری بکەن ئەوا تفەنگەکانتان لەلا دەمێنن، ئەگەر دەشڕۆنەوە وەك خۆتان داواتان کردوە کە بتان

گەیێنینە گوندی (وەرتێ) ئەوا بەیانی لە(دەرگەڵە) کەسێکتان لەگەڵ دەنێرێن هەتا دەتان گەیێنێتە (ڕانیە). هەر دووکیان گوتیان: (تازە مردنو ژیانمان لەگەڵ تۆیەو لەتۆ جیا نابینەوە)، بەو هەڵوێستەی (حەمە عزیزو نورەدین) کە ئامادەن بێن لەگەڵ ئێمە زۆر خۆش حاڵ بووم، هەریەکە لەوان دەستە جلکێکی کوردیان پێدراو چەکەکانیان لامانەوە، ئەو چەکە زیادانەی تریش دران بەو کەسانەی چەکیان نەبوو، یەك لەوان (حەیدەر) بوو پیاوی ناو ماڵ، ئەو شەوە ژنی هێنا بوو، ئەوەی ڕاستییە پێم خۆش نەبوو تفەنگ بدەم بەناوبراو، بەڵام نەمویست قسەی باوکم بشکێنم، ئەو کەسە ئەوەندەی بڵێی دەروون ڕەشو ناپەسند بوو، دەتوانم بڵێم دەربەدەری منو توندو تیژی باوکم لەهەڵوێستی بێ ڕێزی زڕ دایك بوو، دوو ئەوەندەش پڕو پوچیو نا پیاوەتی حەیدەرە ڕەشی باوەڕ پێکراوی باوکم بوو...

## لەوارەکۆن بەرەو مەهاباد

پێش ئەوەی لە(وارەکۆن) دەربکەوین جلە سەربازیەکانم دان بە(ئیبراهیم خاسکەی) کوڕی سەپانمان ئەویش داوای ئەکرد لەگەڵمان بێت، شەو لەگوند دەرکەوتین (حەیدەرە ڕەش) مایەوە گوایا بەیانی لە (دەرگەڵە) دەگاتەوە ئێمە، بەڕێگای دۆڵی وارەکۆن دا سەرکەوتین ژمارەی چەکدارەکان گەیشتە (١١) چەکدار ئەوکاتە ئەوەندە چەکدارە بەلەشکرێك دەژمێردرا، شەوێکی مانگە شەو ناوە ناوە هەور دەکەوتە بەر مانگ، منو ئیسماعیل لە پێشەوە دەڕۆیشتین بەتەنیشت گوندی ماویلیان سەرکەوتین، گوندێکی کشوماتو بێدەنگ، دەنگی باڵندەشی لێ نەدەهات، بەسەر کەوتینە سەر زی تەلانی ماویلیان باسكو باسك دەڕۆیشتین لە ئاگرێك نزیك کەوتینەوە، دیمان جوتیارن لای گایەکانیان خەوتوون، دیار بوو ئەوەندە ماندوو بوون بەتەنیشتیانەوە تێپەڕین سەریان بەرز نەکردەوە، ئینجا کەمێکی تر ڕۆیشتین لاماندا ناو ڕەزەکان چوینە سەرکانی (مەلا)ی لەدواییدا چوینە ناو کۆڵێتی وەستا(قادر)ی کاتێك لەگەڵ (ئیسماعیل) چوینە ژورەوە پیاوێك لەبەر ئاگر نوستبوو زانیمان (وەلی بەگ)ی ماویلیە، ناوبراو چاوی بەو چەکدارانە کەوت سەرەتا سەرسام بوو، دواتر ئێمەی ناسیو بەئیسماعیلی گوت: (ئەوە زرارو لەگەڵ دایە؟) ئیسماعیل گوتی:

(بەڵێ ئەوە زرارە)، لەو دەمەش باوکمو ئەوانی ترگەیشتنەجێ، کەمێك لای ئەو مرۆڤە باشە دانیشتینو لەگەڵی دواین دیار بوو خەریکی ڕەزکێلان بوو، لەوێ ڕۆیشتین چوینە ناو کۆڵێتی (ماڵی میر) ئەو شەوە تا لای بەیانی لەوێ ماینەوە، بەیانی زوو سەرکەوتینە(گۆمەوییان) لەوێ پشویەکی کورتمان دا بەرێگای (بەستی شەمێ) دا ڕۆیشتینە واری (بارزین) لەماڵی شوانمان (قادر لاجانی) بوینە میوان تا دوای نیوەڕۆ لەوێ ماینەوە، دوای نیوەڕۆ ڕۆیشتینە ناو ڕەزەکانی (وارکووڕیش) دیار بوو خەڵکێکی زۆر لەوێ خەریکی کارکردن بوون ڕەزیان دەکێلاْنو بن مێویان دەکردن، ئێمە لە کۆڵێتی (محمدحاجی) بووین، دایدایە باران لەوکاتەدا (حمدەمینی فقێ حسن) هات بۆکۆڵێت بینیم زۆر شڕوشەپرزە بوو بەزەیم پێهات لەبەر ئەوە بەرگی زۆر بێ سەرو بەربوو. کاتێك باران وەستا ڕۆیشتمە ڕووبەڕووی دەرگەڵە زۆرلە مێژبوو لێی دوور کەوتبومەوە لەدیدەنی دیمەنی ئەو ناوە، دیتم (مەلائەحمەدی قادری عبدالباقی) خەریکی ڕەزکێلاْنە ڕۆیشتمە لای لەدوای چاکو چۆنی ناوبراو منی لە پیاوەکان دوور خستەوەوگوتی (زرار ئەوەی بیستومە خزمەکان هەمویان ڕێك کەوتوون یەخەی باوکت بگرنو نەهێڵن بچێتە ئەو دیوو تۆش بدەنەوە دەستی حوکمەت بۆیە زۆر ئاگاداربە بەتەنیا مامت (سەیدئاغا) لەگەڵیان نیەو دژی ئەو هەڵوێستە چەوتەیە)، بەڕاستی ئاگادارکردنەوەی ئەو مرۆڤە دڵسۆزە جێگای سوپاسو دڵخۆشیم بوو هەرگیز لە یاد ناکرێت، لەدواییدا ئەو مرۆڤە پاکە داوای لێ کردمو گوتی: (ئەگەر بتوانی حمدەمینی فقێ حسن لەگەڵ خۆت ببەیت زۆر حەز دەکەم، بەڵکو لێرە ڕزگاری دەبێت، چونکە فیراری عەسکەریە).

لەدوای ئاگادار کردنەوەم لەلایەن مامۆستای بەڕێز، (ئیسماعیل)و دوو سەربازەکەم جیا کردنەوەو پێم گوتن: (ئاگادارتان دەکەم ئەگەر هاتوو باوکم داوای چەکی لێ کردن چەکی پێ نەدەن، ئەگەر بزانن دەستتان بۆ درێژ دەکەن بێ کوشتن خۆتان نەدەنە دەست خۆتان دەزانن ئێمە بکەوینەوە دەست حکومەت ئەکوژرێین کەوابێ نایەڵین کەس دەستمان بۆ درێژ بکات بۆیە زۆر وشیارو ئاگادار بن تا دەچینە ئەو دیوو لەیەك جیا نەبنەوە بەتایبەتی لەناو گوندی دەرگەڵە، چونکە پاش ماوەیەکی تر ئەچینە ناو گوند). لەگەڵ تاریك بوون دابەزینە ناوگوند کاتێك گەیشتینە بەر دەرگای ماڵمان دیتمان ماڵەوەمان پڕە لەخزمان، ئەوەی (مەلا

ئەحمد) فەرمووی ڕاست دەرچوو، ئەوان لەگەڵ باوکم کەوتنە مشتومڕ من زوو ڕۆیشتمە لای (مام سەیداغا)چونکە تەنیا ئەو بەشداری ئەو مشتومڕەی نەکردبوو لەگەڵیان نەهاتبووە ماڵمان، کاتێك بەیەك گەیشتین گوتی: (خۆت دوا مەخەو لەگوند دەرکەوە نیازیان پاك نیە بەلاّم خەمت نەبێت ئەوەی دەستت بۆ درێژ بکات مەگەر مامت دەستی بەتفەنگ ڕانەگات، ئەگەر براشم بێت ئەبێ بزانێ سەید کێیە). کاتێك گەڕاینەوە ماڵ گوتیان مام (ئەحمەدی زێڕنێ) هاتووە کاری بەتۆیە ناوبراو مرۆڤێکی گۆجەی بێ پێ بوو بەچۆکان دەڕۆیشت، ڕۆیشتمە لای دیار بوو داوای ئەوەی دەکرد (حیدەرە ڕەش) نەبەین لەگەڵ خۆمان لەبەر ئەوەی تازەی ژن هێناوە، پێم گوت: (مامەگیان زۆر باشە با تفەنگو ڕانك وچۆغەڵ بێنێتەوە من پارەی ڕانكو چۆغەلێکی دەدەمێ با بۆ خۆی ڕانك و چۆغەلێك بکرێت). (مام ئەحمەد) ڕۆیشت حەیدەر تفەنگو فیشەك دانو ڕانكو چۆغەڵی ناردبونەوە، هەر ئەوکات بانگی (حمەدەمینی فقێ حسن)م کردو پێم گوت: (ئەگەر بتەوێت لەگەڵ ئێمە بێیت خۆت ئامادەبکەو وەرە با بڕۆین. ناوبراو گوتی: (باوەڕ ناکەم باوکت ڕازی بێت من لەگەڵتان بێم). گوتم: (تۆ هەقت نەبێت من دەت بەم)، ئینجا گوتی: (ئەگەر پرسێك بەباوکم بکەی باشە)، لەسەر داوای ئەو بەپەلە ڕۆیشتمە ماڵیان (مام فەقێ) لەژورێك لە شوێنێکی تاریك دانیشتبوو خۆش خۆش قومی لە سەبیلەکەی دەدا، کاتێك پێم گوت: (مامە هاتووم ڕەزامەندی تۆ وەربگرم حمەدەمین لەگەڵ خۆمان دەبەین). مام فقێ گوتی: (زۆرم پێ خۆشە لەگەڵ ئێوە بێت نەك بەدوای ئەمو ئەو بکەوێت). ئەو شتانەی حیدرە ڕەشم دایە (حمد امین)و زۆر خۆشحاڵ بووم کە حیدەرە ڕەش پەشیمان بۆوەو نەهات. پێش ئەوەی لەگوند دەربکەوین ڕۆیشتمە لای دایکم خواحافیزی لێ بکەم، زۆر لە مێژبوو لێی دوور بووم، بۆ ماوەیەکی کورت منی بینی زۆر غەمبار بوو، دیار بوو ئەوکچەی فاڵچیەکە پێی گوتم وازی لێ بێنە بۆ تۆ نابێت لەوێ بوو، کاتێك ماڵئاوایم لێ کردن ئەویش لەگەڵ دایکم دەگریا! ماوەیەکی زۆر مشتو مڕی خزمەکان هەر بەردەوام بوو، ناچار ڕۆیشتمە دەرگا بەباوکم گوت: (ئەگەر دێیت بابڕۆین درەنگە ئەگەر ناشهێیت ئەوا ئێمە دەڕۆین)، لەو کاتەوە دەرکەوتین ژمارەی چەکدارەکان گەیشتە(١٢) چەکدار، شەو درەنگ بوو دەرگەڵەمان بەجێ هێشت، زۆر بەرێكو پێکی کەوتینە ڕێو دوودوو

بەیەکەوە دەڕۆیشتین، بەیانیان نزیکەی (٥٠٠) مەتر زیاتر هەنگاومان دەنا، لە دەرگای گەلی خوارو بەڕێگای (پیبیلان)دا ڕۆیشتین بەرەو گوندی (ڕەژیکەریان)، شەو هەورەکان ئالۆز بوون لەگوند نزیك بوینەوە بوو بەباران، ناچار لاماندا ئەشکەوتەکانی بەر ڕێگا تا باران وەستا، لەوێ ڕۆیشتینە (گەرووسین) ناو ماڵی خاوەن ئاژەڵەکان لە ماڵی (خدرە جۆڵ)دا بەزین باوکم لەژێر ڕەشماڵی ساڵی (مام خدر) بوو، بەیانی کاتی هەتاو هەڵاَت بەنیازی حەسانەوە کەمێك لە ڕەشماڵ دوورکەوتمەوە، لەبەر هەتاو پاڵم دایەوەو کاتێك گوێ بیستی دەنگە دەنگێکی مشتوو مڕ بووم لەژێر ڕەشماڵ دەهات، هەستامەوەو ڕۆیشتمە بن ڕەشماڵ دیتم (کریم بەگو حمەشریف بەگ) کوڕانی(میر حمدامین) لەگەڵ دوو چەکداری نەناسراو دانیشتوون، یەکێکیان زۆر بەدەم زەنی لەگەڵ باوکم دەدواو ئەی گوت:(من هاتووم نارۆم یان پارە، یان چەکم دەوێت لەجیاتی پارە، کاتێك بەو شێوەیە هەڵوێستی چەوتی ئەو مرۆڤەم دیت ڕووم تێ کردنو گوتم: (هەر ئێستا هەڵدەستن دەڕۆن، ئەگینا چەکەکانی ئێوەش دەبەین لەجیاتی چەکتان پێ بدەین هەستن زوو بڕۆن هەتا چەکمان نەکردوون)....

ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆ لە (ڕەژیکەریان) بەڕێ کەوتین بەڕێگای (پاش تات) شەو گەیشتینە گوندی (وەڵژێ) ڕۆیشتینە دیوەخانی (عزیزئاغا) لەوێ کەمێك حەساینەوە لەسەر داوای (عزیزئاغا) ڕۆیشتینە سەرکانیاوی (کانی بەست) لەپشتی گوند، لەبەر ئەوەی نەوەك پیاوانی ناپاك بچن خەبەری حکومەت بدەنو بڵێن چەکدارەکانی (سلێمان بەگ) لە دیوانی (عزیزئاغا) میوان بوون، بەلاَم ئەگەر بۆ (کانی بەستێ) بێن دەڵێن بەوێدا تێپەڕیون، (عزیزئاغا) ئەوەندەی بڵێی مرۆڤێکی ڕووخۆشو بەڕێزو نان دەر بوو، ئەو پیاوە یەکێك بوو لە بنەماڵەی (مەلا شەرەفی)ەکان لە باڵەکایەتی، ناوبراو هەموو پێویستیەکانی بۆ ناردینە (کانی بەست) کاتی نیوەڕۆ خۆشی هاتە لامان، ئەوکاتەی ماڵئاواییمان لێکرد (عزیزئاغا) بەباوکمی گوت: (باوەڕ بەئاغا نەکەیت ئەگەرچی خزمی خۆشمە بەلاَم پیاوی حوکمەتەو جێگای باوەڕ نییە، ئەگەر داوای کرد لانەدەن ڕاست بڕۆن خۆشت دەزانی معاش خۆری کێیە! مەبەستی لە ئاغا (محمدئاغای وەلاَش)ی بوو. ئێمە لە(کانی بەست) چاوەڕوانی (محمودی عالی سەکر)ی بووین ناوبراو شارەزا بوو بڕیار بوو بۆ شارەزایی ڕێگا لەگەڵمان بێت، ئەوە بوو دوای نیوەڕۆ (مام محمود) پەیدابوو،ئەوجا

بەرێ کەوتین (کانی بەست)مان بەجێ هێشت ئێوارە زەردە لەسەران بووگەیشتینە پشتی وەلاش، دیار بوو لەپشتی گوند دووکەس وەستا بوون کاتێك چەکدارەکانمان لەگەڵ (محمود) گەیشتنە لایان بەدیار کەوت چەکدارەکان نێردراوی ئاغا بوون بۆ ئەوەی (سلێمان بەگ) لابداتە وەلاش بۆ لای ئاغا، ئەوەی هەست دەکرا باوکم ڕازی بوو لابدات، بەلاّم ئێمە ڕازی نەبوین‌و ڕۆیشتین دەمی ڕۆژ ئاوا گەیشتینە ڕوی واری گوندی (سەکران) دیار بوو خەڵکی گوند بەشی زۆریان لەسەر بانان بوون کاتێك چاویان بەئێمە کەوت ئەو کۆمەڵە چەکدارە بەرەوگوند دەچن، ئەو خەڵکە تێکڕا کەس لەسەر بانان نەما، ئێمە پێش بگەینە گوند لامان دایە ئەو ڕێگایەی بەپشت گوندا سەر دەکەوێت هەندێکمان زۆری نەمابوو سەر کەوینە سەر گەروەکە ئەوانی تریش سەر دەکەوتن هەر ئەوەندەمان زانی ئێمە دراینە بەر تەقەی تفەنگ، لەسەرەتاوە وامان زانی پۆلیسن هەر زوو کەوتینە دەست و بردو بۆیان دابەزین زوو دەورەی گوندەکەمان دا، بەلاّم شارەزاکەمان (مام محمود) هەر زوو گوتی: (تکایە ئێوە تەقە مەکەن ئەوانە بەهەڵەدا چوینە، ناو براو ڕۆیشتە گوندو زوو گەڕایەوە دوو پیرە پیاوی لەگەڵ هاتنەلای باوکم، دیار بوو زۆر پەرۆش بوون نەیان زانی بوو ئێمەین وایان زانی بوو جەماعەتی (مەلا شەرەف)یانن هاتوونەتە سەریان چونکە، نێوانیان ناخۆش بوو،کە زانیمان هەڵەیەو هیچ نییە ڕۆیشتین لەوێ کۆمەڵێك کەندو دۆڵمان بڕی نزیك بوو بگەینە پردی (باسان) پێش ئەوەی بڕۆینە سەر پردەکە بۆئەوەی بزانین کەسی لەسەرە یان نا مەترسی ئەوەمان هەبوو پۆلیسی لەسەر بن، نزیك بوو لەگوندی (ئێنێ) هەندێکمان لەپێشەوە ڕۆیشتین بۆ بەسەرکردنەوە لە بەر ئەوەی گوایا حکومەت ڕێگاو بانەکانی گرتوون، بەدەرچوونی ئێمە زۆر ئاڵۆز بوو بوون، لەبەرئەوە پێویست بوو زۆر بەهوشیاری، بڕۆین ئەوە بوو زۆر بەپارێز ڕۆیشتینە سەر پردەکەو بەسەرمان کردەوە کاتێك زانیمان هیچ نییە ئەو کاتە باوکم و ئەوانی تریش هاتن، لەپردەکە دەرباز بووین (مام محمودو اسماعیل‌و نوری) لەپێشدا ڕۆیشتنە ناو گوندی (ئێنێ) ئێمەش دوا بەدوای ئەوان ڕۆیشین لە داوێنی گوند دوو کەس لەگەڵ مام (محمود) هاتبوون بۆ سەر ڕێگا لەگەڵ ئەوان ڕۆیشتنە ناوگوند، لەدیوەخانەی (خدر ئاغا) دابەزین، بەلاّم چ دیوانخانەیەك، هۆدە خانوێکی پان وبەرین دوو کۆڵەگەی لە ناوەندێ دا بوون پڕ لە ڕایەخ ڕاخسترا بوو لەوێ پێیان ڕاگەیاندین کە

(خدر ئاغا)و خەڵکی گوند بەشی زۆریان بەدوای هاواری گوندی (سەکری سەکران)دا چووینە بەدوای ئەو تەقەیەی لەگەڵ ئێمە کرابوو لە گوندی ناوبراو، زۆری پێنە چوو خەڵکدکە گەڕانەوە ئەوەندەمان دیت کەسێکی چوار شانەی ڕەنگ پیاوانە بەژوور کەوت لە دیوانخانە بەڕوویکی دەم بەزەردەخەنەوە گوتی: (یاخوا ئەو میوانە خۆشەویستانە بەخێربێن سەر هەردوو چاوم)، لەگەڵ باوکمی چاك‌و خۆشی کرد ئەوجا بەخێرهاتنی لە ئێمەش کرد کاتی دانیشت گوتی: (خەبەریان پێداین نەشکری (مەلا شەرەف)یان بەسەر گوندی (سەکری سەکران)یان داداوەو شەڕە، ئێمە بەپەلە چووین کە گەیشتینە ئەوێ پێیان گوتین تەقەکە بەغەڵەت لەگەڵ چەکدارەکانی (سلێمان بەگی) دەرگەڵە بوو، هەرکە ئەوەم بیست زوو گەڕامەوە زانیم لا دەدەنە (ئێنێ) بەڵکو پێیان ڕابگەم‌و بیان بینم ئەگینا ئەو شەو نەدەگەڕامەوە. پرسی کامیان زرارە؟ (مام محمود) پێی گوت: (ئەوەیان زرارە) بەووردی سەیری کردم‌و گوتی: چەند ڕۆژ پێش ئێستا باش چاوەش مەلا حسن ئێمەی بانگی لای خۆی کرد لەڕایەت پێی گوتین: (کوڕی سلێمان بەگی دەرگەڵەی زرار ڕۆیشتوەو چەکی حکومەتی زۆر بردوە لەوانەیە بەوناوەیەدا تێ بپەڕێت بڕوات بۆ ئێران دەبێ ئێوە مختاری گوندەکان هەوڵبدەن بۆ گرتنی، ئەوەی بیگرێت پاداشتێکی زۆر باشی پێ دەدرێت).گوتی: (لە موختارەکان من بەدەنگ هاتم)و گوتم: (مەلا حسن خوات لێ ڕازی بێت ئەو زرارەی ئەوەندە چەکەی حوکمەت ببات توخوا بەئێمە دەگیرێت؟) ئەوەش بزانە کەسی باڵەك ناڕوات زرار بگرێت خۆی بکاتە دوژمنی بەگزادەکانی دەرگەڵە). لە دواییدا (مەلاحسن)گوتی: (بەئێمە ڕاگەیەندراوە پێتان بڵێین منیش دەزانم زرار بەئێمە ناگیرێت)، ئەوەی جێگای دڵخۆشیمان بوو کاتێکی خۆشمان لەگەڵ ئەو مرۆڤە دڵپاکە بردەسەر، لەدوای حەسانەوەیەکی تەواو لە (ئێنێ) دەرکەتین ئەگەر چی (خدرئاغا) زۆر هەوڵی دا لەوێ بمێنینەوە، بەڵام ماڵ ئاواییمان لە (خدر ئاغا)و ئەوانەی لەوێ بوون کردوو بەڕێکەوتین (خدرئاغا)دەستی لەناو دەستی (سلێمان بەگ) ناو گوتی: (سلێمان بەگ من ناترسێم لە غەمی من دامەبەئەگەر زۆر تەنگاو بووم دێم و ئەگەمەوە ئێوە، منیش ئەبمە سەربازی کوردستان).

لەوێ دەرکەوتین بەسەر کەویە بەفرەکانی قەندیل دا ڕۆیشتین بەدرێژایی شەو ڕێگامان بڕی بەیانی پێش ئەوەی ڕوناك دابێت گەیشتینە بەرامبەر (حاجی

ئۆمەران) لەسەر سنور سەربازەکانی عێراقی ئێمەیان دیت،لەوێوەوە بەمەترەلۆزی (فیکەرس) تەقەیان لیکردین کەمێك وەستاین گوتمان بەڵکودێن بەلاّم لەشوێنی خۆیان جوڵەیان نەکرد. کە زانیمان نایێن لەسنور ئاودیوو بوین، ئەوەی ڕاستی بێت لەو پەڕی هیلاکی‌وماندووبون دابوین لە بەرزاییەکە سەرەو ژێر ڕۆیشتینە خوارەوەو تا گەیشتینە گوندی (تەمەر چیان) لەماڵی (سەید مصلح) میوان بوین، ناوبراو لەماڵ نەبور، بەلاّم ئەوەی جێگای دڵخۆشیمان بوو زیاد لە پێویست خزمەتیان کردین، لەویّ ماینەوە تا ڕۆژی دوایی هەر نوستین تەنیا بۆ خواردن هەڵدەستاین، ڕۆژی دووەم کات ژمێر دەوری نۆ لە (تەمەر چیان) دەرکەوتین بەرەو (خانیّ)، کاتێك گەیشتینە بارەگای سەربازەکانی کوردستان پێشوازیەکی زۆر گەرمیان لێکردین، خۆشترین کاتم ئەو کاتە بوو. لەو کاتەی باوەشم لەسەربازی کورد دەگرت‌و ئەمدیت ئالاّی شانازی‌و سەربەرزی کۆماری کوردستان ئەلەرایەوەو لەژێری وەستا بووم فرمێسکی شادیم دەرِشتەو لە خۆشیان ئەوەندەی دەمکرد قسەم پیّ نەدەکرا تا درەنگ... بۆ نیوەڕۆ لە بارەگای سەربازەکانی کوردستان ماینەوەو لەگەڵیان دواین بەشادی‌و خۆشی.



# بەشدار بوونم لەکۆماری مەهاباد

بەسەر بەرزیەوە پێمان نایە کوردستانی ئازاد لە دیوی ئێران، وەك بەڵێنم بەخۆم دابوو ببم بەسەربازێکی خۆبەختکەری سوپای ئازادی بەخشی کوردستان، ئەوا ڕاوەستاوم!

وەك لەسەرەوە هاتوە لەناوەراستی مانگی (٤/١٩٤٦) پێمان نایە زەوی ئازادکراو لەکوردستانی ئەودیوی (ئێران) لەخانە (پیرانشهر)، لەبارەگای سەربازەکانی سوپای ئازاد کراو لەکوردستان خۆمان ناساند بەلێپرسراوی سەر سنور، ئەفسەرێکی سوپای ئازادی بەخشی کوردستان (سەید محمد)، ئەوەی جێگای لێدوانە ناوبراو پێشوازیەکی زۆر گەرمیان لێ کردین‌و زۆر بەڕێزەوە وەریان گرتین، میواندارییەکی کوردەواریان بۆ سازکردین...

ئەوەی دەمەوێت ڕای بگەیێنم ئەوەیە خۆشترین کاتی شادی‌و خۆشیم ئەو دەمەبوو ئەو کاتەی گەیشتینە (پیرانشەهر)و ڕۆیشتینە ژێر ئالای هەڵدراوی کوردستان لەسەر بارەگای سەربازەکان دەشەکایەوە.

بێگومان لەسەرەتاوە لەخۆشیاندا نەمتوانی بدوێم، لەدوایيدا توانیم ئەوەندە بڵێم وا ئەو ئاواتەی هەم بوو، ئەوەبوو ئالای کوردستان بەچاوی خۆم ببینم هەڵدرابێت، ئەوا ئەو ئاواتەشم بەدیهات، هیوادارم ئاواتی گشت ئاواتخوازەکانی کورد بێتەدی. هەر لەوێ بەڵێنم تازە کردەوە ببم بەسەربازێکی خۆبەخت کەری کوردستان بۆ پارێزگاری کۆماری دامەزراو لەمەهاباد.

لەبنکەی سەربازەکان ماینەوە تا دوای نیوەڕۆ، ئەوەندەی لایان بووین کاتێکی خۆشمان بردە سەر لەگەڵیان نیشانە(ئامانجانە) داندرا، لەئەنجامدا بەدیار کەوت چەك هەڵگرەکانی ئێمە توانای ئامانج شکاندنیان بەهێز بوو، زۆر جێگای ڕەزامەندیمان بوو. لەوکاتەی بەنیازبووین بەڕێ بکەوین، ئەفسەری بنکەی سەر سنور

دواو گوتی:(چەند ڕۆژە ئێمە ئاگادار کراوین کە ئێوە لەڕێگانو چاوەڕێتان بووین، ئەبێ بنێرین ماشێن بێت بتان بەن بۆ نەغەدە). باوکم وەلاّمی دایەوەو زۆر سوپاسی کردن بۆ ئەوپێشوازیەی کەلێمان کراوە، دەربارەی ماشێنیش گوتی:(ئێمە شەو دەڕۆینە (جەڵدیان) لای کاك (عولاّ ئاغا) بۆ بەیانیش دەڕۆینە نەغەدە، ئەوەبوو ماڵ ئاواییمان لەسەربازەکان کردو لە (پیرانشهر) دەرچووین، ڕێگای دۆڵی پیرانمان گرتە بەر بەپیادە، ڕێگاکە تەواو دوور بوو سەرەڕای ئەوەی دووریش بوو بەلاّم نەمان زانی بۆ ئەوەندە زوو گەیشتینە (جەڵدیان)! ئەبێ بڵێین خۆشی ئازادیو وەرزی بەهارو ڕازاوەیی دەوروبەری ڕێگا بەگیاو گوڵزاری جۆراو جۆرو شۆڕە شۆڕی ئاوی کەندو شیوەکان دڕری ڕێگایان لەبیر بردینەوە، دیمەنێکی بەهەشتی باس کراو دەکەوتە بەرچاو ئەوە ئەوە دەگەیێنێ کەوا ئازادی ئاواتی هەموو نیشتمان پەروەرێکی کوردە ئێمەش لەکوردستانێکی ئازاد دەڕۆیشتینو ئەو ڕێگە درێژە لە پێش چاومان کورت ببوەوە، ڕێگای دۆڵی پیران تەواو بوو گەیشتینە نزیك (جەڵدیان) لە خواروی گوند دیار بوو کۆمەڵێك مرۆڤ وەستا بوون کاتێ لێیان نزیك کەوتینەوە کاك (عولاّئاغا) لەگەڵ هەندێ پیاو هاتبونە پێشوازیمان، لە دوای بەیەك گەیشتن (سلێمان بەگو عولاّئاغا) لەپێشەوە بەیەکەوە دەڕۆیشتن بەرەو گوند، کاتێ گەیشتینە دیوانی ئاغا (سلێمان بەگو عولاّئاغا) ڕۆیشتنە ژوری تایبەت بەئاغا ئێمەش گشتمان لە ژورێك دانیشتین کە پێی دەوترێت پاش خانە، ئەوەی دیار بوو دیواخانەکە دووبەش بوو، لایەك تایبەت بوو بەئاغا لایەکەی تریش ئەوەی پێی دەوترا پاش خانە بۆ میوان بوو، ئێمە لە پاشخانە پاڵمان دایەوەو زۆر درەنگ خواردن هات لەکاتی خواردن بۆ ئاغا چوو یەکێك لە خزمەت کارەکانی ئاغا هاتو پرسی: کێیە کوڕی (سلیمان ئاغا) بابڕواتە لای باوکی بۆ نان خواردن، ئیسماعیل گوتی: (کوڕی ئاغا مان لەگەڵ نیە من بڕۆم؟!) پیاوەکە سەرسام بوو گەڕاوەوە پێیانی گوت کوڕی ئاغایان لەگەڵ نیە!!. ئێمە سێ برا کوڕانی (سلێمان بەگ) لەگەڵ بووین (منو عزتو شەوقی) نەمان ویست لەو چەکدارانەی لەگەڵمان بوون جیا ببینەوە، ئەو شەوەمان زۆر بەخۆشی بردە سەر، بەیانی زوو لەگەڵ (ئیسماعیل) ڕۆیشتینە سەرکانیاوی گوندی بینیمان کۆمەڵێك لاوی گوند بەرەو (شنۆ) دەڕۆیشتن بەگوتنی سرودی (ئەی ڕەقیب) تا ئاوا بوون سەیرم کردن. لە دوای چێشت خواردن لە (جەڵدیان) دەرچوین بەرەو (نەغەدە)

کەوتینە ڕێ ئەوەی مایەی هەردەم لەیاد بوونە ڕێ ڕۆیشتنێکی لە ئەندازە بەدەر خۆش و دڵگیر بوو، ئەو کاتە تەواو هەستم بەئازادیو هەناسە کێشانی بەختەوەری دەکرد، هەست دەکرا گۆڕانێك لە ژیانی مرۆڤ بەدی هاتووە. بەدۆڵی (قارنێ) دا ڕۆیشتینە خوارو لە گوندی (قارنێ)کەمێك وەستاین، لەدواییدا ڕۆیشتین لە گەروەکە بەسەرکەوتین لەوێ دوو سوار کە دوو چەکداریان لەگەڵ بوو یەکێك لە سوارەکان ئێمەی ڕاگرت و پرسی: (ئێوە لە کوێ هاتوون؟) لەوەڵامدا گوتمان: (لە کوردستانی عێراق هاتوین، ئینجا پیاوەکە گوتی: (ئێوە چەکدارەکانی سلێمان بەگی دەرگەڵن؟) گوتمان بەڵێ. لەو سوارانە یەکێك لەگەڵ ئێمە ئەدوا ئەوەی تر دوور کەوتبوەوە و لەدوورەوە سەیری ئێمەی دەکرد، ڕانك و چۆغەیکی سپی لە بەر دابوو. باوکم هاتو تێپەڕی ئێمەش ئەوانمان بەجێ هێشت، پاش ماوەیەك زانیمان ئەو دوو سوارەی گەیشتنە ئێمە یەکێك (سلێمان خانی کوڕی مام حسێنی) سێلوێ بوە، ئەوەی تریش مرۆڤێکی ئینگلیز بووە لەگەڵ (سلێمان خان) بوەو بەناوچەکەدا گەڕاونو کەس نەی ناسیوە.

کاتێك گەیشتینە نەغەدە لەوێ ڕۆیشتینە بەر دەرگای کۆمیتەی (حزبی دیموکراتی کوردستان) کۆمەڵە کەسێك وەستا بوون بەشی زۆریان لە کارمەندانی شار بوون لەگەڵ بەر پرسی نەغەدە (سەید ئەحمەدی سەید تەها) چاوەڕوانی گەیشتنی ئێمە بوون، لەگەڵ گەیشتنی ئێمە (سەید ئەحمەد) بەناوی خەڵکی شارو کارمەندو ئەنجومەنی نەغەدە بەخێر هاتنی کردینو هەندێك لەبارەی (سلێمان بەگ) دواو نیشانیدا (سلێمان بەگ) کێیە. لەدواییدا باوکم زۆر سوپاسی کردنو خۆشحاڵی خۆی نیشان دا بۆ ئەو پێشوازیە گەرمەی لێمان کراوە. ئەوەی جێگای ڕەزامەندی هەموو لایەك بوو یەکێك کە ناوی (کەریمی حسامی) بوو قسەی کردو گوتی: (زۆر پێویستە هەوڵبدرێت پەیوەندی فراوانو بەتین هەبێت لەگەڵ کوردە نیشتمان پەروەرەکانی سەرانسەری کوردستان بەگشتی بۆ بەشدار بونیان لەپاراستنی ئەو دەستکەوتە مەزنەی کورد بەدەستی هێناوە ئەویش کەکۆماری کوردستانە لەمەهاباد). بۆ سوپاسی ئەو پێشوازیە گەرمەو ئەو قسە بەنرخانەی مامۆستا (کەریمی حسام)می منیش کەوتمە قسە کردنو ڕێزم لەهەستی پێشوازی کەرانو مامۆستا (کەریمی حسامی) گرت بۆ ئەو هەستە بەرزو سۆزە پاکەی نیشانی دا

بەرامبەر ئێمە. منیش نیشانمدا کەوا هاتوین لەپێناو ئەو کۆمارەی کوردە گیان بەخت بکەین دڵسۆزی ئەوکۆمارە بین. لەسەر داوای(سەید ئەحمەد)بەرپرسی ناوچەی نەغەدە، ئێمە لەوێ ماینەوەو شوێنی جێ نشینیان بۆ دیار کردین لەناو شار، لە دوای چەند ڕۆژێك بڕیارێکی کۆماری هات وەدەڵێت: (لەسەر داوای سەدری نەغەدە سید ئەحمەد بەپێویست دەزاندرێت چەکدارەکانی سلێمان بەگ لە نەغەدە بمێننەوە بۆ پارێزگاری ئاسایشی ناوچەی نەغەدە، سلێمان بەگ بەرپرسی سەربازی بێت لەناوچەو زراریش بەپلەی ئەفسەری یەك ئەستێرە بۆ چاودێری ئاسایشی شار دەست بەکار بێت). بەگوێرەی ئەو بڕیارە کەوتینە کارکردن چەکدارەکان وەك سەرباز مەشقیان دەکرد ئێمەش دەست بەکار بوین، لەدوای ماوەیەك ڕۆژی بازار بوو، خەڵك دەڕۆیشتنە بازاری(مەحمەدیار) لە سەر پردی گادەر پیاوێك کەخەڵکی گوندەکانی لای گردۆڵکەکانی (حەیدەر ئاباد) بوو بەدیوی لای نەغەدە بەلای سەید ئەحمەد دا تێدەپەڕێو سلاوی لێ ناکات، (سەید ئەحمد)یش دەنێرێت بیگرن، پیاوەکەش دەڕوات پاسەوانەکانی (سەید ئەحمەد) بەدوای دەکەون بیگرن، ئەویش دەگەڕێتەوەو تەقەیان لێ دەکات دەڕوات شەو سەید ناردی بەدوامدا داوای لێکردم بڕۆم ئەم پیاوە بگرم، ئەگەر خۆشی نەدا بەدەست بیکوژم.

بەیانی زوو ڕۆیشتین کاتێك گەیشتینە گوند دیاربوو خەڵکەکە دەترسان کەئێمەیان دیت دە پازدە چەکداری کوردی عێراقی گەیشتنە ناو گوند ڕۆیشتینە دیوەخانی (سمایل ئاغا)، ناوبراو خۆی لەماڵ نەبوو لەگەڵ چەکدارەکانی ڕۆیشتبوە مەهاباد دیاربوو لەهێزی بەرگری بوو، دایکی هاتە دیوان بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمی لێکردین و خزمەتێکی زیاد لەپێویستی کردین، ئەو کەسەی ئێمە بەدوای دا چووبووین برای (سمایل ئاغا) بوو، ئەویش چووبوە مەهاباد، لەسەر داوای فەرماندەی هێزی بەرگری میللی سێ شەو لەوێ ماینەوە کاتێك (سمایل ئاغا) گەڕایەوە فەرمانی کۆماری پێ بوو کە دەست لەبرای ئەو نەدرێ بەبێ ئاگاداری فەرماندەی لەشکری مەهاباد، کاتێك ئەوەمان بیستو بڕیارەکەم بینی گەڕاینەوە لای (سید ئەحمەد)، ناوبراو زۆر پەست بوو گوتی: (چۆن گەڕاونەتەوە و هیچتان لەگەڵ ماڵی سمایل ئاغا نەکردوە؟) هەر ئەوکاتە بەنیاز بوو بمان نێرێت بچین ئەزیەتیان بدەین، بەلام دیتی ئێمە ئەوە ناکەین ئەوەی ئەو دەیویست کە بۆ زەبرو تێهەڵدانی خەڵکمان

بەکار بێنێ بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی. (سەید ئەحمەد) هەر لەوکاتەوە بۆی بەدیارکەوت ئێمە نابینە جەندرمەی ژێر فەرمانی ئەو، ناوبراو هەڵوێستی گۆڕاو پەشیمان بووەوە لەمانەوەی ئێمە لە نەغەدە، ئەو کەسە بەهەڵەدا چووبوو وای دانابوو ئەوەی بیەوێ بۆی دەکەین بەپێچەوانە دەرچوو، پاك ڕەوشتیو دڵسۆزیمان بۆ خەڵك ئاشکرابوو.

هەر چەندە ئێمە ماوەیەکی کورت لەنەغەدە ماینەوە، بەڵام بەشێوەیەکی ئاشکرا باوەڕی جەماوەری شار دیار کەوت چۆن ڕوویان لەئێمە کردبوو، ئەوڕووکردنەی خەڵکی شار (سەید ئەحمەد)ی ئاڵۆز کرد بوو دەیبینی ڕەوشتی ئێمە لەگەڵ خەڵك ڕەووشتێکی چاکەو خزمەت کردنی دیموکراتیەتە، خەڵکەکەش بەتەواوی هەستیان بەوە کردبوو کەئێمە پاسەوانی ئەوانو دڵسۆزی کۆماری کوردین، بەڵگەش ئەوەبوو ڕێگامان نەدەدا پیاوانی ناپاك و دەستدرێژیکەر کاری نا ڕەواو پڕو پوچ بکەن، ڕەوشتی ئێمە لەناو خەڵکی کوردو (قەرەپەپاغ) بوو بوە جێگای ڕێز گرتنێکی بەتین ئەو پەیوەندیەمان بەجەماوەر زۆر شتی بۆ ئاشکرا کردینو شتمان لێ زانین، ئەو پەیوەندیەی نێوان ئێمەو خەڵك (سەید ئەحمەدی) زۆر پەست کردبوو بەتایبەتی ئەو خەڵکەی لەدیوی عێراق دەهاتن، چونکە زۆربەی زۆریان دەهاتنە لای ئێمە، ئەوەی جێگای پەرۆشی بوو کردەوەکانی (سەید ئەحمەد) لەناوی ئەو نەدەوەشایەوە، ئەوەبوو باوکم داوای کرد لە نەغەدە بمان گوازنەوە بۆبەرەکانی ڕوو بەڕوی دوژمن، لەبەر ئەوەی هەڵوێستی (سەید ئەحمەد) ئەوە نییە ئەوەی خواستی ئێمە بوو، لەدواییدا ناچار بوو بەبێ ڕەزامەندی دەوڵەوت ڕۆیشتە مەهابادو نەگەڕایەوە نەغەدە، لە پاش ماوەیەك ناردی ئێمەش بڕۆینە مەهاباد، بەڵام فەرمانی وەزیری ناوەخۆ هاتبو، نەغەدە بەجێ نەهێڵینو لەوێ بمێنینەوە تاکو ئەوان ئاگادارمان دەکەنەوە، ئەو نەچونەی ئێمە بۆ مەهاباد باوکمی پەستکرد. لە هاوینی (١٩٤٦) ڕۆژێك لە کۆمیتەی حزبی دیموکرات لە نەغەدە ئاگادار کراینەوە بەیانی کاتژمێر نۆ لە هۆڵی قوتابخانەی کچان ئامادەبین بۆ بەشدار بوون لەئاهەنگی قوتابیەکان، لەسەر داوای ناردراو بەیانی لەکاتی دیاری کراو ڕۆیشتمە قوتابخانەکە. لەکاتی دەست نیشان کراو ئاهەنگەکە دەستی پێکرد لەسەرەتادا بەڕێوەبەری قوتابخانەکە کورتە وتارێکی خوێندەوەو بەخێرهاتنی بەشدار بوانیکردو بەرنامەی ئاهەنگی خستەڕوو، دوا بەدوای

ئەمە هەندێ کەمو کوڕی دیارکردن ئەوەی لەماوەی خوێنددا هاتۆتە پێش، لە دواییدا بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچان کورتە وتارێکی خوێندەوە لە قسەکانیدا زۆر بەگەرمی دەی گوت: (دەبێ سالّی داهاتوو هەموو کەم وکوڕیەکان چارەسەر بکرێن بەهاوکاری هەموو لایەك)، ئینجا چەند سرودێك لەلایەن قوتابیانی قوتابخانەکە پێشکەش کران سرودەکانو شێوەی وتنیان ئەوەندە بەسۆز بوون ئەوەی گوێی لێ بوایە کوڵی خۆشی دەکەوتە دڵەوە. لەدوای کۆتایی هاتنی ئاهەنگ ڕۆیشتمەوەو کەوتمە بیر کردنەوە دەربارەی ئەو مامۆستایەی کچ، لەو دەمەدا (عەلی ڕەووکەوان) کە خەڵکی نەغەدە بوو هاتووچۆی ئێمەی دەکرد پەیدا بوو، ناو براو پۆستەچی بوو، بەهەڵم زانی لەو پیاوە بپرسم بەم شێوەیە: (عەلی گیان کارێکم هەیە تەنیا دەبێ لەنێوان خۆم و خۆت دابێت پێم بڵێ ئەومامۆستا کچەی بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچانە، کچی کێ یە؟) عەلی گوتی: (کچی وەستا ڕەحمانی بەرگدرووە لەئەسلاّ سابلاّغین، بەلاّم لەمێژە لەنەغەدەن ماڵێکی زۆر باشن). گوتم: (مێردی کردوە یان نا؟ خۆ بەدەستگیران نیە؟) گوتی: (نەخێر مێردی نەکردوەو بەدەستگیرانیش نیە بەتەمەن بچوکەو تازە خوێندنی تەواو کردوە، زۆر کەس داوای کردووە ڕازی نەبووە مێرد بکات. سەیرێکی منی کردو گوتی: (دەڵێی دڵت بۆ ئەو کچە ڕۆیشتوە؟) هەر بەخۆشی گوتی: (نامەیەك بنوسە بۆی دەبەم داوای وەلاّمیشی لێ دەکەم). منیش گوتم: (ئەم ئێوارەیە سەرم لێ بدەوە لەگەڵت دەدوێم و باسێکی لێ دەکەین)، ئەوەی شایانی باسە بەڵێنەکەی عەلی دڵخۆشی کردم، دەستم دایە پێنوسو نامەیەکی ڕازاوەم بۆ نووسی، ئێوارە عەلی هات نامەکەم داپێ بۆی ببات لەو کاتەوە دوو ڕۆژ چاوەڕوانی وەلاّمەکە بووم، کەوەلاّمەکەم بۆ هاتەوە بەشێوەیەکی زۆر جوانو پەسند بوو، نووسی بووی: (بەڕێز (ز) نامەکەت گەیشتە دەستم ئەوەی تێیدا نوسرا بوو باش لێی تێگەیشتم، لە نامەکەت بەدیار دەکەوێت بۆ ژن هێنان ئەوەندە ڕێیەتان بڕیوەو خۆتان ماندوو کردوە نەك بۆ خزمەتی کۆماری کوردستان. تکایە بەوەلاّمی نامەم دڵتەنگو نیگەران نەبیت هێشتا زووە بۆ ژن هێنان).

ئەو وەلاّمە ڕێگای لێ بڕیم ئەگەر چی هەردەم دەهاتە بەر چاوم زۆر هەوڵم دەدا لە بیر خۆمی بەرمەوە بەدەست خۆم نەبوو لەیادم دەر نەدەکەوت، هەر بۆ ئەوەی لە یادم بچێت زۆر جاران دوای نیوەڕۆ دەڕۆیشتمە سەر گۆماوی (حەسەن لیان) کە دەکەوێتە

دەشتی (سندوس) بۆ ڕاوکردنی باڵندە ئاویەکان، بەڕێکەوت ڕۆژێك چوینە بناری گردەکان بۆ ڕاوی (جرك) ئێوارە درەنگ لە نزیك پردی (گادەر) لە دورەوە ژنێك‌و منداڵێك دیار بوون دەڕۆیشتنەوە بەرەو شار، ڕۆژیش تاریك دا کەوتبوو، پێش ئەوەی بیانگەینێ بەشوفێرم گوت: (ئەوانە هەڵگرە ڕۆژ درەنگە). هەڵمان گرتن و نەمان زانی کێن لە دوای چەند ڕۆژێك (سەید ئەحمەد) بەمن دەڵێت: (زرار بۆ تۆ باش نیە تۆ ئەفسەرێکی کارگێری ئاسایشی‌و ناسراوی، ژنی خراپ لەگەڵ خۆتان دەبەن بەسەر خۆشی مەلەی لەگەڵ دەکەن!)، (سەید ئەحمەد) بەتەواوی قسەکانی تەواو نەکرد پێم گوت: (جەناب ئەوە هەڵبەستی خۆتەو باش دەزانی من عەرەق خۆر نیم بەڵکو نازانم تامی عەرەقیش چۆنە، من نیم هەموو ڕۆژ لە ورمێ بەسەرخۆشی دەگەڕێمەوەو دایکم پێم بڵێت بریا کوڕی ئەو باوکە نەبایت! ڕازی نابم جارێکی تریش ئەو جۆرە قسانە بەمن بڵێیت، ڕاستە کەئەڵێن لە دز وایە هەموو خەڵك دزە، وابزانم جەماوەر ئێستا باش دەمانناسێ). ناوبراو دیتی من زۆر پەست بووم ویستی بەشێوەیەکی تر بدوێت، بەڵام ڕێگام نەداو گوتم: (جەناب خۆت داوات کرد ئێمە لێرە بێنینەوە ئێستاش پەشیمانی! وات دەزانی ئەوەی بفەرموی بۆت دەکەین، نەخێر!) ئەوەی بەدیار کەوت کارەکانی (سید ئەحمەد) دوورن لەخزمەتی کۆمەڵ بەڵکو هەوڵدانی ئەو پیاوە پاڵدانی خەڵك بوو بۆ دوور کەوتنەوەی جەماوەر لەدەسەلاتی کۆماری دیموکراتی کوردستان، بۆیە کاروکرداری (سەید ئەحمەد) جێگای گومان بوون.

ڕەوشتی چونەدەر: بەهاران ڕەوشتی کوردەواری وابوو لەشارو شارۆچکەکان بەناوی (قەرە چوارشەم) زۆربەی زۆری خەڵك لەشار دەردەکەوتن بۆ سەیران، ئەم ڕەوشتە ڕەوشتێکی باوە لە هەفتەی ڕۆژێك دەچونە دەرەوەی شار، ڕۆژێك ئەوەندەمان زانی سەر لەبەیانی خەڵکی شاری نەغەدە تێکڕا بەرێگای (بالخچی) دا کەوتنە ڕێ بۆ سەر چاکی (سوڵتان بابە یەعقوب) چاکەکە دەکەوێتە ناو گردۆڵکەکانی نزیك گوندی (بالخچی) سەیری ڕێگات بکردایە پڕ بوو لە خەڵك زەردو سورو سەوزو تێکەڵاو دەڕۆیشتنە سەیران، بەدرەنگەوە ئێمە بەرەو شوێنەکە ڕۆیشتین ئەگەر چی کەسی خۆمانی لێ نەبوو تەنها بۆ دیتنی جوانی سروشتی کوردستان‌و شایی‌و هەڵپەرکێ چوین. لەدورەوە دەنگی دۆڵ‌و زورنا دەهات کاتێ گەیشتینە ئەوێ بینیمان ڕەشبەڵەك بوو، دەنگی دۆڵ‌و زورنا خەڵکی ڕادەکێشا بۆ لای خۆی ئێمەش لەگەڵ ئەو

پێشمەرگانەی لەگەڵم بوون نزیك کەوتینەوە شاییەکی زۆر خۆش دەگەڕا لەسەر داوای (خدر زینوەیی) کە کەسێکی باوەڕ پێکراوو دڵسۆز بوو ڕۆیشتمە شایی کاتێك ئەوەندەم زانی ئەو کچەی نامەم بۆ ناردبوو هاتە دەستم، بەلامەوە شتێکی زۆر سەیر بوو! لەدوای وەستانی شایی ئێمە ڕۆیشتینە شوێنێکی بەلاوە لە ناو گیای بەهار دانیشتین زۆری پێ نەچوو وەستا (رحمان)ی باوکی کچەکە هات، داوای کرد بڕۆینە لای ئەوان بۆ نانخواردن پێم گوت: (بەڵێنم بەمیرزا محمد داوە) کەچی هەر وازی نەهێناو ڕۆیشت میرزا محمدیشی هێنا، لەگەڵ وەستا ڕەحمان ڕۆیشتین، زیاد لەپێویست ڕێزیان گرتین‌و زۆر بەگەرمی لەگەڵ (خدر) دەدوان وام هەسەت دەکرد کە ئاڵوگۆڕێك هەیە لەهەڵوێستی کچەکە. ڕۆژێکی خۆشمان بەسەربرد ئێوارەش لەگەڕانەوە ئەو خەڵکە کەوتبوە ڕێ بەبەزم‌و چەپڵە لێدان‌و گۆرانی گوتن‌و سوار سوارانێ لەنزیك نەغەدە (میرزا محمد)ی برادەرم لەسەر پشتی ئەسپ پەڕی زۆر خراپ کەوت لەمردن ڕزگاری بوو، زۆری نەمابوو ئەو خۆشییەی دیبومان لێمان بکات بەتازی، لەدوای ئەو نزیك بونەوەیە بەڕێگای ئاڵوگۆڕی نامە کچەکە ڕازی بوو داخواز بکرێت بەو مەرجەی کە گواستنەوەی دوا بخرێت، بێگومان منیش بەوە ڕازی بووم.

## لەنەغەدە ڕۆیشتم بۆ سابلاغ (مەهاباد)

ئەوەی دیار بوو ڕۆژ بەڕۆژ کارو کردەوەکانی (سەید ئەحمەد) ڕوو لەناپەسندی بوو، شەوان خەڵکی دارکاری دەکردوئەزیەتی دەدان، ڕەشوەشی وەردەگرت، لەسایەی دیموکراتیەت ڕاوو ڕوتیش باسی ناکرێت،ئەو هەڵوێستەی ناوبراو وای لێکردم لە نەغەدە نەمێنم ناچار ڕۆیشتمە مەهاباد بۆ ئەوەی بتوانم چارەیەك بدۆزمەوەو لەو بەدکارینە دووربکەومەوە. کاتێك گەیشتمە سابلاغ لەشوێنی باوکم پرسی. گوتیان لە بارەگای هێزی بارزانیەکان بپرسە،کاتێك دۆزیمەوە لە شوێنی خۆی نەبوو ناچار چومە ئەو چایەخانەی ئەوانی لێ دادەنیشتن هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە هەڵوێستی باوکم بەم شێوەیە بێت، بەجۆرە لەچایخانەکە بجولێتەوەو هەوڵی ئەوە بدات لەپێش خەڵك لێم بدات، بێگومان ئەو هەوڵەی ئەو وای لێکردم بەناچاری پێی بڵێم: (بڕۆ دانیشە ڕێزی خۆت مەشکێنە با هەر ئەوەندە بێت بەسە). هەر ئەوکاتە ڕۆیشتمە

سەربازخانە (مستەفا خۆشناو) لەوێ بوو، ئەو منی نەدەناسی خۆشبەختانە (رەئیس عزەت) لەوێ بوو سەربردەکەی (سیدئەحمەد)م پێ راگەیاندن‌و گوتیان لێرە بمێنەوە بەشداری بکە لەدەورەی سوپا ئەم ماوەیە، ئەوە بوو زیاتر لە مانگ‌و نیوێك لەوێ مامەوە، بەلاّم تابلێی پەست‌و دلشکاوو نیگەران بووم. بەو دلتەنگی‌و ئالۆزیەم رۆژی دووەم رۆیشتمە بارەگای هێزی گشتی بارزانیەکان، سەرلە بەیانی دیار بوو خەلکێکی زۆر لەبارزانیەکان لەهۆلێکی گەورە دانیشتبون‌و چاوەروانی هاتنی (مەلامستەفا) یان دەکرد لەناو ئەو خەلکەدا (مامەند شێروانی)یش دانیشتبوو، ناوبراو زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی لێ کردم‌و پرسی: (ئەوە چی بوو باوکت دوێنێ بۆچی بەو شێوەیە لەگەلت تێك چوو؟) بەوردی بەسەرهاتەکەم بۆ گێرایەوە کە چۆن هەموو رۆژێ دەینارد وەرن بۆ مەهاباد وای دەزانی ئێمە هەر لەدەرگەلەین‌و خۆی فەرمان رەوایە بیری ئەوەی نەدەکردەوە کە ئێمە لەژێر فەرمانی دەولەت داین چۆن بەبێ پرسی ئەوان شوێنی کار بەجێ بهێلین، دوێنێ هاتووم رۆیشتمەلای لە چایخانە خۆی دەپچریەوە دەی گوت لێم گەرێن با بیکوژم. ئاخر لەسەر چی دەمکوژی؟ منیش ناچار پێم گوت: (برۆ دانیشە رێزی خۆت مەشکێنە با هەر ئەوەندە بێت بەسە). مامەند گوتی: (قەیدی ناکات باوکتە نابێ لێی بگریت)، ئێمە لەو باسە دابووین ئەوانەی دانیشتبوون تێکرا هەستانە سەر پێ‌و گوتیان(مەلامستەفا) هات، ئەوەندەم دیت یەکێك لەپاسەوانەکانی بەژوورکەوت کە پیاوێکی چوست‌و چالاك‌و بالاّبەرز بوو سلاّوی کردو لە دوای ئەویش (مەلامستەفا) هاتە ژوورەوەو سلاّوی کرد پێش ئەوەی دابنیشێن مامەند پێی گوت: (ئەز بەنی ئەوە زرارە) منیش رۆیشتمە پێشی‌و دەستی خستە ناو دەستم بەزەردەخەنەوە روی کردە مامەندو گوتی: (توخودێ مامەند ئەوەی زراری نەدیبێت‌و ببینێت باوەر دەکات ئەو زرارەیە ئەوەی ئەوەندە چەکەی هێناوە، خۆ زۆریش بچوکە) دەستی بەردام و چووم لەشوێنی خۆم دانیشتم. مامەند گەرایەوەو گوتی: (دوینێ سلێمان بەگ عادزی کردوەو زۆر نیگەران‌و ئالۆزە). (مەلامستەفا) بانگی (فقێ حەسەنی میرۆ)ی کرد، ناوبراو باوەر پێکراوی خۆی بوو پێی گوت: (بەسلێمان بەگ بلێ رازی نابم زراری عادز بکات با لێرە میرایەتی بەکار نەهێنێ). مەلا مستەفا خەریك بوو لەگەل دانیشتوانی ناو هۆلەکە دەدوا (فقێ حسن) هات لە تەنیشتم دانیشت سەربردەکەم بۆ باس کرد ناوبراو گوتی: (ئەوە بەمن گەیشت

هیچ غەمت نەبێت هەر کارێکت هەبوو بەمن بڵێ دڵنیابە جێبەجێ دەبێت).
مەلامستەفا دەرکەوت‌و مامەند گوتی: (خۆت بزر مەکە دەچینەوە ماڵی ئێمە، ئەوەبوو لەگەڵ ناوبراو ڕۆیشتینە ناو شار، دوایی چوینەوە ماڵی ئەوان، ئەویش تازە لە سەقز هاتبوەوە، شەو کۆمەڵێك بارزانی هاتنە لای لەکاتی قسەکردن شەڕی (گۆڕە توو)م بۆ گێڕانەوە یەکێك لەوان کەناوی (محێ) بوو گوتی: (ڕاستە من بووم بەسەر ئۆتومبێل کەوتم دوو مەیتی لەناو دابوون ئاگرم تێ بەردا، بەڵام ئاگری نەگرت‌و جەماعەتمان ڕۆیشتن‌و منیش بەجێم هێشت.

مامەندو گەڕانەوەی مەلامستەفا بۆ بارزان ساڵی (١٩٤٣): ئەو شەوە مامەند بۆی گێڕاینەوە لەو کاتەی مەلامستەفا لەسلێمانی ڕای کردبوو لەنزیك نەغەدە چوبوە ماڵیان مامەند گوتی: (ئێوارەیەك درەنگ بوو هاتمەوە ماڵ مرۆڤێك میوانمانە، منیش بەخێرهاتنم لێکردوو چووم تفەنگم دابنێم پیرۆزی خێزانم بەپەلە هات‌و گوتی: (کو مامەند ئەتو ئەو مرۆڤە ناس نەکر؟) منیش گوتم: (نەوەڵڵا پیرۆز)، ئەوجا گوتی: (ماڵ میراتۆ ئەوە مەلامستەفایە کو نەناسی!) بەپەلە ڕۆیشتمەوە لایو بەگەرمی بەخێرهاتنم لێ کردو داوای لێ بوردنم لێ کرد کە نەم ناسیەوە، زۆر هیلاك بوو چەند ڕۆژ بەپێیان ڕۆیشتبوو، پێی ببوون بەپۆرگ، پیرۆز خەنەی بۆ گرتەوە لە پێیانی نا دوو شەو لەماڵمان مایەوە تاوەکو توانی بڕوات، کاتێك ئامادەبووین بڕۆین چوار پێنج چەکداری لەگەڵ ڕۆیشتن بەرەو عێراق، شەوێك لەلای کاك (مامەندی کولیچ) ماینەوە تەنیا ئەو دەیزانی ئەوە (مەلامستەفا)یە لەوێ ڕۆیشتین بەناو هۆزی برادۆست دا تێپەڕین بۆ ناوچەی بارزان لەوێش گەڕاین هەندێ چەکدارمان گەیشتنێ، چەك کەم بوو حکومەت هێزێکی پۆلیسی گەڕۆکی بەرێ کردبوو بۆ گرتنی (مەلامستەفا) لە (خوێریزۆك) توشیان بووین لێمان دان‌و ئەوەی نەکوژرا گیرا لەوێ باش بوو کۆمەڵە چەکێکی باشمان دەست کەوت.

ئەو شەوە لەماڵی مامەند مامەوە بەیانی زوو ڕۆیشتمەوە سەربازخانە، شەو چوومە لای (مستەفا خۆشناو) ناوبراو زۆر قسەی کردن ڕون کردنەوەی هەبوو دەربارەی خزمەتی کوردو کۆماری کوردستان، کۆمەڵێك ئامۆژگاری پێ ڕاگەیاندم کە سوود بەخش بوو. منیش دەربارەی کارەکانی نەغەدە ڕاپۆرتێکم دابوە وەزارەتی ناوەخۆ، لەڕاپۆرتەکە نوسرابوو کەوامن لەوە زیاتر توانام نییە لەگەڵ (سید ئەحمەد)

کار بکەم لەبەر ئەوەی کردارەکانی ئەو لێپرسراوە دورن لەخزمەتی گەلو کۆماری دیموکراتی کوردستان، کۆمەڵێك بەڵگەش خرابوونە ڕوو.

بۆ بەیانی نامەیەکی (مستەفا خۆشناو)م بۆ یەکێك بەناوی (سعیدزادە) برد لەکۆمیتەی ناوەندی حزبی دیموکراتی کوردستان، ناو براو بانگی کردم گوتی: (لەسەر ڕاسپاردەی مستەفا خۆشناو تۆ برۆ لەدەورەی ئەفسەری بەشداری بکە، مەگەڕێوە بۆ نەغەدە، ئێمە بۆیان دەنوسین زرار ناگەڕێتەوە)، کاتێك گەڕامەوە لای مستەفا خۆشناو ڕەئیس عزەتیش لای ئەو بوو، عزت گوتی: (چەکدارەکانمان هەندێك ناردون بۆ بەرەی سەقز، بۆ ناو لەشکر هەندێکیشمان ناردونەتە تەورێز بۆ دەورەی تۆپ، باوکت دەڕواتە قادراوا لە نزیك سەقز)، منیش لە دەورە مامەوە لە سەرباز خانەی سابلاغ، بەلاّم لە دوای چەند ڕۆژ نەخۆش کەوتمو لەمەشق دوا کەوتم.

## بەیەك گەیشتنەوە لەگەڵ محمد قودسی

بەرێکەوت ئێوارەیەك ڕۆیشتمە باغی (سیسە) کاتێك سەیرم کرد کەپیتان(محمد قودسی) لەگەڵ هەندێ برادەری بەبەرگی سەربازی لەوێ بوون، ڕۆیشتمە لای چاكو چۆنیم لێکردن لەسەرەتاوە نەی ناسیمەوە لەبەر ئەوەی منیش بەجلی سەربازی بووم پێم گوت: (من زرارم جارێکی تر دەستی خستەوە ناو دەستمو بەبرادەرەکانی ناساندمو گوتی: (ئەوە ئەو لاوەیە کەلە ڕیزی سوپای عێراق ڕای کردوەو کۆمەڵێك چەکی هێناوەو ئێستا لە ڕیزی سوپای کوردستان ئەفسەرە). دوایی پرسی بیستم لە سەر نامەی من ئەزیەت درابوی؟ منیش گوتم: (بەڵێ دەیان گوت دەبێ پێمان بڵێی ئەو نامەیەی ئەفسەری تەجنید ملازم محمد دای بەتۆ بۆ کام ئەفسەرت برد لە مێرگەسۆر؟) منیش پێم گوتن: (نامەکەم دایە مراسیلی شێخ معروف کەناوی بنیامین بوو)، دەیان پرسی نەتزانی چی تێدا نوسرابوو؟ منیش گوتم: (بەچی بزانم نامەکە داخرا بوو ئەمانەتیش دەستی لێ نادرێت).

ئەوەی جێگای شادیم بوو کاتێکی خۆشم لەگەڵیان بردە سەر لەکاتی خواحافیزیم ناوبراو داوای لێکردم لە دوای کۆتایی دەورە بڕۆمەلای ئەو لە بەڕێوەبەرایەتی لاوانی

کوردستان لەگەڵی کار بکەم، بەلاّم بەڵێنم پێ نەدا گوتم: (با دەورەمان تەواو بێت ئەوکاتە ئاگادارت دەکەمەوە).

**باسێکی دڵتەزێن:** لەو کاتەی لە دەورە بووم لەسەربازخانە لە ڕۆژی پشوودا چووبوین بۆ ناو باخچەکان لەو بەری مەهاباد لەپڕێکا ئاگادار کراینەوە کە سەربازەکان بەپەلە بگەڕێنەوە سەربازخانە ئەوەبوو دەنگی شەهید بوونی (نانەوازادە) ڕاگەیەندرا، هەموومان ڕۆیشتینە ئەو مزگەوتەی تەرمی شەهیدی لێ بوو، بەلاّم ئەوەندە خەڵك هاتبوە مزگەوت‌و دەوەرو بەری مزگەوت جێگای سەرسوڕمان بوو هەر بەم شێوەیەش کە تەرمی شەهید بردرا بۆ گۆڕستان ئەو جەماوەرە زۆرە لەگەڵ تەرمەکە ڕۆیشتن، بەپێی نیزامی سەربازی لەکاتی ناشتنی ئەو ڕۆڵە بلیمەتەی ڕێگای ئازادی کوردستان سەربازەکانی کۆماری تەقەیان کرد. لە کاتی لە سەربازخانە بووم دووجار نەخۆش کەوتم، بەلاّم جاری دووەم نەخۆشیەکەم درێژەی کێشا نزیکەی دە ڕۆژ، خۆشبەختانە لەوکاتەدا (ئەحمەدی خانە بەگی کەلێتەیی) ناسراو بەڕیش سپی گەیشتە لام، ئەگەر ئەو پیاوە دڵسۆزەم نەگەیشتبایێ توشی نەمان دەبووم، ئەوەندەی ئەو خزمەتی کردم ئەگەر برای خۆم لابوایە نەیدەتوانی بەم شێوەیە خزمەتم بکات. لەوکاتەی کە زۆر هیلاك‌و نەخۆش بووم برادەران دەهاتن بۆ سەردانم لەوانە(محمدی ماملێ‌و علی یاوەر)و زۆر لەبرادەرانی تریش هەر جارەی محمدی ماملێ دەهاتە لام، گۆرانی بۆ دەگوتم، بۆ ئەوەی کەمێك دڵم بکرێتەوەو بەڵکو لە ئێش‌و ئازار دوور بکەومەوە، قسەی زۆر خۆشیشی بۆ دەکردم، ڕۆژێك (علی یاوەرو محمدی ماملێ) منیان بردە لای دکتۆرێك، ئەو دکتۆرە ئافرەتێکی عەرەبی ئەهواز بوو کەلە نەخۆشخانەی مەهاباد دەوامی دەکرد، دوای ئەوەی کەسەیری کردم گوتی: (نەخۆشی تۆ نەخۆشی غەم‌و پەژارەیە ئاگاداری خۆت بەئەوەندە بیر مەکەوەو ئەوەندەش غەم مەخۆ). تازە لە نەخۆشی هەستابومەوە نوسینگەی سوپایی (رئیس عزت عبدالعزیز) ئاگاداری کردینەوە بەیانی زوو ئامادە بین دەرۆینە پێشوازی پێشەوا، ئەوە بوو بەپێی ئاگاداریەکە لەکاتی دیاری کراو لەسەربازگە ئامادەبوین، لەوێ سواری ئۆتۆمبێل بوین بەرەو(میاندواو) ڕۆیشتین لە ڕێگا ئۆتۆمبێلەکانی (حەمەحوسێنی خاڵ‌و مەلامستەفا)ش گەیشتنەوە ئێمە، هەموومان بەیەکەوە ڕۆیشتین لە (میاندواو مەراغە)ش تێ پەڕین لە شوێنێك

وەستاین، شوێنەکە هەمووی باغو داری بەری بوو زۆر خۆش بوو لە نزیك شاری (نازەر شەهر) لەوێ پیاوەکان پەرتو بڵاوبوون، دووسێ پاسەوانی مەلامستەفا رۆیشتنە ناو یەکێ لەباخەکان، رئیس عزت پێی گوتن: (مەڕۆنە ناو باخچەکان عەیبە). یەکێك لە بارزانیەکان گەڕایەوەو زۆر بەبێ ڕێزی ڕووبەڕووی رئیس عزەت وەستاو قسەی ناڵێوەشاوەی پێگوت بێ ئەوەی بیر لە هیچ بکاتەوە، بێگومان ئەو مرۆڤە مەزنە زۆر نیگەران بو..

ئاگادار کراین کە(پێشەوا) لە تەورێز دەرکەوت، ئێمە لەسەر ڕێگا ڕیز بووین زۆری نەخایاند پێشەوا گەیشتە لامان (ڕەئیس عزەت) فەرمانی بەسەربازەکان داو رۆیشتە لای (پێشەوا) ئەویش لە ئۆتۆمبێل دابەزیو دەستی نایە ناو دەستی (ڕئیس عزەت)و دووبەدوو بۆ لای ئێمە هاتن (پێشەوا) سلاوی لێکردین لەو دەمەشدا (حمە حسێنو مەلامستەفا)و ئەوانەی لەگەڵیان بوون دەستی پێشەوایان گوشی پێشەوا بەمەلا مستەفای گوت: (نابوا ئەوەندە ئەزیەت بخۆن ئەو ڕێیە دوورەتان بڕیبا). لە دواییدا (پێشەواو مەلامستەفا بەئۆتۆمبێلی پێشەوا رۆیشتن، جێبێکی ئەفسەران لەپێشەوە دەڕۆیشت لەوێوە بەناو باغو باغاتدا گەڕاینەوە کاتێك گەیشتینە مێاندواو دیار بوو جەماوەرێکی زۆر لەسەر ڕێگا وەستابوون، پێشەوا دابەزیو بەناویاندا رۆشتو سلاوی لێکردن لەوێ دەستەی لاوانی چەکدار پاسەوانانی کارگەی شەکر لە سەر ڕێگا وەستا بوون سروودیان دەگوت. لە میاندواو دەرکەوتین بەرەو سابلاغ ئێوارە لە ڕاستی (قوونقەلا) گەیشتینە جەماوەری پێشوازیکەر دەستە دەستە وەستابوون تا ناو شاری سابلاغ سەربازو قوتابیو لاوانو تێکڕای خەڵکی شار هەر کۆمەڵێك دروشمی خۆیان هەلگرتبوو، دەبێ بڵێین لەو پێشوازیە تەواو هەست بەخۆشیو کامەرانی دەکرا کە چۆن ئەو خەڵکە تامەزرۆی ئازادی نیشتمانەکەیانن. لە دوای ئەوەی گەیشتینەوە ناو شار ئێمە گەڕاینەوە سەربازگەکەی خۆمان. ڕۆژی دووەم (خۆشناو) ناردی بەدوامدا رۆیشتمە لای پرسی: (ئەو حوسێنی خاڵ مەلایە ئەوەی ڕووبەڕووی ڕەئیس عزەت وەستاوە پیاوی باوکتە؟) گوتم: (ناوبراو بارزانیە بەند بوو لە بەندیخانەی عێراق دەیانویست بەری بدەن کەس نەدەبووە کەفیلی باوکم بەری داو لەگەڵ خۆیشی هێنای بۆ ئێرە ئێستا لەگەڵ بارزانیەکانەو نۆبەتداری بارەگایە). لەو کاتەشدا ڕئیس عزەت هاتە ژوورەوەو لەگەڵ خۆشناو دەرکەوتن، زۆری نەخایاند

گەڕانەوە محمد قودسیان لەگەڵ بوو، ویستم بڕۆم، عزت گوتی: (دانیشە مەڕۆ، لە قسەکردنیاندا بەدیارکەوت لە هەڵوێستی مەلامستەفا ناڕازی بوونو ناکۆکی هەبوو لە نێوان مەلامستەفاو ئەفسەرەکان...

لەو دەمانەدابوو (سەید ئەحمەد سەید تەها) خەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئاهەنگی بوك گواستنەوە بۆ خۆی بەو بۆنەیەوە مەلامستەفاش بانگ کرابوو، هەروەها ئەفسەرەکانی عێراقیش بانگ کرابوون، دیار بوو خەڵکێکی زۆر بانگ کرابوون، ڕۆژی یەکەمی ئاهەنگ کەسێك کەوتە ژێر ئۆتۆمبێلو مرد لەجیاتی وەستانی شایی، شایی گەرم ترو زوڕنا بەجۆش تر بوو، لە ئێوارەی ڕۆژی یەکەمی ئاهەنگ هەر ئەوەندە زاندرا چەند نۆبەتدارێکی مەلامستەفا زۆر بەئالۆزی لەماڵی (سید ئەحمەد) دەرکەوتن بەرەو کاریژ (گەراج) ڕۆیشتن لەو کاتەشدا مەلامستەفا لەلای (گولیزارخانمی دایکی سید ئەحمەد) دانیشتبوو،کاتێك نۆبەتدارەکان گەڕانەوە (ڕەئیس عزەتو محمد قودسی)یان هێنابون بردنیانن بۆ لای مەلامستەفا، ئەوەی جێگای نیگەرانی بوو محمدقودسیان زۆر دڵشکاو کردبوو، مەلامستەفاش زۆر بەتوندی لەگەڵ رئیس عزەت دوا. هەر ئەو کاتە عزەتو قودسی ڕۆیشتنە شنۆ بۆ بەیانی دیار بوو خەڵك بلاوەیان لێ کردو ئاهەنگەکە ساردی تێکەوت، بەڕێکەوت منیش لەگەڵ (جەعفەرئاغا)ی قونقەلای گەڕامەوە سابلاغ، جەعفەرئاغا یەکێك بوو لە سەرکردەکانی سوپای میللی کوردستان.

چەند ڕۆژێك دوای ئاهەنگی باس کراو ڕۆژێك (فقێ حەسەن میرۆ) کارگێڕی بەر دەستی مەلامستەفا، ناردی بەدوامدا، کاتی چومە لای گوتی: (ئێمە ڕۆیشتینە شنۆ کە گەڕاینەوە بۆ نەغەدە شەو ڕۆیشتمە ماڵی وەستا رحمانو کارەکەم جێبەجێ کرد زۆر بەئاسانی، جەنابی مەلامستەفا بەباوکتی گوت: ڕازی نابم جارێکی تر زرار بەم شێوەیە عادز بکەی). ئەو قسانەی (فەقێ حسن) کەمێك دڵی دامەوەو باری گرانی سەر شانمی سوك کرد بەدڵخۆشیەوە لە بارەگای بارزانیەکان دەرکەوتم، بەڕێکەوت لەگەڵ (ئیسماعیل عارف) بەیەك گەیشتین هەر زوو گوتی: (کافر ئەی کە دەڕۆیشتی بۆ بەمنیشت نەگوت لەگەڵ تۆ بێم؟)، (مەبەستی کاتی ڕاکردنەکەمە لە سوپای عێراقی) گوتم: (کاك ئیسماعیل من بەنیازی چەك بردن بووم دەترسام بەکەس بڵێم، دەڕۆم لە بەر ئەوە بەکەسم نەگوت دەڕۆم)، ناوبراو دیتی من بەبەرگی

ئەفسەریم بەلایەوە سەیر بوو، دیار بوو دەیویست بڕواتە لای جەنابی مەلامستەفا بۆیە بەپەلە ڕۆیشت.

پێش دەورەکە تەواو بێت داوام کردبوو لەگەڵ ئەو قوتابییانەی ناونوس کرابوون کە بۆ سۆڤیەت بنێردرێن بۆ خوێندنی سەربازی بنێردرێم، لەسەر داواکەی خۆم ئاگاداریان کردم بڕۆمە کۆمیتەی ناوەندی حزبی دیموکرات کاتژمێردەی بەیانی. ئەکاتی دیاریکراو ئامادە بووم لەوێ پێیان گوتم، دەڕۆیتە لای پێشەوا چاوەڕێ بووم ئەچ کاتێك بانگ دەکرێم، کاتێك بانگ کرام و ڕۆیشتمە ژوری دیاریکراو پێشەوا دەستی خستە ناو دەستمو زۆر بەخێرهاتنێکی گەرمی کردمو گوتی: (فەرموو دانیشە) کاتێك کەوتە قسەکردن دیار بوو دەربارەی من زانیاری تەوای لا هەبوو گوتی:(ئازیز داوات کردووە بنێردرێی بۆ خوێندن، بەلاّم لە خوێندن زیاتر ئێستا پێویستیمان بەئێوەو زۆری وەك ئێوە هەیە کە توانای ئەوەیان هەیە فەرماندەی سەربازە جەنگاوەرەکانی ڕووبەڕووی دوژمن بن، خۆ ئەوانەی دەنێردرێن بۆ خوێندنو دێنەوە ئەوەندەی ئێوە توانای کاروباری سەربازیان نیە، لەبەر ئەوە بەپێویستی دەزانین داوایەکەت دوا بخرێت بۆ داهاتوو). ئەوەی ڕاستی بێت کاتێ ئەو بلیمەتە دەدوا وەك ئەگەڵ یەکێك بدوێت کەلەبنەماڵەی خۆی بێت ئەوهام هەست دەکرد، بۆیە نەمتوانی پشتگیری لە داوایەکەم بکەم ناچار گوتم: (ئێوە چی بفەرمون سەربازی ژێر فەرمانتانم). بەم شێوەیە دەرکەوتمو گەڕامەوە سەربازخانە، چاوەڕێ بووم بۆ کوێم بەرێ دەکەن، هەر ئەو ئێواردیە رئیس عزەت ناردی بەدرامدا کاتێ ڕۆیشتمە لای ناوبراو پرسی: (ڕۆیشتیتە لای پێشەوا؟) گوتم: (بەڵێ چووم) ئەوەی لەسەرەوە نوسراوە بۆ رەئیس عزەتم بەوردی گێرایەوە، ناوبراو پێکەنیو گوتی: (پێشەوا ئەو هەستەی هەبووە کەلە نیازی ئێمەدا هەبور، باش بوو نەیناردی، کەوابێت بەیانی بڕۆ لای شێخ سلێمان داوای کردووە یەکێك بنێرین بڕواتە لایو جێگای باوەڕ بێت بۆ ئەوەی ئەو یارمەتیەی دیاریکراوە بۆ ئاوارەکانی بارزانی لە ناوچەی نەغەدە بەسەریاندا دابەش بکات، ئێمەش کەسی لەتۆ باشترمان دەست ناکەوێت بینێرین).

بەپێی ڕاسپاردە بەیانی ڕۆیشتمە لای (شێخ سلێمان بارزانی) نامەی عزەتم دایە دەستی لە دوای خوێندنەوەی دیار بوو پێی خۆش بوو زوو نوسراوێکی دایە دەستم بۆ لێپرسراوی ئازوقە لەمیاندواو گوتی: (بڕۆ لای خیراللە، ناوبراو ئوتۆمبێلت پێ دەدات

دەڕۆیتە میاندواوو لای عبدالرحمن مفتی ئەو ئەشیایەکانت پێ دەداتو لیستەکەشت دەداتێ کە چۆن دابەشی بکەیت، لەوێ باری دەکەیت بۆ نەغەدەی دەبەیت لەوێش بەسەر ئەوانەی دیارکراون دابەشی دەکەیت.

لەلای ئەو دەرکەوتم، ڕۆیشتمە کاریژ ئەوکاتە (خیراللە) لەوێ نەبوو گوتیان لەماڵی (وەهاب ئاغا)یە ناچار ڕۆیشتمە ماڵی ناوبراو،دیاربوو کۆمەڵێك ئەفسەرو خەڵکی تریشی لەوێ بوون هەموویان کوردی باشور بوون، ئەو کەسانە بوون کە لەگەڵ مەلامستەفا هاتبوونە کوردستانی ئازاد کراو، بێ گومان(وەهاب ئاغا) منی بەوان ناساندو گوتی: (ئەوە ئەو زرارەیە کەلەڕیزی سوپای عێراقی ڕای کردو چەکێکی زۆری هێنا). کاتێك ویستم بڕۆم وەهاب ئاغا گوتی: (نابێ بڕۆی لەگەڵ ئێمەنانی نیوەڕۆ دەخۆیت ئەوکاتەبڕۆ)، لەسەر داوای ئەو لەوێ مامەوە، لەقسەکانی ئەوان تەواو هەستم کرد ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان ناڕازی بوون بەشێوەیەکی تایبەتی دڵتەنگ بون بەلێدانی(محمد قودسی)و زۆریش عادز بوون بەدڵشکاندنی (ڕەئیس عزت)، ئەوە بوو بووە خالێکی ئالۆزو باسو ناکۆکی ئەو کۆمەڵە کەسە، کاتێك وەهاب ئاغا ڕوی لەمن کردو گوتی: (وشیار بەودك ئێمە نەکەویە دوای کلاوی با بردو...) لێرە لەمەرامی وەهاب ئاغا نەگەیشتم مەبەستی چییە.

ئەوەی ڕاستی بێت هەر لەسەرەتاوە لە قسەکانی (وەهاب ئاغا) نەگەیشتم کە مەبەستی چییە؟ لەدواییدا زانیم مەبەستی ئەوەبوو نەڕۆمە ڕیزی بارزانیەکان، ئەوان زۆر بەگەرمی لۆمەی هەڵوێستی ئەوانیان بەناڕێکی دەکردو وایان باس دەکرد کەنیازی چەوتو ناپاکە بەرامبەر بەکۆماری کوردستانو(قازی محمد).

بەپێی ڕێکەوت دوای نیوەڕۆ ڕۆیشتمە(میاندواو) لەوێ ئەوەی هەبوو وەرم گرت، شەومیوانی (حەسۆ میرخانی دۆڵەمەری) بووم، کاتێکی زۆر خۆشم لەگەڵی بردە سەر بەیانی گەڕامەوە نەغەدە، لەوێ دەستمان کرد بەدابەش کردنی کەڵو پەلەکان بەپێی پێویست، لەوکاتەی ئێمە خەریکی دابەش کردنی کەلو پەلەکان بووین ئەوەندەمان زانی نەغەدە پڕ بوو لە لەشکری هێزی کوردستان، ئەوکاتە (حمد ئاغای مێرگەسۆری) ناردی بەدوامدا ڕۆیشتمە لایو پرسی: (چەند کەسی چەکدارت لایە؟) گوتم: (چوار چەکدار ئەوانی تر بڵاو کراون) (حمد ئاغا) بەنهێنی گوتی: (چوار چەکدارەکانی خۆت لەگەڵ شەش بارزانی دەبەیت زۆر بەوەستایی دەڕۆیتە

گوندی (شاوەلێ) ئەگەر دیتت نیازیان خراپەو خەریکی جم وجۆڵن چەکیان بکەن، ئەگەر جم وجۆڵیشیان پێوە دیار نەبوو دەنگیان لەگەڵ مەکەن، لەوێش بمێننەوە تا ئاگادارتان دەکەینەوە). ئەوەبوو شەش بارزانی هاتن لەگەڵ چوار چەکدارەکانی خۆم بەو شەوە بەڕێکەوتین، لە نەغەدە شارەزامان لەگەڵ دا بوو. کاتێك لە (بالیخچی) تێپەڕبووین بەگردۆڵکەکاندا سەرکەوتین بەرەو (شاوەلێ) پێش گەزەنگی هەتاو گەیشتینە گوندی (شاوەلێ) لەدەرگای دیوانخانەی (مارف ئاغا)وەستاین داوامان کرد (ئاغا) بێتە دیوان زۆری پێنەچوو هەموویان هاتنە دیوەخانە بینیمان هیچیان پێوە دیار نەبوو کە جموجۆڵیان هەبێت، لەدوای چێشت خواردن پێمان گوتن ئەوەندە ڕۆژانە بەڕاست نازانین لە (شاوەلێ) دەربچن بەبێ ئاگاداری ئێمە، چونکە لەشکری کوردستان بەرێ کراوەتە دەوروبەری مامەش لەبەر ئەوەی (مام عایزی پەسوێ) یاخی بوە بزانین چی بەسەر دێت، پێم گوتن: (ئێوە خۆتان ئالۆز مەکەن، ئەوە پەیوەندی بەیاخی بوونی مام عایزەوە هەیە نەك بەئێوە، ئێمە نێردراوین ئێوە بپارێزین نەوەك لەشکری کوردستان ئێوەش بەیاخی بوو لەقەڵەم بدات). کاتێ ئەمەیان زانی منداڵەکانی مارف ئاغا گوتیان: (ئێمەسوێند خۆری حزبی دیموکراتو کۆماری کوردین چۆن لەدژی دەوەستین؟ ئامادەین چەکی بۆ هەڵگرین دژ بەیاخی بوان).

ئەوەی دیاربوو یاخی بوەکان نەیانتوانی لەپێش لەشکری کوردستان بوەستن، ڕۆژی دووەم دیتیان هێزێکی زۆر دەوریان داونو (مام عایزی قەرەنیاغا)ڕای کردو ڕۆیشتە عێراق بەبێ ئەوەی خۆی ڕابگرێت لەدوای ڕۆیشتنی ناوبراو هێزێکی چاودێری لە گوندی (پەسوێ) مایەوە، لەشکری هۆزەکانو سوپاش گەڕانەوە شوێنەکانیان ئەوی شایەنی باسە ئەوەندە ڕۆژانەی لە (شاوەلێ) بووین نەمان هێشت هیچ شتێك ڕوبدات بەشێوەی چاودێری نۆبەتداری گوندو خەڵکەکەی بووین بۆ ئەوەی کەس دەستیان بۆ درێژ نەکات، چونکە مەترسی هەبوو لەهێزی هۆزەکان، ئەگەر بۆیان بگونجایە دەست درێژیان دەکردە سەر خەڵکی بێ تاوان.

ئەوەبوو بەدڵ خۆشی گەڕاینەوە نەغەدە، دیاربوو هەموو سەرکردەکان، ئەوانەی نەمامەش گەڕابوونەوە لەماڵی (گولیزار خانم) دابەزیبوون،منیش چووم بۆ

ئەویێ بەشی زۆری ئەوانەی لەوێ بوون بەرپرسی ئەو چەکدارانە بوون کە ڕووبەڕوی یاخی بوەکان وەستا بوون.

(مەلامستەفاو زێرۆ بەگ)و سەرۆك هۆزەکان لەوێ بوون لەکاتی قسەکردندا مەلامستەفا گوتی: (مام عایز غەدری کرد دژی کۆمای کوردستان یاخی بوو، گوایا لە سەید ئەحمەدو هەندێ کارمەند ڕازی نییە، خۆ کۆمار هی سید ئەحمەدو کارمەندان نییە، کۆماری کوردەو ئەویش کوردە، دەبوایە قازی ڕێگا بەوە نەدات کار بەوە بگات). بەنیاز بووم برۆمە (میاندواو) لە نزیك کارێژ لەگەڵ (ئیسماعیل عارف) بەیەك گەیشتین لە دوای چاك‌و چۆنی پرسیم: (ئەو ڕۆژە مەلامستەفات دیت؟) گوتی: (نەخێر ئەو ماوەیە هاتوم دەمەوێت میرحاج ببینم نەم توانیوەو دەستم ناکەوێت زۆریش پێویستە چاوم پێی بکەوێت). من بەپەلە بووم ڕۆیشتم ئەوەندەم پێ گوت(میر حاج بەزۆری لە تەورێزە هەوڵ بدە بزانە کەی دەگەڕێتەوە بۆمەهاباد ئەوکاتە دەتوانی بیبینی).

دیارە لە دیدارێك پرسی بووی (زرار چۆن کراوە بەئەفسەر، لە جوندی ئەوەل یەکسەر کراوە بەئەفسەر!) محمد قودسی وەلامی دابۆوە گوتبوی: (ئەوەی زرار کردویەتی نەك هەر حەقی ئەفسەریەتی هەبوو، بەڵکو حەقی ئەوەی هەبوو دروشمی پالەوانیەتی پێ بدرێت، جیا لەو چەکانەی هێنابوونی خۆی‌و کۆمەڵێك چەکداری بەتوانا سەربازی پاراستنی کۆماری کوردستانن). بەیانیەك لەمەهاباد دەچومە بارەگای بارزانیەکان بۆ چاوپێکەوتنی (فقێ حسن میرۆ) لە دەرگا لەگەڵ ناوبراو بەیەك گەیشتین، گوتی: (باش بوو هاتی وا دەڕۆینەماڵی خودانی) یانی ماڵی(شێخ ئەحمەد) برا گەورەی مەلامستەفا، ماڵیان لە نزیك ورمێ بوو پێم گوت: (ئەوە خێرە وەها بەکۆمەڵ دەرۆنە ماڵی شێخ؟) فقێ حسن گوتی: (چۆن نەتزانیوە خودان لە ئەسعەد خوشەوی‌و مەلامستەفا تورەیەو دەڵێت نابێت ئەوانە هیچ پەیوەندیەکیان بەبارزانیەکانەوە بێت، لەبەر ئەوەی زوڵم لەفەقیران دەکەن)، بێگومان مەلامستەفاش تەنگاوەو دەترسێت بۆیە باوکت‌و حمدئاغای مێرگەسۆری‌و شێخ ئەحمەدی حەقەکانی هێناون لەگەڵ خۆیان ببات بەڵکو خودانێ ڕازی بکەن ئەسعەدو ئەوانەی لەگەڵیانن دەرنەکرێن، تۆش وەرە بابچین. لەوکاتە مەلامستەفا هاتە ژورەوە بەبەرگی جەنەڕالی، چاوی بەمن کەوت‌و گوتی: (باشە لێرەی ئێستا میریش دێتە

ئێرە دەرفەتێکی چاکە پێکتان بینمەوە). زۆری پێ نەچوو (حمەئاغاو سلێمان بەگ)و کۆمەڵێك چەکدار بەسەرکەوتن، چاك‌و چۆنیان لەگەڵ مەلامستەفا کرد، هەر زوو مەلامستەفا گوتی: (میرێ من ئەوە زرارە دێ دگەل وی پێك هێیەوەو چ جارە کا دی ئەوی عادز نەکەی). بەمنیشی گوت: (هەستە دەستی میر ماچ بکە). منیش هەستام دەستی باوکم ماچ کرد.

لەبارەگای هێزی بارزانیەکان هەستاین دابەزینە سەر شەقام ئۆتۆمبێلەکان وەستا بوون، بەمنی گوت: (تۆش وەرە) لەمەهاباد دەرکەوتین کاتێك نزیك کەوتینەوە لە ورمێ لە رێگای گشتی لاماندا، پێش بگەینە ماڵی شێخ ئەحمەد، مەلامستەفا لەشوێنێك لایدا ناو ماڵی هەندێك بارزانی لەوێ بەرگی گۆڕی‌و جلی کوردی کردە بەر لەوێوە بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشتین کە ماڵی شێخ ئەحمەدی لێ بوو زۆری نەخایاند گەیشتینە ماڵی شێخ ئەحمەد، جەنابی شێخ لە شوێنی تایبەتی خۆی بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمی لە سلێمان بەگ‌و شێخی(هەڤەکان)کرد، لە دوای ماوەیەك دەست کرا بەو باسەی بۆی چوبوین، لەو ڕووەوە زۆر قسەکرا شێخ بۆ خاتری ئەوان ڕازی بوو بیان بورێت بەو مەرجەی ئەو زوڵمەی لەمیللەت کراوە دوبارە نەبێتەوە. ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو بەدرێژایی ئەو هەموو کێشەو قسە کردنە مەلامستەفا دەنگی لەبەر دەرنەچوو واتەزانی هەرلەوێ نیە. ئەوەی بەلامەوە زۆر سەرنج ڕاکێش بوو بەئاشکرا مریدەکانی شێخ لەمرۆڤەکانی مەلامستەفایان ئەمراندو قسەیان پێ دەگوتن!

پێش گەڕانەوەمان شێخ ئەحمەد گوتی: (سلێمان بەگ مرۆڤێت خراپ بەحکومەتا کوردیان ڕاگەیاندیە کو مرۆڤێت شێخ ئەحمەدی دەڕۆنەوە عێراقێ بەبێ پرساحکومەتا کوردا، منیش گەلەك مالا بارزانیا ناردنە لای میاندواوێ). سلێمان بەگ گوتی: (جەنابی شێخی دەنگ‌و دۆڵەکی بەرفراوان بلاو ببوەوە کەوا هەندێ لەبارزانیەکان بەنیازن بگەڕێنەوە عێراقێ بەبێ ڕەزامەندی کۆماری کوردستان، بەلام جەنابت ڕێگات لێگرتن بەناردنی ئەو کۆمەڵە ماڵە بۆ دەوروو بەری میاندواو کە لەوێ جێ نشین کران). ئەو ماڵە بارزانیانەی کە ناردرابوون بۆ میاندواو هەر لەوێ بوون تا ڕۆژانی تێك چونی کۆماری کوردستان.

لە کۆتایی مانگی (١٠/١٩٤٦) هەندێ دەنگ‌و باس پەیدا بوون کە ئێران بەنیازە هێرش بێنێت بۆ سەر هەردوو کۆماری ئازربایجان‌و کوردستان، بێگومان ئەوە لە هەموو کاتێك چاوەڕوان دەکرا بەتایبەتی لەدوای ئاخاوتنی بالوێزی ئەمریکا لە تاران کەوای نیشان داوە کە دەبێ ئێران ببێتەوە یەك پارچە بەمانای نابێ ئەو دوو کۆمارەی لە ئێران جیابونەتەوە بمێنن، لەبەر ئەوەی ئەو دوو کۆمارە کۆسپێکی گەورەن لە پێش بەرژەوەندی ئەوان، لەبەر ئەوە ڕازی نەبوون ئازربایجان‌و کوردستان سەربەخۆ بن مادام لەژێر فەرمانی ئەوان دا نین. دوا بەدوای بالوێزی ئەمریکا وەزیری جەنگی ئێرانیش دەستی کرد بەهەڕەشەکردن‌و خۆ هەڵکێشان. دیار بوو پاڵپشتی قایم بوو.

بێگومان بەکشانەوەی سوپای سۆڤیەت لە ئازربایجان‌و کوردستان‌و ئێران هەلێکی گونجاوی بۆ هەڵکەوت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەرئەو دووکۆمارەو داگیریان بکاتەوە. قین‌و داخی خۆی لە ئازادی خوازان بکاتەوە.

ئەوە بوو لە ڕێکەوتی (٢٣/١١/١٩٤٦) بەپشتیوانی دەوڵەتەکانی ڕۆژئاواو ئەمریکاو بەریتانیا سوپای ئێران بەبێ شەڕ گەیشتە (زەنجان) ناو خاکی ئازربایجان، بەگەیشتنی ئەو دەنگە لە کوردستان پەشێوی پەیدا بوو جەماوەر هاندرا بڕۆنە بەرەکانی ڕووبەڕووی دەست درێژیکاران بۆ ئەو مەبەستە بانگەوازێك ڕاگەیەندرا هەر بەدوای ئەم بانگەوازەدا خەڵکێکی زۆر دارژانە شوێنە دیاریکراوەکان بۆ ئەوەی بەڕێ بکرێنە بەرەکانی شەڕ، لە نەغەدەو گوندەکانی دەوروبەر خەڵکێکی زۆر کۆببونەوەو پێویستیان بەبەڕێ کردن بوو بۆ میاندواو، بۆ ئەو مەبەستە ڕۆیشتمە مەهاباد لەوێ داوای ئۆتۆمبێلم لێکردن بۆ ئەوەی خۆبەختکەران بەڕێ بکەینە بەرەکانی ڕووبەڕووی شەڕخوازەکان، هەندێك لەو جەماوەرە بەپیادە ڕۆیشتنە مەهاباد، دوو ئۆتۆمبێلم بردن بۆ نەغەدە، دیار بوو (سەید ئەحمد)یش ڕۆیشتبوە مەهاباد بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێل دابین بکات بۆ ڕەوانە کردنی ئەو خەڵکە زۆرە بۆ بەرەکانی شەڕ، (سەید ئەحمد) دوو ئۆتۆمبێلی بارهەڵگری کارگەی شەکری (میاندواو)ی وەرگرتبوون گوایا لەنەغەدە ئەو خەڵکەی چاوەڕێیە بەڕێیان بکات کەچی دەڕوات ماڵەکەی خۆیان لێ بارئەکات بەناوی ئەوەی گوایە دەڕواتە(ورمێ) هەتا ئامادە دەبن بۆ ڕۆیشتن ئەو کاتە بەشوفێرەکان دەڵێت: (لێخوڕن بۆ خانێ لەوێش بۆ عێراق، کاتێك ئاگادارکراینەوە

بەپەلە بەدوایدا ڕۆیشتین بۆ گرتنی، بەلاّم کارلەکار ترازابوو هەرچەندە بەدواشیدا ڕۆیشتین هەتا خانیّو سەرسنوور بەپەڕۆشەوە دەرباز ببوو. ئەوەی جێگای پەرۆشیە ئەوەیەحاکمی باوەڕ پێکراوی کوردایەتیو سوێند خۆری حزبی دیموکرات هێشتا باس نەبوو سوپای داگیرکەر بگاتە کوردستان ئەو کوردەی لەژێر بەرگی کوردایەتی دا خۆی شاردبوەوە لەژێرەوەش پیاوی بێگانە بووە! لەگەلّ ڕۆیشتنی زۆر کەلوپەلی کۆمارو چەکی کوردستانی بردنو ڕۆیشت ئەوە یەك بوو لە باوەڕ پێکراوان کە ڕووی کردە ئەو بەدکارییە بەرامبەر نەتەوەکەیو کۆمارە ساواکەی کورد کە خۆی سوێندی بۆ خواردبوو خیانەتی لەگەلّ نەکاتو بی پارێزێت، دیارە بەلای ئەو پاراستنی کوردو حزبی دیموکراتی کوردستان بەم شێوەیە بووە. وەك ئاشکراشە ناوبراو کوڕی بنەماڵەیەکی کورد پەروەرن!

بەڕاستی تا سوپای ئێران تەورێزیشی داگیرکرد بوو هەلوێستی بەرپرسەکانی کۆمار ئەوە بوو کە بەرگری بکەن، بەلاّم لە پڕێکا هەلوێستیان گۆڕاو بڕیاریان دا شەڕ نەکەن!

لە(٢٣/١١/١٩٤٦) سوپای داگیرکەر گەیشتە (زەنجان) حاکمی نەغەدە ڕای کردو ڕۆیشتە عێراق لە (١٣/١٢/١٩٤٦) تەورێز گیرا، ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕی بوو، کاتێك زاندرا سەرکردەکانی کۆمار شەڕ ناکەن، ماڵە بارزانیەکان لە دەورو بەری میاندواو کشانەوە بەرەو ناوچەکانی نەغەدەو شنۆو مامەشو پیران بۆ نزیك بوونەوە لە سنوور.

## تێکچونی کۆماری کوردستان

کاتێك زاندرا کوردستانیش شەڕ ناکات ئالۆزی پەیدا بوو، ئەو ماڵە بارزانیانەی لە مەهابادو دەوروبەریشی بوون باریان کردو ڕۆیشتنە شنۆو گوندەکانی دەوروبەری نەغەدەو شنۆو زەرزا، لەگەلّ گرتنی تەورێز سەربازەکانی ئازربایجان ئەوانەی لە کوردستان لەگەلّ لەشکری کورد لەبەرەی ناوچەی سەقز بوون گەڕانەوەو خۆیان دایە دەستی سوپای شای ئێران، لەدوای ڕۆیشتنی ئازربایجانیەکان لەشکری بارزانیەکانیش ناچار بوون بەرەو میاندواو بگەڕێنەوەو لەگەڕانەوەیاندا لەڕێگا نۆکەرانی شاپەرست

ویستبویان ڕێگایان لێبگرن‌و چەکیان بکەن. پیاوانە لێیان هاتبونە دەست‌و بەرەنگاریان بوون خۆشیان نەیانزانی بۆ کام لا ڕابکەن، ئەوان وایان دەزانی وەك سەربازەکانی ئازربایجانی پێشمەرگەکانی کوردیش چەك دەکەن کەچی توشی هیلاکەتێك بوون مەگەر تەنها خۆیان بزانن چیان بەسەرهات. ئەو لەشکرەی بارزانیەکان کەلە سەقز گەڕایەوە بەسەر پەرشتی (حمەئاغای مێرگەسۆری‌و سلێمان بەگی دەرگەلەیی) بەرەو سابلاغ دەهاتن کە تۆپەکانیشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوون لەوێوە تا نەغەدە بەڕاکێشان بەهۆی گاو گامێش، بەهیلاکی‌و ماندو بونێکی زۆرەوە ئەو تۆپانەیان گەیاندنەوە نەغەدە لەوێشەوە بۆ شنۆ. لەوکاتە ناسازو نارێکەو ماڵ‌و منداڵی بارزانیەکان بەو سەرماو ساردیە بەپێیان دەڕۆیشتنە ڕێ‌و دەگەڕانەوە ناوچەکانی نزیك سنوری عێراق بۆ ناو مامەش‌و پیران‌و زەرزاو دەوروبەری نەغەدەو شنۆ. لەو بەرتەنگیەو ئالۆزیەدا ئێمە کۆمەڵێك چەکدار لە سابلاغ دەرکەوتین ئێوارە بەرەو میاندواو دەڕۆیشتین بۆ یارمەتی هێزەکانمان لە بەرەکانی ڕووبەڕوو لە سەقز، شەو داهات لە خوار گوندی (قونقەلا) ماشێنەکەمان لە کارکەوت، لەوێ بەپێیان کەوتینە ڕێ کاتێك گەیشتینە ئەوێ سەرەتای لەشکر دەهاتنەوە، گوتیان (حمەئاغا) نزیکە وادێت لە دوای ئێمەیە، لەدوای کەمێك بەیەك گەیشتین حمەئاغا گوتی: (بگەڕێوە باوکت وا لە دواوەیە لەگەڵ تۆپەکان دێت). منی لەگەڵ خۆی گێڕایەوە ڕۆیشتینە سابلاغ، کاتێك گەیشتینە ناو شار شەو درەنگ بوو، دیار بوو سابلاغێکی ئالۆزو شێواو کە پێش چەند کاتژمێرێك وانەبوو هیچ تەنگاویەك بەرچاو نەدەکەوت، ئێمە ڕۆیشتینە ماڵی پێشەوا، پێشەوا هەر وەك جاران پێشوازیەکی گەرمی لێکردین‌و یەکە یەکە تەوقەی لەگەڵ کردین، چەند جارێك گوتی: (یاخوا بەخێر بێن) لە حمەئاغای پرسی (خۆ بەسەلامەتی گەڕانەوە؟)

حمە ئاغا لە وەلامدا گوتی: (بەڵێ گەورەم بەسەلامەتی گەڕاینەوە لە ڕێگا هەندێ کەسانی شا پەرست ویستیان ڕێگامان لێ بگرن، بەلام زوو بلاوەیان پێ کرا)، حمە ئاغا زیاتر دواو گوتی: (جەنابی پێشەوا من بۆ ئەوەم لا داوەتە لای ئێوە کە بفەرموون لەگەڵ ئێمە بێن بەرەو سنور بڕۆین بزانین لە دواییدا سەرمان بەچی دەگات).

پێشەوا گوتی: (زۆر سوپاسی هەستی پاکی ئێوە دەکەم، دەبێ نیگەران نەبن من ناتوانم سابلاغ بەجێ بهێڵم، لە بەر ئەوەی بەڵێنم بەخەڵکی ئەو شارە داوە بەجێیان نەهێڵم‌و ناتوانم بەجێیان بێڵم).

حمدئاغا زۆر هەوڵیدا، بەڵکو ڕازی بکات، بەلاّم هەر ڕازی نەبوو لەگەڵ ئێمە دەربکەوێت لە دواییدا بەحمدئاغای گوت: (ئەگەر لە سابلاّغیش دەربکەوم ناتوانم لەگەڵ ئێوە دەربکەوم لەوانەیە بەخۆشت بزانی؟!).

لەدواییدا حمدئاغا زیاتر لەسەری ڕۆیشت‌و بێ هیوا بوو، لەوکاتەی دەمانویست بڕۆین پێشەوا بەحمد ئاغای گوت: (بنێرە سەربازخانە ئەو چەکەی دەتانەوێ‌و پێتان دەچێت بیبەن لەگەڵ خۆتان).

بەدڵێکی تەنگی تەزیوی سارد لەدیوان دەرکەوتین‌و ماڵ ئاواییمان لەوکەسە هەڵکەوتوە کردو بەجێمان هێشت، کاتێك دەرکەوتین دیاربوو ئۆتۆمبێلە یەك کەوتوەکەی ئێمە کەوتبوەوە کار بەدوامماندا هاتبوو.

حمدئاغا گوتی: (تۆ بڕۆ بۆ سەربازخانە ئۆتۆمبێلەکەت باربکە لە تفەنگ‌و فیشەك وەرەوە قونقەلاّ من لەوێ دەمێنمەوە هەتا باوکت دەگاتەجێ). ئەوان ڕۆیشتن منیش چەند چەکدارێکم بردن‌و ڕۆیشتمە سەربازخانە لەوێ ئۆتۆمبێلەکەی خۆمان بارکرد، دیمان ئۆتۆمبیلێکی سوپای کوردستان لەوێ بارکرابوو لە تفەنگ‌و فیشەك، وا دیاربوو بەنیازبوون بۆ لایەکی بەڕێ بکەن، ئەویشمان ڕاپێچ کردو شوفێرەکەمان دیتەوە لە سەربازخانە دەرکەوتین بەناو سابلاّغی ڕەش پۆشدا تێپەڕ بووین ڕوو لە(قونقەلاّ) لەوێ لامدا لای حمدئاغا لە خەوم هەڵستاند پێم گوت: (دوو ئۆتۆمبێلم بارکردوون لەفیشەك‌و کەڵو پەلی سەربازی)، ناوبراو گوتی: (بڕۆ بۆ شنۆ لەوێ بیدە بەدەستی شێخ صادق‌و بگەڕێوە، ئۆتۆمبێلەکانیش لەگەڵ خۆت بینەوە). لەوێ بەڕێ کەوتین کاتێك گەیشتینە نزیك (حەیدەر ئاباد) لە سێ ڕیانەکەی (سابلاّغ ـ نەغەدە ـ ورمێ) خەڵکێکی زۆر لە ڕێگادابوون بەرەو نەغەدەو شنۆ دەڕۆیشتن چەند چەکدارێکی بارزانی ڕێگایان لە ئۆتۆمبێلەکانی ئێمە گرت دەیان گوت: (دەبێ باری ئۆتۆمبێلەکان دابگرن ئێمە ماڵی شێخ عوسمانی پێ دەگەیەنینە شنۆ)، هەوڵێکی زۆرم لەگەڵ دان بێ سوود بوو ناچار ڕۆیشتمە لای (شێخ عوسمان)، ناوبراو منی ناسی، پێم گوت: (ئەو بارانە چەك‌و کەڵو پەلی سەربازیە دەیبەم بۆ

شنۆ ئەویش پیاوەکانی ئێوە ڕایان گرتوین)، ناوبراو لەپیاوەکانی زویر بوو پێی گوتن: (ئەوبارانەی بارکراون زۆر پێویست ترن لەکەلو پەلی ئێمە). لەوێ دوو ئۆتۆمبێلی ئەوان وەستابوون بەنزینیان بڕابوو لە ورمیێو نەغەدە بەنزینیان نەدابونێ بەپارەش، لەوێ بەرەو نەغەدە ڕۆیشتین پێش ئەوەی بگەینە ناو نەغەدە ئۆتۆمبێلێکی ئێمەش بەنزینی بڕا ناچار بووین بڕۆینە لای بەنزین فرۆش• (مهدی مشهدی) داوای بەنزینم لێ کرد هەزار سوێندی خوارد کەهیچ بەنزینی نەماوە، بەلاّم ئاگادار کرابووم بەنزین لەماڵێك شاردراوەتەوە بۆ ئەوەی نەیدەن بەو ئۆتۆمبێلە پەك کەوتوانەی کە ماڵی بارزانیەکان دەگوازنەوە، ڕۆیشتمە ماڵە دەست نیشان کراوەکە ئەوەی بەنزینی تێدا شاردرابۆوە: داوام کــرد دەرگا بکەنەوە، دیاربوو ڕازی نەبوون بڕۆینە ژوور، لە دواییدا کردمانە ناخۆشی پێمان گوتن دووقات پارەتان پێ دەدەین دەیان گوت: (ئەگەر بەنزینیش هەبێت پێتان نادەین)، کە وام دیت زۆر پەست بووم ئەو بەنزینەی هەیان بوو زیاتر لە (٢٥) تەنەکە بوو دەستم بەسەردا گرت لەو ماڵەی لێی شاردرابۆوە هەمووم گواستەوە لای چەکدارەکانی خۆم، شەش تەنەکەم بۆ ئۆتۆمبێلە پەك کەوتوەکانی شێخ عوسمان بەرێ کردن، ئۆتۆمبێلەکانی خۆشمان پڕکردن‌و ڕۆیشتین بۆ شنۆ لەوێ چەك‌وکەل وپەلەکانی بردبووم دامەدەستی (شێخ صادق)و گەڕامەوە بڕۆم بۆ لای حمد ئاغا لە ڕێگا (شێخ سلێمان) ڕای گرتین گوتی: (بەپەلە بڕۆوە نەغەدە دەڵێن قەرەپەپاغەکان نیازیان خەراپەو خەریکی خۆ کۆکردنەوەن بۆ دەستدرێژی کردنە سەر کوردەکان). ئەوکات ماڵی (شێخ محمد صدیق‌و شێخ سلێمان)یش هەر لەوێ بوون، لە سەر پردی گادەری ئۆتۆمبێلەکانم بەرێ کردن تاریکیش داکەوت‌و گەیشتینە نەغەدە هەر زوو یەکێك لە نۆبەتدارانی ماڵی شێخ سلێمان (مستۆی محی) هاتە لام گوتی: (ئەوەی بەئاشکرا دیارە قەرەپەپاغەکانی دەوروبەری شار زۆریان هاتونەتە ناو نەغەدە نیازیان خەراپەو مەترسی لێ دەکرێت)، پێم گوت: (وشیاربن بەیانی چارەیان لێ دەکەین).

ئەو شەوە بەدرەنگەوە لە چەند شوێنێك تەقەکرا بۆ ترساندنی خەڵك دیاربوو زۆر چەکداریان لە مزگەوتی شیعەکان کۆبوبونەوە، دوو سێ پێشمەرگەشیان چەك کــردبون، بەیانی کۆمەڵێك چەکدارم بردن چوومە مزگەوتەکەیان زانیم چەند چەکداری کوردیان چەك کردون بەو نیازەی بیاندەنە دەست حکومەت، لەکاتی

سوپای داگیرکەر دەگاتە نەغەدە ئەو هەلوێستەی ئەوان ناچاری کردین ڕوو بەروویان بوەستین و بەتوندی لەگەڵیان بدوێین، هەر زوو چوار دەوری مزگەوتەکە لەلایەن چەکدارەکانی ئێمەوە کۆنترۆڵ کراو خۆشم لەگەڵ چەند چەکدارێك لە مزگەوت بەژوور کەوتین پێم گوتن: (هەر ئێستا بلاوە دەکەن و هەرکەسەی دەگەرێتەوە شوێنی خۆی ئەگینا هەموتان دەگرین و دارکاریتان دەکەین، داواشم لەئاخوندو دارو دەستەکەی کرد ،ئەوانەی چەکیان لە پێشمەرگەکانی دەوڵەت وەرگرتبوون هەر ئێستا تفەنگەکانمان بۆدەهێننەوە، ئەگەر نەیهێننەوە ئەوەی خراپە پێتان دەکەین) ، هەر بەو شێوەیەش ئەوانەی لە ناو بازار خەڵکیان دەترساندو گەف و هەڕەشەیان دەکرد زۆر باش تەمبێ کران و بەسزای خۆیان گەیشتن، هەر ئەو ڕۆژە ئێوارە چەکەکانیان هێنایەوەو بلاوەشیان لێکرد.

ڕۆژانی (١٤-١٥/١٢/١٩٤٦) وردە وردە لەشکری بارزانیەکان، ئەوانەی لە سەقز بوون گەیشتنەوە نەغەدەو ڕوبەڕوی دوژمن وەستان، لە دەشتی (سندوس)و بەرزاییەکانی دەوروبەری پێش سوپای ئێرانیان گرت و ڕێگایان نەدا یەك هەنگاوی تر بێنە پێش، ڕێگای (حیدر ئاباد)یان لێ گرتن لە (مەحمەدیار) تەقەیان لە سوپا کرد، ڕێگەیان نەدا زیاتر بێنە پێشەوەو بەرەو دواوەیان گێڕانەوە. لە ڕێکەوتی (١٧/١٢/١٩٤٦) مەلامستەفاش گەیشتەوە نەغەدەو ڕۆیشتە شنۆ لەو دەمەشدابوو سوپای ئێران ڕاگیراو ڕێگای نەدرا بڕواتە پێش کە ئەمەیان دیت ناتوانن بڕۆن یەکسەر نوێنەریان بەڕێکرد داوای وتووێژیان کرد، نوێنەری ئێران سەرهەنگ (غەفاری) داوای لەشێخ ئەحمەد کرد مەلامستەفا بڕواتە تاران، شێخ ئەحمەد ڕازی بوو مەلامستەفا بڕواتە تاران، زۆربەی چەکدارەکان پێیان خۆش نەبوو مەلامستەفا بڕواتە تاران، لەبەر ئەوەی دەسەلاتداریەتی ئێران جێگای باوەڕ نەبوون بەرامبەر تێکۆشەرە ناسراوەکانی کورد، بۆیە چونی جێگای مەترسی بوو، کەچی مەلامستەفا بەبێ ترس خۆی ئامادەکردو دەستەیەکی دەستنیشان کردن کەلەگەڵی بڕۆن کە ئەمانەبوون (عزت عبدالعزیز، میرحاج ئەحمەد، نوری ئەحمەد تەها، حمدامین میرخان، خالد بارزانی، جمیل تۆفیق). ڕۆژی (٢٠/١٢/١٩٤٦) مەلامستەفاو وەفدەکەی لەنەغەدە بەرەو مەهاباد ڕۆیشتن ڕۆژی (٢١/١٢/١٩٤٦) لە مەهاباد لەلایەن سەرتیپ (هومایۆنی) بەڕێ کران بۆ تاران، لەو کاتەوە لە تاران مانەوە

هەتا دوای کۆبوونەوەی نێوان شێخ ئەحمەدو سەرتیپ (هۆمایۆنی) لە نەغەدە ڕۆژی (١٩٤٧/٢/١٩) ئەو ماوەیەی مەلامستەفا لە تاران مایەوە چەند جارێك سەرهەنگ (غەفاری) بەرێکرا بۆ لای شێخ ئەحمەد داوای دەکرد:

١. چەکە گەورەکانیان بدرێتە دەست.
٢. ڕێگا بەسوپا بدرێت بڕواتە خانێ.
٣. ئەفسەرەکانی ئێران ئەوانەی گەیشتبوونە ڕیزی لەشکری بارزانیەکان بدرێنەوە دەستیان.

بەڵام هەر جارەی دەهات بەدەستی بەتاڵ دەگەڕایەوە، دوا جار شێخ ئەحمەد پێی گوتبوو: (جارێکی تر باسی دانەوەی ئەفسەرەکان مەکەن، چونکە ئەوانە پەنایان هێناوەتە بەر ئێمە تازە مردنو ژیانیان بەئێمەوە بەستراوەتەوە، بۆیە هەر کاتێ فەرمانی لێبوردنیان بۆ دەرکەوت ئەوکاتە دەتوانن بگەڕێنەوە، دەربارەی تۆپەکانو ڕێگا دان بۆ چوونە خانێ با ئەو نوێنەرانەی کە نێردراون بۆ تاران بگەڕێنەوە بزانین ئێوە چیمان بۆ دەکەن ئەوکاتە باسی لێوە دەکەین تا ئەوان نەگەڕێنەوە ناتوانین چیتان بۆ بکەین).

نوێنەری ئێران دیتی نەیتوانی هەڵوێستی شێخ بگۆڕێ ناچار ڕۆیشتەوە تاران لەوێ داوای لە مەلامستەفا کردبوو کە ڕاسپاردەیەکی خۆی بنێرێت بۆلای شێخ ئەحمەد، بەڵکو ڕازی بێت داوایەکانی(غەفاری) جێبەجێ بکات، مەلامستەفاش لەوێ (ڕەئیس عزەتو خالید)ی لەگەڵ دەنێرێتو دەڕۆنە شنۆ،(غەفاری) هەمان داوایەکانی بەشێخ دەگەیەنێو دەڵێت ئەوانەش ڕاسپێردراوی مەلامستەفان بۆ ئەوەی ئێوە باوەڕ بکەن.. وەك زاندرا شێخ زویر دەبێو گوتبوی: (پێم گوتون باسی ئەفسەرەکان نەکەن تا فەرمانی لێبوردن دەرنەکرێت، بۆ مەسەلەی تۆپەکانو ڕۆیشتنی سوپاش بۆ خانێ ئەو کاتە دەکرێت مەلامستەفا بەخۆی بێتەوە با بزانین لەسەر چی ڕێك کەوتون ئەوجا داواکاریەکانتان جێ بەجێ دەکرێنو ڕێگا دەکرێتەوە بڕۆنە خانێ). بەعزەتیشی گوتبو: (نەگەڕێیتەوە تاران)، ئەمجارەش غەفاری بەدەستی بەتاڵو نابەدڵی گەڕایەوە زۆری پێ نەچوو سەرتیپ (هۆمایۆنی) داوای کرد چاوی بەشێخ بکەوێت ئەوە بوو لەسەر داوای ناوبراو ڕۆژی (١٩٤٧/٢/١٩) دیارکرا لەنەغەدە یەکتر ببینن ئێوارەی (١٩٤٧/٢/١٨) شێخ ئەحمەد لە شنۆ هاتە نەغەدە

نە بنکەی چەکدارەکانی (سلێمان بەگ) میوان بوو بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ هەندێ نە سەرکردەکانی لەشکر دوا، پێش ئەوەی لەگەڵ هۆمایۆنی دابنیشێت (شێخ سلێمان بارزانی، حمدئاغای میرگەسۆری، سلێمان بەگ دەرگەلەیی، عزەت ئامێدی) بریاریان ئەوە بوو بەسەرتیپ (هۆمایۆنی) بلێن هەتا مەلامستەفاو نوێنەرەکانی کە لەگەڵیەتی نەگەڕێنەوە داواکاریەکانتان جێ بەجێ ناکرێن ئێمە نازانین لە سەر چی رێك کەوتوون؟.

لەرۆژی دیاریکراو سەرتیپ (هومایۆنی) گەیشتە نەغەدەو لە ماڵی (میرزا قولیخان) دانیشتن بەشداربوان لەگەڵ شێخ ئەحمەد بریتی بوون لە(شێخ سلێمان بارزانی،حمداغای مێرگەسۆری، سلێمان بەگی دەرگەلەیی، عزەت ئامێدی) ئەوانیش (سەرتیپ هومایۆنی، غەفاری)و ئەفسەرێکی تریش کە یاوەری سەرتیپ بوو.

لە سەرەتاوە (ڕەئیس عزەت بەناوی شێخ ئەحمەد)و نوێنەرانی بەخێرهاتنی لە سەرتیپو نوێنەرەکانی کرد، رێگادرا بەسەرتیپ قسە بکات، ناوبراو هەمان داواکاریەکانی کە پێشوتر هەیان بوو دووبارەی کردنەوە، دیاربوو زۆر بەپەلە بوون سوپاکەیان بگاتە خانێ! لەوەلامدا شێخ ئەحمەد پێی گوتن: (وەفدێکمان چۆتە تاران نە سەر داوای ئێوە بۆ وتووێژ با بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی بزانین لەسەر چی رێك کەوتون، نابێ بزانین حکومەتی شا چیمان بۆ دەکات، تاوەکو بەپێی رێکەوتننامەکە کارەکان بکرێن بۆیە واباشە وەفدەکە بگەڕێتەوە پێمان ڕابگەیەنن لە سەر چی پێك هاتوون ئەوکاتە ئەگەر رێکەوتنەکە پەسند بوو ئەوا ڕازی دەبین ئەگەر پەسەندیش نەبوو ئەوکاتە قسەی لێ دەکەین). لەکۆتایی قسەکانی شێخ، هومایۆنی گوتی: (جەنابی شێخ لە ماوەی دووسێ رۆژی تر وەفدەکە دەگەڕێتەوە لای ئێوە، قسەکانتان ماقوڵن). بەو شێوەیە کۆتایی بەکۆبوونەوەکە هات، (هومایۆنی) گەڕایەوە سابلاغو شێخ ئەحمەدیش رۆیشتەوە شنۆ.

بێگومان دوای تێکچونی کۆماری ساوای کورد ئالۆزیەکی زۆر لە کوردستانی ژێر دەسەلاتی کورد پەیدا بوو کوشتنو برین هەر باسی لێ ناکرێ، دەربەدەریش بێ ئەندازە بوو ئەو ماڵانەی ئاوارە بوون بەو سەرماوساردییە کەوتبونە کۆڵانان، بەتایبەتی بارزانیەکان ئەوانەی لەدەوروبەری مەهابادو میاندواو جێنشین ببوون، لە شوێنەکانی تریش ناچار بوون باریان کردو دارژانە ناوچەکانی دەوروبەری نەغەدەو

شنۆو مامەش وپیران‌و زەرزاو ناو شنۆو دەوروبەری ورمیێ‌و بلاوی سەر ئەو گوندانە ببوون، ئاوارەبوەکان ئەوانەی لە ژێر سێبەری حکومەتی کوردستان‌و ئالأی ئازادی دەژیان کەوتنە ژێر بارێکی زۆرگران لە رووی ئابوری‌و بیێ رێیی‌و جێی‌و زەبروزەنگی سەرماو ساردی وەرزی زستان ئەو خەلکەی وێك هێنابوو، جیا لەوەش مەترسی فرۆکەو تۆپەکان سەر بارو بن بار. لەلایەکی دیکەش دەنگ‌و باس دەگەیشت حکومەتی ئێران لە ژێرەوە بەنهێنی چەکی دەدا بەکوردەکان ئامادەی دەکردن بۆ لێدانی هێزە چەکدارەکانی بارزانی. لەبەر ئەوەی لە رێکەوتنەکە بەشك بوون! بەلیێ، بەلێنی (هومایۆنی) راست دەرچوو دەنگوباس پەیدا بوو کە(مەلا مستەفا) گەیشتەوە سابلاغ بەیانی دەگەرێتەوە نەغەدە، بەرێکەوت لە بنکەی چەکدارەکانی عزەت ئامێدی بووین باسی ئەوە دەکرا ئەبیێ مەلامستەفاو وەفدە یاوەرەکەی چیان پیێ بێت؟ دەبیێ شایانی خۆشی بێت؟ عزەت بەدەنگ هات‌و گوتی: (دەبیێ ئەوە بزانن ئەوەی ئێران داوای دەکات شێخ ئەحمەد پیێ ی رازی نابێت، چونکە ئەوان دەیانەویێ بەرێمان بکەن بۆ ئەلوەند کەلە نزیك هەمەدانەو چەکەکانیش بدەینە دەست سوپای شاو ئەو ئەفسەرانەی ئێرانی، ئەوانەی لەگەلّ ئەبوالحەسەنی تەفریشیان دان بدرێنەوە دەستیان، شێخیش ئەوە قبول ناکات کەواتە ئەوە پێك نەهاتن). (علی محمد سەدیق) لە عزەتی پرسی: (خالّ ئەوە مەسەلەی مستەفا خۆشناو چیە؟ دەلێن خۆی داوەتە دەستی حکومەتی عێراق، وەهاب ئاغاو پیاوەکانیشی خەریك بوون برۆن بۆ عێراق، بەلأم لە خانە گێردراونەتەوەو بەرێیان کردونەتەوە بۆ شنۆ!) عزەت گوتی: (خالّ مەلامستەفا زۆر لە مێژە دلّی هێشاوە لەو ئەفسەرانەی لەگەلّی بوون بەتایبەتی زۆر لەخۆشناو دلّتەنگ‌و نیگەران بوو زیاتر لەهەموان قینی لەخۆشناو بوو لەگەلّ تێکچونی حکومەتی کوردی هەولّی دا بڕواتە سۆڤیەت تا نزیك سنوری سۆڤیەتیش رۆیشتبوو، بەلأم دەرنەچوو گەڕایەوە). کاتێك گەڕامەوە بنکە بیرم لەوە دەکردەوە کە لەو کاتەی عزەت قسەی دەکردو باسی خۆشناوی دەکرد هەستم دەکرد ئەو مرۆڤە ئەوەندە بەپەرۆش‌و دلّ رەنجاوو بێزارە لە ئەندازە بەدەر، کاتیێ گەیشتمەوە بنکە دیار بوو (ئیسماعیل عارف) چاوەڕێم بوو، ئەو شەوە لای ئێمە مایەوە ئەو کاتە زانیم ناوبراو ئەندامی پارتی بووەو کادیریش بووە.

بۆ بەیانی بەشێکی زۆری چەکدارەکانی نەغەدە ڕۆیشتنە سەر پردی گادەر چاوەڕوانی هاتنەوەی مەلامستەفا بوون، زۆری پێ نەچوو گەیشتە جێ بەناو چەکدارەکاندا تێپەڕی لە بنکەی چەکدارەکانی (سلێمان بەگ) دابەزی، لەوێ جێگای بۆ سازکرابوو، لە کاتی گەیشتنی خەڵك بەخێرهاتنەوەیان لێکرد، لە دواییدا لەگەڵ (شێخ سلێمان‌و حمدئاغاو سلێمان بەگ) ڕۆیشتنە ئەو شوێنەی بۆی ئامادە کرابوو، هەر بەو بۆنەیەوە کە گەڕاوەتەوە لە تاران خەڵکێکی زۆر لای دانیشتبوون باسی ئەوەی دەکرد کە زیاتر لە مانگێك لە سەربازگەیەك دانداراوون وەك دەست بەسەرێك ماونەتەوە، دەی گوت (هەر چەند ڕۆژێك یەکێك دەهات گوایا فێرم دەکەن لەو کاتەی دەڕۆمە لای شا دەبێ چۆن دەستی ماچ بکەم‌و سەری بۆ دابنوێنم، بەلاّم کە زانیان دەستی ماچ ناکەم‌و سەریشی بۆ دانانەوێنم) وەك خۆی گوتی: (سەر دانەواندن تەنها بۆ خودایەو بەس، بۆم ئاشکرا بوو نامبەن بۆ لای شا، ناچار بوین لەگەڵ یەکێك لە ئەفسەرەکان ڕێك کەوتین بەپارە شەو بۆ ماوەی یەك دوو کاتژمێر ڕێگا بدات بڕۆمە دەرەوە بەم شێوەیە شەوێك دەرچووم‌و خۆم گەیاندە باڵوێزخانەی ئەمریکا ئەوێ چاوم بەباڵویز کەوت ماوەی یەك کاتژمێر لەگەڵی دانیشتم بەڕاستی ئەوەی لە دڵمدا بوو بەوردی پێم گوت‌و پێم ڕاگەیاند ئینجا بەپەلە گەڕامەوە، بۆ ڕۆژی دووەم (قەوام السەلتەنە) بەخۆی هاتە لام‌و پێی گوتم ئامادەبە بڕۆینە لای شا ئەوەبوو ڕۆیشتینە دیوانی شا بەڕێزەکی زۆرەوە پێشوازی لێ کردم لە دواییدا بەسەرۆك وەزیرانی گرت زوو کارەکانی مەلامستەفا ڕێك بخەن، بەپێکەنینەوە گوتی: (کاتێك کە گەڕامەوە لای ئەوان لەگەڵم بوون پێم گوتن، الحمدلله لەدەستی ئینگلیزە درۆزنەکان‌و ڕوسە برسیەکان ڕزگار بووین هەندێك جنێویشی بەهەردوکیاندا).

لەکۆتایی قسەکانیدا هەندێ پرسیاریان لێکردن، شێخ سلێمانی برازای خۆی پرسی: (مام دەربارەی ئەو ماڵ‌و مندالاّنەی ئاوارە چیتان کردوە بڕیاری چیتان لەسەر داوە؟).

گوتی:(لەو بارەیەوە ڕێك کەوتوین ڕێگایان بدەین بڕۆنە سەر سنوری خانە، چەکە گرانەکانیان بدەینە دەستیان ئێرانیەکانیش خۆیان بدەنەوە دەستی حکومەتەکەیان، ئەوانیش ئێمە لە شوێنێك جێنشین دەکەن خواردن‌و خۆراك‌و پێویستیەکانمان بۆ ڕێك دەخەن‌و هەوڵ دەدەن لەگەڵ عێراق بەڵکو عفومان بکەن).

سلێمان بەگ پرسی: (جەنابی بارزانی دەربارەی پێشەواو هەواڵەکانی ئەوانەی گیراون باسێکتان لەگەڵ نەکردن داهاتویان بەچی دەگات؟).

گوتی: (سلێمان بەگ داهاتووی ئەوانە هەر لە سێدارەدانە ئەوان بەخائین تاوانبار کراون باسی چیان بکەین نابوو باسیان لەگەڵ بکەم!).

کوشتنی ئاغایەکانی مامەش: شەوی دووەم بوو مەلامستەفا گەیشتبوەوە نەغەدە لەتاران گەڕابوەوە شەو درەنگی شەو بەمەلامستەفایان ڕاگەیاند کەوا لە(سێلوێ) بارزانیەکان کۆمەڵێك ئاغایان کوشتون لە ئاغاکانی مامەش، بەو بیانوە کە خەریکی جموجۆڵ بوون دژی بارزانیەکان، ئەو کۆمەڵە ئاغایە لە گوندی (سێلوێ) کۆ دەبنەوە لەوکاتەدا هێزێکی بارزانیەکان لێیان بەژوور دەکەونو لێیان دەدەن هەموویان دەکوژن تەنیا منداڵێك دەربازببوو، کاتی ئەو دەنگە گەیشتە مەلامستەفا زۆر ئاڵۆزونیگەران بوو بەسلێمان بەگی گوت: (بەپەلە چەند کەسێك بنێرە بەچوستی بڕۆن خەبەرێکی ڕاست بێننەوە). لەو دەمەدا قادر ئاغا پەیدا بوو هاتبوە بەخێرهاتنەوەی مەلامستەفا، ئەو دەنگەی بیستو دوانەکەوت داوای گەڕانەوەی کرد، مەلامستەفا بەسلێمان بەگی گوت: (ئەو پیاوانەی دەنێردرێن بۆ شیناوە با قادرئاغاش بگەێننەوە کولیچ)، حەوت کەس لەگەڵ (قادر ئاغا) ڕۆیشتن بەیانی گەیشتنە (سۆفیان) لەوێش ڕۆیشتبونە(کولیچ) کاتێك گەیشتبوونە ئەوێ دەبینن هەندێ لەو بارزانیانەی بەشداری کوشتنی ئاغاکان بوون لەماڵی کاك (مامند)ی مابوون (حەدۆ پەری لەگەڵ پیاوەکانی) سەربردەی (سێلوێ)ی بۆ باس کردینو گوتی: (ئێمە هێزێکی چەکدارین لەگەڵ شێخ صادق لە گوندی شیناوەین کاتێك ئاگادارکراین کەوا ئاغایەکانی مامەش لە گوندی سێلوێ کۆبوونەتەوە بەنیازی ئەوەن ڕێگا لە ماڵە بارزانیەکان بگرن نەهێڵن بڕۆنە خانەو دەشتی لاجان شێخ صادقیش بەسەعیدی وەلی بەگی گوت هەندێك چەکداران بنێرە بابچن بزانن ڕاستەو ئاغاکان بۆ لەوێ کۆبونەتەوە؟ سەعیدیش ئێمەی ناردین. چووین ئاغاکان لە دیوانخانەی مام حوسێنی سێلوێ کۆببونەوە، کاتێك ڕۆیشتینە دیوان دیاربوو پڕبوو لەئاغا دەرگای دیوانمان لێ گرتنوو داوای چەکەکانمان لێ کردن، دوو سێ یەکیان خۆیان پچڕیەوە بەتایبەتی سلێمان خانی کوڕی مام حوسێن گوتیان چەك دانانێین. ئەوە بوو پیاوەکانی میرزا ئاغا تەقەیان لێ کردن هەموویان خستنە ناو دیوانخانە

تەنیا گەنجێك هیچی پێ نەکەوت ئەوانی تر هەموویان کوژران). بێگومان ڕۆژی دوایی ئەو زانیاریە بەبێ کەم‌وکورتی لە نەغەدە بەمەلامستەفا ڕاگەیندرا، لەزار گۆتەی (حەدۆی پەری). کاتێك ئەمەیان ڕاگەیاند بارزانی کەمێك وەستاو دوایی ڕوی کردە حمد ئاغاو سلێمان بەگ گوتی: (توخوا من خەریکی چیم‌و ئەوانیش چیم بۆ دروست دەکەن، کاتی ئەوە بوو بکرێت؟ من دروستی دەکەم‌و ئەوانیش تێکی دەدەن).

ئەو ڕوداوە لەوکات‌و ساتەدا هەڵومەرجێکی ناسازی پەیدا کرد، بارزانیەکانی ناچار کردن بەو سەرماو ساردیە لە ناوچەکانی مامەش‌و پیران بگوازنەوە بۆ شنۆو زەرزا، لە دوای گواستنەوەیان ئێران توانی لە ڕێگای ناو مامەش‌و پیران دا هێزەکانی بەرێ بکات بۆ نزیك شنۆ بۆ ئەوەی ئەگەر شەڕ دەست پێ بکات زوو لە شنۆ بدرێت دەیان زانی ماڵی شێخەکان لەوێیەو ئەگەر بتوانن ڕێگای گادەر بگرن.

لەدوای ئەو ڕوداوە مەلامستەفا ڕۆیشتە لای شێخ ئەحمەد ڕێککەوتننامەکەی تارانی بەشێخ ڕاگەیاند بوو وا دەرکەوت شێخ پێی ڕازی نەبوو، ناچار بووین نەغەدە چۆڵ بکەین‌و دەریکەوین هێزەکانمان لە گوندەکانی نیزیك نەغەدەو گردۆلکەکانی نیزیك قارنەو زنجیرە بەرزاییەکانی قۆپی ئالیاوە هەتا دەگاتە پشتی دەربەند سەنگەریان لێدان هەر ئەوهاش لای ورمێ لە هەندێ شوێن خۆیان ئامادەکردبوو.

ئەوەی جێگای ڕەزامەندیە ئەوەیە ئەو خەڵکەی لە گوندەکان جێنشین کران یارمەتی دەدران لەلایەن برا کوردە گوند نشینەکان بەئەزیەتێکی زۆر ماڵ‌و منداڵی بارزانیە ئاوارەکان جێگایان بۆ دابین کردبوون هەتا ڕێگا کرایەوە دەربازی دیوی عێراق بوون، ئەوەی دیاربوو زۆر لە ماڵە گوند نشینەکان دوو ماڵی ئاوارەی وەخۆ گرتبوو ئەوەیە مرۆڤایەتی‌و برایەتی!.

# ڕێك نەکەوتن لەنێوان ئێران و شێخ ئەحمەدی بارزانیدا

ئەوە بەدیارکەوت (شێخ ئەحمەد) بەو ڕێککەوتنەی تاران ڕازی نەبوو، بەتایبەتی بەوە ڕازی نەبوو کە بنێردرێن بۆ ئەو شوێنەی کە ئێران بۆی دەست نیشان کردوون، هەروەها ڕازی نەبوو ئاوارە ئێرانیەکان بێ عەفوو بدرێنەوە ئێرأن، ئەو پێ چەقاندنەی شێخ بوە هۆی ئالۆزی، ئالۆزیەکە بەوەگەیشت لە سەرەتای مانگی (٣/١٩٤٧)کە ئێران هێزی سوپاوجاشەکانی بەرێ بکاتە ئەوشوێنانەی کە بەدەست بارزانیەکانەوە بوو، بەرەبەیانی ڕۆژی (١١/٣/١٩٤٧) لە ناکاو سوپاو جاشەکان هێرشێکی بەرفراوانیان هێنا بۆسەر گوندەکانی قەلاتان لەو بەری ڕوباری گادەرو میراوەو ئالیاوەو پی بەجك و دەربەندو ئەو گوندانەی دەکەونە بناری بەرزاییەکانی قوپی ئالیاوەو گردۆلکەکانی تریش. بوو بەشەڕێکی دژوار. ئەمە یەکەم شەڕی ڕوبەڕووبو لە دوای تێکچونی حکومەتی کوردستان لەگەڵ ئێران، ئەنجامی ئەو شەڕە سوپاوجاش بەشکاوی بەرەو نەغەدەو مۆڵگەکانیان گەڕانەوە لە دوای شکست هێنانیان ئەوەندەی توانیان بەتۆپ وفرۆکە درێغیان نەکرد لە بۆردومان کردنی کوێرانە، کاتێك بۆیان دیارکەوت ناتوانن بمان گێرنەوە دواوە خۆیان بەسەر شۆڕی کشانەوە، لە بەرەکانی لای ئێمە شکستێکی گەورەیان خوارد، بەهەمان شێوەش لە هێرشەکەیان بۆ سنوری ورمێش بەشکاوی گەڕابوونەوە، ئیتر هەر لەوکاتەوە زۆر هەوڵیاندا بتوانن هەنگاوێك بێنە پێشەوە، بەڵام نەیانتوانی. بۆ ئەو مەبەستە بەبەردەوامی زۆر بێ بەزەییانە فڕۆکەو دەبابە بەکار دەهێندران.

ئەوەی بەدیارکەوت هەر لە سەرەتای دەست پێکردنی شەڕ هەوڵی سەرەکیان بۆئەوە بوو ڕێگای گشتی بکەنەوە بەڵکو بڕۆنە پیران و خانەو لاجان، بەڵام ڕێگایان نەدەدرا. ئەوە بوو ڕوویان کردە گردۆلکەکانی نێوان ئالیاوەو زنجیرە بەرزاییەکانی پشتی دەربەند بەو هیوایە بوون کە لێمان بستێنن، بەڵام بەگیان فیدایی هێزەکانمان هەموو جارێك بەسەر شۆڕیو شکاوی دەگەڕانەوە، بۆیە بەهیچ شێوەیەك نەیانتوانی بەو ڕێگایەدا تێپەڕن، ئەمجارەیان هێرشێکی بەرفراوانیان کردە سەر گوندی (قەلاتان)ئەم گوندە دەکەوێتە نێوان شنۆو نەغەدە، لە ئەنجامی تۆپ بارانێکی

بەردەوامو سەخت (سوڵتان ئاغای برای حمدئاغای مێرگەسۆری) کوژراو شەڕێکی دژوار دروست بوو، سوپا گەیشتە گوندی قەلاتانو بەسەرکەوتە قۆپی قەلاتان، گرتنی قوپی قەلاتان مەترسیەکی زۆر بوو بۆ سەر شنۆو گوندەکانی دەشتی شنۆ، ئەو گوندانەی بەشی زۆری ماڵە بارزانیەکانو کوردە عێراقیەکانی تێدا نیشتەجێ کرابوون ناچار دژە هێرشێکیان بۆ کردن بەشکاوی گەڕاندنیانەوە نەغەدە، ئەم جارە کەوتنە جموجۆڵ لەڕێگای ناو مامەش هەموو توانایەکیان خستەکارو بەجاشەکان هێرشێکی فراوانیان بردە سەر شنۆ لەڕێگای سۆفیان بەو مەرامەی بگەنە شنۆ بۆ ئەوەی هێزەکانی پێشەوە دەستیان شل بێتو بەرەکانی شەڕجێ بهێڵنو ئەگەر پێیان بکرێ ڕێگای گادەر بگرن، بەڵام خۆش بەختانە ئەو پلانەشیان سەری نەگرت هەر چەکدارەکانی ناو شنۆ لێیان ڕاپەڕینو ڕاویان نان هەتا شێخ ئەحمد خۆیشی ڕۆیشتە ڕووبەڕوویانو لە ماوەیەکی زۆرکورت بەرەو دواوەیان ڕاونانو بەشەرمەزاری گەڕانەوەو لەگەڵ زیانێکی زۆریش سۆفیەکان ئاواکران. لە دوای ئەوەی لەهێرش بۆ سەر شنۆ سەرنەکەوتن بەیانیەك سوپا بەدەبابەو زرێپۆش کەوتنە ڕێ بەدۆڵی قارنێ دا، بەنیازی ڕۆیشتن بۆ خانێ لەکاتێکا لە گوندی قارنێ دەرکەوتن شەش خۆبەخت کەری لاو بۆیان دابەزینە سەر ڕێگا (ڕشید، خدر، دەروێش حسن، دەروێش حسێن،حمدامین، زرار) ئەو هێزەیان گێڕایەوە بۆ قارنێ، بەڵام دەبابەکان گەڕاندوە بەرەو بەرزاییەکانی پشتی دەربەندو کەوتنە ڕێو تۆپەکانیان لە قارنێ دامەزراندنو دەستیان کرد بەتۆپ بارانی سەنگەرەکانی ئێمە لە بەرزاییەکانو هەر خۆیان دەیانزانی چەندیان تۆپ هاویشتن، ڕۆژی دوایی سەر لە بەیانی دەبابەکان کەوتنەڕێ زۆر نەڕۆیشتن لە ڕێگای گشتی لایانداو ڕوویان کردە بەرزاییەکان بۆ ئەو شوێنەی ئێمەی تێدا بووین، زۆری پێ نەچوو سوپاش بەدوایاندا هات، دەبابەکان نزیك بون سەربکەون ئێمە بۆیان دابەزین لە ناوەڕاستی بەرزاییەکان لە دیوی لای قارنێ لە سوپامان داو سوپا زوو شکاو سەرەو ژێر بەرەو قارنێ هەلاتن، لەم شەڕەدا دوژمن زیانێکی زۆری پێکەوت، دەبابەکانیش گەڕانەوە قارنێ، قارنێ ئەوکات ببوە بنکەی لەشکری سوپاو جاشەکان.

لەپێش دەست پێکردنی شەڕ بنکەی ئێمە لە گوندەکانی ئالیاوەو میراوەو دەربەند بوو، هەر لەو ڕۆژەی شەڕ دەستی پێکرد ئێمە لەو گوندانە ماینەوەو ڕێگامان نەدا

سوپاوجاش بەهیچ لایەکدا بجولێنەوە، لەبەر ئەوە بەردەوام شەوو ڕۆژ شوێنەکانی ئێمە تۆپ باران دەکران.

دوای ئەوەی هێزەکانی ئێران لە هێرشەکانیان سەرنەکەوتن ئەمجارە خەریك بوون لە ڕێگای مامەش‌و پیران بەڕێگا سەختەکان هێزێکی تۆپەکانی چیایی بگەیێننە نزیك گوندی (نەلۆس) بەرامبەر بەشنۆ بۆ تۆپ باران کردنی شنۆ بۆ ئەوەی ئالۆزی بخەنەناو دانیشتوانی شنۆ بەتایبەتی ماڵی شێخەکان، بەڵام کە زاندرا تۆپ لەوێ دامەزراون تۆپەکانی ئێمە لە گوندی(حسن نوران) دەست پێشخەریان کرد بەرە بەیانی (١٩٤٧/٣/١٦!) هێزێکی ئامادەکراو لە کەتیبەی تۆپەکانی ئێران نزیك کەوتبونەوە (تەفریشیان)و ڕەئیس عزەت تۆپەکانیان ئامادە کردبوون، لەوکاتەی کە فەرمانی تەقەکردن درا یەکەم گوللە تۆپ سەرەی کرد، دووەم گوللە تۆپ بەناوەندی تۆپەکانی دوژمن کەوت‌و نەیانتوانی یەك گوللەش باوێن، دوای ئەوەی کە دەورەیان درابوو، هێرش کرایە سەریان ئەوەی کوژرا کوژرا ئەوانی تریش بەدیل گیران، فەرماندەی کەتیبەی تۆپەکانی دوژمن کوژراو هەموو کەتیبەکەش کەوتە بەردەست، دیل وگشت کەل‌وپەلەکانیان گواسترانەوە شنۆ.

ڕۆژی(١٩٤٧/٣/١٧) لە نەغەدە هێزێکی زۆری سوپا بەڕێ کرا گوایا لە هاواری کەتیبەلێدراوەکە دەچن بۆ (نەلۆس) بەڕێگای گشتیدا، بەڵام ئەوەندە لە قارنێ بەدوورنەکەوتن کە ڕێگایان لێگرتن لە گەرمەی لێك دان‌و بەگژیەکدا چونمان یەکێك بەناوی(سلێمان) بەسواری وەڵاخ هاتبوو پێمان ڕابگەیێنێ کەوا سوپای دوژمن لە ڕێگایە ئاگادار بن، بەداخەوە ئەو پیاوە دڵسۆزو پاکە نەگەیشتە لامان شەهید کرا تەرمەکەشی کەوتە دەست دوژمن ئەوانیش لاشەی ئەو شەهیدەیان بردبوەوە نەغەدەو بەشەقامەکاندا گێڕابویان‌و گوتبویان ئەوە سلێمان خانە کوژراوە یانی(سلێمان بەگ) بۆ ئەوەی خەڵکی پێ بترسێنن، بەشەهید بوونی ئەو تێکۆشەرە نیشتمان پەروەرە زۆر نیگەران بووین، بۆ جاری دووەم ڕوویان کردەوە قەڵاتان بۆیان دەرکەوت بەڕێگای گشتیدا ناتوانن بڕۆن بۆ خانە، جارێکی تر هێرشیان بۆ قەڵاتان برد، بێگومان ئەو شەڕە گرانەی لە دۆڵی قارنێ توشی بوون ڕێگای پێ گۆڕین‌و ڕوویان کردەوە قەڵاتان‌و هێرشێکی بەرفراوانیان دەست پێکرد لە پاش شەڕێکی خوێناوی‌و دژوار هێزە چەکدارەکەی لەژێر فەرماندەی حمدئاغای مێرگەسۆری دابوو

نەیان توانی زیاتر خۆیان ڕابگرن لە ژێر زەبرو زەنگی تۆپو دەبابەو فڕۆکەکان قەلاتانیان بەجێ هێشتو ڕۆیشتنە دیوی لای شنۆ، قەلاتان کەوتە دەستی سوپای هێرش بەری شاوە، ئەوە بووە مەترسیەکی ترسناك لەبەر ئەوەی ئاشکرایە قوپی قەلاتان بەسەر هەموو گوندو دەشتی شنۆدا دەڕوانێتو هەمووی لێوە دیارە هەر شوێنێکی بیانەوێ دەتوانن تۆپ بارانی بکەن.

ئێمە لەئالیاوە بووین ئەگەر بێتو سوپا لە قەلاتان بمێنێتەوە، ئەبێ ئالیاوەو میراوەو دەربەند بەجێ بهێلین، باوکم بنکەی لە دەربەند بوولە تەنیشت قەلاتان، ناردی بەدواماندا بگەینەوە دەربەند ئێوارەیەکی درەنگ کە دونیا بەرەو تاریکی دەچوو گەیشتینە لای باوکم، دیار بوو ئەویش خۆی ئامادەکردبوو لە دەربەند دەربکەوێت لەگەڵی کەوتینە قسەو پێمان گوت:(تۆ برۆ بۆ لای حمدئاغا ئێمەش دەڕۆین دەستێك لە دوژمن دەوەشێنین لە قەلاتان ئەگەر نەمانتوانی دەریان بکەین ئەوا ئێمەش شوێنەکانمان جێ دەهێلینو دێینە لاتان) باوکم هەلوێستی ئێمەی زۆر بەباش زانیو پەسندی کرد، لە دوای ئەم گفتوگۆیە ئێمە لە ڕوبار دەرباز بووینو ڕۆیشتین کاتێك نزیك کەوتینەوە لە قەلاتان بەپێی ئەو زانیاریانەی هەمان بوو دەمانزانی ئەفسەرەکان لە دیوانی ئاغا دابەزی بوون، چەکدارەکانمان بەرێكو پێکی دابەشکردن هەریەکە بەشوێنی خۆی دەزانی(منو ڕەشیدو خدرو دەروێش حسنو ڕەحمان) بەناو جۆگەی ئاودا ڕۆیشتین تا نزیك کەوتینەوە لە نۆبەتدارەکانی دیوەخانە، بڕیاریش بوو کەس تەقە نەکات هەتا ئێمە لە ئەفسەرەکان دەدەین، ڕەشید بەنهێنی چووبوە نزیك دیوەخانەو تا لە نۆبەتدارەکە نزیك کەوتەوەو کوشتیو نارنجۆکێکی فڕێدایە ناو ئەفسەرەکان یەکسەر بوو بەتەقە لە هەموو لایەکەوە نەمانزانی چۆن ئەوەندە زوو ڕایان کردو قەلاتانیان بەجێ هێشت سەربازەکانی سەر قوپیش نەیانتوانی لەپێش چوستو چالاکی لەشکری سلێمان بەگ خۆیان ڕابگرن، بەپەلە بەرێگای گشتیدا هەلاتنە خوار بەرەو نەغەدە گەڕانەوە، هەر ئەوکات نامەیەکم بۆ باوکم بەرێ کرد بۆ ئەوەی ئاگاداری حمدئاغا بکات چەکدارەکانی بگەڕێنەوە وا ئێمە لە قەلاتانین، کاتێك باوکم بەحمدئاغای گوتبوو ئەوە نامەی زرارە لە قەلاتان ڕەوانەی کردووە داوا دەکات چەکدارەکانی ئێوە بگەڕێنەوە شوێنەکانیان ناوبراو سەری سوڕمابوو لەو چالاکیەی ئێمە ئەنجامان دابوو!.

دوای دەرکردنی هێزەکانی دوژمن لە قەلاّتان هەر ئەو شەوە بەشی زۆری چەکدارەکانم بەرێ کردنەوە ئالیاوەو دەربەند،ئەو کاتەی ئەو هێزانەی لە قەلاّتان بوون گەڕانەوە شوێنەکانیان منیش لەگەلٚ کۆمەلێك لە چەکدارەکان لە ڕوبار پەڕینەوەو ڕۆیشتینە گوندی(کامووس) بوین بەمیوانی (سەیدڕەحمان) ئەوەی ڕاستی بێت زۆر هیلاك بووین، بەلاّم ئەوەندەیان خزمەت کردین هیلاکیەکەیان لە بیر بردینەوە، ماوەی دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە بۆ ڕۆژی دووەم باوکیشم لەو گوندە هاتە لامان.

دووسێ ڕۆژ لە دوای ئەو سەرکەوتنەی بەدەستمان هێنا (شێخ سلێمان) هاتە دەربەند بۆ لای باوکم دیار بوو کە وەزعی ئابوریان لە شنۆ زۆر پەرێشان بوو ناوبراو گوتی:مالّی خودان یانی (شێخ ئەحمد)لەو پەڕی پەرێشانی دان لە ڕووی خۆراکەوە بەلّکو هەولێك بدەن بۆ پەیدا کردنی هەندێ گەنم. ئەوانەی لە گوندەکان ڕایان کردبوو زۆربەیان چالّە گەنمیان هەبوو بۆیە کەوتینە گەڕان بۆ دۆزینەوەی چالّەکان دووسێ چالّە گەنمان دۆزیەوەو بۆمان ناردن، باوکم گوتی: (خۆشت لەگەلّی بڕۆ بۆ شنۆ بەشێخ سلێمان بلّێ بەلّکو هەندێ چەکدار بنێرێتە دەربەند، ئێمە هیلاك بووین بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدەن، بڕۆ لای وەهابیش پێی بلّێ با چیتر لەسەر هێلکە کوورك نەبیت با بێتە ئێرە) مەبەستی هاتنە دەربەندە بۆ لای باوکم. ڕۆیشتمە شنۆ چاوم بە(شێخ سلێمان) کەوت بەلێنیدا کۆمەلێك چەکدار بنێرێت بۆ یارمەتیدانمان هەر بەهەمان شێوەش ڕۆیشتمە لای (شێخ ئەحمەد)، ئەوەی جێگای خۆشحالّیم بوو ڕێزێکی زۆری لێنام‌و زۆر بەگەرمی باسی چالاکیەکانی ئێمەی دەکردو ڕێزی هەبوو بۆ باوکم و گوتی: (لەوەختەکی باش گەنمتان بۆ هێناین).

لەوێ هەستام ڕۆیشتمە لای (وەهاب ئاغا)مالّیان لە ناو خانوێك بوو تاریك ناسازو نا بەرچاو وەهاب ئاغا ڕیشی زۆر هاتبوو واپێ دەچوو لە خۆی وەڕەس بوبێ، چونکە زۆر شپرەزە بوو، هەندێك گەنمیشم بۆ ئەو بردبوو ڕاسپاردەی باوکم پێ ڕاگەیاندو پێم گوت: (باوکم منی ناردووە بۆ ئەوەی لە گەلّم بێیت بڕۆینە لای تا ماوەیەك لەوێ بمێنیتەوە). وەهاب ئاغا بەنابەدلّی گوتی: (بەباوکت بلّێ ئێمە بەدوای کلاّوی بابردوو کەوتبوین نەمانزانی تووشی ئەو هەلّدێرە دەبین، دیارە ئێوە تازە بەنیازن کلاّوی بابردوو بدۆزنەوە ؟!) لە زۆر ڕووەوە لۆمەی مەلامستەفای کردوو

...زیش لە بارزانیەکان نارازی بوو لەوکاتەی کە لەگەڵیان بووە لە قادرئاوا، دیسان گوتی: باوکت هەر لەسەر بیرو هۆشی هۆزایەتیە، هێشتا کابرای نەناسیوە باسی ئەوەی کرد چۆن بەدوای مستەفا خۆشناودا گەڕاون بۆ کوشتنی، هەر لە بەرئەوەی مرۆڤێکی لێوەشاوەی کوردپەروەر بوو نەبوو بەدارو دەستەی، ئینجا ئەزیەت دانی خۆشی باس کرد. کاتێ کە گەڕامەوە شتەکانم بەووردی بۆ باوکم گێڕایەوەو گوتم وەهاب ئاغا نایەت، چونکە باوەڕیەو زۆریش لۆمەیکرد). باوکم گوتی: (ئەدی هەر ئەوان نەبوون دەگەڕان بەداوودامەنی هەڵ دەگوت ئەمرۆش لۆمەی دەکەن ساحێبی قسەی خۆیان نین‌و ئێمەشیان دەربەدەرکرد). ئەوەی بەدیار کەوت شێخ سلێمان کۆمەڵێك چەکداری بەرێکردن بۆ ئەوەی لە جێگای ئێمە نۆبەت بگرن، شەولەمزگەوتی دەربەندمان دانان، بەیانی بێ ئەوەی کەس ئاگادار بکەن ڕۆیشتبون، ناچار شەو بەدرەنگەوە خۆمان بەسەرکەوتین بۆ ئەو سەنگەرانەی کەدەبوایە ئەوان بڕۆنە ئەوێ، پێش ئەوەی ڕوناك دابێت هێشتا هەر تاریك بوو ئێمە خەریك بووین بڕۆینە شوێنەکانمان ئەو سەنگەرەی(ڕەشیدوحمدامین) بەنیاز بوون بچنە ناوی کاتێك، کە نزیك کەوتنەوە تەقەیان لێکراو کەوتنە بەرشێلکی ئاگری تفەنگ باش بوو ئێمە یەکسەر لێمان دان‌و زۆری نەبرد دەرمان پەڕاندن لە سەنگەرەکان دەرکەرتن‌و ڕایان کرد بەدیارکەوت کە جاش بوون وا پێ دەچوو زانیبویان سەنگەرەکان چۆڵن، بەئاسانی هاتبونە ناو سەنگەرەکان، لە کاتێکا لێیان درا پێڕانەگەیشتن وڵاخەکانیشیان ببەن، سێ ئەسپیان لێ بەجێ مابوون‌و یەکێکیشیان لێ کوژرا بوو، وەك زاندرا جاشەکان بریندارێك‌و کوژراوێکیان هەبووە. لە دوای ڕاکردنی جاشەکان وڵاخەکانمان گواستەوە دیوی لای خۆمان، لە دەربەند گوێیان لەو تەقەیەی ئێمە دەبێت باوکم چەکدارەکان دەنگ دەدات‌و دەڵێت: (زوو بڕۆن لە هاواری زرارو ئەوانەی لەگەڵی بەسەرکەوتون دیارە کەوتونەتە بۆسە) ئەو چەکدارانەی لەوێ بورن بەڕێیان دەکات دیتمان وا هێزێکی زۆر بەرەو لای ئێمە بەسەر دەکەون کاتێك لێمان نزیك کەوتنەوە دەبینن لە دیوی لای ئێمە وڵاخ بەستراونەتەوە دەزانن کە ئێمە وڵاخمان پێ نەبووە دەڵێن دیارە کوژراون یان گیراون ! ئەو هێزە بەپارێز وا سەردەکەون بۆ لای ئێمە بەنیازی لێدانی سەنگەرەکان، ئەوکاتە (ڕەشیدوحمدامین) هەستانە سەر پێ و بەدەستیان ئیشارەتیان بۆ کردن کە زانیان ئێمەین ئەوجا بەسەرکەوتن هاتن بۆ

لامان، بەلاّم ئەوەندە ماندوو ببوون بێ ئەندازە لە دوای ئەوان زۆری پێ نەچوو باوکیشم بەسەرکەوت، سەربردەکەم بۆ گێڕایەوەو وا بەدیار دەکەوت کە زانیویانە سەنگەرەکان بەشەو چۆل دەکرێن ئەوانیش بەهەلی دەزانن‌و هاتبونە ناو سەنگەرەکان وایان دەزانی لێیان دەگەڕێن لەوێ بن، کەچی پێڕانەگەیشتن وەلاّخەکانیشیان ببەن بەم شێوەیە سەرەو ژێر هەلاّتن تا لەحوکمی گوللە دیار بوون ڕایان دەکرد، دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ سەیرمان کردکۆمەلێك جاش بەرەو لای ئێمە دەهاتن وابەدیارکەوت کوژراوێکیان لە نزیك ڕێگای گشتی بەجێ هێشتبوو هاتبوون بیبەنەوە بەلاّم (ڕەشیدو محمدامین‌و حسن) بۆیان دابەزین‌و ڕاویان نان تا قارنێ خۆیان ڕانەگرت. ئێوارە لەگەلّ باوکم دابەزیم بۆ دەربەند شەو لەمالّی هەمزە چاوم بەشێخ جەلال کەوت ناوبراو یەکێك بوو لە ئەنجومەنی شاری نەغەدەو لە کۆمیتەی شاری نەغەدەش ئەندام بوو دیار بوو خۆی نەدابووە دەست حکومەتی ئێران زۆر ئالۆزو غەمبار بوو لەگەلّی کەوتمە دوان، داوام لێکرد لەگەلّ ئێمە بێت مردن‌و ژیانمان هەر چۆن بێت با بەیەکەوە بین تا بزانین سەرمان بەچی دەگات ناوبراو گوتی: (خۆ ئێمەش لەوانەی بەندکراون‌و چاوەڕوانی پەتی سێدارەن زیاتر نین، مردنی سەربەرزی باشترە لە ژیانی مل کەچی، ناوبراو زۆر بەگلەیی بوو لە هەلّوێست بەرامبەر قازی‌و حزبی دیموکرات).

بەیانی زوو ئاگادارکراین سوپا خۆی ئامادەکردوە بەنیازی هێرشە بۆ سەر بەرزاییەکانی ئالیاوەو پشتی دەربەند، ڕاگەیاندنەکە ڕاست دەرچوو، بەپەلە بەسەرکەوتین‌و تووشی شەڕێکی زۆر دژوار بووین لە ئەنجامی ئەو شەڕە دژوارە دەبابەیەکمان لەکارخست‌و پەکی کەوت لەگەلّ ئەوەش توانیان چەند سەنگەرێك بگرن لەبەرزاییەکان لەپشتی دەربەند هەندێ سەنگەر دابنێن، شەوی سێیەم شێخ سلێمان هەندێ چەکداری ناردن یارمەتیمان بدەن بەلّکو دەریان بکەین، بۆ ئەو چالاکیە سەنگەرەکان دابەش کران بەو مەرجەی هەریەکەی سەنگەرەکەی بۆی داندراوە بیگرێت، شەو بۆیان دەرچووین تەوەی بەدیارکەوت تەنیا ئەو سەنگەرەی بۆ ئێمە داندرابوو گیرا و تێکدرا ئەوانی تر هەلّنەستان دوو دەبابەپارێزگاری لێ دەکردن خۆیان قایم کردبوو.

دەبوایە بیر لە دەست وەشانێك بکرابایەوە بۆ ئەو مەبەستەش بنکەی لەشکریان لە قارنیٚ دەست نیشان کرد، بۆ ئەو چالاکیە داوامان لەو چەکدارانەی کە شێخ سلێمان ناردبونی کرد ئامادەبن (١ـ مەلاعلی ژاژوکی ٢ـ علی ئاغا خوێریزۆکی ٣ـ مەلا شین ٤ـ مەلکۆ زێرۆ ٥ـ حەسۆی بەبانی) ئەوانە هەریەکەی هەندیٚ چەکداریان لەگەلٚ بوون، لەکاتی دیاریکراودا گەیشتینە ئالیاوە خۆیانو چەکدارەکانیان ئەوانەی ناویان نووسراوە بانگی لای سلێمان بەگ کران، سلێمان بەگ پێیگوتن: (نیازێکی ئەوهامان هەیە لە بنکەی لەشکر دەدەین لە قارنیٚ) وەك بەدیارکەوت بەشی زۆریان لەگەلٚ ئەوە نەبوون بێن دەیانگوت: (باپرسی شێخ سلێمان بکەین بزانین دەلێت چی) سلێمان بەگ پێیگوتن: (ئێوە بێن یا نێن ئێمە هەر دەرۆین بەیانی نەلێن سلێمان بەگ بەئێمەی نەگوت، ئەوا هەمووتان لێرەن) مەلکۆومەلا شین گوتیان ئێمە دێین.

هەر ئەو دەمی لە ئالیاوە بەریٚ کەوتین بەرەو قارنیٚ، کاتێك نزیك کەوتین لە گوند ئاگادارکراین کەوا ئەوانی تریش هاتن، ئەوکاتە لە شوێنێك دانیشتین نەخشەی مەیدانی بنکەی لەشکرو گوندمان خستە بەرچاو، شوێنەکانمان دابەش کرد هەریەکەی بۆ کاملا دەچیٚو ئەبیٚ چی بکات، شوێنە هەرە سەختەکەم بۆ خۆم دانا ئەویش بنکەی سوپا بوو لە نزیك چایخانە لەو کاتەی هەریەکەی بەجێگای خۆی زانی، بڕیاریش بوو ئێمە تەقە نەکەین کەس تەقە نەکات، ئەو کاتەی هەریەکەی بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی داندرابوو ڕۆیشتین شەوی(١٩٤٧/٣/٢١) ئەو چالاکیە ئەنجام درا، پێش بڕۆین بۆ ئەوشوێنەی بۆمان دیاریکرابوو، کورتە کۆبونەوەیەکی سەرپێیمان کرد بۆ دیارکردنی چەکدارەکان بۆ ئەوەی هەریەکەی بەکاری خۆی بزانیٚ، ئەو کاتەی ئێمە خەریکی دوان بووین، بەلامەوە سەیر بوو لەوکاتەدا چەند سەگێك لە ناو گوندی قارنەدا هەبوون تێکرا دەیان لوراند، لە دوای کورتە کوبوونەوەکە باوکم لەگەلٚ چەند چەکدارێك لەویٚ مانەوە بۆ چاودێری ڕێگا، ئەوانی تریش بەرەو ئەو شوێنانە ڕۆیشتین کە بۆمان دیاریکرابوو، ئێمە شەش کەس لەناو جۆگەی ئاو ئەوەی دەکەوێتە پشتی چایخانەو باخچەکان زۆر بەنهێنی ڕۆیشتین کاتێك لە چایخانە نزیك بوینەوە دەوریەکان بۆ لای ئێمە هاتن زۆر لە نزیك ئێمە گەڕانەوە(خدرو حمد امین و ڕەشید) بەپەلە لە دوایان چوون زۆر بەوەستاییو نهێنی، زۆری نەخایاند

نارنجۆکێیان فڕێ دایە ناو چایخانەو بوو بەتەقە هەر زوو ڕێگامان لێ گرتن ئەوەی لە ناو چایخانەدا بوون ئەوەی نەکوژرا بەدیل گیرا، لەماوەیەکی کورت دا دەستمان بەسەر تەواوی بنکەی سەربازی داگرت، کەڵو پەلەکانی بنکەی لەشکروچلویەك هێسترمان گرتن جاشەکان زوو ڕایان کرد زۆر بەچرووستیو گورج وگۆڵی ڕاپەڕی بوون، بەشی زۆری کەڵو پەلەکانیان بەجێ هێشتبون ئازوقەی لەشکر لەناو مزگەوت داندرابوو خەریکی بارکردن بووین لەو هێسترانەی گیرابون لەگەڵ دوو سێ عارەبانەی گامێش لەو دەمەدا یەکێك بەناوی(مجروم) دانیشتوی گوندەکە بوو بەنهێنی ئاگاداری کردم کە کۆمەڵێك سەربازی ڕاکردو لەماڵی موختاری خۆیان پەنا داوە، بانگی موختارم کرد پێم گوت: (دەڵێن میوانت هەن بابرۆین بیان ناسین)، ڕۆیشتینە ماڵیو گەڕاین لە ناو کاذین حەوت سەربازی بەچەك دۆزرانەوە ئەوانیشمان بەرێ کردن، سێ عارەبانەی گامێشو (٤٠)هێستر لە خۆراك بارکران، ئەوەی پێویست بوو لە مزگەوت بارکراو بەڕێمان کرد بۆ (ئالیاوە) ئەوەی مابوو بەخەڵکی گوندمان گوت وەرن بۆخۆتانی بەرن ئەوەی لەناو مزگەوت ماوە.

ئەوەی دەمەوێت لێی بدوێم ئەوەیە لە ماوەیەکی زۆر کورت ئەو شەڕە دژوارە، کۆمەڵە سەربازێك بەدیل گیران ئەوانەی کوژرابون شەو درەنگ بوو نەزاندرا چەند بوون، لاشە زۆر کەوتبون لە دەوروبەری چایخانە لاشەی دوو ئەفسەریش لەناو چایخانەکە کەوتبون.

لێدانی بنکەی لەشکر سەرکەوتنێکی سەربەرزانەبوو، ئەو ئازوقەی لە قارنێمان گواستەوە ئالیاوە باوکم دابەشی سەر بنکەکانی هێزەکانی دەوروبەری کرد، هەندێکیش ناردرا بۆ شنۆ، هێسترەکانیش (ڕەئیس عزت) هەمووی بردن بۆ تۆپخانە، تەنیا دوویان بۆ من بەجێ هێشتبوون.

ئەو چالاکیەی لەقارنێ ئەنجام درا دەنگێکی زۆری هەبوو، ماوەیەك جموجۆڵی سوپای ڕاگرت، ئێمەش کەمێك بووژاینەوە لەڕووی خۆراكو وردی چەکدارەکانیشمان بەرزبوەوە.

زوو زوو دەنگ وباسی لای ورمێ دەگەیشت کەوا، شەڕی دژواری خوێناوی لەگەڵ سوپای ئێران دەکرێنو سەرکەوتون مەلامستەفا خۆی لەوێیە.

ئەوەی بەدیارکەوت لە دوای تێکدانی بنکەی لەشکری لە قارنێ حکومەتی ئێران ئاڵۆز بوو دیار بوو بیریان لە نەخشەیەکی نوێ دەکردەوە، ئەوە بوو هێرشێکی بەرفراوانیان دەست پێکرد بۆ سەر ئێمەو قەلاتانو دەشتی میراوەو بەرزاییەکانی، دوژمن بەدەبابەو تۆپو فڕۆکە لە قەلاتانی دەداو هەوڵی گرتنی قوپی قەلاتانیان دەدا، چونکە قوپییەکە کلیلی دەرگا بوو بۆ سوپای هێرشبەر، ئەوە بوو لە ڕێگای نەغەدە شنۆ بۆ قەلاتان لە چیانەوە بۆ میراوەو دەربەندو ئالیاوە، هەر لەگەڵ بەرە بەیان تا ئێوارە درەنگ شەڕو لێکدان بوو، ئێمە لە ئالیاوەو میراوە ڕێگامان نەدان بێنە پێشەوە هێزەکانیان بەشکاوی گەڕانەوە، بەلام لە بەری قەلاتان بۆ ئێوارە گەیشتنە قەلاتانو قوپی قەلاتانیان گرت، بنکەی هێزی حمدئاغا چووە گوندی (گوندە وێرە) لە دیوی لای شنۆ، بێگومان بەگرتنی قوپی قەلاتان ئێمەش کەوتینە مەترسیو ناچار بووین بکشێینەوە لەبەر چەند هۆیەك: ـ

١. قەلاتان لەئێمە بەپشتەوە تر بوو دەیانتوانی بەئارەزوی خۆیان سەنگەرەکانمان تۆپ باران بکەن.

٢. دەیانتوانی ڕێگای گەڕانەوەمان لێ بگرن.

٣. زۆر لەچەکدارەکانمان ئەوانەی خاوەن ماڵو منداڵ بوون ڕۆیشتن ماڵەکانیان بگوازنەوە سەر سنوور.

٤. بەڕاستی چەکدارەکانیش هیلاكو ماندوو بوبوون, مانەوەمان لەوێ لە مەترسی زیاتر هیچ سودێکی تری نەبوو.

ڕۆژی دوای گرتنی قەلاتان ئێوارە بەدرەنگەوە چەکدارەکان لەگەڵ باوکم ڕۆیشتنە (گوندە وێرە) لای حمدئاغا) منیش لەگەڵ دوو چەکداری تر بۆ شەو چومە گوندی (حەسەن نوران) لای (ڕئیس عزت عبدالعزیز) بەداخەوە زۆر کزو داماو بوو هەر زوو گوتی: (دوێنێ قازیو براو برازای لە سێدارە دراون جێگای غەمو پەژارەیەو گەورەترین زیانە بەکورد کەوتووە)، ئەوەی ڕاستی بێت ئەو شەوە بۆ ئەوە چوبووم گوێ لە ئامۆژگاریەکانی (ڕەئیس عزت) بگرم، بەلام بەداخەوە ئەو مرۆڤە هەست بەرزە تەواو دڵتەنگو غەمبار بوو لە ئەژمەتی ئەوانەی لە سێدارە درابوون. بەیانی پێش بگەڕێمەوە (گوندە وێرە) دوو چەکداری (حمدئاغا) هاتنە لای (ڕەئیس عزت) پێیان ڕاگەیاند(مەلامستەفا) هاتووە وا لە بنکەی حمدئاغایە لە(گوندە وێرە) ئەگەر

بفەرموون بێی بۆلای. عزت گوتی: (ئەگەر پێیان نە گوتبام نە دەهاتم بەلاّم مەرۆ بەیەکەوە دەرۆین). بەرێ کەوتین بۆ گوندە وێرە کاتێك گەیشتینە گوند چوین بۆ بەخێر هاتنی (مەلامستەفا) ناوبراو باسی شەڕەکانی لای ورمێی بۆ کردین لە دواییدا ڕەئیس عزت گوتی: (بەپەرۆشەوە دوێنێ تا پێرێ قازیوئەوانەی لەگەڵی بوون لە سێدارە دران...).

مەلامستەفا زوو بەدەنگ هاتوگوتی: (تۆ بۆ پەرۆشی؟ حکومەتی ئێران بەخائینی تاوانبار کردوون) زیاتریش دوا دەربارەی ئەوان، هەستم کرد ڕەئیس عزەت زۆر نیگەرانو پەست بوو، لە دوای ماوەیەك هەستاو ڕۆیشتە سەر کانیاوەکەی گوند. لەوێ نەگەڕایەوە، بێ ئەوەی خواحافیزی بکات، ڕۆیشتەوە شوێنی خۆی، کاتێك حمدئاغا گوتی: (عزەت بۆ کوێ ڕۆیشت؟) پێیان گوت گەڕایەوە بۆ (حسن نوران). حمدئاغا زوو گوتی: (بێگومان لە دوانەکەی مەلامستەفا نیگەران بووە لە بەر ئەوە مالّ ئاوایشی نەکردو ڕۆیشت)، لە دوای حمدئاغا مەلامستدفا پرسی (ئەوە عزت چی لێهات دیار نیە؟) فقێ حسن گوتی:(ئەزبەنی وادیارە لە قسەکانی تێوە ئەوەی دەربارەی قازی کردتان نیگەران بووە، بۆیە گەڕاوەتەوە حەسەن نوران). مەلامستەفا بەزەردەخەندوە گوتی: (ئەو ئەفەندیانە بەو ڕاستیەی من پێیان دەڵێم زۆر پەست دەبن هیچ دڵخۆش نین بەو ڕاستیەی دەیان خەیە ڕوو، ئەوان هەردەم بارگرانی سەرشانی ئێمە بوون)، زیاتریشی لەسەر گوتن.

شەو بۆخەوتن فەقێ حسن باوەڕپێکراوی مەلامستەفا لای ئێمە جێگای بۆ دیارکرابوو لەگەڵی کەوتمە قسەو پرسیم: (وا دیارە مەلامستەفا لەو ئەفسەرانەی لە سوپای عێراق ڕایان کردووەو لەگەڵ ئێوەش دەربەدەرن نەڕازیەو هەردەم لێیان بەڕەخنەیە، ئێوە چی لێ دەزانن؟) فقێ حسن گوتی: (ئەفسەرەکان بەگشتی خاوەن بیروڕان دەیانەوێ کارەکانیان لە ڕێگای ڕێکخستن بکەن دوور بێت لەکاری هۆزایەتی، مەلامستەفاش بەقسەیان ناکات، شتی تریش هەیە لێك دوورن). منیش پرسیم: (فقێ حسن جیاوازیەکی تریش هەبووە کە بویتە هۆی ساردی نێوان قازیو بارزانی، ئەفسەرەکان زیاتر ڕوو لە قازین لە قسەکانی شێخ جەلالیش وا دیار بوو ئەو ساردیە هەبووە بۆ ئەمە چی دەڵێیت؟) فقێ حسن گوتی: (دەتەوێ لە ڕاستی بگەیەت، بەکورتی ئەفسەرەکان لەگەڵ بیروڕای قازیدا بوونو چەپڕەو بوون، مەلامستەفاش

بەپێچەوانەی ئەوانە ئەو ڕاستیەش شاراوە نیە هەر ئەوەشد بووە بەهۆی ساردی نێوانیان). لەوکاتانە بوو بەڕاسپاردەی بابم چومە شنۆ، ڕۆیشتمە لای وەهاب ئاغا، دیار بوو هەر توڕەو لالوت بوو، بەنارێکی لۆمەی مەلامستەفای دەکرد، زۆرم پێ ناخۆش بوو کە پێمی گوت: (بەقسەی باوکت نەبیتە جەندرمەی چاوبەست، چونکە ئەوەی تۆ بەدوای کەوتی هەو نیە)، ئەوەی جێگای ڕەزامەندیمان بوو شەوێکی خۆشمان بەسەر برد، بەیانی مەلامستەفا ڕۆیشتە شنۆ، کاتێك دەرکەوت دەستێکی دانا سەر شانم وگوتی: (مێرك ئەو دەستو بردەی لێرە کراوە هەمووی ئاگادارمو زانیومەتەوە مێرینیا تۆم بۆ باس کراوە).

لە (٤/٤/١٩٤٧) لە سەر ڕاسپاردەی حمدئاغا ڕۆیشتمە بنکەی تۆپەکان، بەلاّم دیار بوو(ڕەئیس عزەت)و ئەفسەرەکان لەوێ نەبوون ڕۆیشتبونە شنۆ، لە ڕۆژی(٧/٤/١٩٤٧) ئاگادارکراین کەوا بڕیار دراوە مالّەکان بڕۆنە سەر سنوری عێراق، ئەوەی گران بوو ئەوەبوو کە دەبوایە مالّەکان بەسەر بکەونە سەر بەرزاییەکانی پشتی شنۆ بەسەر بەفردا ئاوای دیوی لای ڕووباری گادەر بن، بێگومان ئەو ڕێگایەی پێیدا دەڕۆیشتن ڕووبەڕووی سوپای دوژمن بوو دەیان توانی بەتۆپی دوورهاوێژ تۆپ بارانیان بکەن، چاریش نەبوو دەبوایە هەر بەو ڕێگایەدا بڕۆنە سەر ڕووباری گادەر، بۆ ئەوەی ئەو کۆچبارەی ئاوارەکان کەمێك لە مەترسی دووربکەونەوە(حمدئاغاو سلێمان بەگ) لەگەلّ (ڕەئیس عزەت) بیریان لەوە کردەوە دەستێك لەو هێزانەی دوژمن بوەشێنن. بۆ ئەم مەبەستە بڕیاردرا هێزێکی چالاك شەو بڕۆنە بن سەنگەرەکانی ئەوان بەیانی تۆپەکانی ئێمە سەنگەرەکانی دوژمن تۆپ باران بکەن ئینجا هێزە ئامادە کراوەکە هێرش بەرێتە ناو سەنگەرەکان، بەلّێ بەشەو ئێمە ڕۆیشتینە بن سەنگەرەکانی دوژمن چاوەڕێ بووین بەتۆپ لێیان بدرێ، بەیانی کاتێك تۆپ بارانی هێزەکانی ئێمە دەستی پێکرد تۆپەکان کورتەیان دەکرد زۆری نەمابوو بەر ئێمە بکەون، ئەو ڕۆژە بەدرێژایی ڕۆژ لەبن تاشە بەردەکانی شاخ لەسەر تەنیشت نەبزوتین ئەگەر بیانزانیبایە ئێمە لەوێین هەر بەنارنجۆك هەموویان دەکوشتین، کاتێك دونیا تاریك داهات ئەوجا بەنهێنی گەڕاینەوە. لەڕۆژی دیاریکراودا کۆچباری ئاوارەکان کەوتنە ڕێ بەسەر دەکەوتنە بەرزاییەکان بەناو کەویە بەفرەکاندا تێپەڕ دەبوون بەرەو سنوری عێراق بۆسەرگادەر.

لەدوای ئەوەی لە لێدانی دوژمن سەرنەکەوتین ڕێگا درا بەو چەکدارانەی ماڵو منداڵیان هەبوو ئەوانیش بڕۆن منداڵەکانیان بگەیێننە سەر ڕوباری گادەر منیش ڕۆیشتم بۆ ئەوەی بزانم منداڵەکان گەیشتونەتەکوێ، کاتێك شەو بەسەرکەوتین سەیرێکی سەر ڕوبارمان کرد لەوبەرو ئەو بەر ئاگر دادەگیرسا، وێنەیەکی دڵتەنگ دەکەوتە بەرچاو، ئەو ماڵو منداڵە بەو سەرمایە لە سەر ڕوبار کۆبونەتەوە نیوەشی زیاتر وا بەڕێوەیە، سوپای دوژمنیش بێ ڕەحمانە بەتۆپ و فڕۆکە لێی دەدان، کاتێك دابەزینە سەر ڕوبار گەڕاین بەو شەوە ماڵەکەمان دۆزیەوە دیار بوو ئەوانەی زوو گەیشتبونە سەر ڕوبار لە چەند شوێنێك بۆ پەڕینەوە پردیان هەڵبەستبوو، کاتێك بەڕۆژ سەیری ئەوبەری ڕوبارت بکردبایە هەر بن بەردێكو بن دارێك چەقەڵە شاخێك چەند منداڵێك سەریان پێکەوە ناوە بەو سەرماو سارديە.

ئەوەی زۆر نیگەرانی کردم بەیانی دەنگێکی دڵتەزێن ڕاگەیندرا کە شەو ئەفسەرەکان لە شوێنێك بووینەو لە بەر ئاگر دانیشتبون لە دورەوە تەقەیان لێ دەکرێت ملازم(حمە صالح فەقێ محەمەد ژاژڵەیی) بریندار کراوە، ئەو کردارە ترسنۆکانەیە بووە هۆی نارەزامەندی هەندێ لە ئەفسەرەکان هەر ئەو ڕۆژە پەرت وبلاو بوونەوە هەریەکەی بەلایەکدا ڕۆیشتن، ئەوانەی مابونەوەش لەوپەڕی پەرۆشی غەمباری دابوون.

ڕۆژی(١١/٤/١٩٤٧) سەر لە بەیانی (ئەحمەد بەگی مجید خان)ی کوڕە خاڵی باوکم هاتبرو فەردە ئاردێکی بۆ هێنابووین دەیویست باوکم ببینێ، بەلاّم باوکم هەر لە دیوی شنۆ مابووەوە زۆرم هەوڵدا تفەنگێك بۆ خۆی بیات ڕازی نەبوو، بەیانی (١٢/٤/١٩٤٧) دەوری کاتژمێر دە کاتێك بانگیان کردم کە چوم دیتم (حمدئاغا)ی مێرگەسۆری وەستا بوو ڕۆیشتمە لای هەر زوو گوتی: (ئەگەر ئیشت نەبێت وەرە دەڕۆینە ماڵەکانی ئەولای)، لەگەڵی چووم کاتێك گەیشتینە لای ڕەئیس عزەت لە بن بەردێك دانیشتبوو کزو داماو بەتەنیا، کاتێك ئێمەی دیت هەستاو بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمی لێکردین لە دواییدا لەگەڵ حمدئاغا کەرتنە دوان، حمدئاغا پێی گوت: (من ڕاسپاردراوی خودانم یانی (شێخ ئەحمەد) کە بەئێوەو ئەفسەرەکان ڕابگەیەنم کە ئەفسەرەکان خۆیان نەدەنە دەست حکومەتی عێراق لەبەر ئەوەی ئەوان بەیاسای سەربازی دەدرێنە دادگاو لە سێدارە دەدرێن)، ئەو پیاوە ڕەوشت

حەزە لە وەلامدا گوتی: (حمدئاغا شێخ ئەحمەد مرۆڤێکی دڵپاکەونایدوێت ئێمە تووشی بەلا ببین زۆر سوپاسی دەکەم، بەلام من بڕیارم داوە خۆم دەدەمەدەستو تعزمە ژێرپەتی سێدارە، کۆمەلانی خەڵك دەزانن لە سەرچی لە سێدارە دراوم نەك، بێ سەرو شوێن بزربم) زیاتریش قسەی کرد. چوین ئەوانی تریش ببینین دیار بوو بەکرئاغا) گەڕابوەوە عێراقو بەنهێنی (جلال ئەمین بەگ) خۆیدا بووە دەست ئێران خیراللەو محمدقودسی)ش وەك عزەت بڕیاریان دابوو لەگەڵ منداڵەکانیان بڕۆنەوە عێراق. لەگەڕانەوەماندا لامان دایە لای (وەهاب ئاغا) ئەویش لەژێر چەقەڵە شاخێك دانیشتبوو زۆر شپرەزەو بێ سەرو بەر بوو، حمدئاغا لێی پرسی: (ئەوە چیە ئەوها خۆت بەرداوەتەوە؟) وەهاب ئاغا لە قسەکانیدا زۆر بەنابەدڵی باسی ژیانی خۆی دەکردو زۆر بێزار بوو دیار بوو هیچیان نەبوو بیخۆن، لەوێ حمدئاغا گەڕایەوە لای شێخ ئەحمەد، من لای وەهاب ئاغا مامەوە کاتێك هەستام بڕۆم پێمگوت: (یەکێك بنێرە با هەندێك ئاردتان بۆ بنێرم، لەوکاتەدا ناوبراو پرسی تۆ نیازت چیەو چۆن دەگەڕێیەوە؟) گوتم: (کاك وەهاب من خۆم نادەمە دەستی حکومەت لەبەر ئەوەی فرمانی خنکاندم لە سەرە با لە چیاکان بکوژرێم باشترە نەك ئەوان بمکوژن، وادیارە مەلامستەفا خۆی نادات دەست ئەگەر وابێت لەگەڵی دەڕۆم بزانین چیمان بەسەر دێت ئەگەر چی ناشزانم باوکم چی دەکات).

وەهاب ئاغا گوتی: (ئەگەر بەگوێم دەکەیت خۆت بەدورر دەخەیتەوە، وەك ئێمە بەدوای کلاوی بابردو مەکەوە باوکت نەزانە، هێشتا هەر لەسەر بیروڕای هۆزایەتیە، ئەو حەز لە پیاوی وەك باوکت دەکات بەچاوبەستی بەدوای بکەوێتو لەژێر فەرمانی خۆیدا بێت هەرچی بڵێت دەبێ بڵێ بەڵێ ئەز بەنی). پێمگوت: (ئێوە ڕۆشنبیران هانتان داین ئەو بناسینو گوێ ڕایەڵی فەرمانی بین ئێستاش شتێکی تر دەڵێن). وەهاب ئاغا گوتی: (تازە پێم گوتی ئێمە بەدوای کلاوی بابردوو کەوتبوین تا هەڵدێراین!).

لە دوای قسەکردنێکی زۆر لەگەڵ وەهاب ئاغا گەڕامەوە، دوای نیوەڕۆ چومە ئەو شوێنەی ماڵی شێخ ئەحمەدی لێ بوو خەڵکێکی زۆری لێ بوو وەزعەکە بەئالۆزی دیار بوو، کەس بەکەس نەبوو ئەو هەموو چەکانە لەسەر یەك دانەدرا بوون بەردەوامیش دەهاتن چەکیان دادەناو دەڕۆیشتن، خەڵکەکە پەلەی دەکرد بڕوات لەبەر ئەوەی

برسیەتی هیلاکی کردبوون، سەرماو ساردیش سەر بارو بن بار، لەو کاتەدا ڕاگەیەندرا کە سوپای دوژمن لە پشتی شنۆ هێرشی هێناوە بۆ ئەوەی ئەو ماڵانەی هێشتا بەسەر نەکەوتوون بیانگرێت. حمدئاغا دەرکەوت گوتی: (ئەو پیاوانەی چالاکن زوو بڕۆنە هانای ئەوانەی هێشتا بەڕێوەن، دەی ئەوەی مرۆیە زوو بڕوات ئەو چەکدارانەی لێرەن یەکسەر بڕۆن فریای ئەو ماڵانە بکەون). هەر زوو زیاتر لە بیست، سی چەکدار ڕۆیشتین بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی سوپای ئێران، کاتێ گەیشتین تووشی شەڕێکی خوێناوی بووین، بەلاّم لێدانێکیان لێدرا نەیانزانی کە چۆن بگەڕێنەوە، ئەوان بەو نیازە بوون هەندێ ماڵ بگێرنەوە، بەلاّم پێش ئەوان بگەنە ماڵەکان، ئێمە دەستمان لێ وەشاندن، سوپا بەشکاوی بەرەو شنۆ سەرەوژێر هەلاّتن تا شنۆ خۆیان ڕانەگرت.

ڕۆژی(١٣/٤/١٩٤٧) هەندێ لە ماڵەکان کەوتنە ڕێ بەرەو عێراق، ڕۆیشتن بەردەوام بوو تا ڕۆژی(١٧/٤) ئێوارەی ڕۆژی دیاریکراو کۆتایی هات، دوا ماڵ لە گادەر ڕۆیشتنە (خرێنە) لەوێش بەرێ دەکرانە(دیانە) لەوێش دەخرانە ناو تێل دڕ*.

ڕۆژانی(١٣-١٧/٤/١٩٤٧) ئەو ڕۆژانە بوون کوردە ئاوارەکان بەشێوەیەکی گشتی بارزانیەکان خۆیان دەدایە دەستی دوژمنو نەیارانی کورد، ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی جیابونەوەی کۆمەڵێك کەس بوو لە ماڵو منداڵەکانیانو دوورکەوتنەوەیان بۆ سەر سنورە دەستکردەکانی نێوان (ئێرانو تورکیاو عێراق) ماڵو منداڵیش بۆ ناو تێلدڕ لە دیانە، بەو شێوەیە ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی لێکدابڕانو فرمێسك بارینو دەست لێك بەردان بوو!

دوای ئەوەی ماڵەکان ڕۆیشتن ئەو چەکدارانەی ڕازی نەبوون چەك دابنێن لەگەڵ (مەلامستەفا) لە ڕێکەوتی (١٧/٤/١٩٤٧) پێش ئەوەی تاریك دابکەوێت ڕۆیشتنە ناو ماڵە کۆچەریەکانی (هەرکی) ئەوانەی سەر بە(تەهابەگ)بوون شەو لەوێ مانەوە ماڵە کۆچەرییەکان لە بەرزاییەکانی بەری ئێران ڕەشماڵیان هەڵدابوون، بەشی زۆری چەکدارەکان ڕۆیشتبونە ناو هۆبەکانی (زێرۆ بەگ) لە نزیك سێ کوچکەی سنورەکان، سوپای ئێرانی زانیبوی بارزانیەکان ڕۆیشتونەتە عێراق

---

* ئەو سیمە سەربازیە دڕەی کە لەدەوری سەربازگەکان ڕا دەخرێت.

بەیانی پێش گزنگی هەتاو روویان کردە هۆبەرەشماڵەکانی کۆچەریەکان دیار بوو(تەها بەگ) بەسواری وەلاخ تەنگاوو هەلاسان هاتە لای (مەلامستەفا)، داوای لێکرد کەوا رێگا نەدرێت سەربازەکانی ئێران بگەنە ماڵەکانیان تا بار دەکەنو لە گادەر دەربازی دیوی لای عێراق دەبن.

بارزانی بەسلێمان بەگی گوت: (با هەندێ چەکدار برۆنە بەرایی سوپا، بەلکو بیان گێرنەوە هەتا ماڵەکانیان باردەکەن). سلێمان بەگ گوتی: (مەلامستەفا لەدوێنێوە لێرەین لە ناو ماڵەکانی ئەوان تێر نانمان نەخواردووە، چۆن بەزگی برسی شەر دەکرێت). لەگەڵ ئەوەشدا لە سەر فەرمانی (مەلامستەفا) کۆمەڵێك چەکدار چوون، کاتێك سوپای دوژمن زانی ئێمە رۆیشتینە پێشیان زیاتر نەهاتن لەوێ ماینەوە تا ماڵەکانیان بارکردنو رۆیشتن، کاتێك گەراینەوە زۆر درەنگ بوو بەشەو رۆیشتین بۆ ناو ماڵەکانی(زێرۆ بەگ)لە نزیك سنوری تورکیا هەر لە شوێنی هۆبەماڵەکانی (تەها بەگ) دەرکەوتین تووشی رێگایەکی دوورو سەختو نالەبار بووین، شەوێکی سارد تا بەسەر کەوتین تەواو هیلاك بووین، لە زۆر جێگا ئاگرمان دەکردەوە، پێش بەرەبەیانی لە هەندێ ماڵی کۆچەریەکان نزیك کەوتینەوە لاماندا ناو رەشماڵەکان تا بووە رۆژ لەوێ نەمان زانی (مەلامستەفا)و ئەوانی لەگەڵی بون رۆیشتبوونە ناو هۆبەبۆ ماڵی (زێرۆ بەگ)، ئەو شەوە لەرێگا (عبدالرحمن مفتیو محمدنجیب بەرواری)مان لەگەڵ بوون، لەبەر ئەوەی بەدرێژایی شەو رۆیشتبوین لە دوای پشوودانێکی تەواو دابەزینە ناو ماڵەکانی خوارەوە.

ئەوەبوو هەر لە(٤/١٧ تا٢١/٤/١٩٤٧) لە ناو ئەو هۆبەرەشمالانەی هەرکیەکان ماینەوە، ئەوەی شایانی باسە ئەو هۆبەمالانەی کۆچەریەکانی (هەرکی)، ئەوانەی سەر بە(زێرۆ بەگ) بوون ئەوەندەی لە دەستیان هات میوانداریان کردین کە جێگای رەزامەندیمان بوو. لە رۆژی(٢١/٤/١٩٤٧) لە ناو ماڵە کۆچەریەکان دەرکەوتین بەرەو دۆڵی (خواکورك) سەرەو ژێر رۆیشتینە خوارەوە بەناوخاکی کوردستانی عێراقدا بۆ ناو هۆزی برادۆست.

## بەشی چوارەم

# سەرەتای رێ رۆیشتنە دوورو درێژەکەمان بەرەو سۆڤیەت

لەدوای تێکچونی کۆماری مەهاباد لەرۆژهەلاتی کوردستاندا لەشکری بارزانیەکان خۆیان نەدایە دەستی سوپای هێرش هێنەر بۆ سەر کوردستان، وتووێژی نێوان حکومەتی ئێران و شێخەکانی بارزانی سەری نەگرت، نزیکەی دوومانگ شەڕ بوو لەگەڵ ئێران لەئەنجامدا بارزانیەکان گەڕانەوە عێراق، بەشێکی زۆری چەکدارەکان لەگەڵ (مەلامستەفا) مانەوەو چەکیان دانەنا رویان کردە کێوەکان، بۆ ماوەیەك گەڕانەوە کوردستانی عێراق، نزیکەی مانگ و نیوێك لەگوندەکانی (مزوری) مانەوە، بەرەبەیانی (٢١/٤/١٩٤٧) لەسێ کوچکەی سنورە دەستکردەکانی نێوان هەرسێ داگیرکەری دژ بەکورد (تورکیاو ئێران، عێراق) ئەوانەی زۆر لە مێژە دەسەلاتدارن بەسەر کوردستاندا، هەر کاتێك بزاڤ و شۆڕشێك سەری هەلدابێت لەهەر پارچەیەك هەرسێکیان یەك دەگرن بۆ دامرکاندنەوەی.

ئەو کەسانەی چەکیان دانەناو نەرۆیشتنەوە ژێر دەسەلاتی داروودەستەی (مەلیك) لەبەرزایی چیاکانی سەر سنوور بەرەو دۆڵی (خواکورك) دابەزین، ئەو شوێنەی ئێمەی پێدا تێپەڕ دەبوین دەبوایە بەناو هۆزی (برادۆست)دا بڕۆین، هۆزی ناوبراویش لەژێر دەسەلاتی بەگزادەکانیدا بوو، لە نێوان برادۆست و بارزانیەکانیش ناکۆکی هەبوو.

بەڵێ گەروە بەفراویەکەمان بەجێ هێشت و کەوتینە دۆلاییەك و شۆڕ بووینەوە ناو دۆڵێکی پڕ لە داروبار، لەشکر کۆمەڵ کۆمەڵ بەدوای یەکتردا دەرۆیشتنە خوار لە پێچ و گردۆڵکەکان دەرباز دەبوین، کشومات بەبێ دەنگی پێش ئەوەی تاریك دابکەوێت لە شوێنێك وەستاین چاوەڕوانی شارەزا بووین،کاتێك شارەزا هات دیار بوو یەکێك بوو لە کوڕە خاڵەکانی سلێمان بەگ کە ناوی (محمد شریف مجیدخان) بوو

ناوبراو پیاوێکی ڕێكوپێكو لێهاتوو بوو، دوو چەکداریشی لەگەڵ دابون ماوەیەکی تەواو لای باوکم دانیشت، ناوبراو لەلایەن بنەماڵەکەیانەوە ناردرابوو بۆ شارەزایی لەگەڵ ئێمە بێت تا لەهۆزەکەی ئەوان دەرباز دەبین، (محمدشریف) هەر لەسەر سنوری هۆزەکەیانەوە کەوتە پێشمان تا دوا گوندیان(دەریا سۆر) کاری ناوبراو هەر شارەزایی نەبوو، بەڵکو لەپێش لەشکر دەڕۆیشت ئاگاداری گوندەکانی دەکرد خۆراكو ئەو پێویستیانەی کە پێویستمان بوو دابین بکەن.

ئێوارەی ڕۆژی(٢٢/٤/١٩٤٧)گەیشتینە گوندی(ئەرموشە) ئەگەرچی گوندی ناوبراو چەند ماڵێك بوون ئێمەش(٥٠٠) چەکدار زیاتر بووین لەگەڵ ئەوەشدا پێشوازیەکی زۆر مەردانەیان لێکردین، ئەوەش ئەوە دەگەیێنێ کەوا پیاوەکانی(محمد شریف) دەپێشدا دەڕۆیشتن گوندەکانیان ئاگادار دەکردەوە بۆ خۆئامادە کردنیان کەوا لە شکر بەڕێوەیەو بەگوندەکەتان تێپەڕ دەبێت، بۆیە دەبێ خواردنیان بۆ ڕێك بخەن بەپێی تواناتان ئەگەر دووسێ ماڵیش بوون، بەلاّم توانیان نانی(٥٠٠) چەکدار زیاتر ئامادە بکەنو بەڕەزامەندی بەڕێمان بکەن، ڕۆژی(٢٣/٤/١٩٤٧) لەوێ کەوتینە ڕێ ئەو شوێنەی پێیدا تێپەڕ بووین شوێنێکی زۆر دڵگیرو خۆش بوو بەناو دارستانێکی چڕدا دەڕۆیشتین، کۆمەڵێك باسكو دۆڵوگەڕومان بڕی بۆ ئێوارە گەیشتینە گوندی(بەنی) گوندی ناوبراویش ئەوەی لە توانایدا هەبوو بۆیان کردین ئەو ڕۆژە لەو گوندە ماینەوە لەبەرئەوەی دەبوایە بەشەو بڕۆین ئەو ڕێگایەی کە دەبوایە پێیدا بڕۆین بەتەنیشت (کانیە ڕەش)دا تێپەڕ دەبوو، گوندی کانیە ڕەشیش مەخفەری پۆلیسی لێ بوو، ئێوارەی ڕۆژی (٢٤/٤/١٩٤٧) لەگوندی (ئارموش)ەوە دەرکەوتین شەو درەنگ گەیشتینە نزیك ئەو چۆمەی کە لە خوار کانیە ڕەش دایە، ئاگادار کراین لەو شوێنە زۆر بەنهێنیو ماتی بڕۆین نەدەبوایە بش کۆخین،کاتێك گەیشتینە چۆمەکە دیار بوو پڕبوو لەدار چنارو دار تریٓ ئاوی، تا بڵێی تاریك بوو چڕی دارەکانیش تاریکتری کردبوو، بەڕیز بەدوای یەکتردا دەڕۆیشتین لەبەر تاریکی زۆر خۆمان بەیەکتردا دەداو یەکترمان نەدەدی تا لەو چۆمە دەرباز بووین زۆر ئەزیەتمان دیت، بەرەبەیانی (٢٥/٤/١٩٤٧) گەیشتینە گوندی (دەریا سۆر) گوندی ناوبراو دەکەوێتە سەر لێواری ڕووبار ئەو ڕۆژە تا ئێوار، درەنگ لە دەریا سۆر ماینەوە، ئەو بەری ڕووبارەکە سنوری کوردستانی باکوور بوو (تورکیا) ئەو ڕۆژە زۆر

باش حەسابینەوە خزمەت گوزاری خەڵکی گوندیش جێگای ڕەزامەندی وحەسانەوەی زیاترمان بوو.

ئێوارە درەنگ لە ڕوبار پەڕینەوە بەری تورکیا ئەو شەوە بەدرێژایی شەو ڕۆیشتین شەوێکی تاریك و ڕێگایەکی هەورازو ناخۆش، لەگەڵ تاریك و ڕۆنی بەیانی لەسەر سنوری عێراق لە گەرووی زیتی لەگەڵ پۆلیسەکانی مەخفەر بوو بەشەڕ لە ماوەیەکی رۆر کورتدا مەخفەرەکە گیرا، لەو شەڕەدا یەکێك لە چەکدارەکانی ئێمە بریندار بوو کە ناوی(تیلۆ کەریم) کەلێتی بوو، ناوبراو بابو برایەکی لەگەڵمان بوون، گوللەیەك بەبەردەستی کەوتبوو بەهیچ جۆرێك خوێنی نەدەوەستا هەرچەندە (میرحاج) هەوڵێکی زۆری دا خوێنەکە نەوەستا هەوڵدانەکەی میرحاجیش بێ سوود بوو لەگوندی ئەرگۆش تەواو بوو. هەر لەو شوێنەی مەخفەرەکەی لێگیرا لەشکر دابەشی سەر گوندەکانی ناوچەی مزوری سەر بەبارزان کرا،ئەوەی شایانی باسە گوندەکان نیمچە چۆل بوون خەڵکێکی زۆر کەمیان تێدا مابوون، ئەوەی ماش بوو ساڵی (١٩٤٥) لەلایەن جاشەکان تالآن کرابوون، ئەوکاتە بەشی زۆری ماڵەکان ڕۆیشتبونە کوردستانی ئازادکراو لە دیوی ئێران ئەو ماڵانەشی کە مابوونەوە بەروبومێکی وایان نەبوو بەشی ژیانیان بکات، ئەوان لەو پەڕی بێدادیو پەرێشانیدا بوون،ئێمەشیان لێ پەیدا بووین باریان گرانتر بوو. لە پاش گرتنی مەخفەری (زیتی) ئەو ڕۆژە تا دوای نیوەڕۆ لەناو لێڕەواری نزیك گوندی (زیتی) ڕامان بوارد لەبەر ئەوەی شەو زۆر هیلاك ببوین لەڕێگا، باش نوستین دوایی چوینە سەر کانیاوێك لە بناری چیای (گەوەندی) ماوەیەکی خۆشیش لەوێ ماینەوە نزیك ڕۆژئاوا ڕۆیشتینە(ئەرگۆش) بەدرەنگەوە گەیشتینە گوندی ناوبراو، ئێمە تەنها بەشێك بووین گەیشتینە ئەرگۆش، ئەوەی زاندرا بەشەکانی تری لەشکر ڕۆیشتبونە گوندەکانی(سێلکەو مێرۆزو پێندرۆو سەرشنگیلو شیڤێ)و گوندەکانی تری مزوری بەتێکرایی لەبەر ئەوەی بەشی زۆری چەکدارەکان خەڵکی شوێنەکە بوون زۆریان کەسو کاریان لە گوندەکان مابوون پێ ڕانەگەیشتبون بڕۆنە ئێران. ئەوەی شایانی باسە بەتێکرای ئەو ماڵو منداڵەی لە ژێر سێبەری حکومەتی کوردستان دەژیان ناچار لە سەر ڕوباری(گادەر)ڕۆیشتنەوە ژێر دەستەلآتی حکومەتی عێراق چاوەڕوانی ئەوەبون بەڵکو لێبوردنێك دەر بکرێت، ئێمەش بەو نیازە گەڕاینەوە سەر کێوەکانی

ـەر سنوور. هەر لە(٢٦/٤/١٩٤٧)تا کۆتایی مانگی(٥/١٩٤٧) لەو شوێنانەی لە سەرەوە ناویان هاتووە ماینەوە چاوەڕوانی لێبوردنمان دەکرد، کەچی حکومەت هێزێکی زۆری سوپاو جاشەکانی بەڕێ کردە دەوروبەری ئەو شوێنانەی ئێمەی تێدا بووین بۆ لێدانمان.

## مانەوەی لەشکر لەدەڤەرا مزوری

وەك لە سەرەوە دیاری کراوە ئێوارەی ڕۆژی(٢٦/٤/١٩٤٧) لەشکر دابەشی سەر گوندەکانی دەڤەری مزوری کراو ئێمە ڕۆیشتینە گوندی(ئەرگۆش)، گوندی ناوبراو گوندێکی گەورە بوو دەکەوێتە بناری کێوی (گوەند) لەوێ دابەشی سەر ماڵەکانی گوند کراین بەگوێرەی لێوەشانەوەی ماڵەکان (منو حمدامینو رەحمان) لە ماڵێك داندراین خاوەنی ماڵەکە ناوی(ئیسماعیل) بوو ماڵی ناوبرار لەو پەڕی پەرێشانی دابوون لە ڕوی ئابوریو ژیاندا لە نانی (ئاردەخۆژەو بەڕوو کرۆسك) زیاتر هیچیان نەبوو، پێخۆریش دۆیان هەبوو ئەویش دراوسێکانیان پێیان دەدان، دەتوانم بڵێم ئەوەی لەپێش ئێمەدا، داندرا خواردن نەبوو زۆر بەشەرمەوە دەمان خوارد بۆمان نە دەگونجا نەگینا نەمان دەخوارد، ڕۆژێ سێ ئەستورکی بچوك لە ئاردی (کرۆسكو بەڕوو خۆژە) یان پێ دەداین لەوە زیاتریان نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دڵ فراوانو خزمەت گوزار بوون.

دەنگێکی دڵ تەزێن: لە ئەرگۆش دەنگێکی بەپەرۆش ڕاگەینرا زۆر دڵ تەزێن بوو ئەویش ئەوەبوو دوو ڕۆڵەی ئازاو گیان بەخت کەری لێ هاتووی بەدەست وبرد کوژران (عەریف عبدالرحمنو عزیز)، ئەوانە دەڵێن خەڵکی دەوروبەری هەولێر بوون، ئەودوو کەسە دڵسۆزە لەشەڕێکی خۆبەخۆیی کوژران، ئەوانە خۆیان دابووە دەست حکومەت لەو کاتەی گەیشتبونە ناو تێل دڕ لە دیانا دەبینن وا ئەو خەڵکەی کراونەتە ناو سیم دەیان گرن کە ئەمە دەبینن چەند کەسێك رادەکەنو بەرەو ناوچەی مزوری دێن شەو بەسەر سەنگەرەکانی ئێمەدا هەڵدەبن یەکتر ناناسنو لەیەکتر دەدەن لە ئەنجامی ئەو لێکدانەدا ئەو دوو کەسە کوژران کە جێگای پەرۆشی هەموولایەکمان بوو.

ئەو ماوەیەی لە ئەرگۆش بووین حکومەت ڕاسپاردەی ناردە لای(مەلامستەفا) داوایان دەکرد خۆمان بدەین بەدەستەوەو بەبێ مەرج چەك دابنێین، بەلاّم داواکەیان پەسند نەکراو ئەوە بوو حکومەت لە ژێرەوە سوپاو جاشی بەرێ دەکردە ناوچەی مزوری لە ڕێگای(مێرگەسۆر ـ شێروان مەزنو ئاکرێ)بۆ لێدانی هێزەکانی ئێمە، ئەو گەمارۆدانەی ئەو شوێنەی کە لەشکری ئێمەی تێدا بوو لە ڕێگای (ئاکرێ)وە سوپاو جاشەکانی(ڕێکانیو سورچی) بوون لە ڕێگای شێروان مەزنیشەوە سوپاو(برادۆست) ئامادە کرابوون.

(علی حیجازی)، دووجار مفەوەز(علی بەگی قەمچی ڕەش)ی بەڕێ کردە لای مەلامستەفا ڕای سپاردبوو کە بەمەلامستەفا بڵێ، ئەگەر لەسەر بەختی حکومەت دێن تسلیم دەبنەوە وەرن وە ئەگەر بەهیوای لێ بوردنیش بن چاوەڕێ مەبن. هاتنی(علی بەگ) بۆ ئەرگۆش لەگەڵ ئەو پۆلیسانەی لەگەڵی بوون دەنگوباسی بەسودمان پێ گەیشت دەربارەی ئەو ماڵو منداڵەی گەڕابوونەوەو لە دیانا، کە ئاخۆ چیان بەسەر هاتووەو کێ گیراوە، (حسن شێروانی) ئەوەی لەگەڵ (علی بەگ) بوو هاتبوو ڕونکردنەوەیەکی تەواوی لە بارەی ئەوانەی ڕۆیشتبونە دیانا پێ ڕاگەیاندین، (علی بەگ)یش زۆر بەمەردانە بەباوکمی گوت:(سلێمان بەگ ئاگاداری خۆتان بن حکومەت نیازی زۆر خراپە دەربارەی ئێوە، بەڵکو هەوڵ بدەن زوو چارەیەك لە خۆتان بکەن). ئەو ئاگادارکردنەوەی(علی بەگ) پێویستی بەلێکۆڵینەوە هەبوو لەبەر ئەوە هەر ئەوکات ڕۆیشتمە لای(میرحاج). شتەکەم پێ ڕاگەیاند ناوبراو گوتی: (ئێستا دەڕۆمە لای مەلا مستەفا پێی ڕادەگەیێنم نامەیەکیشمان لە ڕێکخراوەکانی ناو شارەوە بۆ هاتووە ئەوانیش داوایان کردووە کە خۆمان زوو ڕزگار بکەین، چونکە حکومەت خەریکی پیلانی لە ناو بردنتانە.

دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕاگەیاندنە ڕۆژی(١٧/٥/١٩٤٧) بەفەرمانی (بارزانی)، (مامند مەسیح شێروانی) لەگەڵ چەکدارەکانی بەڕێ کرانە سەر ڕوبار بۆ چاك کردنەوەی پردی نێوان (ئەرگۆش-دری)، پردی ناوبراو جاشەکانی(حسێن ئاغای هەرکی) خەراپییان کردبوو بۆ ئەوەی ئێمە دەربازی بەری(دری) نەبین حەرەسیشی لەسەر داندرابوون، ئەو کاتەش ڕوبار یەکجار زۆر بوو، پردەکەش لەو پردانەی سەردەمی پاشای گەورەی ڕواندز بوو دیار بوو پێ ڕیزەکانی وەك خۆی مابوون وەك

باسم کرد جاشەکان پردەکەیان تێك دابوو بۆ ئەوەی کەس نەپەڕێتەوە بەری(دری)، لەسەر بەرزایی پشتی پردەکەش سەنگەرێکیان دانابوو نۆبەتداری لە ناو دابوون بۆ ئەوەی ڕێگا نەدەن پردەکە چاك بکرێتەوە.(مامەند) پێش ئەوەی بڕواتە سەر پردەکە ئەو پێویستیانەی کە پێویست بوون ڕێکی خستن‌و ئامادەی کردن، بەو شەوە ڕۆیشتنە سەر ڕووبارو کەلوپەلەکانیشی لەگەڵ خۆی بردن، لە سەرەتاوە دوو کەسی ئامادەکردن بۆ ئەوەی بەنهێنی لەڕووبار بپەڕنەوە، ئەو کەسە یەکێکیان برازای خۆی بوو بەناوی(میران میرخان) ئەویتریان یەکێکی شانەدەری بوو، ئەو دوانە بەڕووتی لە ڕووبار پەڕینەوە لەوێ سەری گوریسیان قایم کردو بەو گوریسە چەند چەکدارێك پەڕینەوە بەنهێنی ڕۆیشتنە سەرسەنگەرەکەو جاشەکانیان ڕاونان ئەوکاتە دەستکرا بەچاککردنەوەی پردەکە، کاتێك پرد تەواو بوو وای لێهات پیادە بەسەری تێبپەڕێت·مامەند بەمنی گوت: (نامەیەك بۆ فقێ حسن بنووسە با بەمەلامستەفا ڕابگەیێنێ کە پردەکە تەواو بووە، ئینجا گوتی بەخۆت بڕۆ ئەوەی دیتت پێی ڕابگەیەنە پێی بڵێ کەوا پردەکە سازو ئامادەیە). لەسەر داوای مامەند گەڕامەوە ئەرگۆش‌و ڕۆیشتمە لای مەلامستەفاو پێم ڕاگەیاند کەوا پردەکە تەواو بووە، مامەند چاوەڕێی ئەوەیە خەبەری بۆ بنێرن بڕواتە(دری). مەلامستەفا ڕووی کردە سلێمان بەگ‌و شێخ سلێمان گوتی: (بەڕاستی مامەند مرۆڤێکی بەدەسەڵاتە ئەگەر حەز بکات لە فیل بەتواناترەو جێگای باوەڕە).

دوابەدوای ئەو ڕاگەیاندنە خەبەردرا مامەند بڕواتە(دری)و پیاوەکانی(مرادئاغای بیری)بڕۆنەوە (ستونێ)و گوندەکانی خۆیان، ڕۆژی(١٩/٥/١٩٤٧) مەلامستەفاو یاوەرەکانی گەیشتنە گوندی دری لە ماڵی حسێن ئاغای ڕاکردوو دابەزی (ملا محمەد) پیرە پیاوێك بەخۆی‌و چەند کەسێکەوە لە پێشوازی وەستا بوون مەلا محمد خزمی حوسێن ئاغا بوو، دیاربوو مەلامستەفای دەناسی، هەر ئەو ڕۆژەش (١٩/٥/١٩٤٧) لەڕێگای ئاکرێوە پیاوێك بەسواری ولاخ گەیشتە دری بۆ دیدەنی (مەلامستەفا) شەو لای مایەوە، ئەگەر بەهەڵە نەچووبم ناوی(سەیفەدین) بوو، ئەو شەوە بەدرێژایی شەو دووبەدوو لەگەڵ ئەو کەسە دانیشتن قسەیان دەکرد، وا دیار بوو ئەو کەسە ڕاسپاردراو بێت، بەڵام ڕوون نەبووەوە لەلایەن کێوە بەڕێ کراوە، بەیانی ڕۆژی(٢٠/٥)گەڕایەوە، مەلامستەفا ماوەیەکی لەگەڵ ڕۆیشت تا بەڕێی کرد.

کاتێك ئێمە گەیشتینە گوندی(دری) لە دابەش کردن عنو رەحمان لە ماڵی جولەکەیەك، داندراین ئەوەندەی بلێی ماڵێکی خزمەتگوزار بوون ئەگەر ژەمێك نەچووباین دەهاتنە دوامان.

رۆژی(٢٠/٥) مەلامستەفا ئەو میوانەی هەیبوو بەرێی کردو گەڕایەوە گوند، فقێ حسن داوای کرد ئەو پیاوانە برۆنە لای مەلامستەفا(میرحاج و عبدالرحمان و محەمەد نجیب) ئەوانی تریش (شێخ سلێمان و سلێمان بەگ و علی محمد صدیق) لای خۆی بوون، لە دەوری کاتژمێر دە مەلامستەفاو شێخ سلێمان و سلێمان بەگ بەسەرکەوتنە پشتی گوندی(دری) لە ژێردارەبەنە گەورەکان چاوەڕوانی ئەوانی تریان دەکرد ،کەچی ئەوان ئێوارە دەرەنگ گەیشتنە دری، رۆژی(٢١/٥/١٩٤٧) هەر لەو شوێنەی دیاریکراو(مەلامستەفا) داوایکرد ئەوانەی ناویان لە سەرەوە هاتووە ئامادە بن بۆ ئەوەی لەگەڵیان دابنیشێ، بۆ ئەم مەبەستە رۆیشتنە ژێر قەزوانەکانی پشتی گوند، بەشداربوەکانی ئەم دانیشتنە بریتی بوون لە(شێخ سلێمان بارزانی، میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی، سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، علی محمد صدیق بارزانی، عبدالرحمان مفتی ئامێدی، محمد نجیب بەرواری) دانیشتنەکە لەکاتژمێر دەی سەر لە بەیانی دەستی پێکرد ، ئەوەی دیار بوو لەکۆبوونەوەکە چەند خاڵێکی زۆر گرنگ خرابوونە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

١. دۆزینەوەی رێگایەك بۆ دەربازبونمان بۆ لایەك، لەبەرئەوەی حکومەتی عێراق لەگەڵ تورکیاو ئێران رێککەوتبوون بۆ لێدان و لە ناو بردنی ئێمە، ئەوەش لە نامەی رێکخراوەکانی ناو شاریش دیار کرابوو کە نوسیبویان خۆتان دەرباز بکەن پێش ئەوەی لێتان بدرێت، چونکە دوژمن بەنیازی لە ناو بردنتانن.

٢. رێکخستنی چەکدارەکان لە شێوەی(سریە)، لەشکر بەگشتی لە (٥٠٠) چەکدار زیاتر بوو هەر (١٠٠) چەکدار بکرێن بەیەك (سریە) فەرماندەیان بۆ دیاری بکرێت، ئەوانەی کرانە فەرماندە(مامەند مەسیح شێروانی، سعید وەلی بەگ شێروانی، حمدامین میرخان مێرگەسۆری، ئەسعەد خۆشەوی مزوری، مستۆ مێرۆزی).

٣. دیاری کردنی ئەو شوێنەی بۆی دەچین.

(بارزانی) ڕای وابوو بڕۆینە سوریاو لە ڕێگای خۆشمان دەستێك لە ڕێکانیەکان بۆشیندرێت، کەچی ئەوانیتر یەك دەنگ بیرو ڕایان وابوو بەرەو سۆڤیەت بڕۆین لە بەر ئەوەی هەر ولاتێکی بۆی بچوبایین لەوانە بوو بماندەنەوە دەستی عێراق، هەر چەندە گەیشتنە سۆڤیەت زۆریش زەحمەت بوو، بەلاّم تاکە ڕێگا بوو کە پەنای بۆ ببەین، لە دوای گفتوگۆیەکی زۆر(مەلامستەفا)ش ڕازی بوو بڕۆینە سۆڤیەت لە بەرئەوەی لەوێ بەولاوە هیچ چارەی تر نەدۆزراوە. بێگومان ئەوانەی لە کۆبونەوەکە لەگەڵ (مەلامستەفا) بەشدار بوون وەك ئەنجومەنێك سەیریان دەکرا، (شێخ سلێمان) یارمەتی دەربوو (میرحاج) بەرپرسی ڕێ ڕۆیشتن بوو ئەوانی تریش لەگەڵ (مەلامستەفا) دابوون، دوای کۆبونەوەکە ئاگاداری هەموو چەکدارەکان کرایەوە کە بێنە گوندی دری.

سەر لەبەیانی ڕۆژی(١٩٤٧/٥/٢٢) سەعید وەلی بەگ خۆیو چەکدارەکانی گەیشتە دری بەخۆی نەخۆش بوو لەداوێنی گوند لەناو خانویەکدا بوو چەکدارەکانی تازە گەیشتبوونە گوند هەندێکان لە سەر کانیاوەکەی خوار گوندی بوون، لەوکاتەدا شەش فرۆکەی بۆمبا هاوێژی عێراقی گەیشتنە سەر گوندی دری، شوێنەکانی دەورو بەری گوندی درێیان دایە بەر بۆمبای سوتێنەرو بۆمبای گەورە، دوو لە فرۆکەکان زۆر هەولیّاندا پردەکە خراپ بکەن ئەوانی تریش لەو شوێنانەیان دەدا کە بۆیان دەست نیشان کرابوو، ئەوەی پێیان بوو هەڵیان ڕشت لە ئەنجامی ئەو بۆمبابارانەیان نەدری دوو چەکداری(سەعید وەلی بەگ) شەهید بوون کە ناویان(تەمەر مستەفا بناوی، تەها عزیز سپیندار) بوون. هەر ئەو ئێوارەیە لە وێمان شاردنەوە، دوو بریندارى پەك کەوتوشمان هەبوون لەگەڵ خۆمان بردن تا گوندی(بێداو) ئەوەی دەکەوێتە زەوی کوردستانی باکوور.

# دەرکەوتنمان لە باشوری کوردستان
# بۆ ناو باکووری کوردستان

دوای ئەوەی بەدیارکەوت کەسوپای عێراقی خەریکی خۆ ئامادەکردنە بۆ هێرش هێنانە سەر ئەو شوێنانەی ئێمەی لێ بووین، پێش ئەوەی دوژمن دەست بەهێرش بکات لە شکری ئێمە شوێنەکانی جێ هێشت، ئەوە بوو ڕۆژی (۱۹٤۷/٥/۲۳) لەشکر بەتێکڕایی لە گوندی(ستونی) نزیك سنوری باکووری کوردستان کۆبوەوەو ئامادە بوو، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لە بن دارگوێزە گەورەکان ڕۆژمان بەسەر برد، ڕۆژئاوایەکی درەنگ(مامەند) لە گوند دەرکەوت‌و لە سنور ئاودیوو بوو لە دوای ئەو(حمدامین میرخان) ڕۆیشت، پێش ئەوەی تاریك دابێت گشتمان لە گەروەکە بەسەر کەوتین لەوێ دابەزینە خوار بەرەو گوندی (بێداو) گوندی ناوبراو کەوتۆتە دۆڵێکی زۆر قوڵ لە باکووری کوردستان، ڕوبار گوندەکەی کردۆتە دوو بەش بەشێکی سەر بەتورکیایەو بەشەکەی تری سەر بەعێراقە، شەو لەوگوندە ماینەوە، ئێوارەی ڕۆژی (٥/۲٤)گەیشتینە بێداو کاتێ تاریك داکەوتن بەرە بەیانی ڕۆژی(۱۹٤۷/٥/۲٥) لەگەڵ تاریك‌و ڕۆنی بەیانی مامند دەرکەوت تەورو بێڵیان لەگەڵ خۆبردن، لەگەڵ شارەزا زۆر لەگوند بەدوور نەکەوتن دەستیان کرد بەدروست کردنی پێپیلکە لە سەر بەفر تاسەر لوتکەی کێوە بەرزەکەی بێداو، ئەو هەموو لەشکرە بەو پێپیلکە دروست کراوانەدا سەرکەوتن لەقەد پاڵی بەرزایی کێوی بێداو دوو بریندارەکانمان گێڕایەوە بۆ بێداو(صالح حوسێن گووزی‌و حمۆ هۆزانی) بوون، ئەو دوو بریندارە هی ئەوە نەبوون بەشان لەو چیایە سەر بخرێن لەبەر ئەوە لە بێداو بەجێمان هێشتن. هەر لەبەرەبەیانی(۱۹٤۷/٥/۲٥) ئەو لەشکرە لە ڕێ ڕۆیشتن دابوو بەو پێپیلکە دروست کراوانەدا سەر دەکەوتن تا نزیك ڕۆژ ئاوا، لەگەڵ داکەوتنی تاریکی گەیشتینە گوندی(بای) لەدیوەکەی تری کێوی بێداو ئەگەرچی (بای) گوندێکی بچوك بوو لەگەڵ ئەوەشدا پێشوازیەکی زۆر باشیان لێ کردین‌و نانی ڕۆژی دواییشیان بۆ ئامادەکردین، چونکە دەیان زانی ڕۆژی دوایی ناگەینە ئاوایی بۆیە نانی ڕۆژی

دواییشیان بۆ ئامادە کردین. پێش ئەوەی ببێت بەڕووناك لەگوند دەرکەوتین‌و شارەزا بەپێشمان کەوت، هەرکە بوو بەڕوناك لەشوێنێك ناو دارو تەڕاشی زۆر چڕ خۆمان بووارد، بەدرێژایی ڕۆژی (٥/٢٦) لە ناو ئەو دارو تەراشانە زۆر بەنهێنی خۆمان حەشاردا لە بەر ئەوەی بیستبومان سوپای تورك بەڕێ کراوە بۆ ئەوشوێنانەی شکیان لێ دەکرد کە ئێمەی پێدا تێپەردەبین، لەبەر ئەوە دەبوایە بەوەستایی‌و وریایی بڕۆین بۆ ئەوەی لەگەڵیان توشی شەڕ نەبین، ئێوارەی ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی تاریك دابێت خۆمان پێچایەوەو ئامادە بووین بۆ ڕۆیشتن(مستۆ مێرۆزی)لەگەڵ کۆمەڵێك چەکدار دەستە دەستە کەوتنە ڕێ ئینجا هەموو لەشکر کەوتە ڕێ ئەو شوێنەی پێیدا دەڕۆیشتین ئەوەندە خۆش‌و دڵگیر دەهاتە بەرچاو هەر ئارەزوت دەکرد پێیدا تێپەڕ ببیت، شەو مانگە شەوێکی زۆر خۆش بوو لە شوێنێك لەشکر زۆر لەسەر خۆو بێ دەنگ دەڕۆیشت ئەوانەی کەوتبونە دۆڵی پێچاوپێچ چەکدارەکان بەدوای یەکتردا دەڕۆیشتن وێنەیەکی ئەوەندە جوان بوو دڵی مرۆڤی شاد دەکرد، وێنەکە وات دەزانی خۆراکی خواستی دڵمەو لێی تێر نەدەبووم، هەر ئەوەشە کە قەت لە یادم ناچێت‌و بەبەردەوامی ئاخی بۆ دەکێشم‌و هەموو کاتێك یادی دەکەمەوە.

درەنگی شەو گەیشتینە شوێنێکی زەلکاوی پڕ لە قامیشەلان، دەبوایە بەناویدا تێپەڕ ببین، بەناو ئەو زەلکاوەدا ڕۆیشتین تا دەرباز بووین. تەواو هیلاك بووین، لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەناو ئاودا ڕۆیشتین، ئەوەندە تەڕ ببوین شوێنێکی وشکمان نەمابوو تەڕ نەبوبێت، کاتێك دەرباز بووین گەیشتینە بناری چیایەك پشوێکماندا لەبەر ئەوەی زۆر هیلاك ببوین هەریەکەمان کە دادەنیشت لە جێگای خۆی خەوی لێ دەکەوت، ماوەی دە پانزە دەقیقەیەك، دوایی زۆر بەنهێنی هەریەکەی ئەوەی تەنیشتی خۆی وشیار دەکردەوە، دواتر کەوتینە ڕێ. پاش باران بوو گیا تەڕ بوبوو بەقەدپاڵی کێوەکەدا دەڕۆیشتین، بەلام چ ڕۆیشتنێك هەر هەنگاوێك جارێك دەکەوتین ! مەگەر هەر خۆمان بزانین هەریەکەمان چەند جارکەوتین!

بەیانی ڕۆژی(١٩٤٧/٥/٢٧) بەشی زۆری لەشکر بەسەرکەوتە سەر گەروەکە، بەلام ئەوەندە سەرما بوو باوڕ کرێودیەك بووکەس خۆی پێ ڕانەدەگیرا، هەرکەسەو هەوڵی دەدا هەنوانێك بۆ خۆی پەیدا بکات لە بن تاشە بەردێکی شاخەکە، دوای ئەوەی بەسەرکەوتین ئەوکاتە بەدردنگەوە تورکەکان دیتیان ئێمە لە چیا

بەسەرکەوتوین هەرئەوەندەیان بۆ کرا لە دوورەوە تەقەمان لێ بکەن، لە دوای تەقەی ئەوان دوو فڕۆکە هاتن بەسەر سنوردا سوڕانەوە، ئەوکاتە زۆربەی زۆری لەشکر ئاودیوی کوردستانی ئێران ببون، لە دوای ماوەیەك ئێمە گەیشتینە کوێستانی کۆچەریەکان، خواردنمان ڕێواسو ئەوگیایانە بوون کە دەخوران، ئەوانەی لە پێشەوە دەڕۆیشتن گەیشتبونە گوندی(جیرمێ) لە دیوی ڕۆژهەلاّتی کوردستان، ئێمە ئەوانەی لەدواوە بووین ئەو شەوە نەگەیشتینە گوندی ناوبراو لەچیا لەهەوارگەی ڕەوەندەکان ماینەوە لە ڕۆژی (٢٨/٥/١٩٤٧) گشتمان لە گوندی(جیرمێ) بەیەك گەیشتینەوە.

## لە ١٩٤٧/٥/٢٨ جارێکی تر پێمان نایەوە ڕۆژهەلاّتی کوردستان

بەڵێ پێش نوێژی نیوەڕۆی ڕۆژی(٢٨/٥) هەمومان لەگوندی جیرمێ لە سەر سنوور بەیەك گەیشتینەوە، گوندی ناوبراو دەکەوێتە سەرسنوور، ئەوەی بەدیارکەوت ئەو نۆبەتدارانەی لە بەرزاییەکانی گوند داندرابوون نەیان دەهێشت نەکەس بێت نە کەسیش بڕوات. دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ لەسەر داوای (میرحاج) کۆبونەوەیەکی بەرپرسەکان بەسترا لەو ماڵەی(مەلامستەفا)ی لێ میوان بوو بەشداربووەکان بریتی بوون لە(شێخ سلێمان، میرحاج، سلێمان بەگ، علی محمدصدیق، محمدنجیب، عبدالرحمان مفتی، ئەسعەدخۆشەوی، مامەندمەسیح، مستۆمیرزۆزی، سەعید وەلی بەگ، حمدامین میرخان)، لە کۆبونەوەکەدا (مەلامستەفا) گوتبوی: (دەڕۆینە سەر سنوری سۆڤیەت لەوێ لەناو هۆزی جەلالی دەمێنینەوەو پەیوەندی بەسۆڤیاتەکانەوە دەکەین، ئەگەر یارمەتیمان بدەن لەوێ دەمێنینو لەگەڵ ئێران شەڕ دەکەین). دیارە میرحاج بەوردی باسی ڕێگای کردبوو کە چۆن دەتوانن لەو ڕێ ڕۆیشتنە سەرکەوتووبن، ڕێگاکە دوورەو سەختیشە بێگومان کۆسپو تەگەرەی نالەبارو جەنگ دەبینن لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیم بەتینە کە بەسەرکەوتویی دەگەینە سنووری سۆڤیەت بەو مەرجەی فەرماندەکانی لەشکر لەگەڵ یەکتر پەیوەندی دار بن و وشیار بن، زۆر

شتی تریشی گوتبوو، لەو کۆبونەوەیەدا میرحاج کرابووە فەرماندەی ڕێ ڕۆیشتن وەك ڕێ نیشاندەر.

(هۆزی جەلالی) دەکەوێتە سەر سنوری سێ دەوڵەت(سۆڤیەت، تورکیا، ئێران)کێوە بەرزەکەی (ئارارات) لەسەر سێ کوچکەی ئەو سێ دەوڵەتەیە. ڕۆژی (١٩٤٧/٥/٢٩) سەر لەبەیانی مامەند لە جێرمێ دەرکەوت بەرەو بەرزایەکانی ڕێگای پێیدا دەڕوات بۆ گوندەکانی بەگزادەکانی(هەرکی) لە دەوەرا مەرگەوەڕێ، لە کاتێکا بەسەرکەوتینە سەر بەرزاییەکان پێشرەوەکانی پێشەوە دیتیان دووکەس بەچەکەوە لە دیوی لای تر بەسەر دەکەوتن پێش بگەنە لای پێشرەوەکانی ئێمە چاویان بەنۆبەتدارەکان دەکەوێت یەکسەر دەگەڕێنەوە دواوە زۆر بەگورجی شۆڕ دەبنەوە نۆبەتدارەکان هەوڵ دەدەن بیانگرن، بەلاّم ناگیرێن، ئەو دوو کەسە دەڕۆن بەگوندەکان ڕادەگەیەنن کەوا لەشکری (بارزانی) ئەوا دێت بەرەو گوندەکان، کاتێ ئاغاکان ئەم هەواڵە دەبیستن هەڵدێن و بەرەو (ورمێ) دەڕۆن، لەبەرئەوەی خۆیان بەتاوانبار دەزانی، چونکە لەگەڵ سوپای شا شەڕی بارزانیەکانیان کردبوو، دوو مانگ پێش ئەوە لەو شەڕانەی لەوێ کرابوون (هوردکۆ) کوژرابوو، ناوبراو لەو ئاغایانە بوو بەپێش سوپای ئێرانی کەوتبوو لە دژی بارزانیەکان، ئەوە بووە هۆی ئەوەی کەوا ئەوانیش ڕا بکەن.

بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ دابەزینە ناو گوندەکان(مەلامستەفا)و ئەوانەی لەگەڵی بوون ڕۆیشتنەگوندی (ئەمبی) لە ماڵی (نوری بەگ) دابەزین، نوری بەگ ڕای کردبوو چوبوە ورمێ، لەشکر دابەشی سەر گوندەکان بوو، ئێمە کۆمەڵێك چوینە گوندی(هوردکۆ) بیست چەکدارم لەگەڵ بوون، ئەوەی شایانی باسە پێشوازیەکی زۆرباشیان لێ کردین، ئەوەیان پێوە دیار نەبوو ڕق و قینیان هەبێت، میوانداریێکی زیادلە پێوبستیان کردین، پیرەژنێك هاتە لامان بەخێرهاتنی لێ کردین، دەرچوو دایکی هوورکۆ بوو.

ڕۆژی (١٩٤٧/٥/٣١) سەرلەبەیانی کاتێك ئێمە گەیشتینە گوندی (ئەمبی) دیار بوو نۆبەتدارەکانی مەلا مستەفاش وەستابوون چاوەڕانی ناوبراو بوون دەربکەوێت، ئەوەی بەلامەوە زۆر سەیر بوو یەکێك لە نۆبەتدارەکان بەبەرگی ئەفسەری کوردستان وەستابوو، کاتێك لیێ نزیك کەوتمەوە دەبینم(فەرزی بارزانی)یە

بەرگی(نوری بەگ)ی دۆزیوەتەوە، ئەو بەرگەی لە سەردەمی کۆماری کوردستان بەنوری بەگ درابوو نیشانەکانیشی هەر پێوە بوون، لە ڕێگا ئەو خەڵکەی فەرزی بارزانی دەدیت وایان دەزانی لێپرسراوی لەشکرە.

لەئەمبی دەرکەوتین بەرەو چۆمی(بیلە جووك) کەوتینە ڕێ ئەو شوێنەی پێیدا دەڕۆیشتین خۆشترین شوێنی ژیان بوو ئەویش بەوە بەدیار دەکەوت کاتی سەیری گوندەکانم دەکرد یەك لەوی تریان جوانتر دەکەوتە بەرچاو، گوندەکان بەتێکڕایی داپۆشراوی دارستانی دەست کردبوون دیار بوو زەویوزارەکانیشی بەشی زۆری بەراو بوون. ئەو ڕۆژە بەدرێژایی ڕۆژ لە دەشتاییەك ڕۆیشتین بەشەویش هەر بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن بۆ بەیانی ڕۆژی(١/٦/١٩٤٧) گەیشتینە گوندی(سێلوێ) لەوێ میوانی ئاغای ڕاکردوو (حسن تیلو) بووین ناوبراو پیرە پیاوێکی پیر بوو کاتێ زانیبوی ئێمە لە ڕێگاینو بەوێدا دەڕۆین هەڵاتبوە ورمێ، ئەوەی زاندرا ئەو پیاوە پیرە، پیاوێکی هیلاك بوو کەچی ژنێکی گەنجی لاوی هەبوو، ئەو ئافرەتە وەك مرۆڤێکی بەدەستەلاَت پێشوازی ئەو هەموو لەشکرەی کردو داوای لە میرحاج کرد نابێ ئەو لەشکرەی ئێوە دابەشی سەر ماڵەکان بکرێ، دەبێ خواردنی هەموو چەکدارەکان لە ماڵی ئەو ئامادە بکرێت، بەڵێ خواردنی هەموو لەشکر لەماڵی ئەو ئافرەتە دابەش کرا، بێگومان نۆبەتدارانی دەرەوەش خواردنیان بۆ بەرێ کرا ئەو شوێنانەی لێی نۆبەتدار بوون. تا ئێوارە درەنگ لەرگوندە ماینەوە پێش تاریك دابکەوێت لە سێلوێ دەرکەوتین بەرەو سنوری هۆزی(شکاك)کەوتینەڕێ، شەو تا بەیانی ڕۆیشتین ئەوە بوو بەیانی ڕۆژی (٢/٦/١٩٤٧) پێشڕەوەکانی پێشەوەی لەشکر ڕووبەڕووی جاشەکانی (عومەرئاغا)ی شکاك بوون، ناوبراو بەراسپاردەی حکومەتی شای ئێران بەرێ کرابوون بۆ ئەوەی ڕێگا لە لەشکر بگرێتو نەهێڵێت تێپەڕ بین، بەڵام پێشڕەوانی پێشەوە (مامەندو مستۆ مێرۆزی) کەوتنە دەستو برد هەر زوو ڕاویان نان نەمان زانی پیاوانی شاو عومەرخان بۆ کام لا ڕایان کردو پەرتوو بڵاو بوون.

(عومەرخان) یەکێك بوو لەئاغاکانی تیرەکانی هۆزی شکاك، بەڵام ناوبراو ناسراو بوو بەشا پەرست کەچی لەسەردەمی کۆماری کوردستان لەمەهاباد سوێندی خواردبوو بۆکۆمارو قازی لەسەر ئەوە پلەی بەرزی سووپایی کۆماری پێدرابوو، ئەوجا ئەو سوێندخۆرە پێش ئەوەی کۆماری کوردستان تێك بچێت ڕۆیشتەوە

بەردەرگای خزمەت کردنی شاو دارو دەستەکەی بۆ نۆکەرایەتی. دوا گوندی سەربەتیرەی عومەرخان گوندی(بالەکان)بوو پێیدا تێپەڕ دەبووین خەڵکی گوندەکە پێشوازیەکی زۆر گەرمیان لێ کردین ئەو لەشکرە دەستە دەستە دەگەیشتە ئەو گوندەو یەکسەر خواردنیان پێ دەدراو دەڕۆیشتن، تەواویش هەست دەکرا خەڵکەکە لە عومەرئاغا نارازی بوون.

ڕۆژی (٣/٦/١٩٤٧) گەیشتینە گوندەکانی سەر بەتیرەی سمایل ئاغا(سمکۆ) گوندەکانی(دێلزەو دوستانو حاجی جەفاو کۆزە ڕەش)، ئەم گوندانە لەیەك نزیك بوون، لەوێ بەسەر ئەو گوندانەدا دابەش بووین، گوندەکان لە ژێر دەستەڵاتی (تاهیرخان)دا بوون ناوبراو خۆی ڕای کردبوو لە دەسەڵاتی شای خوێنڕێژ، لەگوندی دۆستان پیرە پیاوێك لە خزمەکانی(سمکۆ) عەبدۆ ناوێك ئەوەندە بەسۆز پێشوازی لێ کردین بەتایبەتی لە(مەلامستەفا)و ئەوانەی لەگەڵی بوون باس ناکرێتو ناتواندرێت هەموی بنوسرێت، ئەو پیرە پیاوە تەمەن درێژە بەچاوی پڕ لە فرمێسك وەستابوو بەخێرهاتنی لە چەکدارەکان دەکردو دەی گوت: (خوا پشتیوانتان بێت خوا بتان پارێزێ لە دوژمنانی کورد). ئەو پیاوە دڵسۆزە لەسەر بانێکی پانو بەرین لە ناومان وەستابوو قسەی بۆ دەکردین زۆرجاری دوبارەی دەکردەوەو دەی گوت: ئاگاداری خۆتان بن باوەڕ بەدوژمن مەکەنو ووریا بن بەدرۆی دوژمن فریوو ندرێن باوەڕ بەخۆفرۆشان نەکەن، ئەو کوردە خۆفرۆشانە دوژمنی ڕاستەقینەی کوردن، ئەوانەن بونەتە کۆسپ لەڕێگای کۆششو خەباتی کورد. ئەوەی گوێی لە قسەکانی ئەو پیرە پیاوە بووبێ بۆی بەدیار دەکەوت کە چەند بەپەرۆش بوو بۆ خەباتو تێکۆشانی نەتەوەکەی.

دەبێ ئەوە بڵێین ئەو گوندانەی سەر بەتیرەی(سمایل ئاغا)بوون زۆر بەسۆزەوە بەپیرمانەوە دەهاتنو پێشوازیان لێ دەکردین، لە زۆر شوێن دەهاتنە سەر ڕێگا کەلوپەلی پێویستیان بۆ دەهێنایین وەك گۆرەویو پێڵاوو توتنو پەڕە جگەرە، زۆر دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش بوو کاتێ دەمدیت زۆر لە پیاوە پیرەکان کە ئێمەیان دەدیت دەگریانو دەپاڕانەوە لە خوا دەستیان بەرز دەکردنەوە دەستەو دوعا دەوەستان. ڕۆژی (٤/٦)یش لەو گوندانەی ناویان هاتووە ماینەوە ئەوەی شایانی باسە ئەو ناوچانە

زۆر دڵگیروخۆش بوون، بەڵام ئێمە خۆشیمان لێ نەدی لەبەر ئەوەی ئەوەندە ماندوو هیلاك بووین هەرجێگایەکی لێی بوەستابایین ئەگەر بۆ دە دەقیقەش بوایە دەنوستین.

ڕۆژی(٥/٦/١٩٤٧) لەگوندی(حاجی جەفا) لەشکر کرا بەدووبەش بەشێك زووتر ڕۆیشتە پێشەوە لەبەرئەوەی مەترسی ئەوە هەبوو نەوەك ڕێگاکە بگیرێت، چونکە زانیبومان حکومەت ئاغاکانی بانگ کردبوون چووبونە ورمێ لەوێ بەڵێنیان بەشا دابوو کە ڕێگا لە لەشکری(مەلامستەفا) دەگرن و نایەڵن تێپەڕبن بۆ سەر(ئاراس )، لەبەر ئەوە مامەندو مستۆ ماوەیەك لە پێش لەشکردا ڕۆیشتن بۆ ئەوەی ڕێگا ڕۆن بکەنەوە ئەگەر چی لەسەر ڕێگا هەبێت بزاندرێت بۆ ڕووبەڕووبونەوەیان، ڕێکەوتی (٦/٦/١٩٤٧) لە ڕێ ڕۆیشتن گوندی(هەولەران) کەوتە سەر ڕێگامان، ئەوەی گەیشتە گوندی ناوبراو پشوی دەکێشاو خواردنی پێ دەدراو دەڕۆیشت، بەڵام ئەوەی جێگای لەبیر نەکردنە گوندی ناوبراو تێکرا ووردو درشت هاتبوونە پێشوازیمان، ئەوەی لە گوند دەردەکەوت میرحاج لە سەر ڕێگا وەستابوو پێی دەگوتن بڕۆن زۆر بەوشیاری ئاگاداری یەکتر بن لە فلانە شوێن دەوەستن، فلانە گوندتان لەپێشە. ئەو ڕۆژەش بەدرێژایی ڕۆژ لەو شوێنە خۆشانە دەرۆیشتین، مرۆڤ لە دیدەنی ئەو دیمەنانەی دەکەوتنە بەرچاو تێر نەدەبوو، ئەوەندەی لەسەر خۆشی و دڵگیری ئەوشوێنە بنوسرێت هەرکەمە.

ئێوارەی ڕۆژی(٧/٦) هەموو لەشکر لە گوندی (بەردەڕەش) کەناودارە بە(بڕوش نەخۆر) لەوێ کۆبووینەوە ئێوارە درەنگ هەموو لەشکر لە گوندی بەردەڕەش ئامادە بوو، دەبوایە شەو بڕۆین، کاتی داکەوتنی تاریکی دوو فڕۆکەی ئێرانی گەیشتنە سەرگوند، لەوکاتە هەموومان لەناو گونددا بووین، فڕۆکەکان زۆر بەنزمی بەسەر گونددا دەسوڕانەوە، بەڵام ئێمە خۆمان ئاڵۆز نەکرد،خەڵکی گوند وایان دەزانی فڕۆکەکان هی ئێمەن، ئەوەی ڕاستیە فڕۆکەکان ئەوەندە نزم بوون هەرخۆیان لەدارەکان نەدەداو بەس، هەندێ لەچەکدارەکان بەخەڵکی گوندیان گوتبوو، ئەو فڕۆکانە پارێزەری ئێمەن خەڵکەکەش باوەڕیان کردبوو، ئەوە باش بوو فڕۆکەکان تەقەیان نەکرد. لەگەڵ داکەوتنی تاریکی لەشکر دەستە دەستە لەگوند دەرکەوت ئەو شەوە دەبوایە بەشەو بڕۆین لەبەر ئەوەی بەشوێنێکی مەترسیداردا تێپەڕ دەبووین، شەو ڕۆیشتین بەدرەنگەوە لەگەروێك سەرکەوتین، دیار بوو دیوەکەی تری

گەلیەکی زۆر قوولو فراوان بوو دەنگی بای ئەوبەرو ئەوبەری چیاو هاژەی ئاوی ناو گەلی ببوە ئاوازێکی زۆرخۆش هەرکاتێك کە بەیادم دێتەوە لە گوێم ئەزرینگێتەوە. ئەوێ سەرەو ژێر شۆڕ بووینەوە بەناو شوێنی هەوارگەی کۆچەرەکاندا دەڕۆیشتین ئەو شوێنەی لە وەرزی هاویناندا ڕەشمالیان لێ هەلّ دەدان، کاتێك گەیشتینە شوێنێکی گونجاو (مەلامستەفا)و ئەوانەی لەگەلی بوون دانیشتبوون لەگۆڕەپانێك لە قەدپالی چیا گوتیان ئێرە شوێنی هاوینەهەواری(سمکۆی شکاك)بووە، بەڕاستی ئەگەر شەویش بوو باسی خۆشی ئەو ناوچەیە ناکرێت ئەوەندە خۆش دەکەوتە بەرچاو تا دلّ حەز بکات، ئەو شارەزایەی لەگەلمان بوو گوتی: ئێرە گەلی (کوتولی)یە سمکۆی شکاك لەوەرزی هاوینان دەهاتە ئەو کوێستانە لەو کاتەی شەڕیشیان لەگەلّ ئێران دەکرد ئەو گەلیە شوێنی پاراستنی مالّومندالیان بووە. لەوێ ڕۆیشتینە خوار بۆ سەر ڕوبار لەگەلّ گزنگی هەتاو گەیشتینە سەر ڕوباری ناوگەلی، مامەندو مستۆ ڕۆیشتبون بەناو گەلیدا بۆ سەرەوە ئێمەش لە ڕوبار پەڕینەوە دەربازی لای تری ڕوبار بووین، لە ناو گەلیدا بەرەو سەرەوە ڕۆیشتین ڕۆژی (١٩٤٧/٦/٨) پێش نیوەڕۆ گەیشتینە دوو گوندی لەیەك نزیك لە سەرەوەی گەلی بەناوی(کەلێتەی سەروو کەلێتەی خواروو) دیار بوو مستۆ لەگوندی سەروو بوو مامەندیش لە گوندی خواروو بوو، مامەند لەو گوندەی لێی بوو دوو پۆلیسی ئێرانی گرتبوون، شەو کۆمەلێك ڕیش سپی گوندەکە ڕۆیشتبوونە لای(مەلامستەفا) داوایان لێ کردبوو کە ئەو پۆلیسانە بەر بدەنو هیچیان لێ نەکرێت، گوتبویان ئەگەر ئەو پۆلیسانە هیچیان لێ بکرێت دەولەت گوندەکانیان تێك دەدات. لەسەر داوای خەلکی گوند پۆلیسەکان بەردران بەمەرجێك نابێ بڕۆن تا ئێمە لەو گوندانە دەرباز دەبین، بەو بڕیارە خەلکی گوند زۆر شاد بوون. بەڕاستی شوێنی ئەو دوو گوندە زۆر لەباربوو بۆ مانەوەمان بۆ ئەوەی بتوانین کەل و پەلەکانمان بشۆین و پشووێك بدەین.

سەرلەبەیانی ڕۆژی(١٩٤٧/٦/٩) پێش ئەوەی لەو دووگوندە دەربکەوین چەکدارەکانی (مامەندو ئەسعەد خۆشەوی) بەگژیەکدا چوون(لاوکۆ)ی کوری مامەند تەقەی لە چەکدارێکی ئەسعەد کرد ناوی (حاجی هۆرەکاری) بوو، بەبڕیاری مەلامستەفا، لاوکۆ چەك کرا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك. ئەوەی هەست دەکرا پێش بەگژیەکداچوونی چەکدارەکانی مامەندو ئەسعەد ساردیەك لە نێوانیاندا ڕەچاو

دەکرا لە نێوان ئەسعەدو مامەند، بێگومان ئەسعەد یاوەری مەلامستەفا بوو پرس‌وڕای بەئەو دەکردن ئەویش مەترسی هەبوو لەو ڕیێ ڕۆیشتنە مامەندو مستۆ شوێنی ئەو بگرن‌و مەلامستەفا زیاتر ڕوو لەوان بکات‌و قسەیا لەهی ئەو باشتر بڕوات!.

لەڕێکەوتی (١٠/٦/١٩٤٧) سەر لەبەیانی مامەندو مستۆ لەگەڵ چەکدارەکانیان لەگوند دەرکەوتن لەبەرزاییەکانی (زارگەڵی) سەرکەوتن، چەکدارەکان پێچاوپێچ بەسەر دەکەوتن لە خوارەوە دەبیندران وێنەیەکی جوانی ڕێ ڕۆیشتنی دەخستە بەرچاو، لە کۆتایی گەلی بەسەرکەوتینە سەرەوە، لەوێش بەناو دۆڵاییەکدا ڕۆیشتین هەموو گردۆڵکەی زورگاوی بوون لەناو دۆڵەکە دوو فڕۆکە بەسەرماندا دەسوڕانەوەو شوێنەکەیان بەجێ نەهێشت، گوندێکمان لە پێش بوو نەچوینە گوندەکە، بەڵام تەنها پێشڕەوەکانمان چووبونە ناوگوند بۆ ئەوەی نانی ئێوارە ئامادە بکەن، چونکە دەبوایە بەشەوە بڕۆین، گوندەکە ناوی(ئەلەند)بوو، لەشوێنێکی زۆر خۆش بوو زۆریش گەورە بوو کاتێ کە شەو داهات بۆ وەرگرتنی خواردن چوینە ناو گوند، ئەوەی خواردنی پێ دەدرا دەرۆیشت، ئەو ڕۆژە زیاد لە ڕۆژەکانی پێشوو فڕۆکەکان تا تەواو تاریك دانەهات ئەو ناوەیان جێ نەهێشت‌و بەسەر گوندەکەدا دەسوڕانەوە، وەك بڵێیت دەیانزانی لە گوندەکەین، بەڵام تەقەیان نەکرد، گوندی(ئەلەند)زۆر گەورە بوو خەڵکی گوند میوانداریەکی باشیان کردین، شەو لەو گوندە دەرکەوتین، ئەو شەوە بەدرێژایی شەو ڕۆیشتین. بەیانی ڕۆژی (١١/٦) گەیشتینە دوو گوندی لەیەك نزیك کەناویان(بەلەسۆرو بەلەڕەش) بوو لەوێ لەشکر بوو بەدوو بەش، بەشێك لەبەلە ڕەش مانەوە، بەشەکەی تریش ڕۆیشتە بەلە سۆر، بەڕۆژ لەو گوندانە ماینەوە، چونکە دەبوایە بەشەو بڕۆین، شەو کەوتینە ڕێ نیوەی شەو لە بەرزایەك سەرکەوتین بەناو کوێستانێکی زۆر خۆشدا دەڕۆیشتین، ئەگەر شەویش بوو زۆریش ماندوو بووین، بەڵام دیار بوو شوێنەکە کوێستانە، بەیانی ڕۆژی(١٢/٦) زانیمان کوێستانەکە ناوی کوێستانی(حاجی بەگ)ە کاتێ بوو بەڕۆژ سەیری هەرلایەکت دەکرد وەك وێنەی مافووری ڕەنگاوڕەنگ دەهاتە بەر چاو هەرجۆرە گوڵێك کەهەبێت لەو کوێستانە دەکەوتە بەرچاو، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لە ناو مێرگ‌و گوڵزار دەڕۆیشتین، ئێوارەی ئەو ڕۆژە گەیشتینە دووگوند کەناوی

یەکێکیان(عەمبار)بوو ئەوی تریان ناوم نەنوسی بوو گوندەکان لەیەك نزیك بوون لە گوندی(عەمبار) شارەزایەکمان لەگەڵ هات ئەو پیاوە ناوی(میرزا) بوو تەمەنی دەگەیشتە شەست ساڵو بەسەرەوە تریش، دەرکەوت پیاوێکی پاکو دڵسۆز بوو، بەڵگەش ئەوەیە ئەو ڕێگایەی دیار کرابوو ئێمەی پێدا بڕۆین ئەو ڕازی نەبوو بەو ڕێگایەدا بڕۆین، بەهەمان شێوەش کاتی ڕۆیشتنیشی گۆڕی،(میرزا عەبدی)، لەگەڵ میرحاج ڕێك کەوتن بەو ڕێگایەدا بڕۆن، ئەوەی میرزا دەستنیشانی کردو کاتیشی گۆری بۆ تێپەڕبوون لەو شوێنەی مەترسی لێ دەکرا لەنزیك سنووری تورکیا، ئەگەر لەو شوێنە ئاشکرا بووباین لەدوو لاوە لێمان دەدرا ئەو ڕێگایەی(میرزا) دیاری کردبوو دوورتر بوو، بەڵام سەلامەت تر بوو لەبەر ئەوە داوای شارەزا پەسەندکراو ئەو لەگوندەکەی(میرزا) دەرکەوتینو لە شوێنە مەترسی دارەکە بەسەلامەتی دەرباز بووین، بەیانی(٦/١٣) گەیشتینە ناو ڕەشماڵەکانی (مستەفا بەگ) شوێنەکە کوێستان بوو هۆبە هۆبە ڕەشماڵ هەڵدرابوون، لەشکر بەسەر ڕەشماڵەکان دابەش بوونو سەرەك هۆزەکە مستەفا بەگ، ڕای کردبووە ناو حکومەت، زانیمان چووبوو چەك وەربگرێت بۆئەوەی شەڕی ئێمەی پێ بکات، کەچی خەڵکەکە زیاد لەپێویست ڕێزیان گرتینو میوانداریان کردین، دوای نیوەڕۆ لەشکر سەرەو ژێر ڕۆیشتە خوار بۆ گوندەکانی دەشتێ ئەو گوندانەی دەکەوتنە پێشمان بەشی زۆری ئازربیجانی بوونو زاوایان تورکی بوون، پێش ئەوەی بگەینە گوندەکان لە بناری بەرزاییەکان گەیشتینە عەتارێکی عەجەم کەلو پەلیان لێ کریبوو پارەیان پێ نەدابوو عەتارەکە ڕۆیشتبووە(لای مەلامستەفا) شکایەتی کردبوو جەنابی مەلامستەفاش داوای کرد هەموو لەشکر بوەستێ، لە شوێنێك لەسەر داوای مەلامستەفا لەشکر هەمووی وەستا ئینجا گوتی: (پێم بڵێن کێ ئەو عەتارەی ڕووت کردۆتەوە)؟ عەتارەکە چاوی بەحکیم پێندڕۆیی کەوتو گوتی: (ئەوەیان لەگەڵ بوو، ئەویش شتی برد پارەی نەدا)، مەلامستەفا گۆپاڵی سەروە بن کردوو دووسێ گۆپاڵی بەشانو ملی تاوبراوادا، دیار بوو (شێخ ئۆمەری شانەدەری) پێی گوتبوو: (ئەزبەنی من گوێ بیست بووم ئەو کاتەی عەتارەکە ڕوت دەکەنەوە زرار لەوێ بووە)، یەکسەر بانگی کردمو گوتی: (ڕاست بلێ کێ بوو شتەکانی عەتاری برد؟) منیش گوتم: (کاتێك من گەیشتمە لایان پیاوەکانی حەکیمو بابکەییەکان دەورەی عەتاریان دابوو ئەویش

داوای پارەی دەکرد پێی دەگوتن شتەکانتان بردووە پارەکەم بدەنێ، بەڵێ شتەکەیان بردوو پارەیان نەدایێ، زۆریشم پێگوتن شەرمە پارەکەی بدەنێ کەس گوێی نەدامێ بۆیە من ڕۆیشتم). لەوکاتەدا شێخ سلێمان برازای خۆی گوتی: (مام من زانی دوای ئەوەی گورگۆی بابکەیی تێر خورمای عەتاری خواردوە ئەوجا دەستی بەحەیوحۆ کردووە گوابە حالّی هاتۆتێ).

(گورگۆ) پیاوێکی چوارشانەی بەهەیکل بوو، هاتە پێش مەلامستەفا وەستا، ناوبراو گوتی: (تۆش شتی عەتارت خواردو حالّیشت گرت؟) هەر ئەوەندەی گوت دایە بەر گۆپالّو لێی دا، بەلاّم سلێمان بەگ گرتی نەیهێشت زیاتری لێ بدات، بێگومان کەس نەیدەتوانی بیگرێت لە سلێمان بەگ زیاتر، هەر ئەوکاتە سلێمان بەگ بەفقێ حەسەنی گوت: (عەتارەکە ڕازی بکەو با بڕوات). لە دوای ئەو ڕووداوە لەشکر کەوتە ڕێ لەو دەشتە بەرەو گوندەکانی(ئاغاداش‌و کلێسە) دیار بوو پێش بگەینە ناو گوندەکان خەڵکەکە لەگوند دەردەکەوتن‌و ڕایان دەکرد ،کاتێك گەیشتینە ناو گوند ماڵەکان دەرگاکانیان بەکراوەیی بەجێ هێشتبوون ئاژەڵەکانیشیان هەروا بەجێ هێشتبوو، ئەو گوندانە کەسیان تێدا نەمابوو تەنها ئەوانە نەبێت کە پیرو پەککەوتە بوون، میرحاج هەر زوو ئاگاداری لەشکری کرد بۆ ئەوەی دەست لە هیچ نەدرێت تەنیا خواردەمەنی نەبێت، تەنانەت کوشتنەوەی مریشکێکیش قەدەغەیە. شەو بەشێکی زۆری ئەو لەشکرە لەو گوندانە مابنەوە، بەلاّم(مامەندو مستۆ) ڕۆیشتبوونە پێشەوە لە نزیك ئەو گەرووەی ئێمەی پێدا تێپەڕ دەبووین بۆ دیوی دۆڵی ماکۆ، گوندێك لەوێ هەبوو بەناوی (ئاوەجاغ) چووبونە گوندی ناوبراو، شەو بەدرەنگەوە هەندێ لە ڕاکردوەکان گەڕانەوە ئەوانەی گەڕابونەوە، دەیان گوت:(ئێمە لەبەر ئەوە ڕامان کرد، چەند ڕۆژێك بەرلە ئێستا کارمەندانی دەوڵەت ئاگاداریان کردین کەوا هەندێ کوردی پیاو کوژو خوێن ڕێژ پەیدا بووینە مرۆڤ دەخۆن لەبەر ئەوە داواتان لێ دەکەین خۆتان مەدەنە دەستیان هەرکاتێ ئەوانە پەیدا بوون زوو پێمان ڕابگەیەنن با لێیان بدەین لەبەر ئەوە ئێمەش ترساین).

# شەڕە دژوارەکەی شازدە کاتژمێری لەدۆڵی ماکۆ

شەوی (١٣ لەسەر ١٤/٦/١٩٤٧) هەست بەئالۆزیەك دەکرا نیوەی شەو دوو سوار گیران نەیان دەزانی ئێمە لەگوندەکانین لەو دوو گیراوە زاندرا کەوا لەشکرێکی زۆر لە هۆزەکانی کوردو ئازربیجانی چەکدار کراون‌و ئەوان هاتوون بۆ لێدانی ئێمە، بەلاّم پێش ئەوە ئەوان دەست بوەشێنن بەرەبەیانی رۆژی (١٤/٦/١٩٤٧) لەگەلّ ئاسۆی بەیانی لە هەر چوار دەوری ئەو گوندانەی ئێمەی لێ بووین چوار دەورمان گیرابوو بەهۆزی چەکدار کراوی کوردو ئازربیجانی،کاتێك هێرشیان بۆ هێناین بەو نیازە بوون بەدەست بمانگرن، بەلاّم قارەمانانی ڕێ ڕۆیشتن ڕوبەڕویان بوونەوەو هەر زوو ڕاویان نان بەماوەیەکی زۆر کورت پەرت و بلاّو بوون بەشکاوی هەر هەندێك بۆ لایەك هەلاّتن، لەگەلّ رووناکی رۆژ دوو فرۆکەی جەنگی گەیشتنە سەر شوێنی شەڕ بەبۆمباو شێستیر تەقەیان دەکرد لەو شوێنانەی دەیانزانی ئێمەی لێین، ئێمەش بەدوایانەوە بووین ڕاومان دەنان، لە گەرمەی ڕاونانی جاشەکان لەوکاتەدا ڕاسپێردراوی (مستۆو مامەند) بەرێ کرابووە لای مەلامستەفا بۆ ئەوەی بەپەلە بڕۆین بگەینە گەروەکە لەبەر ئەوەی هێزێکی زۆری سوپای دوژمن بەرێوەیە بەرەو گەروەکە دەڕۆن خەریکن بەسەر دەکەون وا ئێمە دەڕۆینە پێشیان.

لەدوای ئەوەی ئەم هەوالّەمان بۆ هات ڕاسپێردراوی مەلامستەفا(میرحاج) داوای لە(حمدامین) کرد بەپەلە بڕوات بۆ سەر گەروەکە بۆ یارمەتی دانی مامەندو مستۆ، بۆ ئەوەی ئەو هێزەی دوژمن کە هاتووە بیگێڕنەوە دواوە.

لە دوای ڕۆیشتنی حمدامین، جەنابی (مەلامستەفا)و ئەوانەی لەگەلّی بوون بەرەو گەرووەکە بەرێ کەوتن، سریەکانی(سەعیدو ئەسعەد خۆشەوی) لە شوێنەکانیان مانەوە نەوەك هێزی جاشە بەزیوەکان بگەڕێنەوەو لەدواوە هێرش بێننەوە. پێش ئەوەی بەسەر گەروەکە بکەوین زۆر بەگەرمی دەنگی تۆپەکان دەهات بەبێ وەستان دیار بوو شەڕێکی زۆر دژوار بوو، کاتێ بەسەر گەروەکە کەوتین سەیری ئەو دیومان کرد جێگای سەر سوڕمان بوو ئەو دۆلّە فراوانەی نزیك پردەکە شوێنی بەتالّی تێدا نەدەبیندرا لەبەر خیوەتی سوپا، هەر گردێك چەند تۆپێکیان لەسەر دانا بوو،

سوپایەكی زۆریش لە ڕێگا دابوو بەرەو ئەو گەروەی دەهات ئەوەی ڕێگای ئێمەی پێدا دەڕۆیشت، بەلاّم (مامەندو مستۆ) هەریەكە لەلایەك بۆیان دابەزی بوون پێشیان لێ گرتبوون، لێكدانێك بوو مەگەر هەر ئێمە بزانین چی بوو، حمدامینو چەكدارەكانی گەیشتنە یارمەتیان شەڕگەرم تر بوو سوپا بەنیاز بوو پێ بچەقێنێ، ڕۆڵە دلێرەكانی ڕێ ڕۆیشتن بەورەیەكی بەرزی پیاوانەو چاو نەترس دەجەنگان لە مەیدانی جەنگدا.

مەلامستەفاو ئەوانەی لەگەڵی بوون شێخ سلێمانو علیو سلێمان بەگو عبدالرحمانو محمد نجیبو ئەوانی تریش لە قەدپاڵی چیا لە بەرزاییەك بەدووربین سەیری ئەو شەڕەیان دەكرد، ئەوەی لە نێوان پاڵەوانانی ڕێ ڕۆیشتنو سوپای ئێرانی جەرەیانی هەبوو لەمەیدانی شەڕدا، بێگومان بەشی زۆری ڕۆڵە بەتواناكانی لەشكر دابەزینە ناو سەنگەرەكانی ڕووبەڕووی ئەو شەڕە خوێناویە لەبەر ئەوەی شەڕی مانو نەمان بوو، دەبوایە دەرباز ببینە بەرەكەی تری ڕووبار ئەوانیش پردوو دەوارەكانیان گرتبوو چاریش هەر ئەوە بوو بەلولەی تفەنگ ڕێگا بكەینەوە ئەگەر نیوەشمان تێ بچین، دەبوایە ڕێگا هەر بكرێتەوە.

لەكاتی نوێژی نیوەڕۆ شەڕ ئەوەندە گەرم بوو تەقە نەمابوو تەنها دەنگی هاشە هاش دەهات، كاتێك وای لێ هات لەگەڵ سەربازەكان تێك هەڵ بووین، لە ئەنجامی لێك دانێكی خوێناویدا سوپا ناچاركرا پاشەكشە بكات بەرەو دواوە ڕابكات، ئەوەی لە مەیدانی شەڕ مابوو تانكەكان بوون لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە نەوەستاین تانكەكانمان بەجێ هێشتن . بەدوای شكستەكەی سوپاكەوتین،شوێنەكەمان پێ چۆڵ كردنو ڕۆیشتنەوە مۆڵگاكانیان، لەو شەڕوپێكدادانەی ئێمەو سوپا جەنابی مەلامستەفا بەدووربین سەیری دەكرد شەڕەكەی لێوە دیار بوو، باش دەیبینی كێ لەو شەڕە دژوارە دا بەرەو دوژمن دەڕوات گیان بەخت كەرە. زۆر جار خۆی باسی ئەو شەڕە خوێناویەی دەگێڕایەوە. بێگومان پاڵەوانیەتی(مستۆ مێرۆزیو مامەند شێروانی) هیچ كەسێك ناتواتێ بیشارێتەوە بەخۆیانو چەكدارەكانیان خۆبەختكەرانی تریش ئەوانەی شان بەشانی ئەوان لە ناو سەنگەرەكانیان بێ ترس دەجەنگان لەو شەڕە دژوارە خوێناویەی هەر لە بەیانیەوە تا ڕۆژئاوا لێك دان بوو، تا ئەو كاتەی سوپا شكاو بەرەو دواوە بەشكستی شوێنەكانیان پێ چۆڵ كراو گەڕانەوە زیانێكی زۆری گیانیو ماڵیان لە دوا بەجێما، كوشتارێكی زۆر لە سوپا كرا جگە لەوەی چەكێكی زۆریش تێك

شکێندراو تەرمێکی زۆریش لە مەیدانی شەڕەکەدا کەوتبوون، کەل و پەلی سەربازی ئەژمار نەدەهات کەبەجێیان هێشتبوو، ئەوەی بۆ ئێمە زۆر پێویست بوو بارهەڵگرەکان بوون وەك هێستر.

پێویستە ئەو ڕاستیە بڵێم ژمارەی کوژراوەکان نەدەزاندرا چەند بوون، لەبەر ئەوەی ڕووبەری مەیدانی شەڕەکە زۆر فراوان بوو شەویش بەسەر داهات کەس لەو توانایەدا نەبوو لەوکاتو ساتەدا بچێت کوژراو بژمێرێت، مەگەر لەدوای ئێمە خۆیان بیانزانیبێت کوژراوو برینداریان چەندن، هەروەها ژمارەی دیلەکانیش دیار نەبوون بەتەواوی، لەبەر ئەوەی زۆریان هەر لە شوێنی خۆیان ئازاد کرابوون ئەوانەی مابوون ئەوانیش بەرەڵا کران، ئەوەش ئەوە دەگەیێنێ ئێمە زیاتر پێویستیمان بەخۆ ڕزگار کردن هەبوو.

ئێوارە درەنگ دوای شکانی سوپا،نزیك کەوتنەوە لە ڕووبار، مەلامستەفا دابەزیە خوارو لە شوێنێك وەستا مامەندو مستۆی بانگ کردن دەستێکی خستە سەر شانی مستۆو ئەوەی تریشی خستە سەر شانی مامەندو گوتی:(ئەوەی ئێوەو چەکدارەکانی ئێوە کردووتانە ئەو مێرچاکیە هەر خۆم ئەو نرخە دەزانم، ئێوە بوونە نیشانەی سەربەرزی بنەماڵەی بارزانو بارزانیەکان، ئەو مێر چاکیەی ئێوە لە بیر کەس ناچێت. مەلامستەفا زیاتر دواو ناوی کۆمەڵێك لە چەکدارەکانی هێنا ئەوانەی لەو شەڕەدا ئازایەتیان دیار بوو، لە دوای تەواو بونی قسەکانی جەنابی مەلامستەفا، لەشکر تێکرا دەستی بەڕۆیشتن کردەوە بەپێشڕەوی ئەو شارەزایەی لەگەڵمان بوو، مامەند بەرەو دەراوی ڕووبار ڕۆیشت(مستۆ)ش لەگەڵ چەکدارەکانیو هەندێکی تریش ڕۆیشتنە سەر پردەکە، پردەکە سەنگەری دوژمنی لێ بوو،پێش ئەوەی ئێمە بگەینە سەر ڕووبار لەسەر پردەکە بوو بەشەڕ، شەڕێك کە تەنها ئاگر باران بوو، ئێمە زۆر بەنهێنی ڕۆیشتینە سەر دەراوی ڕووبار لەبەر ئەوەی دەمانزانی سەنگەرەکانی دوژمن لە تەنیشت دەراوی ڕووبار هەن، ئەو دەراوەی ئێمە دەمان ویست پێیدا دەرباز بین، کاتێك گەیشتینە سەر دەراو هەندێك پەڕینەوەو هەندێك لە ناو ڕووبار دابوون، بووبەتەقە لەسەنگەرەکانی نزیك دەراو تەقەیان لێ دەکردین لە ئەنجامی ئەو تەقەیەدا یەکێکمان لێ شەهید بوو بەناوی(محمد مەلا محمد) مێرگەسۆری.

ئەو شەڕەی لە بەرزاییەکانی(سووسۆز) کرا دژوارترینو درێژترین شەڕبوو هەر لە بەیانی لێکدان بوو تا نزیك ڕۆژئاوا، تەنها بۆ ماوەیەکی کورت شەڕ وەستاو دیسان دەستی پێ کردەوە تا نزیك بەیانی، ئەوەی دیار بوو لە شەڕی بەیانی تەنها سێ بریندارمان هەبوو ئەوانیش(مەلی لێری، حاجی گوزی، صالح سپینداری) بوون کەچی لە شەڕی شەو لە سەر ڕوباری(زەنگی) شەهیدێكو حەوت بریندارمان هەبوون. زۆر بەپەلە لە ڕوبار دەربازبوین لە کاتێکا شەڕ لە سەر پرد گەرم بوو لەگەڵ چەکدارەکانی مستۆ، ئێمە ئەوانەی لە ڕوبار بوین پەڕینەوە کەوتینە دەشتێك زۆر نالەبار بوو هەموی پەرێزە برنج بوو، گوڵە برنجەکان پڕبوون لە ئاوی باران تا دەرباز بووین زۆر ئەزیەتمان خوارد، ئێمە پێشڕەو بوین کاتێك نزیك کەوتینەوە لە گردەکان هێشتا هەر تاریك بوو دەنگی دوو تفەنگ هات لە قەد پاڵی بەرزاییەکان هەر زوو مامەند داوای لێ کردین بەپەلە بڕۆین بگەینە گردەکان نەوەك دوژمن پێش ئێمە ئەو گردانە بگرێت، لەسەر ڕاسپاردەی مامەند دەستەیەکمان لە چالاکەکان ڕۆیشتین، لەبن گردەکان، ڕێگای ئۆتۆمبێل هەبوو، هەندێ چەکدارمان لەوێ بەجێ هێشتن نەوەك دوژمن بێت بەنیازی ڕێگا گرتن. ئێمە سەرکەوتین بۆ سەر گردەکان، کاتێ بوو بەڕوناك سەیری پێش خۆمان کرد دیار بوو لەو گردەی ئێمەی بۆ دەچوین چەند کەسێك دیار بوون بەناچاری بەپارێز بۆیان چووین کاتێك لێیان نزیك کەوتینەوە بۆمان دەرکەوت کە چەکدارەکانی مستۆن گەیشتبونە ئەوێ بەپەلە ڕۆیشتینە لایان بینیمان (مەلکۆ)ی برازای مامەندە ئەوانەی لەگەڵ مستۆ چووبون، دیار بوو بریندارە پێش ئەوەی بۆمان بدوێت کە چۆن بریندارکراوە ناوبراو داوای ئاوی لێ کردین ئاومان پێ نەبوو،ئەوجا داوای جگەرەی کرد،یەکسەر جگەرەیەکم بۆ پێچایەوەو دامە دەستی، کەمێك لایان وەستاین زۆری بۆ پەرۆش بووم ئەوان ڕایان گەیاند کەوا کۆمەڵێك برینداری تریشیان هەیە هەردوو برازای مستۆ مێرۆزی علیو جادر بریندارن کە هەردووکیان برابون،ئێمە ئەوانمان بەجێهێشتو ڕۆیشتین دەبوایە سەربکەوینە سەرەوە بەرەو گوندی(هاسون) بڕۆین لەوێ ڕۆیشتین لە گردەکان سەرکەوتینە سەر، لەخوار گوندی(هاسون) لەسەر کانیاوێك وەستاین پشوێك بدەین دیار بوو بەینی کانیاوەکەو گوند هەموو کردار بوو گەنم وجۆبوو گوندیش لە شوێنێکی بڵند بوو، خوارەوەی گوند هەمووی باغو باخچەبوو، لە هەردوو لای گوند

ەوە (قولله) واتا قونگرە هەبوون دەست کردی دەوڵەت بوون، لە کۆنەوە لەوێ دروست کرابوون وەك سەنگەری شەڕ. پێیەوە دیار نەبوو شتێك لە گوند هەبێت، چیشمان نەدەکردەوە خەڵکی گوند ڕابکەن، لەدوای پشویەکی کورت هەستاین بەرەو گوند سەر کەوتین کەمێك نزیك کەوتینەوە گەیشتینە ناو گەنمەکانو دیاربوو خەلکی گوند بەگشتی بەرەو ماکۆ دەڕۆیشتن وا پێ دەچوو ڕایان دەکرد، کاتێك لە گەنمەکان دەرچووین هەر ئەوەندەمان زانی لە قوللەکانەوە لەملاو ئەولای گوندی (هاسون) دراینە بەر گولله هەر ئەوەندەمان پێ کرا بلاوە بکەینو بەپارێز بۆیان بچین، لەگەڵ (محمودی عالی یە درێژی هەودیانیو ڕەحمانوعزیزوکریم) توانیمان خۆمان بگەیەنینە ناو باخچەکان، نزیك کەوتین لە قوللەکان دوای ئەوەی زانیان زیاتر خۆیان پێ ڕاناگیرێ، ئەوانیش ڕایان کردو بەرەو ماکۆ ڕۆیشتن ئێمە گەیشتینە ناو گوند ئەو گوندەش هیچ کەسی تێدا نەمابوو دەرگاکانیان ئاوەلا بەجێهێشتبوون، هیچیان لەگەڵ خۆیان نەبردبوو، خەڵکی ئەو گوندە گەورەیە بەزۆری ئازەربێجانی بوون، ئەوانیش دیارە وەك گوندەکانی (ئاغە داشو کلێسە) پێیان گوتراوە، ئەو گوندە دیارە چەکیان هەبوە، بۆیە بەو شێوەیە گەورەو بچوکیان ڕایان کردبوو گوندیان بەجێهێشت کاتێك گەیشتینە ناو گوند هەرزوو نۆبەتدارمان لە شوێنە پێویستەکان دانان لە دەوری گوند.

زوو نامەیەکم بەرێ کرد بۆ میرحاج بۆم نووسی:(ئێمە دەستەی پێشڕەو گەیشتینە گوندی هاسون، بەلام خەڵکی گوند ڕایان کردوە وەك گوندەکانی ئاغەداشو کلێسا دەرگاکانیان بەئاوالایی بەجێهێشتوەو هیچیان نەبردوە)، نێردراوەکان لەرێگا لەسەر کانیاوی خوار گوندی دەگەنە مەلا مستەفاو ئەوانەی لەگەلی بوون سلێمان بەگ دەپرسێ:(بۆ کوێ ئەچن)؟ ڕەحمان دەلێت: (نامەیەکی زرارمان پێ یە بۆ میرحاجی دەبەین). فقێ حسن نامەکەیان لێ وەردەگرێت لە دوای خوێندنەوەی دەلێت: (میرحاج لە دواوەیە لەگەڵ بریندارەکان دێت من وەلامتان بۆ دەنوسم). ناو براو نوسیبوی: (برام زرار من ڕاسپێردراوەکانم گەڕاندەوە تکایە چەکدارەکان ئاگاداربکەنەوە دەست لە ئاژەڵەکانو پەلەورەکان نەدەن بەهیچ جۆرێك تەنیا خواردەمەنی دەتوانن بەکاری بێنن.

(هاسون) گوندێکی زۆر گەورەیە لە قەدپاڵی بەرزاییەکی بەرزە لەسەرەوەی گوند کانیاوێك هەڵ دەقوڵێت بەقەد ئاش گێرێك دەبێت، لە سایەی ئەو ئاوە هەر چوار دەوری گوندەکە باغو باخچەیە دارو درەختێکی زۆریشی هەیە باسی خۆشیو هەڵکەوتنی گوندی هاسون ناکرێت ئەوەندە خۆشە. ڕۆژی (١٩٤٧/٦/١٥) ئێمە بەیانی کاتژمێر ده گەیشتینە ناو هاسون بۆ ئێوارە هەموو لەشکر گەیشتە ئەو گوندە لەو گوندە وامان دیار دەکرد لایەکمان بوە بەهی خۆمان، لەبەر ئەوەی گوندی هاسون سەرەتای هۆزی(جەلالی)بوو، کاتێك بریندارەکان گەیشتنە ناو گوند ڕۆیشتمە لایان ئەوەی زۆر بەئازار بوو جادری برازای مستۆو مەلی لیڕیو مەلکۆ زێرۆ بوون، ئەوانی تر ئەوەندە بەئازار نەبوون.

سەرلەبەیانی ڕۆژی (١٩٤٧/٦/١٦) سێ چوار چەکداری (عمرئاغای جەلالی) هاتنە لای مەلامستەفاو لەگەڵی دووانو گەڕانەوە، پێش ئەوەی لە گوند دەربکەون دووفڕۆکەی بۆمبا هاوێژ گەیشتنە سەر گوند، ئەوەی پێیان بوو هەڵیان ڕشت،لە دواییدا یەکێك لە فڕۆکەکان بەشێستیر تەقەی لە گوندکرد، لە ناو کۆڵانەکەی ئەو خانووەی (مەلی لیڕی) برینداری لە ناو دابوو گوللەیەك بەمەلی دەکەوێت تەواوی دەکات، ئەو هەموو چەکدارە لەوێ بوون کەس چی پێ نەکەوت، تەنیا بەو بریندارە کەوتو تەواوی کرد. لەکاتێکدا خەریکی شاردنەوەی(مەلی) بووین(حاجی، گوزی)ش تەواوبوو، ئەویشیان لەوێ شاردەوە، بێگومان شەهید بوونی(مەلی)جێگای نیگەرانی هەموومان بوو لەبەر ئەوەی پیاوێکی ئازای لێهاتوو بوو، یەکێك بوو لە پاڵەوانەکانی ئەو شەڕە مەزنەی دۆڵی ماکۆ.

لەدوای شاردنەوەی ئەم دوو شەهیدەی ڕێ ڕۆیشتن چوومە لای جادر، ناوبراو دۆستێکی زۆر ئازیزم بوو دیار بوو زۆر بەئازار بوو، لەوێ لەگەڵ مستۆ کەوتمەقسە، ناوبراو بەدرێژی باسی شەڕی سەرپردێی بۆ گێڕامەوە کە چۆن بوو چۆنیش دەرباز ببون، مستۆ گوتی:(لە سەرەتاوە لە سەنگەرەکانی سەر پردماندا شەڕێکی گەرمی ئاگرین لەسەر پردەکە کراو پردمان لێ پاك کردنەوە، دوای ئەوەی لە پردەکە پەڕینەوە دەربازی بەرەکەی تر بووین چەند چەکدارێك لەگەڵم مانەوەو پردمان بەجێ نەهێشت تا ئەوان هاتن لەوکاتەش تانکێك لێمان نزیك کەوتەوەو تەقەی لێ کردین ئەو کۆمەڵەی لێ بریندار کردین، بەلام جادرو مەلکۆ لەسەر پردەکە بریندار بون، ئەوە

باش بوو بریندارەکان هەمویان بەپێی خۆیان دەڕۆیشتن تا برینەکەیان گەرمە برین بوو، ناوبراو زیاتر لەسەری ڕۆیشتو گوتی: (ئەو شەڕەی لە سەر پرد کرا شەڕە نێزە بوو ئەوسەربازانەی هەلاَتن بەیارمەتی تانکەکان دەربازبوون لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە کوژران زۆری نەماوە بڵێم کوژراوەکان ئەوەندەی هی ڕۆژ دەبوون ئەوانەی، بەڕۆژیش کوژران خۆت لەگەڵ بووی دیتت چەند زۆر بوون. ئەوەی شایانی یادکردنەوەیە ئەو دوو ڕۆژەی لە(هاسون) ماینەوە پشوێکی زۆر باش بوو باش حەساینەوە، دیار بوو تا ئێمە نەڕۆیشتین خەڵکی گوند نەگەڕایەوە، ڕۆژی(٦/١٧) بەیانی لە هاسون دەرکەوتین پێش نیوەڕۆ گەیشتینە شوێنێك، کۆمەڵێك بنەداری بناوی گەورە گەورەی لێ بوون ئاوەدانی لێ نەبوو، دیار بوو شوێنەکە چۆل بوو.لە ژێر ئەو دارانە حەسانەوەو نیوەڕۆمان لەو شوێنە بەسەربرد، لەو کات وساتەی حەسانەوەماندا (صالح)ی برینداریش تەواو بوو لەوێ شاردمانەوە لەو کاتەی خەریکی شاردنەوەی (صالح) بووین دوو فڕۆکەی جەنگی بەوشوێنەدا دەسوڕانەوە، بەلاَم بۆیان دیار نەبوو ئێمە لەوێین، بەلاَم لە شوێنەکە بەشك بوون زۆر گەڕانو سوڕان هیچیان بۆ دیار نەکەوت ئەوجا ڕۆیشتن، دوای نیوەڕۆ لەوێ بەڕێ کەوتین لەگەڵ داکەوتنی تاریکی گەیشتینە یەکەم هۆزی جەلالی.

بەپێی بەڵێنی سەرۆك هۆزی جەلالی دەبوایە ئێمە لەناو هۆزی جەلالی بمێنینەوەو شەڕی ئێران بکەین کەچی ڕۆژی (٦/١٨) زانیمان کەوا(عومەرئاغای جەلالی) ڕاسپێردراوی حکومەتی ئێران بووە بۆ ئەوەی ئێمە ڕابگرێت تا سوپاکانی ئێرانو تورکیا دەتوانن ڕێگای (ئاراس) مان لێ بگرنو لەناومان بەرن تا لەئاراس، نەپەڕینەوە بۆ سۆڤیەت، ئەو ئاگاداریەش لەلایەن یەکێك لەبرازایەکانی (عومەرئاغا) بەسەرکردەکانی ڕێ ڕۆیشتن ڕاگەیەندرا، عومەر ئاغا هەستی کردبوو ناپاکی ئەو بەسەرکردەکانی ڕێ ڕۆیشتن گەیشتووە زوو ڕایکردو ڕۆیشتە ماکۆ، لەدوای ڕاگەیاندنی ئەو لاوە دڵسۆزەی ئەو هەواڵەی ڕاگەیاند بوو بڕیاردرا بڕۆینە سەر ڕوباری ئاراس، لەو دەمەشدا میرحاج لەسۆڤیەت گەڕایەوە ڕەزامەندی ئەوانی هێنابوو کە بپەڕینەوە بەری سۆڤیەت لەوکاتەدا ڕۆیشتینە سەرئاوی ئاراس بۆ پەڕینەوە بۆناو خاکی سۆڤیەت.

لەوکاتەی بەتەواوی زاندرا دەپەڕینەوە لە ئاراس، یەکێك کە ناوی (عادل بەگ) بوو کەهەر لەسەرەتای دەرچونمان لە عێراق لە ڕۆژی(٢٣/٥/١٩٤٧)وە گەیشتبوە ڕیزی چەکدارەکانی بارزانی ناوبراو لەکوردەکانی تورکیا بوو ئەو پیاوە ڕازی نەبوو بپەڕێتەوەو داوای گەڕانەوەی کرد، لەسەر ئاراس گەڕایەوە بەخۆیو ئەو دوو چەکدارەی لەگەڵی بورن، دیار بوو ئەو پیاوە نەدەوێرا بپەڕێتەوە بۆ بەری سۆڤیەت وەك هەست دەکرا گومانێکی لێ دەکرا!

پەڕینەوەمان بەم شێوەیە بوو: لە شوێنێکی نزیك ڕوبار دەراوێك دۆزرایەوە، لەو دەراوە دەست کرا بەپەڕینەوە لەسەر ڕاسپاردەی مەلامستەفا بەهەموو مەلەوانەکان ڕاگەیەندرا بەشێوەیەکی تایبەتی شانەدەریەکان ئامادەبن لەسەر لێواری ڕوبار بوەستن بۆ ئەوەی ئەگەر هاتوو یەکێك بکەوێتە ئاو، بیگرنەوە، دەبێ ئەوەش بڵێین کەوا بەشی زۆری هێزەکەمان لەوپەڕی هیلاکی دابوون لە برسان، ئەگەر چاودێری نەکرابان ترانایان زۆر کەم بوو بپەڕنەوە. لەوکاتەی خەریکی پەڕینەوە بووین دوو فڕۆکەی ئێرانی گەیشتنە سەر ئەو شوێنەی ئێمە لێی دەپەڕینەوە تەقەیان لەوانەی ناو ئاو دەکرد، بەلاّم دیار بوو سۆڤیەتیەکان زوو ڕاویان نانو ڕۆیشتن لەو کاتەشدا (حمدامین میرخان) ڕاسپاردەی ناردبوو بۆ لای پردی (زولفا)و سوپایەکی زۆر بەرەوە لای ئێمەدێت، شکی تێدا نیە بۆ لێدانی ئێمەیە، میرحاج گوتی:(ئەوەی لەخۆی ڕادەبینێو زۆر هیلاك نیە بڕۆن بۆ یاریدەی (حمدامین میرخان)، لەسەرداوای(میرحاج) کۆمەڵێکی زۆر لە چالاکەکان کەوتنە ڕێ بەرەو شوێنەکە ڕۆیشتن، زۆریان بەو هیوایە ڕۆیشتن بەڵکو لەجانتای سەربازەکان نانیان بەدەست دەکەوێت، بەڵێ بەڕاستی بوو بەلێکدان، کاتێ تانکەکان هاتن خۆمان لێیان لادان، تا لێمان تێپەڕبوون، ئەوکاتە زۆر بەوەستاییو ڕێکی دەست لە سوپا وەشێندراو بەشکاوی بەرەو دواوە گەڕاوە، باش بوو خواردنی سەربازەکانمان دەست کەوت بەبەر ئەوانیش کەوت، ئەوانەی هێشتا نەپەڕیبونەوە لە ڕوبار.

ئەوەی بەدیار کەوت پێش ئەوەی بپەڕینەوە لە ئاراس، شێخ سلێمانو میرحاج هەوڵێکی زۆریان لەگەڵ (میرزا)ی شارەزا دا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ناو ماڵومنداڵی خۆی، ناوبراو ڕازی نەبوو بگەڕێتەوە، دەیگوت: (ماڵومنداڵی منیش لەمنداڵی ئەوانە هەموویان زیاتر نیە ،ئەوانەی لە ئاراس دەپەڕنەوە).

دەربارەی ڕوباری ئاراس: ڕوباری ناوبراو گەورەیە، بەڵام زۆر مەندو لەسەرخۆیە واهەست دەکرێت ناڕوات، لەو شوێنەی ئێمە لێی پەڕینەوە زۆر بەرین بوو بەپێیان لە دەراو دەربازی بەری لای سۆڤیەت بووین، ئێمە لە نزیك كێوە بەرزەكەی(ئارارات) كە دەكەوێتە سێ كوچكەی سنورەكانی ئێران وتوركیاو سۆڤیەت پەڕینەوە لە ئاراس، هۆزی (جەلالی) دەكەوێتە سەر لێواری ڕوباری ئاراسو لە كێوی ئارارات تا نزیك پردی(زولفا)لە ناوەوەش تا ماكۆ دەڕوات، بەڵام شوێنێكی ئەوەندەی بڵێی سەختە، هەمووی كێلە بەردو كەندو كۆڵانی ناهەموارە، كۆمەڵێك گۆماوی گەورە لە نزیك ڕووباری ئاراس هەن، زەوی كشتوكاڵی ئەوەندە نیە زۆركەمە، بەشی زۆری خەڵك خەریكی بەخێوكردنی ئاژەڵن شوێنەكەیان بەڕاستی شوێنی بەخێوكردنی ئاژەڵەو شوێنێكی فراوانە. هۆزی (جەلالی) هۆزێكی شۆڕشگێربوون مێژوی جولانەوەكانیان لە لاپەڕەی مێژوودا هەیە.

ڕۆژی (١٩٤٧/٦/١٩) ڕۆژی پەڕینەوە بوو لە ڕووباری ئاراس هەر لەو دەمەی دەست بەپەڕینەوە كرا دەستەی مەلەوانەكان لەسەر لێواری ڕوبار وەستابوون، ئەو خەڵكەش كۆمەڵ كۆمەڵ دەپەڕینەوە ئەوەی دەپەڕیەوە چەكی دەدایە سەربازەكانی سۆڤیەتی ئەوەی چەكی دادەنا سەربازەكانی سۆڤیەتی دەیان بردنە شوێنێك پارچە نانێكیان پێ دەدان، لەوكاتەی گشتمان دەرباز بووین ئێوارە زۆر درەنگ بوو هەر ڕایان گرتین تا مەلامستەفا لەگەڵ مەلەوانەكان نەپەڕیەوە ئێمە بەڕێ نەكراین، كە ئەوان پەڕینەوە ئەوكات بەئۆتۆمبێلەكانی سوپا بەڕێیان كردین بەرەو شاری (نەخچیوان) شەو بەناو شاری ناوبراودا تێپەڕبووین، بردیانین لەلاپەڕگەیەكی شاری ناوبراو لە شوێنێكیان دانایین، شوێنەكە چۆم بوو دەورو بەری باخچە بوون، با بۆ ئاگاداری ئەوەش لەبیر نەچێت ئەوكاتەی لەڕوباری ئاراس پەڕینەوە بەری سۆڤیەت ئەوەی پێمان بوو لەگەڵ خۆمان پەڕاندەوە، دەتوانم بڵێم كۆنە پێڵاوێكمان بەجێ نەهێشت.

ئەوەی جێگای سەربەرزیو شانازیە سەركەوتنی ڕێ ڕۆیشتن بۆ نەیارانی كوردی بەدیار خست كەوا جەنگاوەری كورد نەبەزیەو نابەزێ، دەتوانێ سەر بەدوژمن شۆڕ بكات، ئەو سەركەوتنەی ئێمە وەڵامی ملهوڕانە بوو بۆ ئەوانەی دەیان گوت: (ئەگەر خواش لە باوەشی خۆیان بگرێت هەر نایەڵین مەلامستەفاو چەكدارەكانی بگەنە

یەکێتی سۆڤیەت)، بەلاّم بەشەرمەزاری‌و سەر شۆری دیتیان لەشکری سەربەرزی گەیشتە یەکێتی سۆڤیەت.

بێگومان سەرکەوتنی رێ رۆیشتن خۆی لەسێ خاڵی گرنگدا دەنوێنێ:

یەکەم: گشت چەکدارەکانی رێ رۆیشتن لە ژێر فەرمانی بارزانی دا بوون هەموویان گوێ رایەڵی فەرمان بوون زۆر بەرێکی.

دووەم: ئەو کەسانەی لەرێ رۆیشتن بەشدار بوون یەك پارچە گیان بەختکەر بوون لە پێناوی گەیشتن بەئامانج ئەویش تەواو کردنی رێ رۆیشتن بوو.

سییەم: لێپرسراوی رێ نیشاندەر میرحاج دەورێکی کاریگەری هەبوو لە دەست نیشان کردنی رێگا لەگەڵ رێ رەوانی رێ رۆیشتن، بەتایبەتی مامەند شێروانی‌و مستۆ میرۆزی‌وخۆیان‌و ئەو چەکدارانەی لەگەڵیاندا بوون.

ئەو رێگا دورەی ئێمە بریمان رێ رۆیشتنێکی مێژویی بوو، لە مێژووی کۆڵنەدانی نەتەوەی کورددا بوو لەپێناو بەدەستهێنانی ئاواتی کورد ئەویش ئازادی‌و سەربەخۆیی کوردستانە.

بەشی پێنجەم

# دوازده ساڵ زیاتر پەنابەریەتی لەیەکێتی سۆڤیەت

## دەربازبوونمان لەئاوی ئاراس بۆ بەری سۆڤیەت:

وەك دیارکراوە لە دوای دەربازبوونمان لە ڕوباری (ئاراس) بەئۆتۆمبێلی سوپا شەو بەرێ کراین بەرەو شاری (نەخچیوان) پایتەختی ئۆتۆنۆمی نەخچیوان، لەوێ لەلاپەڕگەیەکی شاری ناوبراو لە چۆمێك داندراین، پاسەوانیشیان لە دەورە دانابن، شوێنەکە دارودرەختی (سونجی)وداری بەری بوون، شەو نووستین بەبێ غەم بەیانی زانیمان کە(مەلامستەفا) لەگەڵ دوو کەسەکەی تر بەناوی (سەعیدو زیاب) لە نەخچیوان ماونەتەوە لەگەڵ ئێمەیان نەهێناون. زیاتر لە مانگێك لەو شوێنە ماینەوە، ئەوەندەی لەوێ ماینەوە لە ژێر چاودێری بووین، زۆر بەوردی چاودێریمان دەکرا، بەتایبەتی لە ڕوی تەندروستیەوە بەردەوام پزیشکەکان سەریان دەداین زوو زوو دەرزیان لێ دەداین، ماوەی ئەو چل ڕۆژەی لەوێ ماینەوە چەندین جار خراینە ژێر چاودێری پزیشکیەوە بۆ دوور خستنەوەی نەخۆشییەکان، بریندارەکان بەرێ کرابونە نەخۆشخانەی نەخچیوان پاش ماوەیەکی کەم بریندارەکان چاك بوونەوەو گەڕانەوە لامان بەتایبەتی(جادرو مەلکۆ)، چونکە ئەو دوانە برینداری مەترسی دار بوون.

شاری (نەخچیوان) شارێکی گەورەیە دەکەوێتە نزیك ڕوباری ئاراس، دانیشتوانی نەخچیوان بەزۆری (ئازەربیجانی کوردو ئەرمەنیو ڕوسی)و نەتەوەکانی تریش لەگەڵیان دەژین، شاری ناوبراو کەوتۆتە بن چیا بەرزەکانی قەفقاس. ئەو ماوەیەی لەو چۆمە ماینەوە وەزعی ژیانمان زۆر ناساز بوو، خۆراکێکی زۆر کەمان پێ دەدرا، تەنانەت شەوێکیش بەزگی تێر نەدەنوستین، لەگەڵ ئەوەشدا بەزۆری خەریکی فێربونی پیتەکانی ڕووسیو هەندێ وشەی پێویست بوم بەیارمەتی مامۆستای دڵ پاکی کوردایەتیو هەست بەرز میرحاج ئاکرەیی.

ڕۆژی (١٩٤٧/٧/٢٠) مەلامستەفایان هێناوە لامان، دوو ڕۆژ لەدوای هاتنەوەی ناوبراو لەڕۆژی (١٩٤٧/٧/٢٢) بەشێکمان بەڕێ کراینە ناوچەی (لاچین) دانیشتوانی ناوچەی ناوبراو کوردن، ناوچەی لاچین دەکەوێتە بەرزاییەکانی ناو کێوە بەرزەکانی بشتی نەخچیوان بەگوێرەی بەرنامەکەیان پیاوەکانی(ئەسعەد خۆشەوی و سەعید)بەئۆتۆمبێلی سوپا بەڕێ کرابوون لەوێ بەسەر (کەلخۆزەکان)* ی ناوچەکەدا دابەش کران هەرچەند کەسێك لە گوندێك داندران بۆ ئەوەی لەوێ کار بکەین.

ڕۆژی (١٩٤٧/٧/٣٠) بەشی دووەمیش بەڕێ کراین، سەر لەبەیانی ڕۆژی دیاریکراو چەند ئۆتۆمبێلێکی سوپا هاتن ئەوانەی مابوون ئەوانیشیان بارکردن و بەرەو بەرزاییەکانی سەرووی نەخچیوان کەوتینە ڕێ، پێچاوپێچ بەسەرکەوتین ئۆتۆمبیلەکان ئەو ڕێگا هەورازە شاخاویەیان دەبڕی و سەردەکەوتن ئەو دیمەنە جوانە وێنەیەکی دڵگیری دەخستە پێش چاو، ئێوارە کاتی ڕۆژئاوا بەناو ئەو شارۆچکەیەدا تێپەڕین خەڵکی شارەکە بەچاوێکی نا بەدڵ و ناشیرین سەیری ئێمەیان دەکرد، وایان دەزانی ئێمە دیلین لەشەڕ گیراوین، خەڵك بەدوامان کەوتبوون دەیان ویست بەردبارانمان بکەن، بەلاّم ئەو ئەفسەرانەی لەگەڵمان دابوون لێیان بەدەنگ هاتن.

ئەو ڕۆژە هەر لەبەیانیەوە بەناو کێوە بەرزەکاندا دەڕۆیشتین و سەردەکەوتین لەو ڕێ ڕۆیشتنەدا زۆر شوێنی خۆش و شارو شارۆچکەی جوان وڕێك دەکەوتنە سەر ڕێگا، بۆ ئێوارە لەگەڵ داکەوتنی تاریکی گەیشتینە شاری (لاچین) وەك دیارکراوە دانیشتوانی شاری ناوبراو کوردن، شارەکەش ناوەندی قەزایە، ئێمەیان بردە ناو قوتابخانەیەك زۆر گەورەبوو، ئەو شەوە لەوێ ماینەوە لەدوای نان خواردن هەندێکمان ڕۆیشتینە سینەما فیلمێکی هیندی کاری دەکرد، ئەگەرچی تێشی نەدەگەیشتین لەگەڵ ئەوەشدا بەلامانەوە زۆر خۆش بوو لەبەرئەوەی زۆربەمان فلیم مان هەر نەدیبوو.

ڕۆژی (١٩٤٧/٧/٣١) بەیانی تا ئۆتۆمبێلەکان ئامادەبوون سەیرێکی شاری (لاچین)مان کرد شارەکە لە شوێنێکی زۆر بڵندبوو دەورو بەری چیا بوون پێشەوەشی کراوە بوو تا بڵێی شوێنێکی خۆش بوو، لەناو شار بەڕێکەوت لەیەکێکمان پرسی کە ناوی (سوڵتان عەزیزۆف) بوو ئەو کێوە بەرزانە ناویان چیە؟ ناوبراو گوتی:(بەگشتی

---

* کەلخۆزە : کەرتی هەرەوەزی ئەهلی

پێیان دەگوترێت کێوەکانی (قەفقاس) یەکسەر فالّ گرەوەکەی کەرکوکم بەبیرهاتەوە کە پێی گوتبوم: (دەڕۆیتە کێوەکانی قەفقاس)، لەوکاتەدا چەند هەڤالێکی خۆمان نەوانەی لەگەلّ (ئەسعەد خۆشەوی) بەڕێ کرابوون لەناو شار دیتنمان، دیار بوو دەڕۆیشتنە شوێنی کاریان، ئەوان گوتیان ئێمەیان دابەشی سەر گوندەکان کردوە کارمان پێ دەکەن.

لەکاتی ئامادە بوونمان ئۆتۆمبێلەکان کەوتنە ڕێ لەقەد پالّی کێوەکاندا بەناو دارستانێکی، پڕ لەداری جۆراوجۆردا ڕۆیشتین بەبەرزاییەکاندا سەر دەکەوتین، هەر شوێنێك پێیدا تێپەڕ دەبووین وامان دەزانی ئەو شوێنە لەوی تر خۆشترە، ئەوەی هەرە سەرنج ڕاکێش بوو ئەوە بوو لەبەرزایە تا هەمموارەکانیش تراکتۆرەکان زەویان دەکێلاو جوتیان دەکرد، دوایی زانیمان ئەو تراکتۆرانە زنجیردار بوون، ئەو شوێنانەی ئێمەی پێدا دەڕۆیشتین ناوچەی(ناگۆرنۆ قەرەباغ) بوو ئەو شەوە لەناو کێوەکان لە شوێنێکی چۆل ماینەوەو نەگەیشتینە ئاوایی لە دەورروو بەری ڕێگا خەوتین.

بەیانی ڕۆژی (١٩٤٧/٨/١) لەگەلّ گزنگی هەتاو کەوتنە ڕێ ماوەیەکی زۆر نەشوێنێکی، ئەوەندە بەرز دەڕۆیشتین کە بەسەر دۆلّو کێوە نەویەکاندا دەیڕوانی، نەوەندەی سەیرم دەکرد لە دیمەنی ناوچەکە تێر نەدەبووم هەر لەبەر ئەوەی بەدیمەنی کوردستان دەچوو. پێش نیوەڕۆ گەیشتینە شارێك ئەو شارە کەوتبوە سەربەرزاییەك دەتوانم بلێم لەسەر شاخێك بوو ئەو دیوو ئەم دیوی دۆلاّیەکی زۆر فراوان بوو دۆلّەکان داپۆشراوی دارو درەختی لێڕەوار بوو شارەکە ناوی (شوشی) بوو، (مەلامستەفاو شێخ سلێمانو علی محمد صدیق)و سێ کەسی تر لەوێ دابەزینو لەوێ داندران، بەلاّم شێخ سلێمان لەگەلّ ئێمە هات بۆ دامەزراندنمان. لە شاری (شوشی) دەرکەوتین پێچاوپێچ سەرەو ژێر ڕۆیشتینە خوارەوە بەناو دارستانێکی پڕ لە داری هەمەجۆر، لە ناو ئەو دۆلّەدا تەنیا گوێت لە دەنگی ئۆتۆمبێلەکان دەبوو، کاتێك گەیشتینە بناری بەرزاییەکان لەئاوەدانی نزیك کەوتینەوە لەم بەرو ئەوبەری دۆلاّییەکە گوند دەکەوتنە بەرچاو لەناو لەوەڕگەکان لەدەورروبەری گوندەکان مێگەلی مەڕو بزنو بەرازی کەیی‌وگاڕان دیار بوو، بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە شاری(ئاغدەم) شاری ناوبراو ناوەندی پارێزگای ئاغدەم بوو، لەوێ نانی نیوەڕۆیان داینێ کەمێك حەساینەوە دوایی ئێمەش کراین بەدووبەش بەشێك لەئاغدەم مایەوەو لەوێ

دامەزران‌و میرحاج لەگەڵیان مایەوە بۆ دامەزراندنیان بەشەکەی تریش بەڕێ کراین بۆ ناوچەی(ئاغجەبەدی)، لەدەشتێك ڕۆیشتین ئەو دەشتە وەك مێرگێکی سەوزی کوێستانان دەهاتە بەرچاو، ئەوەش هەموی پەمۆ بوو، ئێوارە درەنگ گەیشتینە(ئاغجەبەدی) لەپارکێك دایان بەزاندین، لەناو پارکەکەدا دانیشتبوین یەکێك هات باوەشێك ڕۆژنامەی (پراڤدا)* ی پێ بوون بەریز پێداچوو هەریەکەی ڕۆژنامەیەکی پێداین، شێخ سلێمان پێی گوتین: (ڕۆژنامەکانتان تێك مەدەن سەیری وێنەکانی بکەن)، ئەو شەوە لەو پارکە ماینەوە هەرکەسەی لە شوێنێك نوستین تا بەیانی. بەیانی کاتژمێر دە شێخ سلێمان‌و پیاوانی دەوڵەت هاتن ئێمەیان کۆکردەوە شوێنێك(شێخ سلێمان) هەندێك ئامۆژگاری کردین پێی گوتین: (ئێوە دابەش دەکرێن هەرچەند کەسێك لە گوندێك دادەندرێن بۆ ئەوەی لەوێ کاربکەن، کەس نەڵێت کار ناکەم دەبێ هەموتان کار بکەن بەپێی تواناتان، تا ئەوکاتەی خوا یارمەتیمان دەدات‌و چارەیەکتان بۆ دەدۆزینەوە، هیوادارین زۆر لێرە نەمێنن، تەنها ئەوەی لەسەر ئێوە پێویستە ئەوەیە کە سەبرتان هەبێت.

ڕۆژی (٤/٨/١٩٤٧) ئێمەشیان بەسەر کەلخۆزەکانی ناوچەی (ئاغجەبەدی)دا بلاوکردینەوە هەرچەند کەسێك بۆ کەلخۆزێك بەرێ کراین ئێمە نۆ کەس بەڕێ کراینە کەلخۆزێك زاوی(گیندراغ) بوو، کەلخۆزی ناوبراو زۆر گەورە بوو، ئەوانەی بەڕێ کراینە ئەوگوندە بریتی بوون لە:(سلێمان بەگ، مامند مەسیح، زرار سلێمان بەگ، حمدامین فقێ حسن، مەلکۆ زێرۆ، لاوکۆ مامند، حوسێن عبدالقادر، سید سالم، میران میرخان).

لەئاغجەبەدی بەئۆتۆمبێلێکی شل‌و شۆق بەڕێ کراین، کاتێك گەیشتینە گوند، بردیانین بۆ خانوێك پێشان کۆشکی ئاغای گوندەکە بووە لەژوورە گەورەکە دە چارپایە داندرابوون هەریەکەی لەسەر چارپایەك دانیشتین ئەو ڕۆژە هیچ، ڕۆژی دووەم کارگێری گرند هات گوتی:(هەمووتان هەستن بابڕۆین بۆسەرکار، تەنیا سلێمان بەگ دەمێنیت ئەویش نۆبەتداری کەل وپەلەکانتان دەبێت هەتا ئێوە لەکار دەگەڕێنەوە)، هەر ئەوکاتە بەرێکراینە ناو پەمۆ، کاتێك گەیشتینە شوێنەکە سەیرمان کرد، بەلام

---

* پراڤدا : ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی ئەو کاتی حزبی کۆمەنیستی سۆڤیەت بووە .

چی یەك کژمەڵ ئافرەت وا خەریکی پەمۆ چنینن، بەئێمەشیان گوت ئێوەش پەمۆ بچنن کاتیێ بەپرس(یانی چاودێر) سەیری (مامەندو حوسێن)ی کرد دیتی ئەوانە بەتەمەن گەورەن پێیانی گوت: (ئێوە بڕۆن لەسەر جۆخین دانیشن)، ئێمەش هەریەکەی کارێکی پێ سپاردینو دەستمان بەکار کرد.

ئەوەبوو هەر لەڕۆژی(٤/٨/١٩٤٧) هەتا (٢٢/١٠/١٩٤٧) لەو گوندە ماینەوەو کارمان دەکرد ئەو ماوەی لەوێ بووین بەڕۆژ کارم دەکردو بەشەو خەریکی خوێندن بووم بەشێوەیەکی تایبەتی زمانی ڕوسی فێربوونی ئامانجم بوو، جیا لەزمانی ڕوسی حەفتەش دوو دەرسی لاتینی کوردیم دەخوێند(عبدالرحمن فقێ) دەرسی پێ دەگوتم، ناوبراو لەگەڵ(محمد نەجیب و سالم بەخشی) لەگوندێك بوون زۆر نزیك لەئێمە، ڕێگای دە دەقیقەیەك زیاتر نەدەبوو، بۆ دەرس دەڕۆیشتمە لای.

شەوان هەتا درەنگی شەو دادەنیشتم دەمخوێند، دەرسەکانم دەوردەدانەوە هەتا تەواوم دەکردن ئەوکاتە دەنوستم، ئەوەی زیاتر نیگەرانی کردم ئەوەبوو ئێواریەك لەکار گەڕامەوە دەبینم کتێبەکانم دیار نەبوون لەبرازای مامەندم پرسی:(میران نازانی کێ دەستی لەکتێبەکانی من داوە؟) ناوبراو زۆر مەردانە گوتی (مامەند سوتاندنی) دەیگوت: (شەوان هەتا نیوە شەو دادەنیشیت کاردبا ناکوژێنیتەوە خەومان لێ ئالۆز دەکات!) کاتی ئەمەم بیست زۆرنیگەران بووم ئەو ئێواریە خواردنیشم نەخوارد، دیاربوو مەلکۆی برازای زۆر پەست بوو لەو کردارە پوچەی مامی، ناوبراو لای من دەرسی کوردی دەخوێند بەنیازی فێربوونی خوێندنەوەو نوسینی کوردی.

کاتێك باوکم بیستی مامەند کتێبەکانی منی سوتاندون زۆر نارازی بوو، بەمامەندی گوت: (مامەند سوتاندنی کتێبەکانی زرار کارێکی زۆر ناشیرنو چەوتە، ئەگەر بەمنت گوتبایە من داوام لەبەرپرسی گوند دەکرد ژورێکمان لێ وەردەگرت، ئێمە دەچووینە ناوی بۆ ئەوەی خەو لەئێوە ئالۆز نەبێت، ئەوەی من بیزانم ئێوە حەز لەخوێندن ناکەن لەبەر ئەوەتان نییە کەخەوتان لێ ئالۆز بووە، تکایە کاری وەها دووبارە نەبێتەوە با نەبێتە هۆی ناخۆشی نێوانمان، چونکە ئێمە زۆر لەمێژە دۆستی یەکترین).

مامەند دانی نا بەو هەڵەیەی كە كردبووی بۆیە بەباوكمی گوت: (سلێمان بەگ نابێ دڵت نیگەران بێت لەو كردەوەم من دەزانم غەڵەتێكی گەورەم كردووە، داوای لێ بوردن دەكەم). ناچار كتێبەكانم پەیدا كردنەوەو بەردەوام بووم لەسەر خوێندنەكەم، من لەسەرەتاوە باوەڕیم بەوە هەبوو رۆژێك دادێت بگەڕێمەوە كوردستان، كاتێك كە گەڕامەوە خەڵك لێم دەپرسن فێری چی بووی؟.

بەڕاستی زوو فێری زمانی(ئازربایجان)ی بووم ئەویش لەبەرئەوەی ژیانمان لەگەڵ ئەوان بوو كارمان لەگەڵ خەڵكەكەی دابوو لەبەر ئەوە زوو فێری زمانیان بووم، زۆر هەوڵم دەدا زمانی ڕوسی زوو فێربم بۆیە بەبەردەوامی دەمخوێند بۆ ئەوەی بتوانم لە سەرانسەری ڕووسیا بەئارەزووی خۆم بدوێمو لە خەڵك بگەم.

**ناسین:** ئەوكاتانەی هاتووچۆی لای(عبدالرحمان مفتی)م دەكرد ڕێگام بەناو كۆڵانی ماڵەكاندا دەڕۆیشت ئێوارەیەك درەنگ دەگەڕامەوە كچێكی ئازربایجانی لەبەر دەرگاكەیان وەستا بوو كاتێك لێی نزیك كەوتمەوە ڕای گرتمو پرسی: (رەفیق بەئازربایجانی گوتی یولداش تۆ كوردی؟) گوتم بەڵێ فەرموو خزمەتێكت هەیە؟ كچەكە گوتی: (بفەرموو بڕۆینە ماڵمان باوكم داوات دەكات). كاتێك چوومە ژوورەوە پیاوێكی تەمەن چل تاچلو پێنج ساڵانە دانیشتبوو گوێی لە دەنگی ڕادیۆی پەیكی ئێران گرتبوو كە بەزمانی ئازربایجانی بوو، هەر كە گەیشتمە ناو داڵانەكە پیاوەكە هەستاو بەڕێزەوە پێشوازی لێ كردم لەدوای دانیشتن گوتی: (زۆر لەمێژە بەمنداڵەكانم گوتوە چاوتان لێ بێت هەركاتێ ئەو برا كوردە بێرەدا تێپەڕ بوو پێی بڵێن ئێوارانێ كاتژمێر پێنج لەڕادیۆی پەیكی ئێران بەكوردی بۆ ماوەی پازدە دەقیقە بەرنامەیان هەیە بالەكاتی دیاریكراو ئەگەر بتوانێت بابێ گوێی لێ ڕابگرێت). بێگومان سوپاسی هەستی ئەو پیاوەم كرد لەبەر ئەوەی دڵسۆزانە ئاگاداری كردم كەوا دەنگی پەیكی ئێران بەكوردی بەرنامەیان هەیەو داوام لێ دەكات بڕۆم گوێی لێ بگرم، ناوبراو دەیزانی ئێمە ڕادیۆمان نییە لەسەر داوای ئەوان چەند جارێك چووم گوێم لەكوردیەكەی پەكی ئێران گرت. وا هەڵكەوت چەند رۆژێك نەمتوانی بڕۆم گوێ لەڕادیۆ بگرم، ئێوارەیەك كاتی گەڕانەوەم دیسان كچە قژ درێژەكە لە دەرگاكەیان وەستابوو، كاتێك لێی نزیك كەوتمەوە بەزەردەخەنەوە گوتی: (ئێوارە باش خۆ خوانە خواستا لێمان دڵ ڕەنجاو نەبوی ئاوا ڕووت وەرگێراوەو ئێمەت لەبیركردووە،

ـ مان دانابوو گوتمان لەوانەیە ڕۆیشتبێت بۆیە دیار نییە). گوتم: (نەخێر سارای ـزدار هیچ دڵ ئێشیەك لەگۆڕێ نییە تا مردن هەڵوێستی ئێوەو پیاوەتی باوكتو ـێزی دایكت نیشانەی هەمیشە لەسەر دڵمەو لە یادم ناچێت). كاتێك چوومە ژوورەوە ـایكی وەك كوڕی خۆی دەیگرتمە باوەش‌و ماچی دەكردم وای دەزانی ساڵێكە نەی ـیووم.

بەرێكەوت لەدوای ماوەیەك لەگەڵ باوكم لەدوكانە گەورەكەی شار دەركەوتین ـەبەر دەرگا ساراو دایكی ڕووبەڕوومان دەهاتن كە گەیشتنە ئێمە دایكی سارای دەم بەزەردەخەنە پرچ درێژ منی گرتە باوەش‌و وەك جارەكانی تر وای دەزانی لە مێژە نەی دیووم ساراش زۆر بەگەرمی چاك‌وچۆنی لەگەڵ كردم بەوانم گوت: (ئەوە باوكمە)... ـەگەڵ باوكمیان چاك‌و چۆنی كرد. كاتێك بەجێمان هێشتن باوكم پرسی: (زرار ئەوانە كێ بوون ئەوەندە تۆیان خۆش دەوێت؟) گوتم: (بابەئەوە ئەو ماڵەن كە باسم بۆ كردی كە چۆن منیان بانگ كرد گوێ لەرادیۆی پەیكی ئێران بگرم لەماڵیان تا بڵێی ماڵێكی باشن هەست بەوە دەكەن كە ئێمە ئاوارەین).

ئەوەی شایانی باسە ئەو ماوەیەی لە كەلخۆزەكان بووین لە ئازربایجان چەند جارێك كارمەندانی دەوڵەت هاتن بۆ سەردانمان چاویان بەپەنابەرەكان كەوت هەرجارەی دەهاتن كوردیشیان لەگەڵدا بوون دواجار كە گەڕانەوە بۆ باكۆ پایتەختی ئازربایجان زۆری نەخایاند بانگی میرحاج‌و سلێمان بەگیان كرد لە ڕێكەوتی(١٥/١٠/١٩٤٧) بەرێ كرانە(باكۆ) لەسەر داوای مەلامستەفا دیار بوو ناوبراو داوای كردبوون، ماوەی دە پانزە ڕۆژان لەوێ بوون دوایی گەڕانەوە لامان میرحاج ڕۆیشتنەوە(ئاغدەم)و سلێمان بەگ هاتەوە لای ئێمە، ئەوان ڕایان گەیاند كەوا(مەلا مستەفا)و ئەوانەی لەگەڵی بوون ماوەیەكە بەرێ كراونەتە (باكۆ) ئێمەش لەو نزیكانە لەكەلخۆزەكان دەگوازرێینەوە بۆ باكۆی پایتەخت بۆ فێربوونی كاروباری سوپایی‌و چەك. لەو كاتەی لەكەلخۆزەكانی ئازرەبیجان كارمان دەكرد زۆر بەسەرهاتی سەیر ڕوویاز داوە هەر ئەوهاش مامەند شێروانی سەربردەی بارزانی بۆ گێڕاینەوە لەوكاتەی لەسلێمانی ڕای كردبوو لەساڵی (١٩٤٣) هەروەك لەمەهاباد بۆی باسكردین كەلەنزیك نەغەدە چۆتە ماڵی مامندو لەوێش چونەتەوە بارزان.

ڕۆژی (١٩٤٧/١٢/٢٢) ئاگادارکراین خۆمان ئامادە بکەین بەڕێ دەکرێن بۆ باکۆ بێگومان ئەوەندە ماوەی لەوێ ماینەوە کۆمەڵێك دۆستو برادەرمان پەیدا کردبوون پیش ئەوەی بڕۆین ڕۆیشتمە لایان بۆ ماڵئاوایی، لەسەرەتاوە لای دکتۆرە (دونیا)و مێردەکەی کەئەوانیش ئاوارە بوون، بەلاّم پەنابەری سیاسیان هەبوو لەتورکیا ڕایان کردبوو، لەسۆڤیەت خوێندنیان تەواو کردبوو لە نەخۆشخانەی ئەو گوندە کارمەند بوون، دکتۆرە(دونیا)زیاد لەپێویست یارمەتی دام بۆ فێربوونی زمانی ڕوسی بەنوسینو خوێندنەوە.

لەدوای ئەوە ڕۆیشتمە ماڵی (علی ئەکبر) باوکی سارا، کاتی گوتم هاتوم ماڵئاوایتان لێ بکەم دایکی دەستی کرد بەگریان سارا خانیش چاوە شینەکانی پڕ بوون لەفرمێسك کاتێك ماڵئاواییم لێ کردنو لەماڵیان دەرکەوتم دەیانگوت بریا نەمان ناسیبای بەلامانەوە زۆر گرانە بەجێمان دێڵیت!.

## کۆکراینەوە و بەڕێ کراینە باکۆ

بەپێی بڕیارکۆکراینەوە، بەیانی ڕۆژی (١٩٤٧/١٢/٢٣) کەلخۆزمان جێهێشتو کەوتینە ڕێ بەرەو باکۆ بەئۆتۆمبێلی کەلخۆز بۆسەر هێلی شەمەندەفەر، بەدەشتایی تێپەڕ بووین، کۆمەڵێك گوندی خۆشو جوان دەکەوتنە بەرچاو بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە شارێك ناوی(یوولاّغ) بوو وا بەدیارکەوت دەبوایە هەموومان لەو شارە کۆبکرێینەوەو بەشەمەندەفەر بەڕێمان بکەن، پێش ئەوەی ئێمە بگەینە ئەوێ هەندێك گەیشتبوونە شوێنی دیاریکراو، هەروەها ناوە ناوە ئەوانی تریش دەگەیشتن بەو شێرەیە ئەوەی دەگەیشتە یولاّغ لەگۆڕەپانی وێستگەی شەمەندەفەر دایان دەبەزاندن ئەوانیش لەشاییو خۆشی بەیەك گەیشتنەوەیان شاییان دەکرد بەو شێوەیە تا ئێوارە بەشی زۆریان گەیشتنە شوێنی دیاریکراو ئەوەی دەگەیشتنە جێ دەڕۆیشتنە ناو شایی هەتا دەهات شایی گەورەتر دەبوو، کاتێك بینیمان بەشێکی زۆری خەڵکی دەورو بەری وێستگەکە دابەزینە شوێنەکەو بەماوەیەکی کورت ئەوەندە خەڵك لە دەوری شایی کۆبوبوەوە بۆ سەیرکردنی شایی، چونکە بەلایانەوە سەیر بوو. ئەوەی هەست دەکرا

ئەو خەڵکەی لە دەوری شایی وەستا بوون سەرسام ببوون، چونکە نەیان دەزانی ئێمە کێین!

ئەوی ڕاستیە ئێمە لەخۆشی بەیەك گەیشتنەوەو بەیەك شاد بونەوەمان خەریکی یەکتر لە باوەش گرتن بووین بەشێکی زۆریان شاییبیان دەکرد بەگۆرانی گوتن‌و دەمێك شمشاڵیان لیّ دەدا ناوەناوەش شێوەی شایی دەگۆڕا هەرلە شێخانیەوە هەتا ڕۆین‌و سیّ پێی‌و هی تر، لەگەرمەی شاییدا بوین پیرە ژنێك بەڕوویکی خۆشەوە لێم نزیك کەوتەوە بەکوردی پرسی: (ئازیز ئێوە کوردی کامە پارچەی کوردستانن؟) گوتم: (دایە گیان ئێمە کوردی کوردستانی باشورین، لەعێراق).

پیرەژنەکە گوتی ڕۆڵە: (لە کویّ وە هاتوون بۆ کوێتان بەریّ دەکەن؟)

گوتم: (چەند مانگێك بوو لە کەلخۆزەکان داندرابووین ئێستاش نازانین بۆ کوێمان بەریّ دەکەن). کاتێك ئافرەتەکە زانی ئێمە کوردی عێراقین بەدوو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی: (جەرگی پورێت خەرابیّ منیش کوردی عێراقم‌و خەڵکی سلێمانیم زۆر لەمێژە لێرەین لەدوای شکستی شێخ محمود ئاوارە بووین لێرە ماوینەتەوە!)، ئەو کاتە بانگی کوڕێکی کرد هاتەلامان گەنجێکی ڕێك‌و چوست بەبەرگی فرۆکەوانی بوو پێی گوت: (کوڕم نەمگوت ئەمانە کوردی لای خۆمانن بزانە چۆنم زانی؟)

هەر زوو کوڕەکە گوتی: (ڕاستە ئێوە کوردی عێراقین؟ دایکم لەوکاتەی ئێوەی دیوە دەگرییێت‌و فرمێسك دەڕێژێت دیارە یادی نیشتیمان دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی من کوردستانم نەدیوە ئەوەندەی بۆ پەرۆش نیم ئەوەندەی دایکم بۆی بەپەرۆشە). گوتم: (بەڵیّ کوردی عێراقین وەك دایکت گوتویەتی منیش دەڵێم کوردی کوردستانی عێراقین نزیکەی پێنج شەش مانگە لێرەین لەگوندەکان لەپارێزگاری تاغدەم داندرابووین ئێستاش نازانین بۆ کوێمان بەریّ دەکەن)، لەدواییدا دایکەکە کەوتە دروان‌و گوتی:(ئێمە زۆر لە مێژە لەغەریبی دەژین چوار منداڵم هەیە ئەوەیان بچکۆلەکەیانە ئەفسەرە ئەوانی تریش خاوەن وەزیفەن)، دیار بوو پیرەژن زۆر بەسۆز بوو لەگەڵ قسەکردنیدا دەش گریا زۆر هەوڵیدا لەگەڵیان برومەماڵیان، بەلاّم پێم گوتن ئێمە لەڕیّ ڕۆیشتنین ناتوانم بێم زۆر سوپاستان دەکەم، لەوکاتەدا بانگ کرام بەپەلە ماڵاوایم لێکردن‌و ڕۆیشتم، ئەوەی جێگای نیگەرانیم بوو ناونیشانم لیّ

وەرنەگرتن، چونکە دەبوایە ناونیشانم لێ وەرگرتبان بۆیەش نەمتوانی ناونیشانیان لێ وەرگرم، چونکە زەنگ لێدراو گوتیان برۆنە ژوورەوە سەیرم کرد پیرەژن هەر وەستابوو تا ئێمە چووینە ژوورەوە. هەرلەوکاتەی رۆیشتینە ناو شەمەندەفەر چاوەڕوان بووین تا کاتژمێر هەشت لەکاتی دیاریکراو شەمەندەفەرەکە کەوتەکارکردنو بەرێ کەوت بەرەو باکۆ ئەوشەوە بەدرێژایی شەو رۆیشتین کاتی بەیانی گەیشتینیە وێستگەیەك لەوێستگەکانی شاری(باکۆ) لەوێش بەئۆتۆمبێلەکانی سوپا گواسترایینەوە بۆ سەر لێواری دەریای(کاسپی) کەپێشی دەوترێت (بەحری خەزەر) ئەو شوێنەی ئێمەیان لێ دابەزاند دیار بوو شوێنی سوپا بووە بۆ ئێمەیان چۆل کردبوو کەدوو شوێن بوون لەنزیك دەریای ناوبراو، بۆ رۆژی دووەم کۆمەلێك ئەفسەری سۆڤیەتیو کارگێری دەولەت هاتنە لامان خەریکی رێکخستن بوون، بەرگی سەربازیان بەئێمە داو هەر ئەوانیش دابەشیان کردینو کردنیانین بەدوو بەش گەنجەکان بەجیاو پیرەکانیش بەجیا، لەدوای لێك جیاکردنەوە ئەوکاتە ئەو ئەفسەرانەی هاتبرون بوون بەماموستای فێرکردنی کاروباری سەربازی هەر ئەوان ئێمەیان بەشێوەی سوپایی رێکخست، ئەفسەرەکان (ئازربیجان)ی بوونو بەرپرسی کاروبارەکان ئەفسەرێکی کوردی سۆڤیەتی بوو کەناوی(کازیمۆف) بوو ناوبراو لەسەردەمی کۆماری کوردستان لەمەهاباد بەناوی(کاکاغا) ئیشی دەکردو کارمەندێکی گەورە بوو، ئەو ئەفسەرە ئەفسەرێکی لێ هاتووی سوپای سۆڤیەتی بوو، یەکێك بوو لە ئەفسەرە پالەوانەکانی شەڕی دووەمی جیهانی، نیشانەی قارەمانیەتی پێدرا بوو، بەشی زۆری ئێمەی دەناسی لەو سەردەمەوە(کازیمۆف) کرا بەفەرماندەی کاروباری مەشقو پێ گەیاندنی کوردە پەنابەرەکان لەڕووی سەربازی لەکوردەکانیش (ئەسعەد خۆشەوی)داندرا بەیارمەتی دەری. بۆ هەر لقێك ماموستایەك لەئەفسەرەکانی سۆڤیەتی داندران، وە بۆ هەر یەکێك لە ماموستایەکان یەکێك لە کوردەکان داندرا بەیارمەتی دەریان بەهەمان شێوەش بۆ هەر فەسیلێك ئەفسەرێك دیارکراو یەکێك لەکوردەکانی بەیارمەتیدەر داندرا، بەم شێوەیە لقو پەلو دەستە رێکخران لەشێوەی سەربازی، ئەوجا بەرێکوپێکی دەست کرا بەمەشقی سەربازی. ئەوەی راستی بێت ئەفسەرەکان وەك ماموستای فێرکردن هەولێکی بێوچانو دلسۆزانەیان دەدا بۆ فێرکردنو پێگەیاندمان لەگشت رویەکەوە، بەلام پاش ماوەیەك تێ گەیشتن کەوا ئارەزوی

فێربوونمان لاوازە، بەڵکو بۆ ڕابواردنە نەك فێربوون، لەبەر ئەوە ڕۆژ بەڕۆژ کۆسپ ئەخرایە ڕێگای فێرکردن‌و خوێندن، لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستایەکان بەپێی ئەو بەرنامەیەی، بۆیان داندرابوو هەربەردەوام بوون، ئەوەی لە توانایاندا بوو دەیان کرد بەرێزێکی زیاد لە پێویست لە گەڵمان دەجولانەوە، زۆر پێمانەوە ماندوو بوون، بەلام بەپەرۆشەوە ئێمە نەمانتوانی ڕێزی ئەو خۆماندوو کردنەی ئەوان بگرین‌و سود لە زانیاریەکانیان وەربگرین‌و گوێ ڕایەڵی ئامۆژگاریەکانی ئەران بین، بەپێچەوانەوە هەرزوو ئەوانمان دڵ ڕەنجاو کردن‌و تێمان گەیشتن کەوا ئێمە شایانی ئەوە نین ئەوەی ئەوان نەخشەیان بۆ کێشاوە، بەنیازن پێمان بگەیەنن کەچی هەڵوێستە چەوتەکەی ئێمە لە زۆر ڕووەوە دڵی مامۆستایانی نیگەران کرد، وای لێ کردن لێمان بێ ئومێدبن‌و هەست بکەن کە هەوڵەکانیان بێ سوودە، کارگەیشتە ئەو رادەیەی ڕوبەڕوی مامۆستایەکان دەوەستان، دڵ شکاویان دەکردن‌و گوێیان نەدەدایە فەرمانەکانیان ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە مامۆستایەکان هەستیان بەناکۆکی دەکرد لە نێوان ئێمەدا کە بۆنی مەترسی لێ دەکرا، ئەفسەرەکان بەکارێکی ناسازیان هەڵ دەسەنگاند، ئەوە بوو شەوێك پاسەوانێك بەناوی(محمد عوزێر) لە کاتی نۆبەتەکەی نێزەیەکی لە(ئالۆ عەلی)داو برینداری کردو ڕای کرد، ئالۆ یەکێك بوو لە یاریدەدەرەکانی ئەو مامۆستایانەی هاتبوون پێمان بگەیەنن، هەر بەو شەوە ئالۆ بەرێ کرایە نەخۆشخانەی باکۆ باش بوو لە مردن ڕزگار کرا، ئەم کردەوەیە بوو بەمایەی ئالۆزی‌و نیگەرانی مامۆستایەکانمان‌و ئێمەش بەگشتی.

وەك پێش تر باسم کردوە لە سەر لێواری دەریای (کاسپی) دوو شوێنی سەربازی بۆ ئێمەی پەنابەری کورد ڕێك خرابون پیرەکان بەجیاو ئەوانەی لە پەنجا ساڵیش بەرەو خوار بوون لە شوێنێکی تر بەجیا، کەمێك لە یەکتر دوور بوون، لەو شوێنەی پیرەکانی لێ بوو، (میرحاج ئاکرەیی‌و محمدنجیب بەرواری‌و عبدالرحمان مفتی ئامێدی‌و سلێمان بەگی دەرگەڵەیی) لەوێ بەشێوەیەکی کاتی جێگیر کرابوون بەبەرگی مەدەنی بوون.

## دەنگی شادی و.. پەرۆشی!!

لە پڕێکا دەنگوباسێك ڕاگەیەندرا کەوا بڕیارێکی زۆر گرنگ لە سەرکردایەتی سۆڤیەت دەرکراوە، بەرەزامەندی ئەنجومەنی بالای سۆڤیەتیو حزبی کۆمۆنیستو ئەنجومەنی وەزیرانی سۆڤیەت بەدانانی ئەنجومەنێك بۆ کوردە پەنابەرەکان لەشێوەی حکومەتێکی کاتی لەدەرەوەی کوردستان، بڕیاڕی ناوبراو بووە مایەی خۆشیو شادی هەمووومان، بێگومان ئەو بڕیارە ئاواتو مەرامی گشت کوردێکی شۆڕشگێڕو ماندوی ڕێگای ئازادی بوو، ئەو هەواڵە هەواڵێکی بەرز بوو بەئێمە گەیشت بۆمان هەبوو بەسەربەرزیەوە بڵێین ماندوو بونو خەباتمان بەلاش نەڕۆیشتوە بەئاوات گەیشتین. بەڵام ئەوەی جێگای نیگەرانیەکی زۆرو پەرۆشی بوو، ئەو هەواڵە بەرزو بەنرخە زوو بێ دەنگ کراو بەتەواوی نەگەیشتە گوێی جەماوەرە ئاوات خوازەکەمان، دەنگەکە کپ کراو بێ دەنگ بوو!!

ئەوەی زاندرا سەرکۆماری ئازربیجان (باقیرۆف) بەمەبەستی ڕاگەیاندنی ئەو بڕیارە مەلامستەفاو شێخ سلێمانی برازای بانگی لای خۆی کردبوون، لە زارگۆتەی شێخ سلێمان (باقیرۆف) پێشوازیەکی زۆر گەورەی لێ کردبون، لەدراییدا پێی گوتبون: (مژدەیەکی زۆر گەورەم پێ یە بۆ گەلی کورد لە ڕێگای ئێوەوە پیرۆزبایی سەرکردایەتی سۆڤیەت تان پێ ڕادەگەیەنمو بەناوی خۆمو گەلی ئازربیجانیش گەرمترین پیرۆزباییتان لێ دەکەم، لەڕێگای ئێوەشەوە پیرۆزبایی لە گەلی کوردی برامان دەکەین). لەدوای ڕاگەیاندنی بڕیارەکە باقیرۆف گوتبوی: (جەنابی مەلامستەفا ئەوا حەسەنۆف ڕاسپێردراوە هەموو پێداویستیەکانتان بۆ ڕێك دەخات).

شێخ سلێمان گوتی: (لەکاتێکا دەرکەوتین حەسەنۆفو سەرۆك وەزیرانی ئازربیجان لەگەڵمان دەرکەوتن داوای لە مەلامستەفا کرد لیستی ئەوانەی لەو ئەنجومەنە بەشدار دەبن ئامادە بکات بۆ ڕۆژی یەکەمین کۆبونەوەی ڕاگەیاندنی ئەنجومەن). لەگەڕانەوەماندا مەلامستەفا لەگەڵ میرحاج خەریکی ڕێکخستنی لیستەکە بوون ئەوانەی بەشداری لە ئەنجومەن دەکەن. ئەوەی زاندرا میرحاج بەپێی ڕێنمایەکانی مەلامستەفا لیستەکەی ڕێکخستو شوێنی هەریەکەی لە ئەندامانی

ئەنجومەن دیارکردو ئامادەی کرد بوو، مەلامستەفا چۆنی دانابوون ئەویش ئەوهای ڕێك خستبوون. وەك لە دوایی بەدیار کەوت پێشنیارەکانی سەرکۆمار لەگەڵ ئامۆژگاریەکانی بەمیرحاجی نەگوتبون پێش ڕێکخستنی لیستەکە، بۆ هەمان مەبەست میرحاج ڕاپۆرتێکی سیاسیشی ئامادە کردبوو بۆ ڕۆژی دیاریکراو، ڕۆژی (١٩٤٨/١/١٩) دیاری کرابوو بۆ بەستنی یەکەم کۆبونەوەی دامەزراندنی ئەنجومەنی کاتی بۆ کوردە پەنابەرەکان لە دەرەوەی کوردستان.

لە ڕۆژی دیاریکراو لە(باکۆ)ی پایتەختی ئازربیجان کۆبونەوەکە ئەنجام درا لەو کۆشکەی بۆ ئەنجومەنەکان دەست نیشان کرابوو، ئەوانەی دەستنیشان کرابوون بۆ ئەندامیەتی ئەو ئەنجومەنەی بڕیاری لەسەر درابوو ئەمانە بوون (مەلامستەفا سەرۆك، شێخ سلێمان بارزانی، میرحاج ئاکرەیی، علی محمد صدیق بارزانی، سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، محمدنجیب بەرواری، عبدالرحمان مفتی ئامێدی، سەید عزیز شەمزینی، ڕەحیم قازی سابلاغی، عەلی گەلاوێژ سابلاغی)، لەکۆبونەوەکەدا کۆمەڵێك کەسایەتی پایەبەرزی حکومەتی ئازربیجانو ئازربیجانی ئێرانیو هەندێ لە فەرماندە پایەبەرزەکانی قەفقاس ئامادەبوون، لە سەرەتای کۆبونەوەکە میرحاج، وتارێکی پڕ مانای سیاسی گرنگی خوێندەوە کە جێگای ڕەزامەندی گشت ئامادەبوان بوو، دوای وتارەکە لیستی ناوی ئەندامانی ئەنجومەنی بەو شێوەیە خوێندەوە: (مەلامستەفا سەرۆك، شێخ سلێمان بارزانی یاریدەدەر، ئەوانی تریش لەسەر ڕاسپاردەی سەرۆك شوێنیان بۆ داندرابوو (میرحاج، محمد نجیب بەرواری، عبدالرحمان مفتی، ڕەحیم قازی، سەید عزیز شەمزینی، سلێمان بەگ، عەلی گەلاوێژ، علی محمد صدیق) بەم شێوەیە لە دوای خوێندنەوەی لیستەکە وتاری حکومەتی ئازربیجانی سۆڤیەتیو سەرکردایەتی پەنابەرەکانی ئازربیجانی ئێرانی خوێندرانەوەو لەگەڵ پیرۆزبایی فەرماندە سوپابییەکانی قەفقاس.

لەکۆتاییدا سەرۆك وەزیرانی ئازربیجان (حەسەنۆف) پیرۆزبایی لێ کردنو بەناوی سەرکۆماریش پیرۆزبایی ئاراستەی مەلامستەفاو ئەنجومەنە دەست نیشان کراوەکە کرد، لە دواییدا لەگەڵ مەلامستەفا کەوتە قسەکردنو پێی گوت: (جەناب، ئەگەرچی ئێمە دەست ناخەینە نێو ئیشو کارەکانتان، بەلام تێبینیم ئەوەیە ڕێنماییو ئامۆژگاریەکانی سەرۆك کۆمار لەو لیستەی کەخوێندراوە ڕەنگی

نەدایەوە). کاتێك میرحاج گوێ بیستی ئەوە دەبێت کە ڕێنماییو ئامۆژگاری هەبوینەو پێی نەگوتراوە هەر ئەوکات ئاڵۆز ببوو یەکسەر نامەی دەست کێشانەوەی نوسیو دەرکەوتو نەگەڕایەوە، یەکسەر گەڕابۆوە سەربازگەکەی سەر لێواری دەریا. چەند ڕۆژێك دوای واز هێنانەکەی میرحاج(عبدالرحمان مفتیو محمد نجیب بەرواریو سلێمان بەگ)یش کۆشکی ئەنجومەنیان جێ هێشتو گەڕانەوە لای میرحاج، بۆ سەر لێواری دەریای (کاسپی)، هەر دوای ئەوان (ڕەحیمو عەلی گەلاوێژی)ش ئەوێیان بەجێ هێشتبوو، ئەو دەنگە بەرزە کپ بوو شادیو خۆشی بوو بەپەرۆشی.

ئەو دەسکەوتەی بەدەست کورد کەوتبوو سەرکەوتنێکی زۆر مەزن بوو، بەلاّم بەپەرۆشەوە نەتواندرا سودی لێ ببینینو زۆر بەئاسانی لە دەست دراو زیانێکی زۆر گەورە بەخەباتو تێکۆشەرانی کورد کەوت. دەبێ بپرسین ئەو هەلە گەورەیە بۆچی لەدەست درا؟ بۆ ئەو دەنگە مەزنە کپ کرا؟ بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو بەسەرهاتە ماڵوێرانیە بەرێکیو پوختەیی لە ئەرشیفی ئازربیجانو لای ڕەحیمی قازی هەیە. ئەوەی زۆر جێی سەرنجە بەلامەوە کە سۆڤیەتیەکان بۆ لەو ڕووەوە بێ دەنگ بوون هەروەك هیچ شتێك نەبوبێت ئەوها بێ دەنگ بوون!؟

وەك بەدیار کەوت لەدوای سەرنەکەوتنی ئەنجومەنی دەستنیشان کراو بۆ کوردەکان، ناکۆکی کەوتە نێوان کاربەدەستانی ئازربیجانو مەلامستەفا، ناکۆکیەکە بەوە گەیشت مەلامستەفا زۆر بەتوندی لەگەڵ وەزیری ناوەخۆی ئازربیجان ژەنەراڵ (ئاتاشیف) دوابوو، ئەو زویری و لالوتیەی نێوانیان بەوە گەیشت کە وەزعەکە ئاڵۆز بێت، ڕۆژ بەڕۆژ ساردیو ناخۆشی زیادی دەکرد لە نێوان بارزانیو کاربەدەستانی ئازربیجانی، ئەو ناکۆکیەی نێوانیان زیانی گەیاندە ڕێڕەوی کوردو بەرەو دواوەی پاڵدا. لەگەڵ ئەوەی ئەو ناکۆکیە هەر بەردەوام بوو ئێمە هەر بەردەوام بووین لە مەشق کردن، بەلاّم هەستمان دەکرد ئاڵوگۆڕێك ڕوو دەدات، تەنیا نەمان دەزانی ئەوەندە دوورمان فڕێ دەدەن.

ئەوە بوو ڕۆژی (١٩٤٨/٨/٢٥) ئاگادارکراینەوە کەدەمان گوازنەوە بۆ شوێنێکی تر، پێویستە خۆمان کۆبکەینەوەو ئامادەبین،هەرئەو ڕۆژە کەل وپەلەکانمان ئامادەکرد، کەلوپەلەکانی مەلامستەفاو ئەوانەی لەگەڵی بوون لە باکۆ هێنایانە

لای ئێمە، بەدیارکەوت کە ئەوانیش لەگەڵ ئێمە بەرێ دەکرێن بۆ ئەو شوێنەی بۆمان دیارکرابوو.

رۆژی (١٩٤٨/٨/٢٦) دەست کرا بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکانی سەربازی بۆ سەر وێستگەی هێڵی ئاسنی شەمەندەفەر بۆ بارکردن، دیار بوو شەمەندەفەرەکە تایبەت بوو بۆ گواستنەوەی ئێمە، وا پێ دەچوو شەمەندەفەری دیاریکراو بۆ دوور دەروات لەبەرئەوەی خواردەمەنی زۆری تێدا بارکرابوو، لە دوای گواستنەوەی کەل وپەلەکانمان ئێمەش ڕۆیشتینە ناو شەمەندەفەرەکە، بەلاّم نەمان دەزانی بۆ کوێمان دەبەن! دوور وەستانی (میرحاج)، ئەو تێکۆشەرە پایە بەرزە لە دوای ئەو هەموو ماندوو بوونە کە چۆن توشی نەدامەت بوو، منی خستە ژێر بارێکی زۆر گرانی بیرکردنەوەیەکی دووربین.

## گواستنەوەمان لە ئازربایجانەوە بۆ ئاسیای ناوەڕاست

ئەوەی بەدەرکەوت لە ئەنجامی ئەو مشتومڕەی نێوان کاربەدەستانی ئازەربێجان و مەلا مستەفا بوە هۆی دوورخستنەوەی ئێمە لەقەفقاس و بەرێ کردنمان بۆ ئاسیای ناوەڕاست.

ئێوارەی ڕۆژی (١٩٤٨/٨/٢٧) گشتمان لەیەکێ لەوێستگەکانی شەمەندەفەرەکانی(باکۆ) ئامادە کراین، مامۆستایەکانیش خۆیان و کەلوپەلەکانیان هاتنە ناو شەمەندەفەرو لەفارغۆنێك بەتەنیا داندران، هەر بەو شێوەیەش فارغۆنی مەلامستەفاو ئەوانەی لەگەڵی بوون جیا بوو لە ئێمە، ئەوانی تر بەشێوەی نیزامی هەرکەسەو لەگەڵ لق و پەلی خۆیان دابوون، هەر لە ئێوارە لە ناو فارغۆن بووین تا کاتژمێر دەی شەو چاوەڕوانی ڕۆیشتن بووین. ئەوەی ڕاستی بێت زۆرمان پێ ناخۆش بوو ئەو شوێنە خۆشەمان بەجێ دەهێشت، ئەوەندەی باسی ئەو شوێنە خۆشە بکەیت هەرکەمە، چونکە ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین لە سەر لێواری دەریا بوو دەوروبەرمان هەمووی باغ وباخچە بوو، وە لە(باکۆ)ش نزیك بووین.

کاتژمێر دەی تەواو شەمەندەفەر کەوتە جولاّنەوەو بەرێ کەوت، ئەو شەوە تا بەیانی ڕۆیشتین ڕۆژی(٨/٢٨) دیار بوو لەناو دارستانێکی چڕ دەڕۆیشتین شوێنێکی

زۆر خۆش بوو ناوە ناوە گوندی زۆر جوان دەکەوتنە بەرچاو، کاتژمێر نۆی ڕۆژی دیاریکراو گەیشتینە شارێك ناوی (دەربەند) بوو لە دوورەوە دیار بوو شارێکی جوان‌و ڕێکە، دوکەڵی کارگەکان دیار بوو، شاری ناوبراو دوا شاری سنوری ئازربایجان بوو. لەوێ بەولاوە سنوری ئۆتۆنۆمی (داغستان) بوو، ئەو ڕۆژەش تا ئێوارە هەر لەناو دارستان دەڕۆیشتین، بەلاّم چ دارستانێك ئەوەندە چڕ بوو بەرچاوی خۆمان نەدەدیت. بێگومان ئەو شەمەندەفەرەکەی ئێمەی لێ بار کرابوو تایبەت بوو، لە وێستگەکان نەدەوەستا تەنیا لەو کاتانە نەبێت کە شەمەندەفەرەکە خۆی پێویستی بەوەستان هەبێت، ئەوکاتیش هەر ئەوەندە دەوەستا تا کارەکەی تەواو دەکات، بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژەش پێش تاریك دابێت گەیشتینە شاری (مەخاچکەلا) پایتەختی داغستان، شاری ناوبراو دەکەوێتە سەر لێواری دەریای (کاسپی) وەك دیار بور بەشێکی خانوەکانی لە ناو ئاودا دەبیندران، بۆ ماوەی دە پانزە دەقیقە شەمەندەفەر وەستا، مەکینەکەی گۆڕی کاتژمێر نۆی شەو شاری ناوبراومان جێ هێشت، ئەو شەوەش تا بەیانی ڕۆیشتین. ئەوەی شایانی باسە هەر لە شاری دەربەندەوە تا کۆتایی سنوری داغستان جیا ناکارێتەوە لە دیمەن‌و نیگاری کوردستان تەنانەت هەڵکەوتی کێوە بەرزەکانیشی بەهی کوردستان دەچێت، بێگومان دیدەنی ئەو دیمەنە جوانانە وایان لێ کردم بەدرێژایی ڕۆژ هەر لەدەرگای فارگۆن بوەستم، بۆ ئەوەی لە دیتنی ئەو دیمەنانە بێ بەش نەبم لەبەرئەوەی دڵم پێ دەکرایەوە، چونکە کوردستانم پێ دەهاتەوە یاد. ڕۆژی (٨/٢٩) کاتژمێر شەشی بەیانی شەمەندەفەر لە شارێك وەستا، ناوی (گۆردمس) بوو، بۆ ماوەیەك لەوێ وەستاین لە کاتژمێر حەوت لە شاری ناوبراو دەرکەوتین بەرەو چۆڵەواریەك تەنیا وێستگەکانی شەمەندەفەر دەکەوتنە سەر ڕێگاو هیچی ترنا. لەو دەشتە چۆڵەواریەدا بارانێك دەباری وات دەزانی سەرەتای بەهارە، لە وێستگەیەك وەستاین لە چۆڵەواریەکە نانی نیوەڕۆمان خوارد، لە دوای کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆ بەرێ کەوتین ئەوشەوەش بەدرێژایی شەو هەر ڕۆیشتین لە چۆڵەواریەکە، کاتژمێر شەشی بەیانی ڕۆژی(١٩٤٨/٨/٣٠) گەیشتینە شاری (ئەستەرخان) شاری ناوبراو کەوتۆتە نزیك دەریای (کاسپی) لە سەر لێواری ڕووباری (ڤولگا) ڕوباری ناوبراویش لەخوارووی شاری (ئەستەرخان) دەڕژێتە ناو دەریای (کاسپی)، زیاتر لەحەوت کاتژمێر لە شاری (ئەستەرخان) وەستاین، لەبەر چەند

هۆیەك، یەکەمیان کۆمەڵێك پێویستیان هەبوو وەك وەرگرتنی خۆراكوشتی تر، دووەمیان سەیدعزیز شەمزینی لە باکۆ بەجێ مابوو چاوەڕێیان دەکرد بەفرۆکە بگاتە (ئەستەرخان).

ئەو ماوەیەی لەوێ وەستاین توانیمان دابەزینە هەندێ شوێنی شارەکە، ئەوەی دڵمی شاد کرد ئەوە بوو لەدوای کاتژمێر سێ و نیو خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ و جووت جووت لەشار دەردەچوون و لەماوەیەکی کەم خەڵك دارژایە سەر لێواری ڕوباری (ڤۆڵگا) وەك کەوەکانی بەهار جوت جوت بەیەکەوە دەگەڕان، لە ناو گیای سەوزی سەرلێواری ڕوباری (ڤۆڵگا). دیمەنی گەڕانی ئەو خەڵکە ئەوەندە جوان بوو هەرگیز لەیاد ناچێتەوە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە درەنگ لە شاری ئەستەرخان بەرێ کەوتین تاریك داهاتبو، بەسەر پردێکی درێژدا تێپەڕ بوین، پردی ناوبراو زۆر درێژە لە ناوەندی پردەکە شەمەندەفەر دەڕۆیشت، لەملاو ئەو لاشی ئۆتۆمبێل دەڕۆیشتن، لە پردەکە دەرباز بووین کەوتینە چۆڵەواری (قازاغستان) نیوەی شەو یەکێك خۆی لەشەمەندەفەر فڕێدا خوارەوە، ناچار لە وێستگەی پێشەوە وەستاین کاتێك بەدوایدا گەڕانەوە سەیر دەکەن هیچی لێ نەهاتوە، وا بەپێی خۆی دەڕوات، بینیمان(تاهیرە گێل) بوو خۆی فڕێ دابوو.

ئەوەی دەمەوێ بیخەمە ڕوو هەر لە ئەستەرخانەوە تا بەشێکی زۆری (قازاغستان) بەدرێژایی ڕێگا نیشانەی شەڕی دووەمی جیهانی پێوە دیار بوو، بەهەزاران کەلوپەلی تێك شکاوی سوتێندراو لەولاو لەم لای ڕێگا دەکەوتە بەرچاو وەك (فارغۆن و مکائن)و شتی تر کە لەکار کەوتبون، ڕۆژی (١٩٤٨/٩/١) گەیشتینە شاری (کراسنی ئۆردە)، شاری ناوبراو کەوتۆتە سنوری کۆماری (قازاغستان) لەکاتژمێر پێنجی ئێوارە لەو شارە دەرکەوتین بەشەویش لەچۆڵگە ڕۆیشتین، ڕۆژی (٩/٢)کاتژمێر شەش گەیشتینە وێستگەی (ێرسوومی) لەوێوە شەمەندەفەر ڕوی وەرگێرا بەرەوخوارو، لەدوای سوڕانەوەی گەیشتنە وێستگەی (ئەلتاتە) بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە شاری (ئۆزینسکی) لەکاتژمێر هەشتی ئێوارە گەیشتینە شاری (ئوورالسکی) ئەو شەوەش بەردەوام بووین لەڕۆیشتن، ڕۆژی (٩/٣)یش بەدرێژایی ڕۆژ لە چۆڵەواری سەروی (قازاغستان) دەڕۆیشتین بەرەبەیانی

(٩/٤) گەیشتینە شاری (سارتووچك) ئەو ڕۆژە تەواوی ڕۆژ لەدەشتاییەکی چۆل ڕۆیشتین، ئێوارەکاتی ڕۆژئاوا بەناو هەندێ گردۆلکەی نیمچە بەرزدا تێپەڕ بووین لەسەر یەکێك لەو گەروانە وەستاین، لەسەر ئەو بەرزاییە وێستگەی هێڵی ئاسنی بوو، دوای دوو پێچی درێژ بەدیوی تری وێستگەکە ناوی (کەندەگاج) بوو بەڕاستی شوێنێکی زۆر خۆش بوو هەمووی داپۆشرا بوو بەداری بەری، لەکاتژمێر سێی شەو گەیشتینە وێستگەیەکی تر وەستاین، دیار بوو لەبناری بەرزاییەك بوو وێستگەکە زۆر نزیك بوو لەشارۆچکەیەك بەوەدرەنگە شەوە لەم شارۆچکەیە دەنگی مۆسیقایەکی زۆر خۆش دەهات ئەو وێستگەی لێی وەستابووین ناوی (بیرچو.گوور) بوو لەکاتژمێر دووی ڕۆژی (٩/٥) گەیشتینە شاری (کازالینسکی) ئەو ڕۆژەش لە دەشتاییەك ڕۆیشتین کە چۆلەواری بوو ڕۆژی (٩/٦) هەر لە چۆلگە ڕۆیشتین کاتژمێر دوازدە گەیشتینە شاری (ژووسالی) شاری ناوبراو شارێکی کۆنی (قازاغستان) بوو کاتژمێر هەشتی ئێوارە گەیشتینە شاری (قزل ئۆردە) دیاربوو شارێکی گەورە بوو، ڕۆژی (٩/٧) گەیشتینە شاری (چیالی) ئەو شەوو ڕۆژەش لە ڕۆیشتن هەر بەردەوام بووین بۆ بەیانی ڕۆژی (٩/٨) گەیشتینە شاری (تورکستان) شاری تورکستان، جوانو ڕێك بوو دوا شاری قازاغستان بوو، لە کاتژمێر هەشت شاری ناوبراومان جێ هێشتو بەشەو ڕۆیشتین بەیانی ڕۆژی (٩/٩) گەیشتینە شاری (ئاریس) بۆ ئێوارە گەیشتینە شاری (تاشکەند) پایتەختی ئۆزبەکستان لە سەرەتاوە شەمەندەفەر بەناو باغو دارستانێکدا ڕۆیشتین هەر ئارەزوت دەکرد تەماشای بکەیت ئەوەندە دڵگیرو جوان بوو، لە ناو شار لە وێستگەیەك وەستاین کە ناوی (سالار) بوو لە ژێرەوەی هێڵی ئاسنیدا ڕێگای ئۆتۆمبێل هەبوو کە دەڕۆیشت بۆ شار دیار بوو ڕێگاکە ئاوەدان بوو، هاتووچۆشی زۆر بوو، ماوەیەکی زۆر لە وێستگەکە وەستاین دوایی بەڕێ کەوتین ئێوارە کاتژمێر شەش، گەیشتینە وێستگەیەکی تر بەناوی (جەرچیك سترۆی) لەوێ پێیان گوتین ئێرە ئەو شوێنەیە کە ئێوە لێی دادەبەزن، فەرماندرا بۆ دابەزاندنی کەلوپەلەکان لەشەمەندەفەر، ئێوارە درەنگ بوو ئەشیایەکان هەندێکیان دابەزێندران ئەوەی تریشیان مایەوە بۆ ڕۆژی دوایی، بەیانی بەدیار کەوت ئەو شوێنەی ئێمەی لێ دابەزی بووین نزیك بوو لە هێڵی ئاسنی، لەدوای دابەزاندنی کەلوپەلەکان دەست کرا بەگواستنەوەمان بۆ شوێنە دیاریکراوەکەی سەربازی، دیار

بوو سەربازگە بوو چۆڵکرا بوو، بەلاّم شوێنێکی خۆش بوو، چەند ڕۆژێك خەریکی ڕێکخستن بووین لە دواییدا ئەو ئەفسەرانەی لەگەڵمان بوون بەشێوەیەکی سەربازی دەستیان کرد بەمەشقی ڕۆژانە. ئەوەی زاندرا جەنابی مەلامستەفاو یاوەرەکانی لە (تاشکەند) لە شوێنێکی تایبەت داندرابوونو هەموو پێداویستیەکیان بۆ ئامادە کرابوو.

بێگومان ڕێگایەکی دوور درێژی دوازدە شەوو ڕۆژمان بڕی لە پایتەختی ئازربیجان لە قەفقاس تا ئۆزبەکستان ڕۆیشتین تا گەیشتینە تاشکەند، لە دوای حەسانەوەی چەند ڕۆژێك لە نوێ وە دەست کرا بەمەشقی سەربازی لەسەر بەرنامەی پێشان، لە دوای دوو سێ ڕۆژ ئێوارەیەك دوای دەوام ڕۆیشتمە لای میرحاج، ناوبراو بەتەنیا لە ژورێك بوو ماوەیەك لای دانیشتم لە کاتی قسەکردن پێم گوت: (میرە پێم ناڵێی بۆچی ئێمەیان ئەوەندە دوور هێناوین بۆ ئێرە؟) وەلاّمی ئەو پیاوە بەڕێزە ئەوە بوو: (پرسیارلە مەلامستەفا بکەن، ئەو دەزانێ بۆ ئەوەندەیاز دوور هێناوین). دەبێ ئەوە بڵێین کاتێك دەست کرایەوە بەمەشقی سەربازی دیار بوو هیچ لە بەرنامەی پێشوو نەگۆڕابوو لە مەشقی سەربازیو خوێندنو پرۆگرامی کار بەڵکو ئەفسەرەکان زیاتر خۆیان ماندوتر دەکردو هەوڵێکی زۆریان دەدا بۆ فێرکردنی چەکە جۆراو جۆرەکانی کە لەسەرمان دەخوێندن، ئەوانەی پێویست بوون بۆ داهاتووی ئێمە، بەلاّم ئەوەی جێگای بەدبەختی گەلی کوردبوو پشتمان دایە فێر بوون، ڕومان کردە دوو بەرەکیو ناکۆکیو ململانێو دژایەتی یەکتر، تا سەری گەیاندین بەبێ بەشیو دوور لە ئامانجەکەی بۆی چووبوین. زۆری نەخایاند لە ئاسیای ناوەڕاستیش گەڕاینەوە سەر پیشەی کۆنمان لە ناخۆشیو دووبەرەکی نێوان هەندێ سەرکردەکانی ڕێ ڕۆیشتن بەشێوەیەکی تایبەت لە نێوان (ئەسعەد خۆشەویو مستۆ مێرۆزی) ئەو نەخۆشیەی ئەوان گەیشتە ڕادەیەك خەڵکی تریشی گرتەوە، لەو کێشەو ململانێ یەی نێوان ئەسعەدو مستۆ ئەنجامی بەوە گەیشت، ئەسعەد توانی بەپاڵپشتی مەلامستەفا، مستۆ تووشی نیگەرانیو پەستی بکات، مستۆ زیاتر پەستی ئەوە بوو کە مەلامستەفا لەو قسانەی لەسەر پردی ماکۆ کردبوونی پاشگەز بووەوەو لە بیری خۆی بردەوە! هەروەك لە سەرەتاوە دیارکراوە (ئەسعەد) هەر لەسەرەتاوە دڵتەنگو ئالۆز بوو بەوەی کە مەلامستەفا دەستی لە ملی مامەندو مستۆ داو ناوی بەپاڵەوان

بردن، هەر ئەوەش بووە هۆی جموجۆڵی ئەسعەد دژی مستۆو مامەندو ئەوانەی هاتووچۆی ئەوانیشیان دەکرد، لەوە دەترسا نەوەك مامەندو مستۆ ببنە جێگای باوەڕی مەلامستەفاو شوێنی ئەو لەق ببێت! ناکۆکیەکە وای لێ هات ڕۆژ بەڕۆژ پەرەی دەسەندو گەیشتە شکایەتو شکایەت کاری، ئەو ناکۆکیە بوود بەڵایەكو توشی هەموومان بوو لە گەرمەی ئەو ناکۆکیەدا شەوی (١٩/١/١٩٤٩) میرزای شارەزای ڕێ ڕۆیشتن گیانی پاکی لە دەستداو لێمان جیابوەوە، بووە مایەی نیگەرانیو ناخۆشی هەموو لایەکمان، ناوبراو ئەو تێکۆشەرە بوو کە کەوتە پێش ڕێ ڕۆیشتن وەك شارەزایەك لەگەڵ پێشڕەوانی پێشەوە دەڕۆیشت بۆ شارەزایی ڕێگا،ماڵو منداڵەکەی خۆی بەجێ هێشتو پێشمان کەوت، میرزای دڵپاكو هەست بەرز لەو ڕۆژەدا کۆچی دوایی کردو گیانی پاکی خۆی لە پێناو کوردو کوردستان بەخت کرد،دوور لە ماڵومنداڵو کەسوکاری، ئەو پیاوە خزمەتێکی گەورەی بەمیللەتی خۆی کرد لەبەر ئەوە مردنی ئەو تێکۆشەرە بوو بەتازیەی گشتمان، ئەوەش ئەوە دەگەێنێ میرزا ببوە خۆشەویستی هەموومان، وەك لەسەرەوە دیارکراوە لەسەر ڕوباری (ئاراس) هەوڵێکی زۆری لەگەڵ درا بگەڕێتەوە ناو ماڵو منداڵی خۆی، بەلام ڕازی نەبوو لێمان جیا بێتەوەو دەی گوت: (خۆ ماڵ ومنداڵی منیش لە ماڵومنداڵی ئێوە زیاتر نین).

بەپەرۆشەوە ناکۆکیەکەی نێوان (مستۆو ئەسعەد) سەری بەوە گەیشت شەوی (٩/٢/١٩٤٩) چەند کەسێك هەوڵی ئەوەیان دابوو (ساکۆی کانیە لینجی) سەربڕن، بەلام سەر نەکەوتن، ئەوکارە ناسازەو نالەبارە بووە هەلێكو ڕێگا خۆشکەرێك بۆ ئەوەی ئەسعەد لەو ڕێگایەدا مەرامی خۆی جێ بەجێ بکاتو بەئارەزوی خۆی دەست بوەشێنێ لە ژێر ئەو پەردە ڕەشە ناوی کۆمەڵێك لەو کەسانەی لای(ئەسعەد) پەسەند نەبوون خستبویانە لیستی ئەو تاوانبارانەی گومانیان لێ دەکرا لە هەوڵی سەربڕینی (ساکۆ)، لەگەڵ دابووبن، لە سەرەتادا مستۆو برازاکانی خرانە بەندیخانەو ناوی چەند کەسی تریش لەو کەسانەی ئەسعد لێیان نارازی بوو درانە مەلامستەفا بۆ گرتنیان، ئەو ناوانەی درابوون بگیرێن (منو شاکر بەگی گەردیو لاوکۆی مامند)یش دەست نیشان کرابووین.

لەکاتێکا بانگ کرامە لای مەلامستەفا وەڵامم ئەوەبوو: (جەنابی مەلامستەفا من بارزانی نیم هیچ نارەزامەندیم لە ساکۆ نەبوە، دەبی لەبەرچی؟ بۆچی برۆم ساکۆبکوژمەوە؟) ئەگەر بمزانیبایە بەپیاو کوژ تاوانبارەدەکرێم ئەو هەموو ماندو بوونو هەڵاسانیەم بۆچی بوو، قەت ئەوەندەم ئەزیەت نە دەخوارد بۆکوشتنی ساکۆ، ئەوەندە رێیە بچم بێمە ئێرە، خۆ دەمتوانی لەبەر دەرگای خۆم پیاو بکوژم بەراستی پەرۆشە!) لە وەڵامدانەوەم مەلامستەفا هیچی نەگوت، من بەنابەدڵی دەرکەوتمو رۆیشتمەوە لای باوکمو ئەو بانگ کردنەی مەلامستەفام پێ راگەیاند، ئەوەی بەدیار کەوت باوکم زۆر پەست بوو، بانگی (حمید خسروی)کرد نامەیەکی پێ نوسی بۆمەلامستەفاو زۆر بەنارەزامەندی باسی ئەو رووداوەی بۆ دیەر کردبوو، نوسی بوی (دەبی ئەوە بزانی سلێمان بەگ بۆساکۆ کوشتن لەگەڵ تۆ نەهاتووە، بەڵکو بەدوای هیواو ئاواتێك کەوتووم، دیارە ئەویش ئەنجامی هیچە؟!).

کاتێك نامەی سلێمان بەگ دەگاتە مەلامستەفا ناوبراو هەستا بوو رۆیشتبوە لای سلێمان بەگو پێی گوتبوو: (میرا باش دەزانم تۆ بۆکوشتنی ساکۆ بەدوای من نەکەوتوی زرارم بۆیێ بانگ نەکردوە، تۆ ئەوها ئالۆز بووی، من بەو ئالۆزیە رازی نیم لەبەر ئەوەی ئێوە جێگای باوەری منن).

پێش هەوڵدان بۆ کوشتنەوەی ساکۆ یەکێك لە بارزانیەکان خۆی کوشتەوە، ئەوەو کۆمەڵێك لە نارەزامەندیەکان بوونە هۆی ئالۆزیو پە شێویو گرتنی مستۆو برازایەکانی بێ رەزامەندی حکومەت، چەند جارێك داوایان لێ کردن بەری بدەین، گوێیان نەدایە داوای کارمەندانی دەوڵەتو ئەفسەرەکانیش بەئەسعەدیان گوت: (ئەو بەندیانە بەردەن ئێوە رێزی دەسەلاتی دەوڵەت ناگرن، ئەگەر بەرنەدرێن ئەنجامی باش نابێت، وە هەر ئەوهاش بەشێوەی تایبەت کەپیتان (کەریمۆڤ) زۆری هەوڵدا بۆ بەردانی مستۆو ئەوانەی گیرابوون، بەڵام بێ سوود بوو، هەروەها کازیمۆڤ زۆر جار پێی گۆتبوون هەتا بەمەلامستەفاشی گۆتبوو، کابرا کورد بوو نەیدەویست ئێمە توشی کۆسپی مەترسی داربین، بەڵام گوێیان نەدایە داوایەکەی، ئەفسەرەکان زۆر بەپەرۆش برون بۆ ئێمە دەیان زانی بەسەر هاتێکمان بەدواوەیە.

## پەرتوو بڵاو بوونەوەمان بەسەر سەفخۆزەکاندا*

دوا بەدوای ئەو بەسەر هاتانەی باس کراو هەر ئەوەندەمان زانی لەڕۆژی (١٩٤٩/٣/١٢) مەلامستەفا لەگەڵ ئەو دوو کەسە (زیابو سعید) بەناوی ئەوەی بەڕێ دەکرێنە مۆسکۆ، بەفڕۆکەیەك بەڕێ کران لەجیاتی مۆسکۆ بەڕێ کرانە ئۆتۆنۆمی (قەرەقەلباغستان) لەوێ لەیەکێ لەسەفخۆزەکان دانرابوون بۆکارکردن، ئێمە وامان دەزانی ڕۆیشتینە مۆسکۆ، بەڵام ئەو فڕۆکەی ئەوانی هەڵگرتبوو لە جیاتی مۆسکۆ بردبوونی بۆ ئۆتۆنۆمی (قەرەقەلباغستان).

ئەوەی بەدیارکەوت ڕۆژی (١٩٤٩/٣/١٦) سەرلەبەیانی چەند کارمەندێکی دەوڵەت هاتنە سەربازگە، (مستۆ)و ئەوانەی بەند بوون بەرێندانو ناوی کۆمەڵێك لەسەرکردەکانیان خوێندەوە، (ئەسعەد خۆشەویو برازایەکانی عەلی خلیلو عیسی سوارو مستۆو برازای جادر، مامند مەسیحو حمدامین میرخانو مرادئاغای بیری فەقی حەسن میرو)، ئەوانیش بەفڕۆکەیەك ڕەوانەی یەکێ لەشارەکانی سەر لێواری دەریای (ئارالسك) لەشاری (مۆیناك) داندرابوون ئەویش دەکەوێتە ئۆتۆنۆمی (قەرەقەلباغستان)، بۆ کوێ بەڕێ کران؟ نەزاندرا بەناوی ئەوێ بەڕێ کران نەزاندرا بەناوی ئەوە بەڕێ کران گوایا دەڕۆن سەیری ئەوشوێنە بکەن ئەوەی بۆ ئێمە دیاریکراوە، کەچی بێ سەرو شوێن بوون هەتا ئەوکاتەی کۆکراینەوە، ئەوکاتە زاندرا کەوا ئەو کۆمەڵە کەسە لەشاری (مۆیناك) لەکارگەیەکی ماسی چاك کردن داندرابوون کاریان پێ دەکردن لەوێ زانیان چیان بەسەرهاتووە.

ڕۆژی (١٩٤٩/٣/١٧) سەرلەبەیانی پەرتو بڵاو کراینو بەسەر سەفخۆزەکاندا دابەش کراین هەرچەند کەسێك بۆگوندێك دیار کرابووین، ئەوانەی لە تاشکەند نیزیك بوون ئۆتۆمبێلیان بەدوادا هاتبوون هەندێك بەشەمەندەفەر بەڕێ کران بەوناوەی کە دەمان گوازنەوە شوێنێکی تر لە بەرئەوە بیر لەوە نەکرایەوە ئەوەی خزمە لەگەڵ یەك بچین، ئەوها لەیەك جیا کراینەوە هەریەکەی بەلایەك دا کەوتین هەر لەو

---

* سەفخۆز: کەرتی هەرەوەزی گشتی

:ەمەوە وەك تۆی زەوی بەسەر گوندەکان دا بلاو کراینەوە، هێشتا سەرمابوو بەفر نەگۆڕێ مابوو ئۆتۆمبێلێکی باری ئێمەی هەلگرتو ڕۆیشتین کاتی نیوەڕۆ گەیشتینە سەرپردێکی زۆر درێژ لەسەر روباری (سرداریا) لە دوای دەرباز بونمان لە پردەکە زۆری نەخایاند لە شارۆچکەیەك وەستاین، شارەکەش ناوی (سرداریا) بوو کەمێك نەناوشارەکە لەڕێگای گشتی دەڕۆیشتین کاتێك لە شەقامێك لایدار ئۆتۆمبێل لەناو حەوشێکی گەورە چوە ژورەوە، دیاربوو قائیمقامیەتی شاری (سەرداریا) بوو، ئێمە دە کەس بووین لەوناوچەیەدا داندراین لە دوای ماوەیەك ئەفسەرێك هاتەدەر لەگەل ئەو کەسەی لەگەلمان هاتبوو ناوەکانی ئێمەیان خوێندەوە، لەوێ بردیانین بۆشوێنێکی تر، لەوێ زۆریان ڕاگرتین ڕۆژ درەنگ بوو سواری ئۆتۆمبێل کراینەوە لەوێ بەڕێ کەوتین بەڕێگایەکدا ڕۆیشتین دیاربوو بۆگوند دەچوو،لە دەوروبەری ڕێگادا گوندی کشتوکالی دەکەوتنە بەرچاو ئێوارە تاریك پەڕینەوە گەیشتینە داوێنی باخچەکان ئۆتۆمبێلمان لە قور چەقی زۆرمان هەولدا چاری نەبوو، ناچار ناردیان لە گوند تراکتۆرێك هات، منداڵێك لێی دەخوڕی لە ئۆتۆمبێلەکەمان نزیك کەوتەوە زنجیرێکی دایە شوفێرو لە ئۆتۆمبێل قایم کراو ڕایکێشا، بەلامانەوە زۆر سەیر بوو کچ تراکتۆر لێ دەخوڕێت لەبەر ئەوەی نەمان دیبوو، شەو لەبەردەرگای دائیرەیەك وەستاین زۆر سەرمابوو لەوێش بەسەر سێ گوند دابەش کراین، چوار کەس بۆ گوندێك بەڕێ کراین هەر بەو شەوە ناوەکانیان خوێندینەوە (زرار سلێمان بەگ، جمیل تۆفیق بامەڕنی، مستەفا مەلا شین، مەلۆ پیرۆ) کاتێك گەیشتینە گوندەکە بردنیانین بۆ ژوورێك چوار جێگا داندرابوون، گوتیان ئێرە شوێنی ئێوەیە، زۆر بەساردی هەریەکەمان لەسەر چوارپایەیەك دانیشتین بەدلێکی غەمبار لەبەر ئەوەی نەمان دەزانی ئەو بەسەر هاتە چیە کە بەسەرمان هاتووە! من بۆم بەدیار کەوت کە ئێمە دوور خراوینەتەوە ئەو جێگایەو لەمەودوا شوێنی ئێمەیە بۆ کارکردن، ئەگەرچی مستەفاشین لەبەرخۆیەوە دەی گوت: (بەیانی دێن دەمان بەن). ئەوە خەیال بوو، ئەو شەوە بەدلێکی پڕ لە غەم نووستین. بەیانی خەلك سەیری دەکردین، ئێمە بەبەرگی سەربازین، وایان دەزانی دیلین‌و گیراوین، کە دیتیان (کەریمۆف) یەکێك بوو لەو ئەفسەرانەی دەرسیان بەئێمە دەگوت لەگەل ئێمەیان ناردبوو تا دامان دەمەزرێنن لەگەل بەڕێوەبەری گوند کەپیرە پیاوێکی (ئۆزبەك) بوو هاتنە لامان

پێیان ڕاگەیاندین ئێوە لێرە دەمێننەوەو کار دەکەن، نابێ بەبێ پرس لەگوند دەربکەون، ئەگەر بەبێ پرس لەگوند دەربکەون‌و بیست‌و پێنج کیلۆمەتر یش دووربکەونەوە هەر دەگیرێن‌و دەخرێنە بەندیخانە بۆیە ئاگادار بن خۆتان تووشی هیلاکەت مەکەن، ئەوەی هەستم کرد (کەریمۆف) زۆر بەپەرۆش بوو بۆ ئێمە. ئەوان ڕۆیشتن ئەو ڕۆژە هیچیان پێ نەگوتین‌و هیچیشیان پێ نەداین ئەو خواردنەی بۆ ڕێگا پێمان درابوو هەر ئەومان دەخوارد، ڕۆژی سێیەم سەرلەبەیانی کارگێڕی گوند هات‌و گوتی: (وەرن بڕۆنە مەزرا لەگەڵ خەڵکی گوند بۆ ئیش). منیش پێم گوتن (کارگێڕو مراقیب هاتون دەڵێن بڕۆن بۆئیش)، مستەفا مەلاشین پیرە پیاوێکی بارزانی بوو گوتی: (پێیان بڵێ ئێمە بۆ ئیش کردن نەهاتوین‌و ئیش ناکەین). منیش قسەکانی مستەفام پێ گوتن وەکو خۆی مراقیب گوتی: (ئێمە زۆریتان لێ ناکەین، پێتان دەڵێین ئیش بکەن ئەگەر ئیش نەکەن هیچتان پێ نادەین،دەبێ ئەوە بزانن لێرە ئەوەی کارنەکات ناخوات، کەیفی خۆتانە). مستەفاو جمیل گوتیان (ناچینە ئیش خوا رزقی ئێمە دەدات، لە دەستی ئەوان دانییە). ئەوان ڕۆیشتن لەدوایی پێم گوتن (برایان چارە نیە دەبێ ئیش بکەین ئێمە نەفین با زیاتر خۆمان سوک نەکەین چار ئەوەیە کار بکەین تا دەرگایەك دەکرێتەوە، خۆ ئێمە هەر لێرە نامێنین). دیاربوو ڕازی نەبون‌و نەچونە ئیش ڕۆژی دواییش گوتیان ناچین من پێم گوتن هیچم نییە بیخۆم ناچارم دەڕۆم کاردەکەم، ناچار ڕۆیشتمە دائیرەکەیان‌و پێم ڕاگەیاندن هاتوم بڕۆم بۆ کار هەر ئەو دەمە ناردمیان بۆ دەشت کاتێك گەیشتمە شوێنی کار سەیرم کرد هەموو خەڵکی گوند بەتێکڕایی ژن‌و پیاو خەریکی کۆکردنەوەی چەوەندەری شەکرن، ئەو چەوەندەرەی کۆدەکرایەوە باردەکرا بۆ کارگەی شەکر، منیش لەگەڵیان دەستم کرد بەکار لەوان باشتر کارم دەکرد، ڕۆژی سێیەمی کارکردنم هیچم نەبوو بیخۆم ئەوەی هەبوو خواردبوم پارەشم نەمابوو بەمراقیبم گوت، ناوبراو هەرزو پسولەیەکی نوسی گوتی بیبەبۆ کاتب لە دائیرە ڕۆیشتمە لای کاتبەکە، ئەویش بەئافرەتێکی گوت: (ڤالیا پەنجا ڕۆبل ئاڤانس بۆ ئەو برا کوردە بنوسەو بیدەیە)، بەمانای پەنجا روبل سلفەی بۆ بنوسە. هەر ئەوکاتە (ڤالیا)ی قەڵەو پەنجا ڕوبلی پێ دام.

بەڵێ یەکەم جار پەنجا روبلیان سولفە پێدام  کاتێك گەڕامەوە سەیرم کرد (مەلۆ) پیرو کزو داماو بوو لێم پرسی: (ئەوە چیتە خۆ نەخۆش نیت؟ ئەگەر نەخۆشی با بتبەم بۆ دکتۆر) ناوبراو گوتی: (نەوەلاّ نەخۆش یم چیت لێ بشارمەوە هیچم نیە بیخۆم توانای یەك جگەرەم نیە بیکڕم توشی نگبەتیەك بووم لەگەڵ جمیلو مستۆ یەکیان شێتو ئەوی تریان کەللە رەق نازانم چیان لەگەڵ بکەم)، پێم گوت: (برام من ئەمڕۆ پەنجا روبلم وەرگرتووە سلفە بگرە ئەوە دە روبل بۆ تۆ خەرجی بکە)، بەلاّم ئەوەش چارنیە، ناوبراو گوتی: (برا بەیانی منیش دێمە ئیش ئەوانیش کەیفی خۆیانە). بەیانی ڕۆیشتین بۆلای بەرپرسی گوند کە ناوی (مام عومەر) بوو ناوبراو گوتی: (ئێمە پێمان خۆشە یارمەتیتان بدەین بەمەرجێك بگونجێت، ئێمە ناتوانین کارێك بکەین لەگەڵ یاسای دەوڵەت نەگونجێت، ئێوە وەرن بۆ سەرکار با بزانن کە ئێوە کار دەکەن، ئەوەی دیکە غەمتان نەبێت پەکی هیچتان ناخەین). لە دوای پێنج رۆژ لە کاتێکا هیچیان نەما بیخۆن (مستۆو جمیل)یش ناچار بوون کار بکەن دیتیان هیچ چارەیەك نیە دەبێ هەر کاربکەن، ئەوجا بۆکار ملیان شۆڕ کردو دەستیان بەکار کرد.

بیرکردنەوە بۆ خوێندن: لەدوای ئەوەی کەمێك شارەزا بووین ڕۆژێك ڕۆیشتمە لای بەڕێوەبەری گوند مام عومەر پێم گوت: (من لێرە پەنابەرم لای ئێوە داندراوین بەشێوەیەکی کاتی ڕۆژێك دێ دەمان بەن، بۆیە داوام ئەوەیە یارمەتیم بدەن بەڵکو بتوانم ئەو ماوەیەی لای  ئێوەین بخوێنم، ناوبراو زۆر پیاوانە گوتی: (برۆ لای بەڕێوەبەری قوتابخانە داوا بکە وەرت بگرن، ئەگەر دەوامت بەیانیان پێ درا، من بەشەو کارت بۆ دیار دەکەم، ئەگەر دەوامیشت ئێواران بوو من لە کاتی وا کارت بۆ دیار دەکەم کە بگونجێ لەگەڵ خوێندنت. ئەوەی جێگای ڕەزامەندیم بوو هەڵوێستی ئەو مرۆڤە بوو پاڵی دام زیاتر هەنگاو باوێم بۆ خوێندن، لە دوای بەڵێنی بەرپرسی گوند ڕۆژی دوایی ڕۆیشتمە لای بەڕێوەبەری قوتابخانە، داوام لێ کرد وەرم بگرێت بۆ ئەوەی لە قوتابخانە بخوێنم، بەڕێوەبەر پرسی (هیچ بەڵگەنامەت بەدەستەوە هەیە کەتاچەندت خوێندوە؟) گوتم: (نەخێر مامۆستا هیچ بەڵگەنامەیەکم نیە دەبێ ئێوە ڕێگایەکم بۆ بدۆزنەوە بۆ ئەوەی بخوێنم).

یەکێك لە مامۆستایەکان بەناوی (ئەننا) ئافرەتێکی ڕوسی بوو گوتی: (وا بەڕاست دەزاندرێت لیژنەیەك لە مامۆستایان دابندرێت بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەیەکی لەگەڵ بکەن توانای کامە پۆلی هەبوو لەوێی دابنێن) دیار بوو پێشنیاری ئەو مامۆستایە پەسندکرا هەر ئەوکات پێیان گوتم: (خۆت ئامادە بکە بۆ تاقی کردنەوە) مادەکانیان پێ دام بۆ ئەوەی لەسەری بخوێنم. ئەوەی سودبەخش بوو بۆ خوێندنەکەم خوێندنی ئەو دوو ساڵەی سەربازیم بوو زۆر شتی فێرکردم یارمەتی دەرێکی زۆر باش بوو بەتایبەتی لە ڕوی زمانو نوسین، ئەوان جدولو کتێبیان پێدام منیش لەو ماوەی بۆم دیارکرابوو خۆم ئامادەکرد تا کاتی تاقیکردنەوە هەر ڕۆژەی یەکێك لە وانەکانیان لێ دەپرسیم، لە کۆتاییدا پێیان گوتم (لە پۆلی شەش دەوام بکە)، بەپێی ڕاسپاردە لە پۆلی شەش لەگەڵ منداڵان دانیشتم بەڕۆژ دەخوێند بەرپرسی گوند کاری بەشەو بۆ دیاری کردم ئێواران دەڕۆیشتم کارم بەتراکتۆر دەکرد زەویم دەکێڵاو بەڕۆژیش دەچوومە قوتابخانە، ئەو ساڵە پۆلی شەشم تەواو کرد بۆ ساڵی دوایی ڕۆیشتمە پۆلی حەوت، لە پۆلی حەوتەم بەیەکەم دەرچووم بەڵگەنامەم بەدەستەوەیە لەگەڵ شەهادەی سوپاسنامەی قوتابخانە.

بێگومان ئەوکاتە لە یەکێتی سۆڤیەت یاسایەك هەبوو ئەوەی پۆلی حەوتەمی بەیەکەم تەواوکردبایە لە هەر پەیمانگایەك بیویستبا بخوێنێ وەردەگیرا بەبێ ئەوەی دواناوەندی تەواو بکات. ژیانی دوورکردنەوەمان نزیکەی سێ ساڵی خایاند ئەو مانەوەیەمان لە سەفخۆزەکان ئێمەی لەیەك دابڕیبوین کەسمان ئاگاداری کەس نەبووین، باوکم لەپارێزگای (سەمەرقەند)، بوو نەمدەزانی لەکوێیە لەدوایی دووساڵ ئەوجا زانیم وا لە سەرمەرقەندە لەگەڵ (عبدالرحمان مفتی، محمد نجیب بەرواری) لەسەفخۆزێك داندرا بوون لە نزیك شاری سەمەرقەند. درێژە کێشانی مانەوەمان بەو شێوە ناسازە ناچاری کردین بەدەنگ بێین، لە دوا ڕۆژانی هاوینی (١٩٥٠) ڕۆژێك ئاگاداری کاربەدەستانی ناوچەکەمان کرد کە پێمان بڵێن (مەلامستەفا) لە کوێیە؟ بابزانین کە کەسو کارەکانمان لە کوێن پێویستە پێیان بزانین، ئەوکاتە نامەیەکی نارەزامەندیمان پێدان تیایدا دیارکرابوو لە بەرچی ئێمە تووشی ئەو دەردەسەریە کراوین. بۆچی گوێ لە داواکاریەکانمان ناگیرێ، ئێمە هاتووین پەنامان هێناوە بۆ سۆڤیەت بو ئەوەی پێمان بگەیەنێ نەك نەفیمان بکات، وەك تۆوی زەوی هەریەکەی

بۆ لایەك فرێ بدرێین. لەدوای چەند رۆژێك بەدیارکەوت، کەوا گوێ نادرێتە داواکاریەکانمان تا بەوە گەیشت رۆژێك گشتمان رۆیشتینە بەردەرگای دائیرەی قایمقامیەت، زۆر بەتوندی لەداواکاریەکانمان پێچاینەوە لە ئەنجامی ئەو توندو تیژیەی ئێمەو پۆلیس بەگژیەکدا چووین، مشتومڕەکە سەری بەوە گەیشت کە شەڕە بەرد دروست بوو لەنێوانمان، ئێمە هەوڵمان دەدا بڕۆین بۆ (تاشکەند) شکایەت بکەین، ئەوانیش نەیان دەهێشت، لەدواییدا بەڵێنیان پێداین وەڵامێ بدەنەوە، کەچی دوای ئەو ئەزیەت دانەش هیچیان بۆ نەکردین. ئەنجامی درێژە کێشانی بێزاریو ژیانی دەردەسەریو تاڵیو مانەوەمان لە سەفخۆز پاڵی دام ژن بێنم، چونکە بەتەنیا گوزەران کردن زۆر زەحمەت بوو لەوە زیاتر ئەوەی توشی هاتبووین مەگەر هەر خۆم بزانم چیم دیت لە دەستی ئەو مرۆڤە نەفامانەی لەگەڵم بوون.

## جارێکی دیکەش کۆکراینەوە یەك شوێن

لە سەرەتای مانگی (١٠ی ١٩٥١) لەسەر داوای (مەلا مستەفا) ئاگادارکراین کەوا لەشوێنێك کۆ دەکرێنەوە لە ناوەڕاستی مانگی دیاریکراودا هەموو لەپارێزگایدکانی تر دابەش کرابوون بەرێ کرانە پارێزگای (تاشکەند)، لەوێش لەسەفخۆزێك داندراین لەناوچەی (چیناز)، سەفخۆزەکە بەناوی ژمارە نوێی میوەجات بوو، ئەو سەفخۆزە لەچوار گوند پێك هاتبوو گوندەکان داچاندراوی داری سێو بوون، ئەو گوندانە بۆ ئێمە چۆڵ کرابوون، لەماوەی چەند رۆژێك هەموومان لەناوەندی ئەو چوار گوندە کۆکراینەوە. لەوشوێنەی باسکراو جێو رێیان بۆ رێکخستین، دوای ئەوەی کە هەموومان بەیەك گەیشتینەوە رۆژێك لەسەر ڕاسپاردەی (مەلا مستەفا) هەموومان لەگۆڕەپانێك ئامادەبووین وەمانزانی دێت بۆمان دەدوێتو بەخێرهاتنەوەمان لێ دەکات بەبۆنەی بەیەك گەیشتنەوەمان، کاتێك هات دوانەکەی هەر ئەوەندە بوو کەخەڵکەکە چاوەڕوانی بوو، لەجیاتی دڵ خۆشی بەیەك گەیشتنەوە زۆر بەتوندی ڕووبەڕووی خەڵکەکە وەستاو هەڵوێستێکی نارێکی هەبوو هەستی بریندار کردین بەوەی گوتی: (ئەوەی ژنی هێناوە بابەبەنە ئەولاوە)، ئەوانی جیاکردنەوە زۆریش بوون ئەوانەی ژنیان هێنابوو، کاتێك سەیرم کردن نیوە بەنیوە

دەبوون، لە ئاخاوتنەکەی (مەلامستەفا) هەندێ وشەی نابەدڵی فڕێ دان‌و گوتی: (ئەوەی ژنی هێناوە پیاو نین لەوەش زیاتر ڕۆیشت..!!)

شکی تێدانیە ئەوانەی ژنیان هێنابوو بەتێکڕایی دڵ شکاوو نیگەران بوون لەو هەڵوێستەی (مەلامستەفا)، ئەو لەیەك جیاکردنەوەو دوانەکەی ناوبراو بوونە هۆی ئەوەی زۆر لە پیاوەکان گەڕانەوە ئەو شوێنەی پێشان لێی بوون دەیان گوت: (مادام ئێمە پیاونین بۆ لێرە بین؟) دەڕۆینەوە لای ژنەکانمان بەو شێوەیە بەکۆمەڵ ڕۆیشتن‌و ئەوێیان بەدڵ شکاوی بەجێهێشت.

لەدوای ئەوەی لە سەفخۆزی دیاریکراو جێ نشین کراین، ئەوەی توانای خوێندنیان هەبوو ناویان نوسرابوو بۆ خوێندن، ئەوانی دیکەش ڕێکخران ئێوارا‌ن لەدوای کارکردن بخوێنن.

ئەوەی شایانی باسە ئەو شوێنەی ئێمەیان لێ کۆکردبوەوە خۆشترین شوێن بوو، سەفخۆزی میوەجات بوو، دیاربوو بۆ ئێمە چۆڵ کراوە هەندێ خەڵکیان لەوێ ڕاگواستبوەوە. ئێمەیان لە شوێنی ئەوان جێنشین کرد، (مەلامستەفا)و برازایەکانی وەك پێشان لەنزیك تاشکەند لەشوێنێکی تایبەت داندرابوون زیاد لە پێویست چاو دێری دەکران.

ئەوەی ڕاستی بێت حکومەت ئەوەی پێویست بوو بۆی کردین بەشێوەی تایبەت لەبارەی خوێندن، ڕێگادرا بەوانەی ئارەزوی خوێندنیان هەبێت‌و بتوانن لە هەر پلەیەك بخوێنن دەیان نارد، لەسەفخۆزیش قوتابخانەی ئێوارانی تایبەتیان بۆ ڕێکخراو کۆمەڵێك مامۆستایان بۆ دانابوون دەرسیان پێ دەگوتن، دەرسی کوردیشیان پێ دەگوترا. شێوەی کارکردن ڕۆژی پێنج کاتژمێر کاریان دەکرد سێ کاتژمێریش بۆ خوێندن داندرابوو، بەڕاستی لەسەرەتا یەك دوو مانگ زۆر بەڕێك‌وپێکی دەیان خوێند، دوایی پەیتا پەیتا سست بوون تا وای لێ هات زۆر کەمیان مانەوە، دەتوانم بڵێم زۆریان کشانەوە، ئەوانەی مابوون زۆر بەساردی دەچون بۆخوێندن.

دەربارەی پیرەکان بەڕاستی چاودێریان دەکرا بەتایبەتی لەڕووی ژیان یارمەتیان دەدراو مامۆستایان بۆدانابوون فێری نوسین‌و خوێندنەوە بکرێن زۆریان لەکارکردن ئازادکرا بوون، ڕێزێکی تەواویان لێ دەگیراو ژیانێکی ئاسودەیان بۆ دابین کرابوو، ئەوانەی توانای کارکردنیان هەبوو کارێکی لێ وەشاوەیان پێدابوون.

*مشتومڕی مەلا حەسەن باب یەزید:* لەسەرەتای مانگی (١١/١٩٥٢) لە مشتو مڕێك لەنێوان (مەلا حەسەن)و بەڕێوەبەری سەفخۆزدا، مەلا حەسەن دەستی نەبەڕێوەبەر وەشاندبوو، لەسەر ئەو دەست وەشاندنە بەندکراو بەرێ کرابوە تاشکەند، ماوەیەك بێ سەرو شوێن دیار نەبوو، (مەلامستەفا) زۆر هەوڵیدا، بەڵام هیچیان بۆ نەکرد، دیتی هەوڵدانی بێ سودە لە(٢٥/١١/١٩٥٢) بارزانیەکان بەگشتی سەفخۆزیان بەجێهێشتو ڕۆیشتنەوە تاشکەند چوونە بەردەرگای ئەنجومەنی وەزیرانی ئۆزبەکستان داوای بەردانی (مەلاحەسەن)یان دەکرد، ئەوکاتەش زۆر سەرماو ساردی بوو بەفر لەگۆڕی بوو ئەو خەڵکە بەوسەرمایە لەبەردەرگای وەزارەت وەستابوون، بەکارمەندانی دەوڵەتیان ڕاگەیاندبوو یان بەردانی (مەلاحەسەن)یان بماندەنەوە دەستی دەسەلاتدارانی عێراق!

لەدوای ئەو هەموو بەسەرهاتانەی بەسەرمان هاتبوو :یسان کەوتینەوە ناو گێژاوی دووبەرەکیو سودمان لەڕابردوو وەرنەگرتو تەمبێ نەبووین، سەرەتای دووبەرەکیەکە لەباش چاوەش (محمد مستەفا) دەست پێکرا، ناوبراو یەکێك بوو لەکۆنە چەك هەڵگرەکانی لەشکری (مەلامستەفا). ئەو کەسە لەساڵی (١٩٤٣) لەوکاتەی مەلامستەفا لەناوچەی بارزان خەریکی دەست بەسەرداگرتنی مەخفەرەکانی ئەو ناوچەیە بوو، باش چاوەش (محمد) بەخۆیو ئەوانەی لەگەڵی بوون بەچەکەوە ڕۆیشتبونە ریزی هێزەکانی (مەلامستەفا)وە هەر ئەوکاتەوە ماڵو منداڵ جێ دەهێڵێ لەگەڵ بارزانیەکان دەچێتە ئێران، لەوێش لەگەڵ مستۆ مێرۆزی لەبەرەکانی جەنگ جەنگاوەر بووە، لەدوای تێکچونی کۆماری مەهاباد لە بارزانیەکان دانەبڕاوە تا ئەو ڕۆژەی بەیەك گەیشتنەوەمان لە(ڤریڤسکی) لە ساڵی (١٩٥١)، لە دوای ئەو بەیەك گەیشتنەوەمان هەندێ کەلو پەلی پیاوێکی ئەسعەد خۆشەوی برر دەبێت، بزر بوونی ئەو ئەشیایە دەخرێتە ملی باش چاوەشو دەیبەن بۆلای مەلامستەفا، ناوبراو گوتبوی: (ئەزبەنی تۆش دەزانی من پیاوی دزی نیمو بۆ دزی ئەوەندە ساڵە ماڵو منداڵی خۆم بەجێ نەهێشتوە، تکایە لەسەر خواستی ئەسعەد من بەدز تاوانبار مەکەن).

ئەوەی بەدیارکەوت مەلامستەفا بەتوندی لەگەڵی دوابو، ئەویش بەو توندیە ڕازی نەبووە، لە ئەنجام مەلامستەفا پێی گوتبوو: (برۆ لێرە نەمێنی بۆ کوێ دەڕۆی

برۆ). ئەو پیاوە ناچار ڕۆیشتە شوێنێکی دوور لە ناوچەی (بەیاووت) لە سەفخۆزێك کاری دەکرد، لەدوای ماوەیەك شەوێك لەژوورەکەی خۆی سەریان بڕیبوو لەسەر سنگیان دانابوو!! لە دوای لێ کۆڵینەوە ئەمنی سۆڤیەتی وێنەی بکوژەکانی (محمد)ی دابوە مەلامستەفاو گوتبویان خۆتان کوشتوتانە! ئەو تەنگوچەڵەمانەی ڕویان داو هاتنە ئاراوە بارزانی ئالۆز کرد، لەسەرەتای (١٩٥٣) بەنهێنی ڕۆیشتە مۆسکۆ لەوێ مایەوە، ناوە ناوە سەری لە پیاوەکانی ئۆزبەکستان دەداو چەند ڕۆژێك دەمایەوە، لەمۆسکۆ کۆمەڵێك مامۆستایان بۆ دانابوون بۆ خوێندن.

ناکۆکیەکە لەدوای ئەوەی کە بارزانیەکان ڕۆیشتنە بەر دەرگای ئەنجومەنی وەزیران بۆ ئازادکردنی مەلاحەسن دیار بوو کارمەندانی حکومەتی سۆڤیات لەگەڵ مەلامستەفا کەوتنە دوانو ناڕەزامەندیان نیشانداو یەکێك لەوانەی لە مۆسکۆ هاتبونە تاشکەند بەمەلامستەفای گوتبوو: (تکایە جەنابی مەلا مستەفا زیاتر یاری بەئاگر نەکەیت).

بێگومان پێش ئەوەی ئەو ئاگاداریە ئاڕاستەی (مەلامستەفا) بکرێت، (شێخ سلێمان) برازای خۆی داوای لێ کردن بگەڕێنەوە شوێنەکانیان، کە دیتی ناگەڕێنەوە ئەوەی گوێ ڕایەڵی ناوبراو بوون گەڕانەوە سەفخۆز، لێرە دور بەرەکی زیاتر پەرەی سەندو تەواو بوونە دوو پارچە، نێوان (شێخ سلێمانو مەلا مستەفا) بەرەو ئالۆزی ڕۆیشتو بوە ڕقەبەری. ئەوەی دیار بوو (مەلامستەفا) زۆر بەتوندی لە دژی ئەوانە دەدوا کە بەشداری یاخی بونیان نەکرد بوو، نەڕۆیشتبونە بەردەرگای ئەنجومەنی وەزیران، ناویشی لای خۆی نووسی بون بەخائینو هەڕەشەی لێ دەکردن، ئەنجامی توند تیژیو ناکۆکی مامو برازا بەرەو هەنگاوی مەترسی دار دەڕۆیشت، هەر ئەوەش بوو زیاتر (مەلا مستەفا)ی پاڵداو ڕۆیشتە مۆسکۆ، لە دوای ڕۆیشتنی ناوبراو (شێخ سلێمان) ڕۆیشتە (ڤریڤکی) ئەو شوێنەی پیاوەکانی لێ بوون.

کاتێك (مەلا مستەفا) ڕۆیشتە (مۆسکۆ)و لەوێ مایەوە ئەسعەدی کردبوە جێگری خۆی بۆسەر پەرشتی پیاوەکان، ناوبراو کەسێکی دڵ ڕەش بوو لایەنی چاکە نەبوو، وەك ئاشکرایە (ساکۆی کانیەلنجی) کەسێکی دڵپاکی ڕاست گۆبوو زۆر لەخراپەکاری دوور بوو ناوبراو گوتبوی (من دەزانم کێ بوو هەوڵی کوشتنەوەی داوەو ئەو هەوڵدانەیان بۆچی بوە، ڕۆژێك دێت بەچاریاندا بدەمەوە، بەخوای بەقسەی

ئەسعەدی بەربەرەکانی شێخ سلێمان ناکەم). لەدوای ئەو دوانەی شەوێك لەبەردەرگای ماڵی بەتفەنگی ساچمە تەقەی لێ کراو بریندار کرا، برینەکەی کاریگەربوو جێگای مەترسی بوو، بەڵام دکتۆرەکان توانیان لەمردن ڕزگاری بکەن، دوا بەدوای ئەو کەسێك بەناوی (حدۆ) لە شارۆچکەی (ڤریڤسکی) شەو تەقەی لێ کراو کوژرا، هەر بەو شێوەیەش یەکێك لەومریدانەی لای (یوسف سەفتی) بوون خۆی کوشنەوە مرد! دوو بەرەکیو ناکۆکی هەتا دەهات بەرەو ئاڵۆزیو دژواری دەڕۆیشت بەتایبەتی لەنێوان مەلامستەفاو شێخ سلێمانی برازای.

ئەوەی جێگای باس کردنە ئەوەیە لەسەرەتای کۆکردنەوەمان کۆمەڵێك لە ئێمە بۆ خوێندن بەڕێ کراینە شاری تاشکەند، خۆش بەختانە لەگەڵ میرحاجو عبدالرحمن مفتی ماوەی سێ ساڵ لەبەشی ناوخۆی قوتابخانە لەیەك ژوور بووین، ئەوەی جێگای ڕەزامەندیە ئەوەیە میرحاج وەك مامۆستایەکی پایە بەرز زۆر شتی لێ فێربووین بەتایبەتی من، ئەو پیاوە لە زۆر شتی دورخستمەوەو زۆر زانیاری تری لێ فێر بووم کەبوونە ڕێ ڕۆنکەرەوەم زۆر سوود بەخش بوون چ لەڕوی خوێندن چ لەڕوی پەروەردەو پێگەیشتن پڕ بەدڵ دەڵێم ئەوەندەی باسی ئەو مرۆڤە هەڵکەوتوە بکرێت لەگشت ڕووێکەوە هەر کەمە، ناوبراو مامۆستای ڕێ نیشاندەرم بوو ئامۆژگاریەکانی بوونە بازگەی دەرباز بوونم لە زۆر کۆسپی ترسناك، ئامۆژگاریەکانی هەردەم ئاوێنەن خۆمی تێدا دەبینم!!

لەدوای تەواوکرنی پەیمانگای تاشکەند بریارێك لەحکومەتی ئۆزبەکستان دەرچوو بنێردرێم بۆ خوێندنگایەکی بەرز لە مۆسکۆ، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك ڕێك نەکەوت، ئەوەی بەدیارکەوت ئەسعەد خۆشەوەی (بێجان جندی) ناردبوە تاشکەند لەوێ بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ مەلامستەفا کردبوو پێی ڕاگەیاندبوو کەوا حکومەتی ئۆزبەکستان بەبێ ڕەزامەندی ئێوە (زرار) دەنێرێتە مۆسکۆ بۆ خوێندنی بەرز. مەلامستەفا لەوێ بەکاربەدەستانی ڕاگەیاندبوو ڕازی نیم (زرار) بێچتە مۆسکۆ بۆ ئەو خوێندنگایەی بۆی دیاری کراوە، هەروەها بەبێجان دەڵێت (ئاگاداری سلێمان بەگ بکەن با کوڕەکەی نەنێرێت بۆ مۆسکۆ، چونکە ڕازی نیم). لەسەر ڕاسپاردەی مەلامستەفا دوو کەس دەنێرێتە لای سلێمان بەگ پێی دەڵێن (مەلامستەفا بەتەلەفۆن ئێمەی ڕاسپاردوە ئێوە ئاگادار بکەین کەزراری کوڕت

نەنێری بۆ مۆسکۆ بۆخوێندن، چونکە بەرپرسی مەلامستەفا نیە)، دوو کەسەکەش بریتی بوون لە(محمود عبدالرحمان‌و سەعید عمر ئەرگۆشی). سلێمان بەگ پێیان دەڵێت: (بەداخەوە بۆ هەڵوێستی ڕابەری کورد ڕێگا لە جەنگاوەرێکی ماندوی ئەو ڕێگایە بگرێت‌و نەهێڵێت بخوێنێت، دەبێ لەوە بەدوا هیوای چیمان پێی بێ)!؟ زۆر بەتوڕەیی پێیان دەڵێت: (هەستن بڕۆن نێنەوە بەر دەرگام من ئاگادار نیم حکومەت ئەو کوڕە دەنێرێت، لە جیاتی ڕابەر خۆی هەوڵ بدات کە تاکە کوڕێکم لەگەڵە پێی بخوێنێ ڕێگای خوێندنی لێ دەگرێت، چاك بوو منیش تێگەیشتم لەکوردایەتی سەرۆکتان!!).

بەڕاستی باوکم ئاگاداری هیچ نەبوو هەر ئەوەندەی دەزانی (زرار) خەریکی خوێندنە، بەخۆشی لایەنگری مەلامستەفا بوو زۆر بەتوندی دژی دووبەرەکی بوو، بەلاّم بەو ڕاسپاردەیە تەواو پەست دەبێت‌و دەڵێت: (دیارە خۆڕایی نییە ئەفسەرەکانی لێ دوور کەوتنەوە). هەر لەوکاتەوە سلێمان بەگ ڕوی وەرگێڕا لە مەلامستەفاو لێی دوور کەوتەوە بەدڵ شکاوی مایەوە، چەند جارێك مەلامستەفا ویستی چاوی بەسلێمان بەگ بکەوێت‌و لەگەڵی بدوێت، بەلاّم سلێمان بەگ ڕازی نەبوو هەریبینێ، کەچی پێشان لۆمەی ئەوانەی دەکرد کە لە مەلامستەفا دور دەکەوتنەوە، کەس نەدەوێرا باسی مەلامستەفای لەلا بکات. لە دوای ئەو نارەزامەندیەی مەلامستەفا لێپرسراوی کاروباری خوێندکاران لە وەزارەتی پەنابەران (سەفایف) ناردی بەدوامداو ڕۆیشتمە لای گوتی: (وەك دەزانی مەلامستەفا لە مۆسکۆ نا ڕەزامەندی خۆی بەکاربەدەستانی ئەوێ ڕاگەیاندوە نابێ تۆ بۆ خوێندن بڕۆیتە مۆسکۆ جا ئەگەر لێرە یان هەر شوێنێکی بتەوێ بخوێنی دەتنێرین). ئەوەی ڕاستی بێت دەمویست لە(نەوت) بخوێنم، بەلاّم لەبەر ئەوەی زۆر لە بابم بەدوور دەکەوتمەوە بۆ خوێندنی نەوت دەبوایە بڕۆمە (باکۆ) یان (قازان)، ئەو دوو شوێنە زانکۆی نەوتی لێ بوو ئەو دوو شوێنەش ئەوەندە دوور بوون لەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین باوکم ڕازی نەبوو بڕۆم، لەبەر ئەوە لە زانکۆی (تاشکەند) مامەوە لە کۆلێژی پەروەردە بەشی مێژوو. مانەوەم لەتاشکەند ئەوەی باش بوو ناوە ناوە دەڕۆیشتمە (ڤریڤسکی) ئەو شوێنەی باوکم‌و منداڵەکانی لێ بوون. ڕۆژانی پشوو دەڕۆیشتمە لایان، ڕۆژێکی یەك شەم چوومە لای باوکم بینیم پیاوێکی پیر لای باوکم

دانیشتووەو نەمناسی، پیاوێکی ڕەق و لاواز بوو باوکم پێی گوت: (کاك ڕەسول ئەوەیە زرار)، ناوبراو چاك و چۆنیەکی گەرمی لێکردم ئینجا دووبەدو دانیشتین و قسەمان کرد لە قسەکانیدا دیار بوو پیاوێکی وشیار بوو لە ماوەی دانیشتنمان زۆر شتی مێژوویم لێ بیست، لە دواییدا زۆر بەوردی باسی گرتنی خۆی، گێڕایەوە کە چۆن لە نەغەدە لەساڵی (١٩٤٦) دەستگیرکراوەو بەڕێ کراوەتە سۆڤیەت، لەقسەکانی بەردەوام بوو گوتی: (لە ڕاستیدا من پیاوی ئینگلیزەکان بوم، لە زووەوە وەك کاربەدەستێکی شەریکەی نەوتی کەرکوك باوەڕ پێکراوی ئەوان بووم پەیوەندیم بەزۆر کەسەوە هەبوو لەکوردستان، لەکاتێکا هێنامیان بۆ ئێرە هەبوو شتێکم پێ گوتن، ئەوانیش بەڕیاندام، لەوکاتەی بیستم ئێوە هاتوون بۆ سۆڤیەت داوام لێ کردن بمبەن بۆ لای بارزانیەکان، مەلامستەفا دەناسم ئەوانیش هێنامیان بۆ ئێرە) ڕەسول زۆر لە مێژ بوو چاوەڕوانی مەلامستەفا بوو، بەلاّم لەکاتی هاتنی ناوبراو بۆ (فریڤسکی) نەیهێشت بڕواتە لای چاوی پێ بکەوێت گوتبوی: (نامەوێت چاوم پێی بکەوێت با لێرە بڕوات پیاوێکی خراپە بۆتە نۆکەری ڕوسەکان!!). لە دوای ئەوەی ڕیگای پێ نەدرا بڕواتە لای مەلامستەفا، (ڕەسول ناجی) دەمی بەرداو پەردەی لەسەر کۆمەلێك نەهێنی لادا کە هی ئەوە نین بنوسرێن. وەك دیار بوو کێشەی نێوان مام و برازا تا دەهات ئالۆزترو قوڵتر دەبوو، ئەوەی زۆر ناخۆش بوو ئەوە بوو ئێمە تووشی بەلاّ ببوین لەگەڵ کام لا بدوابای لایەکەی تر ڕووی لێ وەردەگێڕای و لالوت دەبوو، لێرەدا ئێمە کەوتبوینە گێژاوێك ڕێگای لێ وون کردبووین، ئەوەندەی بلێی بەپەرۆش بووین بەو نێوان ناخۆشیەی ئەو دوو کۆمەڵە لەبەرئەوەی چەند بۆ خۆیان زیان بەخش بوو دوو ئەوەندە زیاتر بۆ ناوبانگی کورد زیان بەخشتر بوو.

### دۆزینەوەی کوردێکی سەربەڕو ئاوارە:

لەهاوینی(١٩٥٧) بۆ چارەسەری نەخۆشی (ڕۆماتیزم) بەڕێ کرامە باکوری (قازاغستان) شاری (سۆلی لیتسکی) شاری ناوبراو گۆماوێکی سوێری خوێیاوی هەیە ئەم جۆرە نەخۆشانە خۆیان تێدا دەشۆن، نەخۆشخانەی لێیە بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم، لەو نەخۆشخانەیە لەژێر چاودێری پزیشکەکان بووم، وا ڕێك کەوت ڕۆژێك لەگەڵ چەند برادەرێك ڕۆیشتین بۆ سەیرکردنی ئەو ئافرەتەی (لینین)ی بریندار

کردبوو ئافرەتەکە ناوی(قەپلان)بوو لەلاپەڕگەی شاری ناوبراو لەکۆشکێکی دوو نهۆم دا بەندبوو، بەڕۆژ دەهاتە سەرئەو تارمەیەی ڕووی لەڕێگای گشتی دابوو بۆ دانیشتن، ڕۆژنامەی دەخوێندەوە خەڵك دەچون بۆ دیتنی، ئەوەبوو ئێمەش چووین‌و بینیمان، لەگەڕانەوەماندا بۆ شار لەگەڵ شوفێرێك گەڕابنەوە زانی من کوردم گوتی: (من جیرانم کوردەو خەلکی کوردستانی عێراقە ناوی علی بارزانی)ە، لەگەڵی ڕۆیشتم بۆ ناسینی هەرچەندە دووریش بوو لەشار، بەلاّم بەداخەوە لە ماڵ نەبوو، ڕۆژی دووەم دوای نیوەڕۆ دیسان ڕۆیشتم ئەمجارەیان دیتم لەگەڵی کەوتمە قسەکردن دیار بوو نەیدەتوانی بەکوردی قسە بکات تێکەلاّوی ڕووسی دەکرد، لەو بەیەك گەیشتنەمان بۆم دەرکەوت علی بارزانی نەبوو، بەڵکو خەڵکی سلێمانی بوو ناوبراو لەسەردەمی کۆماری کورد لەمەهاباد لەگەڵ (جەلاّل ئەمین بەگ) بووە لەگەڵ تێکچونی کۆماری کورد دەربەدەر بوەو ڕووی کردۆتە سۆڤیەت.

ئەوانیش ڕەوانەی ئەو شوێنە دوورەیان کردبوو بێ هاوار‌و بانگ، ڕۆژی سێیەم ڕۆیشتمەوە لای کاتێ چووم کچێکی بچوکی مردبوو، لە دوای ناشتنی گەڕامەوە، بەلاّم ئەدرەسی شێخ سلێمان‌و میرحاج‌و هی خۆم پێدا لە ئۆزبەکستان، ئەدرەسی مەلامستەفاشم پێدا لە مۆسکۆ، لەدواییدا لەگەڵ ئێمە گەڕابەوە کوردستان.

### ئەو هێرشە سێ قۆڵیەی کرایە سەر میسر لەساڵی (١٩٥٦):

لەکاتی دەست درێژیە سێ قۆڵیەکە کرایە سەر میسر لە ساڵی (١٩٥٦) لەسەر داوای شێخ سلێمان بارزانی بروسکەیەکی ئامادەبوونی هەندێ لەپەنابەرە بارزانیەکان بۆ حکومەتی میسر بەرێ کرا کەئێمە کۆمەڵێك لەو کوردە پەنابەرانەی لە سۆڤیەت دەژین ئامادەین بێین بەشداری بکەین لەڕووبەڕوو بونەوەی داگیرکەران. ئەوەی بەدیارکەوت (جمال عبدالناصر) لەڕێگای کارمەندێکی بالوێزخانەی سۆڤیەت لەمیسر سوپاسی شێخ سلێمانی کردبوو. لە دوای بلاّوبونەوەی دەنگی ئەو بروسکەیە زاندرا مەلامستەفا زۆر پەست ببوو، بەرێکەوت ئێوارەیەك لە(سێنترل پارك) چاوم بە(علی محمد صدیق) برازای مەلامستەفا کەوت ناوبراو گوتی: (زرار دەزانی مەلامستەفا زۆر لەتۆ تورەیەو دەڵێت ئەو بروسکەیەی بۆ عبدالناصر کراوە زرار

کردویەتی شێخ سلێمان ئەوەندە چالاك نیە بیر لەو کارە گرنگ و دووربینە بکاتەوە).
منیش گوتم: (کاك علی بەپەرۆشەوە من هەست دەکەم ئەوەی هاتووچۆی شێخ سلێمان بکات جەماعەتی ئەسعەد خۆشەوی زۆر بەتوندی دژی دەوەستن! دەبێ ئەوە بزانن ئێمە ناتوانین ڕوو لە ئێوە وەربگێڕین، ئێوە مامو برازای یەکترن، بۆ دەبێ مەلامستەفا لە من تووڕە ببێ لە کاتێکا شێخ سلێمان کارێکم پێ ڕادەسپێرێت، یان بۆ تۆی بکەم. دەبێ ئاگادار بن‌و بزانن ئەو ناکۆکیەی کە ئەیە ڕوو لە زیانێکی ترسناکە بۆ هەمووان، من بارزانی نیم، بۆ من هەمووتان وەك یەکن‌و بەیەك چاو سەیرتان دەکەم، مەلامستەفا کە مامی ئێوەیە ئەوە شتێک، بەلام وەك سەرکردە شتێکی ترە، بۆیە دەبێ ئەوە بزانن من لەگەڵ ڕاستیم ئێوە ئامتان ڕووەو ڕاستی بن بەهەمەوو بڕوامەوە دەستی بۆ درێژ دەکەم). بێگومان دیار بوو (علی)ش لەو پەڕی نارەزامەندیدا بوو بەرامبەر دارو دەستەی (ئەسعەد خۆشەوی. زۆر بەتوندی دابەزیە سەریان و باسی کردن.

## هاتنی ڕەحیم قازی لە باکۆ بۆ تاشکەند

ئەوەی زاندرا (ڕەحیمی قازی) بانگ کرابوو بۆ کۆنگرەی ئەدیب‌و نوسەرانی ئاسیا لە تاشکەند کە لە ڕێکەوتی (١٠/٦/١٩٥٧) بەسترا. پێش هاتنی ڕەحیم بۆ تاشکەند(سلێمان بەگ)ی بەبروسکەیەك ئاگادار کردبۆوە. لەکاتێ کەگەیشتە تاشکەند (شێخ سلێمان) لەگەڵ چەند کەسێك ڕۆیشتبونە بەخێرهاتنی، داوایان لێ کردبوو سەردانی (ڤریڤسکی بکات) ئەو شوێنەی شێخ سلێمان‌و باوکمی لێ بوو، لەسەر ئەو داوایە (ڕەحیم) سەریدا لەو شوێنەو پێشوازیەکی گەرمی لێکرا لەلایەن لایەنگرانی شێخ سلێمان‌و ئەوانی تریش، لەسەرەتا میوانی سلێمان بەگ بوو دوایی لای شێخ سلێمان میوان بوو، شەوو ڕۆژێك لامان مایەوە، ڕێزێکی زۆری لێگیرا وەك کەسایەتیەکی ناسراوی بنەماڵەیەکی کوردپەروەرو ڕۆشنبیرێکی کورد، لە دواییدا زاندرا مەلامستەفا بەهاتنی (ڕەحیم) بۆ (ڤریڤسکی) زۆر نارازی بووەو زۆر قسەی نارێك‌و لێنەوەشاوەی بەوکەسانە دابوو ئەوانەی پێشوازیان لە ڕەحیم کردبوو.

دووبەرەکیو ناکۆکی نێوان مەلامستەفاو شێخ سلێمان ئالۆزیەکی زۆری خستبوە ناو ئەو کەسانەی ئەو رێ رۆیشتنە بەناوبانگەیان ئەنجامدا کە لاپەرەیەکی نوێیان لە مێژووی سەربەرزی کورد تۆمار کرد.

دەبوایە ئەو سەرکەوتنە پیرۆزە بپارێزرێتو بەفیڕۆ نەڕوات. لە پایزی (١٩٥٧)دا مەلامستەفا لەمۆسکۆ هاتە تاشکەند بۆ ماوەی چەند رۆژێك لە ڤریڤسکی مایەوە، لەسەر داوای یەکێك لەتابیعە ناودارەکانی بارزانی (یوسف سەفتی) شێخ سلێمانو میرحاجو سلێمان بەگ لەگەڵ مەلامستەفا دابنیشن، بەڵکو رادەیەك بۆ ئەو دوو بەرەکیە دابنێن. ئەو دانیشتنە لەبنکەی مریدەکانی (یوسف) رێکخرا، کاتێك ناردیانە دوو باوکم منیش لەگەڵی چووم لە سەرەتای دانیشتنەکەدا مەلامستەفاو شێخ سلێمان کەوتنە دووان، مەلامستەفا گوتی: (ئەو نێوان ناخۆشیە بۆتە گەورەترین کۆسپ لەرێگای بەرەو پێش چوونی ئێمە بیر لەوە ناکرێتەوەکە ئێمە نوێنەری نەتەوەی کوردینو دەنگی گەلی کوردمان پێیە بیدەین بەسۆڤیەت،) جارێکی تر دابەزیەوە سەر ئەوانەی ژنیان هێنابوو گوتی: ئەوانەی ژنیان هێناوە کوردیان بەبیر نەماوە ژنی خۆیان بەهەموو کوردستان ناگۆڕنەوە هەر ئەوشە ئێمەی توشی ئەو هەورازە کردووەو لێی سەرناکەوین) ئینجا شێخ سلێمان گوتی: (مام دەربارەی ئەو ناکۆکیانەی باستان کردو دەفەرمووی بونەتە کۆسپ خۆت لە هەمومان باشتر دەزانی باری ئەو ناکۆکیە دەکەوێتە ملی کێو لە کوێ سەری هەڵداوە!؟ حەزدەکەم لەم بارەیەوە بدوێم، بۆ مەسەلەی نوێنەرایەتی ئێمە قەت نوێنەری کورد نین، کەی نوێنەری کوردین لەترسی حکومەتی عێراق رامان کردووە لەهیچ جێگایەك شوێنمان نەبوو خۆشمان بەنوێنەری کورد دادەنێین، ئەگەر نەتەوەی کورد بەو کردارانەی ئێمە بزانێو بمان ناسن کە چیمان بۆ کردوون خۆمان لێ بەری دەکەن). وە دەربارەی ئەوانەی ژنیان هێناوە گوتی: (مام ئەوە جاری چەنددەمە ئەوە دوپات دەکەیتەوەو لۆمەی ئەوانە دەکەیت کە ژنیان هێناوە ئەوانیش بەڵگەیان بەدەستەوەیە کەوا بۆچی ژنیان هێناوە). مەلامستەفا لەقسەکانی شێخ سلێمان نیگەران بوو هەستا بەتوڕەیی رۆیشتو یەکسەر گەڕایەوە تاشکەند. لەدوای رۆیشتنی مەلامستەفا، سلێمان بەگ بەشێخ سلێمانی گوت: (نابوایە ئەوها توند لەگەڵ مامت بدوییت پێم خۆش نەبوو بەو شێوەیە دڵشکاوی بکەیت باش نیە بگاتە ئەو رادەیە) ئەو ناکۆکیەی نێوان مامو برازا بەردەوام بوو تا گەڕانەوەمان بۆ نیشتمان لەساڵی (١٩٥٩).

## گەشتێکی خۆشگوزاری بۆ دوورگەی قرم

لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٧)و سەرەتای (١٩٥٨) توشی نەخۆشی بووم، ماوەیەکی زۆر لە نەخۆشخانەکان کەوتم، نەخۆشیەکە پەرێشانی کردبوم، کاتێك لە نەخۆشخانە دەرکەوتم بۆ ئەوەی لە پەرێشانیو لاوازیو بێ توانایی ڕاست ببمەوە بەڕێ کرام بۆ دورگەی (قرم) کە خۆشترین شوێنی پشودانو کات بەسەر بردن بوو لەیەکێتی سۆڤیەت، بۆ ماوەی چل ڕۆژ لەو دورگەیە مامەوە، دورگەی ناوبراو دەکەوێتە سەر ئیواری دەریای ڕەش، خەڵکێکی زۆر بۆ حەسانەوە دەچوونە ئەو دورگەیە. لەدوای دەرکەوتنم لەنەخۆشخانە، وەزارەتی پەنابەران تەواوی کارەکانیان بۆ سازکردم لەڕۆژی دیاریکراو بەڕێ کەوتم لە تاشکەند بەڕێگای مۆسکۆدا بەرەو دورگەی قرم لەدوای سێ ڕۆژو چوار شەو ڕۆیشتن بەشەمەندەفەر گەیشتمە مۆسکۆ لەوێ لە میوانخانەی (ئەوروپا) دابەزیم سێ ڕۆژ لە مۆسکۆ مامەوە، بەتایبەتی بۆ دیتنی هەندێ شوێنی مێژویی گرنگ، لەو دیدەنیانەدا ئەوەی بەلامەوە سەرنج ڕاکێش بوو(میترۆ) بوو ئەژێر شار بۆ هەموو لایەك دەڕۆیشت ئەوەی زۆر جوان بوو سەرکەوتنو دابەزین بوو بۆ وێستگەکانی میترۆ بەدیمەنێکی زۆر جوان دەکەوتە بەرچاوم.

ڕۆژی دووەم سەر لەبەیانی ڕۆیشتمە گۆڕەپانی سوور لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە بەڕیز وەستابوون بۆ تەماشاکردنی تەرمەکانی (لینینو ستالین) وەستام، گۆڕەپانی سوور دەکەوێتە پێش کۆشکی (کرێملین) خەڵکێکی زۆر وەستا بوون کەچی زوو گەیشتمە (مەوزەلی) یانی (ئارامگە) ئەوەی شایانی باسکردنو تێڕامانە ئەو دوو سەربازەی لەبەردەرگا وەستابوون وات دەزانی گیانیان لەبەردا نییە، بەو شێوەیە وەستا بوون بێ جوڵە. کاتێك ڕۆیشتمە ناو ئارامگە چاوم بەتەرمەکانی ئەو دوو ڕابەرە کەوت ئەوەی بەلامەوە زۆر سەیر بوو لینین ئەوەندە لەمێژ بوو مردبوو کەچی وات دەزانی تازە خەوی لێکەوتووە. ئێوارەی هەمان ڕۆژ ڕۆیشتمە کتێبخانەی گشتی، کتێبخانەکە ئەوەندە گەورە بەقەبارەو ئەوەندە دەوڵەمەند بەکتێب مرۆڤ کە دەچێتە ژورەوە سەری سوڕ دەمێنێ نەمدەزانی سەیری چی بکەم. بۆ شەویش ڕۆیشتمە (بەلشۆی تیاتر).

ڕۆژی سێیەم ڕۆیشتمە مۆزەخانەکان، لەسەرەتادا چومە مۆزەخانەی ناو (کریملین) کەمۆزەخانەیەکی مێژوییە کەلوپەلی دەسەلاتدارانی ڕابردووی ڕوسەکانی تێدا پارێزراوە، هەروەها مۆزەخانەی گشتیو ئەوانەی چاوم پێیان کەوت کەپڕ بوون لەکەلوپەلی مێژووییو شتی سەرنج ڕاکێش ئەگەر لەسەریان بنوسم هەرگیزاو هەرگیز تەواو نابێت، بەلام ئەوەی جێگای باسە تۆپە کۆنەکانی ناو حەوشی (کریملین)نو زەنگولەکانیان بەڕاستی سەرنج ڕاکێش بوون، ئەوەی زۆر بیرم لێ دەکردەوە ئەوە بوو لەسەردەمی ڕابردو ئەو زەنگولە گەورانە بەچ شتێك بەرز کراونەتەوەو لەو شوێنە داندراون!! دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە ڕۆیشتمە ناو(گووم) یانی (فرۆشگای گشتی) لەدوای دیتنی فرۆشگای گشتی چوومە سەر ڕوباری (مەسکەوە ریکا) لەوێ بەبەلەمی ناو ڕووبار کەمێك گەڕام، دەبوایە کاتژمێر هەشتی ئێوارە لەوێستگەی ئەو شەمەندەفەرەی بۆ قرم دەڕۆیشت ئامادە بم بۆ ئەوەی بڕۆم بۆ (سیمفیرۆپۆل) لەوێش بۆ شاری (یالتە) لە سەر لێواری دەریای ڕەش.

لەکاتی دیاریکراو لەوێستگە ئامادە بووم، شەمەندەفەرەکە کاتژمێر نۆ لەمۆسکۆ دەرکەوت بەیانی لەگەڵ گزنگی هەتاو گەیشتمە (سیمفیرۆپۆل) لەوێ دەبوایە بەئۆتۆمۆبێل بڕۆمە شاری (یالتە) دیار بوو گەراجی ئۆتۆمۆبێل ئامادە بوو ئەو ئۆتۆمۆبێلەی ئێمەی هەلگرتبوو بەناو شارە خۆشەکەی(سیمفیرۆپۆل) دا تێپەڕی لەزۆر شوێنی شار نیشانەی کاولکاری شەڕی پێوە دیار بوو، کاتێك لە شار دەرکەوتین بەرێگایەکدا ڕۆیشتین بەرێگای (ڕواندز ـ حاجی ئۆمەران) دەچوو ئەوەندە دلگیر بوو زۆر بەئارەزووەوە سەیری ئەملاو ئەولای ڕێگام دەکرد، لەگەروێك سەرکەوتین لەدیوەکەی تر ئۆتۆمبێل لەقەدپالی چیا دەڕۆیشت لەخوارەوەی (دەریای ڕەش) بوو، دیمەنەکەی ئەوەندە جوان بوو هەر حەزت دەکرد سەیری بکەی، کاتێك لە پێچو کەندو دۆلەکانیدا تێپەڕ بووین ئەملاو ئەولای ڕێگا دارستانێکی چڕو پڕ بوو لەداری جۆراوجۆر، لەو ڕێگا خۆشە بەناو دوو شارۆچکەی زۆر خۆشو جوان تێپەڕ بووین کە بریتی بوون لە(ئالووپکاو ئالووشتە) جیا لەوەش هەندێ گوندی جوانیش کەوتە سەر ڕێگامان لەکۆتاییدا گەیشتینە گەروێك شاری (یالتە)مان لێ بەدیارکەوت لەسەر بەرزاییەکە شاری (یالتە) دیار بوو کەوتبوە سەر لێواری دەریا پشتی لە چیای (ئای پیتر) بوو، بەشێکی شار کەوتۆتە قەدپالی بەرزاییەکانی چیای ناوبراو، کاتێك

نەبەرزاییەك دەرکەوتین زۆر بەئارەزووەوە سەیری ئەو دیمەنە جوانانەم دەکردو دڵم پێیان دەکرایەوە، لەدەریاشەوە پاپۆرەکان بەرەو (یاڵتە) دەهاتن لە چەند لایەکەوە دیار بوو ئۆتۆمبێلەکان هاتووچۆیان دەکرد، لەگەرەوەکە شۆڕ بووینەوە بۆ ناو شار لە گەراج دابەزین پرسیم: (سەنەتۆریای ئۆزبەکستان لە وێیە؟) لەوێ تاکسیەك هەڵیگرتم‌و بردمی بۆ (سەناتۆریای) ناوبراو، بەناو یاڵتەدا تێپەڕین ماوەیەکی تەواو بەپێچاوپێچ سەرکەوتین لەنزیك تاڤگەی (ئووچان سوو) لەشوێنێك ڕۆیشتینە ناو حەوشی باخێك لەدەرگای خانویەك وەستاین دیار بوو خانوەکە لەخانوە کۆندکانی دەوڵەمەندەکانی سەردەمی ڕابوردوو بووە، کرابوە شوێنی کارمەندانی سەنتۆریەکە، (سەناتۆریا بەمانای شوێنی حەسانەوەو چاودێری پزیشکی). لەدوای دابەزین ڕۆیشتمە لای کاتبەکەو نوسراوەکەم دایە کچێك سەیری کردوو هەر زوو یەکێکی بانگ کردوو لەگەڵی ناردم ماوەیەك بەژێردارەکاندا ڕۆیشتین لەبەردەرگایەك وەستاین کاتێك ڕۆیشتینە ژورەوە لەژورێك چوارپایەکی بۆ دیارکردو گوتی: (ئەو چوار پایە هی تۆیە) ئێوارەی ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئەوانەی لەوێ لەلام بوون ڕۆیشتینە شوێنی نان خواردن هەر زوو کچێك هات گوتی: (بفەرموو چیت ئارەزوە با بۆتی بهێنم)، بەو شێوەیە لەوێ بەپێی کەتەلۆك خواردنمان پێ دەدرا. لە دوای چەند ڕۆژێك دابەزیمە ناو شاری (یاڵتە) بۆ دیتنی شوێنە خۆش‌و مێژوویەکان، یەکەم جار ڕۆیشتمە ئەو کۆشکەی کە کۆبونەوەی سەرۆك دەوڵەتەکانی هاوپەیمانانی لەساڵی (١٩٤٣) تێدا دەبەسترا، (سەرۆکی ئەمریکا ڕۆزڤیلت‌و سەرۆکی سۆڤیەت ستالین‌و سەرۆکی بەریتانیا چەرچیل) لەو کۆشکەدا بەیەك گەیشتبورن کۆشکەکە کراوەتە مۆزەخانەیەکی مێژوویی‌و وەك خۆی ماوەتەوە، ئەو کەلوپەلەی لەوکاتە لەناوی دابووە دەستی لێ نەدراوە. بەڕێکەوت چاوم بەکۆمەڵێك قوتابیانی زانکۆی ئاسیای ناوەڕاست کەوت هاتبوون بۆ گەشتووزار بۆ دورگەی (قرم) لەگەڵیان کەوتمە قسەکردن، (گوتیان ئامادەبە دەڕۆینە سەردانی شوێنەوارە مێژوویەکان)، ڕۆژی (١٩٥٨/٧/٢) سەرلەبەیانی لەگەڵ قوتابیەکان لە(یاڵتە) دەرکەوتین بەنیازی شاری (باحچە سەرای) شاری ناوبراو لەسەردەمی پادشایەکانی دورگەی قرم پایتەختی دەوڵەت بووە.

## سەردانی شوێنە مێژووییەکان:

بەڵێ ڕۆژی (١٩٥٨/٧/٢) بەیانی لە (یالتە) دەرکەوتین بۆ شاری (باخچە سەرای) کەلە سەردەمەکانی پێشوو پایتەختی شایەکانی قرم بووە، کەلەیالتە دەرکەوتین پێچاوپێچ سەرکەوتینە سەرچیای (ئای پیتر) کاتێك سەرکەوتین دیار بوو لەسەر چیا گۆڕەپانێکی خۆشکراوی پانو بەرین هەبوو، گۆڕەپانەکە ڕازاوەی گوڵو داری جوان بوو لەشێوە پارك لەناوەندی گۆڕەپانەکە گۆرستانی ئەو پارتی زانانەی لەشەڕی ئەڵمانەکان شەهید ببون بوو، زۆربەیان لەوێ بەخاك سپاردرابوون، گۆڕی دوو جەنراڵیشی لێ بوو، ماوەیەك وەستاین دوای سەرەو ژێر بەناو دارستانێکدا ڕۆیشتین بەدرێژایی ڕێگا گوڵو گوڵزارو داری دەست چین بوو، کاتێك گەیشتینە شاری (باخچە سەرای) ڕوومان کردە کۆشکە کۆنەکەی شای قرم، کۆشکی ناوبراو کراوە بەمۆزەخانە هەموو کەلوپەلەکانی ماڵی شا وەکو خۆی ماوەتەوە بێ دەستکاری کردن شوێنی دانیشتنی شا چۆن ڕاخستراوە وەك خۆیەتیو دەستی لێ نەدراوەو دەست لێدانیشی قەدەغەیە، لەدیدەنی ئەو کۆشکە گەورەیە ئەوەی بەلامەوە سەرنج ڕاکێش بوو ئەوە بوو لەناو دالانەکەی بەردەرگای ژووری شا سەرێك دروست کراوە کە سەری ئافرەتەو دەجولێتەوە بەملاو ئەولاداو فرمێسك دەبارێنێ، دەربارەی ئەو سەرکە بۆیان باس کردین گوایە شا خۆشەویستێکی لێ مردووە بۆ ئەوەی لە بیری نەکات زانایەکان ئەوەیان بۆ دروست کردووە تا ئێستاش پارێزراوەو خەڵك سەیری دەکەن، بەزمانی فارسیو عەرەبیش لەسەری نوسراوە. لەشاری باخچەسەرای دەرکەوتین بۆ دیتنی شوێنەوارێکی مێژوویی زۆرکۆن ئەویش شارێکی دروستکراوی کۆنە، مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەهرامەکان، شوێنەکە چیایە، هەر چوار دەوری هەڵدێرە تاکە ڕێگایەکی بۆ دەچێ لەهیچ لایەکی ترەوە ناتوانی بۆی بچی، ئەم شارە زۆر بەئامێدی دەچێ، لەوانەیە کەمێك سەخت تر بێت، ئەو ڕێگایەی دەچێتە ناوی دەرگایەکی بۆ دروست کراوە کە جێگای سەرسوڕمانە مرۆڤی ئەو سەردەمە چۆن ئەو دەرگایە گەورەو پتەوەی دروست کردووە!!

شوێنەکە ناوی (جفوودکالە)یە، ئەوەی ئەو دەستکاریە ببینێ بیر لەوە دەکاتەوە ئەو ئەشکەفتانە بەدەست کۆڵدراون‌و تیایدا ژیاون، ئەشکەفتە دروستکراوەکان زۆرن لەناو ئەشکەفتەکان پاردەی لەسەر دانیشتن دروست کراوە کە بەڕاستی عەقڵێکی زۆر بەتوانا بووە. هەر بەو شێوەش کۆمەڵە بیرێکی گەورەو زۆر قوڵ بەشێوەیەکی وەستاکاری لەشاخ کۆڵدراون، بیرەکان لەسەرەوەیان دەرگایەکیان هەیە هەر ئەوەندەیە زەلام دەتوانێ برواتە ناوی، لەناوەوە زۆر بەرین‌و قوڵن کە جێگای سەرسوڕمانن. دروست کردنی ئەو بیرانە دەڵێن بەزستان بیرەکان پڕ دەکران لەبەفر بۆ کاتی مەترسی‌و ئابلۆقە، دەرگا گەورەکەش دیوارێکی بۆ کراوە دوو مەتر بەرینەو هەرماوە ڕێگاکانی هاتووچۆشی بەرد ڕێژ کراون‌و بەردەکانی شۆرد راون‌و دەزانرێ زۆری لەسەر ڕۆیشتوون، ئەوەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ماوەیەکی زۆر لەو شوێنە ژیاون. بێگومان (جفودکالە) کراوەتە مۆزەخانەیەك زۆر بەجوانی پارێزراوە، خەڵکێکی زۆر دەڕۆنە دیدەنی، لەناو ئەو مۆزەخانەیەدا چەند گۆڕێکی لەبەرد داتاشراوی لێیە کە بەدەست دروست کراوە لەهی مسریەکان دەچێ، تەرمی شایەکانی ئەو سەردەمیان لەناو دایە، یەکێك لەگۆڕەکان دوو تەرمی لەناودایە کەژن‌و مێردن، گۆڕەکە یەك بەردە جێگای دوو مردووی تێدا دروست کراوە لەنێوان هەردوکیان ناوبرێکی زۆر تەنك هەیەو لەڕاستی سەریان کوونە. ئەوەی ڕاستی بێت ئەگەر باسی ئەو شتە کۆنانەی سەردەمی پێشووی مرۆڤی کۆن بکەین کە لەو شوێنە بینیمان قەت بەنوسین تەواو نابێت‌و نانوسرێت. کانتۆرێکی کۆنی دروستکراو لە دارگوێز لە ناو ژوورێکدایە کە تەمەنی (٥٠٧) ساڵە. لەگەڕانەوەماندا ئێوارە هەر بەو ڕێگایەدا گەڕاینەوە کە پێیدا هاتبووین.

لە (١٩٥٨/٧/٤) لەناو دەریا بەبەلەمێك گەڕاین لەنزیك مێردڕەوی بەلەم وەستابووین دووبەدوو قسەمان دەکرد لەگەڵ یەکێك لە برینداره خۆبەختکەرەکانی جەزائیر کەناوی (منعیم) بوو، لەکاتی قسەکردنماندا پیرە پیاوێکی ڕووس لەنزیك ئێمەوە وەستا بوو، کاتێك گوێی لە ناوی کوردستان بوو لێمان نزیك کەوتەوەو پرسی: ئێوە کوردن؟ گوتم: (بەڵێ من کوردم فەرموو مامەگیان چیت، دەوێت لەخزمەت دام بەپێی توانام). پیرە پیاوەکە زۆر بەدڵخۆشی‌و سۆزەوە گوتی: (من قەرزاری کوردانم نانی ئێوەم خواردوەو چاکەتان لەسەرم هەیە، من لە شەڕی (١٩١٤) لەکوردستان

بریندار بووم کوردەکان نەیاندامە دەست تورکەکان، لەگەڵ کاروانێك بەرێیان کردمەوە کوردستانی ئێران، کورد مەردن، نان دەرنو خاوەن شەرەفن). زۆری هەوڵدا لەگەڵی برۆمە ماڵیان نەمتوانی برۆم، چونکە دەبوایە بگەرێمەوە سەنەتۆریا. بۆ جاری دووەم لەگەڵ قوتابیان رۆژی (٦/٧/١٩٥٨) رۆیشتینە شارە خۆراگرەکەی (سیڤاستۆپۆل) بۆ دیدەنی پانارۆمای ئەو شارە، بەو رێگایە خۆشەدا رۆیشتین ئەوەی لەقەد پاڵی چیا دەروات لەخوارەوەشی دەریایە، ماوەیەکی زۆر بەو رێگا خۆشەدا رۆیشتین کاتێك گەیشتینە شار چوینە هەندێ لەو شوێنانەی شەری تێدا کرابوو، لەدواییدا پانۆراماکەمان بینی، ناتوانم ئەو باسە بکەم ئەوەی ئەوان بۆیان باس کردین دەربارەی ئەو شەرانەی لەوێ کراون، لەو خۆراگریەی سوپای ئابلۆقەدراوی سۆڤیەت ئەو ماوە درێژە بەراستی مرۆڤ سەری لێ دەشێوێ، ئەگەر بیر لەو هەموو لێکدانەی ئەو هێزە شەر کەرانە بکاتەوە، ئەوەی زاندرا سێ ساڵ ئەو شارە لە ژێر ئابلۆقەدا بەبێ هیمداد مابۆوە، هەندێ جێگاش هەبوون رێگەیان نەدا بۆ دیدەنی برۆینە ناوی.

رۆژی(٩/٧/ ١٩٥٨) سەر لەبەیانی بۆ جاری دووەم بەسەرکەوتمەوە گازینۆیەکانی تاڤگەی (ئووچان سو) ئەو شوێنە لەبەرزاییەکانی قەدپاڵی کێوی (ئای پیتر)، شوێنی پشودانو کات بەسەربردنەو تا بڵێی خۆشە، بەسەر شاری یالتەدا دەروانێت، دەریای رەشیش بەتەواوی دیارە، کاتێك دانیشتبوین، بوو بەبارانێك هەر ئەوەندەمان بۆکرا هەریەکەمان برۆینە ژێر هەیوانێك تا بارانەکە وەستا. رۆژی (١١/٧/١٩٥٨) سەرلەبەیانی بەئارەزوو جارێکی تر بەسەر کەوتمە سەرچیای (ئای پیتر)، لەوێ لەناو گۆرستانی پارتیزانەکان خەریکی خوێندنەوەی نوسینی سەر کێلەکان بووم لەپرێکا چاوم کەوت بەیەکێ لەو ئەفسەرانەی لە(باکۆ) دەرسیان بەئێمە دەگوت ناوی (قولیف)بوو، ناوبراو هەر منی دیت، گرتمیە باوەشو زۆر بەسۆزەوە چاكو چۆنی لەگەڵ کردم لەدواییدا بۆم دەرکەوت ناوبراو لەسەر رادار بوو، پێش ئەوەی ئەو ئەفسەرە ببینم رادارم لە دوورەوە دەدیت کە کاری دەکرد نەم دەزانی رادارە، کاتێك لەگەڵ (قولیف)کەوتینە قسەکردن ئەو گوتی: (سەری ئەو چیایە پرە لە رادارو موشەك بەهۆی ئەو رادارانە هەموو شوێنە سوپاییەکانی تورکیا لەبەر چاوی ئێمە دیارن بەتایبەتی فرۆکەخانەکانیان، هەر فرۆکەیەك لە تورکیا

هەڵدەستیّ دەبیندریّت بۆ کویّ دەچیّت، موشەکەکانیش (اندراون ئاراستەن بۆ نیدانی ئەو شویّنانەی ئارەزومان بیّت لیّی بدەین). ئەو هەموو موشەکانە ڕوویان لە تورکیا بوو ئەوەی ڕاستی بیّت زۆر بەووردی سەیری ڕادارەکانو موشەکەکانم دەکرد لەبەرئەوەی یەکەم جاربوو شتی وا ببینم. ماوەی چەند کاتژمێرێك لای ئەو مرۆڤە بەرێزە مامەوە لەو شوێنە بڵندو خۆشەی سەرچیای (تای پیتر) لەوێوە دەریایەکی بیّ سنور دیارە هەموو هاتوچۆیەکانی ناو دەریا دیارە، پاپۆڕەکان لەبەندەری یاڵتە وەستابوون بەکورتی وێنەیەکی وات دەخاتە بەرچاو لیّی تێر نابی، لەگەڵ ئەو مامۆستایەم زۆر دواینو سەردەمەکانی باکۆمان یاد دەکردەوە، بەدرەنگەوە ماڵاوایم لەو ئەفسەرە بەرێزە کردو گەڕامەوە یاڵتە.

## ڕاگەیاندنی دەنگی شادی و ئازاد بوون

بەیانی ڕۆژی (١٤/٧/١٩٥٨) وەك ڕۆژەکانی پێشوو زوو هەستامەوەو دەستم دایە ڕادیۆ لە سەرەتاوە گوێم دایە ڕادیۆی مۆسکۆ بەرووسی لەدەنگو باسی دەرەوەی گوتی: (لەپەیامنێری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە ئەم هەواڵەمان پێگەیشتوە، لە عێراق کودەتایەك بووە، بەلاّم تاکو ئێستا هیچ شتێکی روون لەم بارەیەوە نییە). لەگەڵ بیستنی ئەو دەنگو باسە گشت گیانم کەوتە لەرزین کاتێك ئەمەم بیست هەر زوو خۆم پێچایەوەو ڕۆیشتمە هۆڵی گەورەو ڕادیۆ گەورەکەم کردەوەو بردمە سەر ئێستگەی عێراق بیّ دەنگ بوو، بردم بۆ سەر ئێسگەی تورکیا مۆسیقای لیّ دەداو ناوە ناوەش دەی گوت: (مەلیكو نوری سەعید دەگەنە ئەنقەرە کاربەدەستانی دەوڵەت لەپێشوازیانن و چاوەڕێیانن). بەڕاستی زۆر ئاڵۆز بووم دیسان بردمەوە سەر ئێسگەی کوردی عێراق هەر ئەوەندەم زانی بەدەنگ هاتوو گوتی: (ئێرە ئێستگەی کوردی کۆماری عێراقە). ئەمەم بیستو لەخۆشیان نەمزانی چی بکەم دەم گوت، تۆ بڵێی ئەمە خەون نەبێت؟! دەبیّ ئەوە ڕاست بیّت عێراق بوبێت بەکۆمار!؟ لە دوای پارچە مۆسیقایەك بەیانی ژمارە دووی شۆڕشی خوێندەوە ئەوکاتە دڵم ئارامی گرتو بۆم بەدیارکەوت بەڕاستی شۆڕش بەرپا بووە لەعێراق. لەوکاتەی بەیانێك بڵاوکراوە کە (نوری سەعید) هەڵاتوەو خۆی شاردۆتەوە ئەوەی بیگرێت (١٠٠٠٠) دیناری

خەلاّت پیێ دەدرێت، ئەوکاتە بۆم دەرکەوت شۆڕش سەرکەوتووەو شۆڕشگێڕان لەبەرەو پێش چوون دانو خەریکی دەستو بردنو پێچەقاندنن. ئیتر هەر لەو کاتەوە دەقیقەیەك لەرادیۆ دوور نەکەوتمەوە هەردەم چاوەڕوانی ڕاگەیاندنی نوێ بووم لەرادیۆ، پاش ئەوەی دڵنیا بووم شۆڕش سەرکەوت بروسکەیەکی پیرۆزباییم بۆ لێدان بەبۆنەی سەرکەوتنی شۆڕش لەدوای دووسێ ڕۆژ بروسکەکەم چەند جارێك بەکوردیو عەرەبی خوێندرایەوە، ئەوەی ڕاستیە تەنگاوو بوومو کەوتمە پەلە بۆ گەڕانەوەم بۆ (ئۆزبەکستان)، ئارەزووم بوو لەوکاتو ساتەدا بگەڕێمەوە لای باوکم لە ئۆزبەکستان. ئەو ڕۆژانەی لە دوورگەی قرم مامەوە لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی (١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨)کۆمەڵێك نامەو بروسکەی پیرۆزبایی سەرکەوتنی شۆڕشی عێراقیان بۆ ناردم دۆستو برادەران. ئێوارەی ڕۆژی (١٩٥٨/٧/١٧) بەسەر کەوتمە ناو دارستانی سنۆبەرەکان لە قەد پاڵی کێوی (ئای پیتر) لە شوێنێك دانیشتم بەدڵێکی شادەوە پارچە هەڵبەستێکی سەر پێیم نووسی بەناوی موژدە ئەگەر چی ئەوەندە بەهێز نەبوو، بەلاّم لەگەڵ سەردەمەکە دەگونجا. ئەوەندە ماوەی لەوێ مامەوە بەردەوام لەتەنیشت ڕادیۆ دادەنیشتم گوێ ڕایەڵی دەنگوباس دەبووم لەو دەمانەی گوێم لەرادیۆ دەگرت برادەرەکانم کۆمەڵێك وێنەی منیان گرتبوو بیێ ئەوەی ئاگام لیێ بێت.

لەڕێکەوتی (١٩٥٨/٧/١٩) داوام کرد بگەڕێمەوە بۆ ئۆزبەکستان، ئەگەرچی هێشتا دە ڕۆژم مابوو کەلەوێ بنێنمەوە، بەلاّم بەرپرسی (سەناتۆریا) ڕازی نەبوو بڕۆم ئەوەندەی هەوڵم دا لەگەڵیو باسم بۆ کرد کەوا دوور نیبە بەڕێمان بکەنەوە بۆ عێراقو ئەوە باوکم بروسکەی بۆ کردوم کە زوو بگەڕێمەوە لای ئەوان لە(تاشکەند) هەر ڕێگای نەدا، ئەو داواکاریە درێژەی کێشا تا ڕۆژی (١٩٥٨/٧/٢٦) لە ڕۆژی دیاریکراودا ئامادە بووم بۆ ڕۆیشتن، سەرلەبەیانی دوای ماڵئاوایی لەو برادەرانەی ئەو ماوەیە لەگەڵیان بوومو لەکارمەندانی بەڕێوەبەرایەتی (سەناتۆریا) بەشێوەیەکی تایبەتی (لیووبا خانم) ئەوجا دەرکەوتمو دابەزیمە شاری یالتەو لەوێشەوە بەو ڕێگایەدا گەڕامەوە کە پێیدا هاتبووم بۆ شارە خۆشەکەی (یالتە)، کاتێك گەیشتمە (سیمفیرۆپۆل) ڕۆیشتمە فرۆکەخانە کارتی فرۆکەم بری بۆ (ئۆزبەکستان) پێش ئەوەی بەڕیێ بکەوم بروسکەم بۆ کاك (ڕەحیمی قازی) کرد. گوتم وا دەگەڕێمەوە بەڕێگای باکۆ بۆ تاشکەند بەڵکو بتوانم لە فرۆکەخانەی باکۆ بتانبینم .. بێگومان

نە فرۆکەخانە ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی نۆرەمان کرد تا فرۆکەی ئێمەش هات، ناوە ناوە ناویان دەخوێندینەوە هی ئەو فرۆکانەی دەڕۆیشتن کاتێك ناوی فرۆکەی ئێمە خوێندرایەوە ڕۆیشتینە ناو فرۆکەو دانیشتین ئینجا بەڕێ کەوتین، فرۆکەکە کەوتە کارو بەسەر شاری (سیمفیرۆپۆل)دا تێپەڕ چوو، ڕوو لەکێوەکانی (قەفقاس) فرۆکەی (لیووشین) لەزۆر شوێن بەسەر هەورەکاندا دەڕۆیشت کاتێك لەفرۆکەخانەی (دنیپرۆپیترۆڤیسکی) نیشتو لەوێ پشوێکماندا ئینجا بەڕێ کەوتینەوە بەسەر دەریای (کاسپی)دا ڕۆیشتین بەرەو باکۆ، ماوەیەکی زۆر نەسەر دەریا ڕۆیشتین لەفرۆکەخانەی باکۆ نیشتینەوە. دیار بوو کاك (ڕەحیم)و هاورێکانی چاوەڕوانی منیان دەکرد، لەدوای بەیەك گەیشتن کاك ڕەحیم گوتی: (دەبێ لای ئێمە بمێنیتەوە چەند ڕۆژێك لەغەمی کارتی فرۆکەدا مەبە ئێمە کارتی ڕۆیشتنەوەت بۆت وەردەگرین)، بەو شێوەیە نەیان هێشت بڕۆم لەوێ مامەوە لەگەڵیان ڕۆیشتمە باکۆ لەیەکێ لەمیوانخانەکانی باکۆ دابەزین ئەو ڕۆژو شەوەش تا درەنگ دانیشتین‌و کوڵی دڵمان لەقسەکردن ڕشت لەگشت ڕوێکەوە. ڕۆژی دوایی نانی نیوەڕۆمان لەماڵی کاك (ڕەحیم) خوارد ئەو ڕۆژە دواین دەربارەی ئەو باروودۆخەی ڕێ ڕۆیشتن‌و ڕوداوەکانی، دەربارەی ئەنجومەنە کاتیەکەی بۆ کوردان بڕیاری لەسەر درا بوو پرسیم: (کاك ڕەحیم دیکۆمێنتەکان پارێزراون وەك پێویست؟) کاك ڕەحیم گوتی: (بەڵێ تا وتاری میرحاج لەسەر کاسێت تۆمارەو دەمێنێ، جیا لەنوسین)، ئەوندە ڕۆژانەی لای ئەوان بووم چاومان بەسەرکردەکانی پەنابەرانی ئازربیجانی ئێرانی کەوت. لەگەڵیان دانیشتین‌و باسی زۆر شتکرا، ئەوەی پەیوەندی بەهەردوو لاوە هەبوو، هەروەها لەبارەی ڕۆژنامەی کوردستان ئەوەی لەگەڵ ئەوان بەیەکەوە دەردەکرا زۆر بەووردی لەسەری دواین، هەوڵ درا ئەو کەم‌و کورتیانەی تێیدا ڕەچاو دەکرا چارەیان بۆ بدۆزرێتەوەو نەمێنن‌و ڕۆژنامەکە تەواو شێوەی زمانی نوسینی زمانی کوردی بەخۆیەوە بگرێت‌و پێویستە دووربکەوێتەوە لەوشەی عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی، لەو ڕووەوە شتێکم نووسی لە ژێر ناوی نهێنیم لە ڕۆژنامەی کوردستاندا بڵاوکرایەوە.

شەوێك لەپارکی (کیرۆف) بانگ کراین کۆمەڵێك هونەرمەندە گۆرانی بێژەکانی ئەوانەی ناسراوی (ئازربایجان)ن لەوێ گۆرانیان دەگوت کاتێ ئێمەیان بینی چەندین گۆرانیان بەکورد هەڵگوتن، بێگومان ئەوەش بۆ دڵخۆشی ئێمە بوو، ئەو سێ چوار

ڕۆژەی لەوێ بووم بەخۆشی لەگەڵ کاك (ڕەحیم)و برادەرانی سابڵاغیم ڕابوارد، دووسێ ئێوارەش دەرکەوتینە (بۆلڤاری) سەر لێواری دەریاو گەڕان بەناو شاردا. ڕۆژی گەڕانەوەم بۆ ئۆزبەکستان کاك ڕەحیمو برادەرەکانی لەگەڵم هاتنە فرۆکەخانەو لەباکۆ بەڕێیان کردم، ئەو فرۆکەیەی پێی ڕۆیشتم دوای نیوەڕێ لە باکۆ بەڕێ کەوت فرۆکەکەمان بەسەر دەریادا دەڕۆیشت لەگەڵ ئەوەی دنیا تاریك داهات لە فرۆکە خانەی (ئاشخاباد) پایتەختی (تورکمەنستان) نیشتەوە لەوێ کەمێك وەستاین بەو شەوە ڕۆیشتیمە تاشکەند، کاتێك گەیشتمەوە ئۆزبەکستان دیاربوو کوردە پەنابەرەکانمان تەواو تەنگاوو ببون بۆ گەڕانەوە چاوەروانی ئەوە بوون کەی بەڕێ دەکرێنەوە بۆ عێراق، هەر لەوکاتەوە چاوەڕان بووین تا مانگی (٣/١٩٥٩) لە دوای پێنج مانگ بێدەنگی نامەیەکی داواکاریمان دایە دەسەلاتدارانی سۆڤیەت، بۆ ئەوەی بزانین بۆ بەڕێمان ناکەنەوە ئەگەر بەڕێشمان دەکەنەوە بەلکو پەلە بکەن لەبەڕێ کردنەوەمان بۆ نیشتمان، بۆیە ئێمە پێویستیمان بەوە هەیە بزانین هۆی ڕاگرتنمان چیە؟

ئەبێ ئەو ڕاستیە نەشارینەوە ئەوەندە ماوەی لە دوای شۆڕشی (١٤/ی تەموز) لە سۆڤیەت ماینەوە، بەقەدەر ئەوەندە ساڵەی لەوێ بووین ئاڵۆزو دڵتەنگ نەبووین، زیاتریش لەبەرئەوەی دیار نەبوو بۆچیو لەبەر چی ڕاگیراوین!! هەر ڕۆژێکمان لێ ببوو بەساڵێك. ماوەی هەشت مانگ ڕاگیراین. ئەو ماوەیەی بەهیوای گەڕانەوە بووین هەوڵمان ئەوەبوو هەندێ کەلوپەلی بەکەڵکی هێنانەوەی ئێمە دەهات لەگەڵ خۆمانی بێنینەوە بۆ عێراق بکڕین، بۆ ئەم مەبەستە دەگەڕاین بەدوای پێویستیەکان. لەدوای ئەوەندە ڕاگرتن وامان لێهاتبوو بێ ئومێد ببینو بلێین ئەو کەلوپەلانە کەکڕیبومان لێی پەشیمان ببینەوە، دوای هەشت مانگ ئەوجا بڕیاری گەڕانەوەمان پێ ڕاگەیندرا. تەنگاوی ئێمە زیاتر لەوە بوو لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی(١٤/ی تەمووز) مەلامستەفاو هەندێ لەوانەی لای خۆی بوون، لەمۆسکۆ لەگەڵی گەڕانەوە تەنیا میرحاج لەئۆزبەکستان بوو، بردیان بۆ ئەوەی لەگەڵ مەلامستەفا بگەڕێتەوە، (میرحاج) پێش ئەوەی بەڕێی بکەنە مۆسکۆ داوای کردبوو کە ئەو ناگەڕێتەوە عێراقو لەسۆڤیەت دەمێنێتەوە، کەچی سۆڤیەتیەکان ناچاریان کرد لەگەڵ (مەلامستەفا) بگەڕێتەوە عێراق، ئەوەبوو ئەوان لەڕێگای حکومەتی

`چیکۆسلۆفاك)ی بەڕێ کرانەوە بۆ عێراق، دوای گەڕانەوەی ئەوان بەهەشت مانگ ئەوجا حکومەتی عێراق میرحاجی ناردەوە سۆڤیەت بۆ ئەوەی پەنابەرە بارزانیەکان ڕێك بخات بۆ گەڕانەوەیان. ئەوەی ئاشکرایە لەپێش بەرپا بوونی شۆڕشی گەلانی عێراق لە (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) حکومەتە داردەستەکەی عێراق دەرگای ئازادی داخستبوو، بەلاّم لەگەلّ سەرکەوتنی ئەو شۆڕشە مەزنە دەرگا کراوە بۆ ئازادیخوازان، ئەوەبوو پێش گەڕانەوەمان بۆ نیشتمان لەکۆتایی سالّی (١٩٥٨)و سەرەتای (١٩٥٩) دەستەیەك لەنوێنەرانی ئاشتیخوازی عێراقی لەکوردو عەرەب هاتنە یەکێتی سۆڤیەت، کاتێ ڕاگەیەندرا دەستەی ناوبراو سەر دەدەن لە(ئۆزبەکستان) ئێمە چاوەڕوانیان بووین، پێش بگەنە (تاشکەند) من لەگەلّ قوتابیانی زانکۆی ئاسیای ناوەڕاست ڕۆیشتمە پێشوازیان لەفرۆکەخانەی تاشکەند، کاتێك دابەزین لەپێشان کارمەندانی دەولّەتی ئۆزبەکستان پێشوازیان کردن لەدواییدا نۆرەی قوتابیان هات، لەوکاتەی دەستم نایە ناو دەستی (شێخ لەتیف)و گوتم: (زۆر بەختەوەرم کە چاوم پێتان کەوت)، لەگەلّ قسەکانی من ناوبراو گوتی: (لێرە بوەستە) منیش لەوێ وەستام لەدوای کۆتایی پێشوازی کەران ڕووی لەمن کردو گوتی: (تۆ لەو کوردە پەنابەرانەی کە لەگەلّ مەلامستەفا لێرە بوون)؟ گوتم: بەلّێ، هەرزوو بەسوتەرجیمی گوت: (پێیان بلّێ ئەو پیاوە لەگەلّ من دەبێت تاکو لێرەم). لەگەلّ ئەوان ڕۆیشتم لەمیوانخانە دابەزین، بەختەوەرانە لەمیوانخانە بەدیدارو ناسینی مامۆستای بەرزی کورد مامۆستا (گۆران) شاد بووم، ئەو شادبوونەم یەکێك بوو لەئارەزوەکانم، وە هەروەها لەگەلّ (مەهدی حەمیدو جمیل ڕۆژبەیانی) یەکترمان ناسی، ڕۆژی سێیەم دەستەی ئاشتیخوازان سەریاندا لەو شوێنەی کوردە پەنابەرەکانی لێ نیشتەجێ ببون کەلەشارۆچکەی (ڤریڤسکی) بوو. دەستەی ئاشتیخوازان بریتی بوون لە: (شێخ لەتیف شێخ محمود، مامۆستا گۆرانی شاعیر، مەهدی حەمیدو جمیل ڕۆژبەیانی) بوون لەگەلّ برادەرانی عەرەب.

ڕۆژێکی تەواو لە(ڤریڤسکی) مانەوە میوانی (شێخ سلێمان بارزانی و سلێمان بەگ) بوون، لەو گەشتەدا کۆمەلّێك وێنەمان گرت، بێگومان ئەوەندە ڕۆژانەی لە(ئوزبەکستان) بوون، لەگەلّیان بووم لەسەر داوای (شێخ لەتیف)، سەردانی زۆر شوێنیان کرد، ڕۆژێك ڕۆیشتینە سەمەرقەند سەریاندا لەئارامگای شای نەخشەبەند،

بەو شێوە لەتاشکەندیش زۆر گەڕان سەریان لەشوێنەکۆزو مێژوویەکاندا. ئەو ماوەیەی لەئۆزبەکستان مانەوە توانیم ئەو نوسینەی لە(ئنسکلۆپیدیا)ی سۆڤیەتی لە سەر (شێخ محمود) نوسرابوو لە ڕووسیەوە بۆم کردن بەکوردی لە سەر داوای شێخ لەتیف دوایی نوسینەکەی لەگەڵ خۆی بردەوە.

لەدوای چاوەڕوانیەکی زۆر لە ناوەڕاستی مانگی دووی (۱۹۵۹) ئاگادارکراین کە دەگەڕێینەوە، ئەوکاتە دەست کرا بەچاك کردنی بەڵگە نامەکان ئەوانەی پێویست بوون بۆ گەڕانەوە، بۆ ئەو مەبەستە میرحاج لەعێراق گەڕایەوە سۆڤیەت بۆ ئامادە کردنی کوردە پەنابەرەکان بۆ گەڕانەوەیان بۆ نیشتمان، ناوبراو کەوتە کارکردنو کۆبونەوەی بەوانەکرد کە ژنیان سۆڤیەتی بوون، پێی ڕاگەیاندبن کەوا دەگەڕێنەوە بۆ وولاتو ڕێگاش دراوە ئەوەی ژنی هەیە لەگەڵ خۆی بیبات ئەوەی بیەوێت لەگەڵ مێردی بڕواتە عێراق، میرحاج گوتی: (داوام لە ئێوە ئەوەیە هەریەکێك لە ئێوە ڕاستی بەژنەکانتان بڵێن، لەبەر ئەوەی ئەوان لەگەڵتان دێن، هەموتان باش دەزانن ژیانی ئەوان جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ ژیانی ئێمە، دەبێ ئەو ڕاستیە بڵێن، ئەوەی لێرە هەیە لەعێراق نییە، چونکە ئەگەر لەو شوێنەی کەئێوەی لێ دەژین، لەبەر ئەوە تکایە درۆیان لەگەڵ مەکەن لەدواییدا گرفت بۆ خۆتان دروست مەکەن دوایی بێنە ئەوێو ڕازیش نەبنو بگەڕێنەوە دەبێتە شەرمەزاریەکی تر).

(میرحاج) داوای لێکردین بەڕاستی باسی ژیانی کوردەواریان بۆ بکەینو پێیان بڵێن دواکەوتنی ئێمە لەگەڵ پێشکەوتنی ژیانی ئەوان زۆر لێك دوورە. ئەوەی دیار بوو میرحاج زۆر ماندوو بوو، بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان زۆری هەوڵدا بۆ ئەوەی تووشی گیرگرفتو ناڕێکیو نا لەباری نەبین لەداهاتوودا لەگەڵ ئافرەتەکانمان ئەوانەی کە دەهاتن بۆ کوردستان، ناوبراو هەوڵێکی زۆری دا ڕاستی بەو ئافرەتانە بگوترێت، ئەوانەی بەنیاز بوون لەگەڵ مێردەکانیان بێن بۆ عێراق ئەگەر ڕاستیان پێ بگوترێت ئەوکاتە ئۆباڵی خۆی دەکەوێتە سەرخۆی، ناڵێت نەمزانی.

بەشی شەشەم

# شۆڕشی ١٤ ی گەلاوێژی ١٩٥٨ لە عێراق و گەڕانەوەمان بۆ نیشتمان

ئەوەی جێگای دڵخۆشیو شادیمان بوو لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی (١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨) لەعێراق دەرگا کرایەوە بۆ دەربەدەرو پەنابەرەکان ئەوانەی دوور لەوڵات بوون کە بگەڕێنەوە باوەشی گەرمی نیشتمانی خۆشەویستمانو ناو کەسو کارەکانیان، بێگومان ئێمەش لەو پەنابەرە ئاوارانە بووین بگەڕێینەوە نیشتمانمان کوردستانی پاوان کراو. ئەوەی بە دیار کەوت لەدوای بەرپابونی شۆڕشی گەلاوێژی پێشکەوتنخواز بەماوەیەکی کورت مەلامستەفاو چەند کەسێکی تری لەگەڵ گەڕانەوە، لەڕێگای حکومەتی (چیکۆسلۆفاکیا) ئەوان بە فڕۆکە گەڕانەوەو ئێمە ماینەوە بۆ ماوەی هەشت مانگ لەسۆڤیەت چاوەڕوانی گەڕانەوە بووین، ئەوە بوو لەمانگی (١٩٥٩/٢) ئاگادار کراین کەوا بڕیاری گەڕانەوەمان دەرچوە.

هەروەك لە سەرەوە نوسراوە میرحاج لە عێراق گەڕایەوە سۆڤیەت بۆ ئامادەکردنو ڕێکخستنی ئەوانەی بڕیار بوو بگەڕێنەوە عێراق، هەر لەو ڕۆژەوە کە ناوبراو گەیشتەوە سۆڤیەت کوردەکان کەوتنە دەستو برد بۆ خۆ کۆکردنەوەو ئامادەکردن، میرحاج کۆبونەوەی بەهەموومان کرد بە درێژی بۆمان دواو پێشی ڕاگەیاندین کەحکومەتی شۆڕش لەعێراق ڕازی بووە بە گەڕانەوەمان داوانی لە سۆڤیەت کردوە بۆ ئەوەی ڕێگا بدات بەژنومنداڵی کوردە پەنابەرەکان، ئەوانەی لەسۆڤیەت ژنیان هێناوە لەگەڵیان بگەڕێنەوە عێراق، بەو مەرجەی ئەو ژنە سۆڤیەتیانەی کە ڕازی دەبن لەگەڵتان بێن با بفەرموون، تەنیا دوبارە تکام ئەوەیە ڕاستیان لێ مەشارنەوە با ئەوە بزانن کەوڵاتی ئێمەو ژیانی ئێمە لەگەڵ وڵاتی ئەوانو ژیانی ئەوان زۆر لێك دورن، ئەگەر ئەو ڕاستیەیان ئێستا پێ بڵێن ئەوکاتە تاوان ناکەوێتە سەر شانی ئێوە، بەڵکو خۆیان ئەو بارە هەڵدەگرن ئەو سەرئێشەیە لەئێوە بەدوور دەکەوێتەوە.

لەسەر ڕۆشنایی ئەو بریارەو بەپێی خۆئامادەکردن لە ڕۆژی (١٩٥٩/٣/٢٣)دا ئێمە بەشی زۆرمان لەوێستگەی شەمەندەفەری شارۆچکەی (ڤریفسکی) ئەو شوێنەی ئێمەی لێ نیشتەجێ کرابوین کۆکردینەوەو کەلوپەلەکانیان لە شەمەندەفەر بارکردو چاوەڕوانی بەڕێ کەوتنی شەمەندەفەر بووین، ئەوەی زۆر نیگەرانی کردم لەوکاتو ساتەی شەمەندەفەر وەستابوو بەڕاستی دیدارێکی زۆر بە پەرۆش دەکەوتە بەرچاوم ئەوەیش ئەوە بوو کەسوکاری ئەو ژنانەی لەگەڵ پیاوەکانیان ئامادە بوون بڕۆنە عێراق لەناو فارغۆنەکانی شەمەندەفەر باوەشیان لە یەکترگرتبوو بە چاوی پڕ لە فرمێسك سەیری یەکتریان دەکرد ئەو دەمە بەلامەوە گرانترین کات بوو ئەو دیدارە غەمناکە، لەوکاتەدا شەمەندەفەر زەنگی ئامادەبوونی لێداو خەڵکەکە بەدڵتەنگیو گریانو پەرۆشەوە لە شەمەندەفەر دابەزین لەکاتی جولانەوەی شەمەندەفەر دەستیان بۆ یەکتر بڵندکردوو دوا ماڵئاواییان لەیەکترکرد. لەکاتژمێر دە، شەمەندەفەر کەوتەڕێ بەرەو تاشکەند، کاتێك گەیشتینە ناو تاشکەند لەوێش وەستاین ئەوانەی لەوێ بوون هەڵمان گرتنو بەڕێ کەوتین بەهەمان ڕێگادا گەڕاینەوە، ئەوەی یانزە ساڵ پێیدا هاتبووین بۆ ئۆزبەکستان لەئاسیای ناوەڕاست. ئەوەی شایانی باس بێت ئەوەیە لە کاتی گەڕانەوەماندا هەندێك لە بارزانیەکان نەگەڕانەوەو لەوێ مانەوە، هەرچەندە هەوڵێکی زۆریان لەگەڵ درا بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، بەلام هەوڵەکان هەمووی بێ ئاکام بوونو ڕازی نەبوون بگەڕێنەوە، بێگومان ئەوەش بارێکی گران بوو بۆ کەسوکاریان کەبەو شێوەیە بگەڕێنەوەو ئەوانیش لەوێ بمێننەوە. بەرەبەیانی ڕۆژی (١٩٥٩/٣/٢٤) لەتاشکەند بەڕێ کەوتین شەووڕۆژ بێ وەستان دەڕۆیشتین تەنیا ئەو کاتەی شەمەندەفەر دەوەستا کەپێویستی بەشتێك هەبوایە یان مەکینەی بگۆڕێت، بەو شێوەیە چەند شەوو ڕۆژێك لەزەوی کۆماری (قازاغستان) بەرەو سەروو ڕۆیشتین تا گەیشتینە شاری (سۆلی لیتسکی) لەوێوە بەرەو ڕۆژئاوا سوڕاینەوە تا گەیشتینە شاری (ئۆرالسك) بەڕۆژ بەشاری (ئنگلس)دا تێپەڕین لەشاری (سەراتۆف) جارێکی تر بەرەو سەروو ڕۆیشتین شەو بەدرەنگەوە گەیشتینە شاری (میچۆرینسکی) لەوێ بەولاوە بەرەو خوارەوە ڕۆیشین تا گەیشتینە (ڤۆرونیژ) لەوێوە جارێکی تر ڕوەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتین لەشاری (کوورسك) بەرەو (خارکۆف) لەدواییدا

گەیشتینە (کیروڤۆگراد) ئێوارەی ڕۆژی (٢/٤/١٩٥٩) گەیشتینە (ئەدیسە) بەندەری پاپۆرەکان.

ئەوەی دەمەوێ باسی بکەم هەر لە شاری (سەراقۆفەوە) تا گەیشتینە (ئەدیسە) بە ناو دارستانێکی پڕ لەدارو درەختی جوانی سنۆبەرو پەرکو دارەکانی جۆراو جۆرو شارو دێهاتی ڕێكو پێکی شیناوەردی دەشتاییەکاندا تێپەڕ بووین لەزۆر شوێن شاری نوێو دێهاتی نوێ ئەوانەی لەشەڕ وێران کرابوون دیار بوو نوێ کرابونەوە، دەتوانم بڵێم ئەوەندە ڕۆژانەی لە ڕێگا بە شەمەندەفەر دەڕۆیشتین هەر لە تاشکەندەوە تا گەیشتینە (ئەدیسە) لەبەر خۆشی ڕێگا وامان دەزانی شەور ڕۆژێکە چەند لەبەر جوانی دیمەنی سروشتی ئەو شوێنانەی پێیدا تێپەڕ دەبووین، ئەوەندەش لەبەر ئەو شەمەندەفەرەی ئێمەی هەڵگرتبوو هەموو شتێکی پێویستی تێدا هەبوو ئەوەی پێویستبایە، جیا لەوەش هەرکەسەی جێگای خۆی هەبوو، فارغۆنێکی تایبەتی هەبوو بۆ دانیشتنو خوێندنەوەو کات بەسەر بردن، لەکاتێکا گەیشتینە بەندەری (ئەدیسە) زووبەزوو دەستکرا بەگواستنەوەی کەلوپەلی ناو شەمەندەفەر بۆ ناو پاپۆر، ئەو پاپۆرەی داندرابوو ئێمەی پێ بگەڕێینەوە نیشتمان. ئەوەی سود بەخش بوو لەو ماوەی وەستاین لە(ئەدیسە) توانیمان هەندێ شوێنی (ئەدیسە) کەنزیك بوو لەبەندەر ببینین، ئەوەی زۆر دڵخۆشو دڵگیر بوو بەندەر لە هەموو شوێنێك سەرنج ڕاکێش تر بوو لەبەرئەوەی ئەوەندەی پاپۆر تێدا وەستا بوون نەتدەزانی سەیری کامەیان بکەی، زۆر بەئارەزووەوە تا تاریك داکەوت بە دیار دیمەنی دەریاو بەندەرەوە وەستام بەدرەنگەوە ڕۆیشتمە ناو پاپۆر، هەریەکەمان چوینە ئەو شوێنەی بۆمان دیارکرابوو، بەڵام ئەوەیماڵو منداڵیان هەبوو شوێنی تایبەتیان پێدرا بوو، پاپۆرەکە زۆر گەورە بوو ناوی (گرووزیا) بوو پاپۆری ناوبراو هی گواستنەوە بوو دیارکرابوو ئێمە بگەیێنێتەوە عێراق، لەکاتێك دنیا تاریك داهات هەریەکەمان بەپێی ئەو کارتەی پێیدرابوو ڕۆیشتینە شوێنەکانمان، وەك گوتراوە (گرووزیا) پاپۆرێکی گەورە بوو لە بەندەری (ئەدیسە) تەنیا پاپۆری لەو گەورەتر (راسیا) بوو لەبەندەرەکە وەستابوو وەك زاندرا ئەو پاپۆرەی ئێمەی سواربوین بۆ گەڕانەوە زۆر جاری دیکەش بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتووەو شارەزا بوو، لە ڕێك پێکیو پاكو خاوێنی ئەوەندەی باسی بکەیت هەر کەمە، لەگشت ڕوێکەوە شوێنی ڕای تێدابوو وەك هۆڵی

سینەماو مەکتەبەو هۆڵی خوێندنەوەو ناو دالانەکانو گۆمی مەلەوانی کە جێی سەر سوڕمان بوون. شەو دوای ئەوەی نانمان خوارد هەرکەسەو لەشوێنی دیاریکراوی خۆی پشومان داو خەوتین لەدرەنگی شەو پاپۆڕ لە(ئەدیسە) بەڕێ کەوت ئاگاشمان لێ نەبوو کەی لەبەندەر دەرکەوتین ئەوەندەمانزانی وا لەناوەندی دەریای (ڕەش) دەڕۆین‌و لەئاو زیاتر هیچ دیار نیە.

***لە ئەدیسە بەڕێ کەوتین‌و وولاتی سۆڤیەتمان بەجێ هێشت:***

دوای ئەوەی بەشەو لە(ئەدیسە) دەرکەوتین بە ناو دەریای ڕەش کەوتینە ڕێ بەرەو ئەو دەریایانەی دەکەوتنە سەر ڕێگامان، ئەو شەوە تا بەیانی ڕۆیشتین بەیانی بەڕادیۆی ناو پاپۆڕ ئاگادار کراین ئەوانەی لەقاتی سەرەوەو خوارەوەن بڕۆنە قاتی ناوەڕاست بۆ چێشت خواردن لەچێشتخانە، کاتێك چوین بۆ شوێنی خواردن چێشتخانەکە زۆر ڕێك‌و پێك بوو هەرکەسەو دەچوو نانی دەخوارد، زۆر بەسەروبەر خەڵك بەڕێ دەکران ئەوانەی لەوێ کارمەند بوون ئیش‌و کارەکانیان بەپەلە ڕادەپەڕاند. دوای نان خواردن دەرکەوتینە سەر مێردڕەوەکان‌و سەربانی پاپۆڕ لەگشت لایەك شوێنی دانیشتن هەبوو لەسەرەوەش گۆماوێکی مەلەو گۆڕەپانێکی یاری کردن هەبوون، ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە کاتێك بەتەواوی سەیری، پاپۆڕمان دەکرد وەك گەڕەکە خانوێکی گەورە لەسەر ئاو بڕوات وابوو لە کاتی ڕۆیشتن سەیری پاپۆڕمان دەکرد لە ناو دەریا زۆر لە ئۆتۆمبێل خۆشترو چالاکتر دیاربوو، ئەوەندەش جوان دەکەوتە بەرچاو لەناو ئاو ئەوها توند دەڕوات واتدەزانی دەخوشێت. ئەوەی شایانی باسە ئەو پاپۆڕە گەورەیە ئەوەندەی خەڵك‌و بار هەڵگرتبوو بەو بارە گرانەشەوە لە ناو ئەو ئاوە بێ سنورە بێ وەستان دەڕۆیشت زۆر بەسوکی واتدەزانی هیچی پێ نییە دەبێ بڵێین ئەوە خزمەتێکی گەورەیە بە مرۆڤایەتی دەکرێت جیا لە سودی دارایی، ئەگەر بە ووردی سەیری ئەو دەستکاریە بکرێت بە دەستکەوتێکی گرنگی دەزانی، بەڵام بە پەرۆش بووم چەندین ساڵ لەوێ ماینەوە نەمان توانی فێری لێخوڕینی ئۆتۆمبێلیش بین نەك پاپۆڕ! لەکاتێك لەگەڵ منداڵەکانم ڕۆیشتینە هۆڵی خوێندنەوە لەوکاتەی خەریکی خوێندنەوەی گۆڤارێك بووم لەو کات‌و ساتەدا خێزانم زۆر بەسەرسامی سەیری کردم‌و گوتی: (زرار ئەوەچیە ڕەنگت تەواو گۆڕاوە هەستە بڕۆینەوە

ژورەکەمان). هەستام ئاوم خواردەوەو هەندێ ئاوم بەدەمو چاوم داکردو ڕۆیشتمە لای دکتۆر، لەدوای سەیرکردنم پرسی: (چی گرانت هەڵگرتووە؟ گوتم (نەخێر هیچی گرانم هەڵ نەگرتوە)، گوتی: (بیرت لە چی کردۆتەوە؟) گوتم: (بڵێم چی؟).

بۆ ئەوەی لە بیرکردنەوە دوور بکەومەوە ڕۆیشتمە ژووری مەکتەبە سەیری کتێبەکانم کرد کەمێك هاتمەوە سەرخۆ دڵ تەنگیەکەم لە بیرچووەوە، دیار بوو مەکتەبەکە جۆرەها کتێبی تێدا بوو ڕوسیو هی نەتەوەکانی تریش، ئافرەتێکی لێبوو کارمەندی مەکتەبەکە بوو هەرکتێبێکی داوات دەکرد یەکسەر دەیدایە دەستت لەوێ کەمێك لەگەڵ ئافرەتەکە کەوتمە قسەکردن ناوی (ماریانە) بوو زۆر وشیار بوو پرسی: (لەمێژە لە سۆڤیەتی؟) گوتم: (زیاتر لە دوازدەساڵە لە سۆڤیەتین)، بەلام تەنها لە شوێنێك نەبووین ماوەیەك لە ئازربایجان بووین، چەندین ساڵیش لە ئۆزبەکستان بووین. ماریانە گوتی: (وا دیارە خوێندوتە لەو ماوەی لە سۆڤیەت بوی بۆیە ڕوسی ئەوەندە باش دەزانی، چونکە زمانی ڕوسی زۆر زەحمەتە بۆ فێربوون؟) گوتم: (بەڵێ خوێندومەو ژنیشم سۆڤیەتیەو قسەکردنمان بەڕوسیە وە زۆریش دەخوێنمەوە سودم لە کاتی بەتاڵم وەرگرتوەو لە دەستم نەداوە). لەو گفتووگۆیە دابووین هاتن پێیان گوتم (زرار برۆ لای شێخ سلێمان ئیشی پێتە)، ڕۆیشتمە لای شێخ سلێمان، باوکم لەلای دانیشتبوو ناوبراو گوتی: (کەپیتانی پاپۆڕ داوای کردوە کەسێك لەئێمە بڕوات پەیوەندی بە کەپیتانەوە بکاتو کوردیو ڕوسی باش بزانێ منیش ناوی تۆم داونەتێ برۆ ئەو خۆتی پێ بناسێنە بزانە چی دەوێ بۆی بکە، هەر ئەوکاتە چومە لای کاپیتان خۆم پێ ناساند ناوبراو خۆشحاڵی خۆی دەربڕیو لەگەڵی کەوتمە قسە، کۆمەڵێك پرسیاری ئاراستە کردم هەموویانم وەلام دانەوە لە دواییدا گوتی: (وا دەبێت بانگەوازێکمان دەبێت یان ڕوداوێك بەپێویست دەزاندرێت بەڕادیۆی پاپۆڕ بەخەڵك ڕابگەیەندرێت ئەوکاتە تۆ بەکوردی بۆیان بلاو دەکەیتەوە. بۆ ئەوەمان داواکردوی، لەئەمڕۆ بەولاوە هەموو ڕۆژ سەرمان بدە). کەپیتان (ئەرمەنی) بوو، ئەوەندەی بڵێی ڕوخۆشو مرۆڤانەو هەست بەرز بوو.

ئەو ئێوارەیە لەدوای نان خواردن لەگەڵ منداڵەکانم ڕۆیشتینە هۆڵی سینەما فلیمێك نیشی دەکرد کەهی شەڕی (ستالین گراد) بوو ئەگەر چی یەك دوو جاری تریشم بینی بوو، بەلام هەر پێم خۆش بوو لەبەرئەوەی شەڕێکی دژواری مێژویی بوو، ئەو شەوەش لەدەریای ڕەش ڕۆیشتین لەگەڵ ئاسۆی بەیانی دیار بوو پاپۆڕ لەسەر خۆ دەڕژیشت ڕۆژی (٤/٤/١٩٥٩) گەیشتینە تەنگەبەری (بەسفۆر) لە شاری ئەستەمبۆل دیار بوو پاپۆڕ

بەژێر پردێکدا تێپەڕی لەسەر بانی پاپۆر ئەودیوو ئەم دیوی شار دیار بوو هاتوچۆی ئۆتۆمبێلو خەڵك لە شەقامەکانی نزیك ئاو دیار بوو، لەو کاتە بەلەمێك لەپاپۆر نزیك کەوتەوە هەرزو قادرمەکەی پاپۆریان بۆ دابەزاندە خوارەوە دوو ئەفسەری تورك بەسەرکەوتنو چونە لای کاپیتان، بەلاّم دوا نەکەوتن زوو گەڕانەوە ناو بەلەمەکەیان لەدوای دابەزینی ئەفسەرە تورکەکان، پاپۆرەکەمان جلّەوی بەردراو کەوتەوە ڕۆیشتن ئەمجارەیان کەوتینە ناو ئاوی دەریای (مەڕمەڕە) ئەو دەریایە تەواو خۆشحالّی کردم هەموو غەمو پەژارەی لە بیر بردمەوە، خۆشیەکەی لەوە دابو سەیری هەر لایەکت دەکرد لە دوورەوە لە ناوەندی دەریا دورگەی جوان جوان دەکەوتنە بەر چاو ئەو دورگانە دەرو پشتیان هەموی ئاوەو ئاوەدانیشی تێدایەو کۆشکو خانوەکانیان دیار بوون لەوێ بەو لاوە بەرەو تەنگەبەری (دەردەنیل) ڕۆیشتین ئەویش هەمان دیمەنی جوانو سەرنج ڕاکێش بوون لەوێ بەم لاوە گەیشتینە دەریای (ئیجە) بۆ خۆشی جوانی ئەویش هەمان شت بوو بەڵکو شوێنی جوانتری لێ دەبیندرا لەهەندێ لەدورگەکان دوکەڵی کارگە دیار بوو، ئەوەی زۆر جوان بوو هەندێك لەو دورگانە لە ناوەندی دەریا وەك پارچە چیایەك هەڵکەوتبون، بەڕاستی جێگای سەرنجو تێڕامان بوون لەبەرئەوەی تا لە دەریای (ئیجە) دەرکەوتین هەر لەسەر مێردەرەوەکانی پاپۆر بەئارەزووەوە سەیری ئەو دورگە جوانانەمان دەکرد بەتەواو بونی دەریای (ئیجە) گەیشتینە دەریای (سپی ناوەڕاست) بێگومان ماوەیەکی زۆر لەناو ئاوی دەریای ناوبراو ڕۆیشتین ئەو ماوە درێژە چاومان بەوشکایی نەکەوت جگە لە ئاو!! ئەوەی دەمەوێ باسی بکەم ئەو دەریایە پانو بەرینەی دەمان بینی بەشەوان وات دەزانی شارێکە لە شارە هەرەگەورەکان لەبەر ڕوناکی ئەو پاپۆڕانەی لە ناو دەریا هاتووچۆیان دەکرد کە ئەوەندە زۆر بوون لەژماردن نەدەهاتن.

### *دوانێك لەگەڵ شێخ سلێمان بارزانی:*

ڕۆژێك لەناو دەریای (سپی ناوەڕاست) پێش ئەوەی بگەینە (قەناتی سوێس) لای شێخ سلێمان دانیشتبوین لەکاتی قسەکردن شێخ سلێمان گوتی: (ئەوە نزیك کەوتینەوە لە وولاتەکەمان کاتێ کە دەگەینەوە جێ تۆ دەڕۆیتەوە دەرگەڵەو ئێمەش دەچینەوە بارزان لێك دوور دەکەوینەوە دەترسم یەکتر لە بیر بکەین). لە وەلاّمدا گوتم: (وا بزانم ئەوەندە سالاّنەی تاڵیو ناخۆشی، ڕێگا نادات یەکتر لەبیر بکەین ئەگەر خاوەنی وەفا بین، من لەغەمی ئەوەدا نیم بیر لەوە دەکەمەوە لەدوای ئەوەی دەگەینەوە

عێراق هیچ شکی تێدانیە کەسانێك هەن دەپرسن ئێوە ئەوەندە ساڵە لە سۆڤیەت بوون چیتان هێناوەتەوە بۆ گەلەکەتان یان بۆ خۆتان؟) شێخ سلێمان گوتی: (با ئەو پرسیارە ئاراستەی مەلامستەفا بکەن لەبەر ئەوەی هەر ئەوە دەزانێ چی کردووەو ئەو خەڵکەی فێری چی کردووەو چۆنی تێگەیاندون‌و چیمان هێناوەتەوە!).

گوتم: (ئەوەی من تێی گەیشتبم مەلامستەفا ئەو بەسەرهات‌و ماڵ وێرانیەی بەسەرمان هاتووە هەموی دەخاتە سەر شانی (باقیرۆف)و سۆڤیەت، لەوانەیە تۆش لەو گێژاوەدا بەشدار بکات‌و دەڵێت لینەگەڕان ئەو خەڵکە فێری هیچ بن وە بەشێکی تاوانیش دەخاتە ئەستۆی ئەوانەی لێیان نارازیە و هاتووچۆی ئەویان نەکردووە). شێخ سلێمان گوتی: (خۆ هەموو کەس دەزانێ بەو بارە گرانە لەکوێ لەقوڕدا کەوتبوو وە بەشی زۆری پیاوەکانمان زۆر باش دەزانن ئەوەی بەسەر ئێمە هاتووە هەمووی لەژێر هەست‌و نەستی خۆی دا بووە چاك یان خراپ هیچ کەسێك لەئێمە بەرپرس نییە لەبەر ئەوەی هیچ پرس‌و ڕایەك بەئێمە نەکراوە لە خۆی زیاتر، دەربارەی سۆڤیەتیش لەوە زیاتر چیمان بۆ بکەن لەوەی بۆیان کردوین ئەگەر پێ لەڕاستی بنێین خۆ باوکیش هەر ئەوەندە بۆ کورەکەی دەکات، ئەوەش بەکردەوە کراوەو دیارە، ئەگەر ئێمەش بیشارینەوە خەڵکانێك هەن‌و سۆڤیەتیەکانیش نای شارنەوە).

گوتم: (پێش ئەوەی بەرێ بکەوین نامەیەکی عزەتی برام بۆ هاتبوو وادیارە لەکاتی گەڕانەوەی مەلامستەفا بۆ بەغدا ئەوان چوونەتە بەخێر هاتنەوەی، ناوبراو لۆمەی ئێمەی کردوە، بەتایبەتی هی من‌و باوکم گوایا وەهاب ئاغا بەرێکی خستۆتە مزگەوت‌و گوتویەتی بریا هەر لێرە لەگەڵ سەرۆك نەچوبان زۆر باشتر بوو نەك سەرۆك ئەوەندەیان لۆمە بکات‌و لێیان نارازی بێت) وام هەست کرد عزت دڵ تەنگ‌و نیگەران ببوو، ناچار نامکەیەکم بۆ نوسی‌و بۆم نارد.( برام تۆ دڵ تەنگ‌و ئالۆز مەبە سەبرت هەبێت تا ئێمە دەگەڕێینەوە ئەوکاتە بۆت ڕوون دەبێتەوەو دەزانی ئەو لۆمەیەی لەبەرچییەو لەسەر چییە! دەربارەی وەهابیش پێی بڵێ زرار دەڵێت، ئەگەر ئەویش ئەو قسانەی لەسەر ڕوباری گادەرو شنۆیێ بەبیر نەمابن کەچی بەمەلامستەفا دەگوت من زۆر باشم لەبیرن، دیارە بەنیاز بنێکی تازە لەخۆی بنێتەوە. ئەو پیاوی باشەو ئێمەش هیچ با بگەڕێینەوە ئەوکاتی لەگەڵی دەدوێم).

لەکۆتاییدا شێخ سلێمان گوتی: (لەو سەردەمەدا مرۆڤی ڕاست مەنکوبە لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستی ڕێڕەوی مرۆڤی پاکە). لە دوای چەند شەو ورۆژ ڕۆیشتن لەناو دەریای سپی ناوەڕاست دا نزیك کەوتینەوە لە (قەناتی سوێس)، پێش ئەوەی بگەینە قەنات لە ئێزگەی ناو پاپۆڕ بەڕاگەیاندنێك ئاگادار کراین بەکوردیو ڕوسی گوتیان: (بۆ ئاگادرای پاش ماوەیەکی تر لەدوای یەك دووکاتژمێر دەگەینە بەندەری (پۆر سعید) لەوێ دەوەستین، تکایە کەس لەگەڵ ئەوانەی دێنە ناو پاپۆڕ نەدوێتو خۆیان لێ دوور بگرن بانەزانن ئێوە کێنو بۆ کوێ دەچن ئەگەر جنێویشو پێ بدەن وەلآمیان نەدەنەوە کەم یان زۆر بەدەنگ مێن با نەتان ناسن. بەڵێ لەدوای دووکاتژمێر گەیشتینە بەندەری (پۆر سعید) لەوێ وەستاین لەبەر ئەوەی تێپەڕ بوون بەقەناتدا بە نۆرە بوو ئەوەندەی پاپۆڕ لێ وەستا بوون سەرت سوڕ دەما چاوەڕوانی نۆرە بووینو ئەو کەلوپەلانەی پێویستیان پێ هەبوو ڕێکیان خست کاتێك نۆرەمان هات بەندەری (پۆرسەعید)مان بەجێهێشت، پێش بەڕێ بکەوین لە(پۆرسەعید) بەلەمێك بەسەر خرایە سەر پاپۆڕ لەو شوێنە داندرا ئەوەی پیاوەکان شاییان لێ دەکرد بەلەمەکە دوو کەسی عەرەبی شەپوو شۆڕی ناڕێكو ڕوو گرژو نالێوەشاوەن لەناو دابوون گوایا کەلوپەل دەفرۆشن وەك سێوو پرتەقاڵو مۆزو شتی تریش، بەلآم تا لە قەنات دەرکەوتین گەیشتینە (سوێس) کەسیان بەلاوە نەچوو چیان لێ نەکڕین، ئەوانە سەریان لێ شێوا بوو لەزمانی ئێمە نەدەگەیشتن دەیان زانی ناوەکانمان ناوی ئیسلامین لەگەڵ ئەوانیش نەدەدواین، لەناو قەنات پاپۆر زۆر سەبر دەڕۆیشت پاپۆڕەکەمان زۆر گەورە بوو نەدەکرا لەوێ بەپەلە بڕوات نەوەك لەعاردی بدات، چونکە قەنات ئەوەندە قووڵ نەبوو تاکو پاپۆڕی گەورە بەتیژی تێیدا بڕوات لەکاتێکا پاپۆڕە گەورەکان بەقەناتدا دەڕۆیشتن تەنیا بەلەمە بچووکەکان دەیان توانی بەملاو ئەولادا ڕەت بن، ڕۆیشتنی پاپۆڕەکان بەقەناتدا بەنۆرە بوو دەبوایە لەلایەك بوەستن تا نۆرەیان دەهات. لەوکاتەی پاپۆڕەکەمان (گروزیا) لەناو قەنات دەڕۆیشت، هەموومان لەسەر مێردڕەوەکان وەستابووینو سەیری ئەملاو ئەو لامان دەکرد، دیاربوو لەدوو لای قەنات ڕێگای هاتووچۆی ئۆتۆمبێل هەبوو لەدیوەکانی قەنات خەڵك خەریکی کار بوون، کاتێك چاویان بەپاپۆڕی سۆڤیەت کەوت بەچەپڵە لێدان هاواریان دەکرد (دروژبە) یانی دۆستایەتی. کاتێك قەنات کۆتایی هات گەیشتینە (سوێس) ئەو دوو

عەرەبەی لەگەڵ بەلەمەکەیان لە سەر پاپۆڕی ئێمە بوون گوێ بیست بوون خۆ بەخۆ بەعەرەبی دەستیان کرد بەجنێودان، لەکاتی ئەوانیان دابەزاند بەلەمەکەیان شۆڕ کردەوە بۆ ناو ئاو (فەقێ حسنو میرۆ) بەعەرەبەکانیان گوت (وەلو گەوایەد) دیار بوو زۆر پەست بون. لەکۆتایی قەنات شاری (سوێس) دیارمبوو بەڕاستی شارێکی زۆر ڕێكو جوان بوو بەشێکی کۆشکەکانی لەسەر لێواری دەریا بوون، (سوێس)مان بەجێهێشت گەیشتینە ناو دەریای (سوور) دیار بوو دەریای سوریش وەك دەریای (سپی) قەرەبالغ بوو، دوو ڕۆژو شەوێك لە ناویدا ڕۆیشتین کاتێك نزیك کەوتبوین لەئاوی (سعودی) بوو بەڕۆژ کاتژمێر دە، ئەوەندەمان زانی دوو فرۆکەی جەنگی لەچەشنی (میراج) زۆر بەئالۆزی لەپاپۆڕی ئێمە نزیك کەوتنەوە پێوەیان دیار بوو نیازیان خراپە چەند جارێك بەدەوری پاپۆڕدا سوڕانەوە بەشێوەی ترسناك ئەوەی ڕاستی بێت خەڵك لە ناو پاپۆڕ زۆر تەنگاوو ئالۆز بوون، هاوکات لەگەڵ سوڕانەوەی فرۆکەکان دوو گەمی جەنگی ئەمریکی هەریەکەی بەلایەکی پاپۆڕدا نزیك کەوتنەوەو بەتەنیشتماندا تێپەڕ بوون وا هەست دەکرا نیازیان خراپ بێت، بەپێی ئەو هەلوێستەی دوور لە یاسا دەتوانن کارێکی ناڕەوا ئەنجام بدرێت، لەبەر ئەوە خەڵك ئاگادار کران کەئاگادار بن نەوەك دەست درێژی بکرێتە سەر پاپۆڕی هاتوچۆی خەڵك گواستنەوە ئەگەر پێویست بوو وەلامیان دەدرێتەوە. ئەوەی بەدیار کەوت لەو کاتەی فرۆکەکان بەنیازی ئالۆزی بەسەر پاپۆڕدا دەسوڕانەوە پاسەوانانی ناو پاپۆڕ چالاكو ئازایانە بەدیارکەوتنو ئەوەندە بەتەردەستی ئامادە بوون بۆ بەربەرچ دانەوەی فرۆکەکان، تا ئەو کاتەی پاسەوانەکان دەرنەکەوتن کەس بیری نەدەکردەوە لە ناو پاپۆڕ پاسەوان هەبێت، هەروەها بە درەنگەوە زاندرا کەوا لە پێشەوەی پاپۆڕ غەواسە دەڕوات بۆ ڕێ ڕۆن کردنەوە.

لەوکاتەی فرۆکەکان دەسوڕانەوە لەسەر پاپۆڕی مەدەنیو هاتوچۆدا زاندرا لەقیادەی سوپای سۆڤیەتی لەدەریای ناوەڕاست ئاگاداری فرۆکەکان کرابوو ئەگەر دوور نەکەونەوە لە پاپۆڕی (گروزیا) توشی لێدان دەبن. دوای ئاگادار کردنەوە فرۆکەکان دوور کەوتنەوەو گەمیەکانیش دوورکەوتنەوە، لەدوای نەمانی مەترسی فرۆکەکان لەسەر بانی پاپۆڕ لەگەڵ (فەقێ حسنو میرۆ) بەیەك گەیشتین، لەوێ لەشوێنێك دانیشتین، هەروەك لەسەرەوە باس کراوە (فەقێ حسن) تا گەیشتینە

سۆڤیەت باوەڕ پێکراوی مەلامستەفا بوو لە گشت ڕویێکەوە. کەچی لەو دواییانە. زۆر بەساردی سەیر دەکرا ناوبراویش داماو دیار بوو، لێم پرسی: (ئەوە بۆچی بەو شێوەیە لەگەڵت ساردن؟ تۆ جاران لای مەلامستەفا هەموو شت بووی؟) وەڵامی فەقێ حسن ئەوەبو: (لەوکاتەی بەڕێ کراینە مۆسکاو، چەند جارێك لەگەڵ ئەسعەد خۆشەوی کەوتمە مشتومڕ جارێك پێم گوت، تۆ ڕاوێژکاری سەلامستەفا بوی بۆیە حاڵمان ئەوەندە خۆشە هەر تۆش بویە هۆی ئەو ماڵوێرانیە وا ئێستا ئەزیەت دەچێژین‌و والێرە کارمان پێ دەکەن، وا هەست دەکەم هەر لەوکاتەوە ئەسعەد ڕوی وەرگێراو زانیم (...) بەقسەی ئەو ڕوی وەردەگێرێت هەر واش دەرچوو، کاتێك کۆکراینەوە (...) زۆر بەساردی سەیری دەکردم بۆیە منیش نامەوێت وەك جاران ئەوەندەیان لێ نزیك بم لە بەرئەوەی وەفا بۆ ڕاستی نییە، ئازیزم کاك زرار ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوە بیزانن تەرکی دنیا دەکەن، میرحاج ناحەق نەبوو شێت بێت زیاتر ناڵێم). ماوەیەکی زۆر لەناو ئاوی دەریای سوور ڕۆیشتین چەندین شەو و ڕۆژی خایاند لەو ماوەیەدا چەند جارێك لەگەڵ باوکم کەوتینە دوان دەربارەی داهاتوومان لەدوای ئەوەی کە دەگەڕێینەوە چی پێویستە بکرێت‌و بیکەین.. بۆ ئەو مەبەستە دوو سێ خاڵم دیار کردبوون:

١-پێویستە شێوەی پەیوەندیمان لەگەڵ خەڵك بە دوور بینی‌و لە سەر خۆی بێت‌و دوور بین لە توندو تیژی‌و کاری نابەجێ هەموو کارەکان لەڕێگای لەیەك گەیشتن بێت.

٢- بەپێویست دەزاندرێت ئەو ناکۆکیانەو دوژمنکاریانەی ڕابوردوو هەوڵبدەین نەمێنن لەگەڵ بنەماڵەی ئالانەو ماڵی نوری باویل ئاغا، ئەگەر لە دوای گەڕانەوە ئەو هەنگاوە باوێین بۆ ئێمە سەربەرزیە نەك لاوازی، ئەوکات خەڵکیش بەچاوێکی تر سەیری هەڵوێستمان دەکات‌و دەست خۆشانەمان لێ دەکەن.

٣- لە دوای ماوەیەك پێشوازی کردن لەو میوانانەی دێنەلامان بەڕاست دەزانم بگەڕێینەوە سەر ئەو گوندانەی بە جێمان هێشتوون لە ساڵی (١٩٤٦) لەوێ جێ نیش دەبین‌و کاسبی دەکەین.

لەدواییدا بەتکا داوام لە باوکم کرد بۆ ئەوەی کەس دەست لەکارو هەست‌و نەستی ئەو ئافرەتە نەدات کە لەگەڵ من هاتووە، چونکە کەس‌و کاری ئەو ئافرەتە

منم، منیش هەوڵ دەدەم دڵی نەڕەنجێت تا لەباوەشی مندا بێت، ئەوەی جێگای دڵخۆشیم بوو باوکم بەپێشنیارەکانم ڕازی بوو بەخۆشحاڵیەوە گوتی: (بابە سەلامەتی بگەڕێینەوە ئینشاالله هەموویان چارەسەر دەکەین پێشنیارەکانت هەموی پەسندن).

لەکۆتایی دەریای سوور گەیشتینە تەنگەبەری (باب المندب) لەبەندەری ناوبراویش وەستاین، لەوێ ئەوەی پێویست بوو هەڵیان گرت و بەرێ کەوتین بەرەو ڕۆژهەلاَت بەناو ئاوی (عەدەن)دا سوڕاینەوە بۆ ناو (دەریای عەرەبی) لەوکاتەی لەناو دەریای ناوبراو دەڕویشتین لێپرسراوی پێشەنگای ناو پاپۆڕ داوای یادگاریەکی لێ کردین، ئەوەی بە دیارکەوت هەر کۆمەڵێك بەو پاپۆڕە ڕۆیشتبن یادگاریان بۆ پاپۆڕ بەجێ هێشتووە داواشیان لەئێمە کرد یادگاریەکیان بۆ بەجێ بهێڵین، ئێمەش بیرمان لەوە کردەوە شتێکی وایان پێ بدەین کە نیشانەی کوردی پێوە دیار بێت، ئەوەی بەدەستمان کەوت ڕانکوچۆغەیەکی زاخۆیی بوو کەبەشێوەی بادینی دروابوو، لەگەڵ قەلنەو باسکەو کیسەی توتن و ئەستێ و بەرد، ئەو شتانەمان لەمامەند وەرگرتن، چونکە پاراستبونی و لای مابوون ئێمەش بەڕوسی و بەکوردی لەسەرمان نوسین بەوشێوەیە: (ئەو ڕانکوچۆغەیە کە بەرگی کوردین لەسەر شێوەی بادینان لەگەڵ قەلنەو کیسەی توتن و ئەستێووبەرد یادگارن لەلایەن کوردە پەنابەرکانی کوردستانی عێراق ئەوانەی زیاتر لەدوازدە ساڵ پەنابەر بوون لەیەکێتی سۆڤیەت، ئێستاش بەپاپۆڕی گرزیا دەگەڕێنەوە بۆ نیشتمانیان پێشکەشە بەپێشەنگای ناو پاپۆڕی گروزیا لەگەڵ ڕێزمان (١٤/٤/١٩٥٩) لەلایەن نوێنەری کوردە پەنابەرەکان، زرار دەرگەڵەیی و ئالۆ بارزانی درایە دەستی کارمەندی پێشەنگا (ایزا ئیڤا نۆڤنا).

لەناو ئاوی دەریای عەرەبی زوو ڕۆیشتین دوایی سوڕاینەوە بەرەو کەنداوی (عومان) لەوێشەوە بۆ تەنگەبەری (هورمز)و بەرەو کەنداوی عەرەبی ڕۆیشتین تا پێمان نایە ناو خاکی نیشتمان عێراقی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨)، عێراقی ئازاد کراوی کورد و عەرەب عێراقی سەربەرزی شۆڕش. ئەوەی جێگای هەمیشە یادەوەریە لەو کاتەی پێمان نایەوە خاکی نیشتمان هەر لەسەر سنورەوە جەماوەر بەئارەزویەکی پڕ سۆزانە لەپێشوازیمان بوون و پۆل پۆل وەستا بوون چاوەڕوانی گەیشتنی ئێمەیان دەکرد، جەماوەر پێشوازیەکی برایانەی گەرمیان لێکردین و بەخێرهاتنەوەیەکی پڕ لەهەست و سۆزیان لێ کردین کەشایانی ئەوەیە تا مردن لەبیر هیچ کەسێك نەچێت،

ئەو پێشوازیە ڕوداوێکی گەشەداری مێژووییە لەژیانی کۆمەڵگای عێراقی بەگشتیو برا عەرەبەکان بە تایبەتی.

هیچ شکی تێدا نییە یادی ئەو پێشوازیە مێژوییە دروشێکی بەرزە نەك هەر لەلاپەڕەی مێژوو دەنوسرێت، بەڵکو نەخشەیەو لەسەر دڵی هەموو ئەو نیشتمان پەروەرانەی لەبەشداری پێشوازیەکەدا بوونو دەیان دیت هەر لەسەر سنورەوە ئەو خەڵکە لەسەر شەقەماکانو لەسەر لێواری ئاوی شەتی عەرەب وەستابوون بەچەپڵە ڕێزانو بەدەنگێکی پڕ سۆز هاواریان دەکردو نوسینەکانیشیان بەنوسینی پڕ ماناو جوان بەرز کردبونەوە، ناو ئاوی شەتی عەرەب پڕ بوو لەبەلەمی پێشوازیکەران تا شاری (بەسرە) ئەو بەلەمانە لەگەڵ پاپۆڕی ئێمە لە ناو ئاودا بوونو هەڵپەڕکێو سەمایان دەکردو هاواریان دەکرد (بارزانیەکان هاتنەوە لە سایەی زەعیمەوە) هەروەها هاواریان دەکردو بەنوسینیش نوسرابوو (اهلا بك بارزاني شعب العراق يحيك) لەو ئاهەنگو بەزمو وهەڵپەڕکێیە لەناو بەلەمەکاندا پێش بگەینە (بەسرە) بەلەمێکی پێشوازی کەران نقومی ئاو بوو چەند گەنجێکیش لە ناو ئاودا خنکان کەبووە مایەی دڵتەنگیو ناخۆشیمان.

ئەوەی جێگای خۆشحاڵیمان بوو ڕۆڵە دڵسۆزەکانی سوپا دڵسۆزی خۆیان بەوە نیشاندا کەهەر لە سنوری ئاوی عێراقەوە فرۆکەکان نۆبەتداربوون لەگەڵ جەماوەر سەمایان دەکرد.. لەنزیك بەندەری (بەسرە) لەسەر لێواری شەت بەهەزاران کەس لەخەڵکی بەسرە لە ڕێ ڕۆیشتن دابوون بەرەو بەندەر دەهاتن بۆ پێشوازیمان.

پاپۆڕی (گرۆزیا) لەبەندەر وەستا، بەڵام چی سەروبنی جەماوەر دیار نەبوو ئەوەندە خەڵك داڕژابوونە گۆڕەپانی بەندەر لەپێشوازیمان وەستا بوون، ئەوەی هەرگیز لەیادناکرێ ئەو پێشوازیە گەرمەیە کەلەخوارووی عێراق لەئێمە کرا پێشوازیەکی هەمیشە زیندوە ئەو پێشوازییەی لەلایەن برا عەرەبەکانەوە لێمان کرا زۆر گەرم ترو بەرزتر بوو لەو پێشوازییەی کەلەلایەن خەڵکی کوردستانەوە لێمان کرا، لەو کاتەی پاپۆر لەبەندەر وەستا دەمانبینی خەڵك چیان دەکردو لە چ شادیەك دابوون بەرامبەر گەڕانەوەی ئێمە بۆ نیشتمان. وەك پێشتر باسم کردوە ماوەیەکی زۆر لەناو دەریا ڕۆیشتین ڕۆژی (١٦/٤/١٩٥٩ کاتژمێر ٥,١)ی دوای نیوەڕۆ پاپۆڕەکەمان گەیشتە بەندەری بەسرە، لەوێش وەك لەسەرەوە هاتوە جەماوەرێکی ئێجگار زۆر هاتبونە

پێشوازیمان. هەموویان لەبەندەر چاوەڕوانی گەیشتنی پاپۆر بوون، کاتێك پاپۆر گەیشتە بەندەر، بینیمان سەدان دروشمی جۆراو جۆر بەرزکر بوونەوە بەناوی خەڵك هەموو چینو توێژەکان ئامادەی پێشوازیکردنەکە ببوون، (کرێکارو جوتیارو مامۆستاو قوتابیو لاوانو ئافرەتان) تەنانەت پیرو پەککەوتەش هەموویان هەستی دڵپاکیان لەدروشمەکانیان دەربڕیبوو، دیار بوو ئەو جەماوەرە تەواو شادو خۆشحاڵ بوو بەگەڕانەوەمان بۆ خاکی نیشتمان، بەهەمان شێوەش هەمان هەستو سۆزی دڵسۆزانە لەکاربەدەستانی حکومەتی کۆمار ١٤ی گەلاوێژ دەبیندرا هەر لەو کاتەی پێمان نایەوە ناو ئاوی عێراق دەسەڵاتدارانی کۆمار بڕیاریان بەفرۆکەکان دابوو کە لەسەر سەرمان بسوڕێنەوە تا دەگەینە بەسرە، ئەوەی تریان ئەوە بوو لە سەر سنوور یەکەم بەلەم کەوەستا بوو کۆمەڵێك ئەفسەری سوپای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ بوون چاوەڕێی گەیشتنی پاپۆڕی ئێمە بوون لەوانە (مقدم علي عبـالعزيز) برای (ڕەئیس عزت ئامێدی) یان لەگەڵدا بوو، ئەو کۆمەڵە ئەفسەرەی باسکراو نوێنەرانی سوپای شۆڕشگێری کۆماری بوون، بەڕێ کرابوون بۆ پێشوازیکردنمان. ئەوانو دەستەیەکی ڕاگەیاندنو ڕادیۆو دەزگاکانی تری بڵاوکراوەکانی تری دەوڵەت بەسەر کەوتنە سەر پاپۆڕ بەناوی حکومەت بەخێرهاتنەوەیان لێکردین، لەدوییدا دەستەی ڕادیۆو ڕاگەیاندن کەوتنەدوانو پرسیارکردن لەئێمە، یەکەمجار پرسیـرێکیان ئاراستەی من کرد، وەڵامم دانەوە گەرچی ئەوکاتە عەرەبییەکەشم باش نەبوو، هەروەها کەوتنە پرسیارکردن لەوئافرەتە سۆڤیەتییانەی لەگەڵ مێردەکانیان هاتبوون، من لەڕوسیەوە بۆم دەکردنە عەرەبی. لەکۆتاییدا بەرپرسی ڕاگەیاندن داوای لێ کردم شتێك ئامادە بکەم بەبۆنەی گەڕانەوەمان بۆ ئەوەی لەبەغدا لە ڕادیۆی بەشی کوردی بدوێمو بڵاو بکرێتەوە، بەڵێنم پێدانو شتەکەشم ئامادەکرد، بەڵام ئەوەندە لەبەغدا نەوەستاین تاکو ئەوەی ئامادەم کردبوو لەبەغدا لەڕادیۆ بڵاو بکرێتەوە یاخود بدوێم. بەڵێ گەیشتینە بەسرە پاپۆڕ لەبەندەر لەنگەری گرتو پێپلیکانەی بەردا خوارەوە دیار بوو خەڵکێکی زۆر دەیانویست بەسەر بکەونە سەر پاپۆر، بەڵام ڕێگایان پێ نەدرا تەنیا چەند کەسێك ڕێگایان پێدرا بەسەر بکەونە سەرەوە بۆ شاد بوونەوە بە کەسو کاریان، جەماوەرێکی زۆریش لەخوارەوە وەستا بوون بەچەپڵە ڕێزو هەڵ هەڵە سەیری ئێمەیان دەکرد ئێمەش لەسەر مێردرەوەکانی پاپۆڕ هەستی شادیو خۆشی خۆمان

دەردەبڕی بەڕاستی ئەوکاتانە لەو کاتە خۆشانەیە کەهەرگیز لە بیر ناکرێ، دەبێ ئەوە بڵێین هەستو سۆزی خەڵکی پێشوازیکەر وای لێکردبوین فرمێسکی شادی بڕێژین، بڵێین ئەوە ئێمەین دوای چواردە ساڵ ئاوارەیی دەربەدەری دەگەڕێینەوە خاکی نیشتمان! بۆ ماوەیەکی زۆر پاپۆڕ وەستا تا کەلو پەلی ناو پاپۆڕ گواستراوە ناو شەمەندەفەر ئەو شەمەندەفەرەی تایبەت بۆ گواستنەوەی ئێمە لە بەسرە بۆ (هەولێر) دیارکرابوو. ئێوارە بڕیار درا بڕۆینە ناو شەمەندەفەر بێگومان پێش ئەوەی لە پاپۆڕ دابەزین ڕۆیشتمە لای کارمەندانی پاپۆڕ یەکە بەیەکە ماڵئاوایم لێ کردنو زۆر بەگەرمی سوپاسم کردن لەبەر ئەوەی لەگەڵ هەمویان ئاشنایەتیم پەیدا کردبوو. دیار بوو کۆمەڵێکی زۆر لەوانەی کەسوکاریان لەگەڵ ئێمە لەناو پاپۆڕدا بوو هاتبوونە بەسرە بۆ پێشوازی خزمەکانیان، ڕێگایان نەدەدان بەسەربکەونە سەر پاپۆڕو زۆریش لەمێژ بوو وەستابوون، ڕۆیشتمە لای کەپیتان بۆ ئەوەی ڕێگایان بدەن ناوبراو ڕازی بوو، کە خەڵکەکە بەسەر بکەون، کاتێك خەڵکەکە بەسەرکەوتن لەگەڵ خزمەکانیان بەیەك شاد بونەوە زۆر بەسۆزەوە باوەشیان لەیەکتر دەگرتوو یەکتریان ماچ دەکرد، فرمێسکی شادیو خۆشیان دەباراند، لەو دەمەش دوو کەسی خزمی ئێمەش (قادرحاجی حسنو قاسم وەرتی) بەسەرکەوتن لە سەرەتادا نەمان ناسین دوایی خۆیان پێ ناساندینو ڕۆیشتینە لای باوکم لەگەڵمان هاتن بۆ بەغدا، لە کاتێ دەست کرا بەگواستنەوە کەلوپەلەکانمان بۆ ناو شەمەندەفەر، هێزی بەرگری میللی (مقاومە شعبی) بەوکارە هەڵساو دەورێکی کاریگەری نیشاندا لەخزمەت کردنی ئەوانەی لە دەرەوەی نیشتمان گەڕابونەوە وڵات. لەو کاتەی گەیشتینە بەسرە زاییمان (صالح خۆشناو) بەڕێوەبەری پۆلیسەکانی بەندەری بەسرەیە، لەو دەمەی لە پاپۆڕ گواسترابنەوە بۆ ناو شەمەندەفەر ناوبراو بەخۆیو منداڵەکانی هاتنە لامانو لەگەڵمان بەشەمەندەفەر هاتن تا نزیك (ناصریە) لەوێ بەئۆتۆمبێل گەڕانەوە بەسرە، ناوبراو دۆستێکی زۆر نزیکی باوکم بوو. لەبەسرە بەڕێ کەوتین بەرەو کوردستان ئەوەی جێگای یادگاریو خۆشیە ئەو پێشوازیەی خەڵك بوو کەلەهەموو وێستگەکانی شەمەندەفەر هەر لەبەسرە تا بەغدا جەماوەر بەو دروشمانەی کە هەڵیان گرتبوو لە پێش شەمەندەفەر دەوەستانو خۆشحاڵی خۆیان نیشان دەدا، بەو شێوەیە لەگشت ئەو شوێنانەی ئێمەی پێدا تێپەڕ دەبووین جەماوەر چاوەڕوانی شەمەندەفەرەکەی ئێمەیان دەکرد لەگەڵ

وەستانی شەمەندەفەر خۆیانو دروشمەکانیان نزیك دەکەوتنەوە هاواریان دەکرد (بارزانیەکان هاتنەوە بەخێر بێنەوە لە سایەی زەعیمەوە) زۆربان خۆیان دەکوتایە ناو فارغۆنەکان ئێمەیان دەگرتە باوەشو ماچیان دەکردین زۆر بە سۆزەوە. هەروەك لەسەرەوەش باس کراوە ئەو پێشوازیەی لێمان کرا هەر لە بەسرە تا کوردستان گەرمترینو بەسۆزترین پێشوازی بوو لێمان کرا، بۆم هەیە بڵێم ئەو پێشوازیەی لە خوارووی عێراق لێمان کرا لەکوردستان بەو شێوەیە نەکرا ئەوەندەش گەرم نەبوو.

شەوی (٤/١٧) بە درەنگەوە شەمەندەفەر گەیشتە بەغدا لەوێش جەماوەرێکی زۆر لەوێستگەی شەمەندەفەر پێشوازیان لێ کردین، لەکاتی وەستانی شەمەندەفەر یەکێك بەناوی دەوڵەت بەخێرهاتنەوەی لێ کردینو خۆشحاڵی حکومەتی شۆرشی نیشاندا، خەڵکیش تێکرا هاتبونە سەر هێڵی شەمەندەفەر دروشمەکانیان بەرز کردبونەوەو لەپێشوازیمان وەستا بوون، ئەو پێشوازیکەرانەی وەستابوون زۆر لەوانە کەسوکاری ئەوانە بوون کەلەدەرەوە گەڕابونەوە بۆ پێشوازی هاتبونە بەغدا. لەگەڵ ئەو پێشوازیکەرانە براو خزمو کەسوکاری ئێمەش ئامادە بوون لەوانە براکانم (عزەتو سلاح)و ئامۆزایەکانم بوون هەر شەمەندەفەر وەستا ئەو جەماوەرە بەقەرپەستانە خۆیان کوتایە ناو فارغۆنەکان لەگەڵ ئەوانیش براو خزمەکانی ئێمە هاتنە ناو ئەو فارغۆنەی ئێمەی تێدا بووین لەو دەمە خۆشەی بەیەك گەیشتنو شادبونەوەدا کەلەو پەڕی شادی دابووین یەکێك لەبارزانیەکان هاتو گوتی: (ئەوە یەکێك وا لەئێوە دەپرسێ) کاتێ ڕۆیشتم بینیم (مام دێوانە حمدامین)ە لە دوای چاكو خۆشیەکی زۆرگەرمی بەسۆز ڕۆیشتینە لای باوکم، لەوکاتەی باوکمو مام دێوانە بەیەك گەیشتن بەشێوەیەك باوەشیان بەیەکدا کردبوو ئێمەش خۆمان پێڕانەگیرا فرمێسکی خۆشیو سۆزمان دەباراند. مام دێوانە مرۆڤێکی پاكو بەوەفا بوو، ژیانێکی زۆری لەگەڵ باوکم بەسەر بردبوو، ناوبراو ناسراو بوو بەمرۆڤێکی دڵ پاكو نیشتمان پەروەرو ئازاو بەجەرگ، وە لەناو خەڵك خۆشەویست بوو تا بڵێی مەردوو پیاوانەو چاو نەترس بوو هەموو کاتیش لەپێشەوەی نیشتمان پەروەران دەڕۆیشت بەئاواتی ئازادی گەلو نیشتمان بوو جیا لەوانەش لەگەڵ ئێمە یەك ماڵە بوو جێگای تایبەتی خۆی دیار بوو.

لە بەسرە کورتە بەڵێنێکم بەکارمەندانی ڕادیۆ دابوو کە گەیشتینە بەغدا لە ڕادیۆ بدوێم، بەڵام لەبەر ئەوەی لە بەغدا دوانەکەوتین نەمتوانی ئەو بەڵێنەم جێ بەجێ بکەم. لە دوای پشویەکی کورت لەبەغدا بەرێ کەوتین بەرەو کوردستان ئەو کەس و کارانەی بە پیرمانەوە هاتبونە بەغدا لەگەڵ ئێمە بەشەمەندەفەر بەیەکەوە گەڕاینەوە، کاتێك گەیشتینە (بەعقوبە) شەو زۆر درەنگ بوو ئەوجا لەگەڵ ئەوەشدا جەماوەرێکی زۆر لەپێشوازیکەران وەستابوون چاوەڕوانی گەیشتنی شەمەندەفەری ئێمە بوون، ئەوانیش زۆر بەگەرمی هەستی خۆشحاڵی خۆیان نیشاندا لەرێش چەند قوتابیەکی کورد ئەوانەی لەوێ دەیان خوێند لە(پەیمانگای مامۆستایان، بەسەرکەوتنە سەر شەمەندەفەر لەگەڵمان هاتنەوە هەولێر بەك لەوانە (هەلگورد ئیبراهیم ئاغا) ڕواندزی بوو. بەم شێوەیە شەمەندەفەرەکەمان لەبەعقوبە بەرێکەوت بۆ کوردستان.

## بەشی حەوتەم

# شادبوونەوە بەکوردستان و کەس و کارمان

بەرەبەیانی رۆژی (١٨/٤/١٩٥٩) لەگەڵ دەرکەوتنی گزنگی هەتاو گەیشتینەوە شاری کەرکوکی خۆشەویست بەو بەرە بەیانە جەماوەر لەچوار دەوری شەمەندەفەر کۆبونەوە بەدروشمە ڕازاوەکانیان هەستی شادی و خۆشیان دەردەبڕی، بەدەنگی بەسۆزی ئەو جەماوەرە هەموومان لەخەو هەستاین کاتێك بینیمان سەربازەکانی سوپای شۆڕش خەڵکیان لادەدا پێیان دەگوتن (ڕێگا بدەن قائد دێت)، پاش ماوەیەك قائدمان بینی هات دیار بوو مرۆڤێکی چوست و چالاك و لێهاتوو بوو لەگەڵ میرحاج و هەندێ ئەفسەری تریش لە شوێنێك وەستان، قائد بەناوی سوپا و لەشکری دووی کەرکوك و ئەفسەرەکان و سەربازە شۆڕشگێرەکانی ١٤ی تەمووز بەخێرهاتنەوەی لێکردین و شادی و خۆشحاڵی خۆی و سوپاو جەماوەری پیشاندا بەبۆنەی گەڕانەوەمان بۆ نیشتمان وتارێکی زۆر ڕێك و پڕ مانای داو گوتی:

(برایانی بەرێزو ئازیز ئەمڕۆ رۆژێکی مێژوویی پیرۆزە، لە ئەو رۆژەیە لەدوای چواردە ساڵ ئاوارەیی و دەربەدەری برا کوردەکانمان دوور لەنیشتمان و کەس و کاروماڵ و منداڵیان دەژیان وا ئەمڕۆ لە سایەی دەست و بردی شۆڕشگێرانی عەرەب و کوردو کەمایەتیەکان و زەعیم بەسەر بەرزی گەڕانەوە، ئەوان وا لەبەرچاومانن و ئێستا لەسەر خاکی باب و باپیریان پێشوازیان لێ دەکەین، دوبارە بەگەرمی بەخێرهاتنەوەیان لێ دەکەین).

لەدوای قائد میرحاج وتەیەکی کورتیدا کەتیایدا سوپاسی حکومەتی شۆڕش و سوپاو کارمەندان و قائدی کرد بەناوی ئەوانەی لە سایەی شۆڕشەوە گەڕاونەتەوە ئەو نیشتمانەی بەخوێنی شۆڕشگێران ئازاد کراوە هەستی خۆشحاڵی ئێمەی بەدیار خست دەربارەی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی پیرۆز.

ئەوەی جێگای ڕەزامەندی‌و شادی بوو لەو کاتەی قائد (داود جەنابی) دەدوا جەماوەر یەك دەنگ هاواریان دەکرد (بەخێر بێنەوە برایانی دەربەدەرو ئاوارە با هەربەردەوام بێت یەك گرتنی گەل‌و سوپا بۆ سەرکەوتن بەسەر نۆکەران‌و دەست درێژیکەران، با پتەو تر بێت برایەتی نێوان کوردو عەرەب‌و نەتەوەکانی تر) ئەوە بوو هەستی جەماوەری شۆڕشگێڕو تێکۆشەر.

ئەوەی دەمەوێت بیڵێم لەو کاتەی جەماوەر هاواریان دەکردو هوتافیان لێ دەدا ئەوەندە بەگەرمی‌و بەسۆزو ئارەزووەوە سەیرم دەکردن لەخۆشیان تەزیم بەگیاندا دەهات‌و فرمێسکی خۆشی‌و شادیم بەچاواندا دەهاتە خوارێ وامدەزانی ڕۆژی لەدایك بونمە، بەتایبەتی زۆر سەرسام بووم بەووتە بەنرخەکانی (داود جەنابی). لەدوای وتەکانی قائدی لەشکری کەرکوك‌و میرحاج شەمەندەفەرەکەمان کەوتەوە ڕێ بەرەو شارە دێرینەکەی هەولێر، چرای ڕوناکی شارە جوانەکەی کوردستانمان (کەرکوك) جێهێشت، پێش نیوەڕۆ گەیشتینەوە شارە مێژوویەکەی کوردستان، هەولێری خۆشەویست، لەدوورەوە قەڵای شار بەدیار کەوت، کاتێك نزیك کەوتینەوە دیار بوو جەماوەرێکی زۆر چاوەڕوانی ئێمە بوون لەو کاتەی شەمەندەفەر لەوێستگەی هەولێر وەستا هەر ئەوەندەمان زانی ئەو خەڵکە وەك سەر لێشێواو خۆیان پەستایە ناو شەمەندەفەر لەفارغۆنەکان بەژوورکەوتن هەرکەسەو بەدوای، کەس‌و کاری خۆیان دەگەڕان‌و دەیان پرسی، لەبەر زۆری خەڵك دەرگایەکان گیران نەمانتوانی دابەزین، ئەوەی ئەو کاتە ئەو خەڵکەی بدیبایە توشی سەرسامی دەبوو بەتایبەتی ئەوانەی کەس‌و کاریان گەڕابونەوە زۆر لە خۆشی‌و شادیدا بوون لەلایەکی تریش ئەوانەی کەس‌و کاریان نەگەڕابوەوە دەست لە ئەژنۆو دڵ غەمبار دەگریان بەتایبەتی ئەوانەی نەمابوون‌و هەندێکیش هەر نەگەڕابونەوە، لەلایەك شین بوو لەلایەکی تریش شایی، ئەوانەی تازیەیان بوو دەگریان‌و فرمێسکی پەرۆشیان دەباراند ئەوانی تریش کە بەکەس‌و کاریان شادببونەوە فرمێسکی شادیان دەباراند. ئەوکاتانەم بەلاوە زۆر گران بوو بەپەرۆشەوە سەیری غەمبارەکانم دەکرد، دیمەنێکی زۆر سەیر دەکەوتە بەرچاوانم، ئەو خەڵکە تێکەڵاوی یەکتر ببوون کەس بەکەس نەبوو لەو کاتەدا کارمەندانی دەوڵەت لەگەڵ (میرحاج) هاتن بەگوێرەی ئەو بڕیارەی دەرچووبوو ئەوانەی خاوەن ژن‌و منداڵن بەڕێ بکرێنە هاوینە هەوارەکانی (صلاح الدین‌و شەقڵاوە) ئەوەی بێ ژن‌و

منداڵیشە لەهەولێر بمێنێتەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك میوانی حکومەت دەبن شوێنیان بۆ دیار کرابوو، بەو شێوەیە داوایان کرد کەئامادە بین بۆ ئەوەی بەڕێ بکرێنە شوێنی دیاریکراویان، هەر ئەوکات ئۆتۆمبێلەکان دیار کرابون بۆ ئەوەی ئێمە بگوازنەوە، ئەوەی ڕاستی بێت زۆر بەپەلە ئێمە بەڕێ کراین بۆ شەوکەس نەما هەرکەسەو بۆ ئەو شوێنە نێردرا کەبۆی دەست نیشان کرابوو، بەو شێوەیە لەوێ بلاّوەیان پێ کردین، ئێمە بەشێك لەناو خانوەکانی مەسیف داندراین من لەخانوەکەی کوڕی (نوری سەعید) داندرام لەهاوینە هەواری پیرمام، بۆ ڕۆژی دوایی ئەوەندەمان زانی جەماوەر لەگشت ڕوێکەوە ڕوویان تێکردین بێ پچڕان ئەو خەڵکە لەڕێگادا بوون دەهاتن بۆ بەخێرهاتنەوەمان، ئەو ڕۆژانەی لەوێ بووین خۆشترین ڕۆژانی ژیانمان بوو لەبەر ئەوەی چواردە ساڵ بوو لەنیشتمانو کەس‌وکارمان دوور بووین، بۆیە ئەو کەس‌و کارانەی کەئێمە لێیان دوور بووین دەستە دەستە لەگەڵ دۆست‌و ناسیاوەکان دەهاتنە بەخێرهاتنەوەمان، زۆر لە خزمەکان هاتنە لامان لەوان هەندێکیانم نەناسیەوە بۆ نمونە (حمدامین کوڕی مام سیدئاغا)م نەناسیەوە تا پێیان نەگوتم! بەهاتنی ئەو خەڵکە بۆ لامان شادیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا، بەلاّم ئەوەی بەلامەوە نیگەرانی بوو لەو خۆشی‌و شادیەدا هەستم دەکرد نا تەبایی‌و ناکۆکی هەیە لەنێوان کۆمەڵە سیاسیەکان، ئەو ناتەباییە ناسازی‌و ناخۆشی‌و دووبەرەکی پەیدا کردبوو، هەستم بەوە دەکرد ئەو خزمانەی دەهاتنە بەخێرهاتنەوەمان پێیانەوە دیار بوو هەر هەندێك ڕوویان لەلایەك بوو، لەگەڵ یەك نەدەهاتن بەڵکو هەریەکەی لەگەڵ لایەنەکەی خۆی دەهات بۆ پیرمام.

ئەوەندە ماوەی مانەوەمان لەهاوینە هەواری پیرمام، جیا لەکەس‌و کارەکانمان بەکۆمەڵ کەسانی تریش دەهاتنە لامان ئەوانەی ئارەزویان بوو شتێك لە چونی ئێمە بۆ (سۆڤیەت) بزانن، ئەو کاتە وایان دەزانی ئەوەی بڕواتە سۆڤیەت دەبێتە سیاسی‌و بیر هەڵگری چەپ!

ڕۆژی سێیەم دەستەیەك لەمامۆستایان لەهەولێرەوە هاتنە لامان مامۆستاکان بریتی بوون لە(حیدر عوسمان، ئەنوەر سلێمان، جەواد ڕەسول، گۆرگیس) لەدوای بەیەك گەیشتن ئەوان دەستیان کرد بەپرسیارکردن، مامۆستا حەیدەر پرسی: (تەمەنت چەند بوو کە ڕۆیشتیتە یەکێتی سۆڤیەت؟) گوتم: (تەمەنم لە نێوان نۆزدە

تابیست سالآن دەبوو کە چوومە یەکێتی سۆڤیەت). دیسان گوتی: (ڕێ ڕۆیشتنتان چۆن بوو و چەندی خایاند تا گەیشتنە سۆڤیەت؟) گوتم: (لە دوای تێك چوونی کۆماری مەهاباد لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٦ تا مانگی٤/١٩٤٧ لەکێشە دابووین لەگەڵ کاربەدەستانی ئێران، ئەو کوردانەی گەیشتبونە ژێر ئاڵای کۆماری کوردستان بەشێوەیەکی تایبەتی هۆزی بارزان گشتمان کشاینەوە نزیك سنورەکانی عێراق لەناوچەکانی مامەش و پیران و زەرزاو شنۆو نەغەدەو دەوروبەری ورمێ، تا ناوەڕاستی مانگی ٤/١٩٤٧ ڕووبەڕووی سوپای ئێرانی لەجەنگدا بووین لەدواییدا ناچار بووین ماڵ و منداڵ بەڕێ بکەینەوە عێراق ئێمەش پێنج سەدو بیست و پێنج خۆبەختکەر لەگەڵ مەلامستەفا لەکێوەکانی سەر سنورەکانی عێراق و تورکیا ماینەوە تا مانگی ٥/١٩٤٧ نە دوای ئەوەی ناچار کراین لە ٢٤/٥/١٩٤٧لە عێراق دەربکەوین بەرەو سۆڤیەت ڕۆیشتین بەسەر سنورەکاندا لە١٩/٦/١٩٤٧لە ئاوی ئاراس پەڕینەوە ناو خاکی سۆڤیەت). مامۆستا پرسی: (دیارە تۆ خوێندوتە ئایا لە چیت خوێندوە؟) گوتم: (بەڵێ خوێندومە، دەتوانم بڵێم ئەو ماوەیەی لەوێ بووین لە خوێندن دوور نەکەوتم بەڵکو جیا لە تەواو کردنی زانکۆ لەچەند خوێندنگایەکی تریشم خوێندوە). ئەمجارە مامۆستا ئەنوەر سلێمان پرسی: (ئایا ئەوە ڕاستە ئێوە لە شەڕی کۆریا بەشداریتان کردوە مەلامستەفا کراوە بەفەرماندەیەکی پایە بەرز لەو شەڕەدا؟) گوتم: (ئەوەی ڕاستی بێت وا لە ئێوەی دەزانین و بیستومانە، کاتی شەڕی کۆریا ئێمە دوورخرابوینەوەو نەفی کرابووین بەسەر گوندەکان لەئۆزبەکستان مەلامستەفاش وەك هەمووومان لەگوندێك داندرابوو وەك نەفی). پرسیار: (ئایا وابوو مەشقی سوپاییان بەئێوە دەکرد، چونکە نوری سەعید باسی ئەوەی دەکرد کەوا سۆڤیەت مەشقی سەربازی بەبارزانیەکان دەکات و فێری چەکی گران و نوێیان دەکات و ئامادەیان دەکات؟) وەلآم: (بەڵێ ماوەی دوو ساڵ مەشقی سەربازیان پێ کردین، بەڵام بەداخەوە سودمان لەو هەلە ڕەخساوە وەرنەگرت ئەوانیش وازیان لێ هێنایین). پرسیار: (لەوانەی گەڕاونەتەوە چەند کەستان بوون بەشیوعی؟) وەلآم: (دەتوانم بڵێم کەسمان شیوعی نین ئەوەی بزانم یەکێك نەگەڕاوەتەوە شیوعی بێت لەبەر ئەوەی ئێمە لەوێ پەنابەر بووین بەگوێرەی پەیڕەوی ئەوان ئەوەی سۆڤیەتی نەبێت لەڕیزی حزبی شیوعی وەرناگیرێ، لەلایەکی تریش لەوێ بوون بەشیوعی ئەوەندە ئاسان نیە ئەوەی

..بێتە شیوعی دەبێ پەروەردە کرابێت‌و بزانێت شیوعی چیە ) ئەو مامۆستایە لە دوای وەڵامەکەی من دایە قاقای پێکەنین‌و گوتی: (بەزیادی خێرم نەکرد دیارە چۆن ڕۆیشتوون هەر ئاوهاش هاتونەتەوە!) بەڕاستی زۆر پەست بووم، بەڵام میوان بوو بۆیە ڕێزم لێنا. ئەوجارە مامۆستا جەواد ڕەسول پرسی: (کەس لە ئێوە لە کۆلیژەکانی زانستی نەتان خوێندوە؟) وەڵام: (نەخێر لەبەرئەوەی ئێمە کە چووینە ئەوێ تەنیا چەند کەسێکی خوێندەوارمان لەگەڵدا بوون ئەوانیتر بەتێکڕایی نەخوێندەوار بوون، مرۆڤیش ئەگەر بەپێی بخوێنێ فێری هیچ شتێکی وا نابێت ئەگەرچی زۆریان هەوڵدا فێرمان بکەن، بەڵام هەرئەوەندە فێربووین ئەوەی هێناومانەتەوە، وە لەڕووی زانستیش هیچ). پرسیار: (لەوکاتەی پێتان ناوەتەوە خاکی نیشتمان لەبەسرەوە تاکو ئێرە هەست بەچی دەکەیت‌و ڕەئیت بەرامبەر دەستەڵاتی حکومەتی شۆڕشی ١٤ی تەمموز چۆنە؟) وەڵام: (ئەوەی ڕاستیە لەو پەڕی شادی دام بەو سەربەستیە، ئەوەی گەل دەستی کەوتووە‌و تێیدا دەژیت، ئەو یەکگرتن‌و برایەتیەش جێگای پیرۆزباییە، ئەو برایەتیەش لەوە بەدیار کەوت لەوپێشوازیە ئەوەی لەخواروی عێراقەوە لێمان کرا، ئەوەش وادەگەیەنێ دەبێ سەرکردایەتی شۆڕش نیازیان خزمەتی گەل‌و وولات بێت، هیوادارم هەربەو نیازە بن‌و برایەتیش هەر بەهێزترو پتەوتر بێت). پرسیار: (بیروڕات بەو دروشمانەی دەیان بینی‌و ئەو هوتافانەی خەڵك چۆن بوو؟) وەڵام: (دەربارەی دروشمەکان ئەوە ئارەزوی خەڵکەو هەست بەئازادی دەکەن ئەوەش هەنگاوێکی زۆر باشەو جێگای خۆشحاڵیەکە دەتوانن بیروڕای خۆیان دەرببڕن، بەڵام دەربارەی هوتافەکان وا هەست دەکەم دوور نییە لەداهاتوو ببنە هۆی نا ڕەزامەندی نێوان کۆمەڵە سیاسیەکان، هەرچەندە ئێمە تازە هاتوینەتەوە زۆر شارەزای کارو کردەوەکان نین ئەوەی دەبینم سوپا دەڕواتە سەرەوەو سەربازەکان لەناو ئۆتۆمبێلەکان هاواریان دەکرد (ماکو زعیم الا کریم، حزب الشیوعی للامام دیمقراطیة والسلام) ئایا عبدالکریم تادوایی لەگەڵ ئەو هوتافانەی دووەم دەڕوات؟ دەبێ ئەوە دیاربێت ئەو مرۆڤە چیە؟) مامۆستا جەواد وەڵامی دامەوەو گوتی: (ئەوە نازانم‌و دیار نییە تا کەی لەگەڵی دەڕوات!). دوا پرسیار مامۆستا جەواد پرسی: (وەك دیارە هێشتا حزبی نیت نیازت هەیە بڕۆیتە ناو ڕیزی یەکێك لەو حزبانەی کە هەن؟) وەڵام: (ئەوەی ڕاستیە لەو بارەیەوە ناتوانم پێتان بڵێم

بەڵێ یان نا لەبەرئەوەی هێشتا هیچ نازانم لە دوای ماوەیەکی تر بەدیار دەکەوێتو لێتان ناشارمەوە مارکسیم).

لە دوای ئەو دانیشتنە درێژ خایەنە لەگەڵ مامۆستایان وام هەست کردو دیاریش بوو بەرەزامەندی هەستانو ڕۆیشتن وتیان ماندومان کردی، بەلاّم ئەو دانیشتنە کۆمەڵێك شتی گرنگی داینە دەست زۆر سوود بەخش بوو جێگای سوپاسمانە.

لەو دیدارە بۆم بەدیارکەوتو هەستم پیێ کرد شتیان زۆر بیستبوو پێش بێنە لای من لەقسەکانیان دیار بوو (ئەنوەر سلێمان) خۆرایی نەی گوت ئەوە ڕاستە چۆن ڕۆیشتوون ئەوهاش هاتونەتەوە!! ئەوەندە ڕۆژانەی لەپیرمام میوانی دەوڵەت بووین زۆر شت هەبوو بنوسرێت ئەوەی زۆر گرنگ بێت ئەوە بوو لەوکاتەدا سوپا لە ڕێگادا بوو بۆ ناوچەی ڕاوندوز وا بەدیار دەکەوت مەترسی هەبێت لەسەرەوە، ئەوەی بەدیار دەکەوت ئۆتۆمبێلەکانی سوپا ڕازاوە بوون بەدروشمی نایاب وپڕمانا، بۆ نمونە یەکێك لەدروشمەکان نوسرابوو (سوپای شۆڕش پاسەوانی گەلو نیشتمانە)، هەروەها لەیەکێکی تر نوسرابوو (سوپاو گەل پارێزەری دەسکەوتەکانی شۆڕشن) زۆر دروشمی تریش دەبیندران، ئەمانە جێگای دڵخۆشی بوون، بەلاّم نەمبینی بەناوی هاوپەیمانەکانو ڕێکخراوەکان شتێك هەبێت کە سەنگەری پتەوی پاراستنی دەستکەوتەکانی شۆڕش بێت کە جێگای متمانە بێت نەك هەر بەدروشم.

بێگومان پێش لە سۆڤیەت بگەڕێینەوە (ڕەسول ناجی) هاتەلامو داوای کرد کە دەگەڕێینەوە هەولێر بڕۆمەماڵیان ناونیشانی ماڵەکەیو نامەیەکی پێدام بۆ منداڵەکانی، ئەو ڕۆژەی لەپیرمام ڕۆیشتمە هەولێر بۆ سەردانی باوکم لەوێش بەگوێرەی ناونیشانی پێم بوو ڕۆیشتمە ماڵی مام ڕەسول شتەکانم بەئەمانەتەوە پێدان زۆر کەیفیان هات یەکێك لە کوڕەکانم بینی کەناوی (فوئاد) بوو لەگەڵ دایکی پێم ڕاگەیاندن کەهەندێ شتی بەبەرید ناردوە نازانم گەیشتووە یان نا؟ گوتیان نەگەیشتووە. هەر لەو گەشتە چاوم بەقوتابییەکی خزمم کەوت: (قادر مەلا ئەحمەد) بوو لەگەڵی ڕۆیشتمە بارەگای یەکێتی قوتابیان لەگەڵ لێپرسراوی یەکێتی قوتابیان (صلاح حاجی سەعید) دوامو گفتووگۆم کرد ناوبراو داوای کرد بەشداری کۆبونەوە فراوانەکەی کەرکوك بکەم بۆ ئەوەی ئەو باسەی بۆ ئەوانم کرد لە بارەگاکەیان لە

کۆبونەوەکەی کەرکوك بۆیان بدوێم، بەڵێنم پێدان‌و ڕازی بووم بەشداری کۆبونەوەکە بکەم، بەڵام ئەوەی بووە کۆسپ‌و ڕێك نەکەوت بڕۆم بۆ ئەو کۆبونەوەیە لە کاتی دیاریکراودا ئەوە بوو ئێمە گەڕاینەوە دەرگەڵە بەپێی ئەو بڕیارەی کە هەرکەسەی بگەڕێنەوە گوندەکانیان، ئەوە بوو ئێمەش گەڕاینەوە دەرگەڵەو ڕێك نەکەوت بڕۆمە کەرکوك. بەڵێ لەبارەگای قوتابیانی هەولێر بەدرێژی باسی سۆڤیەت‌و قوتابیانی نەوتیم بۆ کردن‌و وەڵامی زۆر پرسیارم دانەوە، هەندێك شت لایان ڕۆن نەبوو دەربارەی ژیانی سۆڤیەت بۆم روون کردنەوە، بۆ ڕۆژی دوایی (جەواد کوڕی رسول) خۆی‌و منداڵەکانی هاتنە لامان داوایان کرد بڕۆینە لایان لەهەولێر ناوبراو گوتی: (بەیانی دێم دەتان بەم میوانمان دەبن ئێوارەش دەتان هێنمەوە). ئەوە بوو جەواد هات‌و ئێمەی برد بۆ هەولێر لەماڵیان میوانداریەکی زیاد لەپێویستیان کردین جێگای بەزامەندیمان بوو. ئەوەی جێگای یادەوەریە ئەو ڕۆژانەی لە مەصیف صلاح الدین بووین، ڕۆژێکیان لەگەڵ دایکی منداڵەکانم دەدوام بەڕویەکی زەردەخەنەوە لە پێشم وەستاو گوتی: (وا دیارە نەت دەویست لەگەڵت بێم بۆ عێراق بۆیە دەت گوت خانوەکانمان ئەوهاو ئەوهان ئێستاش دەبینم خانوەکانی ئێرەش جیاوازیان نیە لەگەڵ خانوەکانی سۆڤیەت). پێم گوت: (بەدبەخت تۆ لێرە میوانی ئەو خانوانەی تێیدا دانیشتوین ئەوە خانوی وەزیرەکانن هاوینان دێن لێرە ڕادەبوێرن، لەدوای چەند ڕۆژێکی تر دەڕۆینەوە ناو ئەو خانوانەی لەوێ باسم بۆ کردی من ڕاستیم پێ گوتوی نەك بۆ ئەوەی لەگەڵم نێیت بۆ عێراق، بەڵکو بۆ ئەوەم بوو نەڵێیت پیاوەکەم فریوی دام‌و ڕاستی پێ نەگوتم. لەپاش چەند ڕۆژێك مانەوەمان لەپیرمەم وەك میوان لەهاوینە هەواری مەسیف ئاگادر کراین بڕۆینە هەولێر بۆ لای میرحاج، کاتێك ڕۆیشتینە لای ناوبراو پێی ڕاگەیاندین کە هەرکەسەی دەتوانێ بڕواتەوە شوێنی خۆی لە دواییدا ئەوەی بیانەوێت لەسەرکار دابمەزرێت بابێن ناویان بنوسن بۆ دامەزراندن، لە دوای چاوپێکەوتنی میرحاج ڕۆیشتمە لای باوکم بۆ ئەوەی لەبارەی گەڕانەوەمان کاتێك دیار بکەین لەوێ ڕێك کەوتین کە دووسێ ئۆتۆمبێل بگرن ئەوان لە هەولێر بێن بۆ پیرمام‌و ئێمەش هەڵبگرن‌و بگەڕێینەوە دەرگەڵە لەوێ ڕۆژو کات دیاریکران ئەوکارە بە(صلاح)ی برام سپێردرا بۆ ئەوەی من‌و حمدامین لەکاتی دیاریکراودا ئامادە بین بۆ ڕۆیشتن.

## ڕۆیشتنەوەم بۆ دەرگەڵە

لەڕۆژی (١٩٥٩/٤/٢٧) سەرلەبەیانی لە هاوینە هەواری صلاح الدین بەڕێ کەوتین بەرەو ناوچەی ڕواندز بۆ شوێنی ژیانی هەمیشەیمان بەو ڕێگا دلگیرەی کۆڕێو شەقلاوەو هەریرو سپیلكو خەلیفانو گەلی عەلی بەگدا تێپەڕین بەسێ ئۆتۆمبێل، ئەوکاتەی لەناو شەقلاوە دەڕۆیشتین منداڵەکانم دەیان گوت: (ئێرە زۆر خۆشە)، بەلاّم کە گەیشتینە گوندی باویان (صلاح)ی برام بەخێزانمی گوت، گوندەکانی ئێمەش بەم شێوەیە بێ دارو ئاون هەر لەگوندی باویانەوە ئەو ئافرەتە بەداماوی مایەوە تا گەیشتینە تاقگەی ناو گەلی عەلی بەگ، لە ناو گەلی عەلی بەگ دابەزین هەندێ وێنەمان گرت ئەوکاتە خێزانم بەدەنگ هاتەوەو زۆر بەئارەزووەوە سەیری دیمەنی گەلی عەلی بەگی دەکرد بەشێوەیەکی تایبەت ئەو شەقامەی بەبن شاخەکەدا دەڕوات کە ئێمەی پێدا پەڕیبوینەوە، لەوێ دەرچوین گەیشتینە دەشتی ڕواندز ئێستا پێی دەگوترێت دەشتە دیان کاتێك گەیشتینە (گەروی سۆرە پەلۆکێ)، ڕواندز بەدیارکەوت بەمنداڵەکانم گوت (ئەوەیە ڕواندز)، گەیشتینە (خەلکان) ئێمە لەگەڵ باوکم لاماندایە ڕواندز بۆ چاوپێکەوتنی قائمقامو فەرماندەی سەربازگەی ڕواندز ئەوانی تریش بەرەو حافیز ڕۆیشتن، لەدوای سەردانەکەمان بۆ ڕواندز ئێمەش زۆر دوا نەکەوتینو ڕۆیشتین بۆ حافیز دیار بوو جەماوەرێکی زۆر هاتبوونە پێشوازیمان، لە کاتێکا ئۆتۆمبێلەکەمان وەستاو باوکم دابەزی بوو بەتەقەی خۆشی کۆمەڵە تفەنگێك تەقەیان دەکرد، ئەوەی شایانی باسە پێشوازییەکی گەرمان لێ کراو لەگەڵ پێشوازیکەران یەك بەیەك باوەشمان بەیەکدا دەکردو بەخێرهاتنەوەیان دەکردینو خۆشحاڵی خۆیان نیشان دەدا.

لەوکاتو ساتە خۆشەدا (حمدامین ئاغای ناوپردانی) گەیشتە حافیز ئەویش هاتبوە پێشوازیمان لەگەڵ ئێمە هاتە دەرگەڵە، لەگەڵ باوکم بەسواری ولاّخ ڕۆیشتین ئێمە هەموومان هەولێکی زۆرماندا دایکی منداڵان بەسواری وولاّخ بڕوات، بەلاّم سوار نەبوو بەپێیان کەوتە ڕێ ڕێگاش دوورو هەوراز بوو، تا بەسەر کەوتینە سەر(زیخان) تاریك داهات، بەلاّم تا بلێی هیلاكو ماندوو ببوین لەگەڵ ئەو ئافرەتە

ئەوجاش سواری وولاخ نەبوو، لەگەڵ بەسەرکەوتنی سەر زیخان (نەجمەی مام سەعید بەگ) لەگوندی چرای لۆکسی هێنا بەپیرمانەوە لەبەر ئەوەی تاریك داهاتبوو ناوبراو پێشمان کەوت سەرەو ژێر بەرەو گوند شۆڕ بووینەوە ناو گەلیو بەرەو گوند سەرکەوتینو گەیشتینە ناو گوند بەو ماندوو بونەی لەگەڵ دایکی مندالان توشی هاتبوین کە گەیشتینە بەر دەرگای ماڵەوەمان بەدایکمیان گوت (ئەوە زرار)ە هەرچاوی بەمن کەوت لە شوێنی خۆی کەوتو بێ هۆش کەوت،گوتمان تەواو بوو لەدوای ماوەیەك وەخۆی هاتەوە وەك سەرلێشێواوێك هەستاوو باوەشی لەمن گرتوو وەك باران فرمێسکی دەباراندو دەی گوت: (ئەوە تۆی ماوی؟ بەئێمەیان گوت زرار لەرێگا مار خواردویانە!) بێ شکە ئەوەش پروپاگەندەی نەیارانی ئێمە بوو بلاویان کردبۆوە، ئەو پروپاگەندەیەی نەیاران مەرامێکی گلاویان هەبوو لیی، بەلام لەمەرامە پوچەڵەکەیان سەرنەکەوتن. دیار بوو دایکم زۆری هەوڵدا منداڵە بچوکەکان بگرێتە باوەشو ماچیان بکات ئەوانیش خۆیان دەپچڕیەوەو نەدەچونە لای دەگریان لەبەر ئەوەی نەیان دەناسی، وە زۆر بەووردی سەیری دایکی منداڵەکانی دەکرد دەیدی وا بێ دەنگ دانیشتوە مەگەر من بدوانبایە یان لەگەڵ منداڵەکانی قسەی کردبا ئەگینا کڕو مات دانیشتبوو هەر ئەوەندەم زانی دایکم گوتی: (ڕۆڵە زرار ئەو کەڕو لاڵە چیە هێناوتە؟ ئەوە کەنگێ فێری کوردی دەبێتو دەتوانێ وەك ئێمە قسە بکات؟ ئەی قوڕم بەسەری تا ئەوە فێری کوردی دەبێتو قسە لەگەڵ دایکت بکات من نامێنم). پێم گوت: (دایە غەم مەخۆ ئەوە زۆر زوو فێری هەموو شتێك دەبێ خۆشت نازانی چۆن ئەوەندە زوو فێربووە!).

ئەوەی شایانی باسە ئەو شەوە ئەوەندە خەڵك هاتبونە دەرگەڵە جێگای بەتاڵ نەمابوو هەموو ماڵەکان پڕ ببوون لەمیوان، خەڵکێکی زۆری گوندەکان هاتبوون بەو شەوە شایی دەگەڕاو ڕەش بەڵەك گەرم بوو، بەیانی ڕۆژی دوایی لەگەڵ گزنگی هەتاو ئەو جەماوەرە زۆرە دارژایە شوێنی شایی کردن دەستە دەستەش خەڵك هەردەهاتن، دەتوانم بڵێم دەرگەڵە لەهیچ کاتێك ئەوەندە خەڵکی تێدا کۆنەبۆتەوە ئەمە یەکەم جار بوو دەرگەڵە ئەوەندە خەڵکی تیادا کۆببێتەوە، خەڵك ڕۆیشتنە شوێنی ئاهەنگو شایی باوکم لەگەڵ (حمدامین ئاغای ناوپردانی)و کۆمەڵێك کەسی تر سەرکەوتنە گەڕەکی قەڵات بۆ دیدەنی (میرحمدامین بەگ) ناوبراو ئامۆزای باوکم

بوو مرۆڤێکی بەتەمەن بوو لەوکاتەی ئێمە گەڕاینەوە نەخۆش بوو لە ناو جێگا کەوتبوو، بەنیاز بووین شەو برۆینە لای، بەڵام لەبەر میوانان بەتایبەتی ئەو میوانانەی لە دورەوە هاتبون رێك نەکەوت برۆینە لای ئەو پیاوە ناودارەی لە مێژ بوو لێی دوور کەوتبوینەوە، دیارە پێش ئەوەی باوکمو ئەو کۆمەڵە کەسێك لەگەڵی برۆنە لای (میر)، ناوبراو داوای کردبوو بیبەنە سەریانی بۆ ئەوەی لەو شوێنە بەرزە ئەو خەڵکانەی کە هاتوون بیانبینێ، کاتێك بەسەر کەوتینە قەڵاتێو گەیشتینە لای ئەو پیاوە ناودارە لە ناو نوێنەکانی باوەشی بۆ باوکم کردەوە زۆر توونד لە باوەشی گرت فرمێسکی شادی دەباراند، چەند جارێك گوتی: (ئۆخەی خۆ نەمردم ئێوەم دیتەوە ئەوە منم نەمردووم ئێوەم دیتەوە!) لە دواییدا منیشی گرتە باوەشو ماچی کردمو گوتی: (خۆ ئەتو ناوت بەمردوو هاتبور ئێستاش الحمدالله وا بەسەلامەتی هاتیەوە)، ئەوجا بەخێرهاتنی لە هەموو میوانەکان کردو بالیفیان بۆ دانانو پاڵی دایەوە دەستی کرد بەقسە کردنو گوتی: (سلێمان ئەوها نەخۆش نەبووام دەهاتمە هەولێر، بەڵام نەخۆشی رێگای نەدام نەمتوانی بێم ئاواتم ئەو رۆژە بوو نەمرم تا چاوم پێتان دەکەوێتەوە، ئەوا مەرامم بەدی هات ئەمرۆ ئەو رۆژەیە ئەوەی خواستی من بوو). ئێمە لەو قسە خۆشانە دابووین لەگەڵ ئەو پیاوە مەزنە لەوکاتەدا هاتن بەباوکمیان راگەیاندو گوتیان زۆر میوان هاتوون، ناچار رۆیشتینەوە لای میوانەکان، شاییو هەڵپەرکێ بەردەوام بوو لەلای میوانەکان بووین ئەرەنددەمان زانی گوتیان شەرە لەناو شایی لەسەر وتاف بەگژیەکدا چوونو بۆتە شەڕ کەهی پارتایەتیو شیوعیایەتیە، باش بوو زوو پێراگەیشتم ئەگینا دوور نەبوو گەورەتر بێت خۆشبەختانە توانیمان لێکیان دوور خەینەوەو تێیان بگەیەنین کە ئەوە کارێکی ناپەسندو نا رەوایە دەبێ ئەوە بزاننو تێبگەن تەنیا یەکێتیو برایەتی بناغەی گەیشتنە بەئامانج ئەو ئامانجەی بۆی هەوڵ دەدەین، هەرکاتێك ئێوە یەك بن دوژمن هەوڵ دەدات ریزەکانتان ئالۆز بکات بۆ ئەوەی نەگەن بەو ئاواتەی بۆی دەچن، لەدوای ئەو قسانەی لەگەڵم کردن دەستیان کردەوە ملی یەکترو رۆیشتنەوە ناو شایی.

رۆژی دووەمی گەڕانەوەمان بوو بۆ دەرگەڵە نامەیەکی (حزبی شیوعی) رێکخراوی رواندز بۆ (عزەت)ی برام هات تیایدا نوسرابوو بەپەلە خۆیو ئەو چەکدارانەی کە هەن بگەنە رواندز لە (سیدەکان) شەرە، (عزەت) یەکسەر لەگەڵ

کۆمەڵێك چەکدار ڕۆیشت بەمەرجێك زۆری ئەو چەکانەی پێیان بوون هی ئەوە نەبوون بیان بەن بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوشدا هەر ڕۆیشتن، ڕۆژی دواتر ئێوارە درەنگ نامەیەکی بەپەلەش بۆ من هاتبوو لەلایەن ڕێکخراوی ڕواندزی حزبی شیوعیەوە لە خوارەوەش بەناوی (حسێن خەباز) مۆرکرابوو نەك بەناوی ڕێکخراو! بەلامەوە زۆر سەیر بوو ناوبراو داوای کردبوو ئەوکەسانەی دەتوانن چەك هەڵگرن بیانهێنن بۆ حافیز بۆ ئەوەی چەك وەربگرن، بەگەیشتنی ئەو نامەیە ئاهەنگ و شایی تێکدرا، (عزەت) لەگەڵ سی چەکدار ڕۆیشت‌و ئەوانی تریش ئاگادر کران بڕۆینە حافیز بەپێی ئەو ڕۆشناییە خەڵکێکی زۆر ڕۆیشتنە حافیز بۆ ئەوەی چەك وەربگرین، لە حافیز چاوەڕوانی هاتنی چەك بووین، باوکم‌و(جەلال) بەگیش هاتبوون لەگەڵ چەند ڕدێن سپیەکی گوند (ئیبراهیم بەگ، حەسەنی بوکە فاتێ، محمود بەگی وەسمانی، خدری حەسنە کەڕی) ئەوانەش دەیان ویست چەك وەربگرن، کاتێك (علی مەکتەبە) بەجێبێکی سوپایی هات وەستا دیتی ئەو هەموو خەڵکە هاتوون زوو گوتی: (بۆ ئاگاداری چەك بەپارتیەکان نادرێت باشتر ئەوەیە ئەوەی پارتیە بڕواتەوە؟!).

پێم گوت: (کاك علی ئەو خەڵکەی هاتوون لەژێر چاودێری باوکم هاتوون بەناوی حزبایەتی نەهاتون ئێمە لێیان بەرپرسین). ناوبراو بەلوت گرژیەوە گوتی: (خۆت ماندوو مەکە نابێت، با پارتیەکان چاوەڕێ نەکەن چەك بۆ ئەوان نییە، ئێمە وا هەوڵ دەدەین هۆزایەتی بن بڕ بکەین کەچی ئێوە بەنیازن نوێی بکەنەوەو نوێ ناکرێتەوە). علی ئەو قسانەی کردو ڕۆیشت.

جەلال بەگ گوێی لە مشتومڕی من‌و علی بوو لەهەڵوێستە چەوتەکەی علی مەکتەبە بەپەستی بەباوکمی گوت: (کاکە من دەڕۆمەوە) ئەوەندەی باوکم‌و من هەوڵمان دا نەڕواتەوە کەمێکی تر بوەستێ‌و ئەگەر هاتن چەکیان بەپارتیەکان نەدا ئێمەش وەری ناگرین‌و دەگەڕێینەوە هەوڵدانەکەمان بێ سوود بوو خۆی گەڕایەوە، بەلاّم ئەوانی تر مانەوە لای ئێمە. لە دوای گەڕانەوەی (جلال بەگ) بۆ دەرگەلە بەنیگەرانی من زۆر ئاڵۆز بووم زۆر بەووردی کەوتمە بیرکردنەوە دەبێ ئەو ناکۆکیەی نێوان شیوعی‌و پارتی ئەوەندە ناساز بێت وەك لە هەڵوێستی علی مەکتەبەڕەنگی دایەوە؟ ئەگەر بەم شێوەیە بێت چاوەڕوانی مەترسی لێ دەکرێت لە داهاتودا. من لەو ئاڵۆزیە دابروم (نوری تاڵەبانی) بەرپرسی مقاوەمەی شعبی ناوچەی ڕواندز گەیشتە

حافیز، لە دوای یەکتر ناسین پێم ڕاگەیاند ئەو خەڵکەی هاتووە چەك وەربگرن‌و بڕۆنە بەرەکانی شەڕ لەژێر فەرمانی شیوعیەکان دەبن، کەچی کەسیشمان شیوعی نین ئەگەر چەك وەرگرتن بەو شێوەیە بێت کە علی مەکتەبەکەمێك پێش ئێستا پێی ڕاگەیاندین ئەوا گشتمان دەڕۆینەوە ئەو چەکە وەرناگرین، وە تێم گەیاند کەوا ئێمە تازە لە سۆڤیەت هاتوینەتەوە نامانەوێ ئەو خەڵکە لێك جیا بکرێتەوە، چونکە بەناوی پارتی نەهاتووین چەك وەربگرین بەڵکو لە لیستی شیوعیەکان داندراوین. (نوری تاڵەبانی) پیاوێکی وریاو وشیار بوو بەتەواوی تێگەیشت من چیم پێ گوت ناوبراو بەڕویەکی خۆشەوە گوتی: (ئێمە چەك بەئێوە دەدەین ئەوەی ئێوە باوەڕی پێ دەکەن چەکیان دەدەینێ خوای دەکرد هەرهەمویان پارتی دەبوون).

نوری تاڵەبانی لەگەڵ باوکم کەوتە قسەو باوکم پێی گوت: (ئەوەی لەگەڵ ئێمە هاتبێت‌و سەر بەئێمە بێت هەرچیەکی بێت لە ژێر فەرمانی ئێمەیە، ئێمەش ئۆباڵی هەڵ دەگرین هەر ڕوداوێك ڕوو بدات ئێمە لێیان بەرپرسین). دیارە علی مەکتەبەگوتویەتی با پارتیەکان بڕۆن چەکیان پێ نادەین ئەگەر وابێت ئەوا ئێمەش چەك وەرناگرین‌و دەگەڕێینەوەو دڵی خەڵکەکەمان ناشکێنین. نوری تاڵەبانی لە دوای قسەکانی باوکم کەمێك وەستا زۆر بەڕێزەوە گوتی: (مامە گیان نابوایە ئێوە ئەوەندە ئەزیەت بخۆن بێن بۆ ئێرە ئەی ئەو هەموو لاوە چین با ئەوان ئەو ئەرکە بخەنە سەر شانیان)، دوبارە (نوری تاڵەبانی) بەمنی گوت: (ئێوە ئەو چەکە وەردەگرن‌و بەرپرسیارن ئەوەی جێگای باوەڕی ئێوە بێت جێگای باوەڕی ئێمەشە، ئێمە ئەو خەڵکە لە ڕێگای ئێوەوە دەناسین، پێویست بەوە ناکات ئەوە کێەو چیە ئێوە خۆتان دەزانن). هەروەها گوتی: (کاکە بەپەلە ناوەکانیان لە لیستێك بنوسن‌و ئامادەیان بکەن ئێستا لەوانەیە ئۆتۆمبێلی دابەشکردنی چەك دەگەنە ئێرە ئەوەی ناوی لە لیست دابێت چەکی پێ دەدرێت). لەسەر داوای (ملازم نوری) پیاوەکان ناونوس کران‌و لیست ئامادە کرا چاوەڕوانی هاتنی چەك بووین، لە دەوروبەری نوێژی نیوەڕۆ ئۆتۆمبێلەکان گەیشتن هەر زوو (ملازم نوری) داوای لیستی ناوەکانی کردو گوتی: (برایان ڕیز بن هەریەکەی تفەنگ‌و پەنجا فیشەك وەرگرن). چەك هەڵگرەکان ڕیز بوون یەك یەك چەکیان وەرگرت لەو دەمەشدا ئەو دوو سێ ڕیش سپیە داوای چەکیان کرد، (ملازم نوری) لەگەڵیان کەوتە قسە پێی گوتن: (مامە پیرانی ئازیز ئێمە چۆن

ـزی دەبێ ئێوە چەك هەڵگرنو نۆبەت بەئێوە بگرین، نەخێر ئێوە هی ئەوە نین
ـەمەنی ئێوە هی ئەوەیە خزمەتتان بکەین، ئەوە ئەو کۆمەڵە گەنجە رێكو چالاکانەی
ـستاون دەبێ لە جیاتی ئێوە نۆبەت بگرن رازی نابین ئێوە ئەو ئەزیەتە بخۆن).

وەڵامی پیرەکان ئەوە بوو: بۆچ وادەزانن ئێمە پەك کەوتەینو بێ هێزین قەت خۆمان بەو گەنجانەی چەکتان پێداون ناگۆڕینەوە، کاتێك زانیان چەکیان پێ نادرێت زۆر بەنارەزامەندی گەرانەوە دەرگەڵە، دیار بوو (ملازم نوری) هەستی کرد پیرەکان نە هەڵوێستی ئەو دڵ رەنجاون رۆیشتەوە لایانو لەگەڵیان دوا دڵی دابونەوەو رازی کردبوون. لەو رۆژەی چەکمان وەرگرت لەگەڵ کەلوپەلو خواردەمەنی رۆژی دوایی بەیانی زووکۆمەڵێك لەو کەسانەی چەکیان وەرگرتبوو دەست نیشانم کردبوونو لەگەڵ خۆم بردن بەرەو (سیدەکان) رۆیشتین بۆ ئەوەی بگەینە ئەو کۆمەڵە چەکدارەی لەگەڵ (عزەت)ی برام رۆیشتبوون بۆ سیدەکان بەو نیازە لە حافیز دەرکەوتین (عزیزی مام سیدئاغا) لەلای برادەرانی حافیز مایەوە، ئێمە بەرێگای (روستێ)دا رۆیشتین گەیشتینەکۆسپەکانی (شارناسی)و تێپەرین لە نزیك گوندی (چۆمبالۆك) گەیشتینە ئەو نوێنەرانەی نێردرابون بۆلای یاخی بووەکانو دەگەرانەوە، (حاجی تاهیر رواندزیو حەسەنیکوری) لەلایەن حکومەتەوە بەرێ کرابوون، (حاجی تاهیر)مرۆڤێکی ناسراوی رواندز بوو رێزێکی زۆری هەبوو لە ناو خەڵکی رواندز، هەروەها کورەکەشی (حسن)، خۆشەویست بوو لەناو کۆمەڵو پیاوێکی ووشیارو پێگەیشتوو بوو ناوبراو ئەندامی لیژنەی حزبی شیوعی بوو لە رواندز کەسایەتیەکی ناسراو بوو. لە کاتێك لە رێگا بەیەك گەیشتین ئێمەیان بینی کۆمەڵێك چەکدار لە رێگای (روستێ)وە بەرەو سیدەکان دەرۆین (حەسەن) رایگرتینو منی جیا کردەوەو گوتی: (مەرۆ بۆ سیدەکان پێویستیان بەئێوە نیە لەشکرێکی زۆر گەیشتۆتە ئەوێ، پێم باشە ئێوە بگەرێنەوەو بچن پاسەوانی لە پردەکانی رێگای گشتی بگرن هەر لە پردی گەلاڵەوە تا پردی خەلکان، لەگەڵ ئەو شوێنانەی پێویستیان بەپاراستن هەیە)، هەروەها ناوبراو گوتی: (بەراست نازانم تۆ برۆی بۆ سیدەکان لەسەر داوای من ئێوە بگەرێنەوەو پاسەوانی لەو شوێنانە بگرن کە پێم گوتن). لەوێ لەسەر راسپاردەی (حسن) گەراینەوە حافیز، بەڵام پێش ئەوەی بگەرێینەوە یەکێکمان بۆ لای (عزەت)ی برام نارده سیدەکان بۆ ئەوەی پێی بڵێ ئەگەر پێویستی بەچەکدار هەبێت با داوای

بکاتو ئێمە بۆی بەرێ دەکەین، (حسن) هەستی کرد من ئاڵۆزم دەستی خستە سەرشانمو گوتی: (پێت دەڵێم لەغەمی عزەت دا مەبەهەر شتێك ببێ لە منی بزانە بڕۆوە چاوەڕوان بەلە دوای دوو ڕۆژی تر ئاگادارت دەکەم بەمژدەیەکی خۆش). لەسەر ڕاسپاردەی (حسن) گەڕاینەوە حافیزو نامەیەکم بۆ باوکم نوسی ئەو شتانەی (حسن) بۆی باس کردبووم هەمویم بۆ نوسی، بێگومان حسن خۆیوباوکیو برایحسێن جێگای باوەڕی ئێمە بوون ئەوان تا بڵێی لای ئێمە خۆشەویست بوون، ئەوەی ئەوان بیان گوتبایە باوەڕیمان وابوو کە لە بەرژەوەندی ئێمەیە هەر لەبەر ئەوەش دڵنیا بووم لە قسەکانی حسن، بۆیە گەڕاینەوە حافیز. من لە حافیز مامەوەو چەکدارەکانیش دابەش کران بۆ پاسەوانی لەو شوێنانەی بۆمان دیار کرابوون.

## بەیەك گەیشتنێك لەگەڵ
## هەمزە عبدالله لە حافیز لە مانگی ١٩٥٩/٤ دا

ماوەیەك لە حافیز مایەنەوە لەو ماوەیەدا چەند جارێك چوومە ڕاو لە چیای (بنکێلان) بەڕێکەوت لەدوا ڕۆژانی مانگی (١٩٥٩/٤) ڕۆژێك چوومە ڕاو کاتێ ئێوارە گەڕامەوە لە بنکەی چەکدارەکان پێیان ڕاگەیاندم کە ئۆتۆمبێلێك تێپەڕ بوو ڕۆیشتۆتە خانوەکانی ئەندازیارانی ڕێگاوبانی (ئیشغال) چەند کەسێکی لە ناو دابوون وەستان پرسیاری تۆیان کرد، یەکێك لەوان گوتی: (هەر کاتێك هاتەوە پێی بڵێن با بێتەلامان لە خانوی ئەندازیاران)، کەئەمەیان پێ ڕاگەیاندم لە دوای کەمێك حەسانەوە لەگەڵ (عەزیزی مام سیدئاغا) ڕۆیشتینە لایان، دەرکەوت یەك لەوان (هەمزە عبداللە) بوو دامەزرێنەری (پارتی دیموکراتی کوردستان). لەسەردەمی کۆماری مەهاباد ناوبراوم دەناسی، بەلام ئەوانی ترم نەدەناسی، لە دوای بەیەك گەیشتنو چاكو چۆنی کەوتینە قسە هەر زوو کاك هەمزە پرسی: (زرار ئەوەی زانیومە تۆ زۆر شتت لایەو دەزانی هەندێ لەو سەربردانەمان بۆ بگێڕەوە بەتایبەتی دەربارەی چوونو ڕابواردنتان لە یەکێتی سۆڤیەت ئەوەندە ساڵانەی لەوێ بوون) گوتم: (مامۆستا هەمزە لە میرحاجت نەپرسیوە خۆ ئەو زوو گەڕایەوە لەگەڵ مەلامستەفا

ئەو زۆر لە ئێمە زیاتر ئاگاداری کارو کردەوەکان بووە). هەمزە گوتی:(ئەوەی هەست دەکرێت میرحاج وەك ئەوەی وازی لە هەموو شتێك هێنابێت وایەو نارازی دیارە باسی هیچ ناکاتو وەلامی پرسیاریش ناداتەوە هەر وادەزانی لەوت نەپرسیوە) گوتم:(خاڵ هەمزە میرحاجو زۆری تریش دڵشکاون ئەوەی ئێمە دیومانە هیواداریـن ئێوە نەیبینن ئەو مەرامەی ئێمەی بەدوای کەوتبوین لەپەشیمانی بەولاوە هیچ شتێکمان دەست نەکەوت، ئەوەش جێگای داخەکە بەدەستبەتاڵی گەڕاینەوە، نابوایە وابێت نازانم ئەبێ چیتان بۆ بگێڕینەوەو باسی چی بکەین کە ئێوەی پێ دڵ خۆش بێت)! من بەتەواوی قسەکانم تەواو نەکردبوو ئەوەندەم زانی یەکێکی چوارشانەی ڕانکوچۆغەیەکی سور لەبەر کە لەگەڵ (هەمزە عبدالله) دابوو هەستا سەر پێو ڕووی کردە پەنجەرەی لای ڕوبارو گوتی: (ئێوە کۆمەڵێك بون لەوێ سەرۆکتان ئەوەندە دڵشکاوو عادز کردووە، ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان کوردستان ئازاد بێت جێگای ئێوەی تێدا نابێتەوەو لێتان حەرامە!). ئەوەی ڕاستی بێت زۆر پەست بووم لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەهێمنی پێم گوت: (کاکی بەڕێز من جەنابت ناناسم ڕێزم بۆ خاڵ هەمزە هەیە هەر ئەوەندەت پێ دەڵێم ئێمە زیاتر لەسێزدە ساڵ لەگەڵ ئەو سەرۆکەی ئێوەی بۆ بەسۆزن ئاوارەو دەربەدەر بووینو لەگەڵمان ڕابوارد، بەبێ ئەوەی کەس بتوانێ خاڵێکی ڕەخنەی بێ ڕێزی بخاتە بەرچاو، ئەوەی لەپاشەملەش دەگوترێت وابزانم تەنیا سوکایەتیەو شەرمەزاریە، پێویستە ئەوەش بزانن ئێمە ماوەیەکی درێژ لەگەڵی ژیاینو ڕامان بوارد هیوادارم جەنابتان (...) بەڕەزامەندی لەگەڵی بن(...))! خاڵ هەمزە هەستی کرد من پەست بووم هەوڵیداو قسەکانی گۆڕیو پرسی: (باشە چۆن سەیری ئێستای عێراق بەگشتیو کوردستان بەتایبەتی دەکەی؟) گوتم: (ئەوەی لەبەر چاوە دیارە بەرهەمی شۆڕشی ١٤ی تەمموزە لەعێراقدا ئەوەی ئێستا دەیبینین خەڵك شادو سەربەستن، دەربارەی کوردستانیش ئەگەرچی ئێمە تازە هاتوینەتەوەو ئاگاداری زۆر شت نین، بەلام دەتوانم بڵێم باش نییە، لەبەرئەوەی ناکۆکی دەبینم لە نێوان پارتیو شیوعی، ئەوە دیاردەیەکی زۆر زیان بەخشو ترسناکە، نمونەیەکی بچوکتان بۆ باس دەکەم لەسەر ئەو ناکۆکیە، بەبۆنەی گەڕانەوەی ئێمە ئاهەنگو شایی بوو، خەڵکێکی زۆر تێکەلاوی شایی بوو لەناکاو پێیان ڕاگەیاندین شەڕە! بەپەلە ڕۆیشتم مشتو مڕ بوو لەنێوان دوو خزمی لەیەك نزیك، یەك پارتیەو ئەویتریان شیوعی،

پارتیەکە بەشیوعیەکەی گوتبو کۆسمۆپۆلیت، شیوعیەکەش بەپارتیەکەی گوتبو دۆلار خۆر، باوەڕیم وایە نەپارتیەکە زانیوەیەتی کۆسمۆپۆلیت مانای چیە وە نەشیوعیەکەش زانیویەتی دۆلار پارەی کام ولاتە، ئەگەر ئەوکاتە نەگەیشتبامێ دوور نەبوو بگاتە ڕادەی چەك بەکارهێنان، جا ئەگەر هەر لەئێستاوە لەم جۆرە گیروگرفتە بچوکانە نەکۆلدرێتەوەو چارەسەریان بۆ دانەندرێ ئەوە حالمان ڕوەو خراپیە). ئەو برادەرە چوارشانو ڕانکوچۆغە لەبەرەش (عومەر دەبابە) بوو.

ئەوەی جێگای دلشادیو ڕەزامەندیم بوو هەلویستە بەرزەکەی (نوری شاوێس) بوو ئەو مرۆڤە بەپێچەوانەی (عومەر دەبابە) بوو لەدوای تێبینیەکەی من (نوری شاوێس) بەدەنگ هاتو گوتی: (بەڕاستی جێگای پەرۆشیو نیگەرانیە ئەو جۆرە دیاردانە، دەبێ بزانن شیوعی کێنو دەبێ شیوعیش بزانن پارتی کێن، ئەو پارتیەی کە شیوعی دەلێت کۆسمۆپۆلیت ئەوە پارتی نییە، بەلکو لەپارتایەتی نازانێ لە هیچ نەگەیشتوە، ئەو شیوعیەش کە بەپارتی دەلێت دۆلارخۆر لەشیوعیەتو بیرباوەڕی شیوعی دورەو دەبێ هەردولا بزانن پارتیو شیوعی هاوپەیمانن ئەگەر هاتوو شیوعیەکان تا گوێزینگێ بکەونە لێلاوێ خۆ پارتی تا چۆکان دەکەوێتە قوڕاوێ).

کاتێ گوێم لە قسەکانی ئەو مرۆڤە هەست بەرزە بوو سەلماندی کە کەسایەتیەکی رۆشنبیرو زاناو وریایە لەڕوی سیاسیەوە، لەبەر ئەوەی زۆر بەڕێکی وەزعەکەی شی کردەوەو لێی دواو وەلامەکەشی لەجێی خۆی بوو، زیاتریش دوا.

ئەوەی جێگای خۆشحالیم بوو ماوەیەکی تەواو لەگەل کاك هەمزەو هاورێکانی دانیشتینو کاتەکەمان بەخۆشی بردە سەر، پێش ئەوەی دەربکەوم کاك هەمزە گوتی بەیانی دەتبینمەوە، بەلێنیشیدا بێتە دەرگەلە بۆ دیدەنی باوکم، بەلام بەداخەوە بەیانی زوو بۆ کارێکی پێویست ڕۆیشتم، نەمتوانی بیان بینمەوە، ئارەزووم بوو زیاتر لەگەل (نوری شاوێس) بدوێم، کاتێ ڕۆیشتم وام دەزانی زوو دەگەڕێمەوەو پێیان ڕادەگەم، بەلام کەگەڕامەوە ئەوان ڕۆیشتبوون. لەکاتی ڕۆیشتنیان خال هەمزە بەپاسەوانەکانی گوتبوو: (لەو نزیکانە دێمەوە دەچمە دەرگەلە). ئەوەی بەدیارکەوت سەرکردەکانی پارتی (هەمزە، نوری شاوێس، عومەر دەبابە) لەبەر یاخی بوونی سۆفیەکانی (لۆلان) هاتبون دەنگیش هەبوو کەمەلامستەفاش لەگەل بەشێکی

هێزەکەی دێتە سیدەکان بۆ دەرکردنی برادۆستە یاخی بووەکان لەحکومەتی عبدالکریم).

قسەکانی (حسن حاجی تاهیر) ڕاست دەرچوو هێزێکی زۆری جوتیارەکانی دەوروبەری دەشتی هەولێر چەکیان وەرگرتبوو هاتبونە ناوچەی ڕواندز لەوێش بۆ سیدەکان بۆ ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ یاخیبوەکان. دواتر زاندرا کە مەلامستەفاش بەخۆی سەرکردایەتی هێزێکی بارزانیەکانی گرتبوە دەستو گەیشتبوە سیدەکان بۆ لێدانی یاخی بوەکانی (لۆلان) پاش ئەوەی هێزێکی زۆر ڕۆیشتە سەریان، زۆری نەخایاند چەکدارەکانی (لۆلان) کشانەوە سەر سنورەکانی تورکیاو ئێران ناوچەی برادۆستیان بەجێهێشتو لە سنور ئاودیو بوون، بەم شێوەیە یاخی بوەکان کۆتاییان هاتو خۆیان ڕانەگرت. لەدوای کۆتایی هاتنی کێشەی یاخی بوەکان بەماوەیەکی کەم دەوڵەتی (قاسم) ئەو چەکانەی دابەشی کردبووە سەر جوتیارەکان لێی وەرگرتنەوەو چەکدارەکان بلاوەیان لێکردو هەرکەسەی گەڕایەوە سەرکاری ئاسایی خۆی، منیش ڕۆیشتمە کەرکوك لەوێ بەهەڵە دامەزرابوم لەبەڕێوەبەرایەتی چاککردنی کشتوکاڵ، چونکە من دەرچوی کۆلیجی کشتوکاڵ نەبووم، بەڵام بەناچاری ماوەیەك لەوێ مامەوە، ئەوەندە ماوەی لەوێ بووم بەزۆری کاتم لای (ڕەئیس مستەفا عبداللەو ملازم فەخری)و بارەگای حزبی شیوعی بەسەر دەبرد ناوە ناوەش چاوم بە(نافع یونس)و ئەوانی تریش لە بارەگای کەرکوك دەکەوت.

حکومەتی عبدالکریم بەرەو گۆڕینی هەڵوێستی هەنگاوی دەهاوێشت بەونیازەی لەباوەشی دیموکراتیەت بڕواتە باوەشی نەیارانی گەلو نیشتمان ئەوەش ڕێڕەوێکی ترسناك بوو بۆ لە دەست دانی ئازادیو دیموکراتی.

لەکاتێکا ڕۆیشتمەوە ڕواندز لەوێ ئاگادار کرام کەوا لە دەرگەڵە حکومەت ماڵی ئێمەیان پشکنیوە بەدوای چەکدا گەڕابوون بەبیانوی ئەوەی گوایە ئەو چەکانەی دابەش کرابوون بەسەر جوتیارەکاندا زۆریان دیار نینو نەدراونەتەوە، ئەوەیان کردبوە بیانوو بۆ پشکنینی ماڵەکانی ئێمە لە دەرگەڵە، سەرپەرشتکەری ئەو پشکنینە (ملازم سەدیق)، ناوێك بووە دیارە مرۆڤێکی پیاوانەو بەڕێز بووە کاتێك زانیبوی ژنەکەی من بێگانەیە زۆر لەسەر خۆو پیاوانە لەگەڵی دوا بوو وای نەکردبوو هەست بکات بۆ پشکنین چۆتە ماڵمان دەستیان لە هیچ نەدابوو.

ئەو پەشێویە رۆژ لەدوای رۆژ روی دەسەلاتی دارانی بەرەو پەشێویو تێکدان پاڵ دەداو هەنگاوی دەهاویشت، بۆ ئەوەی دوربم لە مشتو مڕ ماوەیەك رۆیشتمە رواندز. بەرێك کەوت لەگەڵ یەکێك لەو بارزانیانەی لە سۆڤیات لەگەڵمان بوو بەیەك گەیشتین، نامەوێ ناوی بێنم لەسەر داوای خۆی (ح، ی) ئەو پیاوە پاکە ئاگاداری کردمو گوتی: (زرار ئاگاداری خۆت بەو وشیار بەنەیارەکەت لەگەڵ یەکێك لە خزمەکانی ئێوە دەدوا دەربارەی لەناوبردنی تۆ، خزمەکەشتان (و.ھ) بەڵێنی داوە بەو کارە هەڵبستیت)، ئەوەش ئەوە دەگەیێنێ بەشی زۆری خزمەکان لەگەڵ من راستو پاك بوون چەند کەسێك نەبێت ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان نەبوون؟!.....

لە هاوینی(١٩٦٠) لە دەرگەڵە بووم ئێوارەیەك تازە لە راوە کەو گەڕا بومەوە (مام بەکر خان بەگ ناسراو بەمیرۆ) هاتەلام گوتی: (خۆت بپێچەوە بابڕۆینە ساباتێ، دەڵێن عباس ئاغا هاتووە بچینە بەخێر هاتنی)، لەسەر داوای مامم لەگەڵی رۆیشتم بۆ دیوەخانەی میر لەوێ لەگەڵ (عباس ئاغا) بەیەك گەیشتین، لە دواییدا لەگەڵ ناوبراو تووشی کێشەی سیاسی بووین، ئەنجامی ئەو قسانەی نێوانمان (عباس ئاغا) دانی بەوەنا کە وەزعی کوردەواری ئالۆزو نارێك بووە لە دەستی جوتیارە نەزانو سەر لێ شێواوەکان. لە وەلامدا گوتم: (کاك عباس ئەگەر لەگەڵیان بڕۆیت زیاترلە بەرژەوەندی ئێوەیە)، ناوبراو بەشێوەیەکی ئاغایانە گوتی: (پشتیان بەئەرزی دادەدەم ! جوتیار نەزانە هەر بەرەنجی ئەوانەوەملیان دەشکێنم، جوتیار مەڕی بەخوریە ساڵی سێ جار دەیانبڕمەوە بەرهەمی، خوری، شیر، بێچوەکە. ئەو سێ بەرهەمە یەکێکیان بۆ خۆم دەی خۆم دوەمیان دەدەمە کاربەدەستان سێیەمیشیان دەدەم بەخۆیان بۆ ئەوەی بەگژیەکدا بچن خۆبەخۆ)!! دیسان بەدەنگ هاتم گوتم: (کاکە ئەوەی دەفەرموی ئەوە لە رابوردوو باو بوو جوتیاری ئێستا وای لێ هاتووە لەخۆی دەپێچێتەوەو بەدەنگ دێت بەزەبرو زەنگ رازی نابێت وەك جەنابت دەڵێی نەزانە لەوانەیە وابێت، بەلام مامۆستای رێ نیشاندەری هەیە کە دەرسی پێ دەدات، خۆت باش دەزانی نەزان لە رێگای مامۆستا فێری زانیاری دەبێت). پێش ئەوەی عباس ئاغا وەلامی من بداتەوە یەکێکێك لەوانەی لەگەڵ عباس ئاغا بوون (شێخ خدر) ناوێك بەدەنگ هاتو گوتی: (جوتیارەکان لەمەودوا بەدرۆو دەلەسەی شیوعیەکان هەڵ ناخەڵەتێنو بەدوایان ناکەون بۆیان بەدیارکەوت شیوعیەکان

کافرن، لەدوای ئەوەی ئاشکرا بووە لەڕانیە ڕەئیسی فەلاحەکان توشی زڕ دایکی بووەو منداڵێکیشی لەبەر چووە لەماڵی خۆیان لەژێر ئەستەرکی نوێنان شاردبویانەوە، بەلاّم ئاشکرا بوو و دۆزرایەوە، بۆیە زۆربەی جوتیارەکان لەوبەدکاریە گەیشتوونو لێیان جیابونەتەوەو نارازین لە کردەوەکانیان). ناچار ڕووم کردە ئەو کەسەو پێم گوت: (جەناب من ئێوە ناناسم، بەلاّم مادام شتەکە باس کرا ئەوەندە دەڵێم کەکێ ئەوە باوەڕ دەکات ئافرەتێك منداڵی لەبەر چوبێتو بچێت لەبن ئەستەرکی نوێنان بیشارێتەوەو چاوەڕێ بکات تا پۆلیس دەچن دەری بێنن، تۆ بڵێیت ئەوە ڕاست بێت؟ مادام لەم بارەیەوە دوایو شتەکەت خستە ڕوو پێم ناخۆش بوو من باسی بکەم، بەلاّم داوا لە کاك عباس دەکەم تەنیا ئەوەندە بڵێت من سێ سەد دینارم بۆ ئەم کارە خەرج نەکردووەو بم گەیەنێتە قەناعەت ئەوکاتە منیش دەڵێم فەرمایشی جەنابتەو ڕاستە، دیارە حزبی شیوعی بنکەی کافرەکانە). لەگەڵ وەلاّم دانەوەی من عەباس ئاغا زۆر بەتوورەییو زویری هەستا لە دیوەخان چووە دەرو ڕۆیشتە لای ماڵ دیار بوو لە(شێخ خدر) پەست ببوو نەك لە وەلاّمی من، ئەوەی دوایی زاندرا عەباس ئاغا بەشێخ خدری گوتبوو کە شتێك نازانن بۆ باسی دەکەن، گوایا دەتەوێت لەگەڵ زرار بدوێیتو باوەڕ بەقسەکانی تۆ بێنێت! ئەوە چواردە ساڵە لە دنیای دەرەوە دەگەڕێ تۆ زۆر سەهوی. دە بفەرموو چۆن نهێنی جەنابنی ئاشکرا کرد دە چارەی بۆ بدۆزەرەوە چۆن شەرمەزاری دیوانیشی کردین.

بەیانی وەك ڕۆژانی پێشوو زوو ڕۆیشتمە چیا بۆ ڕاو کاتێك گەڕامەوە لەدەوری کاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆ دیتم (عەباس ئاغا) لە ماڵی ئێمە چاوەڕوانی من بوو هەر زوو گوتی: (دەزانی لەبەر تۆ نەڕۆیشتوم بۆ ئەوەی وا نەزانی کە شەو لە دیوەخان هەستام لەبەر تۆ ڕۆیشتبم، بەڵکو لەبەر ئەو نەزانە بوو ئەوەی بەپێ خواسی کەوتبوە ناو سیاسەتو هیچیشی لێ نەدەزانی). لەوکاتەی هەستا بڕوات گوتی: (جیا لە هەموو ئەو شتانە تکایەکی برایانەم هەیە ئەویش ئەوەیە ئەو ئافرەتە دڵشکاو نەکەیت لەبەر ئەوەی ئەو ژنە هەموو کەسوکاری تەنها تۆی کەسیتر نابینێ لە ئێوە بەولاوە). لە دواییدا دەستی نایە ناو دەستمو لەو خەڵکەی دوور خستمەوە کە لەوێ بوون بەنهێنی پێی گوتم: (زۆر وشیاری خۆت بەیەکێك زۆر بەخراپە باست دەکات بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیشی بەدەستەوە بێت، نازانم بۆچی لەتۆ ئەوەندە بەرقو قینە!).

لە دوای وریاکردنەوەی کاك عەباس‌و ئەو بارزانیە دڵسۆزەی کە پێشی عەباس ئاغ ئاگاداری کردبومەوە زۆری نەخایاند بەکردەوە ئاگادارکردنەوەکان هاتنە دی‌و تەقە لێکرا، واهەڵ کەوت کە پێویست بوو منداڵەکانم ببەم بۆ ڕواندز بۆلای دکتۆر بۆ ئەو مەبەستە سەرلەبەیانی لەدەرگەڵە دەرکەوتین دوو چەکدارم لەگەڵ بوون ڕۆیشتمە حافیز لەوێ چاوەڕوانی ئۆتۆمبێلمان کرد ڕێك نەکەوت هەموومان بەیەکەوە بڕۆین. وا ڕێککەوت من‌و دایکی منداڵان بەئۆتۆمبێلێك بڕۆین‌و چەکدارەکانی لەگەڵیشم بوون لەوێ مانەوە، ئەو ئۆتۆمبێلەی ئێمەی لەگەڵ ڕۆیشتین (محمد) ڕواندزی‌و پۆلیسێك لەگەڵ ژن‌و منداڵی لە ناو دابوون، شوفێریش (عبدالله گەمشۆ)بوو. کاتێك لە بەرسیرین بەدەرکەوتین سوڕاینەوە بۆ دواوی (زەروان) بینیم یەکێك لە سەر بەردێك دانیشتوەو کەئێمەی بینی یەکسەر هەستایە سەر پێ، پێش ئەوەی بگەینە دواوی (پیروسوان) هەر ئەوەندەمان زانی لە دوولاوە ئۆتۆمبێل درایە بەر گوللە. لەگەڵ دەنگی تەقە ئۆتۆمبێل وەستا وامزانی ئۆتۆمبێل پەکی کەوت، ئەگەرچی تەقەیەکی زۆر کرا، بەڵام هیچ بەر ئۆتۆمبێل نەکەوتبوو هەمووی بەدەوروبەری کەوتبوون تەنیا ساچمەیەك بەدەستی (محمد گەردی) کەوتبوو، کاتێك ئۆتۆمبێل وەستا تەقەش وەستا، ژن‌و منداڵی پۆلیس کردیان بەشین‌و هاتوو هاوارێك بەشوفێرم گوت (چیە ئۆتۆمبێل پەکی کەوت؟) عبدالله گوتی نەخێر. بڕۆم، پێم گوت (لەسەرچی وەستاوی بڕۆ مەترسێ)، عبدالله وەك گوللە بۆی دەرچوو ئەوان دەستیان کردەوە بەتەقە، کەسیشیان دیار نەبوو، بەڵام ئەو شوێنەی تەقەی لێ دەکرا دیار بوو لەپێشەوەو دواوە تەقە دەکرا، هەڵنەستان نەوەك بناسرێن گرنگ ئەوە بوو ئێمە دەرچووین، ئەوەی ئێمەی دڵتەنگ کردبوو ژن‌و منداڵی پۆلیسەکە بوو تا گەیشتینە (جوندیان) ئەوان هەر دەگریان، لە مەخفەری خەلکان پۆلیسەکان ئاگادار کران کە ڕوداوێکی وا ڕویداوە پۆلیسەکان داوایان کرد بڕۆینە ڕواندز، ئەوان وەکو سەرەتا شتێکیان نوسی کە تەقەکە چۆن کراوە، بەڵام دیار بوو زۆر بەساردی ئیفادەکەیان دەنوسی لەدوای لێ پرسین ئێمە ڕۆیشتینە نەخۆشخانە، دوایی زانیمان مەئمور مەرکەزی ڕواندز(حەمید) ناوێك بوو پیاوێکی تورکمانی داخ لە دڵ بوو ناوی دەرکردبوو بەپڕوپوچی‌و دوژمن بەشۆڕشی ١٤ی تەمموز، کاتێك ئێمە دەرکەوتبووین گوتبوی: (ئەوە شیوعیە خۆیان ئەو کارەیان دروست کردوە بۆ ئەوەی بتوانن بەو ناوە

چەك هەلگرن). دوا بەدوای ئەم ڕوداوە زۆر هەولم دا بزانم ئەو تەقەیە چی بوو، کێ بوون، زۆری پێ نەچوو لە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو پێیان ڕاگەیاندم کە(وەهاب ئاغا) خۆی هەلکێشا بوو گوتبوی: (ئەگەر خوا ئەجەلی کەسێك نەدات نامرێت ئەگینا دەبوو زرار پارچە پارچە بوبایە لەو بۆسە جەهەنەمیەی بۆی داندرابوو لەنزیك کۆسپێ سپی). وەلامی میری میران ئەوە بووە: (وەهاب ئەگەر ڕاست بێت باشە ئەوجارەی نا جارێکی دیکە نەچوە بچێت ئەوەی ماوە زیاترە).

پێش ئەوەی خوێندن دەست پێ بکاتەوە بڕیارێکی وەزارەتی مەعاریف دەرچوو بەگەڕانەوەم لە کشتوکالەوە بۆ تەربیە، یانی بۆ مامۆستایەتی لە ڕواندز داندرام لەکاتی دەوام مالێشم بردەوە ئەوێ، ئەوەی زۆر سەیر بوو کاتێك مالمان گواستەوە بۆ ڕواندز کەگەیشتینە نزیك لەخۆشخانەی حامیە، مندالەکان چاویان بەخانوەکانی دەوروبەری حامیە کەوت دەیان قیژاندو دەیان گوت: دایە دایە ئەوەن خانوەکانی خۆمان) وایان دەزانی گەڕاونەتەوە سۆڤیەت. ئەوەی غەمم بوو دیسان بەهەلە لەقوتابخانەی زۆزکی سەرەتایی داندرام، ناونیشانیشم مدرس بوو، ماوەیەك لەوێ دەوامم کرد، ئەو ماوەیەی لەوێ لەگەل مامۆستایان زۆر بەخۆشی ڕامان بوارد، لەپشوی نیوەی سال چوینە بەغدا بۆ کۆنگرەی مامۆستایان، ئەوەی بەلامەوە گرنگ بوو ئەو ماوەیەی لەوێ ماینەوە لەگەل مامۆستا (تەحسین ئامێدی) لە بەغدا زۆر گەڕاین چاومان کەوت بەزۆر شوێنەواری کۆنی مێژوویی، مامۆستای ناوبراو لەبەغدا شارەزا بوو پێنج سال لەزانکۆ بووە، لەوێ بەیاریدەی مامۆستا هەر شوێنێکی بمان ویستبایە دەچوین بۆ دیدەنی.

لەسەربازگەی ڕواندز بەبۆنەی جەژنی سوپا سالی (١٩٦٠) ئاهەنگێك سازکراو خەلکێکی زۆر بەشداری ئاهەنگیان کرد، ئێمەش بەشێکی زۆری مامۆستایان بەشداریمان کردو کۆمەلێك وێنەمان گرت، بێگومان خواردنی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد بۆ ئێوارە دەبوایە هەندێك مامۆستا لەمالی ئێمە ئامادە بن بۆ کۆبونەوە، لەوانە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی زۆزك (ئەنوەر محمد نەوڕۆز)و بەڕێوەبەری دواناوەندی ڕواندز (ئەنوەر سلێمان)و (فتاح تۆفیق ئاغا)و منو چەند مامۆستایەکی تریش، سەیر ئەوەبوو ئەوەی دەگەیشتە مالی ئێمە دەڕشایەوە بەخواردنی سوپا تێك چووبوون تەسەمومیان کردبوو، بەلام خێزانم توانی یارمەتیان بدات

بە (فۆرمەنگەنات) گەدەیان پاك بکاتەوە، سەیری ماڵی ئێمەت بکردایە وات دەزانی نەخۆشخانەیە هەریەکەی لەلایەك کەوتبون ئەوەی تێك نەچووبوو تەنها من بووم.

هەستی مەترسی، دوا بەدوای ئاهەنگی سوپا زۆری پێ نەچوو هەستم کرد دەهاتنە پشت دەرگاکان ئەمەش نیشانەی نا پاکی پێوە دیار بوو، وە بۆنی ناپاکی لێدەکرا، ناوە ناوە لەدەرگا دەدرا کە دەچوون دەرگا بکەنەوە کەس لەوێ نەدەما، باوەڕم هات کە شتێك هەیە، ئەوجا ناردم لەدەرگەڵە چەند چەکدارێك بەنهێنی هاتنەلام بۆ ماوەیەك پاسەوانیان دەگرت، بەو نیازە بووین بەڵکو بتوانین یەکێك بگرین ئەگەر بەبرینداریش بێت هەر باشە، بەڵام دیار بوو هەستیان کردبوو بەدوایانەوەین بەداخەوە نەکەوتنە ئەو داوەی بۆیان داندرا بوو. بۆ ئەو مەرامە ماوەیەکی تەواو (عەزیزی ئامۆزامو سەلاحی برام) بەنهێنی لامان بوون، ئەوەی ڕاستیە لەگەڵ ئاگاداری (عەباس ئاغا)و ئەو بارزانیە زۆر لە خۆم وشیار بووم دەتوانم ئەوەش بڵێم ئەوانەی دەستیان بەسینگەوە نا بوو بۆ ئەوەی دەست لەمن بوەشێنن ئەو پیاوە نەبوون لێیان بترسێم، لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە ئاگام لەخۆم بێت، تا ئەو ڕۆژەی ڕاستی بەدەر دەکەوێتو ئەوکاتە پەرێزی پیاوان بەدەر دەکەوێت بەکردەوە نەك بەگۆتە، شکی تێدا نیە مرۆڤی ڕاست سەر بەرزە هەر بەسەربەرزیش دەمێنێتەوە لەبەرامبەر گەلو نیشتمان.

### شادیەکی دایكو باوك:

ئەو شادیە ئەوەیە لە ئایاری (١٩٦٠) لە دوای سێ کچ کوڕێکمان پەیدا بوو لەبەر ئەوەی پێی شاد بووین ناومان لێنا (شادومان) لە دوای پەیدابونی ئەو کوڕە بۆ پشودانی هاوین ڕۆیشتینەوە دەرگەڵە لەوێش لەسەر داوای (عزەت)ی برام ڕۆیشتینە چۆمان ئەوکاتە کەمپی ئیشغال لەچۆمان بوو (عزەت)ی برام سەرپەرشتی کەمپی دەکرد، ئەوکات چۆمان تەنها چایخانەیەکی هەبوو لەسەر پرد پێیان دەگوت (چایخانەی شێخ ئەحمەدی)، لەتەنیشت کەمپ کەپرێك بۆ ئێمە کرابوو ئێوارەیەك کرێکارەکان دەگەڕانەوە،(عزەت) خۆی قەلابەی لێ دەخوڕی گەیشتە پرد لە سوڕانەوە لەسیلەی پردێدا چەند کرێکارێك پەڕینو کەوتنە خوارەوە ئەزیەتیان پێ گەیشت بەتایبەتی (حەسەنی حاجیو بەگۆ) چەند ڕۆژ بوو دایکی شادومان دەرمانی دەکردن

نەناو کەمپ، ئەو ماوەیەی لەوێ ماینەوە چەند ئێوارەیەك ڕۆیشتینە دەربەندو زینویێو خەلانو حاجی ئۆمەران، بەڕاستی ماوەیەکی خۆشمان بەسەر برد پاش ماوەیەك گەڕاینەوە دەرگەڵە، لەوێش زۆربەی زۆری ڕۆژان دەڕۆیشتمە سابات، لای(میر حمدامین بەگ)، ناوبراو مرۆڤێکی بەتەمەن بوو ماوەیەکی زۆر بوو میری دەرگەڵەو دەوروبەری بوو، وا هەلکەوت ڕۆژێك لەبارەی خوێندن لەگەڵی کەوتمە قسەو گوتم: (باپیر دەزانی جەنابت غەدرێکی زۆرت لە ئێمەکردووە بەتایبەتی خەلکی دەرگەڵە، وەك ئەلێن لە زوەوە بڕیار بوو قوتابخانە بێتە دەرگەڵە، بەلام ئێوە ڕێگاتان نەداوە بێت!) میر گوتی: (ڕاستە لەگەلّ ڕواندز قوتابخانەش بۆ دەرگەڵە دەرچوو داوای خانویان لێکردم بۆ قوتابخانە لە نەزانی خۆم چووم پرسم بەمامۆتکی خۆم کرد (حمد علی ئاغا) بۆ دانانی قوتابخانە لە دەرگەڵە ناوبراو گوتی، میرم نەکەی ڕێگا بدەی قوتابخانە بێتە دەرگەڵە هەرئەوەمان مابوو نازوگۆزی ئەفەندیەکانیشمان بێتە سەرو پێمان بلێن ئەو نانە بەو دۆیە، ئەوە بوو ئامۆژگاریەکانی (مام مۆتك)، بەقسەی ئەو فریوم خواردو بەسواری ولاخ ڕێگای هەولێرم کوتاوەو ڕۆیشتمە لای (ئەحمەدە فەندی متەسەریف) داوام لێ کرد بڕیاری دانانی قوتابخانەی دەرگەڵە هەلبوەشێنێتەوە، ناوبراو زیاتر لەسەری ڕۆیشتو گوتی، لە دواییدا پەشیمان بومەوە، بەلام پاش لەدەست چرنی ئەو هەلە زێرینە، بزانە داخوا ئاغایەکانی دزەییو شەقلاوە زانا تر بوون زوو هەولّیان داو داوای قوتابخانەیان کردو منداڵەکانیان ناردنە بەر خوێندن ئەوا ئەمڕۆ منداڵەکانیان پێ گەیشتوون بەخوای غەدرێکی زۆرمان لە ئێوە کردوە، بەلام لەدەستم چوو. ویستم هەندێ شتی تریش بپرسم بەشێوەیەکی تایبەت شتی مێژوویی لەسەر بنەماڵەمان ئەویش لەوکاتەدا هەندێ میوان پەیدا بوون ماوە نەما.

# جیۆلۆجیەکانی سۆڤیەت لە ڕایات ساڵی ١٩٦٠

کۆمەڵێك لە جیۆلۆجیەکانی سۆڤیەت هاتنە (ڕایات) لەوێ کۆمەڵگایەکی زانایەکان ئەوانەی بەدوای بەردە بەنرخەکاندا دەگەڕان جێنیش بوون، بەڕێکەوت ڕۆژێك ڕۆیشتمە لایان ئەوەی هەستم کرد نەیان دەویست لەسیاسەت بدوێن بەڵگەش ئەوەیە لەوکاتەی لەلایان بووم مامۆستایانی زینوە هاتنە لایان یەکێك لەوان دیار بوو نەتەوە پەروەر بوو کۆمەڵێك پرسیاری ئاراستە کردن لە بارەی کورد، ئەندازیاری سەرپەرشتکاری کۆمەڵگایەکە لە وەڵامدا گوتی: (ئێمە بۆیە نەهاتوین بکەوینە ناو کێشەی سیاسی، کۆششی ئێمە گەڕانە بەدوای دۆزینەوەی بەردی بەنرخ، تەنیا دەربارەی کۆماری کورد لە مەهاباد کە دەڵێی سۆڤیەت فرۆشتنی بەئێران وەڵامێکی کورتت دەدەمەوە، ئەوەندەت پێ دەڵێم کۆماری کورد بەیارمەتی سۆڤیەت دامەزرا هەموو پێداویستیەکانیشی پێدان خۆتان نەتان توانی بیپارێزن، چونکە کۆماری کورد دامەزرا بوو تەنیا پاراستنی پێویست بوو بۆ نەتان پاراست؟ پێتان نەپاراسترا لەبەر ناتەبایی خۆتانو سەرکردەکانتان ئەوەیە شکستی ئێوە!) ئەندازیارەکە بەردەوام بوو لە قسەکانیو گوتی: (پێی بڵێ یەکگرتن تاکە ڕێگای سەرکەوتنە ئێوە یەکگرنین لەبەر ئەوە ڕێگاتان زۆر سەختەو ماندوبونێکی زۆری دەوێ بۆ پەروەردەکردنی کۆمەڵگای کوردی لەسەر تیرازێکی دوور لە ملکەچی هۆزایەتی). مامۆستایەکان بەنابەدڵی هەستانو ڕۆیشتن لەوکاتەشدا ئەفسەری تەجنیدی ڕواندز (محمد سامرائی) هاتە لایان ئەویش دەستی کرد بەپرسیار کردن دەربارەی بیروباوەڕی شیوعیەت. یەکێك لە ئافرەتەکانی ئەندازیار (ئەننا) ناوێك وەڵامی دایەوەو گوتی: (ئێمە لێرە کۆمەنیست نین جیۆلۆجین تۆ ئەو پرسیارانە لە حزبی خۆت بکە مادام دەڵێیت من شیوعیم، ئەوان لەئێمە باشتر دەزاننو وەڵامت دەدەنەوە). ئەفسەرەکە بەتووڕەیی هەستاو ڕۆیشت، خۆشی دیار بوو پیاوێکی دەمارگیرو توند بوو ئەوەندەش زانا نەبوو، لە دوای ڕۆیشتنی (ئەننا) پێمی گوت: (ئەوانە جێگای باوەڕ نین، بەڵکو دەناردرێن بۆ ئەوەی بزانن ئێمە چی دەڵێین!).

### هەڵوێستی نەگۆڕاو:

ئەوەی دەمەوێت دیاری بخەمو باسی بکەم ئەوەیە لەدوای گەڕانەوەی ئێمە نەسۆڤیەت هەڵوێستی هەندێك لەخزمەکانمان دەربارەی ئێمە چەوتوو نارێك بوو، بەبیانوی ئەوەی گوایا ئێمە لە دەرەوەی وڵات بەربەرەکانی مەلامستەفامان کردوە، لێرەدا دەبێ ئەو ڕاستیە بزاندرێت ئێمە هیچ کاتێك ڕێگای ڕووبەرەکیمان نەگرتوەو ڕەچاومان نەکردوە بەڵکو زۆر دڵتەنگو نیگەران بووین بەو دروبەرەکیەی نێوان مامو برازا، ئێمە بەکردەوە لەگەڵ ڕاستی بووین، لەبەر ئەوەی بەباوەڕەوە دەمانزانی ڕاستی تاکە ڕێگای سەرکەوتنە، بەڵام زۆر تاڵە بەهەموو کەس ناخورێت، تەنیا سەبرو لەسەرخۆیی ڕاستی بەدیار دەخات، ئەوەش بەکردەوە بەدیارکەوت زۆری بەسەر نەچوو ئەوکەسانەی لۆمەی ئێمەیان دەکردو زۆر توڕەو زویر بوون هەر ئەوان بوونە هێرش بەری نارەزامەندیو هەڵوێستی چەوتی نەگونجاو. زۆر بەسەربەرزیەوە دەتونم بڵێم هیچ کاتێك هەڵوێستی چەوتو بێڕێزم نەبوە بەرامبەر بارزانیەکانو مەلامستەفا، تەنیا ئەوە نەبێت لە بیرو ڕا جیاواز بووم، ئەوەش مافێکی ڕەوای خۆمە، هەموو کاتێکیش لەدژی زوڵمو زۆرداریدا ڕاوەستاوم لەبەر ئەوەی ئەزیەتم لەدەستی زوڵم چێشتوە لەژیانمدا. بەکردەوە لەسەر ڕۆشنایی ئەو بیرو باوەڕەی پەسندنم کردبوو دەڕۆیشتم بەردەوام لایەنگری یەکگرتنی کۆمەڵ بووم لەبەر ئەوەی باوەڕم بەهاوپەیمانی هەبوو، لەبەر ئەوەی کە کورد پێویستی بەهاوپەیمانی هێزە پێشکەوتنخوازەکان هەیە بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی، ئەوەی لێی داگیرکراوە، دوور کەوتنەوەی نیشتمان پەروەران لە یەکتر دوور کەوتنەوەیە لە مەرامو خواستی کوردی ستەمدیدەو کوردستانی دابەش کراو بۆیە باوەڕم وایە ئەوەندەی هێزە پێشکەوتنخوازەکان لە کوردستان هاوپەیمان بن ئەوەندە زووتر دەگەینە ئامانجەکانمان لە کوردستانو باوەڕ بدسەرکەوتن بەهێزتر دەبێت ئەوە مەرامی من بووە کە زۆر لە مێژە بەو هیوایە بووم . بەڵگەش بەوە دەردەکەوێ ئەوەی هەڵبەستەکانی من بخوێنێتەوە کەلە پەنجاکان نوسراون ئەوکاتە بۆی بەدیار دەکەوێت لەچ کاتێکا یەکگرتن ئاواتو ئامانجی من بووە، من وای بۆ چوومە کە یەکگرتن تاکە خۆراکی سەرکەوتنە، یەکگرتن پەرژینی پاراستنە، یەکگرتن چەکی دژواری دوژمن بەزێنە، لەبەرئەوە تا سەرکەوتن دروشمی هەمیشەیمە. ئەو خواستەی من بەکردەوەش لە سەردەمی (عبدالكريم) سەلماندی کە

بەدیارکەوت لە دوای کۆتایی هاتنی یاخی بونەکەی (لۆلان) دەسەلاتداریەکەی (عبدالکریم) ڕووی لە کۆمەلانی خەلك وەرگێراو بوو بەگوێڕایەلی دەستەیەکی دژ بەخۆی و شۆرشگێرانی ١٤ی تەمووزی پێشکەوتنخواز، دوور کەوتنەوەو ڕوو وەرگێڕانی دەسەلاتداریەکەی عبدالکریم ڕێگای خۆش کرد بۆ گەڕانەوەی مرۆڤە ناپاك و داخ لەدلەکانی لە دەستی کۆمەلانی خەلك و شۆڕشگێرەکان هەلاتبوون بگەڕێنەوە لانە گلاوەکانیان بۆ ئاژاوە نانەوەو پیلان بەشێوەیەکی تایبەت لە کوردستان بۆ ئەوەی مادەی سێ لە دەستوری عێراق نەچەسپێ کە دەلێت (کوردو عەرەب لەم نیشتمانەدا هاوبەشن).

### هەلوێستی عباس ئاغا:

زۆری پێ نەچوو لە دوای یاخی بونەکەی (لۆلان)، من هەر لە کەرکوك بووم ڕۆژێك لای (مستەفا عبداللە) دانیشتبوم گوتیان (عباسی مامەندئاغا)ش بەنیازە یاخی ببێت مازەیەکە نایەتە ناو حکومەت ئەو نەهاتنەی ناوبراو بۆنی یاخی بوونی لێ دەهات و دوور نییە ببێتە کارێکی زیان بەخش، لەوکاتەشدا (حسن حاجی تاهیر ڕواندزی) پەیدا بوو، ئێمە ئەوکات قسەمان لەسەر لالوتی عەباس ئاغا بوو چۆن بتوانین پەیوەندی پێوە ببەستین و لەگەلی بدوێین بۆ ئەوەی بەوە نەگات کە یاخی ببێت. بۆ ئەم مەبەستە (حسن حاجی تاهیر) بەدەنگ هات و گوتی: (من ڕێگای ئەو کارەتان نیشان دەدەم، ئەویش ئەوەیە بنێرنە دوای سلێمان بەگ ئەو دەتوانێت بڕواتە لای عەباس ئاغاو پەیوەندی پێوە بکات عباس ئاغا لە قسەی سلێمان بەگ دەرناچێ، ئەوە تاکە ڕێگای چارەسەریە ئەگەر بتانەوێت .(ڕەئیس مستەفا عبداللە) ئەوکاتە ئەفسەری بەرپرسی سیاسی بوو لە لەشکری دووی کەرکوك، دیار بوو بەو ئامۆژگاریانەی (حسن) ڕازی بوو ئەوانی تریش پەسندیان کرد لە دوای ئەو گفتوگۆیە، حسن ڕۆیشتە لای بەرپرسی حزبی شیوعی هەرێم (نافع یونس) دیار بوو ئەوانیش ئامۆژگاریەکانی (حەسەن)یان پەسند کردبوو، بۆ ئەم مەبەستە لەگەل حسن گەڕاینەوە ڕواندز، من ڕۆیشتمە دەرگەلە بەدوای سلێمان بەگدا لەوێ هاتینەوە ڕواندز، لەو کاتەی ناوبراو هاتە ڕواندز لەو بارەیەوە لەگەلی دوان، سلێمان بەگ گوتی: (هیچ غەمتان نەبێت لەو نزیکانە شێخ ئەحمەدی بارزانی بەنیازە سەر بدات

ـە ناوچەکانی رانیەو قەڵادزەو کۆیە، لەوێش دەرواتە هەڵەبجە، وەك بیستراوە لەوێ هێستریك زاوە دەیەوێت بیبینێ ئەوەش هەڵێکی زۆر باشە، لەوێش عەباس ئاغا رازی دەکەین لەگەڵ خۆمانی دەبەینە بەغدا). ئەو رێ نماییانەی سلێمان بەگ دەربارەی ئەو گەشتەی شێخ ئەحمەد برا گەورەی مەلامستەفایان زۆر بەلاوە گرنگ بوو بەپێویستیان زانی خۆیانی بۆ ئامادە بکەنو پێشوازیەکی جەماوەری گەورەی لێ بکرێت لەو شوێنانەی شێخ سەردانیان دەکات، بێگومان ئەوکاتە حزبی شیوعی لە مەلامستەفا رازی بوو، دەنگێکی وا بلاو ببوەوە لەوکاتەی یاخی بونەکەی(لۆلان) کۆتایی هات مەلامستەفا لە بەغدا زۆر شتی لەسەر ئەفسەرەکانی حزبی شیوعی گوتبێت، بەتایبەتی لە سەر (داود جەنابی) قائدی لەشکری دووی کەرکوك!! ئەو پێشوازیەی حزبی شیوعی خۆی بۆ ئامادە دەکرد کە لە(شێخ)، بکرێت زیاتر بۆ دڵ تەنگی مەلامستەفا بوو بۆ ئەوەی بزانێ ئەو حزبەخاوەنی ئەو جەماوەرەیە. ئەو ڕوونکردنەوەی سلێمان بەگ بەسەرکەوتویی پەسند کرا، سلێمان بەگ ڕۆیشتە بارزانو حزبی شیوعی ئامادەیی خۆی نیشاندا، ئەو ڕۆژەی شێخ ئەحمەد لە بارزان دەرکەوتو گەیشتە خلیفان جەماوەر لەپێشوازی وەستانو پێشوازیەکی گەرمی لێ کرا تا گەیشتە هەولێر سەدان ئۆتۆمبێلی لەگەڵ ڕۆیشتن، ئۆتۆمبێلی سەرکردایەتیو ئەندامانی هەرێمی حزبی شیوعی لە خەلیفان پێشوازیان لێ کردو لەگەڵی ڕۆیشتن تا گەیاندیانە بارەگای حزب لە هەولێر، شێخو ئەو کەسانەی لەگەڵی بوون لە بنکەی (اتحادالشعب) دابەزین، ئەوەی شایانی باسە جەماوەرێکی زۆر هاتنە بەخێر هاتنی شێخ ئەحمەد، ڕێچکەی ئەو خەڵکە نەپچڕا تا نانی نیوەڕۆ داندرا. دوای نیوەڕۆ بەرەو شاری (حاجی قادر) کەوتینە ڕێ، کۆمەڵێك ئۆتۆمبێلی لەگەڵ ڕۆیشتن لە کۆیەش پێشوازیەکی زۆر گەرمیان لێکراو زۆر لە پیاو ماقولانو ناسراوەکانی کۆیە ڕۆیشتنە ئەو شوێنەی شێخی لێ دابەزی بوو، وەك دیار بوو ڕێکخراوی ئافرەتانی کۆیە بەمیوانداری شێخو ئەو میوانانەی لەگەڵی بوون هەستا بوو، بەڕێزێکی زۆرەوە بەخێرهاتنی شێخو ئەوانەی لەگەڵی بوون کرد.

ئافرەتان سەرپەرشتی جەماوەرێکی زۆریان کرد لە یەکێ لە باخچەکانی کۆیە ئامادەکرابوو، لە وتەکانی خوێندرانەوە بەدیارکەوت هەستی خۆشحاڵی جەماوەری کۆیە بەگەیشتنی شێخو میوانەکان چەند زۆرە ئەو پێشوازیە گەرمە لە کۆیێ

دەنگی دایەوە، لە جیاتی شێخ ئەحمەد سلێمان بەگ زۆر بەگەرمی سوپاسی کۆمەڵانی خەڵکی کۆیەی کرد بۆ ئەو پێشوازیە گەرمەی لێیان کراوە، هەروەها لە جیاتی شێخ‌ومیوانەکان هەستی خۆشحاڵی دەربڕی بەتایبەتی بەرامبەر ئەو ووتە بەسۆزانەی مامۆستایان‌و ئافرەتان‌و قوتابیان کە خوێندرانەوە، هەروەها سلێمان بەگ وەڵامی ئەوپرسیارانەی دایەوە کە لەلایەن خەڵکەوە ئاراستەی کرابوون، ئەو شەوە لە کۆیە ماینەوە بەیانی ڕۆیشتینە (ڕانیە)، دیارە لەڕێگا سلێمان بەگ بەشێخ ئەحمەدی گوتبوو دەربارەی عباس ئاغا کە بەینی لەگەڵ حکومەت ناخۆشەو بەنیازە هەڵبگەڕێتەوە بەڵکو ئێوە ڕازی بکەن بێتە بەغدا لای (عبدالكريم) یا نەبێتە ئاژاوە. شێخ ئەحمەد بەسلێمان بەگی گوتبوو: (شۆلەکا قەوی باشە دێ دگەل خۆ دبەین بۆ بەغدا). گەیشتینە ڕانیە، شەو ڕۆیشتینە (بۆسکێن) میوانی (شێخ حسێن) بووین لەوێ ناردیانە دوای (عەباس ئاغا)و هاتە (بۆسکێن) وا دیار بوو ڕازی کرابوو لەگەڵ شێخ بڕواتە بەغدا، لەوێ بەڕێ کەوتین بۆ هەڵەبجە بۆ دیتنی ئەو (هێستر)ەی زابوو، لە دوای دیتنی هێسترەکە خاوەنی هێستر زۆر هەوڵیدا شێخ ڕازی بێت هێسترەکەی بۆ ببەنە بارزان، بەلاّم شێخ ڕازی نەبوو بۆ ئێوارە گەڕاینەوە کەرکوك میوانی لەشکری دوو بووین لە یانەی ئەفسەران دابەزین، ئەوەی ڕاستی بێت میواندریەکی زیاد لە پێویستیان کردین، ڕێزگرتن‌و خزمەت گوزاریش هەر باس ناکرێت، لە وێش خەڵکێکی زۆر هاتنە بەخێرهاتنی شێخ ئەحمەد، کۆمەڵێك پەیامنێری ڕۆژنامەو گۆڤارەکان چاویان بەشێخ کەوت‌و لەگەڵی دووان لە زۆر ڕووەوە پرسیاریان لێ کرد.

لەو گەشتە دورو درێژە ئەفسەری بەرپرسی لیوای دەشتەدیان (ملازم سمکۆ) لەگەڵمان بوو ناوبراو خەڵکی شاری (حاجی قادر) بوو تا بڵێی مرۆڤێکی چالاك‌و زیرەك بوو، تاکو لە بەغداش گەڕاینەوە هەر لەگەڵمان بوو. لە کەرکوك بەرەو بەغدا ڕۆیشتین کۆمەڵێك ئۆتۆمبێل بوون سلێمان بەگ لەگەڵ شێخدا بوو، کە گەیشتینە بەغدا ڕۆژی سێ یەم شێخ ئەحمەدو سلێمان بەگ ڕۆیشتنە دیدەنی عبدالكريم قاسم، عباس ئاغاشیان لەگەڵ چوو، هەر لەهەمان ڕۆژ چاویان بەمەلامستەفا کەوتبوو، دیارە ناوبراو نارەزامەندی نیشاندا بوو دەربارەی جوتیارە چەك هەڵگرەکانی دەشتی هەولێر، ئەوانەی بەرێ کرابوونە سەریاخی بوەکانی (لۆلاّن)، هەروەها لۆمەی قائدی

ئەشکری دووی کەرکوکی کردبوو بەناڕێکیو وشەی ناشیرین، ئینجا لەسەر (فاخیر)یش دوا بوو. کاتێك لەبەغدا گەڕاینەوە دیسان لە کەرکوك ماینەوە وەك جاری پێشوو میوانی قائدی لەشکر بووین (داود جەنابی)دواتر بەرێزێکی زۆرەوە شێخ ئەحمەدی بەڕێ کردەوە بارزانو عباس ئاغاش بۆ پشدەر، ئەوەی هەست کرا عباس ئاغا پێش بگەڕێتەوە ئالۆز بوو بەوەی حزبی شیوعی بانگیان نەکردوە، چومە لای (نافع یونس) لەم بارەیەوە لەگەڵی دوامو داوام لێکرد بیبینێت، دیار بوو بانگیان کردبوو.

ئەوەی هەست دەکرا لە سەرەتای (١٩٦١) دەنگی جموجۆڵێك دەکەوتە بەر گوێ لە زۆر شوێن گوایە لە زۆر شوێن ئاغایەکان سەریان هەڵداوەتەوە کەوتونەتە ڕاونانی جوتیارەکان لەگەڵ ئەمانەش پڕوپاگەندەی دژ بەجوتیارانو ڕێکخراوەکان دەکرا بەپشتیوانی کارمەندانی دەوڵەت بەشێوەیەکی تایبەتی ئەوانەی لە سەرەتاوە بەدەسەڵاتی شۆرشی ١٤ی تموز ڕازی نەبوونو بڕیاری حکومەتیان پاش گوێ دەخستو ئاگری فتنەو ناکۆکیان لە نێوان کۆمەڵ خۆش دەکرد تا زەمینەیان خۆش کرد بۆ ئاغا ڕاکردوەکان ئەوانەی لە دەستی جوتیارەکان ڕایان کردبوو بگەڕێنەوە شوێنەکانیان بۆ ئالۆزیو ئاژاوە نانەوەو شلۆق کردنی ڕیزەکانی کۆمەڵ. هەر لەوکاتەوە دەست کرا بەچەك کڕین، بەئاشکرا هەست دەکرا بەگواستنەوەی چەك لە ناوچەی بیتوێن بۆ هەندێ شوێن بەزۆری بارزان، نوێنەری ئاغایەکان بێ وەستان لە هاتوچۆدا بوون بۆ لای سەرکردەکانی پارتیو بارزانی، لەو ڕووەوە مەلامستەفا خۆی دانی ناوە بەو ڕاستیە گوتی: (ئاغاکان ئەوەندە هاتوچۆیان کردو هاتنە لام لە خۆم دەترسام حکومەت شتێکم لەگەڵ بکات لەبەر ئەوە گەڕامەوە بارزان).

لە ناوەڕاستی مانگی (٥/١٩٦١) لە کاتێکدا عباس ئاغا دەڕۆیشتە (حاجی ئۆمەران)، لە دەرگەڵە چاوم پێی کەوت گفتوگۆیەکی دۆستانەمان کرد، دیار بوو ئەویش کاربەدەست بوو لەگەڵ ئەوەش گەش بین نەبوو لە هەڵوێستی مەلامستەفا بەگلەیی بوو، بەڵام هەستو مستی فەرمان بەدەست خۆی بوو، پێش ئەوەی بڕوات گوتی: (زرار نازانم مەلامستەفا بۆ ئەوەندە لە جمال حەیدەریو هەمزە نارازیە قسەی بێ ڕێزیان پێ ئەڵێ ؟!). ناوبراو بەردەوام بوو لە قسەکانیو نیشانی دا کەوا لەم

زوانە شتێك ڕوو دەدات بەپێویستی دەزانم ئێوە ئاگاداری خۆتان بن پێم ناخۆشە چیت بەسەر بێت.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەو قسانەی (کاك عەباس)م بەلاوە زۆر سەیر بوو، ئەو شتە نوێیە کە ڕوو دەدات دەبێ چی بێت؟. بەڵێ ئەو ڕوداوەی عباس ئاغا پێش بینی کرد پەیتا پەیتا نیشانەکانی بەدیار دەکەوتن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئاڵۆزی زیاتر بەدیار دەکەوت‌و هەڵوێستی کارمەندانی دەوڵەت بەئاشکرا بەدیارکەوت دژی کەسایەتیە ناسراوەکان‌و سیاسیەکان‌و دووریان دەخستنەوە بۆ شوێنە دوورەکان‌و زۆریشان ڕاپێچی بەندیخانەکانی ژێر چاودێری ئەمن‌و ئیستخبارات کران. تا دەهات ناخۆشی‌و ئاژاوە نانەوە پەرەی دەسەندو ناکۆکیەکان دژوارتر دەبوون، پیاوە پیسەکانی دژ بەئازادی‌و ئاشتی خۆیان خزاندبوە ناو ڕیزی خەڵك بۆ دابین کردنی مەرامە گڵاوەکانیان، ئەویش تێکدانی ڕیزی ڕێکخراوەکان‌و لێك دابڕینی کۆمەڵە سیاسیەکان بوو بۆ ئەوەی بێ هێز بن‌و گۆڕەپان چۆل بکەن بۆ ناپاك‌و داخ لە دلان، بەڵکو بتوانن دەست درێژ بکەنە سەر ئەو خەڵکەی کە دەزانن لەگەڵیان ناگونجێن، تا بەوە گەیشت دەست درێژکرایە سەر ژیانی هەندێ لە کەسایەتیە چالاك‌و زیرەکەکانی ناو ڕیزی جوتیاران بەنیازی هەڵوەشانەوەی ڕێکخراوی جوتیاران‌و ئەو کۆمەڵانەی لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی(١٤ی تەموزی ١٩٥٨) ڕێکخرابوون، دەسەڵاتدارانی خاوەن زەوی دەسەڵاتدارانیان تەنگاوو ناچار کردبوو هەموو توانایەکیان بخەنە کار بۆ لێدان‌و هەڵوەشاندنەوەی یاساکانی چاك کردنی کشتوکاڵ‌و کۆمەڵەو ڕێکخراوی جوتیاران، ئەوە بوو ئاغاکان‌و دەسەڵاتدارەکان زۆر بەگەرمی کەوتنە جوڵانەوەو یەکیان گرتەوە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی دەستکەوتەکانی جوتیاران، بەوەیان توانی لە ژێر دروشمێکی ئاوات خوازو مەرامی نەتەوەیان بەرز کردەوە لە ژێر سێبەری ئەو دروشمە ئاوات خوازەی تێکڕای نەتەوەی کورد هیچ کوردێکی نیشتمان پەروەری ڕێگای کوردایەتی نەیانتوانی بەرهەڵستی بکات کەچی زۆربەی نەیارانی پێشکەوتنی نیشتمان لە ژێر ئەو دروشمە بەرزەدا خۆیان شاردبۆوە، ببونە سوار چاکی گۆڕەپان‌و خۆیان لە ژێری مۆڵ دابوو تا بۆیان هەڵ دەکەوێت بەئارەزوی خۆیان دەست بوەشێنن، بەڵام کۆمەڵە سیاسیەکان وا دەکشێنە ناو جوڵانەوەی گومان لێکراو، ئەوە بوو پارتی دەستی بەسەرکردایەتی دا گرت‌و جوڵانەوەکەیان لە گومان ڕزگارکرد، کەسانی ناپاك

ئەوانەی لە ژێر سێبەری کوردایەتی خۆیان پەنا دابوو چەکی ناپاکیان هەڵگرتو ڕووبەڕووی جوڵانەوەی کوردایەتی وەستان، ئەوانەی جوڵانەوەی کوردیان بەهی خۆیان دەزانیو لافیان پێ لێ دەدا بەسەر شۆڕی ڕۆیشتنەوە هێلانەی بەدکاریو بەفەرمانی دەوڵەت بوونە کوردکوژ بەرگی جاشایەتیان کردە بەریان، هەر هەندێك بەبیانوێك چەکیان هەڵگرتو ڕۆیشتنە ژێر ڕکێفی ئاغاکانیانو دەست بەکاربوون بۆ کوشتنی براکانیان، ئاغاکانیان بەبەردەوامی هانیان دەدان بۆ شەڕی کوردکوژی.

## بەشی هەشتەم

# سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول ساڵی ١٩٦١

لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٦١) جموجۆڵی ئاغایەکان ئەوانەی خاوەن بەرژەوەندی زەوی‌و زار بوون لە کوردستان یەکیان گرتەوە جموجۆڵەکەیان پەرەی سەند، ئەوە بوو لە زۆر شوێن جوتیارەکان کەوتنە ژێر زەبرو مەترسی دەست درێژی نۆکەرانی خاوەن زەوی‌و زارەکان. ئەوەی دیار بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول زۆری نەخایاند بڕیارێك دەرچوو بەبەدوور خستنەوەی ئەو بارزانیانەی لە سۆڤیەت گەڕابونەوەو لە سەرکار دامەزرا بوون لە دام‌و دەزگاکانی حکومەت، منیش بەر ئەو بڕیارە کەوتم‌و لەکار دوور خرامەوە، ناچار کەوتمە بیرکردنەوە بۆ دۆزینەوەی کارێك کە بتوانم ژیانی خۆم‌و ماڵ‌و منداڵمی پێ دابین بکەم، ماوەیەك بەبێ کاری تەواو پەرێشان بووم‌و بیرم لە کۆمەڵێك کارکردەوە، لە سەرەتاوە دایکی منداڵان کەوتە دەست‌وبردو جولانەوە بەدروومان کردن‌و دەرزی لێدان بۆ ئەوەی بەڵکو پارسەنگی تەرازوو بەتەواوی دانەکەوێت، لەگەڵ ئەوەش ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو لاسەنگی دەڕۆیشت، ناچار کەوتمە بیرکردنەوەی دانانی ستۆدیۆیەکی وێنەگرتن، بۆ ئەو مەبەستە دەست بەکاربووم، ئەم کارەم تاکە ڕێگا بوو بۆ ئەوەی خۆمی پێ بگرمەوە، بێگومان دانانی ستۆدیۆ پارەی دەویست بۆ کڕینی هەندێ کەلوپەلی پێویست، بۆ ئەم مەبەستە چوومە لای یەکێ لە دۆستەکانم کە (حاجی کریم قاسم) بوو، ناوبراو وەك دۆستێکی دڵسۆز یارمەتی دام ئەوەندەی پارەم پێویست بوو لێم وەرگرت، ئەوجا بۆ کڕینی کەلوپەلەکانی ستۆدیۆ چوومە بەغداو ئەوەی پێویستم پێ بووکڕیم، لە دوای گەڕانەوەم یەکسەر دەست بەکار بووم، ماوەیەك کارم کرد هەرچەندە کارەکەش لاواز بوو، بەلام پێیەوە دیار بوو بەرەو هەنگاوی باش دەڕوا، لە دواییدا وای لێ هات لە ماوەیەکی کورت پارەیەکی باشم هاتە دەست‌و پارەی (حاجی کریم)م دایەوەو پێویستیەکانی خۆشم

تەواو رێك خست، بەلاّم هەستم دەکرد خزمەکانم زۆریان پێ ناخۆش بوو من وێنەگری بکەم، بەو بیانوەی ئەوەی گوایا وێنەگری لە بنەماڵەی ئێمە ناوەشێتەوە!

بەو شێوەیە دەست بەکاربووم‌و ئیشی ستۆدیۆ بەرەو باشی هەنگاوی گەورەی دەهاوێشت، رۆژێك مام (میرۆ) هاتە لام‌و گوتی: (ئازیز زرار زۆرمان بەلارە گرانە تۆ وێنەگری بکەی!) گوتم: (وێنەگری عەیب نیەو سوکایەتیش نیە، عەیب ئەوەیە چاوت لە دەستی خەڵك بێت، یا چاوت لەماڵی خەڵك بێت، خۆت باش دەزانی ژیان پێویستی بەکارکردن هەیە بۆ ئەوانەی دەتوانن کار بکەن)، زۆرهەوڵی دەدا ستۆدیۆکە دابخەم، بەلاّم کە زانی چار نیە زۆر بەنا بەدڵی هەستاو رۆیشت، تا دەهات وەزعی ئابوری من بەرەو باشی دەرۆیشت، کەچی ئالۆزی‌و نارێکی رۆژ بەرۆژ بەرەو خراپە دەرۆیشت‌و پەرەی دەسەند، ئەوکاتەش ناکۆکیەکانی نێوان پارتی‌و شیوعی لە رواندز لە سنور دەرچوو بوو، هەرچەندە ئەوکاتە شیوعیەکان بەهێزتر بوون، بەلاّم دارو دەستە کۆنەپەرستەکانی دەوڵەت بەربەرەکانی شیوعیەکانیان دەکردو دژیان دەست بەکار بوون بۆ شلۆقی‌و تێکدانی ریزەکانی کۆمەڵ. لە کاتێکا جموجۆڵی نارەزایی ئاغاکان گەیشتە رادەی چەك هەڵگرتن لە دژی حکومەت پارتیەکانی رواندز کەوتنە هەرەشەو گەف کردن‌و پروپاگەندەی دوور لە راستی دژی شیوعیەکان، ئەگەرچی هەوڵێکی زۆریش درا بۆ پێك هاتنێك بۆ نەمانی ناکۆکیەکان، بەلاّم لەبەر ئەوەی لێپرسراوانی ئەوکاتەی پارتی لە رواندز پیاوی دەوڵەت بوون نەك هی پارتی! لەبەرئەوە هەوڵدانەکە بێ ئەنجام بوو، باری ناوچەش رووی لە ئالۆزی‌و پەشێوی زیاتر بوو. جولاّنەوەی سەرهەڵدراو لە ژێر سێبەری ئاغاکان بوو دژ بەچاك کردنی یاسای کشتوکاڵی دەستیان دابووە چەك بەنیازی هەڵگیرسانی شەرێکی نارەوا بۆ بەرژەوەندی خۆیان، بەو شێوەیە لە چەند شوێنێك شەر هەڵگیرساو دەستی پێ کرد، دەنگ‌و باس گەیشت وبلاّوبوەوە کە مەلامستەفا لە بەغدا گەراوەتەوە بارزان بۆ ئەوەی سەرپەرشتی ئەو جولاّنەوەیە بکات.

وەك دیار بوو سلێمان بەگی باوکم کە لە سۆڤیەت لە مەلامستەفا دڵ رەنجاوو ببوو هێشتا ئەو ناکۆکیەیان لە نێواندا مابوو وەك لە سەرەوە نوسراوە، لە کێشەو ئالۆزیەکانی ئاغاکانیش بەدیارکەوت، لەوکاتەدا عباس ئاغا ببوە یەکێك لە باوەر پێکراوانی مەلامستەفا لە هەمان کاتیش عباس ئاغا نزیکترین دۆستی سلێمان

بەگ بوو وە زاوای (میرحمدامین)ی ئامۆزای سلێمان بەگ بوو، لەوکاتانەدا چەکدارەکانی عباس ئاغا لە سنوری گوندەکانی ژێر چاودێری ئێمە نزیک کەوتبونەوە کە بۆ ئێمە ئەوە کارێکی مەترسیدار بوو، بۆ ئەوەی لەگەڵ عباس ئاغا توشی ناتەبایی نەبین سلێمان بەگ رۆیشتە (زینی ئەستێرۆکان) بۆ گفتوگۆ لەسەر هەندێ کاری پێویست لەگەڵ کاك عباس ئاغا، هەر بۆ ئەوەی ناکۆکی نەکەوێتە نێوان خزمایەتیمان، لەوێ دانیشتبون زۆر بەووردی کەوتبونە لێکۆڵینەوەی شتە گرنگەکان ئەوانەی پەیوەندیان بەهەردوولاوە هەبوو، لەو دیدارە باوکم گوتبوی: (ئەگەر ئەو جولاْنەوەیەی ئێوە بۆ کوردایەتی بێت من خۆم لە ئێوە زیاتر بەکورد دەزانم، ئەوەشم بەکردەوە نیشان داوە، لە ئێوەش زیاتر بەئارەزوم کورد رزگار ببێت، بۆیە وای بەباش دەزانم بەناو گوندەکانی ئێمەدا تێپەڕ نەبن، هەرکاتێ ئێوە گەیشتنە ڕواندز من هێزە چەکدارەکانی خۆم دەخەمە ژێر فەرمانی جولاْنەوەی ئازادیخوازی کورد بەنیازی دڵپاکی دەبینە سەربازی جولاْنەوەکە).

لەسەر ئەوە ڕێك کەوتبون ئەو لەشکرەی هەیانەو لە ژێر فەرمانی کاك عباس دایە لە ڕێگای باڵەکایەتیەوە بڕۆنە ڕواندز هەرکاتێ ئەوان گەیشتنە دەوروبەری ڕواندز چەکدارەکانی سلێمان بەگ بڕۆنە ڕیزی پێشەوە، بەلاْم لە دوای گەڕانەوەی سلێمان بەگ بۆ دەرگەڵە زۆری پێ نەچوو چەکدارەکانی عەباس ئاغا لە(دۆل ماونان) لە گوندەکانی بەرگرکەو خانەقا دەستیان کردبووەگەفو هەڕەشە، جیا لەوەش وایان ڕاگەیاند بوو بەدەرگەڵەدا تێپەڕ دەبن بۆ سەر ڕواندز، ئەمەش وا دەگەێنێ کە بەرەو پەیمان شکاندن دەڕۆن، ئەمە باوکمی ئاڵۆز کردو هانیدا بڕواتە لای کارمەندانی دەوڵەتو داوای چەك بکات، بەلاْم پێش ئەوەی چەك وەربگرێت پرسی بەڕێکخراوی حزبی شیوعی کرد لە ڕواندز لەبەر ئەوەی منداڵەکانی لەگەڵ حزبی ناوبراودا بوون. لە دوای ڕەزامەندی ئەوان ئەوجا داوای چەکی لە دەوڵەت کرد بۆ ئەم مەبەستە ڕۆیشتینەلای قائمقام (عبدالصاحب غرباوی) لە ڕواندز پێی ڕاگەیاند کە هاتووە چەك وەربگرێت لەبەر ئەوەی چەکدارەکانی جولاْنەوە لە سنوری ئێمە نزیك کەوتونەتەوە، ئەو نزیك کەوتنەوەیە مەترسیە لەسەر ناوچەکە، بۆیە پێویستە چەکمان بدەنێ بۆ خۆپاراستن، قائمقام بەسلێمان بەگی گوت: (سلێمان بەگ پێش ماوەیەك پێمان گوتی وەرە چەك وەرگرە ڕازی نەبووی وا ئێستا خۆت هاتووی

ئاوای چەك دەكەی!) سلێمان بەگ گوتی: (ئێستا هەست بەمەترسی دەكەین ئەوانەی چەكیان بەدەستەوەیە بەنیازی دەست درێژی نزیك كەوتونەتەوە لە سنوری ئەو گوندانەی لە ژێر دەستی ئێمە دان، منیش ناكۆكیم لەگەڵ مەلامستەفادا هەیە، لەبەر ئەوە باوەڕیم نیە بۆیە ئەگەر بۆ دەست درێژی بێن ناچارین ڕوو بەڕوویان بوەستین، ئەوەیە هانی داوم بێم چەك وەرگرم بۆ پارێزگاری لە خۆم). قائمقام گوتی: (سلێمان بەگ بۆ وەرگرتنی چەك دەبێ بڕۆنە لای ئەسعەد شێتنە ئەو لەگەڵ خۆتان بێنن ئەوكاتە ئێمە دەتوانین لە ڕێگای ئەوەوە چەكتان پێ بدەین، چونكە بڕیارەكە بەم شێوەیەیە). لە جیاتی باوكم من وەڵامم دایەوەو گوتم: (جەنابی قائمقام وا دیارە ئێوە چەك نادەن بەچەك هەڵگر پێ دەچێت بەنیاز بن پیاو بۆ ئەسعەد كۆبكەنەوە، چونكە باوەڕیتان نیە چەك بەسلێمان بەگ بدەن ئەوە كۆسپ دەخەنە ڕێگای وەرگرتنی چەك ئەگەر بەم شێوەیە بێت پێویست بەوە ناكات لە ڕێگای یەكێكی ترەوە چەك بەئێمە بدرێ، بۆیە ئێمە چەك وەرناگرین). قائمقام هەستی كرد ئێمە ملكەچی كەس نین و ناچینە ژێر باری كەسیش و بەو شێوەیە چەك وەربگرین گوتی: (بڕیارێكی وامان پێدراوە دەڵێت، ئەوەی لە ناوچەی ڕواندز چەكی پێ بدرێت دەبێ بەڕەزامەندی ئەسعەد شێتنە بێت بۆیە ناتوانین بەبێ ناوبراو چەك بەكەس بدەین لە قەزای ڕواندز).

لە دوای قسەكانی قائمقام بەباوكمم گوت: (دەزانی قائمقام دەڵێ چی؟ دەڵێت دەبی بڕۆنە لای ئەسعەد شێتنە ئەو لەگەڵتان بێت و ڕازی بێت چەكتان پێ بدرێت. ئەگەر چەك وەرگرتن بەوشێوەیە بێت بەقسەی من دەكەن وەرمەگرن، دیارە دەیانەوێ بمانكەن بەچەك هەڵگری ئەسعەد شێتنە، بەڵێن مەدەن بەو شێوەیە چەك وەربگری لە ژێر چاودێری یەكێك خاوەنی پێنج كەس نەبێت، دیارە بەنیازی ئەوەن لەسەر شانی ئێمە كەسانی بێ كەس بەدیار بخەن و بەرزیان بكەنەوە). عزیزی ئامۆزام قسەكانی منی پەسند كردو گوتی: (ئێمە ئامادەنین چەك لە دوای كەسێك هەڵبگرین كە شایەنی ئەوە نەبێت لە خۆمان زیاتر بێت).

لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ قائمقام كرا پێم گوت: (مادام چەك وەرگرتن بەو شێوەیەو ئەو مەرجانەبێت كە ئێوە باستان كرد، كە مەرجی نەگونجاون چەك وەرناگرین) لای قائمقام دەركەوتین ڕۆیشتینەماڵی ئێمە كاتێك خەریكی نان خواردن

بووین لە دەرگا درا دیاربوو پۆلیس بوون بەدوای ئێمە دا هاتبوون پێیان گوتین (قائمقام دەڵێت هەر ئێستا سلێمان بەگ بێتەوە لام).

ڕۆیشتینە لای باوکم پێم گوت قائمقام پۆلیسی ناردون کە بڕۆینە لای، گوتی: (با نان بخۆین دەچین) بەپۆلیسەکانم گوت: (ئێوە بڕۆن ئێمە وا دێین).

وا زاندرا لە دوای دەرکەوتنی ئێمە قائمقام بەتەلەفۆن لەگەڵ متەسەریف (بەدرەدین علی) قسەی کردبوو، گوتبووی سلێمان بەگ دەرگەڵەیی ڕازی نەبوو لە ژێر چاودێری (ئەسعەد شێتنە) چەك وەربگرێتو ڕۆیشتەوە، هەر ئەودەمە (بەدرەدین علی) پێی گۆتبوو هەرئێستا بنێرە بەدوایدا چەند چەکی پێ دەوێت بیدەنێ). کاتێك گەڕاینەوە لای قائمقام ناوبراو گوتی: (لە دوای ئێوە تەلەفۆنم بۆ متەسەریف کرد پێم ڕاگەیاند سلێمان بەگ ڕازی نەبوو بەو مەرجە چەك وەربگرێت. متەسەریف پێمی گوت، بنێرە بەدوایداو چەکی پێ بدەن بەبێ مەرج بابەئارەزووی ئەو بێت، ئینجا بفەرموو، بەڵام ئێستا تەنیا هەندێ تفەنگی فەرەنسیمان هەیە. ئەوان ببەن لە دوای دوو ڕۆژی تر وەرن ئەوەندەی پێتان دەوێت تفەنگی ئینگلیزی وەربگرن). بەوشێوەیە ئەو کاتە بیستوحەوت تفەنگی (فەرەنسی)مان وەرگرتن لەگەڵ فیشەك منیش لەگەڵ باوکمو عزیزی ئامۆزامو پیاوەکان ڕۆیشتینەوە بۆ حافیز، کەمپی ئیشغال لە حافیز بوو، عزەتی برام مراقیب بوو لە کەمپی ناوبراو کاتێك عزەت بیستی باوکم چەکی وەرگرتوە زۆری پێ ناخۆش بوو چەك لە حکومەت وەرگیراوە، بەڵام نەیتوانی بەرامبەر باوکم قسە بکات، بێگومان عزەت ئەو کاتە شیوعی بوو پێی وابوو لەوانەیە شیوعیەکان ڕازی نەبن بەچەك وەرگرتن، نەیزانی بوو کە بەپرسی ئەوانو ڕەزامەندی ئەوان ئەو چەکە وەرگیراوە. لە حافیز من گەڕامەوە ڕواندز ئەوانیش ڕۆیشتنەوە بۆ دەرگەڵەو چەکەکانیان دابەش کردبوو بەسەر چەك هەڵگرەکان، دیارە چەك هەڵگرەکان وەك پێویست نێردرابوونە شوێنەکان بۆ نۆبەت گرتن.

دوا بەدوای ئەوە هاتبوونە ڕواندز کۆمەڵێك تفەنگی ئینگلیزیان وەرگرتبوون ئەوەی بەدیارکەوت چەك وەرگرتنی سلێمان بەگ ببوە هۆی پەست بوونی (ئەسعەد شێتنە)، هەر لەوکاتەوە دەستی کرد بەپیلانگێڕان ئەوەی بۆی بکرابایە دەیکرد دژ بەچەکدارەکانی سلێمان بەگ لەبەرئەوەی بەبێ پرسی ئەو چەکی پێ دراوە.

لەوکاتو ساتەش هێزێکی حکومەت پێك هاتبوو لە پۆلیسی گەڕۆكو جاش لە ڕواندز بەرەو باڵەکایەتی دەڕۆیشتن کاتێك گەیشتنە نزیك گوندی (ئۆمەراوە) چەکدارانی جولانەوە ڕێگایان لێ گرتن بەگژیەکدا چوون لە ئەنجامی ئەولێك دانەدا هێزەکانی حکومەت بەشکاوی گەڕانەوە هەتا بەرسیرینو بەرزیوە، بەپەرپووتی هەلاتن بەرەو دواوە.

ڕۆژی دوایی بەیانی خەریکی دوکان کردنەوە بووم، پۆلیسێك هات گوتی: (قائمقام دەیەوێ بەپەلە بڕۆنە لای) هەر ئەو دەمەڕۆیشتمە سەرا دیتم پۆلیس ئالۆز بوون ئۆتۆمبێلی مەفرەزە وەستا بوو پڕ لە پۆلیسی چەك بەدەست ئەو دەمەش قائمقامو(معاون نازم) دەرکەوتن قائمقام بەڕوو گرژی گوتی: (باوکت بەڵێن بەئێمە دەدات کە سنورەکانی سەر بەئێوەن تەقەی لێ نەکرێت کەچی دەڵێن یاخی بوەکان وا لە بن دەمی چەك بەدەستەکانی باوکت شەڕ لەگەڵ هێزی دەولەت دەکەن!).

گوتم: (وا بزانم خەرابیان تێ گەیاندوی دەتوانم بڵێم ئەو شوێنانەی سەر بەئێمەن هیچ شتێکی تێدا ڕوو نەداوە ئەو شوێنەی سەر بەئێمەوە نەبێت باوکم لێی بەر پرسیار نییە). بۆ خۆیو (نازم) لە پێشەوەی ئۆتۆمبێلە وەستاوەکە سواربوون بەمنیشیان گوت سوار بەلە گەڵمان، لەگەڵ پۆلیسەکان سوار بووم لە ڕواندز بەرەو بەرسیرین، گەیشتینە بەرزیوە لەوێ کەمێك وەستاین دیاربوو فەوجێکی سوپا لەوێ دابەزی بوو، قائمقام ڕۆیشتە لای ئامیر فەوجەکە زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە، ڕۆیشتین بۆ بەرسیرین دیاربوو گوند چۆڵ بوو خەڵکەکە لەترسی فڕۆکەکان هەریەکەی بۆ لایەك سەرپەڕ بوبون، کەمێك لە چایخانە چۆڵەکە دانیشتین لە دواییدا بەرەو پردی (بن کێلان) ڕۆیشتین کاتێك گەیشتینە سەر پردەکە دیاربوو هێزێکی زۆری پۆلیسەکانی گەڕۆكو جاشەکان لەم بەرو ئەو بەری پردی ناوبراو پەرتو بلاوی ناو چەقەڵە بەردەکان ببون ناوە ناوە تەقەیان دەکرد هیچیش دیار نەبوو نەش دەوێران زیاتر بڕۆنە پێش، ئەو ئۆتۆمبێلەی پێیان بوون ڕویان سوڕاندبوونەوە بۆ دواوە ئامادەبوون بۆهەلاتن.

ئۆتۆمبێلەکەی ئێمەی تێدابووین لە پردەکە دەربازبوە ئەودیو، دیاربوو هەندێ ئەفسەری هێزی پۆلیسەکان لەگەڵ ئەسعەد شێتنە وەستابوون، هەر قائمقام لە ئۆتۆمبێل دابەزیو ئەسعەد خۆی گەیاندیو پێی گوت: (بزانە تەقەی زۆر لەو

شوێنەیە ئەوەی سەر بەسلێمان بەگیە، ئەوەی جێگای باوەڕی ئێوەیە، ئەو چەکەی پێتان داوە بەو چەکە شەڕی هێزی حکومەت دەکەن، ئەوەیە باوەڕ پێکراوی ئێوەو (بەدرەدین بەگ) لە دوای قسەکانی ئەسعەد قائمقام لە منی پرسی‌و دەستی بۆ کێوی بن کێلان درێژ کردوگوتی: (ئەوە سەر بەئێوەیە؟).

منیش گوتم: (ئەو ڕووبارەی دەیبینی ئەو بەری سەر بەهۆزی باڵەکە، ئەو بەرەی ڕێگای پێدا دەڕوات هەتا دەگاتە حافیز سەر بەئێمەوەیە، لەوێشەوە هەتا تۆمەراوە سەر بەئێمەیە، بەپێی ڕەوشتی هۆزایەتی ئەگەر ئەوان لە ڕوبار بپەڕنەوە بەری لای ئێمەو دارێك ببڕن تۆڵەیان لێ وەردەگیرێت، هی ئێمەش بەو شێوەیەیە).

قائمقام گوتی: (پێمان ڕاگەینراوە ئەو شوێنەی سەر بەئێوەیە، وا یاخی بوەکان شەڕی تێدا دەکەن‌و ڕێگایان لە هێزی دەوڵەت گرتوە.

گوتم: (جەناب بفەرموون ئەو شوێنەی سەر بەئێمەیە من دەکەومە پێشتان هەتا دەگەینە کێوی مامەڕوت، ئەگەر شتێك هەبوو ئێوە دەتوانن بڕیاری سزادانی من بدەن، بەلاّم ئەگەر لەسنوری ئێمە هیچ نەبوو دەبی ئەو کەسە سزا بدرێت، ئەوەی بەدرۆ ئێوەی ئاگادار کردوە)..

من قسەکانم تەواو نەکردبوو ئەسعەد بەقائمقامی گوت: (کێ هەبە لەگەڵی بڕوات؟ لەبەر ئەوەی ڕێگایەکە جێگای مەترسیە کەس لەگەڵی ناچیت). لەو کاتەدا (مستۆ مێرۆزی) لەوێ بوو بەدەنگ هات گوتی: (منی لەگەڵ دەڕۆم)، هەر زوو بانگی یەکێك لە برازایەکانی خۆی کرد گوتی: (ئامادەبن لەگەڵ ئەو پیاوە دەڕۆین بۆ هەر شوێنێك دەیەوێت).

هەر ئەو دەمەش یەکێك لە مفەوەزەکانی پۆلیس (فازل شهاب) خەڵکی هەولێر بوو لاوێکی چالاك بوو، مەردانە ئامادەیی خۆی پیشان داوگوتی: (من بەئۆتۆمبێل لەگەڵیان دەڕۆم دوور لەوان لەسەر خۆ ئەگەر شتێك هەبوو زوو دەگەڕێمەوە ئاگادارتان دەکەم، فازل بەپەلە ڕۆیشتە لای بەڕێوەبەرەکەی ئاگاداری کرد کە لەگەڵ ئێمە دێت بەئۆتۆمبێلی پۆلیس، وام هەست کرد ئەو مفەوەزە جگە لە چالاکی‌و زیرەکی خۆی دیاربوو هەستی بەناپاکی هەڵوێستی ئەسعەد کردبوو دەربارەی ئێمە، ئەگەرچی ئەو پیاوە ئێمەی نەدەناسین.

لەویٚ ئامادەبووین کەوتینە ڕێگاو ڕۆیشتین من تەنیا دەمانچەیەکی لامەی چوکم پیٚ بوو، بەلاٚم پشت بەست بەپیاوەکانی مستۆ کەلەگەلٚم بوون وورده وورده ڕۆیشتین (فازل)یش بەئۆتۆمبێلەکەی بەدواماندا دەهات بەوشێوەیە هەر لە پردی بن کێلان هەتا گەیشتینە حافیز ڕۆیشتین بەبیٚ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ ببین. کاتێك گەیشتینە حافیز دیار بوو ئەو ناوە تەواو چۆلٚ کرابوو لەترسی فرۆکەکان هەریەکەی بۆ لایەك ڕۆیشتبون ئالاٚیەکی سپیان لەسەر خانوەکانی کەمپی ئیشغالٚ هەلٚدابوو، کاتێك گەیشتینە حافیزو ڕووبەڕووی هیچ نەبووین (مفەوەز فازل) ڕۆیشت ئەوان ئاگادار بکات منیش ئەوچەکدارانەی مستۆ مێرۆزی لەگەلیٚ ناردبووم لەچەند شوێنێکی پێویستی دەوروبەری حافیزم دانان هەتا ئەوان گەیشتنە حافیز، ئەوە بوو ئۆتۆمبێلەکانی هێزی پۆلیسەکانی گەرۆك لە پێچی (گەری کەندەسۆریٚ) بەدیارکەوتن‌و گەیشتنە حافیز بیٚ ئەوەی هیچ ڕووبدات، پۆلیسەکان خەریك بوون شت‌ومەك‌و کەل‌وپەلیان لە ئۆتۆمبێلەکان دەهێنایە خوارەوە لەوکاتەش بەڕێوەبەری هێزی پۆلیسەکان‌و قائمقام‌و ئەسعەد شێتنەش گەیشتنە حافیز دیتیان دوونیایەکی هێمن‌و ئارام، بەڕێوەبەری پۆلیس‌و قائمقام لەمن هاتنە پێش‌و زۆر بەگەرمی دەستیان خستە ناو دەستم، قائمقام گوتی: (ئەوەی ڕاستیە قسەکانی تۆ بەکردەوە ڕیسوا کردن بوو بۆ درۆزنەکان). وادیار بوو ئەسعەد لە قسەکانی قائمقام زۆر پەست بوو زیاد لە پێویست گەرم ببوو، یەکسەر فەرمانی بەپیاوەکانی دا بچن بۆ گوندی (ڕێزانۆك)و بسووتێنن بەو بیانوەی گوندی ناوبراو گوندی (جەلال بەگی میرمحمدامین بەگ)ە ئەویش لەگەلٚ یاخی بوەکاندایەو شەڕی دەولەت دەکات.

هەر زوو بەرپەرچم دایەوەو گوتم: (ئەسعەد ئاغا چۆن ئەو گوندە دەسوتێنن؟ بۆچی دوێنیٚ‌و پێرێتان نەدەسوتاند؟ پیاوم دەوێت بیسوتێنێت).

ئەسعەد زۆر بەتوندی‌و زویری گوتی: (زۆر قسەمەکەو دەسوتێندرێت‌و نابی کۆلێتێکی مریشکیشی تێدا بمێنێت).

پێم گوت: (سوتاندنی ئەو گوندە ئەوەندە ئاسان نییە، لەکاتێکدا ئەو گوندە دەسوتیٚ کە کۆمەلێك لاشە دەکەونە گۆڕیٚ) ئەسعەد لەقسەکانی من پەست بوو بەتوڕەیی بەڕەشیدی کوڕی گوت: (بڕۆن ئەو گوندە بسوتێنن ئەوەی نارازیشە باشی بکوتن). ئەسعەد قسەی تەواوکردو من بڕیای کلاشینکۆفێك بوم هی ئەو

پۆلیسانەی کەلوپەلیان لە ئۆتۆمبێلەکان دەهێنا خوارەوە زۆر بەگورجی سوارم کردو ڕوو لەوان وەستامو گوتم: (باڵە شوێنی خۆی بجولێتەوە بزانە چیتان بەسەر دێت!) خەڵکێکی زۆر لەوێ وەستا بوون، هەریەك هەنگاو لەشوێنی خۆی بجولابوایە بێگومان تەقەم لێ دەکردن، ئەگەر تەقەم لێکردبان زیاتر لە پەنجا کەس دەکوژران، بەڕێوەبەری پۆلیسو قائمقامو ئەفسەری پۆلیسەکانیش دەکەوتنە بەر، بەڵام قائمقامو بەڕێوەبەری پۆلیس کەئەمەیان بینی زوو بەزوو غاریان دا منیان گرتە باوەش کلاشینکۆفیان لێ وەرگرتمو زۆر بەتوندی لەگەڵ ئەسعەد کەوتنە قسەو ناچاریان کرد هەر ئەوکاتە حافیز بەجێ بهێڵێتو بڕواتەوە ڕواندز.

لە دوای ئەو مشتومڕە بانگی (حسێن مینە وسو)م کرد هەر ئەو دەمە بەپەلە بەڕێم کردبڕ دەرگەڵە بۆ ئەوەی باوکم بێتە حافیز بۆ دیدەنی بەڕێوەبەری پۆلیسی گەڕۆكو قائمقام.

لە دوای ئەوەی ئەسعەدیان بەرێ کردەوە دیتیان هیچ لە گۆڕێ نییە بەدرەنگەوە قائمقامو سەرۆکی پۆلیس ئامادەبوون بڕۆنەوە بۆ ڕواندز زۆریان هەوڵدا منیش لەگەڵیان بڕۆمەوە ڕواندز پێم گوتن: (ناردومە باوکم بێت دەترسم شەو بێت نەوەك لەگەڵ پۆلیسەکان توشی شتێك بن، ئەوان ڕۆیشتن کاتی ڕۆژئاوا بوو ڕەئیس عورەفا (مامە) کورد بوو لەگەڵ دوو سێ پۆلیس هاتنە لامو داوایان کرد ڕێگایان بدەم بڕۆن لەناو شینایییەکان هەندێ تەماتە بۆ خۆیان کۆبکەنەوە منیش ڕێگام پێدان، لە کاتێکا پۆلیسەکان بەپێش دەرگای خانوەکانی ئیشغالدا تێپەڕ دەبن لەناو پەنجەرەی ژووری ئەندازیاران گوێ بیستی دەنگێك دەبن، کاتێك نزیك دەکەونەوە دەبینن پۆلیسێك لەناو ژوورەکە بەندەو دەرگای لەسەر داخراوە، پۆلیسەکە لەو پۆلیسانە بوو کە ئەوانەی دوو ڕۆژ پێش شەڕەکەی (ئۆمەراوە) لەناو (کوێلەکان) دابڕابوو مابوەوە، کاتێك لەگەڵ ملازم (علی)کە کورد بوو خەڵکی مەنەدەلی بوو، لەبەر دەرگای چایخانە دیان کۆمەڵێك پۆلیس پۆلیسێکیان بەدەستەوەیەو بردیان بۆ لای یاریدەدەری بەڕێوەبەری پۆلیسەکان زۆری نەخایاند ئەوەندەمان زانی دوو نۆبەتداری کەمپی ئیشغال (حسنو مینە وسو)یان بردن بۆلای یاریدەدەری لێپرسراوی پۆلیسەکان،ناوبراو فەرمانی دابوو بەگرتنیان،هێنانیان لە کۆڵەگەی چایخانەیان بەستنەوەو گوتیان: (ئەو دوو کەسە هەر ئەم شەو تیرە باران دەکرێن!) بەقسەی

پۆلیسی دۆزراوە گوایا ئەو دوو کەسە پۆلیسەکەیان بەند کردووەو چەکیان کردوە، کاتێك ئەمەم بیست ڕۆیشتمە لای یاریدەدەری پۆلیس پێم ڕاگەیاند کە نابێ دەست لەو دوو کەسە بدرێتو هەر شتێکی لەگەڵ ئەو دوو کەسە بکرێت نێوانمان تێك دەچێت، ئەوەی زاندرا ئەو پۆلیسە گووتبوی ئەو دوو کەسە منیان چەك کردوو بەندیان کردم وەك دیار بوو بەنیاز بوون کارەکە ئاڵۆز بکەن بەیاریدەدەری پۆلیسەکانم گوت: (ڕێگا بدات لەگەڵ ملازم علی بڕۆین دوو بەدوو لەگەڵ پۆلیسەکە بکەوینە لێکۆڵینەوە ئاخۆ ڕاستە ئەو دوو کەسەی گیراون ئەوان پۆلیسیان چەك کردووەو بەندیان کردووە؟! بۆیە بەپێویست دەزانم لێکۆڵینەوەیەکی ڕاستی لەگەڵ بکەین، ناوبراو ڕازی بوو منو ملازم علی بڕۆین لێکۆڵینەوەیەکی تری لەگەڵ بکەین، شەو درەنگ بوو پۆلیسەکەمان بانگ کرد لەگەڵی کەوتینە لێکۆڵینەوە،دیار بوو پۆلیس پیرە پیاوێك بوو ناوی (عباس) بوو لە شیعەکانی نەجەف بوو لە سەرەتاوە زۆر بەوەستایی لەگەڵی دواین پێمان گوت: (تۆ پیاوێکی خاوەن ئیمانی دەبێ ڕاستی بڵێیتو سوێند بەئیمانەکەت بخۆی کە درۆ ناکەی، ئێمە دەزانین کێ تفەنگی لە تۆ ستاندوەو ئەوان دێن لە پێش بەڕێوەبەر دەڵێن ئێمە تفەنگمان لەو پۆلیسە ستاندوە بۆئەوەی یاخی بوەکان نەیکوژن هەر لەبەر ئەوەش لەو ژوورە بەندمان کردووە کە دیار نەبێت تا هێزەکان دەگەڕێنەوە ئێرە، دەبێ ئەوەش بزانی ئێمە دەزانین چەکی تۆ لای کێیە، بڵێ بەئیمامی کازمو حسنو حسێن ڕاستی دەڵێم، پێمان بڵێ ئەو دوو نۆبەتدارە بوون ئەوانەی گیراون تفەنگیان لە تۆ ستاندووە؟ ئەگەر ڕاستت گوت ئەوکاتە باوەڕ دەکەین کە تۆ پیاوێکی ڕاست گۆی لەبەر ئەوە ئێمە دەزانین کارەکە چۆن بووە؟) بەقسەکانی ئێمە عباسی پۆلیس ئاڵۆز بوو گوتی: (ئەوانە نەبوون تفەنگیان لەمن ستاند هەندێ کەسی تر بون، بەڵام ئەوانیش دەزانن کێ بوون چەکی منیان برد). ئەوەی ڕاستیە ملازم علی زۆر پەست بوو، پێی گوت: (سەگ کوڕی سەگ زۆری نەمابوو ئەو دوو کەسە بێ تاوانە بەقسەی تۆ بکوژرێن کەچی دەرکەوت تۆ درۆزنی لەبەرئەوەی ڕاستیت نەگوتووە دەبێ لە بەندیخانەدا بڕزیت)، ملازم علی بەقینەوە دوو زەللەی لەو پۆلیسە دان کە من پێم ناخۆش بوو.

لە دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە (حسنو مینە وسو) لە پیل بەستن ڕزگاریان بوو تا بەیانی کاتێ (سلێمان بەگ) دەگاتە حافیز ئەوکاتە ئازاد دەکرێن. ئەوشەوە لەوێ

ماینەوە بەیانی پێش ڕۆژهەڵات چەکدارەکانی لەگەڵ باوکم دابون دەستە دەستە دەهاتن‌و دەگەیشتنە حافیز لە دواییدا باوکیشم گەیشتەجێ لەو دەمەشدا بەڕێوەبەری هێزی پۆلیس گەیشتە حافیز، نابراو بەگەرمی بەخێرهاتنی چەکدارەکانی دەرگەڵەی کردو زۆر بەگەرمیش پێش وازی لە باوکم کردو دانیشتن لەگەڵ یەك کەوتنە قسەکردن، دیاربوو بەڕێوەبەر داوای لە سلێمان بەگ کرد کە چەکدارەکانی بڕۆن لەگەڵیان هەتا دەگەنە(ڕایات)، بەلاّم سلێمان بەگ ڕازی نەبوو ئەوەیان بۆ بکەین پێی گوتن: (ئێمە هەتا کێوی مامەڕووت دەتوانین لەگەڵتان بێین لەوێ بەولاوە لەژێر چاودێری ئێمەدا نییە لەبەر ئەوە بەڕاست نازانین سنوور ببەزێنین).

لە دەوروبەری کاتژمێر دەی سەر لەبەیانی چەکدارەکان بەڕاسپاردەی باوکم لە پردی (ڕەزانۆك) پەڕینەوە بەسەرکەوتنە بەرزاییەکانی (سەرگرد)و باسك‌و باسك ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە گەروی (ئۆمەراوە) لەوێ چەند کەسێك بەرێ کران بۆ سەرکەوتنە سەر(مامەڕووت) کاتێك بەسەرکەوتن لەبەرزایی چیای مامەڕووت ئاگریان هەڵکرد، لەدوای هەڵکردنی ئاگر زۆری نەخایاند فەوجێکی سوپاو ئەو هێزەی پۆلیسەکان لە حافیز بوون لە لۆفەکانی (ناوکێلەکان) بەدیارکەوتن بەرەو ناوچەی سەرەوە لە ڕێگادابوون دەڕۆیشتن، بێگومان ئەوکاتە قشڵەی پۆلیسەکانی ڕایات ئابلۆقە درابوو، ئەو هێزە بەو نیازە دەڕۆیشتن بەڵکو بتوانن پۆلیسەکانی ئابلۆقەدراو ڕزگار بکەن. پێش ئەوەی تاریك دابێت گەیشتنە گوندی (ڕێزانی مەلا برایم) ئێمەلە گەرووی ئۆمەراوە زیاتر نەڕۆیشتین.

ئەوەی جێگای باس کردنە ئەوەیە من لە چەك هەڵگرەکان نەبووم، بەلاّم وەك لەسەرەوە هاتوە بەناچاری توش ببوم لەگەڵیان مابومەوە، ئەوە بوو لەسەر داوای باوکم لەگەڵیان ڕۆیشتم هەتا گەرووی ئۆمەراوە، وەك دیاربوو هێزەکانی سوپاو پۆلیس‌و جاش تێپەڕ بوون بۆ ڕێزان، کە ئێوارە تاریك داهات ئامیر فوج (مقدم ئیسماعیل) ڕاسپاردەیەکی ناردبوو کە بڕۆمە لای، ئەگەرچی زۆر درەنگ بوو چەند چەك دارێکم لەگەڵ هاتن ڕۆیشتمە (ڕێزان)، شەو درەنگ بوو گەیشتینە ناو گوند چووینە ماڵی (خەلیفە صادق) شەو لەوێ ماینەوە بەیانی ڕۆیشتمە لای (مقدم ئیسماعیل)، ناوبرا کورد بوو خەڵکی سلێمانی بوو، دیاربوو پیاوێکی ووشیارو

ڕوخۆش‌و لەسەرخۆ بوو، ناوبراو داوای کرد لەگەڵیان بڕۆین هەتا هێزەکانیان دەگەنە ڕایات دیاربوو بەپەلە بوون زوو بگەنە قشڵەی ئابلوقەدراو، پێم گوت ئێمە ناتوانین بێین بۆ ڕایات‌و هۆیەکەشم بۆ باسکرد کە لەبەرچی ناتوانین لەگەڵیان بڕۆین بۆ ڕایات، ئەو لەو هۆیانە گەیشت ئەوانەی کۆسپ بوون لە ڕێگای چوونی ئێمە. ناوبراو زوو هەستی کردو تێ گەیشت لە دواییدا گوتی: (کەوا بێ تکام ئەوەیە ئەو شوێنانەی ئێوەی لێن ئەو دوو سێ ڕۆژە بەجێی مەهێڵن‌و چاودێری ڕێگاکان بکەن تا ئاگادارتان دەکەینەوە)، لەوکاتەی لە چادرەکەی مقدم (ئیسماعیل) دەرکەوتم دیاربوو (ئەسعەد شێتنە) لەسەر جادە دابەزی‌و دەهات بۆ لای ئامیر فوج، پێم گوت: (کاکە ئەوا ئاغاتان هات با ئەو لەگەڵتان بێت بۆ ڕایات).

مقدم ئیسماعیل گوتی: (ئەگەر بەهیوای ئەو باین ئێستاش هەر لە بەرزێوەو حافیز بووین)، لە ڕێزان بەئۆتۆمبێلێکی سوپایی گەڕاینەوە حافیز کاتێك گەیشتینە ئۆمەراوە لەسەر پردی (سۆر) دوو چەکدارم دابەزاندن، (وەسمان خلیل‌و حوسێن خدر) بۆ ئەوەی بڕۆنە سەر گەرووی ئۆمەراوە لای ئەوکەسانەی لەوێ بوون، بۆ ئەوەی ئاگادارایان بکەن لەوێ بمینن شوێنی خۆیان بەجێ نەهێڵن تا ئاگادار دەکرێنەوە، ئەوە بوو(وەسمان بەگۆ) لەسەر داوای خۆی ڕۆیشت بۆ ئەوەی لەوێ بمێنێتەوە خۆی گوتی:(من دەمێنمەوە تا خەبەرمان بۆ دەنێرن)، پێش ئەوەی بەگۆ بڕوات پێم گوت:(لەوێ لەدوری ڕێگالەشوێنێکی لاپەڕگە بێت خۆتان بپارێزن،نەچن یەخەی کەس بگرن لەوانەی بەڕێگادادەڕۆن،کارتان بەکەس نەبێت مەگەر شەڕتان پێ بفرۆشن. نەچن ئەو خەڵکەی بەڕێگادا هاتوو چۆ دەکەن ڕێگایان لێ بگرن‌و ئەزیەتیان بدەن).

ئەوان ڕۆیشتن بۆ سەر گەرووی ئۆمەراوە ئێمەش بۆ حافیز، ئێوارەی هەمان ڕۆژ هەندێ چەکداری تریشمان بۆ ناردن، ئەوانیش ئاگادارکران لەشوێنێك بن دوور لەڕێگا تەنیا ئەوشەوە لە حافیز مامەوە بەونیازەی بەیانی بگەڕێمەوە بۆ ڕواندز کەچی شەو درەنگ لای بەیانی لە گەرووی ئۆمەراوە بوو بەتەقەو تەقەیەکی زۆر گەرم بوو بەپەلە ڕۆیشتین بۆ شوێنی تەقە، کاتێك گەیشتینە ئەوێ دیتمان (بەگۆ) کوژراوە یەکێکیش چەك کراوە ئەوانی تریش کەوتبونە شەڕ لەگەڵیان ئێمەش پێ ڕاگەیشتین، ئەوان زانی بوویان لە دەستی ئێمە دەرباز نابن ناچار ببون وەلاخ‌و کەل‌و

پەلی پێیان بوو بەجێیان هێشتبوو بۆ ئەوەی خۆیان دەرباز بکەنو برۆن، ئەوکەلو پەلەی لیبیان بەجێ مابوو، وەلاَخێکی باربەرو دەزگایەکی لاسلکیو ماتۆڕێکی شەحنی پاتریو جانتایەكو کۆمەڵێك ناس نامەی لەناودابون.

زۆر بەگورجی بەدوایاندا ڕۆیشتین، بەلاَم ئەوان ڕێگای خۆیان گۆڕی بوو، لەبەر چاو وون بوون، ئەگەرچی زوو ڕێگاو بازگەکان گیرابوون، بەلاَم ئەوان پێش ڕێگاگرتن دەرباز ببوونو ڕۆیشتبونە وەرتێ.

لە کاتێکدا دەنگی تەقەی گەرووی ئۆمەراوە گەیشتۆتە گوندەکان خەڵکێکی زۆری چەکدار هاتبوون، دەگەڕان بەدوای بکوژانی (بەگۆ) شەو گشت ڕێگایەکان کۆنترۆڵ کرابوون، لامان وابوو خۆیان لەناو دارستانەکان شاردۆتەوە، هەندێ چەکدارمان گەیشتبوونە زینی (ئەستێرۆکان)و دەوروبەری وەرتێ، شەو من لەگەڵی (کەڵێتە) بووم هەر ئەو شەوە عزەتیش ڕۆیشتبوە زینی (ئەستێرۆکان) بەیانی زوو ئێمەش ڕۆیشینە وەرتێ، لەوێ زاندرا کە دەرباز بوون بۆ دیوی (بیتوێن) بۆ نیوەڕۆ گشتمان لە وەرتێ یەکترمان گرتەوە، لەوێ بەدیار کەوت ئەوانەی بەوکارە هەستا بوون (عومەر دەبابە)و چەند کەسێکی بارزانی لەگەڵ بوون، زۆر بەپەلە بەرەو(بیتوێنو ڕانیە) ڕۆیشتبوون. بێگومان پێیان ڕانەگەیشتین، نیوەڕۆ لەوەرتێ دابەش بووین بەسەر ماڵەکاندا، منو خدری عەولاَ بەگو چەند کەسێك لەماڵی حاجیەك بووین ئەو ماڵە نەخۆشێکیان هەبوو دایان پۆشی بوو، من زوو هەستم کرد ئەو نەخۆشە بەنەخۆش ناچێت لە بەر ئەوەی بێ دەنگ بوو نە دەجولاَیەوە، پێش ئەوەی برۆین زانیمان نەخۆشەکە یەکێك بوو لەوانەی لەگەڵ (عومەر دەبابە) دابوون، پیرە پیاوێکی دەزگای لاسلکی بوو دەرنەچووبوو بەجێیان هێشتبوو بێ یەکانی بووبوونە پۆرگو بریندا ببون نەیتوانی بوو زیاتر بڕوات!؟

ئەو نهێنیە تەنیا منو(خدری عەولاَ بەگ) دەمانزانی، بەخدرم گوت: (برام ئێستا باوکم بزانیت هیچ شکی تێدانیە دەیکوژیت، ئایا ئەو پیرە پیاوە بەبەر خوێنی بەگۆ دەکەوێت؟ نەخێر بۆچی ئەو پیاوە فەقیرە بکوژرێت!) ئەوەی زانیمان پیاوەکەیان بەزۆری لەگەڵ خۆیان هێنابوو، ڕێککەوتین بێ دەنگی لێ بکەینو وازی لێ بێنین، بەجێمان هێشت، شتەکە بەنهێنی مایەوە لەنێوان منو خدرو ئەو ئافرەتەی ئەو نهێنیەی بەخدر ڕاگەیاندبوو.

پاش ئەو بەسەر هاتەی باس کراو گەڕاینەوە دەرگەڵە خەڵکەکە بلاّوەیان لێکرد، منیش گەڕامەوە ڕواندز ڕۆژی دووەم دوای گەڕانەوەم بۆ ڕواندز زانیم لەوکاتەی ئەسعەد شێتنە لە حافیز گەڕابوەوە یەکسەر ئەو مشتو مڕەی ڕوویدا بوو لە حافیز بە(علی مەکتەبە)ی ڕاگەیاند بوو، عەلی یەکێك بوو لە ئەندامانی لیژنەی قەزای ڕواندزی حزبی شیوعی، لە بەیەك گەیشتنێك لەگەڵ عەلی مەکتەبەدیار بوو بەڕوو گرژیو لالووتی بەمن دەڵێت: (کاکە ئەتۆ زۆر غەڵەتی بەرحەڵستی ئەسعەد ئاغا دەکەیت لەبەر ئێمەیە هیچت پێ ناڵێت ئەگینا ئەزیەتت دەدات!).

ئەوەی ڕاستییە زۆر لە قسەکانی عەلی پەست بومو پێم گوت: (دیارە ئەسعەد ئاغا شیوعیەو لەژێر چاودێری ئێوەیە، بۆیە هیچی پێ نەگوتوم. ئازیز با لەسەر ئێوە نەبێت تۆشی لەگەڵ بەئەوەی لە دەستتان دێت ڕامەوەستن، بۆ ئاگاداریت تۆ بەهەڵەدا چووی ئەسعەدی ئاغات بۆ هەندێ مل کەچ ئەسعەدئاغایە، نەك بۆ ئێمە، ناوبراو باش ئێمە دەناسێت). زۆر بەتوڕەیی دەرکەوتم، ناوبراو ئەوەندەی گوت: (کەیفی خۆتە من بۆ تۆمە).

گەڕامەوەو گووتم: (تکایە با بۆ منت نەبێت هەوڵ بدە با خەڵکی ڕواندز ئەزیەت نەداتو بیانویان پێ نەگرێت لەغەمی من دامەبەو بۆم مەپارێوە).

زیاتر لە ساڵێك ئەسعەدو منداڵەکانی ڕێگایان بەبەر دەرگای ستۆدیۆی من دا بوو بەدرێژایی ئەوساڵەو زیاتریش، شتێکی وایان نیشان نەدا بڵێن بۆنی بێ ڕێزی پێوە دیار بێت، کەچی لەگەڵ خەڵکی ڕواندزیش لەوپەڕی بێ ڕێزیو ناپەسندیو بەدکاری دابوون، ڕۆژ نەبوو خەڵکانێك ئەزیەت نەدەن. ئەوەی دیاربوو لە ڕواندز ئەسعەد شێتنەو دەستو پێوەندەکانی ببوونە باش جەندرمەی ئەوشارە.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەشێویو ئاڵۆزی زیاتر پەرەی دەسەند، کۆمەڵانی خەڵك هەستیان بەمەترسی دەکرد چی لەلایەن کار بەدەستانی دەوڵەتەوە، ئەوانەی لەژێرەوە لە دژی حکومەت بوون چ لەلایەن کەسانی دەرکەوتو لەژێر بەرگی کوردایەتی خۆیان داپۆشی بوو گوایا کورد پەروەرن، بەلاّم ناسران کە کێنو کردەوەکانیان چین.

هەروەك لە سەرەوە نووسراوە بارکم لەگەڵ عەباس ئاغا ڕێك کەوت بوو کە چەکدارەکانی ئەوان بەلای ئێمەدا نێن کە دەڕۆن بۆ ڕوانـــدز، بەلاّم بەدیارکەوت ئەو پەیمانی شکاندو پێشێلی کرد، ئەوەی زاندرا کە خزمەکانی ئێمە چووبوونە ژێر باڵی

(عەباس ئاغا)و ڕازیان کردبوو کە پەیمانەکە بشکێنن‌و بەدەرگەڵەدا تێپەڕن بۆ ڕواندز، وایان دیارکردبوو کە (سلێمان بەگ) کەسی لەگەڵ نییەو کەسی لەگەڵ ناڕوات، هەرکاتێ لەشکر گەیشتە (دەرگەڵە) ناوبراو بەناچاری یان دەڕوات یان سەر شۆڕ دەکات، وا دیارکەوت عەباس ئاغا بەقسەی ئەوان لەبەڵێنەکانی کە بەباوکمی دابوون پاش گەز بووبوەوە، ئەوەبوو لە کۆتایی ساڵی (١٩٦١) تاکو سەرەتای ساڵی (١٩٦٢) عەباس ئاغا بەلەشکرێکی زۆرەوە لە ڕێگای (وەرتێ) دۆڵی شەهیدانەوە بەرەو گوندەکانی سەر بەئێمەوە (بەردگرتکەو خانەقاو ناوخەرابو کەلێتە) هاتن بەو نیازەوە بێن بۆ دەرگەڵە، کاتێك دیتیان پشتیان لێ گیراوەو ژمارەیەکی زۆری چەکدار لە گوندی دەرگەڵە کۆبونەتەوە، ئاگاداری عەباس ئاغاش کرابوو ئەگەر زیاتر بێنە پێش شەڕێکی خوێناوی ڕوو دەدات، ئۆباڵی ئەو شەڕەش دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان. لەگەڵ ئەوەش ڕانەوەستان، لەگوندی خانەقا دەست درێژیان کردە سەر چەکدارەکانی ئێمەو دوو چەکداریان چەك کردبوون، ئەو زیاد ڕۆیشتنە بوە ئاڵۆزیەکی ترسناك‌و مەترسیدارو بۆنی شەڕی پێوە دیار بوو.

## سەرەتای هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان چەکدارانی سلێمان بەگ‌و عەباس ئاغادا

ئەوەی دیار بوو سلێمان بەگ زۆر هەوڵی لەگەڵ عباس ئاغا دا بۆ ئەوەی ناخۆشی‌و شەڕ نەکەوێتە نێوانیان، لەبەر ئەوەی شەڕی نێوان هەردوولا بەسودی نەیارانی هەردوولا کۆتایی دێت، بەڵام بەداخەوە هەوڵدانەکە بێ سوود بوو، بەهاتنی چەکدارەکانی(عباس ئاغا) بۆ سەر سنووری ئەوگوندانەی لەژێر چاودێری (سلێمان بەگ)دا بوون، ناوبراوی خستە قین‌و ڕکەبەری‌و پێی داگرت، ڕازی نەبوو دەرگەڵە بەجێ بێڵێت ئەوەندەی (میر حمدامین) بەگی ئامۆزای هەوڵی لەگەڵ دا بۆ ئەوەی بێ شەڕ لە دەرگەڵە دەربکەوێت یاخی ببوو دەیگوت: (نارۆم تا شەڕێك لەگەڵ عباس ئاغا نەکەم لەبەرئەوەی پیاوێکی پەیمان شکێنەو درۆی لەگەڵ کردم).

کاتێك لە ڕواندز دەنگی ئەو تەنگ‌و چەڵەمەیەم بیست زانیم کار لەکار ترازاوە بەپەلە ڕۆیشتم بۆ دەرگەڵە بەڵام چ سەرمایەك بوو کەس خۆی پێ ڕانەدەگیرا ئەوەندە

شەوێکی سارد بوو، کاتێك گەیشتمە زینی دەرگەڵە دیار بوو کۆمەڵێك چەکداری لێ بوون ماوەیەکی تەواو لەلایان مامەوەو لەگەڵیان کەوتمە قسە کردن هەستم کرد وەیان بەرز بوو، زۆربەیان ڕەئیان لەگەڵ ڕەئی باوکمدا بوو کە شەڕ بکرێ لەگەڵ چەکدارەکانی عباس ئاغاو دەستێکی باشیان لێ بوەشێندرێت ئەوکاتە دەرگەڵەش بەجێ بێڵین ئاساییە.

لە دواییدا لەگەڵ (مام ڕەزاق‌و خدری عولا بەگ‌و دەروێشی حمەد بۆری) کەڵێتەیی قسەم کرد بۆ ئەوەی بڕۆین، بەڵکو باوکم ڕازی بکەین لە دەرگەڵە دەربکەوین، لە دوای قسەکانی من لەگەڵ ئەو کەسانەی ناویان هاتووە دابەزینە دەرگەڵەو ڕۆیشتینە دەرگەڵە لای باوکم، لە دوای هەوڵدانێکی زۆر توانیمان (سلێمان بەگ) ڕازی بکەین کە دەرگەڵە بەجێ بهێڵین، کاتێك سلێمان بەگ ڕازی بوو بڕۆین هەر ئەوکاتە خەبەردرایە گوندەکانی (دۆلەمنجەل) بۆ ئەوەی ولآخی بارهەڵگر بنێرن بۆ بارکردنی ماڵی ئەو چەکدارانەی لەگەڵ سلێمان بەگ دان‌و بیان گوازنەوە بۆ ڕواندز، بەماوەی دوو ڕۆژ ماڵەکان بەڕێ کران، تا ماڵەکان گواسترانەوە بەو سەرماو ساردیە چەکدارەکان لە دەوروبەری گوندەکان نۆبەتدار بوون باوکم لەدەرگەڵە دەرنەچوو تا هەموو ماڵەکان گواسترانەوە، ئێمە لە زینی دەرگەڵە چاوەڕێ بووین باوکم بێت، سەردەمێك تاریك داهاتبوو ئاگادار کراین کەوا سلێمان بەگ بەنیازە زەبرێك لە چەکدارەکانی عباس ئاغا بوەشێنێ ئینجا بڕوات، شەوێکی ئەوەندە تاریك‌و سارد بوو ناچار لەگەڵ (عزەت)و هەندێ لە خزمەکان دابەزینەوە گوند ئەوجارە توانیمان وابکەین کە ئەو شەڕەی ئەو بەنیازە بیکات لە بەرژەوەندی ئێمە نیە بۆیە پێویستە لەم جۆرە شەڕانە دووربین‌و ووردبین بین، ئەوکاتە ڕازی بوو لە گوند دەربکەوین بەوشەوە ساردە دەرکەوتین بەرەو زینی دەرگەڵە سەرکەوتین، شەوێکی چەند ساردو دژوار بوو ئەوەندەش تاریك بوو، لەگەڵ ئەوەش لەسەر هەموو شوێنە بەرزەکان‌و گردەکان نۆبەتدار داندرا بوون، کاتێك بەسەرکەوتینە سەر زین ئاگاداری گشت چەکدارەکان کرا بێنە زینی دەرگەڵە، عزەت لەوێ چاوەڕێیان دەکات، ئەوشەوە لای نۆبەتدارەکانی ئەوێ ماینەوە تا بووە ڕۆژ، بەلآم چ سەرمایەك لە هیچ شوێنێك ئارام گرتوو نەدەبووین لەو پەناو ئەو پەنا بەپێوە نۆبەتداریمان دەگرت، بەفر لەگۆڕێ بوو هیچ جێگایەکی ووشکایی نەبوو، تینی ئاگریش دادی نەبوو، کاتێك بوو بەڕۆژ

لەگەڵ چەند کەسێك لەگەڵ باوکم بەرەو گوندی (ماویلیان) ڕۆشتین، وورده وورده بەپێچەکانی (شینك)دا شۆڕ بووینەوە خوارەوە، چەکدارەکانی لای عزت مانەوە هەتا کۆتایی گواستنەوەی ئەو ماڵانەی مابوون بار دەکرێن‌و دەگواسترێنەوە، کاتێك گەیشتینە لای (شێخ مەلا صادق) ناوبراو بەخێرهاتنێکی گەرمی لێ کردین، بەسلێمان بەگی گوت: (باش بوو لەوێ هاتن پێم خۆش بوو لەو بەڵاو فتنەیە دوورکەوتنەوەو بەجێتان هێشت ئینشا الله هاتنتان خێری تێدایە).

نیوەڕۆ لەوێ ماینەوە لە دوای نیوەڕۆ ڕۆیشتینە سەربازگەی (بەرزێوە) لەوێ بیستمان (کەریم خانی کوڕی محمود بەگ)ی برادۆستی چۆتە دەرەوە لەگەڵ چەند کەسێك، ئەوەی دیاربوو پیاوەکانی (محمود بەگ) لە سەربازگەکە بوون، بەڵام ئاڵۆز بوون زۆریان پێ ناخۆش بوو کە ناوبراو ڕۆیشتبوو.

ڕۆژی دوایی (عزەت)یش لەگەڵ تەواوی چەکدارەکان ڕۆیشتبوونە سەربازگەی بەرزێوە لەوێ تەوانیان لە سەر پردی (خەلکان ـ جندیان) دانا بوون، ئەو ماڵانەی لە دەرگەڵەش باریان کردبوو لە (کاولۆك‌و ڕواندز) جێ نشین کرابوون، ماڵی باوکم لە قوتابخانەی کاولۆك داندرابوو، لە کاتێکدا لە سەربازگەکە دەرکەوتین چووینە کاولۆك.

ئەوەی زاندرا دوای دەرکەوتنی چەکدارەکانی (سلێمان بەگ) لە دەرگەڵەو گوندەکان پیاوەکانی (عباس ئاغا) هاتبوونە جێگای ئەوان لە جیاتی دڵ دانەوەی خەڵك دەستیان کردبوو بەئەزیەت دان‌و ئەشکەنجەی خەڵکی گوندەکان بەبیانوی ئەوەی کە جاشی (سلێمان بەگ)ن ئەو هەڵوێستە چەوتەی پیاوەکانی عەباس ئاغا لە بەرژەوەندی سلێمان بەگ بوو، ئەوەدەنگ وباسەی دەگەیشت زۆر بەبێ ڕێزی لەگەڵ خەڵك دەجولانەوەو بەربوونەگیانی خەڵك‌و ڕاوەڕووت‌و تالان کردنی هەژاران بەهەر شێوەیەك بۆیان بگونجابایە، ئەوەی بیان زانیبوایە چەورەو شتێکی هەیە زۆر چاك هەڵیان دەپێچاو بەئارەزوی خۆیان لەگەڵی دەجولانەوە، بەڵگەش بۆ ئەو ڕاستیە (حاجی حکیم)ی ڕەژێکەریە کە پیاوێکی ئاینی بێلایەن بوو لە خوا پەرستی زیاتر هیچی تری نەدەزانی، تەنها ئەوەندەی دەزانی کە (سلێمان بەگ) گەورە پیاوی ئەوناوەیە، پیاوێکی هەبوو بوو، هەرجارەی بەشێوەیەك بیانویان پێدەگرت جارێك

گایەکانیان دەبردن‌و جارێکی تر هێسترو جارێکی تر مەڕو بزن بیانوشیان ئەوە بوو پێیان دەگوت تۆ جاشی سلێمان بەگی.

ئەوەی دیار بوو لە دوای ڕۆیشتنی سلێمان بەگ بۆ ڕواندز بنکەی چەکدارەکانی عباس ئاغا چووبوە ئەشکەفتەکانی گەڵی سەروی گوند، ئەوانەی لەو بنکەیە بوون کاروپیشەیان بەدکاری‌و بیانوو گرتن بوو بەو خەلکەی کەوتبوە ژێر دەستیان.

بنکەی چەکدارەکانی سلێمان بەگ لە جوندیان بوو، بەلاّم سەنگەرەکانی (زی تەلانی) ماویلیان هەتا دەگەیشتە (گۆمەویان) بەدەست سوپاوە بوون، سەربازەکان هەوڵیان دەدا بەسەر بکەونە سەربەرزایەکانی سەری (ڕووەڵە) بەلاّم نەیانتوانی بەسەر بکەون، چەکدارەکانی عباس ئاغا وایان دانابوو تا ماون دەرگەڵە بەجێ ناهێلن زیاتر ئیهانەی خەلکیان دەکردو ڕاویان دەنان، ئەزیەت دانیش باسی ناکرێت، ئەو دەنگ‌و باسەش دەگەیشتە سلێمان بەگ، ئەویش پەست دەبوو، بێگومان ئەو هەلوێستەی ئەوان باوکمیان زۆر ئالۆزو پەست کردبوو هەر ئەوەش هانی دا پەلاماریان بدات. شەوێك زۆر بەڕێکی هێرشێکی کت‌و پڕیان کردنە سەر هەر زوو ڕاویان نان‌و دەریان پەڕاندن تا گوندی ڕەژیکەریان‌و بەردەوامیش بەدوایانەوە بوون، چەند دیلێك گیران زۆر کەلوپەل‌و وولاّخیشیان بەجێهێشت، بۆ بەیانی ئاگادار کرام لەسەر ڕاسپاردەی باوکم بڕۆم فیشەکیان بۆ ببەم، ئێوارە درەنگ لە جندیان بەڕێ کەوتین بەڕێگای ماویلیان کەوتینە ڕێ چەند چەکدارێکیشم لەگەڵدا بوون سێ ولاّخی بارکراومان پێ بوون شەومان بەسەرداهات، بەلاّم چ شەوێکی تاریك کە قەت شەوی وام نەدیبوو بەو تاریکیە دۆڵی شیوی ماویلیمان بڕی لە (شینك) بەسەرکەوتین بەناو دارستانە چڕەکەی (پارزین)دا دەڕۆیشتین کاتێك گوێ بیستی دەنگە دەنگ‌و قسە بووین خۆمان بوارد بۆ ئەوەی بزانین ئەو دەنگانە کێن، بۆیان چووین بەدیارکەوت برین پێنج (هورمز) بوو ئەوەی لەگەڵ هێرش بەرەکان ناردرا بوو، دەگەڕایەوە ماویلیان چەند چەکدارێکیشی لەگەڵدا بوو، ناوبراو مرۆڤێکی زۆر باش بوو لە دیانەکانی عەنکاوە بوو لەکاتی بەیەك گەیشتن ئەوان پێیان گوتین بڕۆنە قوپەکەی زینی (سلێمان بەگ) لەوێیە، بەرەو شوێنی دیاریکراو ڕۆیشتین کاتێك گەیشتینە لای سلێمان بەگ تەواو پشومان نەدابوو هەرئەوندەمان زانی لە سەری ڕووەڵە بوو بەتەقەیەکی زۆر گەرم،هەستم کرد کە باوکم تەنگاو بوو وەك بلێیت

دەیویست خۆی بڕوات بۆ شوێنی تەقەکە، بەڵام نەمهێشت پێم گوت: دانیشە من دەڕۆم، لەگەڵ چەند چەکدارێك ملی هەورازمان گرتە بەر لە چیا سەرکەوتین ئەگەرچی زۆریش ماندوو هیلاك ببوین بەڵام زوو بەسەرکەوتین، باسكو باسك دەڕۆیشتین ناوە ناوەش دەگەیشتینە سەنگەرەکانی پاسەوانانی سەر باسکەکە، لە دوا لوتکەی چیای ڕووەڵە گەیشتینە عزەت لەگەڵ دەستەیەك لە چەکدارەکان لە شەڕێکی سەختدا بوون، شەوی دووەم دوای ئەوەی لە ڕووەڵە دەرکرابوون هەندێك لە چەکدارەکانی (مەلا عوسمانی پڵینگانی) گەڕابونەوە بەو نیازەی بەڵکو بتوانن هەندێ شوێن بگرنەوە، تەقەکە لەگەڵ ئەوان بوو، هێشتا کەمێك شەو مابوو هەرکە گەیشتمە لای عزەت تەواو پشومان نەخواردبوەوە بەووردی سەیری ئەو شوێنەمان کرد کە تەقەی لێوە دەکرا شوێنەکەم دەست نیشان کرد چەند کەسێکم هەڵبژارد بەگوێرەی نەخشەکە بۆیان دەرکەوتین لەگەڵ تاریكو ڕۆنی بەیانی لێمان دان بەماوەیەکی زۆر کورت دەرمان پەڕاندن، بەڵام چی دەرپەڕاندنێك، تا گوندی ڕەژیکەریان بەدوایان دا چووین، لەوێشەوە بێ وەستان تا (ئێندزە)و سەروتریش ڕانەوەستان، ئێمە هەندێکمان لەگەڵی خوارو گەڕاینەوە دەرگەڵە، لەسەر ڕێگا لامان دا ئەشکەوتی (کەرەنای) ئەشکەوتی ناوبراو کۆمەڵێك ماڵی لەناو دابوون، لەترسی فڕۆکەکان خۆیان شاردبۆوە، ماڵی خوشکم لەناو ئەو ئەشکەوتەدا بوو، کەمێك لە لایان دانیشتین، پرسیمان میر لەکوێ یە؟ پێیان گوتین لەگوند دەرنەچوە، لەوێ هەستاین بەرەو گوند سەرکەوتین چووینە ساباتی میر، میر لەوێ نەبوو، چووینە ناو کۆشکەکە ئەو ماڵە گەورەیە چۆڵ بوو، تەنیا (حەمایل) لە ژوورەکەی میر ئاگرێکی هەڵ کردبوو دووکەڵێك بوو ژوورەکـــە پـــڕ ببوو، پیرە نەن لەناو دووکەڵ دیار نەبوو کاتێك لەگەڵی دواین، ئێمەی نەناسین وای دەزانی بێگانەین ڕووی نەداینێ کاتێك پرسیمان باپیر لەکوییە؟ ئەوجا هەستا چاكو خۆشی لێ کردین، گوتی میر لەساباتێ نەبوو؟ ئەگەر لەوێ نەبێت دیارە لەسەر قەبرستانی پاش قەلاتێ یە، ڕۆیشتینە سەرقەبرستان لەوێش نەبوو لە دواییدا دیتمان لەناو چەقەڵە بەردەکانی قونەبانی خانوی (حاجی حمدامین) دانیشتبوو دەست لە ئەژنۆ ڕوو لە ڕەزەکانی (وارکورێشو ڕوەڵە) هیچ ئاگای لەئێمە نەبوو تا لە دواوە سەلاممان لێ کرد لەپڕێکا ئاوری دایەوە، لەسەرەتا هێدمەی گرت قسەی پێ نەکران، تەواو سەیری کردین چاوی پڕ بوون لە

ڕۆندك‌و هەندێك دەوکەی هاتنێ، دوایی گوتی: (زرار ئەوە ئەنگۆن!؟) بۆ دەستی چووم کاتێك لێی نزیك کەوتمەوە منی گرتە باوەش، بەڵام چی دەڵەرزی‌و دەیگوت: (نۆخەی ئەوا نەمردم ئەوجارەشم دیتنەوە وەك دەمویست!) ئەوکەسانەی لەگەڵم بوون یەك یەکی ماچ کردن هەمووومان لەدەوروبەری دانیشتین ورد تەماشای دەکردین، کاتێك (بەخدری عبدوللاّ)ی گوت: (خدر باوە: ئەو پیاوەی لای تۆ دانیشتوە ناینا‌سمەوە؟) خدر وەڵامی دایەوەو گوتی: (مامە ئەوە حمدامینی عەولاّ قوتوی ماویلیە). ئەوجا ڕووی کردە منو‌گوتی: (زرار ڕاستیم پێ بڵێ لەو هێرشەی هێناوتانە بۆ سەر پیاوەکانی عەباس ئاغا کەسی بێگانەتان لەگەڵە، غیری خۆتان؟) گوتم: (بابیر ئەبەد کەسی بێگانەمان لەگەڵ دانیە تەنیا دوو سەربازی لاسلکیمان لەگەڵن، ئەوانیش چەکیان پێ نییە، ئەوانی تر هەر خۆمانین کەسی ترمان لەگەڵ نییە).

میر گوتی: (هەمووتان چەند کەسن ئەوانەی بۆ ئەو هێرشە هاتوون‌و لەشکری عەباس ئاغاتان لەو بەرزاییانە دەرکرد؟) ئەو وەڵامە خدر دایەوە گوتی: (مامە هەمووومان چل‌و پێنج چەکدارین، ئەوانەی هێرشمان کردوە، کاك زراریش ئەو بەیانیە پێش ببێتە ڕۆژ گەیشتۆتە لامان)، میر هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: (ئەوە مینەکە نەمرد ئەو کەسەرەم نەبردە قەبری‌و ئە مرازەی هەمبوو بەدی هات ئەگەر لەوە بەدواش بمرم سورم لە خۆم نیە. بێگومان نەمانزانی ئەو کەسەرە چی بوو لە دڵی ئەو مرۆڤە ناودارە! تەنیا ئەوەمان شك برد(میرحمدامین بەگ) پیاوێکی مەرد بوو لە سەردەمی دەسەڵاتداریەتی سەری بۆ کەس دانەنەواندبوو، دیتیشی پیاوەکانی عباس ئاغا وا بەبەرچاوی ئەو خەڵکی گوندەکان تاڵان دەکەن‌و تێیان هەڵدەدەن، ئەویش هیچی لە دەست نایەت ئەوە کەسەرێکی گەورەو بارێکی زێدە گران بوو لە سەر شانی ئەو مەزنە پیاوە، ئەگەرچی عباس ئاغا زاواشی بوو دیسانیش هەر پێی ناخۆش بوو ئەوان لە گوندەکانی دەسەڵاتدار بن، کاتێك بەچاوی خۆیشی بینی بەژمارەیەکی کەمی چەکدارەکانی دەرگەڵەو ڕەژیکەری‌و کەڵێتەیی‌و ناوخەرابی‌و ماویلی چۆن ئەو لەشکرەی ناو سەنگەرەکانی سەربەرزاییەکانی ڕووەڵەیان ڕاونان‌و نەیانزانی بۆ کامەلا هەڵبێن.

لەوکاتەی لەلای میر دانیشتبوین دیار بوو کۆمەڵێك چەکدار لە(کانی داوەری) دەهاتنە خوارێ بۆ گوند، بەدیارکەوت کە باوکمە لەگەڵ کۆمەڵێك چەکدار دێتەوە گوند، بەمیرم گوت: (باپیر ئەوە باوکمە دێتە خوار)، لەگەڵ ئەو قسەیەی من میر داوای کرد یەك دوو کەس برۆن سابات پاك بکەنەوەو سەماوەریش هەڵبکەن، ئینجا میر هەستاو ئێمەش لەگەڵی رۆیشتینەوە سابات، دوای ماوەیەك باوکم گەیشتەجێ لەگەڵ میر لە سابات دانیشتین، ئێمە گشتمان رۆیشتینە خانوەکەی (مام سیدا ئاغا) دوای ماوەیەك باوکیشم هاتەوە لامان، نەمزانی بۆچی خۆی لە حمدامین (گچکە) زویر کردو دڵی شکاند ناوبراو ئەوەندەی بلێی پیاوێکی دڵپاكو پاك رەوشت بوو، دڵ رەنجانی ئەو پیاوەم پێ ناخۆش بوو هەر ئەوکاتە لە دەرگەڵە گەرامەوە رواندز، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە بەناحەق دڵشکاو کرا. مانەوەی ئەوان لە دەرگەڵە ئەوەندە رۆژانە نەدەبوو ئەوها غافڵ بن، بیریان لەوە نەکردبوەوە کە ئەو هێزەی ئەوان لە وێیان دەرکردوە هەوڵی گەرانەوە دەدەن بەهەر شێوەیەك بۆیان رێك بکەوێت. ئەوەی زاندرا لە رێگای شارەزاوە ئەوان زانیبویان (گەروی رەشماڵاَن) چۆڵەو نۆبەتداری لێ دانەندراوە لە رێگای بن کارۆخەوە زۆر بەئاسانی لە گەروی رەشماڵاَن بەسەرکەوتبوون، کاتێك چەکدارەکانی باوکم دەرۆنە پێشیان ئەوان شوێنە گرنگەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو،دەستیان لێ ستاند بوون، لەگەڵ ئەوەشدا شەرێکی دژوار لە ئارادا دەبێت، (عزەت) نامە بۆ قائمقام دەنێرێت فیشەکی بۆ رەوانە بکات، ناوبراویش فیشەك بەرێ دەکات بۆ (جوندیان) بۆ ئەوەی بۆیان بەرێ بکرێت، بەلاَم دوو رۆژی بەسەردا تێپەر دەبن فیشەکەکان هەر لە (جوندیان) دەبن بۆیان بەرێ ناکرێن، لەوکاتەشەدا پێیان راگەیاندم لە دەرگەڵە شەر گەرمەو داوای فیشەکیان کردووە فیشەکەکانیش لە (جوندیان) داندراون، تاکو ئێستا بۆیان رەوانە نەکراون، دیسان ناچار بووم رۆیشتم ناردم وولاَخیان هێنان فیشەکیان بارکردن رۆژ درەنگ بوو رۆیشتین، ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە ماویلیان دەنگی تەقە دەگەیشتە ئەوێ وا پێ دەچوو شەرەکە لە زینی دەرگەڵەو سەر شینکان گەرم بوو لەناو گوندی ماویلیان خەڵك دەیان دیت وا ئێمە بۆ ناو شەر دەرۆین رێگایان لێ گرتین دەیان گوت: (نابێ بچن درەنگە نەوەك بکەونە بۆسەی دوژمن)، بەلاَم من سور بووم لەسەر رۆیشتن، زۆری نەمابوو بەرێگای (بەردگراو)دا برۆین، بەلاَم پێش ئەوەی لە گوندەکە

دەربکەوین (عەولا ماویلی) لێپرسراوی گوندەکە هاتە پێشم دەستی گرتم‌و گوتی: (نایەڵم بەو ڕێگایەدا بڕۆن ئەگەر هەر دەشڕۆن بەڕێگای تەلان دا بڕۆن باشترەو ئەمین ترە).

لەسەر داوای ناوبراو بەڕێگای تەلان دا ڕۆیشتین، سەرکەوتینە سەر (زیی تەلانی)، تا بەسەر کەوتین تاریك داهات لەوێ باسك‌و باسك ڕۆیشتین زۆر بەوشیاری تەقەش کەم ببوو، ناوە ناوە لەزینی دەرگەڵە دەنگی تەقە دەهات ئێمە بەرەو (گۆمەویان) دەڕۆیشتین ئەوانەی تر کەلەگەڵم دابوون هەستم کرد دەترسان نەیان دەویست زیاتر بڕۆن، من لەگەڵ دوو چەکدار لە پێشەوە دەڕۆیشتم سێ هێستری بار کراویشمان پێ بوون، هێسترەکان خاوەنەکانیان لەگەڵ دا بوون، کاتێك نزیك کەوتینەوە لە گۆمەویان دەنگە دەنگی پیاوان دەهات، ڕاوەستاین گوێمان نەوەك دوژمن بن، خۆمان بواردو ئامادەبووین بۆ ڕووبەڕوو بونیان لە دواییدا وا بەدیارکەوت چەکدارەکانی ئێمەن، ئەوانەی کە خەڵکی ماویلیان بوون، کاتێك دەنگمان دان ئەوان دەنگی منیان ناسی، (فقێ گۆج‌و وەسمانی حەسەنی عباس)ی گوتیان ئەوە کاك زرارە ئەوکاتە بانگیان کردین‌و هاتنەلامان لەوێ دانیشتین باسی شەڕەکەیان بۆ گێڕاینەوە کە لەکوێ وە هێرشیان بۆ هێناوین، وام بۆ بەدیار کەوت دیارە بەبێ ترس لە دەرگەڵە پاڵیان داوەتەوە پاسەوانیان لە دەورو پشتیان داناون‌و بەس بەری (کارۆخ)و گەروی ڕەشماڵان کەسی لێ نەبوە، بێ شك لە گوندیش پیاوی خۆیان هەبوەو بەپێشیان کەوتوە بەبەری کاروخ دا هێناوینی‌و بەسەر کەوتونەتە گەروی (ڕەشماڵان‌و هەندرێن) بەیارمەتی شارەزا بەئاسانی پشتیان لێ ستاندون‌و هەر ئەوەندەیان بۆکراوە بەرگری لە خۆیان بکەن‌و بەپاشەکشە بگەڕێنەوە دواوە.

ئەنجامی ئەو کەمتەرخەمیەو بێ باکیە بووە هۆی کوشتنی (حمدامین گچکە) لە خوار گەرووی ڕەشماڵان، ئەوکات نەیانزانی بوو ڕۆژی دواتر زانرا کە (کچکە) کوژراوە.

لە دوای ئەو گفتوگۆیە بەنیاز بووین بڕۆینە گۆمەویان، بەلام لەم کاتەدا پێشڕەوی چەکدارەکان گەیشتە لامان، زۆری پێ نەچوو باوکم‌و(عزت)یش گەیشتن، دوای پشویەکی کورت هەستاین بەناو ڕەزەکانی تەلانی ماویلیان دا تێپەڕ بووین بەرەو گوندی (ماویلیان) کاتێك گەیشتینە نزیك گوند ئەوان بەتەنیشت گوند دا ڕۆیشتنە خوار، من لامدایە گوند لەوێ پێیان گوتین برین پێچێك‌و دوو چەکداری

تریشی لەگەڵن چاوەڕوانی ئێوەن وا لە ماڵی (محمدی شێخ)ی نوستوون، شەو درەنگ بوو ڕۆیشتمە ماڵی ناوبراو دیاربوو (هورمز)ی برین پێچو ئەوانەی لەگەڵی بوون پاڵیان دابوەوە، وایان دەزانی هیچ لەگۆڕێ نییە، بەپەلە هەڵمان ستاندن خۆیان پێچایەوە کەلو پەلەکانیان بارکردن بەرەو سەربازگەی بەرزێوە کەوتنەڕێ، شەوێکی ئەوەندە خۆش بوو مانگە شەوی بەهار بوو، مانگ لەژێر گەواڵە هەورەکان دەردەکەوتو بزر دەبوو بەدرەنگی شەو گەیشتینە گوندی (میراجیان) ئەوەی دیاربوو هەندێك لە چەکدارەکان لەوێ بوون، (علی عەجەم) یەکێك بوو لەوانەی دیار نەبوون ئەویش گەیشتبوە میراجیان، شەو لەوێ ماینەوە، بەیانی من گەڕامەوە ڕواندز ئەوانیش لە بەرزێوە مانەوە.

لەوکاتو ساتەی چەکدارەکانی دەرگەڵە تێی کەوتبوون لە شەڕیاندا لەگەڵ چەکدارەکانی عەباس ئاغا، لە حزبی شیوعی بڕیارێك دەرچوو بۆ ئەوانەی چەکیان بۆ دەوڵەت هەڵگرتبوو، دەبێ چەکەکانیان دابنێن ئەوەی چەك دانەنێت مافی حزبایەتی نامێنێت، بۆ ئەو مەبەستە (فاخیری حمدئاغا) ئەوکاتە بەنهێنی دەسوڕایەوە لەترسی بارزانی لەلایەكو حکومەتیش لەلایەکی تر، لەگەڵ ئەوەشدا هاتە ڕواندز بۆ لێکۆڵینەوە، بزانێ کێ بووە چەکی بەشیوعیەکانی دەرگەڵە هەڵگرتوە، وەك لەسەرەوە دیار کراوە (فاخیر) لە دوو لاوە بەدوایدا دەگەڕان ئەویش لە ڕواندز بەنهێنی لەماڵی من بوو زیاتر لە دە ڕۆژ، لە ماوەی ئەوەندە ڕۆژەدا بەشداری کۆبونەوەکانی ڕێکخراوی شاری ڕواندزی کرد، هەروەها لەگەڵ (عزت)ی برام بەیەك گەیشتن، لە دوای ئەوەی لەگەڵ لیژنەی قەزای ڕواندز گەیشتبوە باوەڕیەکی تەواو ئەو چەکەی شیوعیەکانی دەرگەڵە چۆن وەرگیراوەوکێ بەرپرسیارە، ئینجا داوای لە عزەت کرد کە چەك دابنێن چونکە بڕیاری حزبە.

وەڵامی عزت کە بەفاخیری گوت: (من پێم خۆش نەبوو ئەو چەکە وەرگیرا، بەڵام تووش کراین، وەرگرتنی ئەو چەکە بوە هۆی ئاوارە بوونمانو لە جێگای خۆمان هەستاین، هیچ شتێك شك نابەین ئێوە ڕێگایەکی ژیانمان بۆ دابین بکەن کە بتوانین پێی بژین زۆرمان پێ خۆشە چەکی برا کوژی هەڵ نەگرین، ئەگەر ئێوە بتوانن ئەو کۆمەڵە ماڵەی لە شوێنی خۆیان هەڵقەناون بیان ژێنن، ئێمە ڕازین چەك دابنێین

خودا بکات ئێوە بمان ژێنن زۆرمان پێ خۆشە ئەو چەکە گلاوە فرێ بدەین کە باوەڕمان پێی نییە).

وەلامی فاخیر ئەوە بوو: (حزب توانای ئەوەی نییە ئەوحەفتا ماڵەی هاتوون بۆ ڕواندز بیان ژێنێت، با کار بکەن خۆیان بژێنن وەك ئەو خەڵکە).

ئەوانەی لەگەڵ عزەت بوون بەشدار بوون لەوبەیەك گەیشتنەی عزەتو فاخیر (حمدامین فقێ حسنو خدری عولا بەگ) کەوتنە قسەکردنو بەفاخیریان گوت: (ئەوەی تۆ دەیڵێیت هەڵوێست نیە بۆ ئێمە زۆر زەحمەتەو ناگونجێت، ئەگەر عزەتیش ڕازی بێت بۆچەك دانان ئێمە ڕازی نابین، زۆربەی چەکدارەکانی تریش ڕازی نابن بەوشێوەی ئێوە دەتانەوێ، ئەو چەکە ئێوە بەئێمەتان هەڵگرتوە ئێمەتان توشی ئەو نەدامەتیە کردوە نەك هێزی چەکداری جولانەوەکە، بوینە نەیاری خزمەکانی خۆشمان). ئەو هەڵوێستەی عزەتو یـاوەرەکانی فاخیری بێ دەنگ کرد هەر ئەوەندەی پێمان گوتی: (ئەوەی بەمن ڕاسپێردرابوو ئەوەیە کە بڕیاری حزبتان پێ ڕابگەیەنم ئەوەی تر ئارەزووی خۆتانە). وەك لەسەرەوە هاتوە فاخیر ماوەیەك لە ڕواندز ماوە، لە مانەوەکەیدا هەندێ ئالوگۆڕی لە ڕێکخراوی حزبی شیوعی لە ڕواندز بەدی هاتبوو، دەستکاریش لە لیژنەی قەزا کرابوو، ڕێکخراو لەپەرەسەندندا بوو ئەو گورجو گۆڵیو چالاکیە ببوە نارەزامەندی کاربەدەستانی حکومەت، ئەوەی بەدیارکەوت ئەوە بوو ئەوانەی ناسراو بوون بەشیوعی کادیرو لەوەزیفە دابوون هەریەکەی بۆ لایەك بەڕێ کران، لە ڕواندز دوورکرانەوە (حەسن حاجی تاهیر) ڕەوانەی بەغدا کرا، (سید عمر) بۆ مەخمور بەڕێ کرا، (شێخ سلێمان) ناردرا بۆ سلێمانی، وایان دەزانی ئەگەر ئەوان دوور بخەنەوە دەنگی شیوعیەکان دەبڕن، بەلام بەپێچەوانەوە بوو،دووا بەدووای بەدکاریو ناپەسندی مرۆڤە داخ لەدڵەکانی دەوڵەت کۆمەلانی خەڵك زۆر لە جاران گەرمتر کەوتنە جموجۆڵو دەستو برد، بەڵگەش ئەوەبوو شەوێك شاری ڕواندز یەك پارچە پڕکرا لەدروشمەکانی حزبی شیوعی ئەو دروشمانە داواکاریو خواستەکانی گەل بوون کەنوسرابوو، هەروەها لەسەر شوێنە جەماوەریەکانیش دروشم هەڵواسرابوون، بەشی زۆری ماڵەکانی ڕواندز دروشمەکانیان بۆ فرێدرا بوە ماڵ لە ناو زەرفدا، ئەو دەنگە هەر بۆ شەقامەکان نەبوو، بەڵکو لەگشت ماڵێك دروشمەکان دەخوێندرانەوەو باسیان دەکرا، ئەو چالاکیە سەری لە کاربەدەستانی دەوڵەت شێواند بوو بەتایبەتی

ئەوانەی دەیان گوت: شیوعی لە ڕواندز نەماون، بەلاّم ئەو کردارەی جەماوەر بەکردەوە بەدیارکەوت لەئەنجامی ئەو چالاکیە سەرکەوتوەدا دوو قوتابی چالاکی دواناوەندیمان گیران (هیوا سید ئەحمەد، محمد عبدالله سلێمان) بەلاّم ئەوەی جێگای ڕەزامەندی بوو تواندرا لەڕێگای کەسانی هەست بەرز پشتگیریمان بکرێو زوو بەردران.

خەڵکی ڕواندز بەگشتی سەریان سوڕما بوو لەبەرئەوەی پێش ئەو چالاکیە پیاوانی ئەمنو داروودەستەی حکومەت پڕوپاگەندەیان بلاّو دەکردەوە کە شیوعی نەماونو توانای هیچیان نەماوە، بەلاّم ئەوەی ئەو شەوە لە ڕواندز کراو ئەنجامدرا لەپێشان ڕواندز شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو، ئەوەی ئەو شەوە کرا بەخەیاڵی کاربەدەستانی حکومڕان نەدەهات کە شتی وا لە ڕواندز ڕوویدات، بەلاّم کە ئەوەیان بینی خۆیان دانیان بەوەدانا کە جەماوەری ئەو شارە بەگشتی لەگەڵ شیوعیەکانە، ئەگەر وانەبێ ئەمەی کە کراوە پێیان نەدەکرا، هەرلەبەر ئەوەش بوو نەیانتوانی کەس بگرن.

پێویستە ئەوەش بڵێین ئەو چالاکیە لە دوای لادانی لیژنەی قەزاو دورخستنەوەی ئەو بردەرانە بوو کەناویان لەسەرەوە نوسراوە، لەو ئاڵوگۆڕەی لە لیژنە کرا تەنیا منو (حسێنی حاجی تاهیر) مابووین، حسێن بەند بوو لە هەولێر، لیژنەیەکی نوێ پێکهاتبوو ئەوانو لیژنەی شار بەیارمەتی جەماوەر ئەو کارەیان ئەنجامدا.

## نامەی مەلامستەفا بۆ
## عزیز محمد سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی عێراق

لەشەڕو پێکداچونی بارزانیو حکومەت دەنگو باس هەبوو حکومەت هێزێکی زۆری بەڕێ کردبووە سەر بارزان بۆ لێدانی هێزی بەرگری بارزانی، ئەو هێزە بارزانی خۆی سەرپەرشتی دەکرد، لەوکاتانەشدا ڕاگەیەندرا کە (محمد خالد)ی برازایو کوڕی شێخ ئەحمەد چەکی لەحکومەت وەرگرتوە، چەك وەرگرتنی (محمد خالد)و بەڕێ کردنی هێزێکی زۆری سوپاو جاش (مەلامستەفا)ی تەنگاو کردبوو، ئەو ئاڵۆزیو تەنگاویە وای لێکردبوو نامەیەك ئاراستەی (عزیز محمد) بکات لە ڕێگای (حوسێنی حمدئاغا)ی مێرگەسۆری، ناوبراو نامەکەی بەیەکێ لە ئامۆزایەکانی خۆی (عبدالله سوڵتان ئاغا) دەنێرێتە ڕواندز بۆ ئەوەی ڕێکخراوی حزب ئەو نامەیە بۆ (عزیز محمد) بنێرێت، ئەوەی نامەی پێ ناردرابوو وا تێگەیەندرا بووکە نامەکە بداتە زراری سلێمان بەگ، ئەوەی سەیرە هەڵگری نامە من ناناسێت منیش ئەو ناناسم، ئێوارەیەکی درەنگ لە دوکانی (حاجی کریم قاسم) دانیشتبوم لەوەدەمەدا پیاوێك هاتە بەردەرگای دوکان زۆر بەووردی سەیری منی دەکرد منیش لەوێ هەستام ڕۆیشتمە مەخزەنی (ئەسعەدی حاجی پەری) پیاوەکە بەدوامدا هات، هەر جێگایەکی بۆی دەچوم ئەویش بەدوامدا دەهات، ئەوکاتە تەراو گەیشتمە ئەو باوەڕە کەئەو کەسە کارێکی لەگەڵ من هەیە، بەڵام دیار نەبوو ئاخۆ ئەوکەسە چی دەوێت؟! هەستم کرد ئەوکەسە چاودێری من دەکات بەڕاستم زانی بڕۆمەوە ماڵ، کاتێك هەستام بڕۆم بەقاڵدرمەکاندا ڕۆیشتمە خوارەوە سەیرم کرد ئەوە بەدوامدا دێت تەواو بۆم دەرکەوت ئەو پیاوە نیازی باش نیە، کاتێك لە قالدرمەکان دەرباز بووم لامدا کۆڵانێكو دەمدیت ئەویش بەپەلە بەدوامدا دێت ئیتر زانیم خۆڕایی نیە ئەوجا بیرم کردەوەو گوتم تا ئەو دەستی نەوەشاندوە بامن دەستی خۆم پێش بخەم، دەمانچەکەم سوارکرد، هات بگاتە لام یەکسەر پێم گوت: کابرا بوەستەو دەست هەڵبڕە ئەگینا دەتکوژم. لەگەڵ دەنگدانی من پیاوەکە یەکسەر دەستەکانی بەرز کردنەوەو گوتی: (کاك زرار من پیاو خراپ نیم ناردراوم بۆ لای تۆ من ئامۆزای

فاخیم)، لەوەدەمەشدا دوو چەکداری ئێمە هاتنە خوارو پێم گوتن: (ئەو پیاوە بەن بۆلای خلیل برازای حمدئاغا ئەگەر بیناسێت بەجێی بێڵن، ئەگەر نەشی ناسی بیهێننەوە بۆماڵ بۆئەوەی بزانین ئەو پیاوە چی دەوێت ؟) خلیل ئەوکاتە قوتابی بوو لە دواناوەندی رواندز، کابرایان برد بۆلای خلیل زۆری پێ نەچوو چەکدارەکان

هاتنەوە لام گوتیان خلیل ئەو پیاوەی ناسیو گوتی: (ئێوە بڕۆن خۆم دەیهێنمو دێم ئەوکاتە دەزانی ئەو پیاوە کێیەو بۆچی هاتووە!) کاتێك خلیل هات پیاوەکەی لەگەڵدا بوو، دەرچوو (عبداللەی برای خلیل)ە ناوی بە(چەپایف) دەبردرێتو شیوعیە لەڕێکخراوی مێرگەسۆر، ناردبوویان ئەو نامەیەی (مەلامستەفا) بۆ(عزیز محمد)ی ناردبوو بگەیەنێو پێیان گوتبوو دەبێ نامەکە بدەیتە دەستی زرار، ئەویش هەوڵی دابوو گوایا بەنەهێنی لەگەڵ من قسە بکات منیش ئەوم نەدەناسی، ئەویش بەشێوەیەکی گومان بۆم هات زۆری نەمابوو بیکوژم، چونکە من بەبەردەوامی خۆم دەپاراست لە نەیارانو دوژمنان، ئەو نامەیەی عبدالله هێنابوی بۆ (عزیز محمد) بەڕێ ی بکەین نامەیەکی (حوسێن)ی لەگەڵدا بوو بۆ منی نوسیبوو، داوای کردبوو نامە ناردراوەکە بەپەلە بنێرم بۆ هەولێر بەڵکو ئەوانیش زوو بیگەیننە جێگای خۆی بۆیە پێویستە پەلەی لێ بکرێت. بێگومان ئەو شەوەمان بۆ ڕێکنەکەوت نامەکە ڕەوانە بکەین لەبەرئەوەی شەو ڕێگا نەدەدرا ئۆتۆمبێل بڕۆن بۆ هەولێر، بەیانی زوو شوفێری تایبەتیمان (مستەفا ئارەب) بەڕێ کردو نامەکەی برد بۆ شوێنی دیاریکراو لە هەولێر.

## چاوپێکەوتنی مامەند مەسیح شێروانی لەجندیان

لە هاوینی (١٩٦٢) بەڕێکەوت ڕۆژێك لەسەر ئاوی جوندیان چاوم بە(مامەند شێروانی) کەوت چەند چەکدارێکی لەگەڵدا بوون، لەدوای چاکو چۆنیو لەیەکتر پرسین، لە مامەندم پرسی: (وا دیارە تۆش دڵشکاوی خێرە انشاالله؟) مامەند گوتی: (زرار ئێوە ئەوەندەی ئێمە شارەزای ماڵی شێخەکانی ئێمە نین (....)، چونکە گوێ لە پیاوی ڕاست ناگرن). ناوبراو دەستی کرد بەگلەیی لە ئێمە، بەتایبەتی لە باوکم گوتی: (ئەوە مانگێکە بەڵکو زیاتریشە لێرە کەوتوم بابت ئەوەندە بێرەدا

تێپەڕ دەبێت، ڕۆژێك ئاورێکی لای ئێمە نەداوەتەوە، بلێت با سەرێکی لەو ئاوارەو لێ قەوماوانە بدەم بزانی بۆ لە جوندیان کەوتون؟ هەر نەبێت کۆنە دۆستینو ماوەیەکی زۆر لە غەریبایەتی بەیەکەوە ژیاوین منیش دلم پێ خۆش دەبێت، بەلکو یارمەتیشم بدات بۆ بەردانی مندالەکانم).

لەگەڕانەوەم لام دایەکاولۆك لای باوکم باسی ئەو چاوپێکەوتنەی (مامند)م بۆ گێڕایەوە، گوتم زۆر بەگلەییە، حەقیەتی دەبوا سەردانێکمان بکردبایە، وا دیارە مندالەکانی لە موصلّ بەندن. باوکم گوتی: (مامند ئەوەندەی بلێیت پیاوێکی مەردو ئازایە، بەلام بۆ حالی خۆی نەزانە، دەبێ برۆم سەردانی بکەمو یارمەتیشی بدەم بۆ بەردانی مندالەکانیو پێویستیەکانیشی بەپێی توانا بۆ دابین بکەم، وا بەدیارکەوت لە دوای دوو سێ ڕۆژ باوکم ڕۆیشتبوە لای مامند لە نزیك سەروچاوەی ئاوی جوندیان، لەو بەیەك گەیشتنە (سلێمان بەگ) بەلێنی پێدا بوو لەگەلّ خۆی بیبات بۆ هەولێر بۆ لای متەسەریف (بەدرەدین عەلی) بەلکو چارەیەك بۆ مندالەکانی بدۆزێتەوە لە بەندیخانە ئازاد بکرێن.

ئەوەی بەدیارکەوت لە دوای شەڕێکی دژوارو خوێناوی (مەلا مستەفا) ناچار کرا بارزان بەجێ بهێلێت بەرەو بالەکایەتی بچێت، لەڕێگای سەری بەردی توشی کاروانێکی صۆفیەکانی برادۆست دەبنو لێیان دەدەنو چەکەکانیان لە کوژراوەکان کردبۆوەو بەجێیان هێشتبوون، لە دوای دوو ڕۆژ لە تەنگەبەری (بەرسیرین) لە ڕووبار پەڕیبونەوە، بەڕێگای ڕەزەکانی تەلانی ماویلیان دا سەرکەوتبوون بۆ (گۆمەویان)و بەبەستی (شەمێ)دا ڕۆیشتبوونە دەرگەلە، (مەلامستەفا) لای دابوە لای (میر حمدامین) ئامۆزای سلێمان بەگ، لەکاتی قسەکانی لەگەلّ میرحمدامین دیارە زۆر بەناشیرنی دەربارەی منو باوکم دوا بوو، دیارە میر زۆر بەگلەیی بوو لێی دەیگوت، نەدەبوو هەلۆیستی پیاوێکی وامەزن بەو شێوەیە بێت (...).

لەدەرگەلە ڕۆیشتبوونە ناوچەی بالەك لە مەلبەندی (شیوەزور) لە گوندەکانی (ڕایاتو زینوەو خەلان) مابوونەوە، پیاوەکانی بەشداری هەولدانی گرتنی قشلەی ڕایاتیان دەکرد ماوەیەك پێوە بوون نەیان توانی بیگرن. بەهاتنی (مەلا مستەفا) بۆ بالەکایەتی دیارە پیاوەکانی عەباس باوەشیان خۆشتر بور لە نوێوە کەوتنەوە ڕاوە ڕووتو ئەزیەت دانی خەلکی گوندەکان، دەنگی ئەو نارێکیو ناسازیە ڕۆژ بەڕۆژ

دەگەیشتە سلێمان بەگ، کردەوە ناپەسندەکانی پیاوەکانی کاك عباس دیار بوو (سلێمان بەگ)یان زۆر ئالۆزو پەست کردبوو ئەگەر بەئارەزوی ئەو بوایە زۆر زوو بەسەریاندا دەدان، ئەو دەنگو باسەی دەگەیشت زیاد لە پێویست سلێمان بەگی پەست کردبوو، لەزارگۆتەی (وەهاب ئاغا)، عەباس ئاغا لەدەربەند بەمەلا مستەفای گۆتبوو زیاتر لە هەزار چەکدارم لە دەوروبەری دەرگەڵە داناوە، هەر چوار دەوری ئەوێم پەرژین کردوە، پیاوم دەوێ بەگەرووی زینی دەرگەڵەدا سەر بکەوێت. ئەوەی شایانی باسە ئەو قسانەی ناوبراو سلێمان بەگی هاندا هێرشێکی تر بکاتە سەر پیاوەکانی کاك عباس لە دەوروبەری دەرگەڵە.

ئەوەی زاندرا حکومەت وەهاب ئاغای ناردبوە لای (مەلامستەفا) بۆ ڕێ ڕۆنی، لە گەڕانەوەی لە زمانی وەهاب بیستراوە لەو کاتەی لە دەربەند لەگەڵ مەلامستەفا دانیشتون، ناوبراو بەعەباس ئاغای گوتوە: (من سلێمانە چەل دەناسم هەرکاتێ هاتەسەری لە هیچ پەرژین‌و شورە ناوەستێ، ئەگەر چی خزمی تۆیە، بەلاّم من باشتری دەناسم). لەدوای ئەو دەنگو باسەی گەیشتبوون شەوێك چەکدارەکانی سلێمان بەگ لەڕێگای چیای هەندرێن هێرشێکی کتووپڕیان کردە سەر سەنگەرەکانی بەری هەندرێن، بەیانی لە نائاگا زوو لێیان درا هەر زوو لەسەنگەرەکانیان دەرپەڕێندرابوون‌و دەستیان بەسەر سەنگەرەکانیان داگرتبوون، یەك دووێك کوژرا بوون، ئەوانی تریش وەك لە ڕێگای جارەکانی پێشان ڕایان کردبوو، ئەوانی بەری ڕوەڵەش سەنگەرەکانیان بەجێ هێشتبوون، چەکدارەکانی سلێمان بەگ هەتا سەری (بەستە ڕێواس) لە دوایان چووبوون، ئەو شوێنەی بەسەر دەرگەڵەدا دەڕوانێت، دوای نیوەڕۆ دەبینن چەکدارەکانی (حمد ئاغای مێرگەسۆری) خۆیشی لەگەڵیان بوو بەرەو زینی دەرگەڵە دەڕۆن بەنیازی شوێنی شکاوە ڕاکردوەکان، هەرئەوکاتە عزەت بەخزمەکانی دەڵێت: (ڕاوەستن زیاتر مەڕۆن تازە شەڕ ناکەین وادیارە پیاوەکانی عباس ئاغا نەماون ئەوانەی کە دێن وا دیارە پیاوەکانی حمدئاغای مێرگەسۆرین، ئێمە شەڕی ئەوان ناکەین)، عزەت دەگەڕێتەوە سەر زینی دەرگەڵە بەلاسلکی قسە لەگەڵ باوکیدا دەکات پێی دەڵێ: (ئاکۆ شکان و ڕایان کرد لاشەکانیان بەجێ ماون، وادیارە پیاوەکانی حمدئاغای مێرگەسۆری بەرەو زینی دەرگەڵە دێن من نامەوێ

شەڕی ئەوان بکەم بۆیە بەسوپا ڕابگەیەنە ئەگەر بیانەوێت بێنە ئەو شوێنەی ئێمە گرتومانە ئەوا دەمێنین تا سوپا دەگاتە لامان ئەگینا وا ئەگەڕێینەوە).

باوکم قسەکانی عزەتی بەئامر لیوا ڕاگەیاندبوو کە ئەگەر بیانەوێ بەسەر بکەونە سەر هەندرێن ڕێگا کراوەیەو بۆئەو شوێنەی گرتومانە ئەگەر نێن ئێمە دەگەڕێینەوە، دیار بوو سوپایان نەنارد عزەتو چەکدارەکانی ئاگادارکران بگەڕێنەوە، لەو هێرشە(لاوکۆی کوڕی مامەند)یش لەگەڵ یەك دوو چەکدار بەشداریان کرد، بۆ ئێوارە گەڕانەوە بەرزێوە. ئەو ڕۆژەی ئەوان هێرشیان بردە سەر سەنگەرەکانی گەروی زینی دەرگەڵە من لەگەڵ باوکم چووم سەربازگەی بەرزێوە، ئەو ڕۆژە بەدرێژایی ڕۆژ لەوێ ماینەوە تا ئەو کاتەی چەکدارەکان گەیشتنەوە سەربازگەکە، لەوماوەیەدا لەگەڵ مقدم لیوا (تۆفیق موختار) کە ئەفسەرێکی موسڵاوی بوو کەوتینە ئاخاوتن بیرو ڕایەکانی زۆر لێوەشاوە بوون دەربارەی ئەو شەڕەی لەگەڵ کورد دەکرێت ناوبراو گوتی: (شەڕی ئازادیخوازی بەزبرو زەنگ کۆتایی نایەت دەبێ هەموومان لەو ڕاستیە تێبگەین‌و بزانین، چارەسەری ئەو شەڕە تەنها بەجێ بەجێ کردنی داواکاریەکانی نەتەوەی کورد دەبێت نەك بەشەڕ، دەبێ لەڕێگای لەیەك گەیشتن‌و خواستەکانی نەتەوەی کوردەوە بێت ئەگینا ئەو تەنگ‌وچەڵەمەیە درێژە دەکێشێ‌و خەڵکێکی زۆر لەو پێناوەدا بەلاش دەکوژرێن ئەو زیانەش بەهەردوو نەتەوەی کوردو عەرەب دەگات).

هەرئەو ڕۆژەش لەگەڵ ئەفسەرێکی تر بەناوی (ڕەئیس ئەحمەد خەلەف) کەوتمە قسەکردن، هەستم کرد ئەفسەری ناوبراویش شیوعی بوو پرسی: (زانیومە تۆو باوکت لەگەڵ مەلامستەفا ڕۆیشتبونە یەکێتی سۆڤیەت، ئێستا وا دەبینم لە دژی وەستاوی لەبەرچی؟ گوتم: (هەر لە سۆڤیەت ناکۆکی لە نێوان مەلامستەفاو باوکم پەیدا ببوو ئەو ناکۆکیە هەرماوە تا ئێستاش، لە کاتێکا جوڵانەوەی کورد دەستی پێکرد لە سەرەتاوە دەرەبەگە بریندارەکان پێشڕەو بوون ئێمەش لایەنگری شیوعی بووین نەمانویست شوێنەکانمان بکەوێتە ژێردەستی ئەوان بەڕەزامەندی لیژنەی قەزای حزبی شیوعی باوکم چەکی لە حکومەت وەرگرتوەو نایەوێ بگەڕێتەوە ژێر فەرمانی مەلامستەفا، بەڵام دەربارەی من بێگومان ئازادی ڕاستەقینەی کوردستان‌و سەربەستی نەتەوەی کورد ئامانجی منەو بەهیوای ئەو ئامانجەش لەگەڵ مەلامستەفا

ڕۆیشتمە سۆڤیەت کاتێك باوەڕم گۆڕا، بەڵام ئامانجم نەگۆڕاو باوەڕم بەخەباتی کوردایەتی هەیە تا دەمێنم، ئێستاش چەك هەڵگرنیم تەنها لەگەڵ باوکم هاتووم بەس). رئیس ئەحمەد خلف گوتی: (ئێوە چەند کەس بوون کە چوونە سۆڤیەتو چەند ساڵ لەوێ مانەوە؟)

وەڵام: ئێمە کە ڕۆیشتین بۆ سۆڤیەت (٥٢٥) چەکدار بووین، بەڵام (٥٠٩) کەس گەیشتینە سۆڤیەت، وە زیاتر لە دوازدە ساڵ لەوێ ماینەوە. ڕەئیس ئەحمەد خەلەف گوتی: (باشە وڵاتی سۆڤیەت کوردی زۆر لێیە بۆچی مافی ئۆتۆنۆمیان پێ نەدراوە وەك نەتەوەکانی تر؟) وەڵام: (ئەوەی من بیزانم لە سۆڤیەت دەربارەی مافی ئۆتۆنۆمی یاسایەك هەیە دەڵێت هەرنەتەوەیەك سەر ژمێری لە ملیۆن کەس کەمتر بێتو شوێنی نیشتەجێی هی خۆی نەبێت مافی ئۆتۆنۆمی نیە، ئەو دوو خاڵەش کورد نیەتی، چونکە سەر ژمێری لە ملیۆنێك کەمترە لە سۆڤیەت، ئەو زەویەشی لەسەری نیشتەجێنە زەوی ئەرمەنستانە، کورد لە سۆڤیەت زۆرن، بەڵام بڵاون لە تورکمەنستانو ئازربیجانو گورجستانو ئەرمەنستان دەژین، بەگوێرەی زانیاریەکان وا دیارە کوردەکان بەفەرمانی شایەکانی ئێران لە کوردستان ڕاگوێزراون، ئەوانەی قەفقاس لە دەستی تورك ڕایان کردوەو لەوێ نیشتەجێ بوون، ئەوانی تورکمەنستانو ئەفغانستان بەفەرمانی شایەکانی ئێران ڕاگوێزراون وەکو لەسەرەوە باسم کرد، سەردەمێك دەنگێك هەبوو گوایا هەموویان لە شوێنێك کۆ دەکرێنەوە بۆ ئەوەی بیانکەن بەئۆتۆنۆمی، لە بارەی ڕۆشنبیریو خوێندنو دەستەڵاتی ناوخۆیان کە پێیاندراوە وەك پێویست خاوەنی ڕۆژنامەو ڕادیۆن بەزمانی کوردی، وە لەبارەی خوێندنیش ڕێگایان پێ دراوە تا بەرزترین پلە دەتوانن بخوێنن). لەوکاتەی لەگەڵ ئەو ئەفسەرە دەدوام هەستم کرد مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر بوو زۆر دڵتەنگو ئاڵۆز بوو بەو شەڕەی لەگەڵ کورد دەکرا، زۆریش بەپەرۆش بوو بەوەی چۆن دەبێ کورد چەك هەڵگرێت لەدژی کوردو یەکتر بکوژن بۆ بەرژەوەندی خوێنڕێژانی شەڕخواز. ئارەزوم بوو لەگەڵ ئەو ئەفسەرە هەست بەرزە پێشکەوتنخوازە زیاتر بدوێم، بەڵام بانگ کرام بڕۆین بۆ گەڕانەوە بۆ ڕواندز لەوکاتەش عزەتو چەکدارەکانی گەیشتبونە میراجیان نزیك سەربازگەی بەرزێوە.

لەدوای ئەو هێرشەی کرایە سەر چەکدارەکانی (عباس ئاغا) دوای چەند رۆژێك (سلێمان بەگ) رۆیشتبوە هەولێر لە سەر داوای متەسەریف (بەدرەدین علی) ناوبراو بەباوکمی گوتبوو زرار بنێرە با بێتە لام دەیگێرینەوە سەر وەزیفەی خۆی، زۆری پێ نەچوو وارێك کەوت لەگەڵ باوکم رۆیشتمە هەولێر رۆژی دووەم چوینە لای (بەدرەدین) لەگەڵ بابم‌و عزەت لە دوای کەمێك گفتوگۆ بەدرەدین نامەیەکی بۆ نوسیم بۆ وەزیری مەعاریف، رۆیشتمە بەغدا بۆ لای وەزیر (ئیسماعیل عارف) بۆ رۆژی دوایی لە بەغدا چوومە لای وەزیر ئەویش ناردمی بۆ ئەمنی گشتی بۆ ئەوەی کتابم بدەنێ بزانن چیم لەسەرە یان نا؟ دوو رۆژ چاوەروانی کتاب بووم رۆژی سێ یەم بەدرەنگەوە پێیان گوتم برۆوە وەزارەت لەوێ کارەکەت جێ بەجێ دەکرێت، ئینجا لە وەزارەت پێیان گوتم برۆوە هەولێر ئەوراقەکانت دێنەوە ئەوێ‌و لە هەولێر داوا بکە، منیش بەناچاری گەرامەوەو هیچم دەست نەکەوت‌و ئەنجامیشی نەبوو. لەدوای ماوەیەك وارێك کەوت جارێکی تر لەگەڵ باوکم رۆیشتمەوە هەولێر لەسەر داوای متەسەریف لە کاتێکا چووبوینە لای بەدرەدین ناوبراو گوتی: (زرار تۆ دەگەرێیەوە وەزیفەکەت بەمەرجێك گوێ رایەڵی باوکت بیت‌و یارمەتیدەری باوکت‌و عزەت بێت، ئەوان چیت پێ دەڵێن بۆ تۆیانە، ئەوان چی دەکەن لەگەڵیان بە، ئەگەر وەك ئەوان بیت تۆ حەقت نەبێت دوو مەعاشت پێ دەدەم مەعاشی مامۆستایەتی‌و ئەوەندەی تریش لەگەڵ ئەوان وەری دەگری). قسەکانی ئەو پیاوە تەواو نیگەرانی کردم، زۆر پەست بووم، بەلاّم لەبەر رێزی باوکم بێ دەنگ بووم، لەدوای چەند دەقیقەیەك سەری هەڵبری‌و گوتی: (برۆ لای معاون سەرای، دوایی برۆ تەربیە ئیزبارەت بێنەو وەرەوە لام). رۆیشتمەلای معاون سەرای باوکم‌و عزەت لای ئەو مانەوە کاتێك چوومە ژووری معاونەکە دیار بوو پیاوێکی عەرەب بوو گوتی: فەرموو دانیشە، کەمێك چاوەروان بووم لە دواییدا پرسی: ناوی خۆت‌و باب‌و باپیرت بڵێ؟ ناوەکانم پێ گوتن ئەوکات معاونەکە خەریکی نوسینێك بوو لە دواییدا کاغەزێکی دایە دەستم‌و گوتی: ئەوە ئیمزا بکە! کاغەزەکەم وەرگرت کاتێ خوێندمەوە دەبینم بروسکەیە بۆ (عبدالکریم قاسم) لە نوسینەکەی بروسکەکە شتی زۆر پرووپوچ‌و بێزێز دژی (مەلامستەفا) نوسرابوو لەدوای تەواو بوونی خوێندنەوەم رووم لە معاون کردو گوتم: (من ئەوەم لەبەرچاوی ئێوە نەرۆیشتومەتە ریزی چەکدارەکانی دەرەوە بەمانای ئەوەی لەگەڵ

ئەوان نیم ئەو بروسکەیە مانای چیە؟) معاونەکە زۆر لەسەرخۆ گوتی: (ئەو کلێشەیەو دوعای پێش نوێژە، ئەوەی نەیڵێت نوێژی بەرناکەوێت،تۆش بەکەیفی خۆت بەئەگەر بتەوێت نوێژت بەریکەوێ ئیمزای بکە ئەگەر ناش ئارەزوی خۆتە!) پێم گوت: (کەوا بێت ئەو نوێژە ناکەم خواحافیز)، ڕۆیشتمە دەرەوەو چوومەوە میوانخانە لەوێ پاڵم دایەوە تا باوکمو عزەت گەڕانەوە دیتیان من نوستبووم کاتێك هەستامەوە پرسیان بۆچی نەهاتویتەوە لامان بەدرەدین چاوەڕێت بوو؟ پێم گوتن: (ئەو بێ ڕێزانە ئەوەندە پیاو نین بەبێ مەرج کارێکت بۆ بکەن! داوایان لێکردم بروسکەیەك بنوسم دژی جولانەوەی ئەیلولو مەلامستەفا قسەی بێ ڕێزو ناشیرینی تێدا بنوسم ووشە بێ ڕێزەکان ئاراستە بوون بۆ مەلامستەفا جا چۆن بەوە ڕازی دەبم، بۆیە وازم لێ هێنلو هاتمەوە). بابم گوتی: (نەدەبوایە واز بێنی بروسکەیەکت بکردباو بۆ ئەوەی بتگێڕنەوە وەزیفە، وا ڕۆژێ هەزاران بروسکە لە دژی مەلامستەفا لێ دەدرێتو جنێوی پێ دەدەن!) گوتم: (بابەنوسینی بروسکە بەو جۆرەی ئەوان داوای دەکەن بۆ مرۆڤی ئەوها دەبێتە سوکایەتیو شکان بۆ خۆمان، ناکۆکی ئێمە لەگەڵ مەلامستەفا مانای ئەوە نیە ڕێگا بەدوژمنانی کورد بدرێت بمان شکێنن)، وام هەست کرد باوکم لە قسەکانی من ڕازی نەبوو گوتی: (کەیفی خۆتە لەوە بەدواوە حەقمان لێت نیە). بەلاّم عزەت گوتی: (چاکت کرد بروسکەت نەکردوە گوێی مەدێ). شەو ڕۆیشتمە ماڵی برادەرێك کەناوی (عزیز زینوەیی) بوو لەوێ لەگەڵ (فاخیری حمدئاغای مێرگەسۆری) بەیەك گەیشتین ئەوکاتانە ناوبراو بەنهێنی دەسوڕایەوەو کاری دەکرد، لە دوای لێکۆڵینەوەی هەندێ گیرگرفتی ڕێکخراوی حزب لە ڕواندز ناوبراو گوتی: (هاوڕێ بەریدێکی زۆرتان لێرەیە بەڵکو بتوانی بەچەکدارەکاندا بەڕێی بکەیتەوە ئەگەر لەڕێی ئەوانەوە نەبێت زۆرە دەرباز نابێت). هەر ئەوکاتە دوو بەدوو دەستمان کرد بەئامادەکردنی شتەکان تەواو دووکارتۆن بوون لە کتێبو ڕۆژنامەو بەیاناتو شتی تریش، بەیانی زوو پێش باوکمو عزەت لە هەولێر دەربکەونو بگەڕێنەوە، کارتۆنەکانم هێنانە میوانخانە،کاتی ئۆتۆمبێلەکان ئامادە بوون کارتۆنەکانم خستنە ناو ئۆتۆمبێل بەپاسەوانەکانی باوکمم گوت: (ئەوە ئەشیای دوکانە لەگەڵ خۆتانی دەبەنەوە من دەرۆمە موصل هەندێ شتی ترم پێویستە بۆ دوکان)، یەکێك لە پاسەوانەکانم جیاکردەوە کە جێگای باوەڕم بوو ئەویش (حسن ئەحمەد

سەرانەیی) بوو ڕام سپارد لەماڵ ئەشیاکان دابگرێت و بیداتە دەستی دایکی شادومان نامەیەکی بچوکیشم بەڕوسی بۆ نووسی کە هەرکاتێ ئەو ئەشیایە گەیشتە ماڵ بنێرە بەدوای خلیل بابێت بیان بات و دابەشیان بکات، بەم شێوەیە بەریدەکەم لەگەڵ ئەوان بەڕێ کرد بەخۆشم دوای نیوەڕۆ گەڕامەوەو یەکسەر پرسیم ئەو ئەشیایانەی ناردبووم گەیشتن؟ گوتیان بەڵێ گەیشتن و ئاگادارمان کردوون کە بێن بیان بەن، زۆری پێ نەچوو(خلیل و حەسەنی مام ئیبراهیم) هاتن بردیان دابەشی بکەن، بێگومان لە(حسن ڕەژێکەری) زیاتر کەس نەیدەزانی ئەوە بەریدە ئەگەر بیان زانیبا بێشك نەدەوێران هەڵی بگرن و بیهێنن بۆ ڕواندز.

لە دوای گەڕانەوەم لە هەولێر دوای چەند ڕۆژێك قائمقام ناردی بەدوامدا کاتێ ڕۆیشتمەلای پێی گوتم: (چەند ئامۆژگاریەکم هەیە دەمەوێت پێت بڵێم بەمەرجێك نابێ دڵڕەنجاوبی، چونکە تۆم خۆش دەوێ و مرۆڤێکی تێگەیشتوی بۆیە پێم خۆشە لەمەودوا لە قسەی باوکت و برات دەرنەچی و خۆت دوور مەگرە لێیان بۆ تۆ وا دەخوازێت بەقسەم بکە). بەڕاستی ئەو ئامۆژگاریەی قائمقامم بەلاوە زۆر سەیر بوو پیاوێکی حکومەت و بەڕەگەز عەرەب ئەوەندە لە غەمی من دابێت کە هیچ پەیوەندیەکی بەمنەوە نەبووەو یەکێکیش نیم لە چەکدارەکانیان، ئەوەی هەستم کرد ئەو پیاوە شتێکی دەزانی نەشی دەویست ڕاستەوخۆ پێم بڵێت! یان ڕاسپێردراو بوو!!

ناوچەی ڕواندز بەشێوەیەکی گشتی ئاڵۆزی و پەشێوی تێکەوتبوو چەکدارەکانی باوکم پاسەوانی دەوروبەری ڕواندز بوون و مەترسیش لە دۆڵی ئاکۆیان پەیدا ببوو، ئێوارەیەك لە دوکان خەریکی کارکردن بووم هیچ ئاگام لەدەرەوە نەبوو، هەر ئەوەندەم زانی دوو چەکداری باوکم لە دوکان هاتنە ژوورێ و زۆر تەنگاوو پەشۆکاو بوون و گوتیان: (کاك زرار شەڕێکی زۆر گەرمە لە گەروی بێجانێ لەگەڵ عزەتی)، کە ئەمەم بیست بەپەلە دەرکەوتم و گوێم ڕاگرت بەگوێرەی تەقە شەڕێکی زۆر گەرم بوو، بەڕاستی تەنگاو بووم هەرئەوکاتە لەوێ ئەو چەکدارانەم بردن و ڕۆیشتم بۆ گەردە گەرد لەوێش دوو سێ چەکداری تر پەیدا بون کۆمەڵێك چەکدار کۆبوینەوەو بەپەلە بەرەو سەروچاوەی (مێگر) ڕۆیشتین کە ئێوارە داهات دیار بوو چەکدارەکانی عزەت دەگەڕانەوە لەوانمان زانی کەوا شەڕێکی دوورە تەقە لەگەڵ چەکدارەکانی (کوردۆی

نوری باویل ئاغا)کراوە. ئەوکاتە (کوردۆ)ش بۆ مەرامی خۆی چوو بوە دەرەوە گۆڕ بوە بەشۆڕشگێڕ، بەلاّم شۆڕشگێڕی ناوبراو هەرئەوەندە بوو تا توانی بەدزی (کەریم بن مێری) بکوژێت، ئەوەی بەدیارکەوت کوردۆ زۆر بەنامەردی لەخەوێدا کەریمی کوشتو گەڕایەوە ژێر دەسەلاّتی حکومەتو بەرگی ناپیرۆزی جاشایەتی کردەوە بەر!.

ڕۆیشتنمان زۆر گرنگ بوو بەهۆی ئەو تەقەی گەرووی بێجان زانیمان مالّی (سعید بەگ)ی ئالاّنی لە (بانەزیوك) لە پشتی ڕواندز ڕەشمالّیان هەلّداون، کاتێك ئەوەمان زانی هەلّکەوت بوو ڕۆژی دووەم لەگەلّ باوکمو کۆمەلّێك پیاو ڕۆیشتینە مالّی ئەو کەسەی لەکۆنەوە ناکۆکیمان لەگەلّی هەبوو، باوکمان لەسەردەمی حوکمڕانی تورکەکان (عوسمانلی) باوکی (سعید بەگ)ی کوشتبوو، ئەو نێوان ناخۆشیە هەرمابوو، وەك لە سەرەوە نوسراوە لەوکاتەی دەگەڕاینەوە بەرەو نیشتیمان لەڕێگا لەم ڕووەوە لەگەلّ باوکم دوابووم بۆ ئەوەی ئەو ناکۆکیانەی هەبوون نەهێلّین. ئەوە یەکێك بوو لە مەرامەکانمان کە بڕیارمان لەسەر دابووکە نێوان ناخۆشیەکان نەمێنن، ئەو دەمەش هەلّێکی لە بار هەلّکەوت بوو چوینە مالّی (سەعید بەگ) بۆ نەهێشتنی ئەوناکۆکیە.

کاتێك ڕۆیشتینە مالّی ناوبراو، ئەوەی هەست دەکرا (سەعید بەگ) زۆرخۆش حالّ بوو بەو چونەی ئێمە بۆ مالّی ئەو، پێشوازیەکی زۆر گەرمی لێکردینو ڕێزێکی زۆریان گرتین لەکاتی قسەکردن دیاربوو (سەعید بەگ) بەدلّێکی پاکەوە گوتی: (بەهاتننتان زۆر خۆشحالّ بووم، بێ گومان ئەوەی ڕابردوو ڕۆیشت ناگەڕێتەوەو نابێ بەدوایدا بچین، سەردەمی ڕابردوو سەردەمێکی تاریك بوو بۆیە توشی ئەو جۆرە کارەساتانە دەبووین، وا ئێستاش پێیەوە ماندوین، بەلاّم انشا الله ئێمە ڕوو لەکاری ناڕەوا ناکەینو برای یەکترین ئەوەی ڕۆیشت بابڕوا نەگەڕێتەوە).

باوکم سەرەتا گوتی: (ئێمە دان بەوتاوانەدا دەنێین کە لەکاتی خۆی کردومە، بەلاّم وەك خۆت گوتت سەردەمێکی تاریكو نەزانیبوو ئەوەی ئێستا دەزانم ئەوکات بمزانیبایە بەو کارە نارێکە هەلّ نەدەستام، زۆریش سوپاسی ئەو هەستە بەرزەی ئێوە دەکەین کەنیشانتان دا بەرامبەرمان)...

قسەکانی بابم جێگای ڕەزامەندی (سەعید بەگ)و مندالّەکانی بوو لە دوای ئەو بەیەك گەیشتنەو لەناو بردنی ئەو ناکۆکیەکە درێژەی هەرمابوو، بەخۆشی هەردوو

لا کۆتایی هات، شەو لەگەڵ باوکم گەڕاینەوە ڕواندز، بەڵام زۆربەی زۆری چەکدارەکان لە دەوروبەری سەروچاوەی ئاوی (مێگر)و(بانەزیووك) مانەوە لەسەر داوای قائمقامو بەڕێوەبەری پۆلیس.

لەو دەمانەشدا بوو سەربازی سەنگەرەکانی سەر بەرزاییەکانی (زینی تەلانی ماویلیان)، ئەوانەی کەوتبونە نزیك (گۆمەویان) بەپشتیوانی جاشەکان ڕۆیشتبون بەو نیازەی گوایا بەسەر بکەونە سەرکێوی (ڕووەڵە)، بەڵام بەشکاوی گەڕابونەوەو کوشتارێکی زۆریشیان دابوو کۆمەڵێك لەلاشەی کوژراوەکانیشیان بەجێ مابوون، ئەو شەڕەش لەگەڵ پێشمەرگەکانی (محمود کاوانی)کرابوو، بۆ ڕۆژی دووەم لایەنی سوپا بەخۆشیو ناخۆشی (مەلاعلی) میراجیانیان بەڕێ کردە شوێنی شەڕەکە بەو ئومێدەی ئەو پیاوە مەلایەو دەنگی لەگەڵ ناکەن بۆ ئەوەی لەگەڵیان بدوێت لاشەی کوژراوەکان بدەنەوە، کەچی (مەلاعلی) یان گرتبوو بەڕێ کرابووە حافیز لای (محمود کاوانی) ئـــەویش بـــەزەیی بەمەلای بێ تاواندا هاتبوو! لەوێ کوشتبویو لاشەکەشی فڕێدابوو! باڵندە گۆشت خۆرەکان خواردبویان، بەو شێوەیە مەلای خاوەن ماڵو منداڵ لە ژیان بێ بەش کرا!!.

لەوسەینو بەینەدا ڕۆژێك ڕۆیشتمە ماڵی باوکم لە کاولۆك بینیم (کریم خان) وا لای عزەت دانیشتووە هەرچاوی بەمن کەوت گوتی: (خوارزا بدون تعليق وا منيش بەپەشیمانی گەڕامەوە). لە وەڵامەکەی پێم گوت: (خاڵ تۆ بەسەفەر چووبوی بەخێربێیتەوە!) وادیار بوو ئامادەبوان لەگەڵ عزەت بەنیاز بوون بۆ لایەك بڕۆن بۆ بەرەکانی شەڕ، دوایی زاندرا کەوا سەنگەرێکی سوپا لەکێوی (سیرین) لەلایەن چەکدارەکانەوە ئابلۆقە درابوو، ماوەی یەك دوو ڕۆژ بوو سوپا هەوڵی دابوو نەیان توانیبوو بیانگەنێ بۆیە زۆر تەنگاو ببون، داویان لە عزەت کردبوو بۆ ڕزگار کردنیان، کاتی عزەتو چەکدارەکانی ئامادەبوون بڕۆن (کەریم خان) کە تازە گەڕابۆوە، ئەویش دەیویست بەشداری تێدا بکات بۆ گێڕانەوەی باوەڕی، بەخۆیو دوو سێ چەکداری کە لەگەڵی بوون لەگەڵ چەکدارەکانی دەرگەڵە ڕۆیشتن بۆ دەرباز کردنی سەربازە ئابلۆقە دراوەکان، هیچ شکی تێدا نییە بەشداربوونی (کەریم خان) لەم چالاکیە بۆ ئەوەبوو ببێتەوە جێگای باوەڕی کارگێڕانی سوپاییو قائمقام، لەو دەستو بردە بەدیارکەوت چەکدارەکانی سلێمان بەگ توانیان سەربازە ئابلۆقە

دراوەکان رزگار بکەن‌و بەسەر کەوتویی بگەرێنەوە لەکاتی گەرانەوەیان لە دورەوە تەقەیان لێکراو گوللەیەك بە(مستەفا حسێن) کەوتبوو کوژرا، ئەو چالاکیە بەسودی (کەریم خان) تەواو بوو رێگای بۆ ناوبراو خۆش کرد لە وێوە ببێتەوە جێگای باوەری دەولەت، هەر بۆ ئەم مەرامەشی رۆیشتبوە دەرەوە، ئەوکاتە باو بوو ئەوەی چوبوایە دەرەوە کە دەگەرایەوە حکومەت زیاتر پارەی پێدەدا، چەکدارەکانی دەرگەلە ناویان رۆیشتبوو بەئازاو چالاك، هەر شوێنێکی روویان تێ دەکرد بەسەرکەوتویی دەگەرانەوە، لەبەر ئەوە ببونە جێگای باوەری دەولەت، بەلام زۆریەی چەکدارەکانی بەگلەییەو گازەندە بوون لە عزەت بەشێوەیەکی تایبەتی ئەوانەی مال‌و مندالیان لە گوندەکان مابۆوە، دەهاتنە لای من گلەییان لە عزەت دەکردو دەیان گوت: (ئەویش وەك سەرۆك جاشەکانی تر فێربوە ئەوشتەی بەناوی ئێمە دێت وەری دەگرێت‌و لێمان دەشارێتەوەو نامان داتێ، شەرمیش دەکەین بەباوکی بلێین بۆیێ داوا لە تۆ دەکەین ئەگەر پێی بلێی). ئەوەی راستی بێت ئەو دەنگە نارێکە کارێکی زیانبەخش بوو بۆ بەرژەوەندی باوکم‌و عزەتیش بۆیەمن بەنیازێکی پاکەوە بۆئەوەی عزەتیش نەکەوێتە کۆری بێ رێزان‌و ناوی هەر بەپاکی بمێنێتەوە ناچاربووم هەندێ شتی بخەمەروو بەلکو سودی لێ وەربگرێت‌و دەنگی نارەزایی چەکدارەکانمان نەگاتە گوێی نەیارانمان‌و ناومان ناشیرین بێت، من بەئەمانەتەوە خواستی نارەزامەندیم پێ راگەیاند، بەلام بەداخەوە ئەو شتەی من پێم راگەیاند دیار بوو زۆری پێ ناخۆش بوو وای بۆ چووبوو من پێم ناخۆشە وحەزناکەم ئەو دەستەلاتدار بێت، هەلبەتە ئەو بیرو بۆچونەی ئەو زۆر لەراستیەوە دوور بوو بەپێچەوانەوە ئەوەی من دەمویست ئەوە بوو کە ناوبانگی زیاتر بەرز بێتەوە لەناو جەماوەرو کۆمەلگاو دۆست‌و برادەران، بەلام بەداخەوە لەدواییدا ئاشکرا بوو وای زانیبوو من چاوم بریوەتە سەروەت‌و داهاتی ئەو کەلەمەشیان دیسان هەلەیەکی گەورەی کردبوو، لەبەرئەوەی ئەو دەسکەوتەی ئەو پێی خۆشحال بوو من بەگلاوم دەزانی‌و قەت چاوم لەوەنەبوە لەسەر رەنجی کەس بژیم، چونکە ژیانی من زۆر لەژیانی ئەو ئاسودە تر وخۆشتر بوو، کە وابێت دەبێ بەهیوای چی بووبم ؟ برا ئەو ها دلی رەنجابێت‌و لالوت بێت!.

رۆژ بەرۆژ پەشێوی‌و ئالۆزی زیاتر پەرەی دەستاندو ناسازی رەچاو دەکرا لەو دەمانەدا هەستم کرد کە چاودێریم دەکرێت زیاتر لە پێشان، چاودێریەکە

بەشێوەیەکی مەترسیدارتر بوو، خۆشم هەستم بەوە کردبوو کەوا نیازیان باش نییە، ئەوەبوو معاون ئەمن ناردی بەدوامدا، معاون ئەمنی ئەوکاتی ڕواندز ناوی (شوکر) بوو. پیاوێکی تورکمانی قین لە دڵ بوو زۆریش نەزان بوو ئەوەندەی بڵێی پڕو پوچ و بێ ڕێز بوو. کە چومەلای پرسی (تۆ زرار سلێمانی؟) گوتم: (بەڵێ من زرار سلێمانم، فەرموو چیت دەوێ). وا دیاربوو ئەو معاونە تازە هاتبوە ڕواندز، نەشارەزا بوو ئەوەندەش گێل بوو هەرکەگەیشتبوە ڕواندز دەستی کردبوو بەئەزیەت دان و ڕاونانی خەڵك بەتایبەتی شیوعیەکان، چەند کەسی بانگ کردبوون و بەندی کردبوون وا پێ دەچوو بەرامبەر بەمنیش ئەو هەڵوێستە وەربگرێت، چونکە کە چوومەلای بەو ئەمنەی لەلای بوو بەتورکی بە(سید محمد)ی گوت دەرگایەکە قایم بکە وای زانی من تورکی نازانم، کە ئەمەی گوت هەر زوو پێم گوت: (پێت دەڵێم یەك ووشەی ناڕێك و ناتەرز بکەیت لێت ڕازی نابم ئەوجا کەیفی خۆت و خۆشت بەرپرس دەبی، لەو مشومڕە دابوین ڕەئیس عورەفا خیری بەژوورکەوت دیتی من ئاڵۆزم و وەستاوم بەتوڕەیی بەتورکی بەمعاونەکەی گوت: (ئەوە چ دەکەی؟ خۆ ئەو پیاوەت عادز نەکردوە؟ دەزانی ئەوە کێ یە؟ باوکی ئەو پیاوە تۆو قائمقامەکەت دەپارێزێت لە ڕواندز)، لەو کاتەدا من دەرکەوتم و ڕۆیشتمە لای قائمقام و پێم گوت: (دیارە معاون ئەمنەکەتان مندالّەو لە هیچ نازانێت گێلەو لە هیچ تێ ناگات، زۆر نەزانەو ئەوە ئەمن نییە، بەڵکو دژی ئەمن و ئاسایشە، ئەگەر بەم شێوەیە بێت خەڵکێکی زۆر دەنێرێتە دەرەوەو کۆسپێکی ترسناکتان بۆ دروست دەکات، بۆیە دەبێ ئاگادارین).

ئەوەی ڕاستی بێت لەگەڵ قسەکانی من قائمقام زۆر توڕە بوو ناردی بەدوای معاون ئەمنەکەو ناوبراو هاتە لای قائمقام و پێی گوت: (ئەوە چیت کردوە؟ لە خۆتەوە یەخەی ئەوکەسانە دەگریت کەنایان ناسیت، دەزانی ئەوە کییە یەخەت گرتوە؟ ئەوە کوڕی سلێمان بەگە، باوەڕ پێکراوی متەسەریفە ئەگەر بزانی ئەوکارەی تۆ کردوتە هیچ گومانی تێدا نییە لە ڕواندز جێگات نابێتەوە.) معاون شوکر بەسەر شۆڕی ڕۆیشتە دەرەوە، زۆریشی نەخایان لەڕواندز گواسترایەوە.

تەواو هەست دەکرا عزەت دڵ نیگەران بوە لەو قسانەی لەگەڵم کردبوون، کە زانیم ئەوهایە خۆم کێشایەوەو کەمتر دەڕۆیشتمە لایان، بێ گومان باوکم ئەوەی نەدەزانی کەساردی لە نێوان من و عزەتدا هەیە لە دوای ئەوساردیە بەشی زۆری کاتم

لەدوکانەکەم بەسەر دەبردو تەنها خەریکی کارکردن بووم، ئەوەی پێم ناخۆش بوو چەکدارەکان بەبەردەوامی هاتو چۆی دوکانەکەمیان دەکرد، ئەوەش عزەتی پەست کردبوو، وای دەزانی زرار ئەوان هان دەدات لەدژی ئەو، تەواو هەستم دەکرد پێی خۆش نەبوو ئەوانە بەم شێوەیە بەکۆمەڵ بێنە لام.

باوکم مامندی بردبوە هەولێر بۆ لای (بەدرەدین علی) متەسەریف، ئەویش بەڵێنی پێدا بوو کەهاوکاریان بکات بۆ بەردانی منداڵەکانی، لەدوای ئەوە مامند زۆر لە سلێمان بەگ نزیك ببوەوە، سلێمان بەگیش زوو زوو دەچوە سەردانی مامندو یارمەتیشی دەدا.

**کارەساتێکی دڵ تەزێن:** بەیانیەك کاتژمێر یازدە لە دوکانەکەم خەریکی کارکردن بووم لەناکاو (شێرزاد)ی برا بچوکمان زۆر بەئاڵۆزی هاتە لام بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی: (بابم ناردومی ئۆتۆمبێلێك بگریت بۆ هەولێر بەخۆشت لەگەڵی بێیت بڕۆیتە هەولێر لەگەڵ قسەکانیشی دەستی کرد بەگریان!) بەگریانی ئەو منداڵە تەواو پەشۆکام هەوڵمدا بزانم چی بوەو بۆچی دەگرییێت، هیچ قسەی نەکرد. لەدواییدا گوتی: (باو بریندارە، شەوی ڕابردو لە ڕوەڵە بریندار بوەو مامند شێروانیش کوژراوە تەرمیشی لەوێ ماوەتەوە ژنیو (سعید میرخانی) برازای چوون بەڵکە تەرمەکە بێننەوە!) لەگەڵ قسەکانی(شێرزاد) بەپەلە دوکانم داخستو شێرزادم نارد ئۆتۆمبێلێك بێنێت، بەخۆشم چوومەوە ماڵ خۆم ئامادەبکەم، کە ئۆتۆمبێل هات ڕۆیشتینە ماڵی باوکم لە قوتابخانەی کاولۆکان، کاتێك گەیشتینە ئەوەێ دیاربوو دکتۆری سوپا لەلای بوو، هەر منداڵەکان چاویان بەئێمە کەوت دەستیان کرد بەگریان کاتێ دکتۆر ئەمەی بینی، گوتی(پێیان بڵێن با نەگریێن هیچ نییە برینەکە جێگای مەترسی نییە، بەڵام حەز دەکەم بڕواتە هەولێر لێرە (ئیشاعە)مان نییە دەترسم نەوەك ساچمەیەك لەناو برینەکەی دا مابێتەوە لە دواییدا ئەزیەتی بدات، لەبەر ئەوە بەپێویستی دەزانم بچێت بۆ هەولێر لە ئیشاعە دیاردەبێت برینەکە چۆنەو چی پێویستە).

لە دوای دەرکەوتنی دکتۆر، لەگەڵ باوکم کەوتمە قسە کردنو گوتم: (ئەوەچی بوو؟ ئە تۆچیت لەشەڕ دا بوو چۆن بەخۆت دەچیتە سەری ڕوەڵە؟) گوتی: (دوێنی نا پێرێ چەکدارەکانمان هێرشێکی تریان کردەوە سەری ڕوەڵەی پیاوەکانی عەباسیان

دەرکردنو ویستیان بگەڕێنەوە کەچی فەرماندەی سوپا داوای کرد لەوی بمێنینەوە هەتا سوپا دەڕواتە شوێنی ئەوان، لەوکاتەش من چووبومە لای مامند لە گەرووی پشتی ماویلیان، عزەت هاتبوە خوارەوە نەگەڕایەوە، منو مامندیش بەسەر کەوتینە سەرەوە گوتمان شەو لەویٰ دەبین کە عزەت گەڕایەوە ئێمەش دەگەڕێینەوە، شەو ڕاکشا کاتێك حەرەسەکانی پێشەوە ئاگاداریان کردین کەوا هەستێکی زۆر لە خوارەرەوە هەیە وا دیارە بەسەر دەکەون، مامند هەستاو چووە لایان، منیش لەلای ئامێری لاسلکی لە گۆڕەپانێك بووینو هیچ بەردیشی لیٰ نەبوون، زۆری نەخایاند لە گشت لایەکەوە بوو بەتەقەو هێرشێکی توندیان بۆ هێناین یەکەم جار شکان بەرەو دواوە گەڕانەوە، جاری دووەم هێرشیان هێنایەوە دیاربوو ئاگری تفەنگی هەردوولا تێکەڵاوی یەکتربون، شەڕەکە زۆر دژوار بوو ئەوەندەم زانی لێمدرا دەستم لەکار کەوت، ئەوانەی لای من بوون کەوتنە شەڕ، منیان برد بۆ پەنایەك دیاربوو ئەوانی پێشەوە جێگای خۆیان بەردابوو شەڕی گران کەوتە ئەو شوێنەی منی لیٰ بووم، لەو کاتە تەنگانەدا باش بوو خدری عەولاٰ بەگو ئەوانەی لەگەڵی بوون گەیشتنە لام، ئەوان کەوتنە شەڕ کردن هەتا منیان دەرباز کردم بۆ ئەو دیوی گۆمەویان لەویٰ بەولاوە ئاگام لە هیچ نەما، دیارە خدرو ئەوانەی لەگەڵی بوون منیان گەیاندبووە نزیك سەنگەرێکی سوپا لەگۆمەویان کاتێك بەدرەنگەوە وشیار بوومەوە پێیان گوتم مامەند کوژراوە؟) ئەوەی جێگای لێکۆڵینەوەیە گەڕانەوەی چەکدارەکانی عباس ئاغا بوو کە جاری یەکەم گەڕانەوە بۆ دەرگەڵە بەیارمەتی(کریم خان)و خەڵکی خۆجییو شارەزاو بیٰ باکی باوکم توانیبویان بگەڕێنەوە شوێنەکانیان، جارەکانی تریش کەدەردەکران چەکدارەکانی سلێمان بەگ دەگەڕانەوە کەدەیان زانی ئەوان ڕۆیشتوونو لەویٰ نەماون ئەوکاتە دەگەڕانەوە، دوواجاریش مەلامستەفا بارزانی ناردنی بەسەرپەرشتی (حاجی بێرۆخی)، بەومەرجەی ئەگەر هەمووشیان بکوژرێن دەبیٰ ڕووەڵە هەرووەریگرنەوە لەبەرئەوەی ڕووەڵەکلیلی دەروازەی باڵەکایەتیە، بۆیە دەبیٰ ئەو کلیلەش لەدەستی خۆماندا بێت.

تا ئامادەبووین بوو بەکاتژمێر دوازدەی نیوەڕۆ لە کاولۆك دەرکەوتین بەرەو هەولێر، ئەوانەی لەگەڵی چووین منو(حمد خۆشکانیو سەلاحی برامو حسن ئەحمد سەرانەیی) بووین، باوکم زۆر بەپەرۆش بوو بۆ مامەندو وەزعی خۆشی ئاڵۆز ببوو،

کە گەیشتینە بازگەی شەقلاوە ئینزباتێکی پۆلیس ڕای گرتین قەلەمو کاغەزی بەدەستەوە بوو پرسی: (بۆکوێ دەچن؟) شوفێرەکە پێی گوت (دەچینە هەولێر)، سوڕایەوە لایەکەی ترو لە باوکمی پرسی ناوت، گوتی: (سلێمان بەگ،) دیسان پرسی: (کارو پیشەت؟) گوتی: (جاش پۆلیس).

پۆلیسەکە زۆر توڕە بوو گوتی: (چۆن ئەو قسەیە دەکەیت، توخوا بنوسم جاش پۆلیس!) باوکم پێی گوت: (بێ ڕێز ئەدی ئەو هەموو قایشو قروشەی پێمانەوەیە نابینی؟) پۆلیسەکە بەتوڕەیی دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی پێوەداو پرتەو بۆڵەیەکی لێهات، باوکم گوتی: (وەرنە خوارێ باشی بکوتن!) پۆلیس کەزانی لێی دەدرێت بەغاردان ڕۆیشتەوە ژورەکەیو دەرگای داخستو پیاوەکان گەڕانەوە. پۆلیسێکی هیچو پوچو زۆر لە خۆڕازی ڕۆژ نەبوو، بەکۆمەڵ دڵی خەڵکی نەڕەنجێنێو ئەزیەتیان نەدات باش بوو لەدوای ئەوکێشەیە زۆر لەوێ نەما.

کاتێك گەیشتینە هەولێر لەسەر ڕاسپاردەی باوکم تەلەفۆنم بۆ (بەدرەدین علی) کرد ناوبراو گوتی: (ئێوارە وەرنە لام لەماڵ چاوەڕێتان دەکەم)، ئێوارە لەکاتی دیاریکراو ڕۆیشتینە ماڵیو پێشوازیەکی زۆر گەرمی لێ کردین، باوکمی دیت بەباسك هەڵبەستراوی گوتی: (سلێمان بەگ تۆ غەدرت کردوە بەخۆت چووی بۆ شەڕ، ئەوە کاری تۆ نەبوو، الحمدالله کۆمەڵێك کوڕت هەیە هەموشیان بەتوانان با ئەوان بچنو نۆرەی ئەوان بێت)، دواتر ڕووی لەمن کردو گوتی: (مامۆستا زرار دیارە هاوڕێکانت ڕازی نەبوون بگەڕێیتەوە وەزیفە، لەبەرئەوەش بروسکەت مۆر نەکردبوو، چونکە شیوعیەکان دژی بروسکە لێدانن)! لەوەلامدا گوتم: (نەخێر جەنابت داوات کرد منیش چەك هەڵبگرم وەك ئەوانی تر ئەوە بەلای منەوە زۆر گرانە من کەخوێندەوارم توانای ئەوەم هەیە لەبوارێکی ترەوە خزمەتی گەلو نیشتمان بکەم، بەلامەوە شەرمە، لەدوای ئەوەندە سالانە بگەڕێمەوە سەر چەك هەڵگرتن). لەدوای قسەکانم سەیری دەموچاوی بەدرەدینم کرد گرژ ببوو،هیچ قسەشی نەکرد،لەوکاتەدا بوو تەلەفۆنی بۆکراو گوتی: (نعم)، دیار بوو هەردەیگوت (ئی)... لە دواییدا گوتی (کەی هاتۆتەوە، تەنیایە؟) تەلەفۆنەکەی داناو گوتی: (ئەوا کاکە سوریش نادیمەن گەڕاوەتەوەو خۆی تەسلیم کردۆتەوە)، کەمێك وەستا بەبێ دەنگ زەردەخەنەیەکی بەڕودا، هات لەوکاتەدا دەنگی ئۆتۆمبێلێك هات دیاربوو بەڕێوەبەری پۆلیسی

گشتی هەولێر بوو(حەسەن ئەفەندی) لەدەرگا بەژوورکەوت سلاوێکی سوپایی کردو گوتی: (بەگم ڕێگا بدەن بێ بۆلاتان)؟ گوتی: (بفـەرمـوون وەرن)، ئـەوەنـدەمـان بینی (حسن ئـەفـەنـدی) دەرگـای کردەوە لەگەڵ (کاکەسور) هـاتنە ژوورەوە کۆمەڵێك دانیشتبوون، ئەوەی جێگای سەرسوڕمانەو نیگەرانیە ئەوەیە، ئەو پیاوە بەشێوەیەکی ئەوەندە سوك سەری چەماندو سوجدەی بۆ بەدرەدین بردو ویستی دەستی ماچ بکات، بەلاّم بەدرەدین نەیهێشت، ئەو سەرچەمانەی (کاکە سوور) دەتوانم بڵێم هیچ عەجەمێك ئەوها سوجدەی بۆ گۆڕی (ئیمام علیو کازم) نەبردووە! کاکەسوری ناسیاو ئەوەندە مشاوەشو ئاڵۆز بوو کاتێك دانیشت بەدیارکەوت (بەدرەدین علی) ئەوەندە ڕووی پێ نەدا، کاتێك بینی ئێمە بەرامبەری دانیشتوین ئەوجا هەستا گوتی: (ببورن ئێوەم نەدیت) ئەوجا چاكوچۆنی لەگەڵ کردین. دوای ماوەیەك بەدرەدین بەکاکەسوری گوت: (بەیانی لەکاتی دەوام لەگەڵ بەڕێوەبەری پۆلیس وەرنە لام)، ئەوان ڕۆیشتنو بەدرەدین گوتی: (پێش ماوەیەك کاکە سور گوتبوی دەبێ هەولێر بگرم، وا دیارە هاتوە ئەو بەڵێنە جێ بەجێ بکات)! ڕۆژی دوایی سەر لەبەیانی ڕۆیشتینە نەخۆشخانە زۆر بەووردی سەیری برینەکەیان کرد، بەدیارکەوت هیچ ساچمەی تێدا نەماوەو جێگای مەترسی نەبوو بۆیە پێویستی بەهیچ نەبوو، دوو ڕۆژ لە هەولێر ماینەوە ئینجا گەڕاینەوە، ناوە ناوە دەچووم سەرم لەباوکم دەدا لەکاولۆك زۆر جار لەگەڵ چەکدارەکان دەکەوتمە گفتوگۆ، ئەو چەکدارانەی چەکیان پێ بوو زۆربەیان پەروەردە کراوی حزبی شیوعی بوون، عزەتیش یەکێك بوو لەوان، بەلاّم دیار بوو بەشی زۆریان لە عزەت دڵ ڕەنجاو بوونو ناڕازی بوون وە لەهەولێستەکانی ناوبراو بەپەرۆش بوون، بەلاّم لەبەر ئەوەی هەستم کردبوو کە عزەت بەئامۆژگاریەکانی من پەست ببوو پێم خۆش نەبوو زیاتر لەگەڵی بدوێم لەم بارەیەوە. بێ گومان باوکم ئاگای لە دڵ ڕەنجانی چەکدارەکان نەبوو ئەوانیش شەرمیان دەکرد بەباوکم بڵێن.

لەکۆبوونەوەیەکی لیژنەی قەزای ڕواندزی حزبی شیوعیدا، یەکێك لەئەندامەکانی لیژنە مامۆستا (محمد علی) گازەندەی لە چەکدارەکانی عزەت کرد کە بەقسەی (شمس الدین بەگ) هەڵیان کوتاوەتە سەر پیاوێکی ڕواندزی، بێ گومان ئەوکاتەش من لێپرسراوی قەزا بووم. ناچار بووم بۆ ئەوەی ئەو دەنگە ناسازە

پەرە نەسێنێ‌و بلاو نەبێتەوە لەو بارەیەوە لەگەڵ (عزیزی ئامۆزامان‌و حمد امینی مام فەقێ)، باسی ئەو گیرو گرفتەم کردو بۆم دیار کردن ئەو ناڕەزاییەی کۆمەڵانی خەڵك دەبێتە هۆی تێکدانی ئەو هەموو ناوبانگەی هەمانەو پێشێل کردنی تەواوی ئەو سەرکەوتنانەی کە بەدەستەوە هاتوون، ئەوە لەلایەك لەلایەکی ترەوە دەبێتە ئالۆزی‌و تێکدانی ڕیزەکانی چەکدارەکان، بێ گومان ئەوەش شکانە بۆ ئەو ڕێزەی هەمانە لەناو کۆمەڵگا. عزیزو حمد امین، ئەوانیش ڕوێکی چەکدارەکان بوون بەڵێنیاندا لەگەڵ عزەت دابنیشن، لەم ڕووەوە بکەونە باس‌و لێکۆڵینەوە لەگەڵی. ئەوکاتەش ڕۆژگار ڕو لەناڕێکی‌و ئالۆزی بوو ڕۆژ بەڕۆژ بارودۆخ بەرەو خراپی دەڕۆیشت‌و چاوەڕوانی مەترسی لێ دەکرا دیاربوو کارمەندانی حکومەت زۆربەی زۆریان ڕوو لە خراپەکاری‌و دژی دەسەڵاتی (عبدالکریم) بوون‌و بەئاشکرا پشتی پیاو خراپانیان دەگرت، بەشێوەیەکی تایبەت تێکدەرەکان هاندەربوون لەدژی شیوعیەکان‌و جولانەوە پێشکەوتن خوازیەکەی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ، لەوکاتەش زۆربەی زۆری جەماوەر پاڵ پشت‌و لایەنگری شیوعیەکان بوون، لەو دەمانەشدا لەڕواندز پڕو پاگەندەیەکی پڕو پوچ‌و ناڕێك بلاو کرایەوە بەناوی پارتی گوایا ڕواندز دەگرن‌و شیوعیەکان نایەڵن‌و ژنەکانیان دابەش دەکەن لەگەڵ کۆمەڵێك قسەی بێ ڕێزو ناوێچویی‌و نالێوەشاوە. بێ گومان شیوعیەکانیش بەو پڕو پاگەندە ئالۆز بوو بوون بۆ بەرگری لە خۆیان هیچ کەس لە ماڵی خۆی نەدەخەوت، زۆر بەوشیاری نۆبەتیان لە خۆیان دەگرت بەتایبەتی شەوان بەگشتی لەماڵەکانیان دەردەکەوتن‌و دەڕۆیشتنە شوێنێکی نادیارو لەبۆسە دادەنیشتن ماوەیەکی درێژ بەوشێوەیە دەژیان تا کودەتا شوومەکەی ١٤ی ڕەمەزانی ڕەش ڕوویدا.

بەشی نۆیەم

# تێکچونی حکومەتەکەی عبدالکریم قاسم لە ١٤/ ی ڕەمەزانی ١٩٦٣

ئەو تێکچونە چاوەڕوان کراو بوو لەبەر ئەوەی (عبدالکریم) خۆی ڕێگا خۆشکەر بوو کەهەڵگەڕانەوەیەکی دژ بەدەسەڵاتی شۆڕشی ١٤ی تەمووز ڕووبدات، ئەو شۆڕشەی گەلو نیشتمانی ئازاد کردو گورزێکی کاریگەریشی لە(ئیمپریالیزم) وەشاند، هەر لەبەرئەوەش دوژمنانی ئەو شۆڕشە بێ وەستان کەوتنە هەوڵدانو پلان داڕشتن بۆ نەمانی، لەئەنجامدا لە ڕێگای پلانی داڕێژراوو نۆکەران توانیان بڕۆنە ژێر باڵی (عبدالکریم) بۆ ڕوو گۆڕینی، ناوبراویش کەسایەتیەکی سەربازی بوو توانیان ڕێگای پێ بگۆڕن، داخ لە دلانی دژ بەئازادیو دیموکراتیەت یەکیان گرتەوەو هەموو توانایەکیان خستە گەڕ بۆ لێدانو لەناو بردنی ئەو شۆڕشەی عێراقو گەلانی عێراقی ئازاد کردبوو، دانی بەهاوبەشی کوردو عەرەب نا، بێگومان ئەو خاڵەی دان نان بەمافی کورد لەعێراق بارێکی زۆر گران بووکە کەوتبوە سەرشانی کۆنەپەرستو شۆڤینیە عەرەبەکان لەبەر ئەوەی دوژمنانی کورد هەرچی توانایەکی هەیان بوو خستیانە گەڕ لە پێناو نەمانی ئەو خاڵە گرنگەی کە شۆڕش دیاری کردبوو بۆ کورد لە دەستوری کاتیدا. ڕێگادان بەدوژمنانی ئازادیو دیموکراتیەتو بونیان بەکارمەندو کارگێری دەوڵەت ئەنجامی لە ناوچونی شۆڕشو دەستکەوتەکانی بوو، دوژمنانی گەلو نیشتمان بێ وەستان لە هەوڵدا بوون بۆ نەهێشتنی ئازادیو لێدانی ئازادیخوازانو یاساکانی شۆڕشی١٤ی تەموزی پێشکەوتنخوازی (١٩٥٨) ئەوە بوو دوژمنانی گەلو نیشتمان بەیارمەتیو پیشتیوانی ئاغاکانیان لە(٨ی شوباتی ١٩٦٣)و ڕێکەوتی ١٤ی ڕەمەزانی هەمان ساڵ دا دەستیان وەشاندو دەسەڵاتی (عبدالکریم قاسم) یان لاداو بەعس بوو بەخاوەن دەسەڵات.

بەرەبەیانی (٨ شوباتی١٩٦٣) وەك گشت ڕۆژانی پێشوو ڕۆیشتمە دوکان هیچ دەنگێك نەبوو، جیا لەڕۆژانی پێشوو ڕادیۆشم لەگەڵ خۆم نەبرد بۆ دوکان، خەریکی کار بووم کاتێك هەرئەوەندەم زانی دایکی شادومان داوای منی کردبوو لەکاتێك لەدوکان دەرکەوتم بینیم لەپەنا پەرژین ڕاوەستا بوو زۆریش پەشۆکا بوو بەو شێواویە بانگی کردمو گوتی: (وەرە نزیك پەرژین) کەلێی نزیك کەوتمەوە گوتی: (زوو وەرە لەبەغدا شتێك ڕویداوە گوێ لەڕادیۆ بگرە ئەوە هەر هاوار هاوار دەکات من تێی ناگەم زوو وەرە بزانە چیە؟ ئاخۆ چی ڕویداوە؟)کە ڕۆیشتمەوە گوێم لە ڕادیۆ گرت کاتژمێر دەوری نۆی بەیانی بوو کەلەڕادیۆ گوێم لەهەواڵی تێکچونی حکومەتی (قاسم) بوو، دیار بوو کار لەکار ترازا بوو بەپەلە ڕۆیشتم دوکانەکەم داخست لەوەدەمەش دیار بوو لەشەقەمەکان ئینزباتەکانی سوپا خەریك بون سەربازیان ڕەوانەی سەربازگەی حامیە دەکردنەوەو زۆریش ئالۆز بوون. دوای ئەوەی بۆم دەرکەوت دەستەی ئینقلابەکە کۆمەڵێکی گومان لێکراون زۆر بەپەلە ناردم بەدوای هاوڕێیانی (مەکتەب)، ڕێکخراوی حزبی شیوعی ئەوکاتە من بەرپرسی قەزای ڕواندز بووم، بۆ ئەوەی زوو کۆبونەوەیەك بکەین بۆ دیاریکردنی ڕێگایەك، بەشدار بوانی کۆبونەوەکە ئەمانە بوون: (مامۆستا محمد علی، مامۆستا ئەحمەد شێخۆ، خلیل سوڵتان مێرگەسۆری، زرار دەرگەڵەیی) لەکۆبوەنەوەکە چەند بڕیارێکماندا گرنگترینیان ئەوە بوو من (قادر عبدالله) ببینم، ناوبراو بەرپرسی سوپایەکان بوو بۆ ئەوەی بڕوات پەیوەندیان پێوە بکات بۆ دەست بەسەر سوپادا گرتن بۆ بەدەست هێنانی چەكو تەقەمەنیو کەلوپەلی پێویست، زۆر بەدوای (قادر عبدالله)دا گەڕام ناوبراو ڕۆیشتبوەوە هەولێرو نەدۆزرایەوە، دوای ئەوە کەوتمە هەوڵدان چۆن بتوانم پەیوەندی بەهاوڕێیانی سەربازگەکەوە بکەم، بۆ ئەو مەبەستە چوومە کاولۆك بەهۆی (وسو جرجیس) توانیم (مام خدر) کە ناسراو بوو (خدرە کدولە) بدۆزمەوە، ناوبراو لەکارەبای سەربازگەی حامیە کارمەند بوو، بەڵکو لە ڕێگای ئەوەوە دەستمان بگاتە یەکێك لە ئەفسەرە هاوڕێکانمان، (مام خدر) وەك هاوڕێیەکی دڵسۆز هەوڵیداو نائب زابت (شوکرانی) بۆ دۆزیەوە، لەگەڵ ناوبراو دانیشتم ئەوەی شایانی باسە نائب زابت (شوکران) شیوعیەکی هەست بەرزی زیاد لە پێویست دڵپاكو چاونەترس بوو، بەهۆی ئەوەوە گەیشتمە(ڕەئیس اول) یانی ڕائد، گوایا لێپرسراوی شیوعیەکانی

ناوسەربازگەکە بوو کە ناوی(مهدی) بوو، ئەوەندەی بلێی ترسنۆك‌و بێ دەسەلات بوو کاتێك پێم گوت: (من بەرپرسی قەزام‌و ئەو هاوڕێیەی پەیوەندی بەئێوەوە هەیە لێرە نیەو بۆ ئەوەی باوەڕ بکەیت کەمن لێپرسراوی قەزام ئەوە ئەو نوسینەن کە بۆ ئێوە هاتوون چەند ڕۆژە لای من ماونەتەوە، قادر نەهاتووە بۆتان بهێنێ ئێستا لێرە نیەو وەزعیش ئالۆزە من هاتووم بەڵکو هاوکاریمان بکەن بەیارمەتی ئێوە بێین دەست بەسەر سەربازگەکەدا بگرین ئەم شەو)، کە ئەوقسانەم پێ گوت ئەو پیاوە ئەوەندەی نەمابوو دڵی لە لێدان بوەستێ‌و دەیگوت، (دەبێ هەرئێستا لێرە دەرکەوی‌و لێرە نەمێنی، چۆن دەبێ ئێوە بێن بۆ ناو سەربازگەکە؟! داوات لێ دەکەم بێ دواکەوتن بڕۆیت من تۆ ناناسم با ئەوەی پەیوەندی بەئێمەوە هەیە ئەو خۆی بێت لەگەڵم بدوێت). بەهیچ جۆرێ ڕازی نەبوو لەگەڵی ڕێککەوین، کەزانیم چارنیە گەڕامەوە ڕواندز ئەوە ئەنجامی باوەڕ پێکراوی حزبی شیوعیە گوایا بەهیوا بووین هەرکاتێ حزب پێویستی پێ هەبوون هێزێکی ئامادەی پاڵپشتی حزبەو جێگای باوەڕن، کەچی ئەوە بوو هەڵوێستی ئەو هێزەی کە دەبوایە پاڵپشتی حزب بێت لەوکاتەدا.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ بەیانی ژمارە سێزدە بلاوکرایەوە بۆ لێدان‌و لە ناوبردنی شیوعیەکان، لەوکاتەوە لەسەر هەر شیوعیەك پێویست بوو کە بتوانێ خۆی دەرباز بکات، هەر لەگەڵ بلاوبونەوەی بەیانەکە دوژمنانی دیموکراتی‌و پێشکەوتنخوازی کەوتنە دوای شیوعیەکان‌و ڕاویان نان بەتایبەتی ئەوانەی ناسراو بوون، هەر زوو ئەوەی دەستیان کەوت ڕاپێچی بەندیخانە کران، پۆلیس بێ وەستان دەگەڕان بەدوای شیوعیەکان لە کاتێکا من لە دوکانی( محمدی حاجی برایم) بووم دیتم کە(خورشید ڕەشۆی) باش چاوەش منی دیت‌و زوو بە(عوبێدی) مەئمور مەرکەزی گوت (ئەوەتا زرار لەو دوکانەیە)، تا ئەوان لە ئۆتۆمبێل دابەزین من دەرکەوتم ئەوەی ڕاستی بێت محمد زۆر مەردانە گوتی: (برۆ ماڵی ئێمە تا شەودادێت). بەلام یەکسەر بەکۆلانێکدا ڕۆیشتم‌و خەبەرم بۆ ماڵێ ناردو زۆری پێ نەچوو(عبداللە قادر ماشکانی)، کەلاوێکی تازە پێ گەیشتوو بوو گەیشتەلام‌و تفەنگێکی بۆ هێنام خۆشی چەکدار بوو لەگەڵ ئەوەی شەو داهات لەڕواندز دەرکەوتین، چونکە دەبوایە ئەم شەوە هەر لەڕواندز دەرکەوتبایین لەبەرئەوەی بەنیاز بوون پشکنینی زۆر ووردی ماڵە شیوعیەکان بکەن، ئەوەی زاندرابوو بڕیاری گرتنی من دەرچوبوو بەشێوەیەکی

تایبەت بەزیندویی یان بەمردریی دەستگیر بکریێو بدرێتە دەست سوپا، ئەوە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە هەر لەزووەوە لەلایەن مەلامستەفا شەوە بەتاوانبار داندرابوم کە هەر لە سۆڤیەت بووین، دەبێ لەوکاتە ناسكو دژوارەدا هەڵوێست چی بێت؟ ڕوو لەکام لا بکەم باشە؟ من لە نێوان دوو دەسەڵاتدار فیرار بووم‌و خۆم پەنا داوە هەریەکەی لەو دوو دەسەڵاتە دارە بمگرن بێشك دەمکوژن. تەنها لەبەرئەوەی شیوعی بوم.

کاتێك شەو لە ڕواندز دەرکەوتین بەگوندی(کانیەقوڕ)دا ڕۆیشتین بەرەو دۆڵی (ئاکۆیان) لەنزیك (کێلی بەکون) پەڕینەوە بەری هەندرێن‌و بەکۆسپەکانی (دەروك)دا سەرکەوتین‌و لە شوێنێك دانیشتین لەگەڵ (عبدالله) کەوتمە قسە. دەمزانی ناوبراو شەڕو گێچەڵی نەدیووە کەمێك هەڵم سەنگاند هەر بۆ ئەوەی ئەگەر هاتوو توشی بەسەرهاتێك بووین ئاخۆ دەتوانێ دەست بکاتەوە، لە ئەنجامی گفتوگۆ بۆم دەرکەوت ئازایەتی پێوە دیاربوو، نەدەترسا پیاوی ڕۆژی تەنگانە بوو، شەو ڕۆیشتینە ئەشکەوتێك پێیان دەگوت (ئەشکەوتە بزن) هەرچۆنێك بوو ئەو شەوەمان بەسەر برد، بەڕۆژیش خۆمان لە پەنایەك بوارد، بۆ شەوی دووەم خۆمان لە کاولۆك نزیك کردەوە ئەگەرچی ماڵی باوکم زۆر نزیك بوو لە سەربازگەی (حامیە) بەهەر جۆرێك بوو خەبەرم بۆ بەرێ کردن کەوا من لە بناری هەندرێنم شوێنی خۆم بۆ دەست نیشان کردن، شەو بەدرەنگەوە (عزەت)ی برام خۆی هاتەلام گوتی: (وەرەوە ماڵی ئێمە من دەڕۆمە هەولێر بۆلای متەسەریف، بەدرەدین بۆ ئەوەی ناوبراو چارەیەك بدۆزێتەوە)، عزەت لە قسەکانی گوتی: (وادیارە حکومەتە تازەکەی بەعس خەریکە لەگەڵ بزاڤی دەرەوە ڕێك بکەوێت لە بروسکەی صالح یوسفی دا بەدیار دەکەوێ دەبێ پێشان پەیوەندیەکیان بەیەکەوە هەبوبێ بۆ ڕوخاندنی دەسەڵاتی عبدالکریم قاسم)، لە دوای قسەکانی عزەت درەنگی شەو ڕۆیشتمەوە ماڵی باوکم لەکاولۆك لەوێ بەنهێنی مامەوە، ئەوەی جێگای ڕەزامەندیم بوو پشتم بەچەکدارەکانی باوکم بەهێز بوو بەشی زۆریان پشتگیری منیان دەکرد، ئەو ماوەیەی لەوێ مامەوە زۆر ئاگام لە خۆم بوو، هیچ شەوێك خۆم نەدەکردەوە بەڵکو بەشی زۆری شەو لەگەڵ نۆبەتدارەکان دەمامەوە لەدوای دوو ڕۆژ (حەمەدی عولای خۆشکانی‌و ڕەزاقی حمدە بۆری گەلالی) هاتنە ماڵی باوکم لە ترسی گرتن ڕایان کردبوو ئەوانیش

فەرمانی گرتنیان دەرچوو بوو. بەو شەوە بەنهێنی لەویّ ماینەوە ڕۆژانە چاودێری ڕوداوەکانمان دەکرد، دەمانزانی چی هەیەو چی ڕوو دەدا، ئەوەی جێگای دڵخۆشیم بوو لە ڕێگای چەکدارەکانی باوکم توانیم پەیوەندی بەو هاوڕێیانەی نەگیرابوون‌و نەش ڕۆیشتبونە دەرەوە ببەستم بەم شێوەیە ووردە ووردەو لە سەرخۆ لە ڕێگای ئەوانەوە تواندرا کەمێك خۆمان ڕێك بخەینەوەو پچڕاوەکان بگەینینەوە یەکتری‌و لە نوێوە دەست بەکار بین بۆ ڕێکخستنەوەی ڕێکخراوو ئەوەی بتوانین لەم کاتەدا یارمەتی ئەوانە بدەین کە ڕۆیشتونەتە دەرەوە، ئەوەی زاندرا سەرەتا کۆمەڵێك هاوڕێ خۆیان شاردبۆوە سەیری هەڵوێستی حکومەتە تازەکەی بەعس‌و جوڵانەوەی چەکداری کوردیان دەکرد، ئەویش ئەوەی بەدیار کەوت لەیازدەیَ مانگ بڕیارێك دەرچوو شەڕ بوەستیّ لە نێوان حکومەتە تازەکەی بەعس‌و چەکدارەکانی دەرەوە، لەگەڵ بڵاوبونەوەی بڕیاری وەستانی شەڕ بوو بەبەزم‌و شادی، بەڵام ئەوەی جێگای نیگەرانی بوو ئەوانەی داخ لە دڵ بوون لە شیوعیەکان وایان دەزانی بەوەستانی شەڕ کۆتایی بەکێشەی کورد هات‌و ئەوانیش بەئاوات گەیشتن بۆ لێدان‌و لەناوبردنی شیوعیەکان.

لەسەرەتای ئینقلابە گومان لێکراوەکە هەندێ برادەران دەرکەوتن لەڕواندز لەگوندی (کەرەك) کۆبونەوە هەندێکیش لەملاو ئەولا خۆیان پەنادابوو بەنهێنی، بەڵام ئەوەی جێگای ڕەزامەندی بوو لەوکاتە تەنگانەی شیوعیەکان تێی کەوتبوون بروسکەیەکی مەلامستەفا بۆ (مقدم عزیزئاکرەیی) لێپرسراوی هێزە چەکدارەکانی پارتی لە ناوچەی باڵەکایەتی‌و ڕواندز هاتبوو بۆ ئەوەی ئەو شیوعیانەی ڕادەکەن‌و دەردەکەون وەربگیرێن‌و بپارێزرێن، لە دوای ئەو ڕاسپاردەیە ڕێگا کراوە بۆ ئەو کەسانەی مەترسیان لەسەرهەبوو بڕۆنە دەرەوە، ئەوە بوو لە نزیك شاری ڕواندز لەگوندی(کەرەك) بنکەیەکی شیوعیە ڕاکردوەکان کرایەوە کۆمەڵێکی زۆر لەشیوعیە ڕاکردوەکان‌و دۆستانی حزبی تێدا کۆببونەوە.

هەستی پاکی‌و ناپاکی لە ڕێڕەو بەدیار دەکەویّ: ئەوەی لەسەرەوە نوسراوە سەرەتای ڕێڕەوە لە ڕۆژانی ئاڵۆزی‌و تەنگانەدا لە سەرەتای دانانی بنکەی شیوعیە ڕاکردوەکان لەکەرەك، ئەوان پێویستیان بەخۆراك‌و هەندێ پێویستی تر هەبوو بۆیان دابین بکرێت بۆ ئەو مەبەستە ناچار کەوتینە جوڵانەوە بۆ کۆکردنەوەی خۆراك‌و کەلوپەلە پێویستیەکان بەو نیازە ڕوومان کردە کۆمەڵانی خەڵك‌و دۆست‌و

لایەنگرانی حزب بۆ یارمەتی دانی ئەو دەربەدەرانەی ڕایان کردبوو لەدەستی زوڵم، زۆر لە ئەندامانو لایەنگرانی گیرابوون لە ئەندامانی قەزاش (مامۆستا ئەحمەد شێخۆو مامۆستا محمد علی) گیرابوون لە بەندیخانەی ڕواندز بوون، لە بارەی یارمەتی دانی هاوڕێیانی دەرەوە مانگی یەکەم توانیمان یارمەتیەکی باش لە چەکدارەکانی باوکم وەرگرین، دیاربوو سی دینار کۆکرابوەوە ئەو برە پارەمان بۆ ڕەوانەکردن، هەروەها بەشێکی باش خواردەمەنی کۆکرابوەوە لەلایەن ڕێکخراوەکانی شارەوە بەتایبەتی ڕێکخراوی ئافرەتان ئەویشمان بۆ ڕەوانە کردن. ئەوەی شایانی باسە مانەوەی من لەماڵی باوکم زۆر سوود بەخش بوو لەدوو ڕووەوە: یەکەم، توانیم پەیوەندی بەڕێکخراوە پچراوەکان بکەم ئەوانەی مابوون بەنهێنی بیان بینمو لە نوێوە بکەوینەوە کارکردنو جوڵانەوە لە ناو جەماوەری لێدراودا.

دووەوم، پاراستنی من لەوێ وەك بنکەیەکی گرنگ بوو بۆ ڕاپەڕاندنی کارەگرنگەکانی حزب لەوێ زۆر کەس دەهاتنەلام، بەڵام ئەوەی هەستم دەکرد ئەو هاتووچۆیەی ئەو خەڵکە بۆلای من باوکمو عزەتی برامی دڵتەنگ کردبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەنگیان نەدەکرد، پاش ماوەیەك وای لێهات باوکم بەدەنگ بێتو ڕۆژێك پێی گوتم: (ئاگاداربە ئەوەندە هاتووچۆیە مەترسی بەدواوەیە،دەترسم خەڵکانی ناپاك توشی زیانو بەڵایەکمان بکەن)! بەگوێرەی ئەو هەواڵەی پێم گەیشتبوو دەبوایە زۆر وریای خۆم بم لەبەرئەوەی ئاگادار کرابووم سوپاییەکان هەرکاتێ بۆیان ڕێك بکەوێت لەسەرم بازنادەنو دەمگرن کە گیرام موتەسەریف هیچی پێ ناکرێ لەگەڵ عەسکەریەکان لەبەر ئەوە، شەوانیش بەوشیاری زۆر ئاگاداری خۆم دەبووم، هەردەم ئامادە بوم بۆ ڕاپەڕینو دەست کردنەوە، لەبەرئەوەی بیرم لەوە دەکردەوە، ئەگەر نیازی وایان هەبێت بێن بۆ گرتنم نابێ بەئاسانی بیان کەومە دەست، وا ڕێك کەوت شەوێك نۆبەتدارەکان زۆر بەئالۆزی پێیان ڕاگەیاندم کەوا عەسکەریەکان دیارە بەنیازن دێن بۆ قوتابخانە، ئەو شوێنەی ماڵی باوکمی تێدا بوو، کاتێك سەیرم کرد دیار بوو چەند ئۆتۆمبێلێکی سوپای پڕ لە سەرباز گەیشتنە ناو گۆرستانی کارلۆك، یەکسەر دەرکەوتمو زوو خۆم گەیاندە گردە بەرزەکەی پشتی قوتابخانە لەگەڵ هەستانی من (ئەحمەدی عولاو ڕەزاق)یش هەستا بوون، بەڵام ئەوان لەکاتی دەرکەوتنیان (ئەحمەد) فیشەك دانی بەجێ مابوو، ئەوان

هەر ئەوەندەیان پێکرابوو کەلوپەلەکانیان خستبوە باوەشیانو رایان دەکرد، لە رێگا خەریکی خۆپێچانەوە بوون تا ئەوان هاتن من لەمێژ بوو سەرکەوتبومە سەربەرزاییەکەو لەناو سەنگەرێکی سوپا خۆم قایم کردبوو، بەدرەنگەوە ئەوانیش هەوراز دەهاتن، بەلاّم چۆن هاتنێك هەر بەغاردان دەهاتن. بائەوەش لەبیر نەکەین پێش ئەوە ئەوان بگەنە لام دووسێ کەسی تریش لەکاولۆك ئەوانەی لەخۆیان دەترسان زۆر بەگورجی بەسەرکەوتنە سەرگردەکەو هاتنە لام یەکێك لەوان (ووسوی جرجیس) بوو لە ناو سەنگەرەکە هاتە تەنیشتم لەوێ خۆمان قایم کردو ئەوجا ئەحمەدو رەزاق گەیشتن، لەوێ خۆمان بوارد تا تەواو بوە رۆژ کاتێك سەیرمان کرد باوکمیان بانگ کردو رۆیشتە خوارەوە بۆ سەر گۆرستانەکە بۆلای ئەفسەرەکان، بەلاّم زۆر دوانەکەوت لە دوای گەرانەوەی بۆ قوتابخانە زۆری نەخایاند دیاربوو پیاوەکان بەسەرکەوتنە سەربانو دەستیان کرد بەیاری (کەلایانە)، دیار بوو کە هیچ نەبوو زۆری پێ نەچوو سەربازەکان هەستان رۆیشتن بۆلای ئۆتۆمبێلەکانو رۆیشتن، بەدرەنگەوە ئێمەش گەراینەوە وەك بەدیارکەوت بەو نیازە هاتبوون کاولۆك بپشکنن، بەلاّم باوکم پێی گوتبوون: (ئەوانەی ئێوە بەدوایاندا دەگەرێن لێرە نەماونو لەشاخن). ئەوەی راستی بێت ئەوکاتانە بۆ من زۆر ناخۆش بوون لەبەر ئەوەی هەردەم چاوەروانی ئەوە بووم بێن بۆ گرتنم، دەمزانی کۆمەلّێك لەهاورێیانی کاولۆك ئەوانەی دەرکەوتون وا لە(ئەشکەفتە بزنەن)و خۆیان حەشارداوە، وارێك کەوت شەوێکی تاریكوتەرو باراناوی رۆیشتمە (ئەشکەفتەبزنە) لەبناری هەندرێن، بۆلای هاورێیانی کاولۆك، (خدر کاکیلو حاجی جرجیس)یان لەگەلّ بوو ئەو دوانە لەلایەك هاورێم بوونو لەلایەکی تریشەوە خۆشەویستی شەخسیم بوون، بەراستی بۆ ئەوە چووبوم نەگەرێمەوە، بەلاّم کاتێك گەیشتمە ئەوێ زۆری پێ نەچوو(حاجی حسن) ئاغاش پەیدا بوو دیار بوو چووبوە (کەرەك) لای ئەوانی تر تا درەنگی شەو لەوێ لەگەلّ ئەوان دانیشتم لەقسەکانمان رووبەرووی کۆمەلّێك خالّ بووین کە شایانی لێکۆلّینەوە بوونو بەوردی لێ ی دواین، دەربارەی مانەوەی من لای ئەوان گەیشتینە ئەو ئەنجامە پێویست بوو من بگەرێمەوە مالّی باوکم لەوێ بمێنم سوود بەخش ترە لەوەی لای ئەوان بم، ئەوە لەلایەك لەلایەکی ترەوە بیرمان لەوەکردەوە دوور نیە چەکدارەکانی

دەرەوە بزانن من لەدەرەوەم بێن بەدوامداو توشی کارێکی نارێکی لابەلا ببین بۆیە گەڕانەوەم پەسندکرا.

بۆمان بەدیارکەوت ئەو بیروبۆچونەی ئێمە ڕاست دەرچوولە دوای گەڕانەوەی من بەدوو ڕۆژ چەکدارەکانی (ملازم تاهیری علی بەگ) هاتبونە لای هاوڕێیان، پرسیاری منیان کردبوو یەکێك لەچەکدارەکان (پاشا کاولۆکی) بوو بەنهێنی بەحاجی جرجیسی گوتبوو: (بەزراری بلێ ئاگاداری خۆی بێت، لێرە هەوڵ دەدەن بۆ لەناوبردنی). هەرئەوکاتەش بەوانیان گوتبوو، ئێوەش برۆن لێرەو نابێ لەو ئەشکەفتە بمێنن، بڕۆنە بنکەی (کەرەك). لەو کاتە پڕ لەتەنگوچەڵەمەیە نامەیەکی محەلی هەولێرم پێ گەیشت داوایان کردبوو کە پەیوەندی بەبەرپرسی پێشمەرگەکانی باڵەك و ڕواندز بکەین بۆ ئەوەی مەرامو خواستی حزبی شیوعیان پێ ڕابگەیەنین و، ئەگەر هاتوو ناخۆشی لەنێوان شۆڕشگێرانی کوردو حکومەتی بەعس پەیدا بوو، ڕێگا بەشیوعیەکان بدرێ بەشداری لەگەڵ چەکدارەکانی جولانەوەکە بکەن بەپێی توانایان لەڕوو بەڕوو بونەوەی دەست درێژیکەران.

ئەوە بوو لەگەڵ عزەت کەوتمە دوان، بەڵکو بتوانین بەنهێنی پەیوەندی بە(مقدم عزیز) بکەین بۆ ئەوەی چاومان پێی بکەوێت، لەم بوارەدا هەوڵدرا لەدوای ڕەزامەندی (مقدم عزیز) لەکاتی دیاریکراودا لەگەڵ عزەت ڕۆیشتینە گوندی (بنەکاول) لەداوێنی کێوی هەندرێن لەڕووی (دۆلاکۆ) بۆ دیدەنی (مقدم عزیزو حمید حسێن مەلا سیدەکەیی و ئەحمەد سەعید سپینداری)، دانیشتین لەو دانیشتنە زۆر بەوردی باسی داهاتومان خستە بەرباس و لێکۆڵینەوەو گەیشتینە ئەو باوەڕەی شەڕ دەست پێدەکاتەوە، باس لەهەڵوێستی ئێمەکراو بەڵێن ئەوە بوو هەرکاتێ دەست بەشەڕ کرایەوە ئێمە بڕۆینە دەرەوە، ئەوەی دیار بوو عزەت لەسەر داوای مقدم عزیز گوتی: (من دێمە دەرەوە لەو کاتەی ئێوە دەستتان بەشەڕ کردەوە لەگەڵ حکومەت، ئەوکاتە بێ مەرج ئامادەم بێمە ژێر فەرمانی سەرکردایەتی پارتی و بارزانی، بۆئەوەی خزمەتی ئەوشۆڕشە بکەم). لە دوای ئەو من کەوتمە قسەکردن لەگەڵ مقدم عزیزو یاوەرەکانی بەناوی نوێنەری حزبی شیوعی کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵیان، لە سەرەتاوە داوام کرد بەجیا لەگەڵ مقدم عزیز بدوێم، ناوبراو ڕازی بوو، دوو بەدوو کەوتینە قسەکردن ئەو ڕاگەیاندنەی بۆمان هاتبوو پێم ڕاگەیاندو، دیارم کرد کە من

ڕاسپێردراوی حزبم هاتووم لەگەڵتان بدوێمو هەڵوێستی حزبتان پێ ڕابگەیەنم، بەئەمانەتەوە بیروڕای حزبم پێ ڕاگەیاندنو ئەو نامەی هاتبوو ناوەڕۆکی نامەکەشم پێ ڕاگەیاندن. لەلایەکی ترەوە داوام کرد کە ئەو هاوڕێیانەی ئێستا لەدەرەوەنو لە گوندی (کەرەك) دان تەنگاو نەکرێنو توشی کێشە نەبن هەرکاتێ گلەییەکتان لێیان هەبوو ئاگادارمان بکەنەوە، ئێمە چارەسەری کێشەکان دەکەین، بەهەمان شێوەش ئەو شیوعیانەی دێنە دەرەوە کۆسپیان نەخرێتە ڕێگا ئەوان وەك پاڵپشتێك دێنە ڕیزی پێشمەرگەی گیان فیدای کوردستان، مقدم عزیز ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو بەڵێنیدا بەهاوکاری کردنمانو چەند پرسیارێکی ئاراستە کردم: (ئەگەر لەگەڵ حکومەت نەگەیشتینە ڕێککەوتن هەڵوێستی تۆ چی دەبێت؟) گوتم: (هەرکاتێ بۆم دەرکەوت ئێوە نەگەیشتونە ڕێك کەوتن ئەوکاتە دێمە دەرەوەبەو مەرجەی ئەو چەکدارانەی لەگەڵم دان وەك هێزێکی تایبەت لە ژێر چاودێری خۆمدا بنو ئازاد بنو بەربەرەکانیان نەکرێتو بناسرێن کە شیوعین بەشداری لە شۆڕش دەکەن). دیسان پرسی: (ئەگەر هاتوو باوکتو عزەت نەهاتنە دەرەوە تۆ دەتوانی چی بکەیتو هەڵوێستت چی دەبێ)؟ گوتم: (من لەژێر فەرمانی حزبم حزبیش لەگەڵ ئەوەیە هەرکاتێ بوو بەشەڕ لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕ ئێمە لەدەرێین)هەستم کرد عزیز دڵخۆش بوو.

کاتێك تەواو بووین گەڕاینەوە لای عزەتو ئەوانی تر، مقدم عزیز بەعزەتی گوت: (خاڵ عزەت تۆ بفەرموو بگەڕێوەو با کاك زرار لەگەڵ یەك دوو چەکدار بمێننەوە، دەچینە لای شیوعیەکان لە کەرەك جێگایان باش نیە، بەڵکو شوێنێکی باشتریان بۆ دابین بکەین، ئەوێم پێ باش نیە نامەوێ لەوێ بن). هەرئەوکاتە عزەت گەڕایەوە بۆ کاولۆك منو ئەحمەدی عولآو دوو چەکداری تر لەگەڵ مقدم عزیزو یاوەرەکانی کە بریتی بوون لە(حمیدئەفندیو ئەحمەد سەعید) لە بنەکاول سەرەوژێر ڕۆیشتینە خوار بۆ کەرەك هەرلەوێ دەرکەوتین وورده وورده باران لێی داین تا گەیشتینە بارەگای شیوعی لە کەرەك، بێگومان هەمومان زۆر باش تەڕ ببوین، ماوەیەك لەلایان دانیشتین، مقدم عزیز لەگەڵیان کەوتە قسەو گفتوگۆ باسی زۆر شت کرا، بێگومان لەگەڵ مقدم عزیز ڕێك کەتبوین بیان گوازێتەوە گوندە بچکۆلەکەی(لۆغان) بەلآم هەرلە سەرەتاوە (مقدم عزیز) بەنیاز بوو بیان نێرێتە گوندی(بن مێرد)، بەلآم من

بەپەسەندم نەزانی بنێردرێن بۆ گوندی ناوبراو، چونكە شوێنێكە لاپەڕگەیەو ڕێگای هاتووچۆش بۆ ئەوێ نا لەبار بوو، دەبوایە بەناو گوندی (فەقیانو ئاكۆیان) دا تێپەڕ بن، ئەو گوندانەش وا تێگەیەندرابون كە شیوعیەكان دوژمنی ئاینن، لەوانە بوو لەگەڵ خەڵكی نەزانو ساویلكە توشی كێشەی لابەلا بن، ئەوەی جێگای ڕەزامەندیم بوو(مقدم عزیز) ڕایەكەی منی پەسەند كردو لەسەر ڕێكەوتنەكەی پێشان ماینەوە. لەوماوە كورتەدا لەگەڵ هاوڕێیان (مام الیاسو ئیبراهیم عبدالله سلێمانو حاجی حسن ئاغاو صدیق عولا ئاغاو خدر كاكیل)و ئەوانی تر دووامو داوام لێكردن لیژنەیەك ڕێك بخەن بۆ هەڵسوڕاندنی كارەكانیانو لە پەیوەندی بەردەوام بن لەگەڵ منو بۆ دابین كردنی پێویستیەكانتان دەست بەكار بن.

(مقدم عزیز) ئەوكاتە داوای لە هاوڕێیان كرد خۆیان كۆبكەنەوەو ئامادە بن هەر ئێستا لەگەڵ خۆمتان دەبەم بۆ لۆغان، ئێرەم پێ باش نیە مەترسی بەدواوە هەیە جێگەشتان بەرتەسكە، ئێمە لەوگفتوگۆیەدا بووین ئاگاداركراین كە لاوێكی تازە پێگەیشتوی شیوعی لە كاولۆك تفەنگی پۆلیسێكی ڕفاندوەو گەیشتۆتە ئێرە، كاتێك لاوەكە هاتە لامان بینیم كوڕی (سۆفی عالی مستەفا) یە كە تەمەنی چواردە ساڵ بوو، تفەنگی لە دەستی پۆلیسەكە ڕفاندبوو بەناو خەرەندا هەڵاتبوو پۆلیسیش بەدوای كەوتبون، بەڵام خۆشبەختانە بەسەلامەتی دەرچوو بوو،(مقدم عزیز) بەخێرهاتنێكی زۆر گەرمی لێ كرد، منیش لە دوای ئەو بەخێرهاتنم لێ كردو هەندێ فیشەكیشم پێدا، بەڵێنیشم پێدا ڕەختە فیشەكێكیشی بۆ بنێرم.

لەوێ (مقدم عزیز) هەستاو ماڵاوایمان لەیەكتری كرد، ناوبراو بەهاوڕێیانی گوت: (كەلوپەلەكانتان هەڵگرن وەرن بۆ لۆغان لەوێ چاوەڕێتان دەبین)، ئەوەبوو بەرەو ئاكۆیان بەڕێ كەوتن، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ كاولۆك، پێش ئەوەی یەكتر بەجێ بهێڵین مقدم عزیز گوتی: (خاڵ زرار تكایە سەریان لێ مەبڕە، منیش هەركاتێ هاتمە ئەوناوە سەریان لێ دەدەم، بەملازم تاهیر دەڵێم ئاگاداریان بێت).

ئەوكات بەبناری هەندرێندا گەڕاینەوە كاولۆك، ئەوەی شایانی باسە هەرلەوكاتەی بەتەنیا لەگەڵ (مقدم عزیز) دانیشتم هەستم كرد كە عزەت ئاڵۆز بوو دیاردەكی ئاشكرای پێوە دەبیندرا، ناوبراو پێش ئەوەی بڕۆین بۆلای مقدم عزیز وایدەزانی من داوای تایبەتیم هەیە، بەڵام كاتێك دیتی بەچ شێوەیەك لەگەڵ مقدم

عزیز دەدوێم‌و قسەکانی من لەگەڵ عزیز دورر بوو لەو خەیاڵەی عزەت بیری لێ دەکردەوە، ئیتر هەرلەوکاتەوە زانی کەمن لە حزب دانابڕێم.

ئەوەی زاندرا هەر لە زووەوە حکومەتە ناپاکەکەی بەعس نیازی باش نەبوو لەگەڵ شۆڕشگێرانی کورد،ئەویش بەوە بەدیارکەوت ئامر لیوای زارگەلی علی بەگ (عبدالرحمان تکریتی) هەندێك سەرۆك جاشی بانگ کردبوون‌و لە قسەکانی هەڕەشەو گوڕەشەی کردبوو گوتبوی: (شەڕ دەست پێ دەکاتەوە، بەڵام ئەمجارە وەهایان لێ دەدەین هەموو خانوەکانیان بەسەردا دەڕوخێنین‌و کچەکانیان دابەشی سەر ئێوەو عەسکەریەکان دەکەین) زۆر قسەی ناشیرینی تریشی کردبوو، لە کۆتایی کۆبونەوەکەدا (کریم خان‌و عزەت‌و کوردۆ) جنێوێکیان بەخۆدابوو کە تفەنگ بۆ ئەو حکومەتە ناوێن ئەگەر شەڕ بوەوە، بەڵێ شەڕ دەست پێ کرایەوە ئەوەی بەدیارکەوت (کوردۆ وکریم خان) لە جاران زیاتر لێیان چوونە پێش‌و زیاتر بەر ئەمر بوون.

بنکەی شیوعیەکان لە گوندی(لۆغان) لە نزیك ئاکۆیان ببوە بنکەیەکی جەماوەری‌و کۆمەڵێکی زۆری شیوعی تێدا کۆببونەوە، ئێوارەیەك درەنگ (سەعید رزاق) یەکێك بوو لە شیوعیە چالاکەکان لەوانەی لە بنکەی لۆغان بوون، سەعید شیوعیەکی چالاك‌و زیرەك بوو ناوبراو باوك‌و دوو برای چەك هەڵگری سلێمان بەگ بوون، ناوبراو ڕاسپێردرابوو هاتە لام نامەیەکی بۆ هێنابووم داوایان کردبوو برۆمە(لۆغان) لە نامەکەدا نوسرابوو یەکێك لە هاوڕێیانی سەرەوە هاتووە دەیەوێ تۆ ببینێ بۆیە پێویستە بێیت، لەگەڵ سەعید ڕێك کەوتین کە بەیانی زوو برۆین، لەکاتی دیاریکراودا ڕۆیشتمە لۆغان دیاربوو (ئەسعەدی فاتمە سۆرێ) بوو هاتبوو دانیشتنێکی دوورو درێژمان ئەنجامدا لە دواییدا لەگەڵ ئەو لیژنەی لەوێ ڕێکخرا بوو دانیشتین، لە دانیشتنەکە کۆمەڵێك شت خرانە بەرباس‌و لێکۆڵینەوە لە دواییدا ئەسعەد داوای لێ کردن ئەگەر چیان هەبێت دەتوانن بیڵێن، کەس دەنگی نەکرد، هەر ئەوەندەم زانی (برایمی عولای سلێمانی) ڕواندزی زۆر مەردانە وەك شیوعیەکی چاو قایمی دڵ پاکی بەجەرگ هاتە قسەو گوتی: (زۆر شەرمە خۆتان مات دەکەن، ئەوە هاوڕێ زرارە لەپێش ئێوە ئەوەی هەتانە ڕووبەڕوو لەگەڵی بدوێن ئەوەی لەمەودوا لەپاشە ملە جارێکی تر باسی هاوڕێ زرار بکات ئاشکرایە ترسنۆکەو شیوعی نیە بەڵکو بۆ خراپەکاری باسی دەکەن ئەگەر ڕاست دەکەن بفەرمون

شیوعیانە لەگەڵی بدوێن و ئەوەی لە دڵتانە بیڵێن). لە دوای قسەکانی برایم بێ دەنگی بوو، ئەسعەد بەقسە هات و گوتی: (برایان دەڵێن ئەشیایەکی زۆر کۆ دەکرێتەوە، کەچی زۆر کەم دەگاتە ئێرە!؟) گوتم: (ئەوەی کۆ دەکرێتەوە لیژنەیەکمان داناوە بۆ وەرگرتنی ئەو شتانەو بۆ ئێوەی ڕەوانە دەکەن، ئەو لیژنەیە بەپرسیارەو هیچ پەیوەندیەکی بەمنەوە نیە، هەر بگەڕێمەوە ئاگاداریان دەکەم بۆ ئەوەی لیستتان بۆ بنێرن و لە لیستەکە دیار بکرێت ئەو شتانەی بۆتان کۆکراوەتەو ڕەوانە کراوە).

دوای ئەوەی بۆم بەدیار کەوت (زرار عبداللەو حاجی حسن ئاغا) هەندێ لەوچەیان کردبوو هەر ئەوانیش هەردووکیان دەستیان لە پەنادانی ئەشیایەکان هەبوو، دەیان ویست شوێن بزری بکەن، بەڵام زۆری پێ نەچوو کارە ناڕەوایەکەیان بەدیارکەوت شەرمەزاریان بۆ مایەوەو لە هەوڵە چەوتەکەیان سەرنەکەوتن. کاتێك گەڕاینەوە کاولۆك شەو درەنگ بوو پێیان گوتم: (شوکریە حمدامین دێوانە بەنهێنی گەیشتۆتە ماڵی باوکم، ناوبراو مامۆستا بوو لە هەولێر ڕای کردبوو بەدرەدینی متەسەڕیف فەرمانی دەرکردبوو دەبێ شوکریە بگیرێت چ بەزیندویی چ بەمردویی!).

(شوکریە)م بینی لەگەڵی دوام ڕازی بوو بڕواتە بنکەی شیوعیەکان، هەر ئەوشەوە بێ دواکەوتن بەڕێمان کرد بۆ بنکەی لۆغان و بەسەلامەتی گەیشتە ئەوێ، ئەوەی جێگای باسە لەدوای گەڕانەوەی (ئەسعەدی فاتمە سۆرێ) زۆری پێ نەچوو (نەجمەدین مامۆ) بەنهێنی هاتە کاولۆك شەو ڕۆیشتمە لای لەماڵی(خدرکاکیل) زیاتر لەسێ کاتژمێر دانیشتین، لەماوەی ئەو دانیشتنە درێژخایەنە زۆر بەوردی باسی ئەو ڕێڕەوەی ڕۆژانی ڕووداوە ڕەشەکەی(١٤ی ڕەمەزان) توشی بووین لەڕواندزکرا، هەروەها باسی دەست و بردو ئەو هەوڵەی کە درابوو لە ڕۆژانی کودەتایە ڕەشەکەی بەعسدا کراو باسی هەڵوێستی هیچی ئەو ئەفسەرە ترسنۆکەی کە بەرپرسی حزب بوو لەحامیە بۆم گێڕایەوە کەبەچ شێوەیەك پەیوەندیم پێوەکرد ئەوجاش ڕازی نەبوو کە من چومەتە لای!.

بەگشتی دەربارەی دەربەدەرەکان و بەخێوکردنیان باس و لێکۆڵینەوەمان کرد، پەیوەندی بەستن لەگەڵ (مقدم عزیز)و هەڵوێستی ناوبراوو ڕێکەوتنی هەردولامان کە ئەوان کۆسپ نەخەنە ڕێگامان ئەوانەی دێنەدەر بەئارەزوی خۆیان بێنە بارەگای شیوعی و کەس داوای چەکیان لێ نەکات بەنیازی چەك کردن تەوەرێکی تری

ـسەکەمان بوو. لەو باسو لێکۆڵینەوەیە بەدیارکەوت ئێمە باشتر بووین ـەشوێنەکانی تر، لەدواییدا باسی هاتنی ئەسعەدم کردو ئەو شتانەی باسی ـێکرابوون بۆ ئەویشم باس کردن بۆ ئەوەی بەجێگای خۆی ڕابگەیەنێ، ناوبراو گوایا ـەبوایە بەپەلە ڕەزامەندی حزب وەربگرێ دەربارەی دەرکەوتنی من بۆ دەرەوە ـەبەرئەوەی هەست بەمەترسی دەکرا نیازی عەسکەریەکان خراپ بوو هەموو هەوڵێکیان ئەوەبوو لە دەرفەتێك دەگەڕان بۆ دەستگیرکردنی من، بەلاّم من زۆر ووشیار بووم لەبەرئەوەی لەسەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو ئاگادارکرابوم کە(عبدالرحمان تکریتی) ئامر لیوای زارگەلی علی بەگ گوتبوی: (ئەگەر هەلێکمان بۆ بڕەخسێت دەبێ زرار بگرین لەبەرئەوەی ئەو سەری مارە، بەلاّم جارێ کارمان پێیانە)! ئەو داواکاریانەی بەئەسعەدم بەڕێ کردبون هیچ وەلاّمێکی دیار نەبوو بۆیە بە(نەجمەدین)م گوت: (بەڕاستی دەزانم زوو حزب بڕیار بدات من بێمە دەرەوە).

کاتێك نجمەدین ئەمەی بیست هەر زوو گوتی: (هاوڕێ منیش لەگەڵ ئەوەم تۆ بێیتە دەرەوە بۆ ئەوەی هێزێکی پتەومان لێرە هەبێت‌و دەور بگێڕێت‌و پشتی پێ ببەسترێت، بەلاّم داوات لێ دەکەم سەبرت هەبێت من دەڕۆمەوە لە ماوەیەکی کورتدا دەگەڕێمەوەو بڕیاری حزبت بۆ وەردەگرم، هەوڵ دەدەم بەڵکو خۆشم بێم لێرە بمێنمەوە بەبەردەوامی). لەوکاتانەدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئاڵۆزی‌و پەشێوی زیاتر بەدیار دەکەوت‌و تا دەهات ناکۆکی لە نێوان ڕژێمی بەعس‌و شۆڕشگێڕانی کورد زیاتر دەبوو، بەعسیەکان بەئاشکرا لە دژی پێشمەرگە قسەیان دەکردو بەبەردەوامیش جاشی نوێیان کورتان دەکردن ئەوەی دیاربوو ڕۆژگار بەرەو تەنگی دەڕۆیشت.

لەو دەمانەی گرژی‌و ئاڵۆزی هەردوولا ڕوو لە توندی بوو(عزەت) لەهەولێر گەڕایەوە ئەویش وای نیشاندا کە شەڕدەست پێ دەکاتەوە لەبەر ئەوەی بەعس بەداواکاریەکانی کورد ڕازی نیەو دەڵێن دەبێ پێشمەرگە چەك دابنێن!.

ناوبراو گوتی: (لەگەڕانەوەم حاجی مەلام لەگەڵ خۆم هێنا ماوەیەك بوو لە هەولێر خۆی حەشاردابوو نەیدەتوانی بێتەوە، لەخلیفان دابەزی لەوێوە ڕۆیشتەوە لۆغان). ئەو پەشێوی‌و ئاڵۆزیەی نێوان هەردوولا وای دەگەیاند خۆیان کۆ دەکردەوە بۆ ڕووبەڕوو بونەوەیەکی تر، ئەوەبوو مقدم عزیز داوای کردبوو من‌و عزەت بچین چاومان پێی بکەوێت، لەسەر داوای ناوبراو شەوێك ڕۆیشتینە (بێشوك) درەنگی

شەو گەیشتنە جێ، لەکاتی بەیەك گەیشتن مقدم عزیز واهەست دەکرا هاندرا بێت، وەك جاری پێشوو ڕووکراوە نەبوو پێ دەچوو زوویر بێت، لەکاتی قسەکردنیدا دەیویست بمان ترسێنێ بەهەڕەشەو توندی، بەڵام هەزوو بەرپەرچی قسەکانم دایەوەو گوتم: (ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین بمان ترسێنی بەڕێگای هەڕەشەو توندوتیژی ناتوانن سوود لەئێمە وەرێگرن، تکایە بەو شێوەیە ڕوومان تێ نەکەن). کاتێك عزیز بینی ئێمە لەهەڵوێستی ئەو نیگەرانین‌و ڕووگرژی‌و زوویری بەهیچ ناچێت دیاربوو بەرەو سارد بونەوە پاشەکشەی‌کردو کەمێك وەستاو لە دواییدا گوتی: (باشە بۆ شیوعیەکان هاتوچۆی گوندەکان دەکەن بێ ئەوەی ئاگاداری کەس بکەن)؟ گوتم: (چۆن نابێت بچن بۆخۆیان کەلوپەل‌و پێویستیەکان ڕێك بخەن، ئەوانەی ماڵیان لە گوندەکانە بڕۆنەوە ماڵەکانیان، خۆبەند نەکراون! ئەگەر بەندیشن ئەوە شتێکی ترە!).

دیاربوو عزیز بێ دەنگ بوو کەچی (بێجان جندی) بەدەنگ هات‌و وای خۆ نیشاندا کە ئەویش دەم ڕاستێکە دەستی کرد بەقسەی بێ کەڵك‌و بەتاڵ زوو بێ دەنگم کردو پێم گوت: (تکایە تۆ قسە مەکە لەبەرئەوەی من تۆ باش دەناسم ئەگەر هەموو کەس مافی قسەکردنی هەبێت لەگەڵ ئێمە تۆ ئەو مافەت نیە، تۆ بۆ ئەوکەسانە بدوێ کەنەتناسن‌و نەزانن تۆ کێی!) ناوبراو زیاتر نەدواو بەشەرمەزاری بێ دەنگ بوو. لەوکاتەی هەستاین بگەڕێینەوە مقدم عزیز منی جیاکردەوەو گوتی: (خاڵ زرار تۆ عادز نەبی من لەبەر ئەوەی بەم شێوەیە بەتووندی دوام باوەڕیم نیە عزەت بێتە دەرەوە لەبەرئەوەی ئەوان فێری پارە وەرگرتن بووینە دەستیان لە پارە بەرنابێت بۆیە باوەڕمان پێیان نیە). پێم گوت: (خەراپ تێ گەیەندراوی ئەگەر بەعزەتی بێت ئێستا دێینە دەرەوە، لەسەر شەڕ ڕاناوەستین ئاخۆ کەی دەبێت، بەڵام هێشتا نەمان توانیوە باوکمان ڕازی بکەین ئەوەیە کۆسپ لەسەر ئەوەی ماوین تا ڕازی دەکەین). هاتینە دەرەوە بڕۆین (وەهاب ئاغا) لێم نزیك بوەوەو گوتی: (تۆ پەلە بکە زوو وەرە دەرەوە خۆت بەباوکت‌و براتەوە مەبەستەوە ئەوان نایەنە دەرەوە. گوتم: (کاك وەهاب بەبێ ئەوان من نایەمە دەرەوە، کەس بۆ من نابێتە باب‌وبرا لەهیچ کاتێکدا)، شەو زۆر درەنگ بوو لە(بێشوك) دەرکەوتین بەنێوان سەنگەرەکانی

ـوپادا تێپەڕبووین زۆری نەمابوو تەقەمان لێ بکرێت، شوێنی پێدا ڕۆیشتنمان مەترسی داربوو ئێمەش زۆر بووین بەناو سەنگەرەکان دا بەنهێنی ڕۆیشتین.

لەڕێگا بەعزەتم گوت: (ئاگادار بووی مقدم عزیز چۆن خەریك بوو بەگەف و هەڕەشە بمان ترسێنێ دیار بوو هاندرابوو)، ئەو دیدارەی پێشوك بۆ ئێمە زۆر بەسوود بوو بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ من هەستم دەکرد دەیانویست من لە باوکم دوور بخەنەوە بۆ ئەوەی بێ سەنگی بکەن، بەڵام دوایی بۆم ڕۆن بوەوە خواستی ئەوانەی مقدم عزیزیان هاندابوو چیە!! ڕێکەوتی سەری مانگ بوو، دەستکرا بەکۆکردنەوەی یارمەتی بۆ ئەوانەی لە دەرەوە بوون لەو دەستو بردەش زیاتر لە پەنجا دینار کۆکرابوەوە لەناو چەکدارەکانی باوکم، ئەو برە پارەیە ئامادە کراو خەریك بوو بۆیان بنێرین، بەڵام پێش ئەوەی بۆیان ڕەوانە بکەین نامەیەکی لیژنەی سەرپەریشتیکەرانی پێشمەرگەکان گەیشت ئاگاداریان کردین پارەی کۆکراوەیان بۆ نەنێرین، لەبەر ئەوەی چەند ئەفسەرێکی ڕاکردووی شیوعی گەیشتونەتە بنکەکەیان ئەوان پارەیان پێیە ئەو مانگە خەرجی بنکە دەدەن، ئەوانیش لەگەڵ ڕای ئێمە بوون کە پارەی کۆکراوە بدەین بەماڵی ئەوانەی گیراون، چونکە پێویستیان بەیارمەتی هەیە، بۆ ئەو مەبەستە زۆر بەووردی لیستی گیراوەکانمان سەیرکرد ئەوەی بەپێویست زاندراو زۆر دەست کورت بوو دەست نیشانمان کرد بۆ یارمەتی، لەکاتی دابەش کردن پارەی چەند ماڵێك درابووە دەستی خوشکێکی باوەڕ پێکراوی چالاك کەناوی (هەمین جرجیس) بوو کە پارەکەیان بداتێ، پێش ئەوەی خوشکی ناوبراو پارەکەیان بۆ ببات بەڕێکەوت (حاجی حسن ئاغا) لەلۆغان بەنهێنی گەڕابوەوە کاولۆك، ناوبراو لە لیژنەی لۆغان بوو دەزانێ پارە لای (هەمین) داندراوە بۆ ئەوەی بدرێتە ماڵی گیراوەکان، بەپەلە دەڕواتە لای (هەمین) بەناوی لیژنەی قەزا پارەکەی لێ وەردەگرێتەوە، بەوبیانوەی گوایا ئەوان پێویستیان بەوپارەیە هەیە، وەك زاندرا خۆشی تورە کردبوو گوتبوی (بۆ زرار نازانێ ئێمە لەلۆغان پێویستیمان بەپارە هەیە!) وادیاربوو خوشکە (هەمین) وای زانیوە بەڕاست بڕیاری لیژنەی قەزایە بەبێ ئەوەی پرس بەئێمە بکات پارەکەی پێدا بوو، کاتێك ئێمەش ئەمەمان بیست بەپەلە بنکەی لۆغانمان ئاگادار کرد کەوا (حاجی) کارێکی ئەوهای ئەنجامداوە لەگەڵ ئەو کارە بێڕێزو ناشیرینەش ویستویەتی بێ دەنگی لێ بکاتو وانیشان بدات کە شتی

وانەبووە، بەڵام خوشکە هەمین زۆر ئازایانە بەگژیدا چووەو ڕیسوای کرد جگە لە شەرمەزاری هیچی تری بۆ نەماوە.

لەدوای ئەوکردەوە ناپەسەندەی (حاجی ئاغا) هەوڵماندا بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو کەلوپەلەی کۆدەکرایەوەو دەناردرا بۆ بنکەی لۆغانو بەدەستیان نەدەگەیشت، لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیە بەدیارکەوت ئەو کەلوپەلانەی کۆدەکرانەوە پێش ئەوەی بەڕێ بکرێنو بنێردرێن لەماڵی (زرار عبدالله) دادەندران، ژنەکەی ناوبراو لە لیژنەی کۆکردنەوەی کەلوپەلو خۆراك بوو، گەیشتینە ئەو ئەنجامە کەوا ژنەکەی زرار عبدالله،(گوڵ بەهار) زۆری لەو ئەشیایانەی پەنا دەدا، بەشێکی بەناوی خۆی بۆ مێردەکەی دەنارد، نەك بەناوی ڕێکخراو، زراریش وای نیشان دەدا گوایا ئەو لەماڵی خۆی یارمەتی بنکە دەدات، لە دوای ئاشکرا بوون شتەکەی کۆکرایەوەو گواسترایەوە شوێنێکی ترو (خدرحسێن) دیار کرا بۆ بردنی شتەکان لەگەڵ (ڕەئوف)، ئەوجا شتەکان زۆر بەڕێکی دەگەیشتە شوێنی خۆی، ئەوکاتە هەڵوێستی ناپەسندی زرارو ژنەکەی بەدیارکەوت، لە دوای ئەو ئاشکرا بوونە چیتر یارمەتی بنکەی نەدا. بەڵێ (حاجی حسن ئاغاو زرارعبداللەو گوڵ بەهار) کادیری حزب بوون ئەوەش کردەوەیان بوو لە پێناو خزمەتی گەلو خەڵکی چەوساوە.

ئێوارەیەك بەدرەنگەوە (علی عەجەم) بەتەنگاوی هاتەلامو پێی ڕاگەیاندم کەوا بەیانی ئەو شیوعیانەی بەندکراون لەڕواندز بەڕێ دەکرێن بۆ هەولێر، ئەگەر بتواندرێت چارەیەکیان بۆ بدۆزیتەوە وا دیارە بۆ لەناو بردنیان دەنێردرێنە هەولێر. پێم گوت: (علی هیچ شکی تێدا نیە ئەگەر بەڕێ بکرێن لەکاتی دەوام بەڕێ دەکرێن تۆ بڕۆوە سەرەوە لەوێ بزانە لەچ کاتێك بەڕێ دەکرێنو چەند ئۆتۆمبێل دەبن؟ ئێمە لەکاولۆك چاوەڕێت دەکەین تا دێیتەوە). شوێنیشمان بۆ دیار کرد کە لەکوێ دەبین.

لەدوای ڕۆیشتنی (علی عەجەم) کەوتمە بیر کەوتنەوە چۆن بتوانین کەمینێك بۆ ئەو ئۆتۆمبێلانە دابنێین کە بەندیەکان دەگوازێتەوە بۆ هەولێر، بۆ ئەو مەبەستە چاوم بە(خدری عولا بەگو تاهیری حەمەد)ی کەوت ئەو باسەم پێ ڕاگەیاندن لەدواییدا ناردمان (حەسەنی عولای حوسێنیو حەسەنی ئەحمد سەران)یش هاتن پێمان گوتن (شتێکی ئەوها هەیەئێوە چی دەڵێنو چیان بۆ بکەین؟)ئەوەی جێگای دڵخۆشی بووخدر زۆر مەردانە گوتی: (چیان بۆ بکەین! بەیانی دەڕۆین لەناو

ئەستریەکانی گۆڕستانی خوار قەلاتی پاشا چاوەڕوانی ئۆتۆمبێلەکان دەکەین هەر کەگەیشتنە لامان یەکسەر لێیان دەدەین ئەگەر توانیمان نەجاتیان بدەین لەگەڵ خۆمان دەیانبەین بۆ پشتی گوندی کەورینو لەوێش دەیانگوازینەوە زێوە). ئەوانی تریش قسەکانی خدریان پەسند کردو پێی ڕازی بوون، بۆ بەیانی زوو خۆمان کۆکردەوەو چەند چەکداری دیکەشمان لەگەڵ خۆبردن، ئەوانەی جێگای باوەڕ بوون، لەکاتی دیاریکراو ڕۆیشتینە کاولۆك، بەلام بارانێك دەباری کەس نەیدەتوانی سەر دەربخات لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆیشتینە شوێنە دەست نیشان کراوەکە لەژێر ڕەحمەتی ئەو بارانە چاوەڕوانی هاتنی ئۆتۆمبێلی بەندیەکان بووین ئاخۆ کەی دێن، کاتێك بەدرەنگەوە علی عەجەم بەدیارکەوت گوتی: (شەو لە ڕێگای مام قادر ئەوەی خۆراکی بەندیەکان دەبات خەبەرم بۆ ناردن کە ڕێگا لە ئۆتۆمبێلەکان دەگیرێت بۆ ئازاد کردنیان)، کاتێك مام قادر گەڕایەوە ئەو نامەی هێنا بوو پێشیان گوتبوو نامانەوێ ڕێگا بگرن، کاتێك نامەکەم کردەوە کورتە نامەیەکی دەست نوسی (کریم قاسم) بوو نوسی بوی: (ئێمە هیچمان لەسەر نیە ئەوەی بەنیازن پێویست ناکات وازی لێ بینن، ڕێگا مەگرن بۆ بەردانی ئێمە. لەوێ بەبەرگی تەڕ بەو ساردیە گەڕاینەوە کاولۆك ئەوانیش هەر بەڕێ نەکران).

دوای تێپەڕ بوونی ئەو کێشەو بێشەیە دیسان (سەعید رزاق) ئێوارەیەك هاتەوە لام ڕاسپێردرابوو پێمی ڕاگەیاند کەوا شەو هەندێ لە برادەران دەیانەوێت چاویان بەتۆ بکەوێت دێنە نزیك قوتابخانە لە کاتژمێر هەشت ونیو، بەلێ لەگەڵ داکەوتنی تاریکی لە نزیك (قونگرێ شەمامی) لەگەڵ ئەوبرادەرانەی لەلۆغان هاتبوون بەیەك گەیشتین، ئەوانەی لەگەڵیان دانیشتم (ڕەئیس کمال نعمان، ملازم ئیحسان، حاجی ملا سعید)و هەندێ چەکداریشیان لەگەڵ بوون لەو بەیەك گەیشتنە کۆمەڵێك گیروگرفت خرانە بەرباسو لێکۆڵینەوە بەشێوەیەکی تایبەتی باسی ئەوە کرا ئەگەر هاتوو شەڕ دەست پێ بکاتەوە باوکمو عزەت نێنە دەرەوە دەبێ هەڵوێستی ئێمە چی بێت؟ ملازم ئیحسان گوتی: (هەرکاتێ هەستتان کرد ئەوان نایەنە دەرەوە ئەوکاتە ئێوە دەرکەون ئەمە هیچ قسەی لەسەر نیە)، کەچی حاجی مەلا هەر زوو بەرپەرچی دایەوەو گوتی: (ئەوانەی چەك هەڵگری عزەت بن نابێ ناوبراو بەجێ بێڵێ بەهیچ جۆرێك)، لێرەدا هەڵوێستی حاجیمەلا بەدیارکەوت تا چ ڕادەیەك بەرژەوەندی حزبی

لەبەرچاو بوو چۆن لابەلا بۆکارەکان دەچوو، دیار بوو ملازم ئیحسان‌و ڕەئیس کمالیش هەستیان بەومەیلانەی حاجی مەلا کرد.

ڕەئیس کمال‌و ملازم ئیحسان بیروڕایان ئەوە بوو من هەرلەویٚ بمێنم بۆ ئەوەی زیاتر هەوڵ بدرێت رێکخستنەکەی شار تەواو رێك بخرێتەوەو کەلوپەلی زیاتریش بۆ ئەوانەی دەرەوە دابین بکرێت. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئالۆزی‌و ناخۆشی لە پەرەستاندن دابوو لە نێوان بەعس‌و هێزی پێشمەرگە ئەنجامی ئەو ناخۆشی‌و تێکچوون‌و ئالۆزیە چاوەڕوانی مەترسی لیٚ دەکرا، هەرلەو دەمەدابوو شەوێك لە سەربازەکانی پاسەوانی مەکینەی ئاوی (حامیە) درا، بەو نیازەی چەکی سەربازەکان ببەن، تاوانەکەش بخەنە سەرشانی چەکدارەکانی سلێمان بەگ، بەڵام لەدواییدا زاندرا کیٚ بوون‌و بۆچی بەو کارە هەستا بوون؟ ئەوکارە بووە بیانوو بۆ ئامیر لیوای سەربازگەی (زارگەلی علی بەگ) جارێکی تر سەرۆك جاشەکانی ناوچەی ڕواندز بانگ بکات‌و لەگەڵیان بدوێت. هەمان تکریتیەکەی جاری پێشولەگەڵیان دوابوو ئەوجارە عزەت نەچوو بوو، ڕۆژی دووەم (کوردۆی نوری باویل ئاغا) لەماڵی باوکم قسەکانی تکریتی بۆ گێڕاینەوە. ئەو پیاوە داخ لەدڵە زۆر لە جارەکانی پێشووتری توندو تیژتر ئاخاوتبوو گوتبوی: (ئەوا شەڕ دەست پیٚ دەکاتەوە ئەوجارەی دەزانن چیان پیٚ دەکەین، دەبیٚ گوندەکانیان بەبلدۆزەر بکەینەوە دەشت‌و هێزە چەکدارەکانیشمان لەماڵ‌و منداڵیان بەردەدەین. نابیٚ روشەی کوردیان هەر بەبیر بێتەوە!) بەقسەی کوردۆ دیارە زۆر قسەی بێڕێزی تریشی کردبوو، ئەوەی ڕاستی بێت ئەو تکریتیە بیٚ ڕێزە وا دەردەخا بەعس زۆر لەقەومیە شۆڤینیەکانی تری عەرەب دژی کوردن، عزەتیش زۆر بەقسەکانی تکریتی پەست ببوو بەمنی گوت: (برا خۆ قسەکانی تۆ ڕاستن کە ئەو کودەتا چیە بەعسیانە زۆر لە قەومیە شۆڤینیەکان نیاز پیس ترن، نیازە گڵاوەکانیان لە ئەندازە بەدەر خراپە پیاو زیاتر ناتوانیٚ لەگەڵیان بێت تازە چار نیە دەرۆمە دەرەوە). ئەوەی بەدڵم بوو ئەوەبوو چاوەڕوانی هەڵوێستێکی ئەوهای عزەت بووم ئەوجا گوتم: (ئازیز ئەگەر مەلامستەفاش وەرم نەگرێت دەرۆمە ئەشکەفتێك بابمرم بەلامەوە زۆر سەربەرزترە لەوەی نەك گوێم لە قسەی ئەو جۆرە دوژمنەی کورد بیت، ئەگەر هاتوو باوکیشم بمێنیٚ من دەڕۆم‌و بەبەردەوامی چاوەڕێی هەڵوێستێکی ئەوهای تۆم دەکرد).

لەرۆژانی ئاڵۆزیو ناخۆشی شەوێك (عومەری شێخ عولای) بەنهێنی لە ماڵی باوکم پەیدا بوو ناوبراو نێردراوی مەلامستەفا بوو، نامەیەکی بۆ باوکم هێنا بوو نامەکە پڕ لەگلەیی بوو بۆ سلێمان بەگ کە نوسیبوی: (میری من بەس نیە تاکەی لێم دوور دەوەستی بیر لە تاڵیو ناخۆشیو بەسەرهاتەکانی ڕابوردوو ناکەیتەوە، ئەوەی بەیەکەوە پێیدا تێپەڕ بووین ڕوحمێکت هەبێت). ئەوەی بووە جێگای خۆشحاڵیمان، نامەکەی بارزانی دڵی سلێمان بەگی نەرم کردو وای لێکرد بیربکاتەوە، ئێمەش لەگەڵی کەوتینە هەوڵدان توانیمان پێی بڵێین پێویستە لەگەڵ گۆڕانکاریەکان بڕۆین ئەگینا تووشی لۆمە دەبینو مێژووش ڕەحمان پێ ناکات. ئەوە بوو باوکمان ڕازی بوو بڕوات مەلامستەفا ببینێ لەدەوروبەری خلیفان لە گوندی (سرێشمە) بەڕێکەوت لەوکاتانەدا (بەدرەدین علی) ناردبووی سلێمان بەگ بڕواتە هەولێر، لەگەڕانەوەیدا باوکم لای دابووە گوندی (کەڵەکین) لە ماڵی حسێن ئاغای سەرچیا دابەزی بوو ئۆتۆمبێلەکەیان بەجێ هێشتبوو بەسواری وولاخ ڕۆیشتبوونو حسێن ئاغاش لەگەڵی چووبوو بۆ سرێشمە، لەوێ لەگەڵ مەلامستەفابەیەك گەیشتبوون، حسێن ئاغا باسی ئەو دیدارە دەکاتو دەڵێت: (من وام دەزانی ناوبژی کەرو ڕێ ڕۆنکەرەوەم بۆ ئەم دیدارەی ئەو دوو کەسەی ماوەیەکی زۆر لەیەکتر ناڕازی بوون، کەچی لەوکاتەی مەلامستەفاو سلێمان بەگ بەیەك گەیشتن خۆ ئێمەیان هەر بەبیر نەماو لە بیرکراین، ئەوان دانیشتن تالای بەیانی گلەییو گازەندەیان لەیەکتر دەکرد)، ناوبراو درێژە بەقسەکەی دەداتو دەڵێت: (بەڕاستی مەلامستەفا ڕێزێکی زۆری سلێمان بەگی گرت). لەو دیدارە سلێمان بەگ بەڵێنی دا هەرکاتێ شەڕ دەست پێکرایەوە لەگەڵ گشت چەکدارەکانی دێنە دەرەوە بەو مەرجەی لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆم سەربەخۆبم کەس دەست لەکاروبارم وەرنەدات، مەلامستەفا گوتبوی: (میرم تۆ هەر میر بوویو میریشی، منیش لەگەڵ ئەوەم کەمنیش دەست لەکاروبارەکانت وەرنەدەم)، لەوکاتەی خەریك بوو بگەڕێنەوە سلێمان بەگ گوتبوی: (من دێمە دەرەوە بۆ ئاگاداریتان تەنیا فەرمانی ئێوە بەسەر مندا دەڕوات من کەسی تر ناناسم).

لەو دیدارەی نێوان بارزانیو سلێمان بەگ عزەتیش ئامادە بوو، لە گەڕانەوەیاندا دیار بوو دڵخۆش بوون، هەرکە هاتنەوە کەوتنە هەوڵی ئەوەی کە ماڵەکانمان لە

کاولۆك بگوازنەوە ڕواندز لەبەر ئەوەی ڕواندز لەبارتر بوو بۆ ڕۆیشتن، مەرام ئەوە بێ لەکاتی دەرکەوتن ڕواندز لەبارتر بوو بۆ ڕۆیشتن‌و هەموو سەنگەرەکانی دەوروبەری ڕواندز لە دەست چەکدارەکانی خۆیانەوە بوو بەتایبەتی سەنگەرەکانی ڕێگای (دۆڵ ئاکۆ) هەرلەسەر ئەو ڕۆشناییە زۆری پێنەچوو یەکە یەکە ماڵی چەکدارەکانی ئەوانەی لە کاولۆك نیشتەجێ ببون، لەگەڵ ماڵی سلێمان بەگ بەسەرکەوتنە ڕواندز، ئەوەی شایانی باسە چونی ماڵی سلێمان بەگ بۆ ناوشاری ڕواندز بۆمن خراپ بوو، چونکە لەوێ نەدەگونجا لە ماڵیان بم لەبەرئەوەی مەترسی زیاتر هەبوو سوپاییەکان دەست درێژی بکەن نەوەك توشی بەلایەك بکرێم، وام پێ باش بوو تاکاتی دەرکەوتن بڕۆمە یەکێ لە سەنگەری ئەو چەکدارانەی بەگیان لەگەڵم بوون لەنزیك گوندی (کانیە قوڕ) بێگومان ئەو کۆمەڵە چەکدارەی لایان بووم بۆ مردنیش لەمن جیا نەدەبونەوەو بەگیان لەگەڵم بوون، لەو سەنگەرەی منی لێ بووم زۆربەی شەوان بەنهێنی دادەبەزیمە ناوشار بۆ بەشدار بوون لە کۆبونەوەی شانە حزبیەکانی لەنوێ ڕێکخرابوون‌و دەست بەکار بوون، ئەوانەی دەرنەکەوتبون‌و نەگیرابوون. لەودەمانەدا بەگەرمی خەریکی چالاکی بوم، ڕۆژێك (سەعید رزاق) پەیدا بوو. ڕایگەیاندکەوا یەکێك لە برادەرانی سەرەوە هاتووە دەیەوێ چاوی بەتۆ بکەوێت بۆیە شوێن‌و کاتی کۆبونەوەکەیان بۆ دیار بکە، چونکە ئەم شەو دێن. منیش وەڵامم هەر بەسەعیدەوە بۆ ڕەوانە کردنەوەکەلە کاتژمێر دەی شەو لە نزیك ئەو سەنگەرەی منی تێدا بووم لە ناوباخچەی (مستەفای حاجی ئەحمەدی) چاوەڕوانیان دەکەم، لەوێ ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بووین زیاتر لە کاتژمێرێك‌و نیو چاوەڕێمان کرد ئەوان هەر پەیدا نەبوون لە دوای ئەوەی بێ ئومێد بووین لە هاتنیان گەڕاینەوە شوێنەکانمان، زۆر ئارەزووم بوو لەودەمەدا چاوم بەیەکێك لەوانەی سەرەوە بکەوێت بەڕاستی زۆر بەپەرۆش بوم کەلەکاتی دیاریکراودا نەهاتن، ئەوکاتە کاتێکی ئاڵۆز بوو زۆر پێویست بوو ئەو برادەرە ببینم، چونکە کۆمەڵێك گیرگرفت لە ئارادا بوون شایانی لێدوان بوون بۆ ئەوەی نەبنە کۆسپ لە پێشمان، هەستم کردبوو هەندێ لە شیوعیە بێ دەسەڵاتەکان لەدەست‌و بردو چالاکی من دەترسان بەتایبەتی کە دەیاندیت خەڵك تێکڕا ڕوویان لەمن بوو، ئەمە دڵی خەڵکی ناپاکی تەنگ کردبوو بۆیە هەوڵی خراپەکاریان دەدا.

نێوانی ڕژێمی بەعس‌و بزاڤی کورد ڕووی لە ئاڵۆزی بوو لە دوای گەڕانەوەی باوکم لە هەولێرو بەیەك گەیشتنی لەگەڵ مەلامستەفا زۆری نەخایاند لە(١٩٦٣/٦/١) نوسراوێکی بنکەی لۆغانم بەدەست گەیشت تیایدا نوسرابوو: (لیژنەی بەڕێوەبەری ناوچەی ڕواندز بڕیاری داوە کە تۆ دووربخرێیتەوەو پەیوەندیت بەڕێکخراوەکان نەمێنێ‌و لە تەواوی کارەکانی حزب دوور خرایەوە، لەبەرئەوەی چەکی حکومەتی بەعست بەشانەوەیەو لەسەنگەری ئەوان نۆبەت دەگری). ئەوەی بۆم ڕون بۆوە ئەو لێپرسراوەی هاتبوو چاوی بەمن بکەوێت تۆفیق ئەحمد(هەژار) بوو، ئەوکاتەی بۆم دیار کردبون وەك بڵێی دەست غەڵەت درابوون، زۆر دەرەنگتر هاتبوون، بەداخەوە چاوم پێی نەکەوت، ئەوەی نامەکەی بۆ من هێنابوو(سەعید رزاق) خەبەری بەوان دابوو پێی گوتبون: (دەبوا ئێوە لە کاتژمێر دەی شەو لە شوێنی دیاریکراو ئامادە بن کەچی ئێستا کاتژمێر دوازدەی شەوە ئەوان ئەگەر بشهاتبن لەوانەیە هەر کاتژمێرێك چاوەڕێیان کردبێ زیاتر نا، تۆفیق گوتبوی: (ڕاستە مادام کات دیارکراوە دەبوایە لەوکاتەدا ئامادەبین، بێ شکە ئەوان هاتوون ئێمە دواکەوتوین‌و ئەوان گەڕاونەتەوە، لەگەڕانەوەیاندا لە ڕێگا (حاجی مەلا) بەتۆفیقی گوتبو: (هاوڕێ پێم گوتی ئەوە شیوعی نیەو بەکەڵکی شیوعیەت نایەت،) دیارە تۆفیق دەنگی نەکردبوو.

وەرە سەیری ئەو هەڵوێستە چەوت‌و بێ سەنگەی ئەو کەسانەی سەرپەرشتکاری ناوچەیان گرتبوە دەست بکە! دوای چوار ڕۆژ لە ناردنی نامەی دوورکردنەوەی من لە ڕێکخراوو کاری حزب بەو بڕیارەی دوور لە پەیڕەو دوور لەهەستی مرۆڤایەتی کەسێك بەڕێ دەکەن بۆ لام دەزانن خۆشەویستمە کە (خدر حسێن) ڕواندزی بوو، نامەی پێدا دەنێرن بۆ من لە (١٩٦٣/٦/٥) لە نامەکەدا نوسرابوو: (تۆ وەك هاوڕێیەکی کۆن، حزب چاوەڕوانیەکی زۆر لەئێوە دەکات‌و ئەمەڵێکی زۆری بەئێوەیە بۆیە داوامان ئەوەیە کە ئاگادارمان بیت‌و یارمەتیمان بدەیت، بەڵکو هەندێ فیشەکمان بۆ بنێریت چونکە زۆر پێویستیمان پێی هەیە!) سەیرکەن ئەمە چ شەرمەزاریەکە!!.

بەڕاستی زۆر بەدڵ تەنگی بەخدرم گوت: (ئازیز کاتێ گەڕایەوە پێیان بڵێ من نۆبەتداری دەستەڵاتداری بەعسم دەبێ حزبی حاجی مەلاو حاجی حسن ئاغا چاوەڕوانی چی لەمن بکات؟! ئەوان چۆن داوا لە مرۆڤی گومان لێکراو دەکەن یارمەتیان بدات، چۆن شەرم لە خۆیان ناکەن دوێنێ‌و پێرێ چیان بۆ من نوسی‌و

ئێستا چی دەنوسن)! ئەوەی هەستم کرد (خدر) زۆر بەنیگەرانی قسەی لەگەڵ من دەکرد، هەرئەوەندە بوو نەدەگریاو بەس، لە کۆتایدا گوتی: (تکـایە تۆ دڵگرانو نیگەران مەبەحەقیشت لەوان نەبێت، ئەوان شێواونو نایانەوێت کەسێکی زیرەكو چالاك سەرپەرشتیان بکات، باش بزانە ئەو کارەی ئێستای ئەوان لە توانای ئەواندا نیەو بەوان ناکرێ).

کاتێك دیتیان ئاوڕیان لێ نادەمەوە دوو ڕۆژ لە دوای ناردنی خدر دیسان داوایان کرد بیانبینم ئەوە بوو شەوی (١٩٦٣/٦/٧) دەستەیەك هاتنە نزیك ئەو سەنگەرەی منی تێدا بووم لە گوندی (کانیە قوڕ) لەکاتژمێر هەشتونیو وەکو جارەکانی پێشوو کۆمەڵێك لە دارودەستەکەی هاتن لە کاتی دیاریکراودا لەگەڵ کۆمەڵێك چەکدار ڕۆیشتینە شوێنی دیاریکراو لەوێ دانیشتین ئەوانەی هاتبوون (ڕەئیس سەعید سلمان، ملازم ئیحسان، حاجی مەلا) بوون، هەندێ چەکداریشیان لەگەڵدا بوون، لەکاتی قسەکردن دابەزیمە سەریانو گوتم: (وادیارە دەتانەوێت ووتوویژ لەگەڵ بەعس بکەن بۆیە هاتونەتە لام)! لە دواییدا پێم گوتن: (باوکمو عزەت چاویان بەمەلامستەفا کەوتوەو ئەوان بەڵێنیان بەمەلامستەفا داوە ئەگەر شەڕ دەست پێ بکاتەوە دێنە دەرەوەو ڕاستەوخۆ دەبنە سەربازی مەلامستەفا، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەوان پەشیمان بونەوە لە هاتنە دەرەوە ئەوە هیچ شکی تێدا نیە ئێمە کۆمەڵێك چەکدار دێینە دەرەوە، لەکاتی هاتنە دەرەوەمان ئەگەرچی لە ئێوەش دڵڕەنجاوینو ناڕازین بەڵام هەر بەنیازین بێینە بنکەی حزبی شیوعی نەك شوێنێکی تر). پێش ئەوەی (ڕەئیس سەعید یان ملازم ئیحسان) بەدەنگ بێن حاجیمەلا گوتی: (ئێمە ئامادە نین جاش پۆلیس وەربگرینو مەلامستەفا لە خۆمان نیگەران بکەین، ئێوە دەتوانن بڕۆنە لای حمدئاغای مێرگەسۆری یان وەهاب ئاغا)! بەڕاستی زۆر لە هەڵوێستی ئەو مرۆڤە پەست بوومو پێم گوت: (حاجی ئەوە قسەی خۆتە یان هی حزبە، ئێمە بەڕێ دەکەیتە لای حمدئاغا یان وەهاب ئاغا؟ دەبێ جەنابت زۆر باش بزانی ئەگەر نیازم ڕیزی ئەو بیروباوەڕەو خزمەتی ئەو ڕێگایە نەبێت ئەوەی من باوەڕیم پێی هەیە بۆی بێمە دەرەوە قەت من نابمە پیاوی کەس، زۆر زۆرسەهوی ئێمە بەڕێ بکەیتەئەو شوێنانەی کەجەنابت دەفەرموێ دڵنیابەئەگەر وای لێبێت من لەوان ئاغا ترم). وەك دیار بوو ملازم ئیحسان، لەهەڵوێستی حاجی مەلا پەست

ببوو، هەستی کرد من ڕێزی ئەوانم گرتوە زیاتر نەمویست لەگەڵ حاجی مەلا لەوە توندتر بکەومە کێشە.

ملازم ئیحسان هەوڵی ئەوە بوو هەڵوێستی حاجی بگۆڕێت، بەڵام نەیتوانیو ناوبراو گوتی: (هەرجێگایەکی دەچن بابەکەیفی خۆیان بن بەس بۆلای ئێمە نابێت بەهیچ جۆرێك)، ئەوەیە کورد گوتەنی (ماڵێکی لە ماخۆ حەرام) کاتێ ئەو هەڵوێستە چەوتەی حاجی مەلام بینی پێم گوت: (باشە ئەوانەی چەکداری حکومەتنو بەڕەزامەندی حزب چەکیان وەرگرتوە جەنابت بەجاش ناویان دەبەیتو ئەوان وەرناگرن لەترسی مەلامستەفا وەك خۆت گوتت مەلامستەفامان لێ نیگەران دەبێت، ئەی ئەوانەی چەکیان هەڵنەگرتوەو چەندینیان لەلای من خۆیان پەناداوە کە شیوعین بۆ ئەوان چۆن دەبێت)؟ حاجی مەلا بەبێ ئەوەی بیر لە ڕێزگرتن بکاتەوە گوتی: (تۆو ئەوانەی لەگەڵ تۆشن بەهیچ جۆرێك لەوانی تر جیا ناکرێنەوە، ئەوجا خۆت ماندوو مەکە!). ئەو پیاوە بەئاشکرا پێیەوە دیار بوو لە دژی بەرژەوەندی حزب قسەی دەکردو خۆشی پێ هەموو شت بوو، ئیتر تەواو بۆم بەدیارکەوت کە ئەو حاجی مەلایە وەك نەیارێك لەگەڵ من دەدواو پێیەوە دیاربوو مەرامێکی هەبوو. (ملازم ئیحسان) تەواو بۆی ڕۆن بوەوەو تێگەیشت کە کێشەکە دژایەتیو ڕکەبەریەو زیاتر نا، پێش بڕۆن ناوبراو بەمنی گوت: (نیگەران مەبەهەوڵ دەدەم وەڵامت بۆ ڕەوانە بکەمەوە لەڕۆژانی داهاتوو)، لەوەش حاجی بەرپەرچی دایەوەو گوتی: (خۆت ماندوو مەکەو هیچ بەڵێنی پێ مەدە چونکە ممکین نابێت).

ئەوان ڕۆیشتن دیار بوو سەعید رزاق گەڕاوەو گوتی: (کاك زرار تازە چەند مێوانێکمان بۆ هاتوون زۆر پەرێشانینو نوێنمان نیە ئەگەر یارمەتیەکمان بدەیت چەند بەتانیەکمان بۆ دابین بکەی زۆر ممنون دەبم)، ناچار لەسەر داوای ناوبراو چەند بەتانیەکم لەچەکدارەکان وەرگرتنو بردی بۆیان. بەڕاستی لەدوای ئەو کێشەو مشتومڕەو ڕووبەڕووبونەی حاجی مەلا کەوتمە بیرکردنەوەیەکی زۆر قوڵ دەبێ چ هۆیەك بێ حاجی هاندا بێت بەم شێوەیە ڕکەبەری من بکات؟ من هیچم لەگەڵ ئەو پیاوە نیە، ئەو پرسیارەم ئاراستەی (خدرحسێن) کرد ناوبراو دەبوە خزمی حاجیمەلا لە وەڵامدا گوتی: (با ڕاستیت لێ نەشارینەوە حاجیو ئەوانەی لەگەڵیدان لە چالاکی تۆ دەترسنو دەڵێن ئەگەر زرار بێتەدەر هەموو شتێکی دەکەوێتە دەستوکەس ڕوو لە

ئێمە ناکات، ئەوەی زۆرم بەلاوە سەیر بوو لە پاش ئەو هەموو ڕکەبەریەی حاجی. دیسان لەڕێکەوتی (١٩٦٣/٦/١٠) خدر حسێن بەڕێ کراوە لام، لەسەر خواستی بنکەی لۆغان بەڕێ کرابوو نامەیەکیان پێدا ناردبوو، لە نامەکەیاندا زۆر بێشەرمانە دەڵێن: (حکومەتی بەعس بڕیاری داوە کە شەڕ دەست پێ دەکاتەوە. ئینجا ئێمە خۆشحاڵین بەهاتنتان بۆلای ئێمە). هەروەها وەك هەمیشە داوای یارمەتیان کردبوو دەڵێن پشتمان بەیارمەتی ئێوە بەستوە، بەلاّم بەلامەوە سەیربوو کە چۆن توانیتیان ئەو ڕاستیە بلێن کە یارمەتیم داون، نامەکە بەناوی لیژنەکەیان بوو، بەلاّم دەست نوسی حاجی مەلا بوو، ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو چەند ڕۆژ لەمەوبەر جۆرە هەڵوێستێكو ئێستاش هەڵوێستێکی تر بەبێ ئەوەی شەرم بکەن.

لەوەلاّمی نامەکەیاندا بۆم نوسین‌و ئاگادارم کردن: (لە دوای چی دەنوسن بەهاتنتان خۆشحاڵین لەدوای چیو چ لەگۆڕێ ماوە؟ لە دوای ئەوەی ئێوە دڵی ئەو خەڵکەتان شکاندو نیگەران کران ئەوجا خۆشحاڵن بەهاتنمان بۆ لاتان! بێشکە ئێمە دێینە دەرێ، بەلاّم ناچینە لای وەهاب ئاغا بەفەرمایشی پاڵەوانی شیوعی، لەبارەی یارمەتی حزب ئەوەی لەدەستم بێت چۆن یارمەتیم داوە لەمەودواش بەهەمان شێوە بەگوێرەی توانا هەموو هاوکاریەکی حزب دەکەم)، لەوماوانەدا ئالۆزیو پەشێوی لە ئارادابوو هەڵوێستی بەعسیە خوێن ڕێژەکان ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر بەدیار دەکەوت، ڕژێمی کودەتا ڕەشەکەی (١٤ی ڕەمەزان) دەستیکرد بەگرتن‌و ڕاونانی خەڵك بەشێوەیەکی تایبەت ئەو پارتیانەی لەڕۆژانی هاتنی بەعس بۆ دەستەلاّت هەڵدەپەڕین‌و چەپڵەیان لێ دەداو خۆشحاڵ بوون بەهاتنی ڕژێمی بەعس، هەر ئەو بەعسیەش کەوتە ڕاونانی ئەوان بەسەر شێواوی لە دەستی ڕژێم ڕایان دەکرد، بەعسیەکانیش بەدوایانەوە بوون ئەوەی توانی دەرباز بێت ڕۆیشت‌و دەرچوون ئەوانی تریش گیران‌و ڕاپێچی بەندیخانە کران، ئەو ئالۆزیە هەموو ماڵێکی گرتەوە، ئەوە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە حکومەت بڕیارێکی بلاّوکردەوەو دەڵێت: (بۆ ئاگاداری داوا لە چەکدارە یاخی بووەکان دەکەین لە ماوەی چل‌و هەشت کاتژمێردا دەبێ چەکەکانیان بدەنەوە دەستی حکومەت‌و سەردابنەوێنن بۆ بڕیارەکان‌و فەرمانەکانی دەوڵەت). دەمەوێت ئەوە بەدیار بخەم لەم ڕۆژە ئالۆزو ناخۆشەدا باوکم‌و عزەت لەسەر داوای (متەسەریف بەدرەدین علی) بانگ کرابوونە هەولێر، لەوکاتە تەنگ‌و ناخۆشەدا دوو سێ ڕۆژ

دواکەواتن دەنگێکی واش بلاو بوەوە گوایا گیراون. بێگومان چاوەڕوانی ئەوەبووم ئەگەر ڕاست بێت گیرا بن ئەوە دەڕۆین کۆمەڵێک کاربەدەستی حکومەت دەگرین‌و لەگەڵ خۆمان دەیان بەین‌و دەڕۆینە دەرەوە تا ئەوان بەرنەدرێن‌و نەگەڕێنەوە ئێمەش ئەوان بەرنادەین، ئەگەر ئەم ئێوارەیە نەگەڕابانەوە هیچ شکی تێدا نەبوو شەو دەستمان بەسەر دائیرەی قائمقامیەتدا دەگرت، قائمقام‌و بەڕێوەبەری پۆلیس لەگەڵ چەند کارمەندی ترمان دەبردن‌و لە ڕواندز دەردەچوین، بەڵام خۆشبەختانە ئێوارەی ئەو ڕۆژەی ئێمە خەریکی خۆ ئامادەکردن بووین ئەوان خۆیان گەڕانەوە. لەسەر ئەو بڕیارەی حکومەت دابوایە بۆ ماوەی چل‌و هەشت کاتژمێر پێشمەرگە چەکەکانیان تەسلیم بکەنەوە، ئێمە لەڕواندز شەو دەستمان بەسەر شارداگرت تا هەموو ماڵەکانی چەکدارەکانمان‌و ماڵی سلێمان بەگ ڕۆیشتنە دەرەوە ئینجا هەموومان ڕۆیشتین، پێش ئەوەی بڕۆین چەند ڕۆژێك بوو چەکدارەکانمان خەریکی کۆکردنەوەی کەلوپەل‌و پێویستیەکانیان بوون، چونکە دەیانزانی دەڕۆینە دەرەوە. لە سەرەتاوە بەنیاز نەبوم منداڵەکانم لەشار دەربخەم کەچی بیستبوم لەهەولێر ئەو ژنە سۆڤیەتیانەی لە هەولێر دەژیان‌و مێردەکانیان بارزانی بون‌و ڕۆیشتبونە دەرەوە بەشێکی زۆریان گیرابون‌و ڕاپێچی بەندیخانە کرابوون، کاتێ ئەوەم زانی یەکسەر کەوتمە دەست‌و برد بۆ ئەوەی بیان بەم‌و لەوێ نەمێنن، بۆ ئەو مەبەستە لە ڕۆژی دەرکەوتنمان سەرلەبەیانی بەبیانوی ئەوەی دەڕۆنە سەیران لە شار دەرکەوتن‌و هاتنە گوندی (کانیە قوڕ) نزیك ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین، ئێوارە پێش ئەوەی دنیا تاریك دابێت ئەوانم بەڕێ کردن بۆ گوندی (ئاکۆیان) ئافرەتێکیان لەگەڵ بوو بەناوی (حەلیم) خزمی دایکم بوو خەڵکی گوندی (فەقیان) بوو، چەند شارەزا بوو ئەوەندەی تریش چالاك‌و بەدەست‌وبرد بوو، یەکێکیش لە چەکدارەکان لەگەڵیان دەڕۆیشت کە ناوی (رسول فقێ) بوو خەڵکی (ڕەژیکەریان) بوو، لەوێ بەرەو ئاکۆیان بەڕێ کەوتن شەو درەنگ گەیشتبونە ئاکۆیان کەلەژێر دەستی پێشمەرگەدا بوو، دوای ئەوەی ئێمە دەرکەوتین کەلوپەلی ماڵ‌و ئەشیای ستۆدیۆ لەشوێنی خۆیان مانەوە تەنیا لەکاتی ماڵ بارکردن هەندێ ئازوقەو شرە نوێنمان بەڕێ کردن ئەوەی تریش ئەوها مایەوە لە ناو خانودا، کەلوپەلی ستۆدیۆیش لە ناو دوکاندا مایەوە، وەك زاندرا لە دوای

دەرچونی ئێمە جاشەکان بەتالآنیان بردبوو بەستۆدیۆیەکەشەوە کە بۆ ئەوکات شتی زۆر بەنرخی تێدا بوو.

## دەرکەوتنمان لەڕواندز

ئەوەی دیار بوو پێش ئەوەی ئەو چلو هەشت کاتژمێرە تەواو بێت کەرژێم دیاری کردبوو بۆ چەك دانان ئاگاداری گوندەکانی دۆڵی ئاکۆیان کرا ئەوەی وەڵاخی باری هەیە ئێوارەی دیاریکراو پێش تاریکی لە(گەروی ڕەزان) لە نزیك ڕەواندز ئامادە بن بۆ بارکردنی ماڵەکانی سلێمان بەگو چەکدارەکانی، شێوەی دەرکەوتنمان لە شار بەم شێوەیە بوو: لەگەڵ ئەوەی دنیا تاریك دابێت چەکدارەکانی ناو سەنگەرەکان دابەزنە ناو شار دەستە دەستە دیار کرابوون بۆ ئەو شوێنانەی مەترسیان لێ دەکرا نەوەك لەکاتی بارکردن دەست بوەشێنن، فەرماندرا باربەرەکان بێنە ناو شار بۆ بارکردنی ماڵەکانو چەندین کەسیش دیار کرابوو بۆ بارکردنی ماڵەکان، باوکم بەخۆی چاودێریکەر بوو تا ماڵەکان باردەکرێنو دەردەکەون. هەڵبەتە پێش وەڵاخەکانی بار بێنە ناو شار لەگەڵ داکەوتنی تاریکی هەردەستەی ڕۆیشتە ئەو شوێنەی بۆی دیارکرابوو، منو خدری عولابەگی بۆ قائمقامیەتو دەوروبەری داندرابووین لەگەڵ دە چەکداری بژاردە، کۆمەڵێك چەکداری زیرەكو چالاکیش بۆ گەردەگەردو شوێنەکانی ڕووبەڕووی سەنگەرەکانی دوژمن لە(مل تۆکر) داندرابوون، لەکاتی دیاریکراودا باربەرەکان هاتنە ناو شارو دەست کرا بەبارکردنی ماڵەکانو دەرکەوتنیان لە شار، دانیشتوانی ڕواندز تێکرا زانیان کەوا چەکدارەکانی سلێمان بەگ وا بار دەکەنو دەڕۆنە دەرەوە، تا ماڵەکان بارکرانو دەرکەوتن ئێمە هەر لە دەوروبەری سەرای حکومەت چاودێری قشڵەو ماڵی ئەسعەد شێتنە بووین، هیچ شکی تێدا نەبوو پۆلیسەکانی قشڵەو جاشەکانی ئەسعەدو کوردۆ دەیانزانی وا چەکدارەکانی سلێمان بەگ ماڵەکانیان باردەکەنو دەڕۆنە دەرەوە بۆ ڕیزی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، بەلاّم لە توانایاندا نەبوو لە شوێنی خۆیان بجوڵێنەوە، زۆر بەدرەنگەوە سێ جاشی ئەسعەد لە ماڵی ناوبراو دەرکەوتن بەرەو قشڵەی پۆلیسەکان (محمدی سابیر)و دووی تر، هەرزوو گێڕانمانەوەو پێمان گوتن قەدەغەیە کەس نابێت

لەماڵ دەربکەوێ، بێگومان خەتی تەلەفۆنیشمان بڕیبوو، ماڵ بارکردن چەند کاتژمێرێکی خایاند لە کۆتاییدا (عوسمان سەرانەیی)م نارد دوو باربەری باری بردن هەندێ کەلوپەلی پێویستیو خواردەمەنی باربکەن لە ماڵی ئێمە ئەوەی تریش لەناو خانوەکەدا بەجێما. بەکۆتایی هاتنی ماڵ بارکردن لەشار هەندێك لەچەکدارەکانمان بەنیازبوون (خورشید ڕەشۆی) باش چاوەش لە ماڵ دەربێننو لەگەڵ خۆیان ڕاپێچی بکەن، ئەگەر نەشهات بیکوژن هەرلەبەرئەوەی خەڵك زۆر لێی نارازی بوون، بەڵام من ڕێگام نەدان پێم گوتن: (ئەوە کارێکی خراپەو نابێت شتی وا بکرێت). لەدوای کۆتای هاتنی ماڵ بارکردن باوکم بەدوای منیدا نارد بۆ ئەوەی بڕۆین دیار بوو ماڵەکان هەموی دەرکەوتبون، ئەو کۆمەڵە چەکدارەی لەگەڵ مندا بون زۆر بەوەستایی لە شوێنەکانیان کشانەوەو ڕۆیشتنە ئەو شوێنەی باوکمی لێ بوو، لەگەڕانەوەماندا بەبەردەرگای ماڵی ناسراوێکی ڕواندزی ڕۆیشتین کە ماڵی (مام پلینگ) بوو، ناوبراو لەناو پەنجەرەکەی سەیری دەکردینو دەیگوت: (ئای های ئەوەی خەڵك دڵی پێیان خۆش بوو لەو شارەدا ئەوانە بوون وا ئەوانیش بەجێمان دەهێڵنو دەڕۆن). لەوێ بەسەرکەوتینە ئەو شوێنەی باوکم چاوەڕێی ئێمەی دەکرد هەر زوو پرسی: (هەموتان هاتوون؟ خۆکەس نەماوە لەخوارەوە؟) گوتم: (نەخێر لە ئێمە بەرەو خوارتر نەبوو)، لەگەڵ ئەوەش گشت شوێنەکانمان بەسەرکردنەوە ئەوجا گەڕاینەوە لای باوکم، لەوێ قسەکانی مام پلینگم بۆ باوکم گێڕایەوە وام هەست کرد باوکم زۆر نیگەران بوو، ئەوکات پرسیم: (ئەدی عزەت کوا لە کوێیە)؟ گوتیان: (چووە لەسەر ڕێگای خۆی هەندێ گاڵتە بەکوردۆ بکاتو پێی بڵێت وەرە با بڕۆین سوێندمان خواردوە بەشێخ عەنەش!!)لەوێ بەڕێ کەوتین تا دووڕیانەکەی نزیك ماڵی (شاکر مەجروم)منو ئەو چەکدارانەی لەگەڵم بوون بەڕێگای (کانیە قوڕ)دا ڕۆیشتین بۆ ئەوەی ئەو پاسەوانانەی لەوێ لە ناو سەنگەرەکەدا مابوون بیان بەینو بڕۆین، باوکمو ئەوانەی لەگەڵی بوون بەڕێگای گەروی ڕەزاندا ڕۆیشتنو لە شار دەرکەوتین، کاتێك گەیشتینە لای پاسەوانەکان دیاربوو ئەوانیش خیوەتیان خستبوو دەیان پێچایەوە بەنیاز بوون بەچوار چەنگە هەڵی بگرنو بیبەن، کاتێك (خدری عولا بەگ) زانی خەریکی خیوەتنو بەکۆمەڵ هەڵی بگرن گوتی: (ڕاوەستن هەر ئێستا دەڕۆم لە کانیە قوڕ گوێ درێژێکتان بۆ دێنم لە ئاکۆیان بۆیان دەنێرینەوە)، ناوبراو لەگەڵ دوو

چەکدار ڕۆیشتن زۆری پێ نەچوو گەڕانەوەو گوێ درێژێکیان هێنا بوو خیوەتیان لێ بارکردو لە سەنگەرەکە دەرکەوتین، لەگەڵ ڕۆشتنی ئێمە بانگی بەیانیشی دا تەواو بوو بەڕۆژ ئێمە گەیشتینە (شیوومردێر) لەودیوی ڕواندز لە گەروی ڕەزان بەدیوی دۆڵ ئاکۆ، کاتێك سەیرمان کرد دیاربوو باوکمو بەشێکی زۆری چەکدارەکانی وا لەوێنو زۆر ئەشیاو کەلوپەلی ماڵە کۆچ کراوەکان لەوێ ماوەتەوە چاوەڕێ بوون باربەریان بۆ بگەڕێنەوە لە ئاکۆیان، کاتێك ئێمە گەیشتینە لایان بەباوکم گوت: (تۆ بڕۆ بەڵکو زوو باربەرەکان بەڕێ دەکەیتو من لێرە دەمێنم تا باربەرەکان دێنەوەو باردەکەن) لەو قسانەدا بووین دیاربوو کاروانی باربەرەکان گەڕانەوە دەستیان کرد بەبارکردنی ئەو ماڵانەی لەوێ مابوون، ئێمەش لەگەڵ باوکم ڕۆیشتین بۆ لۆغان لەوێ (ملازم تاهیر علی بەگ) پێشوازی لێکردین، ناوبراو دەورێکی کاریگەری هەبوو بۆ بەڕێ کردنی باربەرەکانو گواستنەوەی ماڵەکانمان لە ڕواندز بۆ دەرەوە. کە گەیشتینە لۆغان ئەوەندە ماندوو ببوین شەو نەنوستبووین لە سەر بانێك کەمێك خەوتمو پاش ماوەیەکی کەم بانگیان کردمو گوتیان: (هەستە ملازم تاهیر چاوەڕوانی تۆیە)، بەڕاستی زۆر بەنابەدڵی هەستام ڕۆیشتمە ئەو شوێنەی ئەوانی لێ دانیشتبوون، کاتێك خەریك بوو بڕۆینە ئاکۆیان بۆ ئەوەی بزانین منداڵەکانمان چیان بەسەر هاتووە لەوکاتەدا بینیم خۆشەویسترین هاوڕێم (حاجی جرجیس) لەگەڵ دوو برادەری تر بەرامبەرم دێن لە دوای بەیەك گەیشتن ناوبراو گوتی: (من هاتوم بۆ ئەوەی لەگەڵم بێیت بۆ لای هاوڕێیان، ئارەزوویانە چاویان پێت بکەویت). پێم گوت: (حاجی گیان کەسی تریان نەدۆزیەوە تۆیان ناردووە کە دەزانن برایەکی خۆشەویستمی، باشە ئەگەر بڵێم نایەم دڵت ناڕەنجێت)؟ لەگەڵ ئەو قسەیەی من باوەشی پێداکردمو گوتی: (تۆ بەڕاستیتە بەونیازەی بەجێمان بێڵی!؟ ئەگەر تۆش ئێمە بەجێ بێڵی ئێمە تۆ بەجێ نایەڵین، ئێمەت فێری ئەو بەزمە کردو بەتەماشی لێمان دابڕێی!؟) ئەوەی ڕاستی بێت نەمتوانی دڵڕەنجاوی بکەم گەڕامەوەو لەگەڵیان ڕۆیشتم، (تاهیری حەمەدیو حەسەنی عولای حوسێنیو عوسمان سەرانەیی)ء لەگەڵدا بوونو ڕۆیشتینە لایان دیار بوو بنکەیان بردبوە ناو (گەلی گەرەنالی) لە نزیك لۆغان، لەوێ چاومان بە(ڕەئیس کمالو مامۆستا جاسم گاتع) کەوت لەگەڵ هەندێکی تریان، بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە لەگەڵیان دوامو پێم گوتن: (ئەوەیە

دادوەری شیوعیەت‌و ڕێزگرتنی پەیڕەو؟ ئەوەیە هەڵوێست جارێك دەنوسن جاشن، جارێك دەنوسن خۆشحاڵین بەهاتنتان، توخوا ئەوە سەر لێشێواوی نیە)؟ دیار بوو بەقسەکانی من نیگەران بوون، بەتایبەتی جاسم تەواو نیگەران بوو، وەك بەدیارکەوت حاجی مەلا خۆی لێ کردبوونە مامۆتك، ماوەیەکی تەواو لەگەڵیان دانیشتم‌و زۆر شتم پێ گوتن کە ئەوان ئاگایان لێ نەبوو! لەلای ئەوان هەستاین ڕۆیشتین بۆ ئاکۆیان لە ڕێگا عوسمان بۆی گێڕامەوە کە مندالەکان زۆری نەمابووە لە (شیوومردیر) لەکاتی پەڕینەوەیان لەئاو بخنکێن، حلیم لەگەڵ مندالە بچوکەکان بەسواری وولاخ ڕۆیشتبون وولاخەکە لەناو ئاو سەرپەلۆی بردبوو کەوتبونە ناو ئاو خۆشبەختانە هیچیان لێ نەهاتبوو. ئەو شەوە لە ئاکۆیان ماینەوە لەماڵی (مام ئاغۆ) شەو لەباخچەکەی کە زۆر خۆش بوو ڕامان بوراد بەیانی زوو مندالەکانم بەڕێ کردن بۆ دەرگەڵە (عوسمان‌و ڕەسول)و دوو سەربازی ڕاکردووی ناسراویشیان (عزیزو مجید) لەگەڵیان ڕۆیشتن، ئەو ڕۆژە بەدرێژایی ڕۆژ بەپێیان ڕۆیشتبون ڕێگاکە چەند دوور بوو ئەوەندەش هەورازو نشێوو بوو، گرفتەکەش ئەوە بوو دایکی مندالەکان سواری وولاخ نەدەبوو لەبەرئەوە زۆر درەنگ بەسەر کەوتبونە سەر گەروی سەران، لەگەڵ ئەوەی دنیا بەرەو تاریکی دەڕوات ئەوان لەگەروەکە شۆڕ دەبنەوە دیوی دەرگەڵە لە(گۆڕ مێکۆك) دەبێتە شەوو ڕێگا بزر دەکەن ئەوەی دیارە عوسمان بارەکانی بردبوون‌و(حلیم‌و پاکیزەو شادومان) بەسواری ڕۆیشتبون (ڕەسول‌و عزیزو مجید) لەگەڵ مندالەکان مابوون لەزۆربەی ڕێگادا بەکۆمەڵ هەڵیان گرتبوون بەتایبەتی لەوکاتەی لە ڕێگا لایاندابوو سەرپەڕببون باش بوو شوانێك پێی گوتبون بگەڕێنەوەو ڕێگای پیشاندابوون. من لەئاکۆیان لای باوکم مامەوە لەبەرئەوەی نەوەك حکومەت هێرش بێنێ‌و بەدوای ئێمەدا بێت، بەڵام دیار بوو هیچ نەبوو، ئەمجارەیان لەگەڵ دەستەیەك لە چەکدارەکان بەرەو دەرگەڵە کەوتینە ڕێ لە گوندی سەران لاماندا‌و ڕۆشیتینە ماڵی (حاجی فتاح) کە یەکێك بوو لە هاوڕێکانمان جیا لەوەش دۆستکی نزیکمان بوو، لەوکاتەی ئێمە لەوێ دانیشتبووین خەڵکێکی زۆر لە ڕێگادا دیار بوون، ئەوانەی لە ترسی گرتن‌و ڕاونانی ڕژێمی بەعس هەڵاتبوون، زۆربەیان بەسەروسیمایانەوە دیار بوو کە خەڵکی شارن‌و زۆر بەهیلاکی بەرەو(کانی کۆڵان) سەردەکەتن کە ئەمەم بینی داوام لە فتاح کرد کە دوو وولاخ بنێرێت بۆ هاوکاری

کردنیان بۆ ئەوەی بەسەربکەونە سەرگەروی سەران، پێیانەوە دیار بوو هەندێك لەوخەڵکانە نەیاندەتوانی بەسەربکەون بەتایبەتی پیرەکان، یەکێکیان لەگەڵدا بوو تەواو سەری سپی ببوو زاندرا کە ناوی (مامۆستا عبدالقادر)ەو خەڵکی ئامێدیە. ئەوەی جێگای ڕەزامەندیم بوو فتاح مەردانە یارمەتی دابوون بۆ سەرکەوتنیان. لە سەران دەرکەوتین گەیشتینە بن (کارۆخ) دیاربوو شڕە کەلوپەلی ماڵ لە ژێر گوێزەکانی کۆلێت داندرابوون‌و خیوەتیان هەڵدابوو چاوەڕێی ئێمە بوون ئاخۆ لە کوێ خیوەتەکەمان بەیەکجاری هەڵبدەین؟ لەدوای کەمێك حەسانەوە دایکی شادومان بەسەرهاتەکەی سەرپەڕبونی بۆ گێڕامەوە کە چۆن ڕێگایان بزر کردبوو بۆ کوێ ڕۆیشتبوون، عوسمانیش هەرلە (سەران) بارەکانی بردوەو (حلیم‌و پاکیزەو شادومان) یشی بەسواری برد بوون، منداڵە بچوکەکانیش (زەکیەو چینازو سەروەر)یش لەگەڵ دایکیاندا مابونەوە، رەسول لەگەڵ دوو سەربازەکە کەوتونەتە ڕێ‌و دەڵێ لە گەروەکە شۆڕ بوینەوە دنیا تاریك داهات دیارە لە خوار (گۆر مێکۆك) ڕێگایان لێگۆڕابوو بەرەو لای چیای هەندرێن ڕۆیشتبوون بەناو دارو دڕك‌و گوینیدا دەڕۆیشتن بەشەو کاتێك لەدەنگی سەگەکان شوانێك ووشیار بۆتەوە، شوانەکە پێی گوتون بگەڕێنەوەو ڕاست برۆن ڕێگای پیشان دابونەوە، گەڕابونەوە لە دوای ڕۆیشتنێکی زۆر ئەوجارە گەیشتبونەوە سەر ڕێگای خۆیان، بەدرێژایی ڕێگا منداڵەکانیان بەکۆڵ هەڵگرتبوون توشی ئەو ماندبوون‌و هیلاکیە ببوون، ئەوەی جێگای نیگەرانیم بوو ئەوەبوو لەکاتی سەربردەکەی دەگێڕایەوە چاوەکانی پڕ ببون لەفرمێسك لەکۆتایی قسەکانیدا بەڕوسی پێم گوت قەیدی ناکات هێشتاش ماویەتی.

ڕۆژی دوایی کەلوپەلەکانمان دابەزاندنە ناو چۆمی (کونێری) لە نزیك (کانی فەقیان) لە شوێنێکی بەلاوەی نادیار خیوەتمان هەڵداو لەو شوێنە نیشتەجێ بووین، چۆمی کونێر چۆمێکی پڕ لەدارو درەختی جۆراو جۆر بوو، بەوشێوەیە گەڕاینەوە دەرگەڵە، ماڵی چەکدارەکانمان بەسەر هەندێ شوێنی لابەلای نادیار دابەش کرد لەناو گەلێەکانی سەروی گوندو خواروی گوندو چۆم ئەشکەفتەکان، ماوەی چەند ڕۆژێك هەرکەسەو خەریکی دامەزراندنی ماڵەکەی بوو، لەبەر مەترسی هێرشی دوژمن‌و هێرشی فرۆکەکانی حکومەتە تازەکەی بەعس کە ڕۆژانە هەڕەشەی دەکرد پێویستیمان بەشوێنی خۆپاراستن هەبوو بۆ ئەوەی ماڵ‌و منداڵمان لە مەترسی دوور

بن. وەك دیار بوو هەرلە سەرەتاوە حکومەتی بەعس بەنیاز نەبوو دان بەسادەترین مافەکانی کورد دابنێت، بەلاّم پێویستی بەپشویەکی تەواو هەبوو تا خۆی کۆدەکاتەوە بۆ دەست وەشاندن ئەوەبوو درێژەیان بەووتوو وێژدا لە مانگی (سێ) وە تا مانگی (٦/١٩٦٣) کاتێك بەخۆکەوت ئەوجا کەوتە بیانوو گرتن‌و ڕێگای بۆ شەڕ خۆش دەکردو هێزەکانی بەڕێ کردنە ڕووبەڕووی هێزەکانی پێشمەرگە. ماڵی باوکم لە سەروچاوەی (کانی بارۆیان) کەپرو ساباتیان بۆکرابوون، وەك پێشتر باسم کرد چەند ڕۆژێك خەڵکەکە خەریکی ڕێکخستنی ماڵەکانیان بوون تا بەتەواوی نیشتەجێ بوون‌و بەبەردەوامیش خەڵك دەهاتنە دەرەوە، ئێوارەیەك ڕۆیشتمە ماڵی باوکم کۆمەڵێك میوانیان هەبوو لەوانە (حمە ڕەئوف ووسو سەوزەچی) عومەر ناوێکیان لەگەڵدا بوو، ئەوانم بردنەوە ماڵی خۆمان لە دوای دوو ڕۆژ بەسەفەر ڕۆیشتینە ناوچەی باڵەکایەتی، چەند ڕۆژێك ماینەوە پاشان وسو لەگەڵ عومەر گەڕانەوە لای ئێمەو لەلامان مانەوە، لەو ڕۆژانەی لای ئێمە مانەوە ڕۆژێك چوبوونە چۆمی خۆیان بشۆن ئاویان گەرم کردبوو چۆمیش فێنك بوو وسو تێك چووبوو لە هۆش خۆی نەمابوو، وەك باسیان دەکرد زۆری نەمابوو بمرێت، یەکێکی پارتیان لەگەڵ بووە کە ناوی (حسێن تەتەر) بووە زۆر برادەری وسو بوو، ناوبراو گوتویەتی: (ئەگەر وسو هیچی لێ هاتبایە دەیان گوت حسێنی پارتی وسوی شیوعی کوشتوە کە ئەوەش دەبوە نەگبەتی بۆ من!).

بەشی دەیەم

# وتووێژی نێوان بزاڤی کوردو بەعس سەرنەکەوت

درێژەکێشانی وتووێژی سێ مانگەی نێوان دەسەلاتی بەعسو پێشمەرگەکانی کورد سەرنەکەوت، رێك نەکەوتنی بووە هۆی فاکتەرێك بۆ بەعسیەکانو سودێکی گەورەیان لەم دەرفەتە وەرگرت، لەماوەی ئەو سێ مانگەی گفتوگۆدا بەعسیەکان توانیان تەواو جێی پێی خۆیان قایم بکەنو ئەمجارە زۆر بەناپاکی کەوتنە پروپاگەندە بەزمان درێژیو هەلوێستی بێ رێزەوە هەرەشەی بەردەوامیان دەکردو داواکاریو مەرجەکانی گەلی کوردیان رەت دەکردەوە، دوژمن نیازی هێرش‌وکوشتو بریان هەبوو، لەدوایدا دەستەلاتداریەکەی بەعس فەرمانێکی توندی بلاوکردەوە کە تیایدا داوای لەپێشمەرگەکانی کوردکردکە دەبێ لەماوەی چلو هەشت کاتژمێردا چەکەکانیان بدەنەوە دەستەلاتدارانی بەعس لە نزیکترین ئەو بنکانەی دەستیان پێرادەگات، بەلام لەبەرپەرچ دانەوەی ئەواندا چەکدارانی (سلێمان بەگ) لەوکاتە تەنگەدا زیاتر لە حەفتا چەکدار بریاریان دا برۆنە دەرەوە، بێگومان رۆیشتنە دەرەوەی چەکدارەکانی سلێمان بەگ سەرشۆریەکی گەورە بوو بۆ دەسەلاتی رژێمی بەعسو بەرپەرچ دانەوەیەکی کوشندەی کاریگەریش بوو.

بەعسیە ناپاکەکان ئەو سێ مانگەی کە درێژەیان بەگفتوگۆدا لە ماوەی مانگی (١٩٦٣/٣) تا مانگی (١٩٦٣/٦) تەنها بۆ مەرامی تایبەتی خۆی بووە وەك مناورەیەکی سیاسی بۆ ئەوەی لەو ماوەیەدا بتوانێ زیاتر خۆی رێك بخاتو ئامادە بێت بۆ جەنگ، بەعس وای دەزانی بەهەرەشە چەك بەچەکدارانی کورد دادەنێ! بێگومان ئەو خۆ ئامادەکردنەی حکومەتی بەعس بێ بەرامبەر نەبوو، هێزی پێشمەرگەش بۆ رووبەروو بونەوەی دوژمن سازو ئامادە بوو، چەند رۆژێك پێش ئەوەی ئێمە بچینە بەرەکانی پێشەوەی بەرەی جەنگ (مقدم عزیز ئاکرەیی) هاتە لای باوکم شەوێك لەلای مایەوەو دوایی بەگوندەکاندا گەراو هێزی پێشمەرگەی ئاگادارکردن کە برۆنە بەرەکانی شەرو ئێمەش برۆینە سپیلك.

# ئێمەو شەڕی سپیلك

لەسەر ڕاسپاردەی باوکم لە ڕۆژی (١٩٦٣/٧/١) لەدەرگەڵە دەرکەوتین ژمارەی چەکدارەکانمان دەگەیشتە پەنجاو حەوت چەکدار، بەڕێگای دۆڵی ئاکۆیاندا ڕۆیشتین باوکیشم لەگەڵمان هات تا سەروچاوەی ئاوی (مێگر)، ئەو ڕۆژەی لە دەرگەڵە دەرکەوتین بۆ شەو لە گوندی (گەرەوان)ماینەوە بۆ بەیانی ڕۆیشتینە گوندی (ئاکۆیان) بۆ نیوەڕۆ لەسەر کانیاوی (گۆرانگی) لەگەڵ پێشمەرگەکانی (ملازم تاهیر) نانی نیوەڕۆمان خوارد، بۆ ئێوارە ڕۆیشتینە گەلی (کەڕەك) کاتێك نزیك کەوتینەوە لەلۆغان من لەگەڵ دووسێ چەکدارو (خدری عولا بەگ) لاماندایە بنکەی شیوعیەکان لەگەلی (گەرەنالی) لەوێ چاومان بەبرادەران کەوت لەوچاوپێکەوتنەمان هەندێ شتم بە(ڕەئیس کمال) ڕاگەیاند شتەکان زۆر گرنگ بوون‌و پێویست بوو کە بیزانن‌و ئاگادار بن، پێم گوتن: (باوکم ڕۆیشتە گەلی کەڕەك وەرن سەری لێ بدەن‌و پەیوەندی لەگەڵ بەتین بکەن بۆ ئێوە سود بەخش دەبێت، وادیارە لەونزیکانە بەنیازە بڕواتە لای مەلامستەفا لە ڕێگای ئەوەوە، بەڵکو هەندێ داواو خواستی ئێوەش بەبارزانی ڕابگەیەنێ خراب نابێت). لە دوای ئەو چاوپێکەوتنە بەدرەنگەوە ڕۆیشتینە گەلی کەڕەك کە گەیشتینەوە چەکدارەکانمان دنیا تاریك داهاتبوو، شەو لەناو گەلی کەڕەك لە بنکەی پێشمەرگەکانی لەشکری دۆڵی ئاکۆیان ماینەوە، ئەوەی جێگای ڕەزامەندیمان بوو پێشمەرگەکانی (ملازم تاهیر) پێشوازیەکی گەرمیان لێ کردین. هەر لەناو گەلی نانەواخانەی لێ بوو نانی بۆ پێشمەرگەکان دەکرد. بۆ ڕۆژی دوایی (ڕەئیس کمال)و دەستەیەك لەهاوڕێیان (ملازم کریم‌و حاجی‌مەلا)و ئەوانی تر هاتن بۆ لای باوکم، سلێمان بەگ پێشوازیەکی گەرمی لێ کردن‌و زۆر ڕێزی گرتن‌و بەڕوپەکی گەشەوە لەگەڵیان کەوتە دوان‌و بەڵێنی پێدان لە گەڕانەوەیدا لابداتە بنکەکەیان لەگەلی گەنەڕالی، ئەوان ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لەلای سلێمان بەگ مانەوە، لەکاتێکا (ڕەئیس کمال‌و ملازم کریم) لەگەڵ باوکم سەرگەرمی قسەکردن بوون (عزەت‌و حاجی مەلا)ش دوو بەدوو بەیەکەوە لە شوێنێك قسەیان دەکرد، ئەوەی بۆم ڕوون بوەوە لە دوای ئەو بەیەك گەیشتنەی

عزەت‌و حاجی مەلا هەستم کرد عزەت وەك خۆی نەمابوو بەئاشکرا ئالوگۆڕی پێوە دیاربوو، وادیار بوو ئەو شتانەی ڕۆژی پێشووم بۆ ڕەئیس کمال باس کردبوو هەمووی بۆ عزەت گێڕابووەوەو شتەکانیش لەبەرژەوەندیو مەرامی عزەت دا نەبوون، بۆیە دیار بوو پەست ببوو. لە دوای گەڕانەوەی ئەوان ئێمەش بەرێ کەوتین بۆ سەروچاوەی ئاوی (مێگر) ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە ناو (گەلی مێگر) کەلەو سەروچاوەیە ئاو بۆ ڕواندز دەڕوات، لە مێگر دوو شەوو ڕۆژ ماینەوە، ئەوەی جێگای یادەوەریە لەوێ چاوم کەوت بە(ئەحمەد تۆفیق) ناوبراو یەکێك بوو لە سەرکردەکانی (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)و لەگەڵ کۆمەڵێك چەکداری خۆی پاسەوانی ئاوی مێگر بوون، کاك (ئەحمەد تۆفیق) پیاوێکی ڕۆشنبیری پێگەیشتوو وشیار بوو لە ڕووی سیاسیەوە، زۆریش زانا بوو دەربارەی خەبات‌و تێکۆشانی گەلی کورد، ئەو ماوەی لەوێ ماینەوە لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ یەکتر دواین، دیاربوو ئاگاداری زۆر بەسەرهاتی مێژوویی کورد بوو.

پێش ئەوەی مێگر بەجێ بهێڵین‌و بڕۆین بۆ سپیلك باوکم گەڕایەوە دەرگەڵەو خواحافیزیشمان لە (ئەحمەد تۆفیق)کردو لە مێگر دەرکەوتین بەگۆڕەپانی (بانە زیووك)دا تێپەڕین بەبەردەمی سەنگەرەکانی سوپادا لە(مل تۆکر) بۆ سەر ئاوی بێخاڵ، ماوەیەکیش بۆ پشوودان لەوێ ماینەوە، ئینجا بەناو(گەلی علی بەگ)دا بەرەو سرێشمە ڕۆیشتین، ئەوکاتە گەلی علی بەگ لە ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەدا بوو بەئارەزوی خۆمان لەناو گەلی دەڕۆیشتین. وەك دواتر زانیمان لە گەڕانەوەیدا باوکم لای دابووە بنکەی شیوعیەکان لە ناو گەلیگەرەنالی بەپێی ئەو بەڵێنەی پێی دابوون نیوەڕۆ لای ئەوان مابووەوە ئەوجا ڕۆیشتبوو، هەروەها بەڵێنی پێدا بوون کە دەڕواتە لای (مەلامستەفا) داواکاریەکانی ئەوانیان پێ ڕادەگەیەنێ بەڵکو یارمەتیان بدات. ئێمە دوو میوانمان لابوون کە بریتی بوون لە (ووسو سەبزەچی)و عومەر ناوێك کە لەگەڵ ورسو دابوو، بێگومان ووسو دۆستێکی نزیکی ئێمە بوو لەکاتی ڕۆیشتنمان بۆ سپیلك ئەوانیش لەگەڵمان هاتن زۆر هەوڵمان دا کە بەبێ چەك نەیێن کەچی ووسو سور بوو لەسەر هاتنی بۆ سپیلك ناوبراو گوتی: (هەرنەبێ بریندارو جەنازە دەگوازینەوە یان ئاو بۆ پێشمەرگەکان دەبەین).

لەوکاتەی لەناو گەلی دەستە دەستە بەئارەزوی خۆمان دەڕۆیشتینە ڕێ لە ناوەندی گەلی فڕۆکەیەکی بارهەلگری گەورەی زۆر گران بەرەو فڕۆکەخانەی دیانا دەڕۆیشت زۆر لەسەرخۆ چەکدارەکانمان هەرکەسەی لەڕاستی خۆی تەقەیان لێ کردو گوێمان لە عزەت بوو دەیگوت: (بەشەرەفم لێمداو تۆزی لێ دەرچوو واللە پێی کەوت)، چەکدارەکان تێکرا هاواریان دەکردو دەیانگوت: (ئاگادار بن فڕۆکە لێی درا ئێستا دەکەوێ)، عزەت گوتی: (باوەڕ ناکەن بەچاوی خۆم دیت تۆزی لێ دەرچوو، دەبینن ئەگەر وانەبوو هەرچی دەڵێن بڵێن)، لێمان کردە گاڵتەو پێکەنین تا گەیشتینە کۆمەڵێك پێشمەرگە لە نزیك تاڤگەی گەلی هەر بەپێکەنین ڕۆیشتین.

ڕێکەوتی (١٩٦٣/٧/٧) ئێوارە لە بنکەی پێشمەرگەکانی (علیکۆ) لە دواوی ئاوی سرێشمە ماینەوە ئەوەی جێگای ڕەزامەندیمان بوو پێشمەرگەکانی علیکۆ خزمەتێکی زۆریان کردین، شەویش لەلای ئەوان ماینەوە لە ناو دۆڵایەك لەسەر ئاوێکی سازگارو لە ژێر چناری گەورە خەوتین. بەیانی ڕێکەوتی (١٩٦٣/٧/٨) لەگەڵ ڕۆژهەلات بەپێش سەنگەرەکانی سوپادا ڕۆیشتین زۆریش دەترساین نەوەك تەقەمان لێ بکرێت کەمێك لەوان دوورکەوتینەوەو زۆری نەخایاند لە نزیك گوندی سرێشمە چوینە بنکەی هێزی (عەقید کافی) دیاربوو بنکەکەیان لەناو هەندێ خرە بەردی گەورە گەورە دانابوو، لەگەڵ عزەت چوینە لای عقیدکافی ماوەیەکی تەواوی لەلا دانیشتین‌و(عومەری ئەحمەد شابازی)لەلا بوو، لەو دیدارەدا لە زۆر شت دواین‌و کۆمەڵێك باس‌و گیروگرفت کەوتنە بەرباس‌و لێ دوان بەشێوەیەکی تایبەتی ئەو لیوایەی لە خلیفان ئابلۆقە درابوو، ئەوەی دڵخۆشی کردم هەڵوێستی عقیدکافی بوو، ناوبراو بەڕاستی ئەفسەرێکی زانای لێوەشاوەی بەدەست‌وبرد بوو، تا بڵێی پیاوێکی هەست بەرزو دڵسۆز بوو، لەکاتی قسەکردنمان لەگەڵ ئەو فەرماندەیە گوتی: (ئەو لیوایەی لە خلیفان ئابلۆقە دراوە لەگشت لایەکەوە ڕێگاکانی لێ گیراون بڕیار وایە ڕێگا نەدەین هیمدادیان بگاتێ تا خۆیان دەدەنە دەست، بۆئەو مەبەستە داوامان کردوە پێشمەرگەیەکی زۆر لێرە کۆبکەینەوە بۆ لێدانیان یان گرتنیان)، ئینجا گوتی: (ئێوە بڕۆنە لای مقدم عزیز ئەو لەسپیلکە لە نزیك گۆڕی خدرئاغایە). لەوێ بەڕێ کەوتین بەرەو گوندی (دەربەندۆك) لە ڕێگای ڕۆیشتین عزەت خۆی پێ ڕانەگیراو گوتی: (کاکە تۆ ئەوەندە پشتگیری لە شیوعیان مەکە،

بەدوور مەزانە کە ئەوانە پێیان ناخۆش بێت تۆ بەو شێوەیە لەلای ئەوان پشتیگیری لە شیوعیەکان دەکەیت، لەوەڵامدا پێم گوت: (ئازیز کافی باش دەزانێ من شیوعیە ناوبراو بەخۆشی مرۆڤێکی دیموکرات خوازە، هەرکاتێ دەستیان لە شیوعیەکان وەشاند با لە پێش هەموویان من بەبەریکەوم). وادیار بوو لە وەڵامی من ڕازی نەبوو گوتی: (کەیفی خۆتە من بۆتۆمە). کاتێك گەیشتینە گوندی دەربەندۆك لەوێ پشووێکی باشماندا و نیوەڕۆ لەوێ ماینەوە، لەدوای نیوەڕۆش ڕۆیشتینە گوندی (لێرە میر) گوندی ناوبراو بەبۆمبی ئاگرینی فڕۆکەکان سوتێندرابوو خەڵکەکەشی لەوێ نەمابوون چووبونە قەدپاڵی چیا هەندێکیشیان ڕۆیشتبونە باوەشی حکومەت. گوند بەگشتی چۆڵ بوو ئەوەی بەرچاو دەکەوت تەنها کاولکاری و وێران کاری بوو، شەو لەو گوندە کاولکراوەدا ماینەوە لەژێر دارە گەورەکانی گۆڕستان، شەوێکی کش‌ومات و بێدەنگ بوو، بەیانی زوو چوومە سەرئاوی کانیاوی مزگەوتی گوند لە دامێنی گوندەکە دیار بوو مزگەوتەکە مابوو نەسوتابوو ئەویش هۆی ئەوە بوو کە دوور بوو لەگوندو ئاگری پێ نەگەیشتبوو. بەیانی ڕۆژی (٩/٧/١٩٦٣) لەگەڕوەکە ئاودیو بووین، گەیشتینە گوندی (کەلەکین) لەوێوە ڕۆیشتینە سەرئاوی سپیلك بەدیوی لای خەلیفانەوە، لەسەر ئەو ئاوە ماینەوە تا ئێوارە درەنگ، ئێوارە ڕۆیشتینە سەربەرزایی سپیلك، شەو لەوێ ماینەوەو بەیانی(١٠/٧/١٩٦٣) مقدم عزیز هاتەلامان زیاتر لەیەك کاتژمێر لەگەڵمان دانیشت ناوبراو گوتی: (ئێوە بڕۆنە گوندی بەنۆك، گوندەکە نزیك سپیلکەو پەنایەو نادیارە)، بڕیار بوو لەسەر داوای مقدم عزیز کۆبونەوەی سەرکردەکانی گشت پێشمەرگەکانی سپیلك بێنە ئەو گوندە. ئێمە ڕۆیشتینە (بەنۆك) لەوێ دامەزراین بۆ ئێوارە (مقدم عزیز) هاتە لامان لە گوندی ناوبراو داوای لە من و عزەت کرد لەگەڵی بڕۆینە ماڵی (حسێنی خدرئاغا)ی سەرچیا بۆ نان خواردن، ماڵی ناوبراو لەپشتی کەلەکین بوو عزیزگوتی: (بەڵێنم پێداوە بڕۆینە لای و ئێوەش لەگەڵم بێن، جا ئامادە بن بابڕۆین، لەدوای نان خواردن دەتوانن ئێوە بگەڕێنەوە، من زۆر هەوڵمدا نەچم، بەڵام مقدم زۆر کێشەی‌کردو وازی لێ نەهێنام تا لەگەڵ خۆیان بردم، بەسەرکەوتین بۆ ماڵی حسێن ئاغا، پێشوازیەکی زۆر گەرمی لێ کردین، ئەو ماوەیەی لەوێ ماینەوە زۆر لەگەڵ خاڵ عزیز قسەو باسمان کرد، لەودانیشتنەماندا حسێن ئاغا باسی ئەو بەیەك گەیشتنەی

مەلامستەفاو سلێمان بەگی بۆ مقدم عزیزگێڕایەوە کە لەگوندی سرێشمە یەکتریان بینی بوو، ناوبراو گوتی: (کاتێك لەماڵی ئێمە بەڕێکەوتین بڕۆینە سرێشمە لەگەڵ سلێمان بەگو عزەت بۆ دیدەنی مەلامستەفا لە ڕێگا بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ من ناوبژیکەربم لەگەڵیان دابنیشم کەچی کاتێك ئەوان بەیەك گەیشتن منیان بەبیر نەماو تەنها وەك گوێ ڕاگرێك گوێم لەوان گرتبوو کە چۆن بەئارەزووەوە دەدوان!).

شەو بەدرەنگەوە ئێمە گەڕاینەوە لای پێشمەرگەکان لە بەنۆك، بەڵام عزیز لەوێ مایەوەو گوتی: (بەیاتی دێمەوە لاتان لەوێ کۆبونەوەکە دەکەین وەك بڕیارە). ئێمە لەبەنۆكو دەوروبەری گوند خۆمان قایم کرد لەپاراستنی تۆپو فرۆکەکان بۆ ئەو مەبەستە توانیمان شوێنی سەنگەرەکانی ڕووبەڕووی تۆپەکانو سوپای دەشتی هەریر باش ڕێك بخەین بۆ ئەوەی دووربین لە زیان.

ڕۆژی دیاریکراو دوای نیوەڕۆ نوێنەرەکان لە گوندی بەنۆك ئامادەبوونو کۆبونەوەکە لەژێرداره گەورەکانی پشتی گۆڕستانی پشتی گوند بەسترا، ئەوانەی ئامادەی کۆبونەوەکە بوون (مقدم عزیز) سەرپەرشتی کۆبونەوەکەی دەکردو (مراد ئاغای بیری، ملازم تاهیر عەلی، ئەحمەدمستی لە جیاتی حاجی بێرۆخی هاتبوو، مستەفا نێروەیی، ڕەئیس عورەفا ئەسعەد، ئەحمەد سەعید سپینداری، زرار سلێمان بەگ، عزەت سلێمان بەگ) ئامادە بوون، لەسەرەتاوە مقدم عزیز بەخێرهاتنی میوانەکانی کردو لەڕێگای ئەوانەوە سڵاوی لە پێشمەرگەکان کردو لەدواییدا دەستی کرد بەقسەکردنو گوتی: (ئەوە دەبینن لیوا لەخلیفان ئابلۆقە دراوە لەگشت لایەکەوەو هەموو ڕێگاکانی لێ گیراوە، دەبێ هەوڵبدەین کە خۆیان بدەنە دەست، بۆ ئەو مەبەستە ئێوە هەریەکەی لە شوێنەکانی خۆتان دەبێ سازو ئامادە بن پێویستە بیرلەوە بکەنەوە کە هێرشتان دەکرێتە سەرو لێتان دەدرێت، لەبەرئەوە دەبێ زیاد لەپێویست وشیار بنو هەردەم نۆبەتداری ناو سەنگەرەکان بن، ئەگەر بتوانن لە ڕێگای خەڵکی ناوچەو گوندەکانەوە پەیوەندی بەهێزی سوپاو جاشەکانەوە بکەن بۆ ئەوەی ئەگەر نیازی هێرشیان هەبێت بەڵکو بتوانن زوو ئاگادارمان بکەنو یارمەتی دەرمان بن، چونکە ئێمە پێویستیمان بەهاوکاری هەموو کوردێك هەیە، ئەگەر ڕێ پێشاندەر بێت یان ئەگەر بتوانێ گوللەیەك ئاراستەی دوژمن بکات)، لە دواییدا گوتی: (ئەوەی بیرو ڕایەکی پەسندو سوود بەخشی هەبێت بۆ بەهێزکردنی هێزەکانمان

با بفەرمویّت قسە بکات)، ناوبراو دەیزانی من دەدویّم هەرزوو ڕووی کردە منو گوتی: (خالّ زرار بفەرموو دەزانم تۆ قسەت هەیە، ئەوەبوو کەوتمە قسەکردنو گوتم: (بەلّیّ خالّ عزیز ئیّوە دەفەرمون ئیّمە هاوپەیمانی لەگەلّ هەموو هۆزیّكو کەسانیّك دەبەستین ئەوەی بیەویّت یارمەتیمان بدات بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمن ئامادەین پەیوەندی لەگەلّ بەتین بکەین بۆ سوودی خەباتەکەمانو بەرژەوەندی گەلەکەمان بەومەرجەی لەگەلّ داواکاریەکانمان بگونجیّن، باشە ئەگەر وایە بۆچی کۆمەلّیّك شیوعی بەدەسەلاّتو دوژمنی سەرسەختی ئەو ڕژیّمەن وا خراونەتە ناو گەلی گەرەنالی، وەك دەست بەستراوو بەند بیّبەش کراون لە ڕووبەڕووبونی دوژمنو ڕیّگایان لیّ گیراوە)، مقدم عزیز گوتی: (ئەوەی ڕاستی بیّت زۆریان لیّ پەست بووم لە کاتیّکا بیستم بلاّویان کردۆتەوە گوایا ئەوان گەلی علی بەگیان گرتوە بەتەنیا بۆیە ڕیّگام نەداون بیّنە بەرەی ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن، ڕاستە ئەوانیش بەشدار بوون لە گرتنی گەلی علی بەگ، بەلاّم ئەوەندە نەبوو، ئەوەندەی ئەوان گۆتبویانو بلاّویان کردبۆوە). عزەت وەلاّمی دایەوەو گوتی: (خالّ عزیز من لەو باوەڕەم وانەبیّت ئەوەی ئەو قسانەی بەئیّوە ڕاگەیاندوە، ئەوان ئەمەیان بلاّوکردبیّتەوە، بەلّکو بەزاری ئەوان بلاّوکراوەتەوە دوریش نیە کە بەهەلّە بۆ ئیّوە گەڕابیّتەوە، پیّویستە ئیّوە لەو ڕووەوە ئاگادارین خەلّکی دلّ ڕەشو پڕوپوچ هەن نایانەویّ یەك گرتن لەناوماندا هەبیّت). دووبارە بەدەنگ هاتمەوەو گوتم: (خالّ عزیز ئەگەر دەتانەویّ بەڕاستی سەرکەوتووبین دەبیّ پەیوەندی لەگەلّ نەیارانی دوژمن بەتین بکەینو باوەش بۆ کۆمەلّو کۆمەلّگا بکەینەوە، بەتایبەتی لەگەلّ بەرهەلّستکارانی ڕژیّم، خۆشتان ئەوە دەزانن کە شیوعیەکان دژوارترین بەرهەلّستکاری ئەو ڕژیّمەن. پالّپشتی بەهیّزی بنەڕەتی هەمیشەین بۆ یارمەتیدانی کوردو شۆڕشو داواکاریەکانمان)، ئەوەی هەستم کرد لەکاتی قسەکانم مقدم عزیز گرژ ببوو دەیویست وەلاّمم بداتەوە، بەلاّم پیّش ئەوەی بەدەنگ بیّت (ئەحمد مستی بارزانی) بەدەنگ هاتو گوتی: (خالّ عزیز قسەکانی کاك زرار لە جیّی خۆیەتیو ڕاستە، ئیّمە لەوکاتە ناسکەدا پیّویستیمان بەیارمەتیو هاوکاری تاکە کەسیّکیش هەیە کەچی هاوکاری لەژیّر دەستماندایەو پالّی دەدەینو لەخۆمانی بەدوور دەخەینەوە کەی ئەوە ڕاستە؟. بەلّکو زیانیّکی گەورەیەو مەترسی بەدواوەیە، لەبەر ئەوە بەڕاست دەزانم هەرئیّستا بنیّرن بەدوایاندا بۆ ئەوەی بیّنە

بەرەی ڕووبەڕووی دوژمن‌و بەشداربن لەو شەڕەی ئێمە دەیکەین)، لە دوای ئەو داوایەی ئەحمد مستیّ‌و قسەکانی ئێمە مقدم عزیز بەناچاری بەملازم تاهیری گوت: (نامەیان بۆ بنوسە با چەکدارەکان بنێرن بۆ بەرەی سپیلك بابێنە لای (زرارو عزەت)، هەرئەوکاتە ملازم تاهیر نامەی بۆ نوسین کە بێن بۆ بەرەی سپیلك. کۆبونەوەکە کۆتایی هات هەریەکەی گەڕایەوە لای پێشمەرگەکانی، دوای بلاّوە پێکردنی بەشداربوانی کۆبونەوەکە زۆری پیّ نەچوو عقیدکافی پەیدا بوو، شەویش لای ئێمە مایەوە، بەیانی ڕێکەوتی (١٩٦٣/٧/١٢) لەگەلّ ئاسۆی بەیانی دوو فرۆکەی دوژمن لە جۆری (فیووری) گەیشتنە سەر بەنۆك‌و ئیتر بەبۆمبای ئاگر پرژێن‌و شەستیر گوندەکەیان بۆمبا باران کرد ئەو دوو فرۆکەیە هێشتا نەڕۆیشتبوون فرۆکەیەکی تری بۆمبا هەلّگر لە جۆری (لویوشین) گەیشتە سەرگوند ئەویش ئەوەی پێی بوو فرێیدایە سەر گەنم‌و نیسکەکانی دەوروبەری گوند، بەلاّم چالاکانە خەلّکەکە ئاگرەکەیان کوژاندەوەو نەیان هێشت دانەوێلّەکەیان بسوتیّ، عقید کافی‌و ئەوانەی لەگەلّی بوون هەرئەوەندەیان بۆ کرا بەپەلە بڕۆن.

لەگەلّ عزەت دوو بەدوو دانیشتین کەوتینە دوان دەربارەی هاتنی چەکدارەکانی شیوعی بۆلای ئێمە، گوتمان (مادام عزیز ئێمەی دیار کردکە شیوعیەکان بێنن، پێویستە ئێمەش بەپێی توانا یارمەتیان بدەین بۆئەوەی بەلانی کەم ناوەکانیان بخرێتە لیستی پێشمەرگە، بۆ ئەوەی ئازوقەیان پیّ بدرێت، وە ئەگەر هاتوو چەکیشمان بەدەست کەوت لەویش یارمەتیان دەدەین، ئەوەشمان خستە بەرچاو ئەگەر بوو بەشەڕ دەتوانین چەك لە پێشمەرگە بیّ توانایەکانی خۆمان وەرگرین‌و بیدەین بەوان بۆ ئەوەی شەڕی پیّ بکەن تا دیاربن‌و جێی خۆیان قایم بکەن‌و ببنە جێگای باوەڕی هەموو لایەك، بەم شێوەیە چاوەڕێی ئەوان بووین کە بێن‌و بگەنە لامان. ئەو ماوەیەی لە گوندی بەنۆك بووین ڕۆژانە دەڕۆیشتینە ژێر دارەکانی گۆڕستانی دامێنی گوند لەبەرئەوەی ڕووبەڕوو بوو لەگەلّ ڕێگای گشتی ئەوەی بەسپیلك تێپەڕ دەبوو، بەشەویش هەموومان نۆبەتدار بووین لەگردەکان، بەلاّم ئەوەی ڕاستی بێت بۆ خواردن‌و خۆراك زۆر هیلاك بووین، ئەوەی هەبوو تەنها نان‌و چا بوو خۆراکمان نەبوو ناوە ناوەش کوشتەیان پیّ دەداین، ئەویش هەریەکەی پارچەك گۆشتمان بەبەردەکەوت یان نا! لەکۆبونەوەی بەنۆك هەندێك تەوجیهاتمان پێدرا لە ڕووی ئاشنا بوون لەگەلّ

کاروکرداری پێشمەرگایەتی‌و هەندێ شتی تر کە نەمان دەزانی‌و لامان ڕوون نەبوو کە زۆر باش بوو زانیمان، وەك باسکراوە بەنۆك گوندێکی پەنایەو لەناو کەندێکدایە هەتا بەسەری هەڵ نەبی‌و نەگەیە ناوی دیار نیە، کانیاوێکی کەم ئاوی هەیە لە دەوری ئەو کانیاوە چەند بنە هەنجیرێك هەن ئەویش لەبەر بێ ئاوی هەڵ نەکەوتوون. دانیشتوانی ئەو گوندە نەزانن‌و ژیانیشیان ژیان نیە بەڵکو دەردەسەریە. ڕۆژی سێیەمی دوای کۆبونەوەی بەنۆك فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەریش کاتی نیوەڕۆ گەیشتە سەر سەنگەرەکانی ئێمەو دەسوڕایەوەو بۆ دەست نیشان کردنی ئەو شوێنانەی مەبەستی بوو، ئەوکات ئێمە لە ژێر سێبەری دارەکانی گۆڕستان دانیشتبووین لە هەموو لایەکەوە تەقەی لێ کراو فڕۆکەکە سەری لێ شێواو نەی دەزانی بۆکام لابڕوات!! هەرئەوەندەی بۆ کرا بگەڕێتەوە هەریر لەوێ نیشتەوە، بەڵام چی! لە سەربازگەی هریر ئێمە کەوتینە ژێر ئاگربارانی تۆپەکانی دوژمن هەرئەوەندەمان بۆ کرا ڕابکەینە شوێنە پەنایەکان‌و خۆمان پەنا بدەین، ئەو نۆبەتدارانەی کەلەسەر گردەکان بوون لەتۆز دیارنەبوون وامان دانا کە کەسیان نەمابن، لەبەرئەوان خۆم پێ ڕانەگیراو تۆپ باران هەربەردەوام بوو من ڕۆیشتم هەرچەندە پێشمەرگەکان هەوڵیاندا نەڕۆم لەگەڵ ئەوەشدا هەر ڕۆیشتم بۆ لایان بەخۆشم نازانم کە چۆن گەیشتمە ئەوێ ! کە چوومە لایان‌و بینیم هەموویان سەلامەتن‌و ماوون زۆر خۆشحاڵ بووم کە ئەو قارەمانانە(تاهیرحەمەدو ئەحمەد قادروکەژە حسێن‌و ڕەسول ئەحمەد گەلاڵی) کەدانیشتوی ڕەژیکەریان بوون زۆر مەردانە سەنگەرەکانیان جێ نەهێشتبوو ئەگەرچی هەموو دەقیقەیەك مردن چاوەڕوانیان بوو بەجۆرێك لەو شوێنە دەرباز بووین‌و خۆمان ئاودیووکرد بەدەردەسەری لەبەرئەوەی شوێنەکە ڕووبەڕووی دەشتی هەریر بوو، ببوە ئامانجی تۆپەکان بەپەلە هەوڵماندا خۆمان بگەیەنینە پەنایەك کە گوللە تۆپ نەیگرێتەوەو ئەوکاتەش تۆپەکان بێ وەستان دەهاوێژران.

هاتنی چەکدارەکانی شیوعی بۆ سپیلك: دوای ئەوەی نامەیان بۆ نوسین کۆمەڵێك چەکداری شیوعی گەیشتنە بەنۆك، ئێمە لەسەر کانیاوی گوند بووین پێیان ڕاگەیاندین کە چەکدارەکانی شیوعی گەیشتنە گوند، بێگومان پێشوازیەکی گەرمان لێ کردن هەرئەوکاتە ئەو تاکە(گیسك)ەی هەمان بوو بۆمان سەربڕین، ئەوشەوە لەلای ئێمە مانەوە گوایا لەسەر ڕاسپاردەی ڕەئیس کمال دەبێ لەلای ئێمە

بن ئێمەش وامان دانابوو، بەڵام کاتێك لەگەڵ حاجی جرجیس کەوتمە دوان ناوبراو ڕای گەیاندو گوتی: لە ڕێگا دەهاتین کێشە بوو لە نێوان حسێن خەبازو ملازم مهدی دیار بوو زۆر بەتوندی لەگەڵ یەکتر دەدوانو نێوانیان تێك چوو لەسەر ئەوەی حسێن خەبازو حاجی حسن ئاغا نارازی بوون بەوەی بێن بۆلای ئێوە ئەوان دەیان گوت (ئەگەر بڕۆینە لای زرارو عزەت مانای وایە لە ژێر دەسەلاتی زراردا دەبینو ناوبراو فەرمانڕەوامان بێت ئەوەش بۆ ئێمە ناگونجێت)، برادەرم حاجی زیاتر لەسەری ڕۆیشتو دەڵێت: (ملازم مەهدیو مام ئەلیاس هەولێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی لە سەر ڕاسپاردەی ڕەئیس کەمال لای ئێوە بین هەر ڕازی نەبوون) کەچی ڕەئیس کمال پێی گوتن (دەڕۆنە لای هێزی مام سلێمان بەگ). بەحاجی برادەرم گوت: (کاکەی ئەزیزم با ئەوە باش بزانن کەلەسەر داوای من بووە ئەوانیان هێناوەتە ئێرە ئەوجا با بەئارەزووی ئێوە بێت گرنگ نیە لای ئێمە دەبن یان لە هەر شوێنێکی تربن گرنگ ئەوەیە کە ئێوەیان هێناوە بۆ بەرەی ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن، ئەوەی لەسەر ئێوە پێویستە ئەوەیە خۆتان بەدیاربخەنو جێگای خۆتان قایم بکەن، ئەگەر چی من گەش بین نیم ئەوەی گوتم لە توانای ئەواندا بێت سەرپەرشتی ئێوەیان پێ بکرێت!).

لەوباسە گەڕاین دەستمان کرد بەقسەی ترو سەربردەکانی ڕابردوو هەندێ شتی گرنگ ئەوەی لەداهاتوو لێی بدوێینو بخرێتە بەرچاو ئەگەر بەسەلامەتی بگەڕێینەوە، لەقسەکردنماندا بۆم ڕوون بووەوەو بەدیاریش کەوت کە ئەوان تێکڕا نارازی بوون لەهەڵوێستو کرداری هەندێك پیاوی دوور لەڕاستیو ئێستا خۆیان کردوە بەدەمڕاست وەك حاجی مەلاو حاجی حسن ئاغاو حسێن خەبازو زرارە شەل. بەپێی توانا هەرچی لەدەستمان هات بۆمان کردنو ڕێزێکی زۆرمان گرتن بەهاتنیان خۆشحاڵ بووین بەنیازێکی پاکەوە دەمانویست یارمەتیان بدەین، بەڵام بەیانی ڕۆژی دوایی پێش نیوەڕۆ نامەیەکی مقدم عزیزم پێ گەیشت نوسی بووی: (برایانی بەڕێز زرارو عزەت، ئەوشوعیە چەکدارانەی لەسەرداواو خواستی ئێوە هاتبونە سپیلك لەسەر داوای خۆیان بیان نێرن بۆلای ڕەئیس عورەفا ئەسعەد لە دامێنی چیای بەنی هەریر لە پشتی گولەك). دوای خوێندنەوەی نامەی مقدم عزیز پێم ڕاگەیاندن بفەرمون لەسەر خواستی خۆتان بڕۆنە لای ئەسعەد خۆشناو لە دامێنی چیای بەنی هەریر ئەو شوێنە حسێن خەبازو حاجی حسن ئاغا داوایان کردوە، بەو شێوەیە ئەوان

ڕۆیشتن، ئێمە پێمان خۆش نەبوو بڕۆن لەبەر ئەوەی دەمانزانی ئەوان ئەوەندە زاناو شارەزا نەبوونو وەك چەکدارەکانی ئێمە شەڕیان نەدیبوو، بەلاَم دیار بوو بەرپرسەکانیان بەڕاستیان نەزانی لەلای ئێمە بن ! ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین ببوە ئامانجی تۆپو فڕۆکەکانی جەنگی، بێ وەستان ئاگری تۆپو هێرشی فڕۆکەکان لەسەرمان بوو وەك لەسەرەوە دیارکراوە، ئەوشەوەی عقید کافی لامان بوو، بەیانی زۆر زوو فڕۆکەکان هاتن ئەوەندە نەوی دەسوڕانەوە هەرئەوەندە بوو خۆیان لەدارەکان نەدەداو بەس، ئەو شەوە لەگەڵ عقیدکافی تا درەنگی شەو دانیشتین لە زۆر ڕووەوە قسەوباسمان کرد ئەوەی ڕاستی بێت ئەو پیاوە زۆر وشیارو پێ گەیشتوو بوو، بەتایبەتی لەڕووی سیاسیو عەسکەریەوە، لەکاتی قسەکردن پێم گۆت: شەوان لەنزیك ماڵی حسێن ئاغاوە (قەندیلە)ی پەیوەندی کاردەکات لەگەڵ سەربازگەی دەشتی هەریر بەئاشکرا دیارە. کافی لەوەلاَمدا گوتی: (دەتوانم بڵێم ئەو پیاوانەی لەگەڵ منن زۆر لێیان بەباوەڕ نیم کە بەپاکی لەگەڵ مندا بن، لەوانەیە زۆربەیان پەیوەندیان بەحکومەتەوە هەبێت !) ئەوەی جێگای نیگەرانیمان بوو ئەوە بوو کەبەیانی بەپەلە عقید کافی گەڕایەوە بۆ دیوی گوندەکانی ئەو دیوو(لێرەمێرو دەربەندۆكو سرێشمە).

خۆراگری هێزەکەی ئێمە لەبەنۆك ورەو توانایەکی زۆری دەویست، ئەویش لەبەرئەوەی دوژمن بەهەموو هەوڵێکیەوە دەیویست ئەوشوێنە ستراتیجیە بەجێ بهێڵین، بۆیە بەبەردەوامی ببوینە نیشانی تۆپو فڕۆکەکانی دوژمن، لەگەڵ ئەو هەموو ئاگربارانەشدا دوژمن نەیتوانی وورەی پێشمەرگەکانمان دابەزێنێتو بەهیچ شێوەیەك شوێنی خۆمان جێ نەهێشت تا ئەو کاتەی هەموو هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە ناوچەکە کشایەوە.

هێرشی گشتی سوپاو جاشەکان: کاتێك هێرشی دوژمن بەجاشو سەربازەوە لە هەموو لایەکەوە دەستی پێ کرد، هێرش هێنەران لەلای گوندی (ئامۆکان) بەسەرکەوتنە سەر بەرزاییەکان، لە ئەنجامی شەڕێکی زۆر دژواردا پێشمەرگەکانی مرادئاغای بیرێ بەناچاری لەژێرئاگری تۆپو فڕۆکەکانو هێرشی بەردەوامی سەربازو جاش شوێنەکانیان بەجێ هێشت، هەر بەهەمان شێوەش پێشمەرگەکانی مستەفا نێرەیی شوێنەکانیان بەجێ هێشتوکشانەوە بەرزایەکانی لای (بێخمە) سوپاو جاش

هاتنە شوێنی ئەوان، لەوێوە ڕووی چەکەکانیان کردە سەنگەرەکانی ئێمەو لە دەشتی هەریریشەوە لولەی تۆپەکان لە ئێمە کرا لەبەر تۆزی بۆمباو گوللە تۆپ کەس کەسی نەدەدی، دوای گەردەلولەکە دیاربوو لە بەنی هەریریش شەڕێکی دژوار بوو لە دەوربەری نیوەڕۆ پێشمەرگەکانی ئەوێش لە سەنگەرەکانیان هەستان‌و ئاوای دیوی ئالانەو خلیفانیان کردن، ئەوجا لەگشت لایەکەوە ڕوو لە ئێمەو ئەحمەد سعید سپیندارێ کرا، ئەوان لەخوار ئێمە بوون بەڕادیۆ گوێبیستی لاسلکی سەربازگەی ئامۆکان بووین دەیگوت: (هەموو هێزی یاخی بوەکان لە شوێنەکانیان کشاونەتەوەو شوێنەکانیان جێ هێشتوەو چوونەتە بەرزایەکانی سەرچیا، تەنیا شەڕکەرەکانی سلێمان بەگی دەرگەڵەیی خائین لە شوێنی خۆیان پێیان چەقاندوە، ئەوەندەی بۆتان دەکرێت بەتۆپ‌و فڕۆکە لێیان بدەن)، بەکشانەوەی هێزی پێشمەرگە هەموو زەبرو گرانایی کەوتە سەر ئێمە بەڕاستی زۆر شپرزەیان کردین لەگەڵ ئەوەشدا جێگای خۆمان بەجێ نەهێشت، لەدوای نیوەڕۆ ئەحمد سعیدیش ناچارکرا بکشێتەوەو برینداراەکانی دەرباز بکات‌و ئێمەش هاوکاری بووین تا دەرباز بوون، لە دوای دەرچونی ئەوان چەند جارێك هەوڵیان دا لێمان نزیك بکەونەوە، بەڵام هەموو هێرشەکانمان بەرپەرچ دەدایەوەو بەرەو دواوە دەگەڕانەوە بۆ بناری سپیلك، هەرجارەی دەگەڕانەوە دواوە ئاگری تۆپ‌و هێرشی فڕۆکەکان زیاتر دەبوو لەسەرمان تا درەنگی ئێوارە لەژێر ئەو زەبرو زەنگەدا بووین لە دوای کاتژمێر پێنجی ئێوارە ئەوجا ڕاسپاردەی مقدم عزیزو سعید میرخان بارزانی، زۆر بەشێواوی خۆی گەیاندە لامان‌و نامەی مقدم عزیزی هێنابوو کە بکشێینەوە گوندی (لێرە میری)، ئێمەش لەسەر داوای مقدم عزیز لەدوای کاتژمێر پێنجی ئێوارە دەستمان بەکشانەوە کرد، لە ئەنجامی هێرشی بەردەوامی فڕۆکەکان ئاگر بەربوە پوش‌و دارستانی ناوچەکە،دوکەڵی ئاگر قەدپاڵی چیایەکانی تاریك کردبوو، بەشێوەیەکی ڕێك وپێك پێشمەرگەکانمان لە شوێنەکانیان هەستان‌و بەرەو بەرزاییەکان سەرکەوتن،لە ژێرئاگری چوار فڕۆکەی جەنگی کە زۆر بەچڕی لێیان دەداین‌و تۆپەکانی دەشتی هەریریش بێ وەستان تۆپبارانیان دەکردین، لەوکات‌و ساتە ناهەموارەی لەناو دوکەڵ ڕۆیشتندا بووین لە دوورەوە دیار بوو یەکێك بەپەلە بەرەو ڕووی ئێمە دەهات کاتێك نزیك کەوتەوە دیار بوو(سەعیدی ڕەزاق)یە پێیەوە دیاربوو کە زۆر پەشۆکاو بوو،

یەکسەر گوتی: (خدر حسێن بریندارەو دەمانەوێ بیبەین بۆ خەلان‌و لەهاورێیانمان دابڕاوین، بەڵکو هاوکاریمان بکەن تا بەسەری دەخەینە سەرگەروەکە لەوێ بەولاوە خۆمان دەیگەیەنینە لیرەمیر)، یەکسەر ئەوانەی لەگەڵم بوون ڕۆیشتن کاتێك گەیشتنە لای خدر، دیتمان عومەری عەولای سێمانی لەلابوو، سەیری خدرم کرد ئەگەرچی هیلاکیش بوو بەلام وورەی بەرز بوو دەیگوت: (هەڵم مەگرن خۆم بدەنە بن شانم وردە وردە خۆم دەتوانم بڕۆم)، پێم گوت: (ئێمە یەك لەشکر پێشمەرگەین چۆن دەبێ تۆ بەو برینداریە بەخۆت بڕۆی عەیب نیە؟) لەوێیەوە هاوکاریمان کردن تا بەسەرمان خستە سەر گەروەکە، لە ڕێگا سعید رزاق بۆی گێڕامەوە کە چۆن گوللە تۆپ بەناو سەنگەرەکەیان کەوتبوو گوتی: (هەموومان لەناو یەك سەنگەردا بووین گوللە تۆپێك بەناومان کەوت حەوت پێشمەرگەمان برینداربوون‌و حاجی جرجیس‌و هەمزەش شەهید بوون، لاشەکانیان لەوێ بەجێ ماون)، حاجی جرجیس خۆشەویسترین هاوڕێم بوو، دیاربوو بریندارەکانی تر برینەکەیان سوك بووە، بەخۆیان ڕۆیشتبون، (خدر)مان بەسەر گەروەکە خست لەوێ من‌و دووسێ چەکدار گەڕاینەوە بەدوای ئەو چەکدارانەی لەگەڵ عزەت مابوون لەسەرکانیاوەکەی دیوی لای کەلەکین چاوەڕوانمان دەکردن، بەردێکی زۆر گەورە لە پشتی کانیاوەکە بوو دیتمان لە بن بەردەگەورەکە مریشکێك بەجوجەڵەوە بەسترابووەوە کاتێك ئاگری لێ نزیك کەوتەوە زۆری نەمابوو بیان گاتێ مریشکەکە خۆی ڕاتەکاند بەسەربەردە گەورەکە بکەوێت نەیدەتوانی لەبەرئەوبەنەی پێیەوە بەسترابووەوە بەنەکەش کورت بوو، بەپەلە چووم بەنەکەم پساندو مریشکەکە بەرەڵا بوو لەگەڵ بەرەڵا بوونی بەسەربەردەکە کەوت جوجەڵەکانیشی بەدوادا سەرکەوتن، بەوردی سەیرم کردن ڕۆیشتنە شوێنێك لەناوەڕاستی بەردەکە دوور لە ئاگر، لەوکاتەش برادەرەکانمان گەیشتنە لامان دنیا تاریك داهاتبوو بەرەو (لیرەمیر) کەوتینە ڕێ، بەدرەنگەوە گەیشتینە گوند هەر زوو پرسیم (خدر) لە کوێیە؟ گوتیان بەڕێ کرا بۆ گوندی خەلان، بەئێمەشیان گوت بڕۆنە گوندی (کانی کوڕك) عقید (کافی‌و مقدم عزیز) لەوێ چاوەڕوانی ئێوە دەکەن. لە دوای پشوەیەك سەرەو ژێر ڕۆیشتینە خوارەوە بەرەو (کانی کوڕك) بەو شەوە تاریکە ئەو لەشکرە کەوتبوە ڕێ کاتێك لە گوند نزیك کەوتینەوە دیمان کۆمەڵ کۆمەڵ چەکدارەکانی (حاجی بێرۆخی) ئاگریان کردبۆوە لە دەوری دانیشتبون، بەو

شێوەیە چەکدارەکانی ئێمە لە شوێنێك وەستان کە چووینە لای عقید (کافیو مقدم عزیز) دیار بوو (حاجی بێرۆخیو مستەفا نێروەییو مرادئاغا)و چەندی تریش لەوێ بوون، لە دوای گەیشتنی منو عزەتو خدری عولا بەگ ئەوانەی پێویست بوون بانگ کران، بەپرسەکانی پێشمەرگە گشتیان ئامادە بوون لەسەرەتادا (عقید کافی) دواوگوتی: (ئەوەی جێگای پەرۆشیو نیگەرانیە ئێوە ئەوها بەئاسانی شوێنەکانتان بەجێ هێشت، خۆ هەمووتان دەزانن شوێنی پێشمەرگەکانی مام سلێمان بەگ لە هی هەمووتان سەختترو مەترسیدارتر بوو، کەچی هەرئەوان بەتەنیا مابونەوە، لە هەموو لایەکیش لێیان دەدرا تا ڕاسپێردراومان نەنارد لە شوێنی خۆیان نەجولاّنو سەنگەرەکەی خۆیان جێ نەهێشت، کە ئێوە شوێنەکانتان جێ هێشت دوژمن ڕووی لەوان کرد، ئەگەر پێمان نەگوتبان بکشێنەوە ئێستاش هەرلەوێ دەبوون، بەلامەوە زۆر سەیرە لە کاتێکدا پێشمەرگەکانی دەوروبەری سرێشمەو خلیفان هەموویان لە شوێنەکانی خۆیانن‌و ئاگادارنین کە ئێوە ڕێگاتان بۆ دوژمن چۆل کردوەو ژیانی ئەوانیشتان خستۆتە مەترسی، وەك بلێی ئێوە گوێ ڕایەڵی فەرمانەکان نین!) عقید کافی زۆر بەتووندی دابەزیە سەر فەرماندەکانو وای نیشاندا کەوا فەرمانەکان بەپێی پێویست جێ بەجێ ناکرێن، دەبێ بزانین هۆی چیە؟ لە قسەکانی (کافی)دا وا دیاربوو کە ناکۆکی هەبێت لە نێوان ئەوو (عزیز) وا پێ دەچوو هۆیەکەشی هەرئەوە بوبێت کە ئەوها بەئاسانی (سپیلك) بەردراو کشاینەوە، لەبەرئەوە (کافی) ئەوەندە پەست ببوو فەرمانی دا کە دەبێ هەر ئێستا بگەڕێنەوە سەر بەرزایەکانی زنجیرە چیای (بێخمە) تا (سرێشمە). عزەت دواو گوتی: (ئەوەی جێگای نیگەرانیە بەجێ هێشتنی سپیلك بوو بەو شێوەیە بەڕاستی کارێکی ناتەرزو شەرمەزاری بوو بەو شێوەیە ڕێگا بدرێت بەدوژمن ئەگەر(سپیلك)یشمان بەجێ هێشت نابوایە بەرزایەکانی سەرچیا بەجێ بهێڵین). منیش لە قسەکانم گوتم: (ئەوەی دیارە هەست بەساردیەك دەکرێت هەرئەو ساردیەش بووە هۆی ئەو پەشێویو ناڕێکیە ئەوەش سەرکردەکان بەرپرسیارن نەك ئەو پێشمەرگانەی لەژێر فەرمانی ئەواندانە، گومانی تێدانیە شکانی ئەو لەشکرە بەم شێوەیە دەنگێکی ناسازی دەبێتو ئەنجامیشی مەترسیدارە). ئینجا (حاجی بێرۆخی) گوتی: (بفەرموو کاك کافی ئەوەی پێویستە با بیکەین تا زووەو خەڵك بلاّوەی نەکردووە، ئەگەر ئەو چەکدارانە بلاّوە بکەن

کۆکردنەوەیان بۆ جارێکی تر زەحمەتە، دەبێ ئەوەش بزانین مەلامستەفا بەوشکستە لێمان زویر دەبێت). دیسان (کافی) داوای کرد بەپەلە بگەڕێنەوە شوێنەکانتان بۆ سەر زنجیرە بەرزاییەکانی سەرچیا، ئەگەر هەر نەبێت بتوانین (گەلی علی بەگ) بپارێزین و لەدەستی نەدەین، خۆئەگەر بتوانین ڕێگا لە سوپا بگرین و چەند ڕۆژی تر نەگاتە خلیفان ئەوە زۆر باشە) عقیدکافی هەر لە بێخمەوە تا سرێشمە هەریەکەی شوێنی بۆ دیارکردین و پێی ڕاگەیاندین نابێ کەس بێ پرس شوێنی خۆی جێ بهێڵێ، بەپێی ڕاسپاردە هەرئەوکاتە دەستمان بەگەڕانەوە کردو هەریەکەمان بەرەو ئەو شوێنە دەچووین کە بۆمان دیارکرابوو لەسەر ئەو بەرزاییەی بەسەر هەردوو دیودا دەیڕوانی، (حاجی بێرۆخی و مستەفا نێروەیی) داندرابوون بۆسەر بەرزاییەکانی بێخمە، ئێمەش بۆ پشتی (کەلەکین)و(مراد ئاغا)ش لە ئێمە بەولاوە لە پشتی (خلیفان) داندرا، ئەو لەشکرە دابەشی سەرئەو زنجیرە چیایە کرا لەوسەر بۆ ئەو سەر.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو بڕیارە لە (کانی کۆرك) بەڕێ کەوتین لەوێوە بەهەورازێکی سەخت سەرکەوتین، شەو دەرەنگ بوو بەناو بێستانێکدا ڕۆیشتین، بەلاّم لە تینوەتیان تەواو هیلاك ببووین، بەو شەوە تاریکە بەناو بیستان کەوتن هەندێ تەرۆزی و کاڕکە گندۆرەیان بەدەست کەوتن، لەوێ ماوەیەك حەساینەوە، ئینجا ڕۆیشتین بۆ سەر گەروەکەو چووینە ئەو شوێنەی بۆمان دیارکرابوو، کاتێك سەیرمان کرد کۆمەڵە ماڵێك لەگەڵ ماڵی (حسێن ئاغا) لە دیوی لای (خەلانێ بیاوێ) لەبن کێلە شاخێك خۆیان پەنا دابوو لەترسی تۆپ و فڕۆکە ئەوان وایان دەزانی ئێمە ڕۆیشتوین و ناگەڕێینەوە کەچی دیتیان ئێمە لەسەر گەروەکەین. پێش دەرکەوتنی ئاسۆی بەیانی من لەنزیك نۆبەتدار دانیشتبووم هەرئەوەندەم زانی نۆبەتداری پێشەوە (فتاح فقێ حسن) گوتی: (کوڕە تۆ کێی؟) هەر لەگەڵ دەنگدانی نۆبەتدار من گەیشتمە لای، دوو پیاوی بەچەکمان دیت هەر زوو پێمان گوتن: (دەستتان هەڵبڕن ئەگینا کوژران؟) زوو دەستیان بەرزکردنەوەو گوتیان ئێمە پیاوی (حسێن ئاغا)ین. دوایی چەکەکانمان لێ وەرگرتن، بەدیارکەوت کەوا پاش ئەوەی ئێمە ڕۆیشتینە (کانی کۆرکێ) حسێن ئاغا ئەو دوو پیاوەی ناردبونە لای ئامیر لیواو ئاگاداری کردبوون کە پێشمەرگە لەوێ ڕۆیشتوون و ئەوێ چۆل کراوە، نەیانزانی بوو ئێمە گەڕاوینەتەوە، لێم پرسین (بۆچی چونەتە خلیفان؟) یەکێکیان هەر زوو گوتی: (کاغەزی حسێن ئاغا)مان بۆ

ئامیرلیوا برد، دیسان پرسیم: (کاغەزەکەتان لەویّ دابەکیّ ؟) گوتیان: (دامانە دەستی ئامیرلیوا خۆی). پرسیم: (کاغەزی ئامیرت بۆ حسێن ئاغا هێناوەتەوە؟) گوتیان: (نەخێر ئەوان چاوەڕێن حسێن ئاغا بەخۆی بڕواتە لای ئامیرلیوا بەو نیازەی بڕواتە ئالاّنە، عومەرئاغای برای لەوێیە بیهێنێتەوە). لەدوای ئەوەی بۆمان دەرکەوت پیاوی (حسێن ئاغا)ن بەڕێم کردن بۆ لای خۆی، ناوبراو گوتبوی: (ڕاستە پیاوی منن) ئەوکاتە تفەنگەکانیان دابونەوە دەستی (حسێن ئاغا).

ئەوەی شایانی باسە هەرئەو بەیانیەی گەڕاینەوە سەربەرزایەکان سەیرمان کرد هێشتا هێزەکانی دوژمن بەسەرنەکەوتبونە سپیلك، لەگەڵ هەلاّتنی خۆر/تانکەکان خەریك بوون لە پێچەکان بەسەردەکەوتن، بەلاّم زۆر بەترس دەڕۆیشتن، نزیك کاتژمێر یازدە ئەوجا بەسەرکەوتنە سەربەرزاییەکەی نزیك قەبری (خدرئاغا) کە دیتیان کەسیان لەپێش نەماوە دەستیان کرد بەتەقەو سەربازەکانیش سەرکەوتن، لە دواییدا ڕوویانکردە ئەو شوێنەی ئێمەی لیّ بووین گردی (بەنۆك)، بەلاّم پێش ئەوەی بەرەو گردەکە بڕۆن ئەو گردە کەوتە بەرهێرشی فڕۆکەو تۆپ بارانێکی سەخت، تا تەواو دڵنیا بوون لەوەی کە کەس نەماوە ئەو کاتە تانکەکان بەرەو گردەکە کەوتنە ڕێو جاش‌و سەربازیش زۆر بەترسەوەو بەپارێز بەرەو ئەو سەنگەرانەی ئێمەی تێدا بووین سەردەکەوتن، وایان دەزانی ئێمە هەرلەوێین‌و نەڕۆیشتیوین، ئێمە ڕۆژی پێشوو ئێوارەیەکی زۆر درەنگ ئەوێمان جیّ هێشتبوو، بێگومان ئەوچەند ڕۆژەی لەویّ بووین چەند جارێك هێرشی ئەوانمان بەرەو دواوە گێڕابووەوەو بەشکاوی سەرەوژێر ڕاو دەندران‌و ترسێکی باشمان دابونیّ، هەر لەبەرئەوەش ئەوەندە بەترس بۆگردی (بەنۆك) دەڕۆیشتن، لەوکاتەی خەریك بوون بەسەرگردی بەنۆك بکەون ناردم بەدوای (حسێن ئاغا) زۆری پیّ نەچوو ناوبراو هات بینی سوپاو جاش وا بەرەو (کەلەکین) دەڕۆن، (حسێن ئاغا) گوتی: (گەڕانەوەی ئێوە بۆ ئێرە هەموو کارەکانی منی تێکدا، ئەگەر ئێوە نەگەڕابانەوە ئێرە گوندی (کەلەکین)یش ئەمڕۆ نەدەسوتێندرا). پێم گوت: (حسێن ئاغا چەند چەکدارت لایە با بێن لەگەڵ ئێمە هەرئێستا دەڕۆین‌و ناهێڵین بگەنە گوندو دەیانگێڕینەوە). ئەو پیاوانەی لەگەڵی بوون گوتیان: (ئەوەیە هەڵوێستی ڕاست دەبا بچین شەڕێکی مەردانەیان لەگەڵ بکەین)، دیاربوو (حسێن ئاغا) قسەی ئەوانی پەسەند نەکرد، واپیّ دەچوو پەیوەندی پێوە کردبن، ناوبراو

لەویٚ وەستا تا سوپاو جاش گەیشتنە ناو(کەلەکین)و سوتاندیان خۆیو پیاوەکانی باش سەیریان دەکرد کە چۆن کەلەکین دەسوتێندرا، ئەوجا بەدڵتەنگی گەڕانەوە ئەو شوێنەی ماڵەکانیان لیٚ بوون.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ (خدری عولا بەگ) لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تر دابەزیبونە ناو ئەو ماڵانەی کە لەترسی تۆپو فڕۆکە خۆیان پەنا دابووە بن کێلە شاخەکان لە دیوی (خەلانی بیاویٚ) بێگومان ماڵەکان ناسراویان لەگەڵدا بوون، کاتیٚ زانیبویان ئێمەین لە پشتی ماڵەکانی ئەوانین (ش.م.د) یەکێك بوو لە باوەڕ پێکراوەکانی ئاغاکان بەنەهێنی هاتە لاموگوتی: (بەڕاست نازانم ئێوە لێرە بن یا بارزانیەکان بنێرنە شوێنی ئێوە لەبەر ئەوەی نیازی سورچیەکان باش نیە، دوور نیە ڕێگا خۆشکەرو هاوکار بن بۆ یارمەتیدانی هێزەکانی حکومەت بۆ لێدانی پێشمەرگە، لەبەرئەوە پێم خۆش نیە ئێوە بکەونە بەرلێدانی ئەوان، بۆیە ئێوە لێرە بڕۆن بۆ شوێنێکی ترو زۆریش ئاگادارو وریای خۆتان بن!) دیاربوو ئەو پیاوە هەستی بەمەترسی دەکرد بۆیە نەیدەویست ئێمە لەویٚ بین. دوابەدوای ئەو قسانەی ئەو پیاوە دڵسۆزو پاکە،(خدر)ئەوکات چووبوە ناوماڵەکانو چاویکەوتبوو بەکوڕی پورم (حمد مستەفا) ناوبراویش ڕای سپاردبوو کە بەزرار بڵیٚ لێرە بڕۆنو دوور بکەونەوە لەوشوێنەی ئێستای لێن لەبەر ئەوەی سورچیەکان نیازیان باش نیە بەرامبەر ئەو هێزە. لەگەڵ گەیشتنی ئەو دەنگوباسە بەپەلە دوو پێشمەرگەم بەڕیٚ کردن (حسن حاجی حمدامینو مینەی عولا قوتوی)ماویلی بۆ لای (حاجی بێرۆخیو مستەفا نێروەیی) ئاگادارم کردن کەوا ئەو دەنگوباسە هەیە لەسەر سورچیەکانو هەڵوێستی چەوتیان. هەروەها دوو پێشمەرگەشم (خدرو تاهیری حەمەدی) ناردنە لای (مرادئاغای بیریٚ) بۆ ئەوەی ئەوانیش ئاگاداری ئەو نیازە خراپەی سورچیەکان بن، وە نامەیەکیشم بۆ (مقدم عزیز) بەڕیٚ کردو ئەو دەنگو باسەم تێدا نوسیبوو، هەرئەوشەوەی گەڕاینەوە سەرگەروەکە بەیانی (عزەت) زوو ڕۆیشتە لای عقید(کافی) لەویٚ خۆی لەبیرچوبوو نەیدەزانی پێشمەرگەی لەگەڵدایە یان نا!! ئەو کێشەو مشتومڕە بوو هەرنەشی زانیبوو (عقید کافی) پێی گوتبوو: (دەنگو باسێکی ئەوها هەیە دیارە سورچیەکان خەریکن لەگەڵ حکومەت لەدژی پێشمەرگە ڕێك بکەون بۆ لێدانمان).

بۆ جاری دووەم (ش . م . د) بەنەهێنی هاتەوە لامو پێی گوتم كە لەگەڵ (حسێن ئاغا) چۆتە (خلیفان) بۆلای ئامیر لیواو دەڵێت: (ئاغا هەوڵی ئەوە دەدا بڕواتە ئالآنە بۆلای عومەری برای بەڵكو بتوانێ ڕازی بكات بگەڕێتەوەو واز لە یاخی بووەكان بێنێ)، بەڵام ئامیر لیوا پێی گوتبوو: (كارت بەعومەر ئاغا نەبێت، ئەو كاری خۆی باش دەزانێ!) ئەو ڕووداوو دەنگو باسانەی لە سەرەوە نوسراون دەربارەی (حسێن ئاغا)و پیاوەكانیو ئەوانەی گرتنمانو ئاگاداركردنەوەی هاوسەنگەرەكانمان لە نیازی سورچیەكانو چونی (حسێن ئاغا) بۆ لای ئامیر لیوا (خدری عولا بەگ)ی بە(عزەت)ی ڕاگەیاندبوو بۆئەوەی بەڵكو (عقیدكافیو مقدم عزیز) ئاگادار بكەنەوە، بەڵام (عزەت) گوتبوی: (عومەر ئاغا) پارتیەو بەرپرسی ناوچەی حریرە چۆن دەگەڕێتەوە باوەشی حكومەت؟)، (خدر)یش پێی گوتبوو: (كاك عزەت ئێمە ئەو زانیاریانەمان لە سەرچاوەیەكی باوەڕپێكراوەوە بۆ هاتووەو لەسەرمان پێویستە ئاگادارتان بكەینەوە، جا خودا بكات وابێتو كاری خراپ ڕوو نەدا).

## چۆڵكردنو كشانەوەی هێزی پێشمەرگە لە سپیلك

لەڕێكەوتی (١٥/٨/١٩٦٣) ئالۆزی پەیدا بوو واهەست دەكرا كەوا(گەلی) كەوتۆتە دەست حكومەت، هەرئەوەندە زاندرا شەوی(١٦/٨) پێشمەرگەكان بەگشتی لە بەرزایەكانی سەرچیا دابەزینە خوار بۆسەر پردی (خەلانێ بیاوێ) ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو كەس بەكەس ڕانەدەگەیشت! ئەو هەموو لەشكرە كەس گوێڕایەڵی فەرمان نەبوو! هەمووی كەوتبونە ڕێ بەكڕو بێدەنگی واتدەزانی كەس لە ڕێگادا نیە! پێش دەركەوتنی ئاسۆی بەیانی لە پردی (خەلان) پەڕینەوەو دەربازی بەری ئەوبەر بووین، لە پشتی گوند كەمێك خەوتینو لەگەڵ گزنگی هەتاو بەرەو بەرزایەكانی (پیری خەل) كەوتینەڕێ، هەورازی پیری خەلمان كەوتە پێشو پێیدا سەركەوتین بۆ سەر بەنی (بالەكیان) لەوێوە بەباشی دەبیندرا ئەو هەموو لەشكرە چۆن دەستە دەستە بەدوای یەكدا بەسەردەكەوتنە سەرەوە، وات دەزانی كەس لە ڕێگادا نیە ئەوەندە بەبێ دەنگی دەڕۆیشتن، چونكە بەملكەچیو شكاوی دەگەڕانەوە، ڕۆژێكی زۆرگران بوو بەشێكی ئەو بارگرانیەش لەسەرشانی من بوو، لەگەڵ ئەو بارە

نالەبارەشدا کە بەسەرمان هاتبوو من بیرکردنەوەم هێشتا لەسەر قسەکانی (عزەت) بوو چونکە هەڵوێستی ناوبراو هەرئەوەندە نەبوو ئەوەی دەری بڕی هێشتا زۆری تری بەدواوە مابوو.

کەندو دۆڵی (پیری خەل)مان بەجێ هێشت، تا سەرکەوتین زۆر هیلاك بووین و ئەو کەندو هەورازە زۆر تینوی کردین و پەکمان کەتبوو، پێیان گوتبوین پێش بەسەر بکەون ئاوێك هەیە زۆرمان هەوڵداو بەدوایدا گەڕاین نەمان دۆزیەوە لەبەر ئەوەی شارەزا نەبووین، ئەگەرچی زۆریش لە ناو لێڕەواری قەدپاڵی چیا بەدوای ئاوەکەدا گەڕاین و نەمان دۆزیەوەو تینوێتیش شپرەزەتری کردین، بەڵام بەناچاری بەپەلە کەوتینەوە ڕێ و بەرەو گوندی (هاودیان) شۆڕ بوینەوە بۆئەوەی زوو بگەینە ئاو، لەودیویش بەناو کەندو دۆڵەکاندا پێچاوپێچ سەرەو ژێر دابەزینە خوار. ڕۆژی (٨/١٧) گەیشتینە (هاودیان) لەوێ پشوێکی درێژمان کێشاو تا نزیك ڕۆژئاوا لەوێ ماینەوە، لە(هاودیان) چاومان کەوت بە(کەکۆ شێروانی و فرنسۆ هریری) ئەوەی جێگای خۆشحاڵیمان بوو (فرنسۆ) یارمەتیەکی باشی داین بەدابین کردنی خواردنی نیوەڕۆ بۆ لەشکر، ناوبراو ئەوکاتە لەگەڵ چەکدارەکانی (کەکۆ)دا بوو، ئەو ڕۆژەمان لەناو باخچەکانی (هاودیان) بەسەربردو تێر حەساینەوە، ئێوارە بەدرەنگەوە لە(هاودیان) دەرکەوتین و ڕۆیشتینە سەر ڕووبار لە ڕاستی گوندی (دێلزیان) پەڕینەوەو لەوێش بەو شەوە بەرەو ڕوناکایی شارۆچکەی (دیانا) هەنگاومان دەنا، بەناو سەنگەرەکانی سوپادا تێپەڕین، ئەگەرچی پێشمەرگەکان زۆریش بوون، بەڵام زۆر بەڕێکی و بێدەنگی دەڕۆیشتن، شەوێکی زۆر بێ هەست بوو، کاتێك گەیشتینە سەروچاوەی ئاوی (دیانا) بەسەر ئاوی جۆگەلەی پشتی (دیانا)دا تێپەڕین، پێشەنگی لەشکر ئێمە بووین، کە گەیشتینە ناو گۆڕستانی نێوان (دیاناو گوان) لە سەنگەرەکانی دەوروبەری دیانا هەستیان بەشتێك کردو کردیان بەتەقە لەسەرتادا چەند گوللەیەکی ڕوناك کەرەوەیان هاویشتن و ئەو ناوەیان کردە ڕۆژ هەر ئەوەندەمان بۆکرا هەرکەسەی لەشوێنی خۆمان درێژ بووین تا ماوەیەك و دوای ڕۆیشتین، هەستمان دەکرد لەناو گوندی (گوان) خەڵك ئاڵۆز ببون بەو تەقەیەی سوپا کردبووی چونکە خەڵکەکە زانیبویان ئێمە (سپیلك)مان جێ هێشتوە، لە دوایدا زانیان ئێمەین و تێپەڕ دەبین ئەوجا هاتنە پێشوازیمان، کەمێك لەناو گوند ماینەوە تا

لەشکر تەواو تێپەڕی ئەوجا ئێمەش لە گوند دەرکەوتین بەرەو (جندیانو خلکان) ڕۆیشتین. (عزەت) لە کەندە(کەورین) لایدابووە لای سەپانەکان لەوێ پاڵی دابوەوە،منیش ڕۆیشتمە سەر پردی (خلکان) کە بنکەی چەکدارەکانی (وەهاب ئاغا)ی لێ بوو کە ئەوکات بەرگری میللی بوو، بەو نیازەی بەڵکو شتێك پەیدا بکەین بۆ چێشت، پێش ئاسۆی بەیانی زۆربەمان گەیشتینە سەر پردی (خلکان) بێگومان پێشمەرگەکان تەواو هیلاك ببون پێم گوتن: (لێرە بحەسێنەوە تا ئەوانی تریش دەگەنە جێ، من دەچم بەڵکو خواردنێکتان بۆ پەیدا بکەم)، چووم بۆلای (وەهاب ئاغا)و پرسیارم کرد، گوتیان وا لەناو ئەشکەوتی سەرپردێیە، کە چووم بینیم ناوبراو تازە لە خەو هەستاوە،بەچاوی بەخەوەوە گوتی: (ئەوەچی بوو بۆچی ئەوها بەئاسانی سپیلکتان بەجێ هێشت؟) گوتم: (کاك وەهاب سەلامەت بیت، ئێمە لە ژێر زەبری تۆپو هێرشی فڕۆکەکان کشاینەوە، بەلآم سەیر ئەوەیە ئەو هەموو لەشکرەی کە لێرە بوو ئەوان بۆ هەلآتوون هەریەکەی بۆلایەك پەرتو بلآوبوونەوە!؟ دەربارەی سپیلك جێ هێشتن دەتوانی لە عقید کافیو مقدم عزیز بپرسی با ئەوان وەلآمت بدەنەوە). وەهاب ئاغا گوتی: (باسی هەلآتنی لەشکری ئێرە مەکە، هەر ئێوە لە سپیلك بەڕێ کەوتن لێرە کەس بەکەس ڕانەدەگەیشت، هەرکەسەو لە بابی خۆی کەویو زوو بڕوات بەماوەیەکی زۆر کورت ئێرە چۆل کراو ئێمەیان بەجێ هێشت، تەنها من ماوم منیش دووسێ خزمۆکەم لاماون ئەوانیش بەنیازن بکشێنەوە بەرسرین). پێم گوت: (کاکە ئێمە برسین نانمان دەوێ ئەگەر نیە پێویستە بۆمان بکرێت چارنیە ئێمە زۆرین لێرەش دەمێنین تا کاغەزی مقدم عزیزمان بۆ دێت). وەهاب ئاغا گوتی: (زرارە ئەفەندی بدۆزنەوە ئەو بەرپرسی ئازوقەو فڕنیە). خۆم ڕۆیشتم بۆلای فڕنیەکەلەپشتی (بێشوك) لە ناو دۆلآیەکدا بوو، کە گەیشتمە ئەوێ سەیرم کرد دوو سێ پێشمەرگەی لێ بوون ئەویش خەریکی پێچانەوەی کەلو پەلەکانیان بوون بەنیازبوون باربکەنو بڕۆن، هێزەکانی پێشوو لەوێ بوون هیچیان نەمابوون، بەتایبەتی چەکدارەکانی هۆزەکان بەلآم مامۆستا (زرار حاجی) بەرپرسی ئازووقە لەوێ مابوو، لەگەڵ ناوبراو بەیەك گەیشتینو سەیرم کرد مامۆستا ئالۆز نەبوو وەك ئەوانەی لەئەشکەوت دیمانن، لەگەڵ ئەو جوامێرە کەوتمە قسەکردنو داوام لێکرد نانمان بۆ بکەن بۆ پێشمەرگەکان، دیاربوو نانیان زۆر هەبوو ئەویش لەبەر

ئەوە بوو خەڵکێکی زۆر ڕۆیشتبوون‌و ئەوانیش بەنیاز بوون بڕۆن، نانەکە مابووەوە دەیانویست لەگەڵ خۆیان بیبەن بۆ(بەرسرین)، بەڵام مامۆستا زرار ئەو نانەی هەمووودا بەئێمەو دوو گیسکیش لەوێ مابوون ئەوانیشی پێداین‌و منیش ناردە چەند پێشمەرگەیەك هاتن ئەو نانانەی کە هەبوون‌و لەگەڵ دوو گیسکەکە بەرێیە کردنە سەروچاوەی ئاوی (جندیان) بۆ ئەوی لەوێ خواردنی نیوەڕۆمان بۆ ئامادە بکرێت، لەدوایدا لەگەڵ (مامۆستا زرارحاجی) دوو بەدوو کەوتینە دوان‌و باسی ئەو شکەستەمان کردکە چۆن پێشمەرگەکان پەرت‌و بلاوەیان لێکرد، بەتایبەتی باسی ئەو هەلاَت هەلاَتەی (سپیلك‌و ڕواندز)مان کرد کە چۆن ئەو هەموو چەکدارانە بەبێ شەڕ شوێنەکانیان بەجێ هێشت‌و بەرەی ڕووبەڕوویان بۆ دوژمن چۆل کرد بەبێ ئەوەی بزاندرێ بۆچ یان لەبەرچی؟! ئەو گلەییانەمان لە بزاڤی کورد لە دڵسۆزیەوە بوو کەچی دەنگمان کڕ دەکرا لە دوایدا گوتم: (ئەوە غەم نیە کە ئێمە ماندوو هیلاك دەبین‌و زیانمان پێ دەگات، غەمی گەورە ئەوەیە نازانین چیمان بەسەردێت لەبەرئەوەی بناوانی جۆگەکەمان بێ بناغەیە!) مامۆستا ئەمەی سەلماندو گوتی: (بەڕاستی منیش گەیشتومەتە ئەو باوەڕەی کە بەتەواوی هەست دەکەم شۆڕشی ئێمە ڕوو لە چۆلی دایەو دوا ڕۆژیش پەشێویە، لەسەرەتاوە خەلك بەهیوایەك بوو زۆر بەگەرمی بەشداری تێدا دەکرد، بەلاَم ئەوەی دیارە ئەو گەرمیە زۆر ساردبۆتەوە، چونکە بەنیاز نین چارەسەری کەموکورتیەکان بکەن، باش پێیەوە دیارە هەرکەسەی بۆخۆی ڕادەکێشێت ئەوەش مەترسیەکی زۆری بەدواوەیە!).

ئەو یارمەتی‌و هاوکاریەی مامۆستا زۆر جێگای خۆشحالیمان بوو، وە بەلێنیشی دا هەندێ نانی تریشمان بۆ بکەن پێش ئەوەی بڕۆن، لەوێ گەڕامەوە لای پێشمەرگەکان لە سەر پردی(خلکان) سەیرم کرد گشتیان لەسەر پردەکە خەوتوون، منیش یەکە یەکە هەلمستاندن‌و پێم گوتن: (بڕۆنە سەروچاوەی ئاوی جوندیان بەنەهێنی لەبەر حامیە)، چونکە حامیە زۆر نزیك بوو ئەگەر ئێمەیان بدیبا تەقەیان لێ دەکردین.

ڕۆژی (١٨/٨/١٩٦٣) بەدرێژایی ڕۆژ لە سەروچاوەی ئاوی جندیان ماینەوە، بێگومان من کاتێك کە لە(سپیلك) لەگەڵ (عزەت) کەوتمە کێشەو پێم گوت: (بەخۆت سەرپەرشتی پێشمەرگەکان بکە) لە دواییدا سەیرم کرد ئەگەر لە

پێشمەرگەکان دوور بکەومەوە زیانێکی زۆر بەخۆشم دەگات بۆیە بریارم دا کە نابێ لەو ڕۆڵانە دوور بکەومەوە کە هەمیشە گیان لەسەر دەست بوون لەگەڵ من، دوور کەوتنەوە لێیان بێ وەفاییە، هەروەها ئەگەر ئەو هێزە شلۆقی تێ بکەوێ دوژمنان سودی لێ وەردەگرن لەبەر ئەوە پەشیمان بوومەوە چونکە دڵنیا بووم ئەگەر بەتەمای (عزەت)بن زۆر ناخایەنێ پەرتو بڵاو دەبن.

نیوەڕۆی ڕۆژی (٨/١٨) کە لەسەر ئاوی (جندیان) بووین نامەیەکمان لە (مقدم عزیز)ەوە پێ گەیشتو نووسیبووی: (تکایە ئێوە بەپەلە بڕۆنە سەرکوڕەك پێش ئەوەی دوژمن بەسەر بکەوێتە ئەوێ)، بۆ زانین دەبوایە بەپشتی (حامیە)دا تێ بپەڕینو بڕۆینە دۆڵی (ئاکۆیان)و بەشەویش بڕۆین تا لە بەرامبەر(حامیە) دەرباز دەبین، ئێوارە پێش ئەوەی تاریك دابێت خۆمان ئامادەکردو لەگەڵ تاریکیدا (جندیان)مان بەجێهێشت بەبناری (هەندرێن)دا کەوتینە ڕێ بەرەو(دۆڵی ئاکۆیان) شەو لەبەرامبەر (ڕواندز) گەیشتینە هەندێ چەکدار بەرەو (جندیان) دەڕۆیشتن، گوتیان ئەمانە ڕۆژنامە نوسنو داوای تۆ دەکەن، کە چوومە لایان دیار بوو دوو ڕۆژنامە نوسی بیانی بوون، شەو تاریك بوو(سید عزیز شەمزینی)یان لەگەڵدا بوو، ناوبراو منی بەوان ناساندو منیش بەخێرهاتنم لێ کردنو کەمێك لەگەڵ دکتۆر (عزیز شەمزینی) دواین، ئەوەی هەستم کرد ناوبراو لەو وەزعە تەواو بەگلەیی بوو دەیگوت: (بەهیچ ناگەین لەبەرئەوەی مرۆڤی بەتواناو لێ هاتوو ڕێگای نادرێت دەست بەکار بێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشو کارەکان ئەوەش جێی مەترسیە!!) لەوێ ئەوانەمان بەڕێ کردن بەرەو (جندیان) ڕۆیشتنو ئێمەش بەرەو دۆڵ ئاکۆ، شەو درەنگ گەیشتینە نزیك گوندۆکەی (لۆغان)، پێشمەرگەکان ڕۆیشتنە (ئاکۆیان)و منیش دوو پێشمەرگەم لەگەڵ خۆم بردنو چوومە گەلی (گەرەنالی) بۆ دیتنی هاوڕێیان، کە گەیشتینە لایان دیار بوو زۆر شپرەزە بوونو خەریکی گواستنەوەی کەلو پەلەکانیان بوون بەبێ باربەر هەربەشانی خۆیان شتەکەیان دەگواستەوە، بێگومان کارێکی زۆر سەخت بوو لەوێ لەگەڵ (ڕەئیس کمال)و ئەوانی تر قسەم کرد پێم گوتن: (هەرچۆنێك بێت ئەشیایەکان بگەیننە زارگەلی سەران، وا ئێمە دەڕۆینە سەرکۆڕەك هەوڵدەدەم پێشمەرگەکان بەسەر بخەمە کۆڕەكو زوو دەگەڕێمەوەو باربەرتان بۆ پەیدا دەکەم بتان گەیەنێتە دەرگەلەو لەوێ بمێنەوە).

لەوێ ئەوانمان جێ هێشتو شەو درەنگ گەیشتینەوە پێشمەرگەکانمان لەناو گۆڕستانی خوار گوندی ئاکۆیان(مقدم عزیز)یش گەیشتبوە ئەوێ، ناوبراو پەلەی لە ئێمە دەکرد زوو بڕۆینە سەرکوڕەك، بەو تاریکە شەوە کەوتینە ڕێ بەناو گەلی ئاکۆیاندا سەرکەوتین بەرەو گوندی (فەقیان) بەناو چۆمی ئاکۆیاندا، خۆشی لەوە دابوو هاژەو هوشی گەلیو شۆڕە شۆڕی ئاوی ناو گەلی ئەوەندە خۆشو دڵگیر بوو هەر ئارەزووت دەکرد گوێت لێ بێت، ئەو شەوە تاریکە بەناو ئەوچۆمەدا دەڕۆیشتینو کاتێك گەیشتینە ئاشێك لە دەرگای ئاشەکە پیاوێك وەستابوو هاتە بەرامانو گوتی: (شێخ لەتیف دەڵێ با نەچن بۆ کوڕەك، گەرووی بێجانیش گیراوە ئێوە پێ ڕاناگەن خۆڕایە خۆتان ماندوو دەکەن)، پێم گوت: (ئێمە دەڕۆین لەکوێ گەیشتینە دوژمن لەوێ بەگژیدا دەچینو شەڕی لەگەڵدا دەکەین بەشێخ لەتیف بڵێ با خەبەر بداتە مقدم عزیز وا لە ئاکۆیانە با ئاگادار بێت)، ئێمە ڕۆیشتینو لە خوار گوندی فەقیان گەیشتینە (عومەری خدرئاغا) پێش تاریكو ڕۆنی بەیانی بوو دەڕۆیشتە ئاکۆیان بۆ دیدەنی (مقدم عزیز) لەو بەیەك گەیشتنە لەگەڵ عمرئاغا ئەو دەیزانی ئێمە دەڕۆینە کوڕەك هەر زوو گوتی: (ئێوە بگەڕێنەوە، دەوروبەری کۆڕەك لە دەستی ئێمەدایە، وا ئێمە لەوێینو پێویست بەئێوە ناکات)، منیش گوتم: (کەوا بێت وا ئێستا تۆ دەڕۆیتە لای مقدم عزیز پێی بڵێ ئەوان ڕۆیشتنە فەقیان لەوێ چاوەڕوانی خەبەر دەکەن کە بڕۆن بۆ کۆڕەك یان نا؟ عزەتیش وا لە دواوە دێت لە ڕێگادا دەیبینی، لەگەڵ ئەویش قسە بکەو بزانە چی دەڵێت؟) ناوبراو ڕۆیشتە خوار بۆ ئاکۆیان ئێمەش سەرکەوتین بۆ فەقیان لەوێ چاوەڕانی خەبەر بووین، میوانی (حاجی حسێن ئاغا) بووین کە دەکاتە خاڵی من، میوانداریەکی بەپەلەی بۆ کردینو بزنێکی سەربڕیو نانی ئەو چل پێشمەرگەیەیان ئامادە کرد، بێگومان لە فەقیان پێشمەرگەکان پەرتو بڵاوی ناو باخچەکان ببوونو لەژێر سێبەری دارەکان پشوێکی باشیان دابوو، زۆری پێ نەچوو نامەی مقدم عزیز گەیشت، نووسی بووی ئێوە بگەڕێنەوە دەرگەڵە وادیارە هێزی عومەرئاغا لەوێ ماوەتەوە، ئێمە لەوێ ماینەوە تا دوای نیوەڕۆ، لەوماوەیەدا(منو عزەتو خدر) لە تەنیشت خانوو گوێزێکی گەورە هەبوو لە ژێری نوستین تا خواردن ئامادەکرا بوو، هەرلەو ڕۆژە چاوم کەوت بە(حسێن خەباز) ئەویش لە سپیلك گەڕابوەوە لە ماڵی باوکی بوو، لە کاتی قسەکردنمان

ناوبراو گوتی: (هەندێ شتم هەیە پێت دەڵێم با جارێ وابێت بۆکاتێکی هەڵ کەوتوو). لە پێش نان خواردن لەگەڵ عزەت چووین چاومان بە(عولا بەگ)و منداڵەکانی کەوت‌و چەند دەقیقەیەك لایان ماینەوە. دوای نیوەڕۆ لە(فەقیان) دەرکەوتین بەشی زۆری پێشمەرگەکان بەسەرکەوتبونە سەرگەروی (بن مێردێ) ئێمەش لە خوار گەروەکە بەسەردەکەوتین هەر ئەوەندەمان زانی دوو فڕۆکەی (مێك) گەیشتنە سەر (فەقیان)و یەکسەر گوندەکەیان دایە بەر صارۆخ‌و لەو خانوەیان دا کە ئێمەی لێ بووین کەهی ماڵی خالم بوو ئاگریان تێ بەردا، لەگەڵ هێرشی فڕۆکەکان لەگوند بوو بەهات‌و هاوارو خانوەکەش ئاگری تێبەربوو ویستمان بگەڕێینەوەو یارمەتیان بدەین بۆ کوژاندنەوەی ئاگر، بەلام لە گوند بانگیان کردین‌و گوتیان پێویست ناکات مەگەڕێنەوە خۆمان دەتوانین ئاگرەکە بکوژێنینەوە، هەرئەوکاتەش لە (خلیفان) دەست کرا بەتۆپ باران کردنی دەروبەری (فەقیان‌و بن مێرد) بەتۆپی دوور هاوێژو قورس، بۆ ماوەیەکی تەواو کەس نەیدەتوانی لە شوێنی خۆی بجولێتەوەو تەنها گوێ بیستی دەنگی گریان دەبووین وادیار بوو فڕۆکەکان زیانیان بەخەڵك گەیاندبوو، دوایی زاندرا کچێکی پانزدە ساڵی کوژراوە کە خوشکی (عبدالواحید) بوو لەڕواندز ڕایان کردبوو ئەو ڕۆژە گەیشتبونە (فەقیان)، هەروەها زانیمان ئەو ڕایەخانەی ئێمەی لەسەر نوستبوین لەژێر دارگوێزەکەی تەنیشتی خانوو هەمووی بەشێستیر لەت لەت کردبوو، ئەوەی شایانی باسە فڕۆکەکان ئەوەندە بێ ویژدان لە گوندی (فەقیان) یان دا کە کەس بەهیچ ڕانەگەیشت!

لەدوای ڕۆیشتنی فڕۆکەکان‌و وەستانی تۆپ بارانەکە ئێمە ئاودیوی بن مێردە بووین‌و کە بینیمان خەڵکی (بن مێرد)یش لە ترسی فڕۆکەکان هەموویان لە گوند دەرچووبوون‌و لەناو ڕەزەکان بلاو ببوون، لەکاتی تێپەڕ بوونمان هەندێك لە پیاوانی گوند هاتنە بەرایمان بۆ ئەوەی لابدەینە لایان، بەلام ئێمە بەپەلە بووین بەرێزەوە بەجێمان هێشتن، لەگەڵ تاریکیدا گەیشتینە (زارگەلی سەران) ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو ئەوبوو کە خەڵکێکی ئەوەندە زۆر لە دواوەی (گەرەوان) کۆببووە جێگا نەبوو لەبەر ئەو هێزانەی لە (سپیلك) گەڕابونەوە، تەواوی بنکەکانی (دۆڵی ئاکۆیان)یش کەل‌و پەلەکانیان گواستبووە ئەوێ، هەریەکەی لە شوێنێك کەوتبون بەکەل‌و پەلەکانیانەوە نەیان دەتوانی لەوێ بەولاوە بڕۆن، لەبەرئەوەی خاوەن

بارپەرەکانی گوندەکان بەپارەش باریەریان پیّ نەدەدان وایان دەزانی لەگەڵ کشانەوەی پێشمەرگە لە (سپیلك‌و بەنی هریر) دەسەلاّتی پێشمەرگە نەما! ئەوەی ڕاستی بێت کاتیّ ئەمەم بیست دەمار توندی گرتمی، بەتایبەتی کە دیتم ناو ئەو گەلّیە پڕە لە ڕاکردوەکان‌و هەمووشیان دەست لە ئەژنۆ وەستاون‌و بەشەویش ڕێگا چۆل نەدەبوو. چونکە دەڕۆیشتن بۆ(سەران) ئەو دیمەنانە هانیدام بەو شەوە کۆمەلّێك پێشمەرگەی خۆم بردن‌و ڕۆیشتمە گوندی (سەران) بەبیّ پرسی لێپرسراوان، بەو شەوە تاریکەو بەو گەلیە تەنگ‌و وشکەی (سەران)دا سەرکەوتین لە کۆتایی گەلی لە سەر کانیاوەکەی (کانی کەوان) چاوم بە(مام صدیق عەولاّ ئاغا) کەوت ناوبراو یەکێك بوو لە بەرپرسانی شیوعی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی لەلای هەندیّ کەل‌و پەل دانیشتبوون، ماوەیەکی کورت لەلایان دانیشتین‌و بە(مام صدیق)م گوت: (لێرە مەڕۆن لە دوای ماوەیەکی تر ولاّختان بۆ دەنێرم بارەکانتان بار بکەن‌و بڕۆنە گەلی دەرگەلّە)، لە(کانی کەوان) بەڕیّ کەوتین بەرەو (سەران) پێش ببێتە ڕۆژ گەیشتینە ناو گۆڕستانی خوار گوند لەویّ پێشمەرگەکانم دابەشی ئەو ڕێگایانە کردن کەلە گوند دەردەچوون بۆ ئەوەی هەر وەلاّخێك دەربچێت بیگرن‌و بیگێڕنەوە خاوەنەکەشی بێنن بۆ مزگەوت، خۆشم لەگەڵ کۆمەلێك لە پێشمەرگەکان لە ناو گوند لە مزگەوت دابەزین، ناردم بەدوای موختار گوتیان ناوی (کریم)ە زۆری پیّ نەچوو ناوبراو هات‌و پێم گوت: (خەلّکی گوند ئەوانەی خاوەن باریەرن ئاگادار بکەن کە کەس لە گوند دەرنەکەوێت‌و بێنە مزگەوت) دوایی ڕۆیشتمە مالّی (مەلا شێخ ئەحمەد) ناوبراویش پێش شکانی (سپیلك) یەکێك بوو لە فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگەی (دۆلّی ئاکۆیان) داوام لێکرد بەلّکو هەندیّ باریەرمان بۆ پەیدا بکات بۆ ئەوەی بیانێرین کەل‌و پەلی بنکەکان لە دواوەی (گەرەوان) بگوازینەوە بۆ گەلی (دەرگەلّە) ناوبراو زۆر بەنابەدلّی گوتی (کەس بەقسەی من ناچێت‌و ناتوانم بەکەس بلّێم !) ئەو کاتە پێم گوت: (ئێوە ناتوانن پێیان بلّێن ئێمە دەتوانین باریەر پەیدا بکەین، ئەوەی لە دەستی پێشمەرگەش هەلّبێت دەزانین حەقی چیە)! گوندی (سەران) هەرچی تێدا نەبێت سەد باریەری تێدایە من دەزانم چۆن دەیان نێرم ئەوەی بلّێت ناچم بزانە چۆن دەچێت، ڕۆیشتمەوە مزگەوت دیاربوو خەلّك کۆببونەوەو کەوتمە قسە لەگەلّیان‌و پێم ڕاگەیاندن ئەوەی خاوەن باریەرە بەبیّ لاملی بڕوات بارێك

بهێنیێو بگەڕێتەوە، ئەوەی بێ کێشە بڕوات با بارەکەی لە (دەرگەڵە) بێخێتو بگەڕێتەوە، ئەوەی لامیلیش بکات دەبێ بار باربکاتو بچێتە (گەلاڵەو زینەبێش) ئینجا بەکەیفی خۆتان بن، ئەوەی بارەریش بشارێتەوە ئەوا باربەرەکەی دەکەوێتە ژێر دەستی پێشمەرگەو تا بەئارەزوی خۆمان نەیدەینەوە هەر لامان دەمێنێ، دیاربوو هەندێکیان بەنیاز بون بلێن ناچین، بەلاّم بەتوندی پێم گۆتن: (کەیفی خۆتانە لە دواییدا مەڵێن زرار غەدری لێکردین، نامەوێ کەس لە دەستی من ئەزیەت بخوات بۆیە هیوادارین ناچارمان نەکەن بەشێوەیەکی تر لەگەڵتان بجوڵێینەوە).

خەڵکەکە، کە بینیان بەم توندیە لەگەڵیان دوام زانیان چارەیان نەما زۆری پێ نەچوو هەرکەسەی باربەری خۆی بردو چوون بۆ بارکردنی بارەکان، بەو شێوەیە دەست کرا بەگواستنەوەی کەلوپەلی بنکەکان لەگەڵی (سەرانە)وە بۆ (دەرگەڵەوگەلاڵە)و شوێنە دیارکراوەکان، کاتێك بینیمان چەند کەسێکیان هێنان هێستریان شاردبۆوە، لەوانەی کە هێنابونیان کوڕی (شێخ مەلا ئەحمەد)ی فەرماندەشیان لەگەڵدا بوو!! بەبێ دواکەوتن بەڕێمان کردن بۆ بارکردنی بنکەی (مراد ئاغای بیری) بۆ (زینە بێشە). بێگومان ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لەوێ ماینەوە تا گشت کەلوپەلی بنکەکان گوازرانەوە بۆ ئەودیوی (دەرگەڵە)، ئێوارەی ئەو ڕۆژە لە سەر کانیاوی (کانی کۆڵان)چاوم کەوت بە(ملازم جمال) بەرپرسی ئازوقەی پێشمەرگە ناوبراو گوتی: (ئازیز تۆ نەبای بارێك بەپارەش بار نەدەکراو یەك باریش نەدەگوازرایەوە، چونکە وەلاّخیان پێ نەدەداین، وایان دەزانی پێشمەرگە تازە نامێنێ، بەلاّم دەستو بردی ئێوە بەڕاستی کارێکی بەجێ بوو کە ئەنجام درا)، ئەوەی دیار بوو (مقدم عزیز) تەواو پەڕو باڵی شکا بوون نەمدەزانی ئەو پیاوە چالاکە بۆچی دەستی ئەوها شل کردوە، ئەو هۆیەمان هەر نەزانی!.

## چالاکیەکانی ئێمە لەدوای گەڕانەوەمان لە سپیلك

کەلەسپیلك گەڕاینەوە دیاربوو بنکەی شیوعیەکان لە(لۆغان) بوو، گواسترابوەوە ناو گەلی سەروی (دەرگەڵە) لە شوێنی ئاشی (قادری وەسمان) لە ژێر گوێزە گەورەکان دانرابوو، ئەو ڕۆژەی کە گەڕامەوە ڕۆژی دوایی بۆ بەیانی ڕۆیشتمە لایانو

لەگەڵیان دوام لە دواییدا داوام لە ئەفسەرە عەرەبەکانو(مامۆستا جاسم) کرد بۆ نانی ئێوارە بێنە ماڵی ئێمە، ئێوارە کە هاتن دیاربوو (ڕەئیس سەعید سلمان)ی لەگەڵ نەبوو وابەدیار دەکەوت کە دڵی ڕەنجابێت بۆیە نەهاتبوو، ناردم بەدوایدا هەر نەهات.

شیوعیەکان لە(دەرگەڵە)مانەوەو لە دوای چەند ڕۆژێك پشودانو حەسانەوە، کۆمەڵێك چەکداری ئەوانیشمان لەگەڵ خۆمان بردنو ڕۆیشتینە(دۆڵە منجەل) وەك لە سەرەوە باس کراوە پێش کشانەوەمان لە سپیلك دۆڵەمنجەل هێزێکی زۆری چەکداری تێدا کۆکرابوەوە، بەلاّم لەگەڵ کشانەوەی هێزەکانی پێشمەرگە لە سپیلك و بەنی هەریر ئەوانیش بلاّوەیان لێکرد بوو، هەندێك لە چەکدارەکانی بنکەی (وەهاب ئاغا)ش کشانبونەوە (بەرسیرین)و ئەو ناوە چۆل کرابوو، ئێمە لە سەرەتاوە ڕۆیشتینە گوندی(ماویلیان) ئەو شیوعیانەی لەگەڵ خۆمان بردبوون بۆ ئەوەمان بوو بەڵکو ناویان بخرێتە لیستی پێشمەرگە بۆ ئازوقە. چەند ڕۆژێك لە(دۆڵە منجەل) لە گوندی (ماویلیان)و دەوروبەری ئەو گوندە بەشێوەی پارتیزانی هەر شەوێك لە شوێنێك دەبوین بەڕۆژیش دەهاتینەوە سەرکانیاوەکەی (کانی گوێزێ) لە تەنیشت مزگەوتی گوند، بەیانیەك لەگەڵ (خدری عولا بەگ)ی و چەند پێشمەرگەیەکی تر بەدرەنگەوە لە دەوریە گەڕاینەوە سەرکانیاوەکە دیار بوو یەکێکی نەناسراو دانیشتبوو کە لێم پرسی لە کوێ وە هاتووی؟ پیاوەکە گوتی: (جاشمو پەتکم پساندوەو هاتومە لای ئێوە) بێگومان بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمان لێکردو ڕێزمان گرت، دوایی بەڕێمان کرد بۆ (دەرگەڵە)، لە دوای ماوەیەك بنکەمان بردە گوندی (میراجیان) لەوێ شەوان دەڕۆیشتینە پێشەوە نزیك ئاوی جندیانو بێشوك ڕووبەڕووی سەربازگەی ڕواندز نۆبەتمان دەگرتو بەڕۆژیش دەکشاینەوە ناو چۆمی (دەنگارە)و باخچەکانی (جنێراوە)، لەوێ ماینەوەو جێگیر بووین، بەم شێوەیە بەبەردەوامی شەوان دەردەچووین بۆ بناری (هەندرێن)و نزیك دەکەوتینەوە لە سەربازگەی (ڕواندز) شەوان چاودێری هێزەکانی حکومەتمان دەکرد نەوەك لە ناکاو بێن لێمان بدەن.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ڕۆژێك نزیك کاتژمێر دەی بەیانی بوو لە ژێر دارەکانی گۆرستانی گوندی (جنێراوە) دانیشتبوین دیاربوو کە مەلایەكو دوو کەسی تر لە

میراجیان بەرەو لای ئێمەوە دەهاتن کە نزیك کەوتنەوە زانیمان مەلای زێوە (مەلا محمدو حسێن گولاَن) دانیشتوی بەرزێوە بوون لەگەڵ (حیدەرە ڕەش)ی دانیشتوی میراجیان کە سەپانی سلێمان بەگی باوکم بوو، هاتن دانیشتن، بەخێرهاتنێکی گەرمان لێکردن لە دواییدا مەلا کەوتە قسەکردنو گوتی: (ئێمە بۆ داواکاریەك هاتووین ئەویش ئەوەیە کە ئێوە ئەو ناوە بەجێ بهێڵنو بگەڕێنەوە گەرووی زینی دەرگەڵە لەبەر ئەوەی نەوەك حکومەت هێرش بێنیَو ئەو گوندانە تێك بداتو بیان سوتێنێ، ئینجا بۆئەوەی گوندەکان تێك نەدرێنو نەسوتێندرێن دۆلە منجەل جێ بهێڵن لەبەرئەوەی پێتان ناپارێزرێت بۆیە باشتر وایە بکشێنەوە زینی دەرگەڵە). ئەوەی ڕاستی بێت زۆر پەست بوومو پێم گوت: (ئەو داوایەی ئێوە زۆر بەناپەسندو بەشەرمەزاری دەزانم لەجیاتی ئەوەی ئێوە یارمەتیمان بدەنو لە خواردن پەکمان نەخەنو پێویستیەکانمان بۆ دابین بکەن دەتانەوێت لە سەر زەوی خۆشمان دەرمان بکەن ! ئەوە بەڕاستتانە؟! نەخێر ئێوە بەخێر بێنو بەخێر بچن ئێمە ئێرە بەجێ ناهێڵین ئەگەر هەمووشمان بکوژرێین، گوندەکانیش وێران دەکرێن گـــونـدی خـۆمــانــن زیان بەسلێمان بەگی باوکم دەگات نەك بەئێوە، گوندەکانی باوکم دەسوتێنرێن نەوەك هی ئێوە)، کە بینیان بەتوندی لەگەڵیان دوام زیاتر لە سەری نەڕۆیشتنو هەڵسانوگەڕانەوە.

### هاتنی شیوعیەکان بۆ دەرگەڵە:

نیشتەجێ بوونی شوعیەکان لە(دەرگەڵە) کارێکی بەجێ بوو لە دوو ڕوەوە، یەکەمیان (لە دەرگەڵە بەئازادیو ئارەزوی خۆیان دەجولاَنەوە بۆ هەرشوێنێك بچوبان وەك پێشان لە ئاکۆیان ڕێگایان لێ نەدەگیرا) دووەمیان (بەو هاوکاریەی لەگەڵ هێزی سلێمان بەگ بۆ لێدانی دوژمن توانیان جێگای خۆیان بکەنەوەو ببن بەهێزێکی چالاكو دەست وەشێنی ناوداری بزاڤی شۆڕشی ئەیلول). ئەوەی ڕاستی بێت ئێمە زۆر ئەزیەتمان چێشت زیاتر لەمانگێك بەئالۆزیو نارێکی لە(دۆلە منجەل) ڕامان بوارد، هەر شەوێك دەبوایە لەشوێنێك بین، ئەو ناوە لە دوای سپیلك چۆل کرابوو هەر ئێمەی لێ بووین، هەموو کاتێك چاوەڕوان دەکرا حکومەت هێرش بێنێت، ئەگەرچی لە ڕووی خۆراکەوە زۆر پەرێشان بووین، بەلاَم نۆبەتداری وورە بەرز بووین، بەدیار

کەوت تازە ئەویّ بەجیّ نایەڵین‌و پارێزەرین‌و لەوناوە جێگیر بووین وەك هێزێکی بەرگری پتەو، ئەوکاتە هێزی چەکداری (باڵەك) بەسەرپەرشتی (عەبابکری کریم)و هەندیّ لە چەکدارەکانی (وەهاب ئاغا)ش گەڕانەوە گوندی (زێوە) لەوبەری ڕووبارو ڕێگای گشتی، بەلاّم ئەوەندەی بلێی لە بارەی خواردن‌و وەزعمان خراپ بوو. ماوەیەکی زۆر لەسەر شانی خەڵکەکە دەژیاین بەشێوەیەکی نالەبار، بەلاّم دوایی نانەکە دابینکرا کەبۆمان بێت، ڕۆژانە لەسەر ئاوی(دەنگارە) کۆدەبوینەوەو بەشەویش دەرۆیشتینە پێشەوە بۆ ئەو شوێنانەی مەترسیمان لیّ دەکرد نەوەك سوپاو جاش هێرش بێنن بۆمان، لەوکاتانەدا بوو ڕوداوێکی زۆر ناخۆش ڕویدا، ڕۆژێك پیاوێکی ناتەواو بابڵێین شێت خەڵکی باپشتیان دەکەوێتە بۆسەی پێشمەرگەکانی ئێمە لەوکاتەی دەیهێننەوە مقدم عزیز لەبنکەی ئاوی دەنگارە بووە، مقدم عزیز لەگەڵی کەوتبوە دوان پیاوە ناتەواوەکە بەئارەزووی خۆی وەلاّمی پرسیارەکانی مقدم عزیزی دابوەوە، بێگومان مرۆڤی ناتەواو گویّ بەوە نادات قسەکانی بەچی دەگات دیارە لە وەلاّمی ئەو پیاوە شێتە مقدم عزیز تورە دەبیّ فەرمان دەدات بەکوشتنی ئەو پیاوە بیّ تاوانە فەرمانەکەش یەکسەر جیّ بەجیّ دەکرێت، ئەوەی ڕاستی بێت کوشتنی ئەو پیاوە بیّ تاوانە کارێکی زۆر نالەبارو بیّ جیّ بوو لەبەر ئەوەی مرۆڤی شێت کوشتنی لەسەر نیە، ئەوەی بەدیارکەوت ئەو پیاوە شێتێکی تەواو بوو کوشتنی لەسەر نەبوو.

ئێمە بووینە هێزێکی پتەوی بەتوانای ڕووبەڕووی دوژمن لە سەخترین شوێن لەسەر ڕێگای حاجی ئۆمەران، لەسەرەتای پایزی (۱۹٦۳)دا دەستکرا بەچالاکیەکان هاوکار لەگەڵ هێزەکانی ئەوبەری ڕووبار چەکدارەکانی (عەبابەکری کریم و وەهاب ئاغا) یەکێك لەو چالاکیانە ئەوەبوو توانیمان چەند مێگەلە مەڕێکی جاشەکان لە دەوروبەری (ئیس قەلاّ)ی پاشای گەورەو گەروی(سۆرە پەلۆکیّ) ڕاپێچ بکەن‌و بەرەو سەرەوە بەڕیّ بکرێت بۆ(گەلاّڵە)، هەروەها ناوەناوەش دەست لەسەنگەرەکانی پێشەوەی سەنگەرەکانی دەوروبەری ڕواندز دەوەشێندرا، شەوێك لەپۆلیسەکانی کاولۆك درا دوو پۆلیس بەدیل گیران ئەوانی تریش ڕایان کردە حامیە، هەربەو شێوەیە لەنزیك(ئیس قەلاّ) لە سەنگەرێکی جاشەکانی (زراری) مانداو سەنگەرەکەمان تێکداو جاشەکانیش هەلاّتن‌و دەربازبون، لە سەرەتای زستانی ئەو

ساڵەدا شەوێك لەڕواندز دراو دائیرەی بەرید گیراو،ماڵی قائمقام کەوتە بەرهێرش لە ئەنجامی ئەو هێرشەدا (قاسم) شەهیدکراو (حسێن خەباز)یش بریندار بوو. لە سەرەتای (١٩٦٣) دا(حمدئاغا)ی مێرگەسۆری لە خۆشناوەتی گەڕابوەوە بۆ باڵەکایەتی، لە کاتێکدا گەیشتە (دەرگەڵە) پێشوازیەکی گەرمیان لێکرا بەتایبەتی لەلایەن ئێمەوەو چووینە(بن کارۆخ) بۆ پێشوازیان، بێگومان لە شکری (حمدئاغا) بەشێکی شیوعیەکان بوون لەگەڵی هاتبون، کە گەیشتنە دەرگەڵە ئەواتیش لەگەڵ بنکەی شیوعیەکانی دەرگەڵە یەکتریان گرتەوەو لەگەڵ ئەواندا جێگیر بون، (حمدئاغا) چەند ڕۆژێك لەلای (سلێمان بەگ)مایەوە، لە دواییدا بەنیازی (سەری بەردی) بەرێ کەوت لەوکاتەشدا بوو جاشەکان هێرشیان کردە (ناوڕۆین‌و سەری حسن بەگ)و بەسەرکەوتنە (گۆشینە)و لەوێ مانەوە، بێگومان بڕیارێك دەرچوو بۆ ئەوەی هێزەکان بەرێ بکرێن بۆ لێدانیان، لە کاتێکا(حمد ئاغا) دەگاتە گوندی(سمیلان)ی خوار (ڕوستێ) فرۆکەکانی دوژمن لە گوندی ناوبراو دەدەن‌و (محیەدین مێرگەسۆری) بریندار دەبێ، بەپێی بڕیاری فەرماندە (عقید کافی) فاخیری حمدئاغا هەندێك چەکداری شیوعی ئامادەکردن بۆ ئەوەی بڕۆنە (ڕوست)بۆ ڕووبەڕووبونەوەی جاشەکان کە بەسەرکەوتبونە(گۆشینەو حەسەن بەگ) لەبەر ئەوەی نەشارەزا بوون داوایان کرد من لەگەڵیان بڕۆم، دیار بوو ڕەئیس کماڵ‌و فاخیریش ئامادەبون بەشداری ئەو گەشتە بکەن، ڕازی بووم لەگەڵیان بڕۆم لەبەر ئەوەی پێشمەرگەکان نوێ بوون‌و خەڵکیش نەیدەناسین، ئەو ڕۆژەی لە دەرگەڵە دەرکەوتین بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە گوندی (ئۆمەراوە) خەڵکی گوندەکە بەتێکرایی پێشوازیەکی گەرمیان لێکردین، لەوێ ئەوانم بەخەڵکی گوند ناساند، دوای نیوەڕۆ لە (ئۆمەراوە) دەرکەوتین بەناو (گەلاڵە)دا سەرکەوتینە کوێستانی (مەزرێ) ئەوکاتە بەشی زۆر خەڵکی(گەلاڵە) لە کوێستانی ناوبراو بوون، لەوکاتەی ئێمە گەیشتینە ئەوێ ئەگەرچی (گەلاڵیەکان)بەشێوەیەکی گشتی شیوعیان خۆش نەدەویست ئەوجاش پێشوازیەکی زۆر گەرمیان لێکردین لەگەڵ ڕێزێکی زۆرو میوانداریەکی (باڵەکایەتی)، بێگومان میوانداریەتی باڵەکایەتی دەنگی داوەتەوە لەکوردستان ناوبانگی بەربلاوە، زۆر بەڕێکی چەکدارەکان دابەشی سەر ماڵەکان کران، (فاخیرو ڕەئیس کماڵ‌و منیر) لەماڵی(حمەد ڕەشی) برا گەورەی عولا (خالۆ) داندران، لەدوای

دابەش کردنی چەکدارەکانو خۆشم ڕۆیشتمە ماڵی زاوای خاڵۆ(ماڵی خوشکی) بۆ نان خواردن، ئەوەی جێگای دڵخۆشیم بوو براو برازایەکانی خاڵۆ، زیاد لە پێویست خزمەتیان کردین بەتایبەتی (عوسمان)ی برای تا ڕۆژی دوایش بەئێمەوە ماندوو بوو. جێگای ڕەزامەندی ئەوە بوو بەیانی کەڕۆیشتین هەموو پێشمەرگەکان نانی ڕێگاشیان بۆ ڕاپێچرابوو لەگەڵ خۆیان بیبەن یەگشتی پێشمەرگەکان تابلێی لەم میوانداریە ڕازی بوون بەتایبەتی لەو ڕێزەی کە لێیان نابوون. بەیانی بەو کوێستانە خۆشەدا ڕۆیشتین بەرەو گوندی (ڕوستێ) کە گەیشتینە ئەوێ بەشی زۆری ئەو خەڵکە داڕژابونە ناو چۆمی خوار گوند لە ترسی بۆردومانی فڕۆکەکان، کەمێك لەوێ ماینەوە دوایی ڕۆیشتینە(سمیلان) لەوێ پێیان گوتین (حمدئاغا) چۆتە (مامە خەتیبیان) ئێمەش ڕۆیشتینە ئەوێو چاومان بە(حمدئاغا) کەوت ناوبراو سەربردەکەی بۆ گێڕاینەوە کە چۆن فڕۆکە لێی داون لە (سمیلان) ماوەیەکی تەواو لەگەڵی دانیشتین دوایی (منو فاخیر) ڕۆیشتینە لای (محیەدین) دیار بوو هیلاك بوو، هەوڵدرا زوو بەڕێ بکرێتەوە (دەرگەڵە) لەبەر ئەوەی دکتۆر لەوێ هەبوو، ئەوە بوو ڕۆژی دوایی بەڕێ کرا بۆ دەرگەڵەو ئێمەش ڕۆیشتینە گوندی (بێشە) لەگەڵ (حمدئاغا) لەپێشەوە دەرۆیشتین پێش ئەوەی بگەینە (بێشێ) ئاگادار کراین کەوا جاش لەناو گوندن، زۆر بەووریایەوە چوینە ناو گوند دیار بوو جاشەکان ڕۆیشتبوون، دوو ڕۆژیش لەوێ ماینەوە لەدواییدا لەگەڵ (عقید کافی)دا گەڕامەوەو ناوبراوەمان گەیاندەوە(گەلاڵە) و ئێمەش گەڕاینەوە بنکەکەمان لە(میراجیان).

ئەو شیوعیانەی لەگەڵ (حمدئاغا) لە خۆشناوەتی هاتبون بۆ (دەرگەڵە) هەندێکیان لە(زینە بێش) مانەوە لەگەڵ (فاخیر) دەستەیەکیش لەوان هاتنە(میراجیان) بۆ لای ئێمە، ئەوانەی لە(زینە بێش) بوون لەگەڵ جاشەکان ڕووبەڕووی لێك دانێك ببون لە ئەنجامی شەڕێکی دژواردا لە(ناوڕۆین) نجم الدین مامۆ کە کادیرێکی حزبی شیوعی بوو بریندار ببوو یەکێکیش شەهید بوو، لە دوای ماوەیەك هەرئەوان لەسەنگەرەکانی سەری (حەسەن بەگ)یان داو سەنگەرەکەیان تێکداو کۆمەڵێك جاش کوژران، زیانی پێشمەرگەش بریندار بونی (ملازم عبدالرحمان) بوو کە چەندین گوللەی پێکەوتبوو، بەلام خۆشبەختانە لە مردن ڕزگاری بوو، ئەو زەبروزەنگو لێکدانو بەگژیەکدا چوونەی نێوان کوردو

حکومەت بەشێوەیەکی گشتی لە بارزان‌و لای ئێمە جەرەیانی هەبوو، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە سەرۆك هۆزەکانی ژێر فەرمانی ڕژێم دژی بارزانیەکان بوون‌و چەکی خۆفرۆشیان هەلگرتبوو بەگشتی بەپشتیوانی سوپا ڕوویان کردبووە بارزان، ئەوەی بۆیان کراو لەدەستیان هات کردیان، لە ئەنجامی ئەو شەڕە دژوارانەی لە بارزان کران بەئاسن و ئاگر لێیاندرا (مەلامستەفا) ناچار بوو لە (بارزان) بکشێتەوە بەرەو باڵەکایەتی بێت، تا (مەلامستەفا) لەوێوە گەیشتە باڵەکایەتی (عبدالسلام) بەعسیەکانی لادان‌و دەسەلاتی گرتە دەست لە دوای ماوەیەك داوای ووتوێژیان کرد لەگەڵ (مەلامستەفا)، ئەوکاتەی (مەلامستەفا) گەیشتە(باڵەکایەتی) حکومەت دەستی کرد بەناردنی نوێنەر بۆ شەڕ ڕاگرتن، ئەوکاتە زۆر بەتوندی لە بەرەکانی ڕواندز دەست لە هێزەکانی حکومەت دەوەشێندرا. لە سەرەتاوە لە ڕێگای ڕواندزەوە یەکێك بەناوی (ئەسکەندەر) بەڕێ کرا هاتەلای ئێمەو بەڕێمان کرد بۆلای فەرماندەکانی باڵەکایەتی‌و بەرپرسەکان.

بەشی یازدەهەم

# دەست پێ کردنەوەی وتووێژ
# لە کۆتایی (١٩٦٣) و سەرەتای (١٩٦٤)

لەکۆتایی ساڵی (١٩٦٣)و سەرەتای (١٩٦٤) لەوکاتەی مەلامستەفا لەناوچەی بارزان تازە گەیشتبوە ناوچەی (باڵەك) حکومەتە نوێیەکەی (تاهیر یەحیا) چەند نوێنەرێکی بەرێ کرد بۆ رێ ڕوون کردنەوەی شێوەی وتووێژ، لەسەرەتاوە لە ڕێگای ڕواندزەوە یەکێك بەرێ کرا بۆ دیدەنی بارزانی بەناوی ئەسکەندەر، ئەومان بەرێ کرد، گەلاڵە، دوابەدوای ئەسکەندەر(نوروزی) برازای مەلامستەفا بەرێ کرا ئەویش ڕۆیشتە باڵەکایەتی بۆ دیدەنی مەلامستەفای مامی، ڕاسپێردراوی حکومەت بوو، ئەوەی بەدی دەکرا حکومەتی (عبدالسلام عارف) زۆر بەپەلە بوو شەڕ بوەستێ بۆ ئەوەی بتوانن بەعسیەکان لە دەسەڵات دوور بخەنەوە، کودەتای بەعسیەکان لە دژی (عبدالکریم قاسم) بەسەرپەرشتی (عبدالسلام) ئەنجام دراو کودەتایە نوێیەکەش هەر ناوبراو سەرپەرشتی کردو یەکسەر داوای وتووێژی لەگەڵ کورد دا کردو گوتی دەبێ ئەنجامی هەبێت.

پێش ئەوەی مەلامستەفا بڕواتە ناوچەی ڕانیە (عزیز محمد) سکرتێری حزبی شیوعی عێراق گەیشتە دەرگەڵە، ئێوارە زۆر درەنگ هاتە ماڵی ئێمە پێش ئەوەی بڕواتە بنکەی حزب، دیار بوو زۆر ماندو بوو لە بادینان بەپێیان هاتبوو، لە دوای کەمێك حەسانەوەی ئاگاداری بنکەی حزبمان کرد کەوا هاوڕێ عزیز لەلای ئێمەیە، زۆری نەخایاند ڕەئیس کماڵو مامۆستا جاسمو ئەوانی تریش هاتن بۆ لای هاوڕێ عزیز، وادیار بوو هەرێمی گەلاڵە بەیانێکیان ئامادە کردبوو دەربارەی هاوڕێ (حسێن حمدئاغای مێرگەسۆری) لە شەڕە دژوارەکەی دەوروبەری بارزان شەهید کرابوو، کاتێك هاوڕێ عزیز چاوی بەنوسینەکە کەوتو خوێندیەوە زۆر بەتوڕەیی گوتی: (کێ

پێی گوتون ئەو نوسینە بنوسن؟) نوسینەکەی دڕاندو فڕێیدا، ئەوەی ڕاستی بێت ئەو هەڵوێستەی سکرتێری حزبی شیوعیم پێ ڕاست نەبوو کە بەم شێوەیە بێت لە پێش ئێمە.

بۆ بەیانی ئەفسەرە پایەبەرزەکان، سلیم فەخریو عقید کافی گەیشتنە دەرگەڵە، ئەوان ڕایانگەیاند کەوا بارزانی لەڕێگادایە دێت بەرەو ناوچەی ڕانیە دەڕوات، بەیانی بۆ ئێوارە دەگاتە گوندی (ناوکێلەکان) هاوڕێ عزیز داوای لێ کردم بڕۆمە پێشوازیو بەخێرهاتنی، لەبەر ئەوەی پێش ئەوەی لەسۆڤیەت بگەڕێتەوە ساردیەك هەبوو، دیار بوو مەلامستەفا لەمن زویر ببوو. لەسەرداوای هاوڕێ عزیز ڕۆیشتمە گوندی ناوکوێلەکان بۆ پێشوازی بارزانی، ئەوەی ڕاستی بێت زیاتر لەشەش ساڵ بوو بارزانیم نەدیتبوو، ئێوارە زۆر درەنگ بوو پێش تاریك دابێت پاسەوانانی بارزانی لە ڕێگای (داروسلام) دابەزینە گوندی ناوکوێلەکان، کاتێك خۆیشی دابەزیە سەرجادەی گشتیو چاوی بەمن کەوت بەدەست بانگی کردم، ڕۆیشتمە لای دەستی خستە ناو دەستمو چاكو چۆنی لێ کردمو هەر زوو پرسی: (ئەتو بێژە هەری ساری لە کەرا شەیتانی؟) گوتم: (گەورەم سواربوون عەیبەکەو هاتنە خوار دوو عەیب). ئەوکاتە دەستی بەردامو گوتی وەرە، لەگەڵی ڕۆیشتمە ئەو شوێنەی بۆی ئامادەکرابوو لەماڵی حاجی حسن، ئەوانەی لەوێ بوون (سلێمان بەگ، حمداغای مێرگە سۆری، غازی حاجی ملۆ، فاخیر حمدئاغا) منیش لەگەڵ نۆبەت دارێك کەناوی (عوزێرۆك) بوو، بارزانی ویستی لەگەڵ من بدوێت، بەلآم لەو دەمەدا (علی مولود داربەسەری) داوای کردبوو بارزانی ببینیێو هاتە ژوورەوە لەگەڵ مەلا مستەفا کەوتە قسەو گوتی: (جەنابی بارزانی پارتیەکانی ناوچەی کۆیە بیست پارچە چەکیان لە ئێمە وەرگرتوەو پێمان دەڵێن نامەی بارزانیمان بۆ بێنن دەتان دەینەوە، جائەگەر بفەرموون پارچە کاغەزێکمان بۆ بنووسن بەڵکو چەکەکانمان بدەنەوە)، بارزانی گوتی: (نامەی من ئێستا لای ئەوان ناڕوات هەر کاتێك نامەی من لەوێ ڕۆیشت ئەوکاتە وەرە نامەت بۆ دەنوسم، کەمێك سەبرتان هەبێت هەرچەکەکانی ئێوەنین باسیان لەسەر بێت هیتریش هەیە، نامە بۆ ئەوانەی چەکیان لە ئێوە وەرگرتوە نانوسم کە گوێی پێ نەدرێت!) دوای ڕۆیشتنی علی مولود، حمد ئاغا گوتی: (ئەو پیاوە لە جەماعەتی شیوعیەکانە هەر ئەوەندەبوو ناوی شیوعیەکانی هێنا بارزانی کەوتە قسەکردو

ئەوەندەی بلّێی ووشەی ناشیرنی بەکارهێنا دژ بەسەلام عادلو جمال حیدری. ئەوجا هەستم کرد جنێوەکان راستەوخۆ ئاراستە بوون بۆ منو فاخیر، بێ گومان ئەم هەلّوێستەی بارزانی ناچاری کردم بەو سەرماو ساردیە بگەرێمەوە بۆ بنکەکەمان لە میاجیان، بەدرێژایی شەو بەپێیان رۆیشتینو لای بەیانی گەیشتینەوە بارەگا، لەکاتی رۆیشتن پێم نەگوتن دەگەرێمەوە.

وەك لەسەرەوە باس کراوە لەگەلّ گەیشتنی بارزانی بۆ ناوچەی(بالّەك) نێردراوانی حکومەت بەبەردەوامی بەرێ دەکران بۆ لای بارزانی، لە دوای ئەسکەندەرو نوری برازای خۆی لە حامیەی رواندز دەرکەوتو چاودێری بووین تا گەیشتە لامان لە نزیك جوندیان کاتێ هات دوو سێ پیاوی لەگەلّ بوونو بەرێمان کردن بۆ ئەو شوێنەی مەلا مستەفای لێ بوو، لەدوای سێ رۆژ گەرایەوە، زۆری پێ نەچوو راسپێردراوی سێیەمیش (عریف ئەسعەد)دەرگەلّەیی. بەیانیەك زوو سوارێك لە حامیەی رواندز دەرکەوتو چاودێریمان کرد تا گەیشتە لامان لە(گەرووك شیران) ناوبراو گوتی: (نامەم هێناوە بۆ مەلامستەفا)ئێمەش بێ دواکەوتن بەرێمان کرد بۆ ماویلیان بۆلای رەئیس کمال لەوێش بەرێ کرابوو، لە وەرتێ نامە درابووە بارزانیو راسپێردراو بەلای ئێمەدا گەرایەوە رواندز.

ئەنجامی ئەو وتووێژە رێك کەوتن نامەیەك بوو کە مۆر کرا لە نێوان حکومەتی عارفو بارزانیدا لە سەرەتای سالّی (١٩٦٤) لە رانیە، ئەو رێکەوتن نامەیە دەنگو دۆلّی وا بلاّو ببوو کە کوردستان بەسێوو پرتەقالّ فرۆشراوە! ئەوەش نیشانەی ناکۆکیو دووبەرەکی ناو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، هەرئەو ناکۆکیە سەری بەوە گەیشت لە کۆنگرەی رانیە پارتی بوو بەدوو پارچە، بارزانی بەلایەکداو (برایم ئەحمدو مام جلال)یش بەلایەکدا رووبەرووی یەکتر وەستان، لە ئەنجامی لێکدانو ئالّۆزی لایەکەی (برایم ئەحمدو مام جلال) رۆیشتنە ئێرانو بارزانیش لە سەنگەرەکان مایەوە بۆ ماوەیەك.

لە سەرەتای بەهاری (١٩٦٤) لە مانگی سێ ئاگاداریەك لە (حزبی شیوعی)وە هاتبووە دەرگەلّە بۆ ئەوەی هەندێ لە کادرەکانی شیوعی برۆنە (ئاوەگرد) لە کلکەی کێوی (سەفین) بۆ بەشدار بوون لە ئاهەنگی دامەزراندنی حزبی شیوعی عێراقی، ناوی منیش لەولیستەدا بوو فاخیر بەمنی گوت کە ناوی تۆش لەگەلّدایە بۆ بەشدار

بوون لەو ئاهەنگە، بەلاّم بەنهێنی (منیر) بەرپرسی سیاسی پێی گوتم بەومەرجەی نەزاندرێت ناوبراو بەمنی ڕاگەیاندوە کە ناوی منیش لە لیستەکەدا هەیە بڕۆمە ئاوەگرد، ویستم بزانم بۆچی نایەوێت من بڕۆم بۆ بەشدار بوون لەو ئاهەنگەی ئاوەگرد؟ منیر گوتی: (ئەوەی من بزانم دەنگە دەنگێك هەبوو لە نێوان فاخیرو عزەتو حاجی مەلا وام هەست کرد نایانەوێت تۆ بڕۆیت، بەلاّم نازانم مەرامیان لە نەچوونی تۆ چیە؟) بێگومان لەگەڵ ئەو ووشیار کردنەوەی هاوڕێ منیر بۆم بەدیارکەوت مەرامی ئەو سێ کوچکەیە چیەو چیان دەوێت، ئەوان زۆر پەست ببون بەوەی پێشمەرگەو خەڵك زیاتر لایەنگرو پاڵپشتی من بوون. بەبەردەوامی هەوڵیان ئەوە بوو بەڵکو بتوانن ئەو جەماوەرە لەمن دوور بخەنەوەو وایان دەزانی ئەو خەڵکەی پاڵپشتی منن لە ڕێگای حزبی شیوعیەوەیە، بۆیە دەیانویست کۆسپ بخەنە سەر ڕێگای کاری حزبیەکەشم، بەڵکو دوورم بکەنەوە لە خۆشەویستی پێشمەرگەو خەڵك، بەلاّم بۆیان بەدیارکەوت پەیوەندی نێوان منو پێشمەرگەو خەڵك زۆر لەوە گەورەترە کە ئەوان بتوانن تێکی بدەن، چونکە پەیوەندیەکی پاكو پڕ لە خۆشەویستیە، هەر ئەوەش ئەوانی پەست کردبوو، پڕوپاگەندەیان ئەوەبوو بارزانی لە(زرار) ناڕازیەو بەرقو قینە، بەلاّم ئەوەش دادی نەدانو منیش خۆم ئاڵۆز نەکرد، ڕۆژی (١٩٦٤/٣/٢٧) دوای نیوەڕۆ لەدەرگەڵە دەرکەوتمو ڕۆیشتمە ڕەژێکەریان بێ ئەوەی بەکەسیان بڵێم، ئێوارەی هەمان ڕۆژیش پێش تاریك دابێت دیار بوو فاخیر لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە گەیشتنە ڕەژێکەریان، کاتێك فاخیر چاوی بەمن کەوت وەك بڵێی ئاڵۆز دیاربوو، هەرزوو لێم نزیك کەوتەوەو پرسی: (ئەوە خێرە لێرەی؟) گوتم: (ئەدی نەت ناردبوو بێم بڕۆینە ئاوەگرد بۆ بەشداربوون لە ئاهەنگی دامەزراندنی حزب؟) ناوبراو بێ دەنگ بوو یەك ووشەی دەرنەبڕی، لەودەمەدا ناردم پێشمەرگەکانی لەگەڵی بوون دایان بمەزرێنن، ئەو شەوە لەوێ ماینەوەو بەیانی زوو بەڕێ کەوتین نیوەڕۆ لەوەرتە میوانی (حاجی عەولاّ) بووین لەگەڵ ڕێزێکی زۆری ئەو پیاوە مالاّوایمان کردو بەڕێ کەوتین، پێش ئەوەی بەڕێ بکەوین هەستم کرد فاخیر مەرامێکی هەیە! کاتێك لە وەرتە دەرکەوتین ناوبراو لێم نزیك کەوتەوەو گوتی: (هاوڕێ بەباشی دەزانم پێشمەرگەکانمان هەریەکەی جەمەدانیەکی سوّر ببەستن بۆ ئەوەی نەپرسن ئێوە کێن!) ئەوەی ڕاستی بێت ئەو داوایەی فاخیرم بەلاوە زۆر سەیر

بوو،لەبەر ئەوە هەر زوو گوتم: (فاخیر داوایەکەت بەلای منەوە وارید نیەو گرانە یەکەم ئێمە بارزانی نین، دووەم بەخۆت دەزانی من نزیکەی چواردە ساڵ لەگەڵ بارزانیەکان بووم ئەو داوایەیان لێ نەکردین کە جەمەدانی سوور ببەستین ئێستاش بەجوانی نازانم جەمەدانی سوور ببەستم تا نەناسرێم، چونکە من ناسراوم و زراری کوڕی سلێمان بەگی دەرگەڵەییم، ئەگەر یەکێك بەجەمەدانی سوورەوە بم بینێ چیە پێ دەڵێ؟ ئینجا ئێوە برۆن لە دوای ئێوە ئێمە بەڕێ دەکەوین، دەبێ ئەوەش بزانی کەس نیە ڕێگا لەمن بگرێت و بمگێڕێتەوە). فاخیر زانی من بەقسەکانی ئەو پەست بووم گەڕایەوەو دەستی کرد بەسوێند خواردن گوتی: (بەسەری حمدئاغا لەبەر هیچم نەبووە تەنیا بیرم لەوە کردۆتەوە ئێوە ناکۆکیتان هەیە لەگەڵ عباس ئاغا پێم خۆش نەبوو ئەتۆ بێیت و بەناو هۆزی ئەواندا تێپەڕ ببی). منیش گوتم: (فاخیر ئەگەر بۆ ئەوە بەپەرۆشی غەمت نەبێت هیچ ناکۆکیم لەگەڵ عباس ئاغا دانیە، ناوبراو زۆر باش دەزانێ من شیوعیم و کوڕی سلێمان بەگی دەرگەڵەییم نەك شێروانیم!) کاتێك دیتی لەو هەڵوێستەی ئەو ڕازی نیم زیاتر لە سەری نەڕۆیشت، ویستم لەگەڵی نەڕۆم، بەڵام ناچاری کردم کە دەبێ بەیەکەوە برۆین، دیار بوو بەخەجاڵەتەوە گوتی: (بەسەری سلێمان بەگ تۆ نەیەی منیش ناڕۆم). لە هەورازی زینی ئەستێرۆکان بەسەر بەفردا سەرکەوتین و بەدیوی تردا سەرەو ژێر بەدۆڵی پڵینگاندا شۆڕ بووینەوە خوار لەگەڵ داکەوتنی تاریکی گەیشتینە گوندی (دێرێ) ئەوکاتە ماڵی عباس ئاغا لەو گوندە بوون، لە دیوەخانی ناوبراو میوان بووین، شەو لەوێ ماینەوە عباس ئاغا ڕۆیشتبوە ڕانیە خۆی لەماڵ نەبوو.

ئەو شەوە لەوێ بووین، شەوێکی ئەوەندە تەڕوتووش بوو کەس نەی دەتوانی سەری دەربێنێت، لەو ڕێڕەوەدا (عزیز سەلیم)ی هونەرمەندیشمان لەگەڵ بوو بەناوی (دکتۆر ڕەحیم) دەڕۆیشتەوە قەلادزێ بەیانی ڕۆیشتینە ڕانیە لەوێش چووینە گوندی (کونەسە) بنکەی چەکدارەکانی حمدئاغای باوکی فاخیر لەوێ بوو، لای ئەوان ماینەوە، بەیانی ڕۆژی (١٩٦٤/٣/٣٠) زوو لەڕانیە دەرکەوتین بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە(هیزۆپ) گوندی ناوبراو لەلایەن سوپای داگیرکەر وێران کرابوو، نانی نیوەڕۆمان لەسەر ڕووبار لە ژێر پردەکە خوارد لەوێش بەرەو (سماقولی) ڕۆیشتین، لەڕێگا لاماندا ناو هەندێ خاوەن ئاژەڵ لەژێر ڕەشماڵی بوارە هەوار بوون لە نزیك

گۆڕستانێك لەوێ پێیان گوتین ئەوە گۆڕستانی شەهیدانە، لە دەوروبەری گۆڕستانەکە دیتم چەند کەڵەکە بەردێك هەبوون، بەلامەوە سەیر بوو هەر پێشمەرگەیەك بەردێکی بەدەستەوەیە فڕێی دەدایە سەر کەڵەکە بەردەکان، پرسیم (ئەوەچی یە؟) گوتیان (ئەوە گۆڕی ئەوکافرانەن کە شەڕی لەشکری ئیسلامیان کردوە، پێویستە ڕەجم بکرێن!)، یانی بەرد باران بکرێن! کاتێك گەیشتینە ناو گۆڕستانەکە دیاربوو چەند گۆڕێکی ڕازاوەی تێك نەچوو، کێلەکانیان بەرزو پارێزراو، گوتیان ئەمانەش گۆڕی (ئەسحابەی لەشکری ئیسلامن)، خەڵك باوەشیان لە کێلەکان دەکردو خواستو مەرامیان لێ دەخواستن، دەبی لە وەڵامی ئەو خەڵکە نەزانە چی بڵێیتو وەڵامی چیان بدەیتەوە؟

بۆمان هەیە پێیان بڵێین ئەوانەی ئێوە ڕەجمیان دەکەن ئەوان خاوەنی ئەو خاکەبوون، پارێزەری کورد بوون لە پێناو پاراستنی خاكو نیشتیمانیان گیانیان لە دەست داوەو داگیرکەر نەبوون. بۆیە دەبێ بەو شێوەیە سەیریان بکرێت؟ بۆ نەڵێین ئەوان شەهیدی ڕێگای نیشتیمانن؟ ئەو کۆمەڵە نەزانەش ئەوانەی باوەشیان لە کێلەکانیان دەگوشینو فرمێسکی بەگوڕیان بۆ دەڕشتن، ئەوان هێرش هێنەری داگیرکەربوون!

ئێوارەی هەمان ڕۆژ بەدرەنگەوە لەنزیك گۆڕستانی باسکراو لە ڕووباری سماقولی پەڕینەوە، دیاربوو سماقولی سوتێنندرا بوو، بەبناری کێوی سەفین دا سەرکەوتین لەگەڵ داکەوتنی تاریك گەیشتینە بنکەی ئاوەگرد ئەو شەوە بووم بەمیوانی مامۆستا (ئەحمەد دلزاری شاعیر)،ئەوەی جێگای ڕەزامەندیم بوو ئەوەبوو شەو زۆر بەخۆشی ڕامان بوارد، بەیانی ڕۆژی (١٩٦٤/٣/٣١) لەگەڵ گەزەنگی هەتاو گشتمان دارژاینە گۆرەپانێك بۆ ئاهەنگ گێڕان لەناو سەوزە گیای بەهار دانیشتین، لە سەرەتاوە گوێمان گرت لەدەنگی مامۆستا (کمال غەمبار) بەڕێوەبەری ئاهەنگ، زۆر بەسۆزەوە بەخێرهاتنی لە مێوانەکان کردو ئەوجا گوێمان گرت لە گوتاری حزبو کۆمەڵێك هەڵبەستی مێژوویی، دوا بەدوای ئەوانە بەیادی شەهیدانی سەرکردە شریتێکی دەنگی ئەوان لێدرا، ئەوەی ڕاستی یە بەشداربوەکانی ئاهەنگ زۆر بەپەرۆشەوە گوێیان لەدەنگی سەرکردە شەهیدەکان ڕاگرتبوو.

ئاهەنگەکە ئاهەنگێکی یادەوەری بوو، ئەو شوێنەی ئاهەنگەکەی لێ سازکرا (ئاوەگرد) دەکەوێتە دامێنی کێوی سەفین ئەو شوێنە ببوە بنکەی شیوعیە ڕاکردوەکان، ئەوانەی لەدەستی ڕژێمی خوێن ڕێژی بەعس ڕایان کردبوو، بنکەی هەرێمیش لەوێ بوو بەشێوەیەکی کاتی، ئەوەندە ڕۆژانەی لەوێ ماینەوە لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێیان کەوتمە قسەکردن، زۆر بەووردی باسی ئەو گێروگرفتو ڕووداوانەم لەگەڵ باس کردن ئەوەی کادیران خستبویانە پێش کارکردنی منو کۆسپ بۆ ئەوەی ڕێگایان بۆ چۆڵ بکرێت بەئارەزووی خۆیان بن.

لەدانیشتنێکی درێژ لەگەڵ (کەریم ئەحمەد) ئەو شتانەی ڕوویان دابوو بۆم باس کرد، وا دیاربوو ناڕازی بوو، گوتی: (ئەوەی دەربارەی تۆ کراوە هەمووی ناڕاستو نارەوایە، من ئاگادارم ئەو کردارە بۆچی کراوەو خرتۆرەکە لەکوێ سازکراوە . ئێمە بۆیان دەنوسینو لەو ڕووەوە ئاگاداریان دەکەینەوە لەگەڵ ڕون کردنەوەیەك).

لە گەڕانەوەمان بۆ ڕانیەو قەڵادزە (مومتاز حەیدەری)ش لەگەڵمان هات، ڕێگا دوور بوو بەپێیان ناوبراو هیلاك بوو، شەو لەڕانیە ڕۆیشتینە بنکەی چەکدارانی سەعیدی برای فاخیر، ناوبراو میوانداریەکی زۆر باشی کردین، بەیانی ڕۆژی دوایی لەگەڵ حمد ئاغای باوکی فاخیر ڕۆیشتینە سەر قولەی ڕانیە بۆ نیوەڕۆ چووینە ماڵی (سەعید تەماتە) لەماڵی ناوبراو چاومان بەبرایم ئاغای مامند ئاغا کەوت، ئەو پیاوە زۆر بەزەقی هەندێ شتی بۆ باس کردینو گوتی: (ئێمە کە چەك هەڵگربووین ئەوەندە مەرامان کوردایەتی نەبوو ئەوەندەی بەدوای ڕاوە ڕووتو داپڵۆسینو ئەزیەت دانی خەڵکەوە بووین!) زۆرشتی تریشی باس کرد ئەوەی لە دەرگەڵەو گوندەکانی دەوروبەرکردبوویان.

ڕۆژی دوایی ڕۆیشتینە قەڵادزێ لەوێ چووینە لای (هەمزە عبداللە) دامەزرێنەری (پارتی) لەگەڵ ئەو پیاوە ڕۆشنبیرو سیاسەت مەدارە دانیشتین سودێکی زۆرمان لە قسەکانی بینی، لەو بەیەك گەیشتنەی ئەو پیاوە کورد پەروەرە کۆمەڵێك ڕێنمایی پێ ڕاگەیاندین جێگای ڕەزامەندی بوون. ئێوارەی ئەو ڕۆژە لەگەڵ بەڕێز (هەمزە عبداللە) دەرکەوتینە هەندێ شوێنی دەوروبەری قەڵادزێو هەندێ وێنەی یادگاریمان کێشانو کاتێکی خۆشمان لەگەڵ بەسەر برد، ئەو ڕۆژەی لەوێ بووین چاومان بەهاوڕێ (عزیز محمد) کەوتو هەر ئەو ڕۆژەش گەڕاینەوە سەنگەسەر، ئەوەی شایانی

لێ دوانە پێشوازیەکی گەرمیان لێ کردین، لەو بەیەك گەیشتنەی لەگەڵ عەباس ئاغا زۆر سوود بەخش بوو، ناوبراو بەزۆری ئاخاوتنی لەگەڵ من بوو ئاخاوتنەکەش لە ڕووی شادیو دۆستایەتی بوو هەست نەدەکرا ئەو پیاوە گۆڕابێت، وەك پێشان چۆن بوو هەروا بوو. ئەو بەیەك گەیشتنەی لەگەڵ عەباس ئاغا کەڵکی زۆری هەبوو، کۆمەڵێك زانیاری دەستکەوت بوون، هەندێك لەو شتانەی قسەیان لەسەر بوو باسیان لێوە کراو خرانە بەرچاو، بەلاّم دیاربوو عەباس ئاغا نەیدەویست ڕاستەوخۆ بدوێت، من گوتم کاك عەباس لەوکاتەی بارزانی بەرەو بیتوێن دەهات لە گوندی (ناوکێلەکان) پێشوازیمان لێکرد لەقسەکانی دیاربوو زۆر ناڕازی بوو لە دەستەی (برایم ئەحمەدومام جلال) زۆر بەتوندەی لۆمەی دەکردن، سلێمان بەگی باوکم پێی گوت: گەورەم تۆ لە ڕوسیا زۆر جار دەتگوت من جارێکی تر ئەبەد بەقسەی ئەفەندی لۆکەکان فریوو ناخۆم، دەبینم دیسان لێیان پەستو بێزاری! لەوکاتەدا فاخیریش لەوێ بوو. بارزانی گوتی: (سلێمان بەگ ئاغەکان تووشیان کردم، ئەوەندە هاتنو چوونو هاتنە لام بەڕاستی لەخۆم ترسام نەوەك حکومەتی قاسم شتێکم لەگەڵ بکات، ئەوە منی لە بەغـدا دەرپەڕاند!!).

عەباس ئاغا سەری هەڵبڕیو گوتی (عەفووی فەرمووە ئەدی ئەو نەبوو مام جلالی نارده لام بۆ کڕینو پەیدا کردنی چەك پێش ئەوەی دەست بکرێت بەهەڵگرتنی چەك؟) گوتی (برایان زۆر شت هەیە هی ئەوەنییە لێی بدوێینو باسی لێ بکرێت، وازی لێ بێنن با جاریێ وابێت) قسەی هەبوون نەیویست بیڵێ. دەربارەی ئەو شەڕەی لە(هەڵشۆ) جەرەیانی هەبوو لەگەڵ بەرهەڵستکارانی جەماعەتی (مام جلال) عباس ئاغا گوتی: (پێم خۆش نیە بەو شێوەیە ڕووبەڕوویان بوەوە)، لە هەڵوێستی عباس ئاغا بەدیاردەکەوت کە ناوبراو دڵتەنگو ناڕازی بوو، بەلاّم دەری نەبڕی ڕۆژێکی خۆشمان لەگەڵ عباس ئاغا بردەسەر بەدرەنگەوە بەسەرکەوتینەوە بۆ سەنگەرو لەسەر خواستی فاخیر لە سەنگەر ماینەوە، ئەوەندە ڕۆژانەی لەوێ بووین فاخیر بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵ مەلامستەفا دوو بەدوو دەدوان ئێوارانیش دەڕۆیشتنە بناری چیای کێوەڕەش، ئەومارانە فاخیر لە هاتنەوە دوا دەکەوت ناچار بووم بەناوبراو بڵێم، من دەڕۆم زیاتر ناتوانم بمێنم، ئەوە بوو ڕۆژی دوایی گەڕاینەوە ڕانیە، لەوێ لەناو شار منی جیا کردەوەو دە دیناری دەرهێناو ویستی بیداتە منو گوتی: (مەلامستەفا

هەندێ پارەی داوە پێم بۆ خەرجی ئەو دە دینارەش تۆ بۆ مندالّەکانت بەپێویستیەکانیان بدە). ئەوەی ڕاستی بێت بەلامەوە سەیر بوو پێم گوت: (فاخیر ئەو دە دینارەی دەیدەی بەمن، دە دیناری تریشی بخەرە سەرو ئەو پێشمەرگانەی لەگەلّمانن هەریەکەی دینارێکیان پێبدە بۆئەوەی بۆ خۆیان خەرج بکەن، ئەوە باشترە لەوەی بیدەیە من)، بەوەلاّمی فاخیر نیگەران بووم کە گوتی: (خۆ پارەی حزب نیە بیدەم بەپێشمەرگەکان ! ئەو پارە دراوەتە من بۆ خەرجی خۆم). پێم گوت: (کەوابێت بۆچی دە دینار دەدەیتە من بۆخۆتی خەرج بکە باشترە لەوەی کە بیدەی بەمن خۆ من لەوان زیاتر نیم)، قسەکانی منی بەدلّ نەبوون، ڕۆیشتە بنکەی چەکدارەکانی سەعید، نیوەڕۆ لای ئەوان مایەوە، ئێوارەی ئەو ڕۆژە بەدرەنگەوە لە ڕانیە دەرکەوتین‌و شەو لە(سەرکەپکان) لە بنکەی بارزانیەکان میوان بووین ڕۆژی دوایی بەیانی زوو ڕۆیشتین گەیشتینە خوار(پلّینگان) بووبەباران هەرئەوەندەمان بۆ کرا بەپەلە لاماندا ناو مالّی کۆچەریەکان، لەناو ڕەشمالّەکان ئاهەنگی بووك گواستنەوە بوو، ئێمەش ماوەیەك لەوێ ماینەوە، دوای نیوەڕۆ لە (پلّینگان) بەسەرکەوتین بۆ ناو دۆلاّییەك. بوو بەباو باران‌و کرێوە هەریەکەمان ڕۆیشتینە بن هەیوانێك، من‌و فاخیر چووینە بن کێلکە شاخێك باش بوو تەڕ نەبووین، خەریك بووم تفەنگم دەستپێوە فاخیر دەستیکرد بەقسە کردن‌و گوتی: (بەڕاستی ئەو پیاوەمان پێشان نەدەناسی، کە سەرۆکێکی ئەوها لێ هاتووە، دەبێ دان بەو غەلّەتیە دا بنێین!) یەکسەر وەلاّمم دایەوەو گوتم: (هاوڕێ فاخیر مەلّێ ئێمە سەهوین دەتوانیت بلّێی من سەهوم، کە دەلّێیت ئێمە سەهوین وا دەگەێنیێ کە منیش سەهووبم، بەلاّم زۆر بەسەربەرزیەوە دەتوانم بلّێم من بەرامبەر ئەو پیاوە ناودارە سەهوو نەبووم هەمووکات ناسیومە وەك سەرکردە هەرئەوهاشی دەناسم، چونکە هیچ ڕۆژێك شتێکی بێ ڕێزو نارێك‌و ناتەرزم نەبووەو ناشبێت، تەنیا ئەوە نەبێت لە بیرو باوەڕ جیاوازیم لەگەلّی هەیە ئەوەش مافێکی سروشتی خۆمە، پێویستە ئەوەش بلّێم مەلامستەفا مرۆڤێکی ووشیارو لێهاتووەو مەرامی تایبەتی خۆشی هەیە، دەبێ ئەوەش بزانی ناوبراو نایەوێت بارزانی حزبایەتی بکەن، تۆش بارزانی‌و شیوعی!) فاخیر گەڕاوەو گوتی: (وەك تۆ دەێلّێیت دەبێ واز لەو بیروباوەڕە بێنم و دووریکەومەوە لە شوعیەت ئەوەش شتێکی مەحالّەو قەت نابێت، چونکە ئەو بیروباوەڕە ڕێڕەوەی ئەبەدیمە).

پێم گوت: (مرۆڤ قابیلی گۆڕانەو گۆتەیەکی سەرزاری هەیەو دەڵێت: (ئەمرۆ پیاوێکی باشەو بەیانی دەبێتە پیاوێکی ناپەسندو خراپ، شتی واش بووەو دەبێت)، دیار بوو فاخیر قسەکانی منی پێ خۆش نەبوو ڕووی گرژ بوو بەئاڵۆزی ڕۆیشت، لەو سەین و بەینەدا (عریف یونس) گەیشتە لامان و بەڕێ کەوتین لە هەورازی زینی ئەستێرۆکان بەسەرکەوتین و عریف یونس پرسی: (مامۆستا زرار ئەوە فاخیر بۆ گرژو زویر دیارە وەك بڵێی دڵی ڕەنجابێت؟!) گوتم: (هاوڕێ دوایی لێی بپرسە بۆچی زویرەو دڵی ڕەنجاوە، دیارە لەقسەکانی من نیگەران بووە).

بێگومان لەدوای گەڕانەوەمان بۆ دەرگەڵە ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەلم دەربارەی ئەو سەفەرە نوسی، ئەوەی کۆم کردبۆوەو هەڵوێستی فاخیریشم دیارکردبوو کە بۆنی مەترسی لێ ڕەچاو دەکرێت، ڕاپۆرتەکە دەربارەی ڕەوشتە پڕوو پووچ و ناپاکەکەی حاجی حەسەن ئاغاش شتی تێدا دیارکرا بوو کە چۆن لە ژێر سێبەری کادیرایەتی کرداری ناپاك و زیان بەخش ئەنجام دەدات!

ڕاپۆرتەکەم لە ڕێگای هاوڕێ منیرەوە بەڕێ کرد بۆ هەرێم، پێش ئەوەی وەلامم بدەنەوە لە کۆبوونەوەیەکی لیژنەی قەزا حاجی مەلا پێمی گوت: (تۆ سەهوی لۆمەی فاخیر دەکەی دەبێ ئەوە باش بزانیت حزب فاخیر بەتۆ نادات!) لە وەلامدا گوتم: (حاجی مەلا سەلامەت بیت خۆ ئالو گۆڕی ئاژەڵ نییە، فاخیر لەمن قەڵەوتر بێت، منیش تێگەیشتوم و هەستم کردوە شتی وا لەحزبەمارکسیەکەی ئێمەشدا هەیە، نابوایە وابێت)، دیاربوو لەقسەکانی من پەست بوو گوتی: (تۆ زەرەر دەکەی، کەیفی خۆتە من بۆ تۆمە). ئەوەی دیار بوو ڕاپۆرتەکە وەك داواکاریەکانی تر بێ دەنگی لێکرا، بەلام نیشانەی پێوە دیاربوون کە داروودەستەکەی کارگێڕانی حزب لە دەرگەڵە ڕێك کەوتبوون بۆ ئەوەی من لە حزب دوور بخەنەوە، تاوەکو لە گۆڕەپانێکی چۆڵ بەئارەزووی خۆیان بارگیرەکەیان تاو بدەن، بێگومان بۆ ئەو مەبەستەیان توانیان ئەوانی سەرەوەش واتێ بگەیێنن کە زرار کەسێکە بۆ ئاڵۆزی و ناتەبایی لە ڕیزی حزب دایە، ئەوانی سەرەوەش وەك پیشەیان گوێ ڕایەڵی نامەو ڕاپۆرتەکانی فاتح و فاخیرو حاجی مەلا بوون، ئەوانیش ماشاالله بۆ خاتری خاتران قەڵەمیان هەر بەدەستەوە بوو بێ ئەوەی بیر لە بەرژەوەندی حزب بکەنەوە! چونکە مەرامی خۆیان لە پێش هی حزب دادەنا. لە دوای گەڕانەوەم لە ئاوەگرد بەماوەیەك، ڕۆژێك حاجی مەلا

گوتی: (نامەیەكی هەرێم هاتوە تیایدا نوسراوە ئەوەی لەسەر هاوڕێ زرار نوسراوەو پێی تاوانبار كراوە ڕاست نییەو هەڵبەستراوە، ئەوە ڕای كەریم احمدە، ئەو بەئارەزووی خۆی شت دەنوسێ‌و ئاگای لە هیچ نییە، ئێمە بەو نوسراوە ڕازی نین‌و وەڵامی دەدەینەوە)، منیش بەئامادەبوونی (حمدامین هریری) پێم گوت: (دیارە تۆ نوسیوتە زرار چەكی جاشایەتی لەگەڵ باوك‌و برای هەڵگرتوە، باشە باوك‌و براكانی من بەقسەی كێ چەكیان هەڵگرت؟ ئەگەر ئەوان تاوانبارن بۆ ئێستا لەژێر چاودێری ئەوان ملكەچن؟ تكایە با بەس بێت ئەو زێدە ڕۆییە بەتایبەتی تۆ). هەستام‌و ڕۆیشتم.

دەرگەڵە ڕێكخراوێكی ڕێك‌وپێكی لێ بوو بەشێوەیەكی تایبەت ڕێكخراوی ئافرەتان لە هی ڕواندز بەتواناتر بوو، لەناو ڕیزی چەكدارەكانی باوكیشمدا كۆمەڵە شیوعیەكی بەتواناو لێ هاتوو هەبوون، لە بەشی زۆری گوندەكانی دەوروبەری دەرگەڵە خەڵكی شیوعی هەبوون‌و لیژنەیەكی ڕاپەڕاندنی كارەكان سەر پەرشتكاری دەكردن، من بەرپرسیان بووم. دەبێ ئەوەش بڵێین هێزە چەكدارەكەی سلێمان بەگ هێزێكی بەتواناو چالاك بوون دەسەڵاتی تەواویان لە بارزانی یەوە پێدرابوو لە ناوچەی باڵەكایەتی.

لەدوای كۆبونەوەی ڕانیە پارتی بوو بەدوو بەشەوە دەستەی (ابراهیم احمدو مام جلال) لێدران‌و ڕۆیشتنە ئێران، بەڵام هەست دەكرا خەڵكێك هەبوون كە لایەنگیریان دەكردن‌و ناكۆكی‌و دوو بەرەكی دیاردەیەكی باو بوو، دەستەی ناوبراو لە بزاڤ دا بوون ئەویش ئەو كاتە بەدیاركەوت كاتێك بەرپرسی باڵەكایەتی‌و ڕواندز (عقیدكافی) لەسەر داوای بارزانی ڕۆیشتبوە ڕانیە لە ناكاو بەنهێنی بەسلێمان بەگ ڕاگەیندرا كەوا (ملازم ڕەئوف)و لایەنگرەكانی لە گەلاڵە بەنیازی دەست وەشاندنێك چەكداریان ناردون ڕێگا لە(عقیدكافی) بگرن، لەكاتی گەڕانەوەی لە ڕانیە بۆ گەلاڵەو دەست بەسەر ناوچەی باڵەكایەتی دا بگرن، بەڵام سلێمان بەگ یەكسەر عزەت‌و فاخیری بەكۆمەڵێك چەكدارەوە بەڕێ كردن بەدوای كافیدا بەخۆیشی لەگەڵ كۆمەڵە چەكدارێك ڕۆیشتنە گەلاڵە، كاتێك (ملازم ڕەئوف) زانی بوی كە سلێمان بەگ بەهێزێكی چەكدارەوە بەرەو گەلاڵە كەوتۆتەڕێ یەكسەر گەلاڵە بەجێ دێڵێت‌و بەرەو شوێنێكی نادیار ڕا دەكات، گەلاڵە دەكەوێتە ژێر كۆنترۆڵی چەكدارەكانی سلێمان

بەگ، کە ئەو دەنگوباسە گەیشتبوە ڕانیە کافی نەگەڕایەوەو لە ڕانیە مایەوە، پاش هێمن بوونەوەی ناوچەکە سلێمان بەگ یەکێکی لەو بارزانیانەی پاسەوان بوون لە گوندی وەلاش (غەزالی میرخان)ی لە گەلاڵە دانا تا یەکێك دیار دەکرێتو دەنێردرێتە جێگای کافی.

لەگەڵ ڕێکەوتنەکەی نێوان حکومەتو بارزانی لە ساڵی(١٩٦٤) هەر زوو داوا لە شیوعیەکان کرا چەکدارەکانیان لەسەر ڕێگا گشتییەکان دوور بخەنەوە، بەپێی ئەو داوایە شیوعیەکان چەکدارەکانیان گواستنەوە دەرگەڵە لەبن گوێزەکانی (ئاوەڕێژ)مانەوە.

ئەوەبوو لەوکاتەشدا لەبەهاری (١٩٦٣)دا فاخیر ماڵەکەی هێنایە دەرگەڵە لەو ماوەیەدا کۆمەڵێك کرداری ناپەسند سەریان هەڵدا، بێگومان کاتێك ماڵی فاخیر هاتە دەرگەڵە ڕێکخراوی ئافرەتان لە دەرگەڵە ئاگادار کران یارمەتیان بدەن کەچی ئەنجامی ئەو یارمەتیە کاری ناڕێکی بەدواوە بوو، ئەوەبوو جەمیلی برای فاخیر بەنیازی ناپاکی دەستی بۆ یەکێ لە خوشکانی هاوڕێ درێژ کرد ئەو کارە بوە هۆی شکانێکی خراپ بۆ ڕێکخراو بەشێوەیەکی گشتی بۆ ئافرەتان بەتایبەتی لە دەرگەڵە، بێگومان لەو ڕووەوە زۆر بەتوندی ڕووبەڕووی فاخیر وەستامو لۆمەی ژنەکەم کردو گوتم با وانەزانی ئەو خوشکانەی یارمەتیانی داوە خزمەتکارن.

لەدوای ناردنی ئەو ڕاپۆرتەم کەوتمە ژێر بارێکی گران لەدەستی کادیرە خۆپەرستەکانی شیوعی هەر لەسەرەتای هاوینی(١٩٦٤) لە ژێر تەنگو چەڵەمەی ناڕێكو دوور لەڕاستیو بیروباوەڕ لەئازار دابووم، بەنیاز بووم بڕۆمو بگەڕێمەوە ڕواندز بەڵکو کارێك بدۆزمەوەو لەو تەنگو چەڵەمەیەی تێی کەوتوم ڕزگارم بێت، بەڵام ڕێك نەکەوت ناچار کەپرو ساباتێکم لە بن گوێزێکی گەورە کە بەناوبانگ بوو بە(هۆری) کردن، شوێنێکی باش بوو بەشی زۆری ئێواران هاوڕێ (منیر) دەهاتە لام گوێمان لە ڕادیۆی (پەکی ئێران) ڕا دەگرت، شتە گرنگەکانمان تۆمار دەکردن، بێگومان لەبەر ئەوەی ئەو دەمانە دڵ ڕەنجاو بووم بەشی زۆری کاتم بەڕاوە کەو دەبردە سەر.

لەسەرەتای هاوینی (١٩٦٤)ماڵی بارزانی هاتنە بناری چیای (کارۆخ)، بێگومان لەگەڵ هاتنی ماڵی بارزانی بۆ بناری کارۆخ ڕێگای هاتوچۆ کەوتە

دەرگەڵەو بەو ڕێگایەدا کەلو پەلی پێویست بەڕێ دەکرا بۆیان لەو کاتەی ماڵی بارزانی لە بناری کارۆخ بوو یەك دوو جار لەگەڵ باوکم ڕۆیشتمە لایان، جاری دووەم وا ڕێك کەوت بارزانی لە سەفەری سەر سنوور گەڕابوەوە، باوکم لەگەڵی کەوتە دوان‌و پرسی: (ئینشاالله سەفەرتان خێرە، بیستمان چاوتان بەشا کەوتوە؟) مەلامستەفا بەدەمێکی زەردە خەنەوە گوتی (میرێ من ئەو دەرگای ئەز سەرێ خۆ ل بەر خوار دکەمەوە، شاش ژی وەکی من سەرێ خۆ ل بەر خوار دکەتەوە، غەمت نەبیت دونیا بەدڵی ئێمە دەبیت، داوای چەکتان دەکرد ئەویش دێت)، هەست دەکرا دڵی شاد بوو، بێگومان ئەو ماوەیەی ماڵی بارزانی لە بن کارۆخ بوو خەڵکێکی زۆر دەچووە لایان.

چوونی من بۆ ئاوەگرد لە مانگی (٣/١٩٦٤) بەو نیازە بوو لە تەنگ‌و چەڵەمە دوور بکەومەوە، بەڵام لە سەرەتای هاوینی (١٩٦٤) زیاتر لە پێشان کەوتمە ژێر باری گرانی تەنگ‌و چەڵەمەی ناڕێك‌و نالەبارو بەندو بالۆرەی دوور لەڕاستی لەلایەن کادیرانی بەرێوەبەرەوە، کەوتمە بیرکردنەوە بەو نیازە بووم بگەڕێمەوە ڕواندز، بەڵکو کارێك بدۆزمەوە لەو کێشەو دەردەسەریە ڕزگارم بێت لەدەستی خێرومەندەکانی دوور لەڕاستی‌و ڕاستی گوتن کەمنیان کردبووە ئامانج بۆ لێدان لەبەر ئەوەی بەرهەڵستی کارو کرداری پڕوچوچ‌و ناڕەوای ئەوان بووم، ئەوانیش باش بۆیان ئاشکرا ببوو کە بەشی زۆری خەڵك‌و پێشمەرگە لایەنگری منن، بۆیە نەیارەکان یەکیان گرتەوەو کەوتنە دژایەتی‌و بەرهەڵستکاری‌و خراپەکاری بۆ بەدناوکردنی من، وادیار بوو ئەو ڕاپۆرتەی دابوومە سەرەوەش پشتی تێکراو وا پێ دەچوو هەناسەی تەنگ کردبن ئەویش بەوە بەدیار کەوت بڕیارێکی دوور لەپەیرەوی حزب دەرکرابوو بۆ دوورخستنەوەی من بەبێ ئەوەی من ئاگام لێ بێت‌و ئامادەی ئەو کۆبونەوەیە بم کە بڕیاری تێدا درابوو من دوور بخرێمەوە! پێش ئەوەی پێم ڕابگەیەندرێت هەستم کرد شتێك هەیە دەربارەی من، زۆری پێ نەچوو ڕۆژێك (شێخ علی بەرزنجی) کە یەکێك بوو لە بەرپرسانی حزب بانگی کردم گوتی: (هاورێ لەبەرئەوەی تۆ بەشێوەیەکی سوك ناوی هاوڕێیان دەخەیتە بەرگوێی خەڵك‌و دیارە هاوڕێیان‌و کاك عزەتیش دەڵێن زرار ملکەچی بڕیارەکانی حزب‌و ئەو فەرمانانەی پێی دەدرێن نیە لەبەرئەوە بڕیار دراوە بۆ ماوەیەك بەتەنیا پەیوەندیت بەحاجی مەلاوە بێت!) لەوەڵامدا گوتم:

(باوەڕیم بەپەیوەندی تەنیایی نیە بۆ نالێیت لە حزب دوورمان خستیتەوە، ئەو بڕیارەش بەبڕیار نازانم ئەوەی کە دەربارەی من دەرکراوە، چونکە دڵنیام بڕیارەکە ئارەزووی چەند خێرومەندێکی سەرمێزی نان خواردنە نەك بڕیاری حزب).

ئەوەی لەیادی ناکەم زستانی ئەو ساڵە (١٩٦٥) کەزستانێکی لەڕادەبەدەر سارد بوو بەدرێژایی ڕۆژانی بەفرو کڕێوە لەسەری چیا داری سوتانم بەمل ڕادەکێشا خوارەوە، بەڕەزالەتێك زستانەکەم بەسەربرد مەگەر هەرخۆم بزانم!! بێگومان ئەوکات دانیشتبوم دوور لەئیش‌و کاری حزبی، کاروکردەوەم تەنها ڕاو بوو وازم لە پێشمەرگایەتیش هێنا بوو.

یاخی بوونی پێشمەرگەکانی دەرگەڵە: لەبەهاری ساڵی دیاریکراودا دەنگێك بلاّوبوەوە کەوا بەشی زۆری پێشمەرگەکانی دەرگەڵە نەڕۆیشتونەتە واجب‌و لە عزەت‌و دارو دەستەکەی نارازین، من خۆم تێکەلاّوی هیچ نەکرد، بەلاّم زوو بیرم بۆ ئەوە چوو بلێن زرار سەری لەوکارەدایە کەلەڕاستیدا ئاگام لە هیچ شتێك نەبوو، ڕۆژێك سەرلەبەیانی ڕۆیشتمە لای (ئەبو نەوال) ناوبراو برادەرێکی شیوعی بوو خەڵکی تکریت بوو خەریکی کاری ڕۆشنبیری بوو،لە خانوەکەی (مینەی مام عوسمان) کاتیك (حمدامین فقێ حسن‌و ئەسعەدی خلیلی حسن بەگ) بەدەرکەوتن بەمنیان گوت: (کارێکمان بەتۆیە ئەگەر زەحمەت نەبێت)،لەگەڵیان دەرکەوتم (حمدامین) لەدەرەوە گوتی: (برام ئێمە بەشی زۆری خزمەکان وا لە ماڵی قادری خلیلی کۆبوینەتەوە بەو نیازەی لەگەڵ عزەت نەمێنین‌و لێی دووربکەوینەوە،بۆیە هاتوین لەو ڕووەوە پرسێك بەتۆ بکەین، بۆیە وای بەباش دەزانین لەگەڵمان بێی‌و گوێیان لێ ڕابگری‌و ڕای خۆت بدە بۆ ئەوەی ئەوانیش ڕای تۆ بزانن). ئەگەرچی پێم خۆش نەبوو لەگەڵیان بچم، چونکە دەمزانی ئەو بارە گرانە دەخرێتە ملی من، بەلاّم ناچار لەگەڵیان چووم بۆ شوێنی دیاریکراو، کە چووم بینیم خزمەکان زۆربەیان لەوێ کۆبونەتەوەو هەر بەرەبابێك نوێنەری خۆی لەوێ بوو، بەرەبابی میرەکان (حمدامین‌و سۆفی) برای بوون، بەرەبابی ئیبراهیم بەگ (ئەسعەدو قادر)ی برای لەوێ بوون، لە بەرەبابی بوزیەکان (حەسەنی ڕەزاق) کە گەنجێك بوو لە جیاتی باوکی هاتبوو، کە گوێم لە قسەکانی ئەوان بوو بەتێکڕایی دەیانگوت: (ئێمە گەیشتوینەتە ئەو باوەڕە عزەت بەچاوی پێشمەرگە سەیری ئێمە ناکات‌و وەك کرمانجی ژێر دەستەی خۆی سەیرمان دەکات،

بێگومان ئێمەش بەوە ڕازی نین، چونکە ئێمە وەك خزم لەگەڵ ئەوداین لەکاتی تەنگانە دەرگەڵەمان بەجێ هێشتو چووینە ڕواندز، وە لەکاتی دەرکەوتنو لێ قەومان لەگەڵی دەرکەوتینو بەجێمان نەهێشت، ئێستاش دەبینین پشتمان تێکراوە. ئازوقەیەکی زۆر بەناوی ئێمەوە وەردەگرنو نادرێتە پێشمەرگە، بەڵکو دەدرێتە ئەوانەی هیچ پەیوەندیەکیان بەواجبەوە نیە! ئێمەش ئەوانەی واجب دەگرین کەس نازانێ ماڵیشمان لە کوێ یە، لە هەمووشی ناخۆش تر ئەو ئازوقەیەی وەردەگیرێت دەدرێتە ئەوانەی لە دژی ئێمە دەوەستان پێش بگەڕێینەوە دەرگەڵە، ئەوەیە ئێمەی هانداوە لە عزەت دووربکەوینەوە، ئـــەو هەڵوێستەی نـاوبراو وامان لێ دەکـات پەرتوبـڵاوەی لێ بکەینو هەریەکـەی ڕوو بکەینە لایەك).

*یەکەمیان* (قادر خلیل)دواو گوتی: (ئەگەرچی کەیفیشم بەوەهاب ئاغا نایێت. بەلاَم لە ڕقی عزەت بەخۆمو خزمەکانم دەڕۆمە لای ناوبراو).

*دووەمیان* (حمدامین فقیێ حسن) گوتی: (دەڕۆینە زۆرزك لای حسنی خاڵ همزە). ناوبراو بارزانی بوو لەگەڵ ئێمەدا هاتبوە سۆڤیەت برادەری حمدامین بوو.

*سێیەم* (خدری عولاَ بەگ)یش گوتی: (ئێمەش دەڕۆینە لای مەلا تەها لە ناوکوێلەکان، دەبینە پێشمەرگەی ئەو).

*چوارەم* (حەسەنی ڕەزاقو منداڵەکانی قادری فقیێ وەسمان) گوتیان: (ئێمە دادەنیشین بۆ هیچ لایەك ناچینو پێشمەرگایەتی ناکەین).

لە دوای گوێ گرتن لە قسەکانی ئەوان زۆرم بەلاوە گران بوو کە بەنیازن بلاَوەی لێ بکەنو هەریەکەی ڕوو لەلایەك بکەن، چونکە ئەو چەکدارانە هەمووی چەکداری سلێمان بەگ بوونو ئێستاش ئەوەندە وەڕەزبنو بلاَوەی لێ بکەن کارێکی ناخۆشە، ناچار ڕووم تێکردنو پێم گوتن: (ئەو بیروبۆچونەی ئێوە بۆی چوون بەڕای من هەڵەیەکی گەورەیەو ناتەواوەو ڕوو لە هەڵدێرە ئەنجامەکەشی توش بوونی بەلاَیەکی ترسناکەو ماڵوێرانی بەدواوەیە، ئێوە دەبێ ئەوە بزانن هیچتان ناتوانن یەك مانگ لەو شوێنانەی بۆخۆتان دیارکردوە بمێنن، لەبەرئەوەی ئێوە لەگەڵ ئەوان ناگونجێن، لەم ڕووەوە کۆمەڵێك بەڵگەم خستنە ڕوو کە لەبەرچی ناتوانن لە شوێنی تر چەکداری بکەن)، دیار بوو بڕوایان بەقسەکانی من هاتو پەسندیان کرد، لە دواییدا گوتیان ئەدی چارە چیەو چی بکەین؟ پێم گوتن: (تەنها چارە ئەوەیە بڕۆنە لای عزەتو لە

ناوبراو جیا مەبنەوەو سەنگی خۆتان سوك مەكەن، لەناو خۆتان ڕێك كەون چەند كەسێك دیاریبكەن‌و لەگەڵی بدوێن‌و پێی بڵێن، ئێمە چەند داواكاریەكمان هەیە دەمانەوێت لەگەڵت باس بكەین، بێگومان ناوبراو دەڵێت بفەرموون ئەوكاتە ئێوە مەرامی خۆتانی پێ ڕابگەیەنن‌و پێی بڵێن لە ڕووی ڕێك‌و پێكی پێشمەرگایەتی ئێمە چەكدارین لە ژێر فەرمانی مام سلێمان بەگ ڕاوەستاوین ئەویش تۆی داناوە بەسەرپەرشتی كاربۆیە بەپێویست دەزانین پێشمەرگەكان ڕێك بخرێن وەك پێویست سەرپەل‌و سەردەستەكان دابندرێن‌و لیژنەیەك دیاریبكرێت بۆ ئەوەی ئازوقەو كەل وپەلی پێشمەرگە وەربگرێت‌و چاودێری بكات، ئەگەر عزەت ڕازی نەبوو ئەوكاتە ئێوە خۆتان سەرپەل‌و سەردەستەكان دادەنێن‌و لیژنەی ئازوقەش نوێنەری ئێوەو ئەو پێكەوە سەرپەرشتی دەكەن، ئەوەیە چارەسەری ئەو كێشەیە نەك پەرت‌و بڵاوبوون‌و خۆ سووك كردن).

لە ئەنجامدا بەدیاركەوت هەموویان بەقسەكانی من ڕازی بوون‌و ڕای منیان بەپەسند زانی، هەرئەوەدەمە چوار كەسیان دیاركردن بۆ ئەوەی بڕۆن لەگەڵ (عزەت) دابنیشن‌و لەو بارەوە بدوێن، دیاركراوەكان ئەمانە بوون (ئەسعەد خلیل، حمدامین فقێ حسن، خدر عولا بەگ، حسن ڕەزاق) لە دوای ئەوەی ڕەزامەندیان لەسەر قسەكانی مندا داوایان لێكردم منیش لەگەڵ ئەو چوار كەسە بچم بۆلای (عزەت)، زۆرم هەوڵدا كە بۆیان بسەلمێنم كە پێویستی من ناكات، بەلام پێیان داگرت‌و وازیان نەهێنا، ناچار ڕازی بووم هەرچەندە دەمزانی بۆمن خراپە، چونكە ئەگەر نەچووبام لەوانە بوو بڵێن زرار ئێمەی خستەوە ژێر فەرمانی عزەتی برای، لەلایەكی تریشەوە من دڵنیا بووم كە عزەت لە سەدا سەد دەڵێت زرار ئەوانەی هانداوە كە بەوكارە هەڵبستن، كەلە ڕاستیدا من ئاگام لە هیچ نەبووە تەنها سەر ئێشیەكە بۆ من بووە، لەدوای كێشەیەكی زۆر بڕیاریان پێدام كەلەگەڵیان بچم، ڕۆژی دوایی لەگەڵیان ڕۆیشتمە سەروچاوەی ئاوی (دەنگارە) لە نزیك گوندی (جنێراوە) ئەوكاتە بنكەی پێشمەرگەكانی سلێمان بەگ لەوێ بوو، عزەت چووبووە ئەوێ لەبەرئەوەی بەشی زۆری پێشمەرگەكان نەچوبونە واجب! لەوێ لەگەڵ (عزەت) دانیشتین لە دانیشتنەكەدا كۆمەڵێك كەم‌وكوڕی‌و ناتەواوی دەست نیشان كران بەتایبەتی لە ڕووی نارێكی پێشمەرگەكان، لە سەرەتاوە (عزەت) بەڕووگرژیەوە بەداواكاریەكان

ڕازی نەبوو، نیازی وابوو توندو تیژی نیشان بدات، بەڵام کە دیتی چارنیە ئەگەر ڕازی نەبێت ئەو دەسەڵاتەی هەیەتی لە دەستی دەڕوات ناچار بوو کە ڕازی بێت لەسەر داواکاریەکانی پێشمەرگە بەڕێکخستنی پێشمەرگە وەك پێویستو بەدانانی لیژنەی سەرپەرشتی ئازوقەشەوە، هەرلەو دانیشتنەدا ڕێك کەوتن دانیشتنێکی تری فراوان بکرێ لە دەرگەڵە بۆ دامەزراندنەوەی پێشمەرگەکان لە نوێوە، ئەوانەی لەژێر دەسەڵاتی (سلێمان بەگ)دا بوون‌و(عزەت) سەرپەرشتی دەکردن، بێگومان تا ئەوکاتە بیر لە ڕێکخستنیان نەکرابووەوە. هەر لەو دانیشتنەدا بەدیارکەوت عزەت ئۆباڵی ناڕەزایی پێشمەرگەکانی خستە سەرشانی من‌و وای نیشاندا کە من ئەو خەڵکەم هانداوە لە دژی ئەو بوەستن، ئەوەیە (نەخواردی لە سمێڵان مەیی)، ناوبراو وا تێگەیشتبوو من دەمەوێت جێگای ئەو بگرمەوە کەچی نەیدەزانی کە من لەناچاری چەك هەڵگرم نەك چاوم لە پلەو پایەی ئەو بێت، ئەوەی هەست دەکرا ئەو برایە لە ڕادەبەدەر لە من نا ڕازی بوو لە خۆیەوە لەبەرئەوەی ڕاستیم لێ نەدەشاردەوە.

لە دوای ماوەیەك لە کاتی دیاریکراودا لە دەرگەڵە لە ماڵی (حمدامین فقێ حسن) کۆبونەوەی دەستنیشان کراو کرابوو، وەك زاندرا لە جیاتی (عزەت، فاخیری حمدئاغا) لەگەڵ دوو ئەندامی لیژنەی قەزا (حاجی مەلا سعید) بەرپرسی شیوعیەکانی قەزاو(حاجی حسن ئاغا) ئەندامی قەزا ئامادەی کۆبونەوەکە ببوون، لێرەدا دەبێ بپرسین ئەوە (فاخیر) لە جیاتی (عزەت) ئامادەی کۆبونەکە بوو، ئەدی ئەوو دوو کادیرەی حزبی شیوعی بەچ مەبەستێك‌و بۆچی بەشداریان کردووە؟ گومانی تێدا نییە بەشداربوونی ئەوان لەو کۆبوونەوەیە بۆ ئەوەنەبوو کۆتایی بەکێشەکە بێنن، بەڵکو بۆ ئەوەبوو تاوانی یاخی بوونەکە بخەنە سەرشانی من، دەتوانم بڵێم بەشدار بوونی هەردوو حاجیە بەکەشیدەکە لەو کۆبوونەوەیەدا هیچ پەیوەندیەکیان بەکێشەکەوە نەبوو، بەڵکو هەوڵ دەربوون بۆ پارێزگاری لە عزەت‌و تاوانی ڕوداوەکەش بخەنە ملی من‌و زیاتر نا، بۆ ئەوە بەشدار نەبوون پارێزگاری لە داوایەکانی ڕەش‌و ڕوت بکەن‌و (نوێنەرانی) چینی زەحمەتکێش بن.

لەزارگۆتەی (حەسەنی ڕەزاق)ی ناوبراو ئەوکاتە شیوعیەکی چالاك بوو گوتی: (ئێمە بەتێکڕایی باسی داوایەکانی پێشمەرگەکانمان خستبوە بەرباس‌و لێکۆڵینەوەو هۆی ناڕەزایی پێشمەرگەکانمان باس دەکرد کەچی حاجی مەلا زۆر بەگرژی گوتی:

(ئێوە لە جیاتی پێشمەرگەکانی کەڵێتەو ڕەژیکەریانو ماویلیان مەدوێن، بەڵکو ئەوان بەعزەت ڕازین لەگەڵ ئێوە نین)، حمدامین فەقێ حەسەن بەرپەرچی دایەوەو پێی گوتبوو: (ئافەرین نوێنەری کرێکارو زەحمەتکێشان دیارە پارێزەرێکی دڵ پاکی، هاتووی پارێزگاری لەمافی هەژاران بکەیت دەبێ چ بلێین بۆ ئەو هەڵوێستەی ئێوە هەتانە بەرامبەر بەخەڵکی تێکۆشەر؟ بەڕاستی ئێوە شیوعین! ماڵی ئەو کەسەم وێران بێت ئەوەی پشت بەئێوە دەبەستیو بەهیوای ئێوەیە).

ئەوەی ڕاستییە سێ کادیری حزبی شیوعی خۆیان خستە ناو کێشەیەك هیچ پەیوەندی بەئەوانەوە نەبوو، هەر لەبەر ئەوەش کە دیتیان ئەو خەڵکە بەدەسەلآتی زەبرو زەنگ ڕازی نابنو پارێزگاری ڕەنجی خۆیان دەکەن، بەشەرمەزاری دەستیان دابوە پێنوسو ڕاپۆرتێکی ڕازاوەیان نووسی بوو بۆ سەرەوە، لە جیاتی ڕاستی نووسی بوویان ئێمە گەیشتوینەتە ئەو باوەڕە، زرار ئەو خەڵکەی هان داوە دژی باوكو برای بۆ ئەوەی خۆی ببێت بەپاڵەوانی دیار، کە جێگای عزەت بگرێتەوە، کەچی باشیان دەزانی کە من ئاگام لە هیچ نەبوو، بەڵکو ڕێگام نەداون بلآوە بکەنو عزەت بەجێ بێلن.

بێگومان من ئەودەمەی ئەو ڕوداوە سەری هەڵدا دوور بووم لە ڕێکخراو، وازیشم لە پێشمەرگایەتی هێنابوو، ئەوەی جێگای پەرۆشیو نیگەرانی بوو ئەوەبوو ئەوەی فاخیرو هەردوو حاجیەکان نووسی بوویان بۆ سەرەوە ئەوانیش وەکو جاران بێ ئەوەی لێکۆڵینەوە بکەن مۆرێکی باوەڕیان بەبەڕاپۆرتی نێردراو نابوو، کە زرار دژی باوكو برای وەستاوە!

حاجی مەلا وەك بەرپرسی قەزا سەرەوەی ئاگادارکردبوو، نووسیبوی (مادام دۆستێکی وەك عزەتمان هەبێت لە دەرگەڵە پێویستمان بەرێکخراوی حزب نابێت لەوێ). ئەوە بوو بیروڕای هەڵسوڕێنەری کاری حزبی شیوعی قەزای ڕواندز، ئەوەبوو بیرو بۆچوونی کادیری حزبو ڕێکخراوی فراوانی چالاك بکرێتە قوربانی تاکە کەسێك!! کە بەڕاستیش کرایە قوربانی.

ئەوەی بەدیارکەوت ئەو کادیرانەی ناویان هاتووە هەر لە زووەوە بەڵێنیان بەعزەت دابوو کە لەڕێگای حزبەوە زرار ناچار دەکەن ملکەچ بێت کە چۆن بتەوێت.

لەوکاتانەی ئەو تەنگەو چەڵەمەیە لەئارادا بوو زۆری پێ نەچوو دەنگوباس پەیدا بوو کەوا مەلامستەفا دێتە دەرگەڵەو دەڕواتە(هەندرێن) لەوێوە سەیری(کوڕەك) دەکات، بەنیاز بوون هێرشێك بکەن بۆ گرتنی چیای (کوڕەك)، ئەو ماوانە چەکی تازە گەیشتبوو وەك (هاوەن‌و دۆشکەو فرۆکە شکێنەکان‌و تانك شکێنەکان) ماوەیەك بوو مەشقیان لەسەر دەکرا.

## شەڕی کوڕەك لە هاوینی ١٩٦٥ دا

بۆ داڕشتنی بەرنامەی هێرش بۆ چیای (کوڕەك) مەلامستەفا ڕۆیشتە چیای (هەندرێن) لەوێوە سەیری چیای (کوڕەك)ی کردبوو، لە دوای گەڕانەوەی لە دەرگەڵە چاوی کەوتبوو بەفەرماندەکانی پێشمەرگەی باڵەکایەتی دەربارەی گرتنی چیای (کوڕەك) دوابوو، ئەوەی زاندرا(فاخیرومەلا ئەمین) بەڵێنیان دابوو کە بەو ئەرکە هەڵبستن‌و (کوڕەك) بگرن.

بارزانی دوو ڕۆژ لە دەرگەڵە مابووەوە لە ناو گەڵی ژورو لەکاولە ئاشی (قادری وەسمان)ی جێگای بۆ ساز کرابوو، وەك لەسەرەوە باسم کردوە ئەوکاتە من وازم لە پێشمەرگایەتی هێنابوو، بەڵام لەدوای ئەو مشت‌و مڕەی نێوان عزەت‌و پێشمەرگەکان سەرەڕای هەوڵدانم بۆ چاکە کەچی هەستم کرد لە پێشان زیاتر کەوتونەتە دژایەتیم لەبەرئەوە بەڕاستم زانی لەپێشمەرگەکان جیا نەبمەوەو لەگەڵیان بم ئەگینا کلاوێکم لەسەری دەنێن. ناچار ڕۆیشتمە بنکەی پێشمەرگەکان لەسەروچاوەی ئاوی (دەنگارە) لەوکاتەوە فەرمان درا گشت هێزەکان بڕۆنە (دۆڵی ئاکۆیان) ئێمەش ڕۆیشتین، شەوێك لە گەلی (کەرەك) ماینەوە بۆ ڕۆژی دوایی چوینە سەروچاوەی ئاوی (مێگر) ئەو ئاوەی بۆ ڕواندز دەڕۆیشت.

بەپێی ئەو زانیاریانەی دەستم کەوتن بارزانی کەلە هەندرێن گەڕابووەوە لایدابووە دەرگەڵە، وادیارە خێرومەندەکان باوکمیان هاندابوو بەبارزانی بڵێت کە زرارو ئەوانەی لە واجب یاخی ببوون نارەزامەندیان نیشان دابوو چەك بکرێن‌بەو بیانوە گوایا مەترسی ئەوەیان لێ دەکرێت بڕۆن ببنە جاش، کەچی ئێمە ئاگاداری هیچ نەبووین‌و لە ڕووبەڕووی دوژمن وەستابووین. ئێمە لە مێگر داندراین‌و ئامادەبووین

بەونیازەی لەکاتی دیاریکراودا هێرش ببەینە سەر سەنگەرەکانی سوپا لە دەوروبەری شاری ڕواندز بەشێوەیەکی تایبەت سەنگەرەکانی (مل تۆکر)، ئەوەی بەدیارکەوت ئەوانەی بەڵێنیان دابوو (کوڕەك) بگرن(فاخیرو مەلا ئەمین) بەڕێ کەوتن بۆ سەر(کوڕەك) هەمان شەو ئێمەش ڕۆیشتینە بن ئەو سەنگەرانەی بۆمان دیارکرابوون، بڕیار بوو بەرەبەیان بەتۆپ لێیان بدرێت ئەوجا هێرش بەرینە سەریان، بەلاّم تۆپەکان نەگەیشتنە نیشانەکانو زۆریشی نەمابوو ئێمەش بەهیلاك بچین، هەرئەوەندەمان بۆکرا بەنهێنی بگەڕێینەوە دواوە.

یەکەم شەو هێرش بەرەکان(فاخیرو مەلائەمین) توانیان دوو سەنگەری پێشەوە لەگەڵ کانیاوەکەی بن (کوڕەك) ئەوەی دەکەوێتە دیوی (خلیفان) بگرن، وەك باس کرا ئێمەش بەدرێژایی شەو چاوەڕوانی تۆپ بووینو تۆپەکانیش نەگەیشتن ئەوەی بەدەستمان کەوت تەنها هیلاکیو ماندوو بوون بوو، کاتێك لە دەنگی قڕەو کێشەیەك بەخەبەر هاتم بەپەلە ڕۆیشتم دیتم یەکێك بەناوی (خاناودەل) لەگەڵ مقدم (سعید مەتەر) کەوتۆتە کێشەو دەڵێت: (من نێردراوم ئاوی مێگر تێك بدەم نابێ ئاو بۆ ڕواندز بڕوات)، دیارە پیاوێکی گێلو نەفام بوو، لەگەڵ ئەو چەکدارانەی لەگەڵی بوون خۆیان دەپچڕیەوەو دەیان گوت: (ناڕۆین تا سەروچاوەی ئەو ئاوەی بۆ ڕواندز دەڕوات تێك نەدەین ئەوە فەرمانی بەکرئاغا)یە! (سعید مەتەڕ) بەفەرمانی بارزانی کرابوە فەرماندەی ئەو هێرش بەرانەی دۆڵی ئاکۆیانو خاناودەلیش زۆر بەبێ ڕێزی لەگەڵ ئەو پیاوە دەدوا، ناچار بووم زۆر بەتوندی پێم گوت: (هەر ئێستا لێرە نەڕۆی چەکت دەکەم بەپیل بەستیش بەڕێت دەکەمەوە بۆ لای بەکرئاغا، مادام دەڵێی ئەو ناردومی بڕۆ بابەخۆی بێت سەروچاوەی ئاوی شارێك تێك بدات)، کەزانیان ئێمە لێمان توند کردن بەملکەچی گەڕانەوە. ڕۆژی دووەم شەڕێکی دژوار بەردەوام بوو، بۆ ئێوارە فاخیر نامەیەکی نووسی بوو بۆ عزەت گوتبوی: (تکایە بەپەلە کاك زرارو ئەو چەکدارانەی لەگەڵیەتی بنێری بۆ ئەوەی بێنە پاڵپشتیمان ئەگینا حاڵمان لەوپەڕی شلۆقیو پەرێشانی دایە)، عزەت نامەکەی فاخیری نیشاندام، هەرئەوەدەمە هەستم کردو زانیم ئێمە بۆچی دەناردرێینە سەرکوڕەك! یەکەمیان ئەگەر نەچین لەسەرمان بکەنە بیانوو، دووەم بەڵکو هەندێکمان لێ بکوژرێن. ئەوکاتیش تاوانەکە بخرێتە سەر(زرار)، خۆم دەمتوانی نەڕۆم لەبەرئەوەی ئێمە دانەندرابووین بۆ سەر(کوڕەك)

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو چلو سێ پێشمەرگانەی لەگەڵم بوون بەرێ کەوتین بۆ سەر(کورەك) من دەمزانی ناردنی ئێمە تەنها بۆ ئەوەبوو پێشمەرگەکان توشی هیلاکەت بن، شەو بەسەرکەوتین لەرێگا لاماندایە لای (ملازم خدر دەباغ) کە بەرپرسی ئەو تۆپە بوو کە تۆپ بارانی سەنگەرەکانی سەری (کورەك)ی دەکرد، لە دوای پشویەکی کورتو حەسانەوەیەك رۆیشتین لەرێگا دەگەیشتینە بریندارو کوژراو دەیان بردنە خوارەوە، لەشوێنێك دیتمان (حسن جارولّلا) داندرابوو برێندارێکی وابوو هیوای ژیانی لێ نەدەکرا، بەلاّم هەر زوو رێو شوێنم بۆ پێشمەگەکان دانا لەگەڵیان کەوتمە دوانو پێم راگەیاندن دەبێ بزانن چۆن بەرگری لە خۆتان دەکەن، ئەگەر ئامۆژگاریەکانی من جێ بەجێ بکەن بەڵێنتان پێ دەدەم بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە، ناهێڵن مەرامی نەیاران بێتەدی، دەبێ ئەوە بزانن ئێمە نێردراوین بۆ ئێرە بۆ ئەوەی زۆربەمان نەگەڕێنەوە، بەلاّم ناهێڵم بەئاوات بگەن! بۆ ئەو مەبەستەم نەخشەیەکی زۆر رێکم دانا بۆ ئەوەی پێشمەرگەکان لە هیلاکو زیان دووربنو بتوانین دەست لە دوژمن بوەشێنین، ئەویش بەوە بەدیارکەوت ماوەی هەشت رۆژ لەوێ مانەوە لە رووبەرووی دوژمن وەستا بووین جێگامان دیاربوو نامەوێ باس لە دەستو بردەمان بکەم، چونکە پەرێزمان لەبەر چاوبوو.

بێگومان ئاشکرایە کورەك لە سەرەوە زۆر ناهەموارە باسی لێ ناکرێت، ئەوەندە رۆژانەی لەوێ بووین تەنیا شەوان دەمان توانی لە پەنایەکان دەربکەوینو بجولێینەوە، دەبوایە بەدرێژایی رۆژ لەناو سەنگەرەکانمان بەنهێنی خۆ بپارێزین، ئەوەندە لە سەنگەرەکانی سوپاو جاش نێزیك بووین کێلە شاخێك بەینمان بوو، ئەوان لە ناو سەنگەرە داپۆشراوەکان بوون، ئێمەش لە پەنا کێلکە شاخو بەردەکان خۆمان دەبواردو پەنا دەدا هەتا تاریك دا دەکەوت، گومانی تێدا نییە ئەوەی بەرۆژ لەشوێنی خۆی دەربکەوتبایە بێ شك لێی دەدرا ئینجا چ هی ئێمە بووایە چ هی ئەوان بووایە بەساغی نەدەگەراوە بۆ شوێنی خۆی!.

ئەوەی دیاردە بوو هاورێیانی شیوعی زیانێکی زۆریان پێ کەوت، کۆمەڵێك چەکداریان شەهید کران ئەویش ئەوە دەگەینێ کە گیانی خۆبەخت کەریان زیاتر بوو، دووەم لە شەڕ شارەزا نەبوون، راوێژکارەکانیان وەك پێویست ئەوەندە زانا نەبوون!؟...

لەرۆژانی شەڕە دژوارەکەی (کورەك) لەوکاتەی ئێمە لەسەرەوە بووین رۆژێك لەگەڵ ئەو برادەرانە لە پەنایەك دانیشتبووین (عریف عوسمان،حمدامین هریری، خدری عولاّ بەگ، حمدامین فقێ حسن) لە ناکاو فڕۆکەیەکی جۆری (لووشین) گەیشتە سەر(کورەك)و جارێك بەسەریدا سوڕایەوەو بەرمیلێکی فڕێدا خوارەوە هەر لەهەوا دوکەڵی لێ دەردەچوو، گوتیان ئەوە هات تیزابەئاگادارین، بەرمیلەکە زۆر سەیر دەهاتە خوارەوە، بەلاّم باش بوو کەوتە دیوی ڕواندز زیانی نەبوو. ڕۆژی دوایی بەیانی زوو دوو فڕۆکەی (مێك) بەرەو بناری (کورەك) شۆڕ بوونەوە لە دیوی ڕواندز کە سەیرمان کرد دیاربوو شەڕ بوو فڕۆکە جەنگیەکان لە شوێنی شەڕەکەیان دەدا، زانیمان شەڕەکە لەگەڵ پێشمەرگەکانی ئێمەیە، ئەو پێشمەرگانەی ئێمە کەلە خوارەوە بوون ڕێگایان لەسوپا گرتبوو نەیان دەهێشت بەسەر بکەون بۆ(کورەك) شەڕەکەش زۆر گەرم بوو، لەگەرمەی ئەو شەڕەدا بینیمان جاشەکانی ناو سەنگەرەکانی (دارە هیشك) لەسەنگەرەکانیان دەرکەوتن بەنیازبوون بڕۆن ڕێگا لەپێشمەرگەکان بگرن‌و لەگەڕانەوەیاندا لێیان بدەن، بەلاّم ئێمە کە ئەمەمان بینی یەکسەر بۆیان دابەزین بەنهێنی ڕێگامان لێ گرتن، بەلاّم بەداخەوە پێش ئەوەی بگەنە لای کەمینی ئێمە هەستیان کردبوو کە ڕێگایان لێ گیراوە بۆیە زوو گەڕانەوە مۆڵگەکانیان، پێشمەرگەکانی ئێمە لەدوورەوە دیاربوون دەگەڕانەوە (مێگر) بریندارێان پێ بوون، زانیمان کەوا (عزەت) شەو ڕۆیشتبوە سەر ڕێگای ئەو هێزەی سوپا، ئەوەی لە ڕواندز بەنیاز بوون سەر بکەونە کورەك لەو شەڕو لێکدانەدا شەهیدێك‌و دوو بریندار هەبوون، تا دەهات شەڕ گەرمتر دەبوو، حکومەت هەوڵی دەدا کورەك لەدەست،نەدات ئێمەش دەمانویست بیگرین، ئەمەش مەترسی لەدواوە هەبوو، ڕۆژی دوای هێرشەکەی عزەت بۆ بناری کۆرەك لە ژێر کێلە شاخێك دانیشتبووم تەواو هەستم بەمەترسی نەمان دەکرد، بۆیە بیرم لەوەکردەوە نامەیەك بنوسم بۆ دایکی شادومان بەزمانی ڕوسی هەندێك ئامۆژگاری بکەم، هەر ئەو کاتە کورتە نامەیکم نووسی‌و لەناو دەفتەری ڕۆژانەکەم دانا لەبەر ئەوەی لەناو ئاگری مان‌و نەمان دابووین هەموو کات چاوەڕوانی گوللەیەك بووین پێمان بکەوێت‌و گیان لەدەست بدەین.

...یك پێش ئەوەی کوڕەك بەجێ بهێڵین و بگەڕێینەوە سەر ئاوی مێگر ئاگادار کراین کەوا ڕەئیس (کمال مفتی) لەگەڵ پێشمەرگەکانی دێنە شوێنی ئێمە، بەڵێ شەو بەسەرکەوتن لەگەڵ (خدری عەولا بەگ) ڕۆیشتینە بەخێرهاتنی، ئەوەی جێگای خۆشحاڵی بوو ڕەئیس (کمال) بەکورتی دوا، بەلاّم دوانێکی لێ وەشاوەو بەنرخ و بەسەنگ قسەکانی جێگای ڕەزامەندیمان بوو، لەگەڵ گەیشتنی ئەوان ئێمە دابەزین. هەر لەدوای ئێمە ئەوان هێرشێکی نەبەردانەیان کردبوە سەر سەنگەرەکانی سوپاو زیانێکی زۆریان بەسوپاو جاشەکان گەیاندبوو، بەلاّم ئەوەی جێگای پەرۆشی بوو هاوەنێك بەناو پێشمەرگەکان کەوتبوو دە پێشمەرگەی شەهید کردبوو.

بەر لەوەی لە کوڕەك دابیەزین نامەیەکم دەست کەوت بۆ (بێجان جوندی) بەڕێ کرابوو کە تیایدا نوسرابوو:(ئازیز بێجان داوای پارەت کردوە ئەدی ئەو پارەیەی بارزانی بۆ مەلا ئەمین و فاخیرو عزەتی ناردوە بەشی ئێوەشی لەگەڵدا نییە؟ بۆ پێتان نەدراوە؟ داوایان لێ بکە پارەکە زۆرە هەزارو پێنج سەد دینارە).

ئەوەی دیاربوو پارەی باس کراو بووە خۆراکی ماسی و بێ دەنگی لێکرا، پێش ئەوەی (دۆڵی ئاکۆیان) بەجێ بهێڵین ڕۆژێك بەفاخیرم گوت: (هاوڕێ ئەو پارەیەی بارزانی بۆی ناردن بەناوی تۆو مەلا ئەمین و عزەت کوا چی بەسەر هات ؟) ناوبراو بێ دەنگ بوو دیسان گوتم: (ئازیز لۆمەی مەلا ئەمین و عزەت ناکرێت، بەلاّم نابێت تۆ بچیتە ڕیزی ئەوانەوە تۆ باوەڕ پێکراوێکی شیوعی لەگەڵ ئەوان جیاوازیت هەیە). ناوبراو دیاربوو کەپەست بوو هیچی بەدەستەوە نەما ئەوەندەی گوت: (تکایە دەست مەخەرە ناو ئیش وکاری من حەقی ئەوەت نیە من محاسبەبکەیت، تۆ لە حزب نەماوی!) لەدوانەکەی فاخیرو لالوتیەکەی پێوە دیار بوو کە بزاقێك ڕوویدا بێت دژی من، کاتێك شتەکەم بۆ(خدرعولاّ بەگ) باس کرد دیاربوو ناوبراو ئاگاداری جموجۆڵی (فاخیرو عزەت) بووە لەوکاتەی (بارزانی) لە دەرگەڵە بووە هەندێ شتی بیستبوو ئەو بەمنی نەگوتبوو تەنیا ئەوەندەی پێ گوتم: (کاکە زرار وشیاری خۆت بەنیازێکی ناپاك بەرامبەر بەتۆ هەیە).

دووەم ڕۆژ بوو لە (کوڕەك) دابەزی بووینە سەر ئاوی (مێگر) پێمان ڕاگەیەندرا کەوا باوکم بریندارە لە نەخۆشخانەی ناو گەلی (ئاکۆیان) کەوتوە، وەك زاندراوە لە دەرگەڵە هاتبوو بۆ ئاکۆیان لە ڕێگا لە وەلاّخ کەوتبوو، بێگومان بەپەلە ڕۆیشتم

بۆلای لەویٚ کە بینیم بەبرینداری زۆر نیگەران بووم، بەلاّم زیاتر بەوە نیگەران بووم کە پێی گوتم،(بیستم کە نیازتان وابووە بڕۆنە ناو حکومەت‌و بێن بەجاش، بەلاّم سەعید مەتەڕ ڕێگای نەداون!) پێم گوت: (باوکی بەڕێزم چۆن باوەڕت کردوە کە من شتی وابکەم! ئەوەندە ساڵەیە من ئەو ماڵوێرانیە دەکەم ئەوجا بچم چەکی خیانەت هەڵگرم ! تۆ چەند هەوڵت دا چەکم لەگەڵ ئێوە هەڵنەگرت، ئێستا بڕۆم چەك بۆ بەعسی کورد کوژ هەڵبگرم!!) لەدوای ئەوەی لەگەڵ باوکم دوام ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی: (ئەوەشیان پێ کردم!) ماوەیەك لەگەڵی مامەوە ئەو کەسانەی لەگەڵی هاتبوون (حەسەنی عەیشە قوچێ) پیاوێکی دڵ پاك بوو بەتایبەتی لەگەڵ من‌و ئەوەی بەبەردەوامی لەبەرچاو بوو لەوکاتەی لە(حافیز) گیرابوو چۆن من بەهانایەوە چووم، بەنهێنی پێمی گوت: (زوو بگەڕێوە منداڵەکانت شپرەزەو نارحەتن!) لەویٚ چاوم بە(حسێنی قوتەسوری) کەوت کە بریندار بوو زۆر شوڕ دیاربوو، بەلاّم وورەی زۆر بەرز بوو، شەو گەڕامەوە بنکەکەمان لە ناو گەلی(مێگر) لەویٚ بەرپرسەکانم ئاگادار کردن کەوا بەیانی دەگەڕێمەوە بۆ (دەرگەڵە) منداڵەکانم داوایان کردووە کە بڕۆمەوە دیارە پێویستیان پێم هەیەو کەس نیە چاودێریان بکات، ڕۆژی دوایی گەڕامەوە کە گەیشتمەوە بەڕاستی دیتم منداڵەکانم نەك هەر لەشپرەزەیی‌و پەڕپوتی دابوون بەپەرۆشەوە ئەوەی بەسەر ئەو منداڵانە هاتبوو مەگەر هەرخۆم بزانم چیان پێکرابوو! لە جیاتی دڵدانەوەو یارمەتی دان سەدان بەندو باڵۆرەی جۆراوجۆریان بۆ هەڵبەستبوون، ئافرەتێکی بێگانەی بەستەزمان مەگەر هەرخۆی بیگێڕێتەوە ئەوماوەیەی من لەویٚ نەبووم چیان بەسەر هێنابوو چۆن ئەزیەت دراوەو لە چ دەردەسەرییێك ژیاوە!

ئەوەی نیگەرانی بوو لەوکاتەی (بارزانی) هاتبووە (دەرگەڵە) دایکی منداڵان هەوڵی دابوو ناوبراو ببینیٚ، بەلاّم ڕێگایان نەدابوو ببینیٚ، دەنگ‌و باس بەشێوەیەکی یەکجار بەرفراوان بلاّوکرابوەوە کە گوایا زرارو ئەو کۆمەڵە چەکدارەی یاخی ببوون بەنیازن بڕۆن ببنە جاش، بۆیە لەوانەیە چەك بکرێن ئەو پڕوپاگەندە پڕوپوچە نا لێوەشاوەیە دایکی شادومانی ئاڵۆز کردبوو، لەوکاتەی داوای کردبوو چاوی بە(بارزانی) بکەوێت پێیان گوتبوو: (ئەوە زرار چی کردووە، سلێمان بەگ‌و عزەت ئەوەندەی لیٚ ناڕازین؟) دایکی (شادومان)یش گوتبوی: (زرار هیچی وای

ئەکردەوە باب‌و برای ئەوەندە لێی ناڕازی بن ئەو قسانە هەمووی هەڵبەستە). بێجگە پێی گوتبوو: (ئەدی بۆ داوایان لە مەلامستەفا کردووە زرارو ئەوانەی لەگەڵینی چەك بکرێن، لەبەرئەوەی مەترسیان لێ دەکرێت برۆن ببنە جاش، بەلام بارزانی گوتویەتی زرار نابێتە جاش هەرکاتێ حزبا وی بوە جاش ئەویش دەبێتە جاش).

لەدوای ئەو بەسەرهات‌و کێشەیەی بینیمان زیاتر بۆم ڕوون بوەوە کەو بەرهەڵستیەکی توند دەکرام لەلایەن ئەوکەسانەی لە دەسەلاتی خۆیان دەترسان نەوەك جێی پێیان لەناو کۆمەڵ‌وحزب لەق ببێ، وایان دەزانی من ڕێگام لێگرتوون. لە دوای ئەو بەرهەڵستکاریەی کەسانی لاواز بەڕاستم زانی خۆم دووربگرم بۆ ئەوەی ئەوان بزانن‌و تێبگەن من کۆسپ نیم لە پێش مەرامی ئەوان، بەڵکو کردەوەو هەڵسوکەوتی خۆیان کۆسپەن، بەڵێ لە پێشان هەولم دەدا کە تەنها ڕاستی ڕێڕەوو پێشڕەو بێت، بەلام ئەوەش خەون بوو، چونکە ڕاستی ئەوکات تەنها مل شکان بوو!.

ماوەیەکی درێژ ئارەزووم بوو بەڵکو یەکێك لە ئەوانەی سەرەوە پەیدابێ بۆ ئەوەی هەرنەبێت هەندێ شتیان پێ ڕابگەیەنم، بەڕێکەوت ڕۆژێك لەگەڵ (عریف یونس) بووم لە ناو گوند لە نزیك مزگەوت بینیمان (ئەبوحکمت) لە سەرەوە دەهاتە خوارێ زۆر دڵخۆش بووم بەوەی کە لەگەڵی دەدوێم، چونکە بەڕاستی زۆر بێزار ببووم کەچی زۆر سەیر بوو ئەو پیاوە گەیشتەلامان چاك‌و چۆنی لەگەڵ (یونس) کردو ڕووی لەمن وەرگێڕاو ڕۆیشت، (عریف یونس) بەسەر سوڕمانەوە گوتی (ئەوە چی بوو ئەو پیاوە بۆ وای کرد؟) وا بەدیار کەوت (ئەبو حکمت) پێش ئەوەی چاوی بەئێمە بکەوێت لای (عزەت)ی برام میوان بووە ئەوەی زاندرا ناوبراو هەندێ گلەیی کردبوون دەربارەی من‌و بە(ئەبوحکمت)ی گوتبوو(پێشمەرگەکانی لە واجب یاخی ببوون بەقسەی زرار بوو ئەو هانی دابون) (ئەبوحکمت)یش بەڵێنی پێدابوو کە غەمت نەبێت ئێمە زرارت بۆ تەمبێ دەکەین لەڕێگای حزبەوە، ئەوەش لە یەکێك بیسترا لەکاتی نان خواردنی نیوەڕۆ لەگەڵیان دانیشتبوو (ح.ح) ئەو بەرهەڵستیەی لەمن دەکرا بەزۆری لە دوای ناڕەزایی پێشمەرگەکانی (دەرگەڵە) بوو، ئەگەرچی دەشیانزانی من لەو کارە دوور بووم، بەلام کردیانە بیانوو بۆ بەربەرەکانی من بەو نیازەی دوورم بخەنەوە لە کۆمەڵ‌و کۆمەڵگا! خەڵکانی ناڕازی بەگەف‌و زەبرو زەنگ هەر ماوەیەك گوێڕایەڵ دەبێت هەرکاتێك بۆی ڕێك کەوت ڕادەپەڕێ‌و ڕازی نابێت.

زستانی ساڵی (١٩٦٥) بۆمن زستانێکی ساردبوو کارو پیشەم دارکێشان بوو باربەرم نەبوو بەیانیان (بیورو گوریس)م هەڵ دەگرتو بەسەر دەکەوتمە سەر بەرزاییەکانی چیا داری سوتانم دەهێناو بەشان دەمان کێشایەوە بۆ ماڵ، جیا لەو ئەزیەتو ماندوبوونەش ئەوەندە غەمم پێی نەدەخوارد ئەوەندەی جەنگی دەرونیان لەگەڵ دەکردم، بەشێوەیەکی تایبەتی کادیرانی شیوعی قەزای ڕواندز بەپشتیوانی (نجم الدین مامۆ، فاتیح ڕەسول)، بەلاّم کەزانیان بەو ڕەفتارانەی ئەوان نایمە ملکەچیان ناچار داوایان کرد لەگەڵیان دابنیشم، لە سەر داوای (فاتیحو نجم الدین) لەگەڵیان دانیشتم، بەلاّم دانیشتنە کە بێ سوود بوو، لەبەرئەوەی ئەوان دەیانویست هەرچییەکی ئەوان گوتیان منیش بڵێم ڕاستە، کەچی لە ڕاستیش دوور بوو، دوا بەدوای ئەو دانیشتنە (نجم الدین) داوای کرد جارێکی تر لەگەڵم دابنیشێ لە قوتابخانە لەماڵی ئێمە دانیشتین ناوبراو زۆر بەتوندی هەوڵیدا من پێی بڵێم فەرمانەکانتان ڕاستن، بەلاّم زانایانە وەلاّمم دایەوەو پێم گوت: (تۆ پێویستت بەفێربونی مارکسیەت هەیە هێشتا زۆر ساوای!) دیاربوو ئاڵۆز بوو بەپەلە هەستاو ڕۆیشت. بەو هەوڵسوکەوتەی لەگەڵم دەکرا زۆری ئاڵۆزو نیگەران کردبووم، ناچارکرابووم بیرلەوە بکەمەوە کە هەلێکم بۆ هەڵبکەوێتو بگەڕێمەوە (ڕواندز) بەڵکو بتوانم کارێك بدۆزمەوە بۆ بەخێو کردنی منداڵەکانم، کە زانیان نیازێکی وام هەیە تەنگاوبوون لە پێش هەموویانەوە (عزەت) لەبەر ئەوەی دەیانزانی ڕۆیشتنی من لە دەرگەڵە دەبێتە شکستیو گۆڕانکاریەکی ناسازو زیانێکی بەرچاو، ئەوەندەم زانی (ڕەئیس کمالو ملازم عبدالرحمن) بەپەلە هاتنە لامو گوتیان: (بەهیچ شێوەیەك ڕازی نابینو ممکین نابێت تۆ بڕۆیت نە ئێمە ڕازینو نەحزبیش ڕازیە بۆیە ڕێگات نادەین!) گوتم: (من ئێستا حزبی نیم لە مێژە پەیوەندیم نەماوە لە سایەی هەڵوێستی کادیرەکانتان، پێشەکی ئێوە لە هەڵوێستی کادیرەکانتان ئاگادارینو بزانن چیان کردووەو چی دەکەن لەگەڵ ئەوەشدا ئێوەش پاڵپشتیان دەگرن لەو خراپەکاریەو هەڵوشانەوەی ڕێکخراو لە دەرگەڵە، ئەوجا ئێوەش هاتوون بەناوی حزب لەگەڵ من دەدوێن! بەڕاستیتانە ئێوە بەپەرۆشن بۆ ئەو حزبەی بەناوی دەدوێن؟ ئەگەر بەپەرۆشن بۆ چاودێری کادیرەکانتان ناکەنو بزانن چی دەکەن؟ بەتایبەتی حاجی مەلاو حاجی حسن ئاغا ئەو ڕێگایەی ئەوان گرتویانەو لەسەری دەڕۆن

... بەرەو هەڵدێرەو توشی کۆسپی گەورە دەبن‌و ئەوکات چارە کردنی زۆر زەحمەت دەبێت، زۆر شتی تریشم خستە بەردەمیان‌و نەیاتوانی زیاتر بدوێن).

ئەوەی زاندرا باوکم گوێ بیستی ئەو دەنگ‌و باسە ببوو کە من دەمەوێ برۆمە رواندز، ناوبراو زۆر تەنگاو ببوو لەبەر ئەوەی دەیزانی من لەوێ برۆم پێشمەرگەکان پەرت‌و بلاو دەبن‌و توشی دژوارترین ئالۆزی دەبن، بەخۆشیان ئەو رووەیان نەبوو پێم بلێن مەرۆ لەبەرئەوەی ئەوەندەیان بێزار کردبووم هەموو شتێکم لەبەرچاو کەوتبوو، لەئەنجامی بلاوبونەوەی دەنگی رۆیشتنی من ئێوارەیەك کۆمەڵێك لەو خزمانەی خۆشم دەویستن پەیدا بوون (خدری عولا بەگ، وەسمانی قادری فقێ وەسمان، قادری حمدئاغا، حەسەن رەزاق) بەناوی خزمەکانی تریش داوایان لێکردم بەجێیان نەهێڵم‌و نەرۆمە (رواندز) لەسەر داوای ئەوان بەڵێنم پێدان لەگەڵیان بمێنم هەرچەندە لەبارەی ژیان‌و گوزەرانیش زۆر خراپ بووم‌و لەوپەڕی شپرەزەیی دابووم، لەگەڵ ئەوشدا بۆ رەزامەندی ئەو کۆمەڵە خزمە رازی بووم بمێنمەوە. ئەوەی دەمەوێت دیاری بکەم ماوەیەکی زۆر لەناوگێژاوی ئالۆزی‌و دڵتەنگی‌و نیگەرانی دەسورامەوە، ئەوکاتانە بەزۆری خەریکی نوسین بووم، بەرنامەیەکی فراوانم لەبەردەست بوو بۆ نوسینەکانم جیا لە نوسینی بیرەوەریەکانم بەم نوسینانەوە خەریك بووم (دەرگەڵەو بنەماڵەی میرەکان، یادنامە، راوو راوشکاری لەکوردستان، رێکخستنی هەڵبەستەکانم، چەند پارچە چیرۆکێك) بێگومان هەڵبەستەکانم زۆربەیان دەربارەی بارودۆخی ئەوکاتە بوون هەندێکیان تۆمار کرابوون بەتەسجیل لێ دەدران هەست دەکرا هەندێك لە کادیرەکانی شیوعی پێی پەست دەبوون وایان دەزانی باسی ئەوانە!.

## داستانە ناوادارەکەی هەندرێن لە ئایاری ١٩٦٦دا

وەك لەسەرەوە دیارکراوە لەسەرداوای خزمەکان ڕازی بووم لەگەڵیان بێنمەوەو لێیان جیانەبمەوە، بەڵام بەلاپەڕگە دانیشتبوم لەدەرگەڵە، لەکۆتایی مانگی (١٩٦٦/٤)ڕۆژێك چاوم بە(شێخ علی بەرزنجی) کەوتو لەگەڵی دوام، لەدوای دوو ڕۆژ ناوبراو لەگەڵ (ڕەئیس کمال نعمان) هاتنە لام لەو دانیشتنەدا داوایان لێ کردم بۆ یادی یەکی ئایارو ژن گواستنەوە بۆ (ملازم ڕیاز) لەگەڵیان بڕۆمە دەربەندی (ڕایات) ئەگەرچی دڵشکاوو ناڕازی بووم لێیان، بەڵام نەمتوانی دڵی ئەو دوو پیاوە بەڕێزە بشکێنم، پێویستیش بوو لەو دوو ئاهەنگەدا بەشداربم، یادی یەکی ئایار جەژنی کرێکارانی جیهان نەدەبوو بەشداری نەکەم ئەوی تریان ژن گواستنەوە بۆ ملازم (ڕیاز) کە پیاوێکی عەرەب بوو لە شەڕی (کوڕەك) چاوێکی لەسەردانابوو، هەردەبوایە بۆ ئەویش بڕۆم، چونکە بەڵێنم پێدابوون کە بەشداری ئاهەنگەکە بکەمو لەکاتی دیاریکراو لە دەربەند ئامادەبم.

ئەوە بوو ڕۆژی (١٩٦٦/٤/٣٠) چومە(دەربەند) بەڕێکەوت ئێوارەی هەمان ڕۆژ لەچایخانەی (مستەفا سلێمان) لەگەڵ یەکێ لە کادیرەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (سەدیقی هەنجیری) یەکترمان ناسیو لەگەڵ یەکتر کەوتینە گفتوگۆ، ناسینی ئەو مرۆڤە بۆتە ڕۆژێکی یادگاری هەمیشەیی لەلای من، چونکە ئەو پیاوە ڕۆڵەیەکی هەڵکەوتوی ڕۆشنبیری کورد بوو، تا بڵێی ووشیارو پێگەیشتوو بوو، نزیکەی دوو کاتژمێر بەیەکەوە دانیشتین، دەربارەی زۆر کێشە دواین بەتایبەتی بەسەرهاتەکانی سەردەمی (کۆماری مەهاباد) دیاربوو لە زۆر شت ئاگادار بوو، لە کۆتاییدا بەڵێنمان ئەوە بوو پەیوەندیمان بەردەوام بێتو سەردانی یەکتر بکەین. ئەوەی جێگای داخە ئەو تێکۆشەرە بەدەستی بکوژانی ئێرانی شوێن بزر کرا.

شەو لەدەربەند مامەوە، بەیانی لەکاتی دیاریکراودا هەمووومان ئەوانەی بانگ کرابوون لەگازینۆی (محمد گەردی) ڕواندزی یەکترمان گرتەوە، بەشی زۆری بەشداربوان لێپرسراوانی هێزی پێشمەرگەی (هەندرێن) بوون لەگازینۆی ناوبراو کورتە یادێکی جەژنی (یەکی ئایار)کرایەوە، (شێخ علی بەرزنجی) کورتە دوانێکی

لەو ڕوەوەدا، لە دوای ئەو یەك دوو برادەری تریش قسەیان کردو باسی جەژنی کرێکارانیان کرد، لەدوای نان خواردنی نیوەڕۆ دەست کرا بەئاهەنگی دووەم ئەویش گواستنەوەی بووك بوو بۆ ملازم (ڕیاز) بەشداربوان (شێخ علی، فاتح رسول، فاخیر مێرگەسۆری، ڕەئیس کمال نعمان، عزەت سلێمان بەگ، ملازم عزیز، ملازم عبدالرحمان)و زۆری تریش، لە دوای بووك گواستنەوە ئێوارە بلاوەی لێکرا هەندێکمان ڕۆیشتینە (زینوێی شێخی) بۆ دیدەنی (شێخ لەتیفی شێخ محمود) ناوبراو لە مالّی (شێخ عبیداللە) میوان بوو، ئەوانەی شەو لە (زینوێ)مانەوە (حمدئاغای مێرگەسۆری، فاخیرو عزەت)منیش لە سەر داوای (شێخ لەتیف) مامەوە بۆ بەیانی نیوەڕۆ لەلای (حاجی سەید مینە)ی زینوەیی بووین لە مەزرای پشتی زینوێ ئێمەشیان لەگەلّ خۆیان برد لەسەر داوای (حاجی سەید مینە) ،ئەوەی جێگای ڕەزامەندی بوو ئەو ڕۆژەمان زۆر بەخۆشی ڕابوارد، سەرەتای بەهار لەو مەزرایە سەوزە لەژێر ڕەشمالّی خاوەن ئاژەلّەکان بووینو وورده وورده باران دەباریوشێخ لەتیف قسەی خۆشی بۆ دەکردینو بەسید مینەیگوت:(کاکە سەید بەڕاستی هەوارگەتان زۆرخۆشە ،خۆشتریش ئەبوو بەمەرجێ خۆشەویستیەکی گەنجیشت لەگەلّ بێت).هەر زوو (حمدئاغا) گوتی: (یا شێخ حاجی سەید مینە لەو خۆشیە بێ بەش نیە، ئەو دەزانێ خۆشی لەچ دایە بۆیە خۆی بێ بەش نەکردوە). شێخ گوتی: (مادام وایە کاك حاجی تەمەنی درێژ دەبێت، بەو هیوایەینو داواکارین تەمەنی درێژ بێتو هەردەم لە خۆشیدا بێت).

ئەوەی شایانی باسە میوانداریەکی کوردەواری زۆر ڕێكو پێكی سازکردبوو کە باسی ناکرێت چۆن بوو، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لەو شوێنە خۆشو دلگیرە ڕامان بوارد، ئێوارە گەڕاینەوە (خەلان) لەسەر داوای کوڕەکانی شێخ (علاءالدین) شەو لای ئەوان ماینەوەو ئەوانیش میوانداریەکی زیاد لە پێویستیان کردینو لە هەمویان زیاتر (شێخ عبدالقادر) بەو میوانداریەتیە ماندوو بوو، شەو تا دەرنگ بەخۆشی ڕامان بوارد، بەلاّم دەرنگانی شەو هەوالێکی ناخۆشیان پێ ڕاگەیاندین ئەویش هێرشی سوپاو جاش بوو بۆ سەر (هەندرێن). بەهیچ جۆرێك بیر لەو هێرشە نەدەکرایەوە لەبەر ئەوەی وەك زاندرابوو نوێنەری حکومەت (زەیدی ئەحمەدە فندی) لە دیلمان بوو بۆ ڕێ ڕوون کردنەوەی ووتووێژ هاتبوو، کەچی شەوی دووەمی مانگی ئایار

هێرشێکی کتوپڕیان کردە سەر(هەندرێن) دیارە ئەوان زانیبویان کە سەرکردەکانی هێزی پێشمەرگە لەوێ نینو ئەم هەلەیان قۆستبۆوە، ئێمە لە خەلان نیوە شەو ئاگادار کراینەوە کە بەزووترین کات بگەڕێینەوە هەندرێن، سوپاو جاش هێرشیان هێناوە بەشێکی زۆری (هەندرێن)یشیان گرتوە! لەگەڵ بیستنی ئەو هەواڵە بەپەلەو بەوشەوە گەڕاینەوە بەبێ مالآوایی کەس بەکەس ڕانەدەگەیشت، لە(خەلان) ڕۆیشتینە خوار بۆ سەر ڕێگای گشتی (فاخیر) بەخۆیو ئەوانەی لەگەڵی بوون بەشوڕە جیبێك ڕۆیشتن ئێمەش بەپێیان کەوتینەڕێ، لە خوار (ڕایات)وە بەقەلابەیەك ڕۆیشتین، ئەگەرچی ئەوکاتە من وازم لە هەموو شتێك هێنابوو بەنیاز نەبووم جارێکی تر بڕۆمەوە بەرەکانی شەڕ، بەلآم کە ئەم تەنگاویە پەیدا بوو هەستی شۆڕشگێری هانیدام دەست بدەمەوە تفەنگو بەوە ڕازی نەبم دوژمن خاکمان داگیر بکات، لەڕێگا لەگەڵ (عزەت) ڕێك کەوتین کە من لە(حافیز) دابەزمو بڕۆمەوە (دەرگەلە) ئەو چەکدارانەی کەهەمانن لەگەڵ خۆم بیان هێنم لەوێوە بەسەر بکەوینە سەر(هەندرێن)و پێش لە هێرش هێنەرەکان بگرین، گوندەکانیش ئاگادار بکرێن بەزووترین کات چەکدارەکانیان بنێرنە ئەو شوێنەی شەڕی لێ یە،(عزەت)یش بڕواتە(میراجیان) لەوێوە بڕواتە شوێنی شەڕەکەو ئاگاداری ئێمەش بکاتەوە کە چی بکەین، ئەوە بوو لە(حافیز) دابەزیمو ڕۆیشتمە دەرگەلەو یەکسەر ئاگاداری گوندەکانم کرد بۆ ئەوەی بێ دواکەوتن چەکدارەکانیان بنێرنە(دەرگەلە) بۆ ئەوەی بچینە (هەندرێن) بەگوێرەی ئەو ئاگاداریە بۆ دوای نیوەڕۆ نزیکەی چل چەکدار ئامادە بوون لەدەرگەلە، بەو نیازەی لەزینی دەرگەلە بەسەر بکەوینە سەر(هەندرێن)، بەلآم پێش ئەوەی لابدەین لە ڕێگا ڕاسپێردراوی (عزەت) گەیشتە لامان بۆ ئەوەی بڕۆینە ئەشکەفتی شەهیدان لەبناری (هەندرێن) لەنزیك (جندیان)، لەسەر زینی (دەرگەلە) ڕۆیشتینە خوار بەدۆلی (ماویلیان)دا بەدرێژایی ڕێگا باران دەباری، شەو درەنگ گەیشتینە ئەشکەفتی (شەهیدان)و لە ڕێگا زۆر هیلاك ببوین کەگەیشتینە ئەوێ ئێمە زۆر بووینو هەیوانیش تەنها تاکە چادرێك بوو بارانیش بەبێ وەستان دەباری ئەوان بۆ خۆیان جێگایان نەبوو، ئێمەش گەیشتینە لایان، زوو پرسیم (عزەت) لەکوێیە؟ گوتیان: (ئەویش بەسەرکەوت)، دیاربوو هێرش وەستا بوو. ئەوەی ڕاستی بێت جێگامان زۆر تەنگ بوو ئەو هەموو

پێشمەرگەیەو تەنها یەك چادر! بۆ بەیانی ڕۆیشتمە لای پەلی (سەیدتەها)لە نزیك ئێمە بوون ئەوان هێزی حزبی شیوعی بوون، بۆئەوە چووم بزانم ئاخۆ ئەو هێرشە چۆن بووە؟ (سید تەها) بەم شێوەیە بۆی گێڕامەوەو گوتی: (بیر لە هێرش نەدەکرایەوەو لەوکاتەدا زۆربەی زۆری پێشمەرگەکانمان بەبۆنەی یەکی ئایار دابەزی بوون ئەوەی مابوو تەنها مام صدیق، لەگەڵ پەلێکی پێشمەرگە دەوریە بوون، بنکەکانیش هەریەکەی چەند پێشمەرگەیەکی نۆبەتداریان مابوون، شەوی دووەمی ئایار سوپار جاش بەهاوکاری سیخوڕەکانی بەبیانوی ڕاوەکەو لە هەندرێن گەڕابوونو شوێنەکانیان بۆ دەست نیشان کردبوونو پێیان گوتبون کە بەکوێدا برۆن، ئەوە بوو کە توانیان ئەوها بەئاسانی بەسەریکەونە سەر هەندرێن). ئەوەی دیار بوو دوژمنو هێرش هێنەرەکان زۆر لە دەوریەکانی ئێمە بەسەرتر کەوتبوون ئەوجا ووشیار ببوتەوە، کاتێ دەبینن وا کەوتونەتە ناو هەرتەوەندەیان بۆکرابوو هەوڵبدەن دەربچن، دیارە لە دوای دەستو بردێکی چالاكو شەڕێکی ڕوو بەڕوو خۆیان دەرباز کردبوون لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا چەند پێشمەرگەیەك دابڕابوون بۆ شەوی دووەم بەدیار کەوتنەوە، بێگومان تا هێزیان گەیشتێ سوپار جاش توانیان بگەنە قوپی (کەپکە موو)، ئەگەرچیپێش بەسەر بکەونە سەر کەپکە موو (فاخیر) لەگەڵ دەستەیەك لە پێشمەرگەکان گەیشتبوە پێشیانو شەڕێکی دژواری لەگەڵ دا کردبوون،بەڵام سەرماو باران ڕێگایان نەدابوون شەو بێنەوە بەوشێوەیە گەیشتبونە (کەپکە موو).

لەدوای گوێ ڕاگرتن لەسەرگوزەشتەی (سەید تەها) گەڕامەوە بنکەی خۆمان، زۆری پێ نەچوو دەنگی تەقینەوەیەك هات لە پەلی (سەید تەها)و بینیمان دوو پێشمەرگەیان بەپەلە بۆ لای ئێمە دەهاتن کە گەیشتن زۆر ئاڵۆز بوون، گوتیان: (نارنجۆکێك لە ناو دەستی سەید تەها تەقیەوە لەو نارنجۆکانەی کە دەستکردی خۆمانن، بۆ ئەوە هاتوین ئێوە ئاگادار بکەین وا ئێمە دەڕۆین سەید تەها دەبەینە سەر ڕێگای گشتی بۆ ئەوەی بیگەیننە ناوپردان). هەرئەوکاتە بەپەلە ڕۆیشتم دیار بوو دەیان بردە خوارەوە کە بەم شێوەیەم دیت زۆر دڵتەنگ بووم لەبەرئەوەی ئەوەندەی بلێی پیاوێکی ئازاو لێهاتوو وشیار بوو، ناوبراو کە دیتی زۆر بەپەرۆشم گوتی: (هاوڕێ زرار تکایە ئەوەندە دڵتەنگ مەبەئەوە ڕێڕەومانە تەنیا نەمدەویست بەم شێوەیە برۆم بریا لە شەڕێك بریندار بووبام). ئێوارەی هەمان ڕۆژ ڕاسپاردەی باوکم

گەیشتە لامانو ئاگاداری کردم بەزووترین کات پێشمەرگەکان ببەمو بڕۆمە سەرەوە بۆ ڕوو بەڕووی دوژمن، بۆ ئەو مەبەستە دوو پێشمەرگەم بەڕێ کردن ئەو نامەیەی باوکم بۆمی ناردبوو بۆم ناردنو نوسیم من دێمە سەرەوە ئێوە هێزێك بنێرنە شوێنی ئێمە لەبەرئەوەی لە فەرمانی باوکم دەرناچم بەیانی دێمە سەرەوە، لەسەرداوای (ڕەئیس کمال) شەوو ڕۆژێکی تر لەوێ مامەوە ڕۆژی دوایی (سەعیدی حمدئاغا) هاتە شوێنی ئێمەو هەر ئەوکاتیش ئێمە بەسەرکەوتینو ڕۆیشتینە سەر (بیرۆکا)، بەڵام چ سەرماو ساردیەك هەر باسی ناکرێت، دیار بوو سوپا لە(کەپکە موو) خەریکی خۆ قایم کردن بوو ئێمەش لە(بیرۆکا) لەپێشیان وەستا بووین، شوێنی ئێمە لەشوێنی ئەوان بەرزتر بوو، ئەوەندە سارد بوو شەوان هیچ نۆبەتدارێك نەی دەتوانی نیوکاتژمێریش لە نۆبەتەکەی خۆی بوەستێ لە سەرمان لەگەڵ ئەوەشدا پێشمەرگە وورەی ئەوەندە بەرز بوو داوایان دەکرد زوو هێرش بەرینو دەریان بکەین، ئێمەش پێمان دەگوتن سەبرتان هەبێت.

(٦/٥) عزەت ڕۆیشتە خوارەوە بەو نیازەی بەڵکو بتوانێ شتێك بەدەست بخات لە چەكو جلو بەرگ بۆ پێشمەرگەکان لە هەموو شتێك زیاتر پێویستیان بەقاپووت هەبوو بۆ نۆبەتدارەکان کەچی ڕۆژی (٨/٥) گەڕایەوە دیاربوو شتێکی وای پێ نەبوو شایانی باس بێت.

ئێمەبەنیازی هێرشێکی بەرفراوان بووینو ئەو چەکانەی بەدەست ئێمەوە بوون چەکی هێرش بردن نەبوون بەشی زۆریان لەچەکە کۆنەکان بوون لەجۆری ئینگلیزیو جۆری تر بەتایبەتی چەکی هاوڕێیانی شیوعی لە سەدا حەفتای هی ئەوە نەبوون هەڵبگیرێن نەك شەڕیان پێ بکرێ، ئەو چەکانەی کەمێك جێگای باوەڕ بوون کە شەڕیان پێ بکرێ چەکەکانی دەستی پێشمەرگەکانی ئێمە بوون ئەویش (٥٠-٦٠) تفەنگی ئینگلیزی بوون لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجو خواستی زۆری پێشمەرگەکان دەرکردنی سوپا بوو لە (هەندرێن).

ئەوەندە ڕۆژانەی لە سەرەوە لە ڕووبەڕووی سوپا وەستابووینو پێشمان لێگرتبوون ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین زۆر بەرز بوو ئەگەر هەیوانێك نەبوایە نەمان دەتوانی خۆمان ڕابگرین، دوای ئەوە کە زانیمان فرۆکە نایێن ڕەشماڵمان هەڵدا بۆ ئەوانەی لە نۆبەت نین بەڕۆژیش ڕەشماڵمان دەخست لەبەرمەترسی فرۆکەکان، لە پەنایەك خۆمان

دەبوارد، ڕۆژانەش نۆبەتدارانی چاودێرمان هەبوون سەیری جولآنەوەی سەربازەکانیان دەکردو تفەنگ چیەکان تەقەیان لیٰ دەکردن.

## خۆ ئامادە کردن بۆ هێرشی بەرپەرچ دانەوە

ڕۆژی (٩/٥/١٩٦٦) دوای نیوەڕۆ لەسەر(بیوٚکا) یەکەم کۆبونەوەی هاوبەشی لێپرسراوانی ئەو هێزانەی ڕوو بەڕووی دوژمنن لە هەندرێن بەسترا، ئەوانەی بەشدار بوون لەو کۆبونەوەیەدا بریتی بوون لە (فاخیر حمدئاغا، ڕەئیس کمال نعمان، صدیق عولآ ئاغا، حاجی مەلا سعید، عریف یونس، مام الیاس) دەبوایە (ملازم عبدالرحمان)یش ئامادە بێت، بەلآم ئامادە نەبوو کەلە هاوڕێیانی حزبی شیوعی بوو، ئێمەش (عزەت سلێمان بەگ، حمدامین فقێ حسن، خدرعولآ بەگ، سیدمستەفا، زرار سلێمان بەگ)، مەبەست لە گرێدانی ئەو کۆبونەوەیە ئەوە بوو کە نەخشەیەك دابندرێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی هێرشی سوپاو لێدانیانو دەرکردنیان لە(هەندرێن)، هێرش کردنێکی ئەوها پێویستی بەزۆر شت هەبوو، بەلآم کە نەبوو چارنەما تەنها خۆبەخت کردن تاکە چارە بوو. ئەو خالآنەی لەکۆبونەوەکە خرانە بەرباسو لێکۆڵینەوە ئەمانە بوو: -

١. شێوەی هێرش بردن بۆ سەر سەنگەرەکانی دوژمن.
٢. دەست نیشان کردنی خۆبەختکەرانو ژمارەیان.
٣. ئەرکی هێرش بەرەکان.
٤. دیاریکردنی کاتی هێرش بەشەو بێت یان بەڕۆژ.
٥. بەدەست هێنانی دەسکەوت.

لە دوای گفتوگۆیەکی تێروتەسەل بڕیارەکان بەم شێوەیە دران:

١. دیاریکردنی شوێنی ئەو دوو هاوەنەی هەمان بوونو ئامادە کردنیان بۆ کاتی هێرش بردن.
٢. بڕیار درا هێرشەکە بەڕۆژ بێت لە کاتی نیوەڕۆ، چونکە ئەوکاتە دوژمن بیر لە هێرش ناکاتەوە.

٣. دەستەی خۆبەخت کەران پەنجا کەس دەبن، بیستو پێنج لە ئێمەو بیستو پێنجیش لە هاورێیانی حزبی شیوعی، سەد پێشمەرگەی تریش پاڵپشت دەبن بۆ ئەو شوێنانەی کە دەگیرێن یەکسەر ئەوان بچنە ئەو شوێنەو بریندارو شەهیدیش ئەوان دەیانگوازنەوە شوێنی دیاریکراو.

٤. ئەرکی هێرش بەران ئەوە دەبێت لەو شوێنانە بدەن کە دەزانن هەڵناستنو شەڕ دەکەن، لێدراوانی خۆشمان بەجێ بێڵن بۆ ئەو هێزی پشتیوانی کەلە دوایاندا دەڕۆن.

٥. دەستکەوت بەپێی بڕیاری شۆڕش چەکی گران بۆ شۆڕشەو چەکی سوکیش بۆ ئەوانەیە کە دەیگرن لەگەڵ کەلو پەلی وردە.

٦. ئاگاداری ملازم عبدالرحمنو عوسمان حوجرانی بکرێت لەکاتی هێرش، عبدالرحمن لە لای گەلی (حاسێ) ڕێگایان نەدات بگەڕێنەوە، وە لەلای (بنەکاول)یش عوسمان ڕێگایان لێ بگرێت بۆ ئەوەی دەرباز نەبن بگەڕێنەوە حامیە.

تاریك داکەوت کۆبونەوەکە کۆتایی هاتو بڕیاردرا بەیانیش لەهەمان شوێن دابنیشین لەکاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ بۆ تەواو کردنی کارەکان، لەڕێکەوتی (١٠/٥) لەکاتی دیاریکراو لەهەمان شوێن بەیەك گەیشتینەوەو دەست کرا بەکارو بارەکان، ئەوەی زۆر پێویست بوو ڕێکخستنی لیستی خۆبەخت کەرەکان بوو کە ڕێك بخرێتو بۆ بەیانی ئامادە بێت، لەکاتی لێکۆڵینەوەو بەسەرداچونەوەی خاڵەکان بەداخەوە لەخاڵی دەست کەوتەکان (فاخیر) کەوتە کێشەو داوای ئەوە بوو ئەوەی دەکەوێتە بەردەست گشتی لەشوێنێك کۆبکرێتەوەو لەدواییدا بەسەر پێشمەرگەکانی هێرش بەردا دابەش بکرێت، بێگومان ئەو داوایەی ناوبراو پەسند نەکرا. یەکەم من گوتم ئەوەی ئێوە دەیڵێن بەڕای من ڕاست نییەو سەرکەوتن بەدەست نایەت، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی پێشمەرگە شەڕکەرو ئازایەکانیش خۆیان نادەنەشەڕ ئەگەر بزانن ئەوەی دەیگرن بۆ ئەوان نابێت، ئەوەش مانای ئەوە دەگەێنێت کە هێرشەکەمان سەرکەوتوو نابێت. فاخیر کەدیتی ڕای ئەو پەسند نەکرا دیار بوو ئاڵۆز بوو بەتوندی گوتی (ئەگەر بەو شێوەیە بێت ئەوەی ئێوە دەیڵێن من لەگەڵی نیمو بەشداری ئەو هێرشە ناکەم)، بەڵام ئێمە ڕامان گەیاند ئەو بەشداری بکات یان نەکات ئێمە ئەو

هێرشە هەر دەکەین ئەگەر هەمووشمان لەو هێرشە نەگەڕێینەوە، چونکە ڕاسپاردەی (سلێمان بەگی باوکمانە) دەبێ بەجێی بگەیێنین لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە:

١. فەرمانی باوکمانە دەبێ پێی هەستین ئەگەر هەر هەمووشمان لەوهێرشە بکوژرێین.

٢. بەرپەرچی ئەو پڕو پاگەندانە دەدەینەوە کە گوایا عزەتو فاخیر هەندرێنی بەپارەیەکی زۆر فرۆشتوە.

٣. ئەگەر بێتو سوپا هەر لەوشوێنە بمێنێتەوە دەبێ ئێمە دەرگەڵە چۆڵ بکەینو بەجێی بێڵین.

کاتێك سەیری هەڵوێستی ئێمەو ئەو دیاردانەی خرانە بەرچاویان کرد (ڕەئیس کمالو عریف یونس) ئاشکرا دیار بوو نیگەران بوون بەهەڵوێستی فاخیر لە دوایید (ڕەئیس کمال) ڕایگەیاند کەوا بەیانی کاتژمێر چواری ئێوارە دێینەوە لێرە جارێکی تر کۆدەبینەوەو کۆتایی بەمەسەلەکان دێنین.

لەوێ گەڕاینەوە لای پێشمەرگەکانمان تاریك داکەوتبوو کۆمان کردنەوە بۆ ئەوەی دەستەی خۆبەخت کەرەکان دیار بکەین، لەوکاتە پێمان ڕاگەیاندن بیستو پێنج پێشمەرگەمان دەوێت ناونوس بکرێن بۆ هێرش بردن، ئەوەی جێگای دڵ خۆشیمان بوو لەو سەد پێشمەرگەی هەمان بوو ژمارەیەکی کەم نەبێت ئەوانی تر هەمویان داوایان کرد ناویان بنوسرێت، کە ئەمەمان دیت ناچار پێمان گوتن ئێمە خۆمان دیاریان دەکەینو ناویان دەنوسین.

لەسەر ڕاسپاردەی (ڕەئیس کمال) ڕۆژی (١١/٥) لەشوێنی دیاریکراو کاتژمێر چوار کۆبونەوەکە دەست پێ کراو لەو کۆبوونەوەیەدا ئەو خاڵانە خرانە بەر باسو لێکۆڵینەوە کە پێویست بوو تەواو بکرێن:

١. کاتی هێرش بردن دیار بکرێت.

٢. دەست نیشان کردنی سەرپەرشتکارانی خۆبەختکەرەکان.

خاڵی یەکەم بڕیار درا ڕۆژی (١٢/٥) کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ هێرشە دەست پێ بکات بەو مەرجەی نهێنی بێت تا کاتی دەست پێ کردنی هێرش، بۆ خاڵی دووەم دەست نیشانکردنی سەرپەرشتکارانی خۆبەختکەر هی بیستو پێنج لە خۆبەختکەرانی لەشکری (سلێمان بەگ) من بووم یاریدە دەریشم (خدری عولا بەگ)

بوو، هی بیستو پێنج خۆبەختکەری هێزی شیوعیەکانیش (عریف یونس) بوو یارمەتی دەریش (مام الیاس) بوو، هێزی پشتیوانیش سەد پێشمەرگەبوو، هی ئێمە (حمدامین فقێ حسن) بەرپرسی بوو، هی هاورێیانیش (مام صدیق عولاَغا) بەرپرسی بوو، لە ژێر چاودێری (فاخیرو عزەت)، تۆپەکانیش لە ژێر فەرماندەی (ڕەئیس کمال) بوون، تۆپ هاوێژەکانیش بریتی بوون لە (عەزە ڕەشو محمد مکتوف) جۆری تۆپەکانیش هاوەن بوون، شوێنی ئەوانیش دیار کراو لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا ڕەئی وا هەبوو کەکاتی هێرش بردن کاتژمێر چوار بێت لەجیاتی دوو. بێگومان ئێمە بەرامبەر سوپا وەستا بووین تەنها دۆڵێك لە نێوانمان بوو، ئەو دۆڵەش بەفری تێدابوو، دەمانزانی شەوان دێن بۆ بردنی بەفر، چونکە ئاو نەبوو ئەگەرچی زۆریش سەرما بوو بەهاوبەشی لەگەڵ پەلی(بەکرەڕەش) ڕۆیشتین بۆسەیەکمان لەبەینی ئێمەو ئەوانەی دەهاتنە بەفردانا،بەلاَم دیار بوو زوو هەستیان پێکرد لەگەڵ ئەوەشدا تەقەمان هەر لێکردنو ڕایان کرد، لە دواییدا زاندرا کە کوژراوو برینداریان هەبوو، ئەو زانیاریەش لە دەفتەری ڕۆژانەی یەکێك لە ئەفسەرە کوژراوەکان بەدەسکەوت کە نوسیبوی (شەوی ٩/٥ لەکەمینی یاخی بوەکان نائیب زابتێکو سەربازێك کوژراونو سێ سەربازیش بریندا بوون) لەهەمان دەفتەر نوسرابوو: (ڕۆژی١١/٥ لەسەنگەرەکانی بەرامبەر مان یاخی بوەکان تەقیان لە سەنگەرەکانمان کرد ملازم اول عدنان کوژرا).

ڕۆژی (١٢/٥/١٩٦٦) سەرلەبەیانی خەریك بوو خۆمان ڕێك بخەین لەو کاتو ساتەدا (سعیدی حمدئاغا) برای فاخیر خۆیو نۆ پێشمەرگە گەیشتە لامان کەوتە کێشە داوای دەکرد کە ناوی بخرێتەلیستی خۆبەختکەران، بەهاتنی ئەوان ژمارەی خۆبەختکەران بوون بەشەست کەس.

دوای نیوەڕۆی ڕۆژی (١٢/٥) لەسەر ڕۆشنایی بڕیارەکان لەکاتی دیاریکراودا ئامادەبووینو هەریەکەمان لە شوێنی خۆی چاوەڕێی دەنگی تۆپەکان بووین کە کەی دەتەقێنرێنو ئێمە هەڵمەت دەبەین؟ بڕیار وابوو هەر تۆپێك سێ گوللە بتەقێنێ ئەوکاتە ئێمە هێرش بەرین بۆ ئەو شوێنانەی کە بۆمان دیار کراوون، بەڵێ لەگەڵ تەقینەوەی دوو گوللە ئێمە ڕاپەڕینو بۆی دەرچووین سەرەو ژێر بەپێش سەنگەرەکانی دوژمندا دابەزینە خوارەوە ئەوجا سەر هەوراز بەبەر سەنگەرەکانی دوژمندا

سەرکەوتین، هەر زوو سەنگەرەکانی پێشەوەمان پێ چۆڵ کردنو ڕامان پەڕاندن، بەڵام بەداخەوە لەسەنگەرەکانی پێشەوە لە(خدری عوڵابەگ) دراو شەهید بوو لە دوای شەڕێکی دژوار بەشی زۆری سەنگەرەکانی سەرەوەمان ئازاد کردنو گەیشتینە نزیك (مەقەر لیوا) سەربازەکان بەشکاوی دەڕۆیشتنە خوارەوە بەجۆرێك سەریان لێ شێوابوو نەیان دەزانی بۆکام لا ڕابکەن، توانای ئەوەیان نەبوو بەرگری لەخۆیان بکەن، ئەو سوپایە ڕەوێکی وای تێکەوت ئەوەی هێنابوویان بۆ هەندرێن لە ماوەی ئەوەندەی لەوێ بوون بەجێیان هێشت، لەوکاتەی گەیشتینە (مەقەر لیوا) دیاربوو سەنگەرێکی گەورەی پارێزەری تۆپەکان بوو یەکێك لەناو سەنگەرەکە لەسەر مەترەلۆزێکی (فیکەرس) غەزری بوو بەتەنیا مابوو هەڵ نەدەستاو ڕێگەشی نەدەدا کەس بڕواتە پێشەوەو سەرهەڵبڕێت، بۆماوەیەك ڕایگرتین چارەمان نەما بە(حاجی حمدامین) بن مێردەیم گوت: (تۆو سەید مستەفا تەقەی لێ بکەن من بەنهێنی بۆی دەچم لە دواوە بەڵکو بیگەمێ) لەوێ لەگەڵ (عبدالله مینە) ڕەژێکەری گیامان لەخۆمان بەست بۆ ئەوەی دیار نەبین تا لەبەرامبەری دەربازبوین، ئەوەی ڕاستی بێت نەمانزانی چۆن دەرباز بووینو گەیشتینە ناو دارەکان! هەرچۆنێك بوو بەنهێنی گەیشتینە ناو دارەکان ئەوجا توانیم لە دواوە بۆی بێم، کە لە دیواری سەنگەرەکە نزیك کەوتمەوە لەبەر تەقەی زۆر ئاگای لەمن نەبوو کاتێك پێم گوت: (هەستە تەسلیم بە)، یەکسەر لە سەنگەرەکەی خۆی هەستاو دەستی بۆ غەدارەکەی خۆی برد بەنیازی تەسلیم نەبوونو شەڕکردن، بەڵام نەمهێشت پێ ڕابگاتو تەقەم لێ بکات من تەقەم لێ کردو کەوتە سەر مەترەلۆزەکە، لەگەڵ وەستانی تەقەی مەترەلۆز پێشمەرگە بەگوڕ دابەزینە خوار، کاتێ ڕۆیشتمە ناو سەنگەرەکە دیاربوو کۆمەڵێك تەرمی کوژراو لەوێ کەوتبوون لەوکاتەش (عریف یونس) گەیشتە ناو سەنگەرەکەو تفەنگێکی برنۆی هەڵگرتو ڕادیۆیەکیش لە سەردیواری سەنگەرەکە داندرابوو هەرئیشی دەکرد ئەویشی هەڵگرت، بەڵام دیاربوو زۆر ئاڵۆز بوو لەبەرئەوە پێشمەرگەکانی لەسەرەوە نەهاتبونە خوارەوە لەوێ بەتوڕەیی پێم گوت: (مەڕۆ لێیان گەڕێ) ئەو گەڕایەوە ئێمەش چووینە دوای سەربازە هەڵاتوەکان تا گەیشتینە ناو چادرەکانی (مەقەرلیوا) لە دەرگای یەکێ لە چادرەکان بینیم جانتایەك بەجێ ماوە گۆپاڵێکیشی لەسەر داندرابوو، جانتایەکەم دایە دەستی (محمدی ئەحمەدی فاتێ)و

پێم گوت: (ئەو جانتایە باش دەپارێزی)، کە چووینە یانەی ئەفسەرەکان بینیمان مێزێکی زۆر گەورە لەبن کەپرێك داندرابوو کۆمەڵێك نەخشەی سوپاییو کەل وپەلی لە سەربوون، بەناو ئەو تۆپە گەورانەی بەجێیان هێشتبوو تیپەڕین لەوێ ڕۆیشتینە خوارتر بۆ شوێنی وەڵاخەکان دیاربوو دوو هێستر کوژرابوون کە ئەمەم بینی هەرزوو (حسێنی قادری عالیو باوەکەم) گێڕانەوە بۆ ئەوەی هێسترەکان بگوازنەوە شوێنێکی لاپەڕگەو کەمێك دوور لە شەڕ بۆ ئەوەی زیاتر نەکوژرێن. کاتێك گەیشتینە(گۆڕێ سەعاتێ) تۆپەکانی ئێمە لە پێشمانی دەداو نەیان دەزانی ئێمە ئەوەندە ڕۆیشتیون، ئاگادارمان کردن تۆپ هاویشتن بوەستێنن تا بتوانین بڕۆینە پێشەوە، لەگەڵ ئەو ئاگاداریە (عزەت)و پێشمەرگەکانی سەرەوژێر دادەبەزنە خوار وایان دەزانی کەس نەماوە، دێن تا دەگەنە ناو دارستانی خوار(گۆری سەعاتێ) لەوێ دەکەونە ناو سەنگەرەکانی دوژمن کە هێشتا لەوێ مابوون لەوکاتەشدا شەڕ ئەوەندە گەرم بوو دەنگی تەقە هەڵگیرابوو هەر هاشە بوو لە هەموو لایەکەوە ئاگرباران بوو چوار فڕۆکە لێیان دەداین، بەلام لەوکاتەی کە لەگەڵ دوژمن تێکەڵ بووین فڕۆکەکان تەنها بەسەرماندا دەسوڕانەوەو نەیان دەتوانی تەقە بکەن، ئەو کاتەش هەر سەرباز بوو سەرەوژێر ڕایان دەکرد کەس بەکەس ڕانەدەگەیشتین ئێمەش سەرگەرمی شەڕ بووینو لەو سەنگەرانەمان دەدا کە هێشتا هەڵ نەستابوون لە شوێنی خۆیان، لەو کاتانە یەکێك لە پاسەوانەکانی(عزەت) بەئاڵۆزیو شێواوی گەیشتەلامانو ئاگاداری کردین زوو بگەنە(عزەت) لە(گۆڕی سعاتێ) کەوتە ناو ئابلۆقەی سەنگەرەکانی سوپا، ئەوەی ڕاستییە ئەو هەواڵە زۆر ئاڵۆزی کردمو بەپەلە بەرەو شوێنی ناوبراو ڕۆیشتین، ئەوە باش بوو ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین زۆر لەبار بوو بۆ ئەوەی ڕێیان لێ بگرین ئەوەبوو توانیمان لە پشتەوە بۆ ئەو سەنگەرانە بچین ئەوانەی ئابلۆقەی (عزەت) یان دابوو کاتێك لێیان نزیك کەوتینەوە دیار بوو تەقە زۆر گەرم بوو توانیمان بەنهێنی لە دواوە هێرشیان بۆ ببەینو لێیان بدەین، دیاربوو سەربازەکان ڕوویان لەسەرەوە بوو زۆر لەسەنگەرەکانی تەقەکردن نزیك کەوتینەوە من سەنگەرێکی زۆر گەورەم کەوتەپێش زۆر بەگەرمی تەقەیان دەکرد زۆر بەوەستاییی بەپارێز خۆم گەیاندە پەنا بنەدارێکی (گێوژ) زۆر بەووردی سەیرم کرد یەکێك لە دەرگای سەنگەرەکە بەکلاشنکۆف وەستابوو نەی دەهێشت بڕۆنو هانی سەربازەکانی

دەداو خۆیشی بەگەرمی تەقەی دەکرد لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی (عزەت) بوو بانگی ئێمەی دەکرد زۆر ئاڵۆز بوو دەستم بۆ (عبدالله ڕەژێکەری) بڵند کرد دیار بوو ناوبراوو(علی مولود ناوخەرابی) خۆیان خوشاندو گەیشتنە لام نارنجۆکێکم لە(عبدالله) وەرگرت لەپەنا دار گێوژەکە بەسێرە تەقەم لەو سەربازە دەکرد ئەوەی بەکلاشنکۆف تەقەی لە سەرەوە دەکرد، لەگەڵ تەقەکە خۆم گەیاندە نزیك دیواری سەنگەرەکەو نارنجۆکەکەم فڕێ دایە ناویان خۆشم هەڵدایە ناو سەنگەرەکە، لەگەڵ خۆفڕێ دانم بانگم کرد (لێ مەگەڕێن بڕۆنو ئەوانە ڕابکەن) لەگەڵ دەنگی من (عزەت) بانگی کردبوون گوتبوی (کوڕینە هەستن ئەوە دەنگی زراره دەری کردن). لەوکاتەی خۆم فڕێ دایە ناو سەنگەرەکە چوومە شوێنی ئەو سەربازەی بەکلاشنکۆف تەقەی دەکرد بینیم کلاشنکۆفەکە لەوێ کەتبوو هەڵم گرتو کە سەیرم کرد فیشەکی تێدا نەمابوون، چەند مەخزەنێکی تری لێ بوون ئەوانیش بەتاڵ بوونو تەنها یەکێکی پڕم دەستکەوت کەسەیرم کرد سەربازەکان لاشەی کوژراوێك ڕادەکێشن، تەقەم بەسەردا کرد بەجێیان هێشت لەوکاتەش پێشمەرگەکان گەیشتنە ناو سەنگەرە گەورەکەو بەپەلە ڕۆیشتمە ئەو شوێنەی(عزەت)ی لێ بوو دیار بوو سەلامەت بوون تەنیا(حەسەنی عەولای حوسێنی) بریندار بوو، یەکسەر برینەکەمان بۆ بەستو ڕۆیشتینە دوو هێزە شکست خواردوەکە، دیاربوو پێشمەرگەکان زۆر بەشلی دەهاتن، پێشمەرگەکانی هێزی پشگێریو خۆبەخت کەرەکان تێکەڵاوی یەکتر بوبوون، کە ئەمەمان بینیو پێشمەرگە ئەوها بەساردی دێن ئێمەش لە دوا سەنگەرە چۆڵ کراوەکەی بناری (هەندرێن) وەستاین. (مام صدیق)و چەند پێشمەرگەیەکی (سعید حمدئاغا)ش گەیشتنە لامان ئەوکاتە ڕۆژ درەنگ بوو بەرەو تاریکی دەڕۆیشت نەمان توانی زیاتر بڕۆین مەگەر خۆبەختکەرەکان شەهید ببن، لەوێ هەندێك پێشمەرگە ڕۆیشتن (حەسەن) بگوازنەوە سەروە (عزەت)یش هاتە لامان، ئەوەی شایەنی باسە لەماوەیەکی زۆر کەم(هەندرێن) پاك کرایەوە، ئەو سوپایەی هێرشی هێناو سەرکەوتە (کەپکە موو) زانی چۆن بەسەر کەوت، بەلاَم نەیزانی چۆن بگەڕێتەوە. ئەو کەلو پەلەی هێنابویان هەموویان بەجێهێشت، مەگەر سەربازەکان تفەنگی خۆیان لەگەڵ خۆیان بردبێ، ئەگینا هیچ شتێك لەکەلو پەلەکانی (جعفل

لیوای٤) دەرباز نەبوو گشتی لە شوێنی خۆی بەجێماو کەوتە دەستی پێشمەرگەکانی هەندرێن.

ئەوەی دەمەوێ دیاری بکەم ئەوەیە ئەگەر پێشمەرگەکان بەو دەستو بردەی لەسەرەوەیان کرد بەوشێوەیە بهاتبانو نەوەستابان هیچ شکی تێدا نەبوو سەربازگەی حامیە(ڕواندز)یش دەگیرا لەبەر ئەوەی سەبازەکان ئەوەندە وورەیان دابەزی بوو توانای بەرگریان نەبوو، ئەوەی جێگای ڕەزامەندیە ئەوەبوو ئەو پێشمەرگانەی گەیشتنە دوا سەنگەر لەگەڵ ئەو ماندویی‌و هیلاکیەشدا لەوێ مانەوە مەگەر دوژمن بگەڕێتەوە، شەو بەدرەنگەوە پێشمەگەکانی لقی(ملازم عبدالرحمن) هاتنە شوێنیان، ئیتر هەر لەو کاتەوە هەندرێن بوە ئامانجی تۆپەکانی حکومەت لە (باپشتیانو ڕواندزو دۆڵی ئاکۆیان) بەبێ وەستان شەوو ڕۆژ تۆپ بارانی ئەو شاخەیان دەکرد. شەوی سێ یەم لە دوای شکانیان جاش‌و سوپا هێرشێکی بەرفراوانیان هێنا بەو نیازەبوون بگەڕێنەوە، بەڵام نەیانتوانی هەنگاوێك بێنە پێش، بەڵکو توشی دژوارترین شەڕ بوون بەشکاوی گەڕانەوە دواوە لەگەڵ زیانێکی زۆری کوژراوو بریندار.

***ئەنجامی ئەو شەڕە ناودارەی هەندرێن بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:***

* تێکشکاندنی جعفل لیوای ٤ بەتێکڕایی .
* دەست بەسەر داگرتنی ئەو کەل‌و پەلانەی بەسەریان خستبوە سەر هەندرێن.
* بەجێهێشتنی زیاتر لە (٨٠) لاشەی کوژراو لە ئەفسەرو سەرباز.
* بەدیل گیرانی کۆمەڵێك سەرباز.
* دەست بەسەر داگرتنی تۆپخانە کەپێك هاتبو لە (٤) تۆپی چیایی‌و(٤) هاوەنی گەورەو هەر سریەیەك هاوەنی خۆی هەبوو، لەگەڵ مەترەلۆسی فیکەرو جبەخانەی هەمووی مایەوە لەگەڵ (٩) دەزگای لاسلکی ژمارە (٩)ی رووسی(٦٠) لاسلکی کۆڵ‌و کۆمەڵێك ماتۆڕی شحن، بەڵام چەکی وورد زۆر کەم گیرا سەربازەکان ئەوەی دەرباز بووبوون تفەنگەکانیان لەگەڵ خۆیان بردبوون، ئەوەی کەوتە دەستی ئێمە(٤) تفەنگی بڕنەو(١) کلاشنکۆف‌و(٨) غەدارەی جۆری ئەمریکی بوون. ئەوەی کەوتە دەستی

هاورێیانی حزبی شیوعی (یەك تفەنگی برنۆیەك ڕەشاشی دیکتاریۆف، چوارغەدارە) بوون.

* زیانی ئێمەش (٣) شەهیدو (٧) بریندار بوون، خۆشبەختانە برینەکانیان سوك بوو، شەهیدەکانیش بریتی بوو لە (عریف یونس، خدرعولا بەگ، صالح مام الیاس).

لێرەدا دەمەوێ ئەوە ڕابگەیەنم دەربارەی دەسکەوتەکان بەشێوەیەکی ڕێكو پێك نەنوسرابوون ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ بەرپرسەکان بەشێوەیەکی ڕاست تۆماریان نەکردبوو!

***ئەو چەند خاڵانەی خوارەوە ساتە ناخۆشەکانی داستانەکەی هەندرێنن:***

* لەوکاتەی ئێمە سەرگەرمی شەڕێکی دژوار بووین لە پڕێکا ئاگادار کراین کەوا (عزەت) ئابلۆقە دراوە لەلایەن هێزی دوژمنەوە! بێگومان لەوکاتە لە نزیك گوندی (بنەکاول) سەرگەرمی شەڕێکی دژواربووین، ئەوکاتەی ئەم هەواڵەم پێگەیشت ئێمە زۆر دوور بووین لە شوێنی ئەوان، بەلام بەلامەوە سەیر بوو نەمزانی چۆن ئەوەندە زوو گەیشتمە شوێنی ڕوداوەکە، ئەو شوێنەی (عزەت)ی لێکەوتبوە ئابلۆقەوە، من لەوکاتەی ڕۆیشتبووم بەکەسم نەگوتبوو وەرن لەگەڵم ئەوانەی هاتبوون خۆیان بەدوامدا هاتبوونو من بەتەنیا کەوتبومە ڕێو ڕۆیشتبووم لەتاوی (عزەت). ئەوەی زاندرا لەوکاتەی ئاگادارمان کردن تۆپ باران ڕابگرن ئێمە لە(گۆڕی سەعات) ین (عزەت) خۆیو نۆبەتدارەکانی دادەبەزنە خوارو دەڵێ: (کوڕینە لیوا شکا من ڕۆیشتم) ئەوان دێنو دەگەنە ناو دارستانی(گۆری سەعات) بەناشارەزایی دەکەونە ناو ئەو سەنگەرانەی سوپا کە هێشتا لە شوێنەکانی خۆیان هەڵ نەستابوون نەشیان توانی بگەڕێنەوە تا ئەو کاتەی بەهانایانەوە چووینو دەربازمان کردن.

لەدوای سەرکەوتن بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك گەڕامەوە دەرگەڵە، ئێوارە درەنگ بوو گەیشتمەوە گوند دیاربوو ماڵمان لە ئەشکەفتی(کەڕەنا)بوو، بەیانی ڕۆژی دووەم کاتژمێر دەی بەیانی دوو فرۆکەی جۆری (هەنتەر) بەسەر دەرگەڵەدا سوڕانەوە بەشێستیر تەقەیان لە ئەشکەفتی(ڕووتەڵە) کرد ژنو منداڵی (مجید بەگ)

بەبەرکەوتن‌و ژن‌و کچێکی نۆزدەساڵانەو کوڕێکی پێنج شەش ساڵی شەهید بوون، خۆم گەیشتمە سەریان بێگومان ڕوداوێکی گەورەی دڵتەزێن بوو. ئەو ڕۆژەش دوا ڕۆژی شەڕ وەستان بوو!

ئەو سەرکەوتنەی هێزی (هەندرێن) ڕوداوێکی مێژوویی گەورە بوو لە مێژووی جولانەوەی ڕزگاریخوازی کورد، بەو بۆنەیەوە لەگەڵ وەستانی شەڕ ڕۆژنامە نوسەکان یەك بەدوای یەك، ڕوویان دەکردە (هەندرێن)و سەریان دەدا لەوشوێنەی شەڕەکەی تێدا کرابوو، بەچاوی خۆیان دەیانبینی چ کارەساتێك بەسەر لیوای چواری دوژمن هاتبوو، لەپێش هەموویانەوە ڕۆژنامەنوسێکی بەریتانی هات کە(سامی عبدالرحمن)ی لەگەڵدا بوو، ڕۆژنامە نوسەکە زۆر بەووردی شتی دەنوسی، ئەوەی زۆر سەیر بوو بەلایەوە دەیبینی کە چۆن تۆپ بەشێلکە بەدەوروبەرمان دەکەوتن‌و کەس لە شوێنی خۆی نەدەجولاو فڕۆکەکانیش بێ وەستان بەسەرسەرماندا دەسوڕانەوە لە سەر چیای (هەندرێن)، ئەوان خۆیان قایم کردبوو کەچی پێشمەرگەکان خۆیان تێك نەدەداو هەریەکەو بەلایەکدا پاڵیان دابوەوە بەبێ ترس! ڕۆژنامە نوسەکە بەئێمەی گوت: (بائەوەندە بێ باك نەبن باش نیە)، دەستەیەکی تر لەکارمەندانی (تەلەفزیۆنی فرەنسی) هاتن ئەوان دوو شەو مانەوە لە(هەندرێن) لەسەر داوای ئەوان جارێکی تر ڕووداوی شەڕی (هەندرێن)مان دووبارە کردەوە کە چۆن هێرش دەستی پێکردو لە کوێیەوە بۆ سەنگەرەکان چوین‌و چۆنمان سوپا ڕاونا، ئەوەی ئەوان ویستیان بۆیان کراو ئەوانیش تۆماریان کردو وێنەشیان دەگرتن، دەستەی تەلەفزیۆن دوو پیاوو ئافرەتێك بوون‌و هەموو دەزگایەکیان پێ بوو بۆ تۆمارکردن. دووسێ ڕۆژ پێش ڕێککەوتنەکەی حوزەیران دوو ڕۆژنامەنوسی ئێرانی بەناوی گۆڤاری (خاك‌وخوێن) گەیشتنە لامان دیاربوو پاسەوانانی (بارزانی) یان لەگەڵدا بوون، پێشوازیەکی گەرممان لێکردن بەتایبەتی لەبەرئەوەی کورتە نامەیەکی کاك (ئیدریس) یان پێ بوو کە تیایدا نوسرابوو: (یارمەتی ئەو دوو ڕۆژنامە نوسانە بدەن هی خۆمانن)، بەوبۆنەیەوە خۆشم لەگەڵیان ڕۆیشتم هەموو شوێنەکانم پیشان دان‌و ئەوەی ویستیان بۆمان کردن‌و لەکۆتاییدا بەڕێك‌و پێکی باسی شەڕەکەم بۆ گێڕانەوە کە چۆن بووە، ئەوەی جێگای دڵ تەنگی‌و نیگەرانی بوو یەکێکیان بەئەوی تری گوت: (من لەوباوەڕە نیم ئەو هەموو شوێنەی بینیمان لەماوەی دووسێ کاتژمێر بەو

سوپایە چۆڵ کرابێت، بەشەست کەس، ئەگەر پەیوەندیەك نەبوبێت لە نێوان ئەفسەرانی خۆفرۆش‌و پێشمەرگە، چونکە ئەوەی کراوە کرداری شەست چەکدارنیە، بەڵکو هی هەزار چەکداریش نیە)! ئەوەی ڕاستی بێت لە قسەکانی ئەو دوو پیاوە ناپاکە زۆر پەست بووم‌و ڕووم تێ کردن‌و گوتم: (باش بزانن ئەو شەڕەی کراوە شەست پێشمەرگەی خۆبەختکەر کردویانە لەو شوێنە سەختەی بینیتان، دڵنیاش بن هیچ پەیوەندیەکمان بەکەسەوە نەبووە وەك ئێوە لێی بەشکن، حەزدەکەم بزانن دەستوبردی پێشمەرگە سوپای ئێوەشیان ئەوها بەزاندوەو داواتان لێ دەکەین کە گەڕانەوە ولاتەکەتان چاوێك بەمێژووی شەڕەکانی ساڵی(١٩٤٧) دا بگێڕنەوە ئەو شەڕانەی لەگەڵ سوپای ئێوەماندا کردووە لەگردەکانی سەری دەربەندو قوپی ئالیاوە لەو شوێنە ڕووت‌و ئەموارە چۆن سەرمان لە سوپای ئێوە شێواندبوو بەتایبەتی لەوکاتەی لەشکری ئێوە بەرێوەبوو لە هاواری سوپا تێك شکاوەکەی نەلۆس دەرۆیشت لە دۆڵی قارنێ، چۆن بەملکەچی بەرەو دواوە گەڕانەوە نەغەدەو ڕاومان نان، بەمەرجێك دوو تانکیان لەگەڵ بوون ئێمە شەش کەس بووین ئەوانەی لەگەڵم بوون هەموویان لاوی تازە پێگەیشتوو بوون، لە شەوی (١٩٤٧/٣/٢٤)لە گوندی قارنێ لە بنکەی لەشکری ئێوەماندا‌و دەستمان بەسەردا گرت هەتا هەموومان گواستەوە بۆ گوندی ئالیاوە، ئەگەر باوەڕیش ناکەن لە گەڕانەوەتان لە بارزانی بپرسن ئاخۆ ئەوەی گوتم ڕاستە یان نا؟)

دیاربوو قسەکانی منیان بەلاوە گران بوو، ڕۆژنامە نوسەکە هیچی پێ نەما پرسی: (تۆ کۆمۆنیستی)؟ گوتم (وا دەبینی پێشمەرگەم بەناوی پێشمەرگە لەگەڵتان دەدوێم وابزانم پرسیارەکەت زیادبوو کردت) دیار بوو کابرا زۆر بەنابەدڵی خوا حافیزی کردو ڕۆیشت.

بەیانیەك پاسەوانەکانمان (دەوریەکان) نائب عەریفێکیان لەگەڵ بوو هێنایانە بنکە، ناوی (عیلیگی) بوو ناوبراو بەدوای برایەکەیدا هاتبوو، برایەکەی لەو شەڕە بێ سەرو شوێن بوو، لەکاتی قسەکانی نائب عریف گوتی (ڕۆیشتمە لای ئامیر لیوایەکەمان لە خەلیفان بۆ ئەوەی ڕێگام بدات بەدوای برام دابێم، پێی گوتم مەڕۆ یاخی بوەکان دەتکوژن، بەڵام پێم گوت، هەر دەڕۆم دەبێ بزانم برام چی بەسەر هاتوە، گوێم نەدایە ئەوان هاتوم بۆ لای ئێوە یارمەتیم بدەن، بەڵکو بزانم ماوە یان کوژراوە،

دایکم وا لەکاولۆك چاوەڕێم دەکات) بێگومان لەگەڵ بەخێرهاتنێکی دڵ خۆشانە بەزمانێکی خۆش لەگەڵی دوام، بۆم ڕوون کردەوە کە ئێمە شەڕخواز نین، بەڵکو داخوازین دەسەلاتدارانی ئێوە شەڕمان پێ نەفرۆشن، لەوێ ڕێگام پێداو پیشمەرگەم لەگەڵ ناردن بڕۆن ناو لاشەکان بگەڕێن بەڵکو بەو(قورسەی) لە ملیان دایە بیان ناسنەوە لەبەر ئەوەی لاشەکان تێك چووبوون، دیارە لەناو لاشەکانیان نەیدۆزیبوەوە، ئەوکاتە داوام لەبرادەری لاسلکی کرد سەیری لیستی ناوی دیلەکان بکرێت، دەرکەوت لەگەڵ دیلەکانە، کاتێك ئەو پیاوە زانی برایەکەی ماوە دەستی کرد بەسەماو پێشمەرگەکانیش گۆرانیان بۆ دەگوت، لە دوای نیوەڕۆ بەڕێمان کردەوە، دوو پێشمەرگەم لەگەڵ ناردن هەتا بردیانەوە نزیك سەنگەرەکانی پێشەوە، کە ڕۆیشت لەخۆشیان نەی دەزانی چی بکات.

لەدوای ڕێکەوتنەکەی حوزەیران ڕێگا بەسوپا درابوو بێن لاشەکانیان ببەنەوە، ئەگەر چی تەواویش تێك چووبوون، ئەوەندەمانزانی ڕۆژێك کۆمەڵە سەربازێك هاتن داوایان کرد ڕێگایان پێبدەن لاشەکانیان ببەنەوە، ئەگەرچی پێمان ڕاگەینرابوو ڕێگایان بدرێت، بەلاّم کە دیتمان بەچەکەوە هاتوون ڕێگامان نەدان پێمان گۆتن بڕۆن چەکەکانتان دابنێن ئەوکاتە وەرن، سەربازەکان گەڕانەوە، ڕۆژی دووەم هاتن بێ چەك لەسەرەتاوە ملازم (اول)ێك بەناوی (هادی) پرسی بووی کێ لە ئێوە زمانی ڕوسی دەزانیت؟ پێشمەرگەکانیش هێنایان بۆ لای من، بەرووسی چاك‌و چۆنی لەگەڵ کردم، لە قسەکانی دیار بوو پیاوێکی باش بوو، بەدیارکەوت ئەندازیاری وولاّتی سۆڤیات بوو، رووسی دەزانی‌و هەندێ ئامۆژگاری پێ ڕاگەیاندم گوتی: (ڕێگا بەسەربازەکان مەدەن بەهەموو شوێنەکانتان بزانن، ئەوانەی هاتوون زۆریان نێردراون بزانن ئێوە چیتان هەیەو شوێنەکانتان ڕەچاو بکەن) بێگومان جێگای ڕەزامەندیم بوو قسەکانی ئەو ئەفسەرە، لەگەڵیان ڕۆیشتین هەتا بەسەر کەوتینە (قۆپی کەپکەموو)، کاتێك بەسەر کەوتینە سەرەوە (ملازم عبدالله) ناوێك سەیرێکی ئەو دیوو ئەودیوی کردو گوتی (ئافەرین بۆ پاڵەوانانی سووپای عێراق بزانە بەسەر کوێ کەوتوون!)، بەلاّم وەلاّمی ئەو ئەفسەرە لەلایەن یارمەتی دەری من (عەریف حوسێن) یەکسەر درایەوەو گوتی (بەراستی سوپاتان پاڵەوانە بەسێ ڕۆژ توانی

بگاتە ئێرە کە زانیان ڕێگا ئاوایە، بەڵام پاڵەوانیەتی بەوە بەدیارکەوت بەماوەی سێ کاتژمێر گەیشتەوە ڕواندزو دیانا، ئەوەیە پاڵەوانیەتی؟).

وەك هەستم کرد (ملازم هادی) وەڵامەکەی (عەریف حوسێن)ی بەدڵ بوو بەرووسی گوتی (بەڕاستی وەڵامێکی باشی دایەوە لە جێگای خۆی بوو) ئەوە بوو لا شەکانیان بردن‌و ڕۆیشتن.

ماوەیەك پێش هێرش بۆ سەر هەندرێن کوڕێکمان پەیدا بوبوو پێم گوتبوون ناوی لێ بنێن (کارۆخ) لەدوای سەرکەوتنی پێشمەرگە کاتێك گەڕامەوە ماڵ دایکی بەچاوی پڕ لە فرمێسك پێی گوتم (خۆ دوعام قەبوڵ بوو تۆ نەکوژرای ئەوجا ناو لە کورەکەم دەنێم کارۆخ، هەتا ئێستا بەنیاز نەبووم ئەو ناوەی لێبنێم، گوتم ئەگەر خوانەکات باوکی چی بەسەر بێت بەناو باوکی دەکەمەوە).

لەدوای ڕێکەوتنەکەی حوزەیرانی (١٩٦٦) پێشمەرگەکان لە هەندرێن دابەزین، بنکەمان بردە گوندی (جنێراوە) لە شوێنی کەپرو ساباتی هاوینە هەوارمان، ئەوەی پێش ساڵی (١٩٦٦) لێی بووین لەوێ بنکەمان دامەزراندو جێگیر بووین، دوای ماوەیەك دیاربوو دوکتۆری سوپایی بەڕێ کران بۆ کوتانی پێشمەرگەکان، من لەو کوتانە زۆر مەترسیم هەبوو، بەڵام باش بوو هیچ نەبوو، زۆری پێ نەچوو لە دوای دابەزینمان لەهەندرێن لە بەرزێوە کۆبونەوەیەکی سەرەکانی پێشمەرگەکانی هێزی باڵەکایەتی‌و ڕواندز سازدرا بەسەرپەرشتی (عبدالرحمن قازی)، ناوبراو دوانێکی گرنگی خستە ڕوو پیرۆزبایییەکی گەرمی لەخۆبەختکەران‌و پێشمەرگەکانی هەندرێن کرد زۆر بەووردی لە دەستوبردی پێشمەرگە دوا، لە قسەکانی نیشانی دا گوتی (لەوانەیە لەماوەی داهاتوو عبدالرحمن عارف‌و بارزانی بەیەکەوە دابنیشن) ئەوەی دەرکەوت زۆری پێ نەچوو لە دەشتە دیان (بارزانی‌و عارف) بەیەك گەیشتن.

لەدوای بەیەك گەیشتنی بارزانی‌و عارف بڕیار درا قوتابخانەکان بکرێنەوەو تێکڕای فەرمانبەران بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان، بەگوێرەی ئەو بڕیارە دەبوایە منیش بگەڕێمەوە، بەڵام لەدوای سەرکەوتنی هەندرێن باوەڕیم نەبوو بگەڕێمەوە، چونکە دەستوبردی من لەو سەرکەوتنە ئاشکرابوو، بۆیە جێگای مەترسی بوو بڕۆمەوە بەردەمی کەسانی داخ لەدڵ، ئەوەبوو نەگەڕامەوە سەر کارم وەکو مامۆستا.

لێرەدا بەدڵنیاییو سەربەرزانە دەتوانم بڵێم ئەوەی نوسیومە دەربارەی هەندرێنو مێژوی ئەو داستانە مەزنە ئەوەیە کە نوسراوە، ئەوەی زیارتر بنوسی گەورەترین ناپاکیەو زیادە، ئەوەیە ڕاستی ئەو داستان مێژووییەی هەندرێن، هەتا ماوم ئەوەی زیاد بنوسی وەڵامی دەدەمەوەو ڕێگانادەم هەرکەسەی بەئارەزوی خۆی لەسەر ئەو داستانە بنوسێت، لەبەر ئەوەی یەکێك بووم لە بەشداربوانی نەخشەکێشانی ئەو هێرشەو لێپرسراوی بەشێك لەوخۆ بەخت کەرانە بووم لەو هێرشە دوژمن بەزێنەدا.

لە پایزی ساڵی (١٩٦٦)دا بارەگای هەرێمی حزبی شیوعی لە گوندی (کەڵێتە) گوازرایەوە (دەرگەڵە) لە سەرەتای گەیشتنیان لەگەڵ (عزەت) ڕێك کەوتن بەکەڵو پەڵو کەرستەی عزەت خانوێك دروست بکەن بەو مەرجەی هەرکاتێ ڕۆیشتن خانوەکە بۆ عزەت بمێنی، بەڵام هەتا لەوێ بن لەناوی دادەبن، من کە ئەندامی ئەو حزبەبووم داوام لێ کردن ئەگەر بەنیازن خانوو دروست بکەن خانوێکی سەربەخۆ دروست بکەن، هەرکاتێ ڕۆیشتن خانوی حزبەدەمێنێتەوەو دەبێتە بارەگای جوتیارانی گوندو وەك دیاردەیەك دەمێنێتەوە، ئەو داوایەی من نەك هەر پەسند نەکرا، بەڵکو بەشێوەیەکی ناپەسند هەندێ لە کادیرەکان گوتبویان (زرار دەیەوێت حزب خانوێك دروست بکات لەکاتی ڕۆیشتن بۆ خۆی بمێنێتەوە)، هەر بەوەش ڕازی نەبوون بەبابمو عزەتیان ڕاگەیاندبوو (زرار پێی خۆش نییە حزب خانوتان بۆ بکات).

بەڵێ خانوەکەیان کردو چوونە ناوی، بەڵام زۆری نەخایاند کە داوایان لێ کرا بەتاڵ بکرێت، بەو بیانوە نابێت بارەگای حزب لەناو گوند بێتو خانوەکەشیان پێویستە، لەدوای زیانێکی زۆر هەر گەڕانەوە سەر ڕای من ناچار بوون داوا لەمن بکەن لە دەرەوەی گوند خانوێك دروست بکەم، ئەوەبوو لەنوێ کەوتینە دەستوبرد خانوێکمان دروست کرد لەگردی (هەمزەبەگ) بوە بارەگای سەربەخۆی هەرێم تا ساڵی (١٩٧٣) تێیدابوین، بێگومان خانوەکە ساڵی (١٩٧٠) دروستکرا بەفەرمانی (کەریم ئەحمەد).

# ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٦٧

ئەوەی بەدیارکەوت لەدوای سەرکەوتنی داستانە مەزنەکەی هەندرێن لەکۆنفرانسی (کەلێتە) لەساڵی (١٩٦٦)، فاخیر حمدئاغا کەوتە ململانێو کینە لەگەڵ حزب، ئەم کێشەو ململانییە بەوە گەیشت فاخیر لە حزب جیا بووەوە، دیار بوو فاخیر هەندێ لە دابراوەکانی لە دەوری خۆی کۆکردنەوە خەریکی جمو جۆڵێك بوو، پێش بەدیارکەوتنی کۆمەڵی (عزیز حاج) بەرێکەوت لەگەڵ (ڕەشید)ی برای فاخیر ڕۆیشتمەماڵی (حمد ئاغا) لە چۆمان شەو لەوێ مامەوە ئەو شەوە هەستم بەوە کرد کەوا فاخیر خەریکی جموجۆڵێکە شتێکی بەدەستەوەیە، بەلاّم بۆم ڕوون نەبوو ئەو جموجۆڵە چییە. لەگەڕانەوەم لەم بارەیەوە بەنامەیەك ئاگاداری هەرێمی حزبم کرد، لە دوای چەند ڕۆژێك لەگەڵ (کەریم ئەحمەد) بەیەك گەیشتین ناوبراو گوتی: (نامەکەت گەیشت سوپاست دەکەین ئەو جموجۆڵەی فاخیر دژ بەئێمە نییە، ئەوان کۆمەڵێکن بەنیازن حزبێك دروست بکەن گوێ بەدەستی منداڵەکانی بارزانی دەبن)، هەروەها دەربارەی دانیشتنی من دوور لەحزب گوتی: (نابێ ئەوها دوور بیت سەفەرێکم لە پێشە بگەڕێمەوە لێی دەدوێین).

لەسەرەتای بەهاری ساڵی (١٩٦٧) خەریکی خانووکردن بووم لە (دەرگەڵە) لەڕۆژانی هەڵکەندنی بناغەی خانوو ڕۆژێك دوو سێ پیرە پیاوی گوند پەیدا بوون (حەسەنی بوکە فاتێو قادری فەقێ وەسمانیو عەبابکری عەدێ) لامان دانیشتن لەگەڵیان کەوتینە قسە، بە(مام حسن)م گوت: (زۆر لەمێژە بەو نیازەم بێم بۆ لات کۆمەڵێك پرسیارم هەن دەربارەی زنجیرەی بنەماڵەی میرەکانی دەرگەڵە، ئەو ڕیش سپیانەی لەگەڵیان دواوم هەتا میریش خۆی دەڵێت مام حەسەن لە هەموومان شارەزاترەو باشتر دەزانێت دەربارەی ئەو سەربردانە)، مام حەسەن هەر زوو گوتی: (بفەرموو ئەگەر ئارەزووت هەبێت هەر ئێستا ئامادەم ئەوەی بزانم بۆت باس بکەم)، بەڕاستی هەلێکی گونجاوی لەبار بوو هەر ئەوکاتە لەگەڵ ئەو پیاوە ووشیارە ڕۆیشتینە ژێر سێبەری دار(تاووك) لەگەڵی دانیشتم ئەوەی مەرامم بوو نووسیم هەر ئەو نوسینەشم هەڵبژاردو کردم بەسەرچاوەی ئەو نوسینەم ئەوەی دەربارەی (دەرگەڵەو

میرەکان)م نوسیوە، بێگومان سودێکی باشم لەو دانیشتنە بینی لەگەڵ ئەو پیاوە وشیارە نەخوێندەوارە!.

بێگومان ساڵی (١٩٦٧) بەزۆری سەرقاڵی دروست کردنی خانوەکەم بووم بەردەوام لەگەڵ کرێکارەکان لەسەر کار بووم بۆ دابین کردنی پێویستیەکان، ماوەیەکی زۆر بوو ئاگام لەهیچ نەبوو. ئێوارەیەك لە سەرەوە خەریکی ئاو ڕابەستن بووم بۆ قوڕکاری، کاتێك بانگ کرام بڕۆمەوە بۆ ماڵ میوانمان هاتوون، منیش بەپەلە ئاوم ڕابەستو چوومەوە، دەبینم میوانەکان (زرار عبداللهو سالحی سلێمانی ئەحمەد گۆن)ی ڕواندزی دانیشتبوون، بەلاّم بەلامەوە زۆر سەیر بوو، چونکە ئەوانە دەستو پێوەندەکانی (کاك فاخیر) بوون! خۆیشی بەدزی جڵەو بەدەستی شوێنێکی تربوو، چۆنو بۆچی هاتونەتە لای من؟! لە دوای بەخێر هاتنو چاكوچۆنی لەگەڵیان کەوتمە قسە،(زرار) هەر زوو گوتی: (ئێمە نێردراوی کاك فاخیرین نامەیەکمان بۆ هێناوی) نامەکەم لێ وەرگرت، کاتێك نامەکەی ناوبراوم خوێندەوە کەوتمە بیرکردنەوە لەوەی فاخیر چۆن بەناوی (قیادەی مەرکەزی عزیز حاج) نامە بۆ من دەنێریت، کەهیچ پەیوەندیەکم پێیانەوە نییە، بەو شێوەیە دڵنیا بێت لەگەڵی بڕۆم !!.

فاخیر دەیزانی کەمن لەکاروباری حزبی دوورمو لێیان ناڕازیم، بەڵکو خۆیشی دەستی لەدوور بوونەوەکەی من دا هەبوو، پێش ئەوەی خۆی جیابێتەوە لەحزبی شیوعی. ناوبراو لەنامەکەی دەڵێت (برای عزیز زرار لە بەغدا ئاڵوگۆڕێکی تەواوکراوە لە"یەمین" دراوەو تێك دراونو دەستیان بەسەر داگیراوە، بەپێویست دەزانرێت ئێمەش لێرە دەستیان لێ بوەشێنینو دەست بەسەر بارەگای هەرێم دا بگرین، بۆ ئەو مەبەستە زرارو صالح هاتن بۆ لاتان بۆ ئەوەی ئاگاداربن ئێستا من وا لە حافیزم چاوەڕوانی هاتنی پێشمەرگەکانم هەرکاتێ گەیشتن بۆ لام دێین بۆ دەرگەڵە، هەتا ئێمە دێین چاودێریان بکە کەلوپەلی بارەگا ڕانەگوێزنەوە) لەنامەکەی پلەو پایەی حزبی بۆمن دیار کردبوو نوسی بووی: ئەو"یەمین"ـەی زۆر لەمێژبوو لێی ناڕازی بووی نەما هیوادارم بەرەو ئاوات بڕۆین).

هەر زوو ئەوەم هاتەوە یاد کاتێك ناوبراو بەهەموو توانایەوە لە هەوڵدابدا بوو، بەناوی چەپڕەوی دوور بخرێمەوە لە حزب، وا ئێستا خۆی کردۆتە پێشڕەوی چەپ!؟

لە دوای خوێندنەوەی نامەکە بەڕاسپاردەکانم گوت: (ئێوە بڕۆنەوە من وەڵامی نامە بۆ فاخیر دەنێرم، ئەوەی پێویستە بۆی دەنووسم)، پێش ئەوی بڕۆن لە(زرار)م پرسی (کاک فاخیر لەنامەکەی دەڵێت ئەگەر پرسیارێکت هەبوو لە زرار بپرسە. هەڵگری نامە وەڵامتان دەداتەوە، دەمەوێ بزانم ئەگەر هاتوو دەست بەسەر بارەگای هەرێم دا گیرا ئەو بەپرسانەی "یەمین" لێرە چارەنوسیان چی دەبێت؟).

زرار بێ ڕاوەستان گوتی (کوڕە دەیان بەین بۆ کەندو دۆڵەکانی لای وەرتەو کەڵێتە بزریان دەکەین، نابێ هەر شوێنەواریشیان بێنێ!)

ئەوانم بەڕێ کردن، دانیشتم وەڵامی نامەکەی (فاخیر)م نوسیەوە بەو شێوەیە (بۆ برای بەڕێزم کاک فاخیر نامەکەت گەیشتە دەستم ئەوەی تێیدا نوسرابوو بۆم ڕوون بوەوە، ئەوەی جێگای پەرۆشیو نیگەرانیە ئەوەیە بیرم لەوە نەئەکردەوە هەنگاوی ئەوها دوور بهاوێیت بەو نیازە بیت دەست بەسەر بارەگای هەرێم دابگریت، وورد بیر بکەوە ئەگەر هەر بەونیازە بیت دەبێ ئەوە بزانیت ڕوو بەڕووی کارەساتێکی چاوەڕوان نەکراو دەبیتەوە، ئەویش ئەوەیە بارەگای هەرێم لەژێر سێبەری دارگوێزەکانی دەرگەڵەی سلێمان بەگە، لەتوانای کەس دا نییە دەست درێژ بکاتە سەر ئەو بارەگایە، ئەگەر هەر بەونیازەش بیت کە بێیت بۆ دەرگەڵە ئاگادار بەدەبێ بەسەر لاشەی ئەو ڕۆڵانەدا باز بدەیت ئەوانەی خۆت دەیان ناسی لەشەڕەکانی کۆرەکو هەندرێن کێن، لەپێش هەموویان بەسەر لاشەی زرار باز دەدەیت، ئەوکاتە دەتوانی بگەیتە هەرێم، ئەو هەرێمەی لەدەرگەڵەیە).

نامەکەم خستە ناو پاکەت لەگەڵ نامەی هاتوو ڕۆیشتمە گۆڕەپانی قوتابخانە لەبەرئەوەی بەشی زۆری کادیران لەوێ تۆپانەیان دەکرد، (مەلا ئەحمەد بانی خێلانی)م جیاکردەوە لەپێشدا پێم ڕاگەیاند ئەوکاتە نامەی فاخیرم دایە دەستی، لەگەڵ خوێندنەوەی نامەکە شێواو ئاڵۆز بوو، کاتێك هەستم کرد ڕەنگی گۆڕاو تێك چوو پێم گووت: (باوکی سەرباز خۆت تەنگاو مەکە نەك فاخیر هیچ کەسێك ناتوانێت بگاتە بارەگای هەرێم هەتا یەکێك لە ئێمە مابێت، نامەی بۆ فاخیرم نوسی بوو دامە دەستی کاتێك خوێندیەوە ناوبراو بارەشی هاویشتەملمو هەر ئەوەندە بوو نەدەگریاو بەس، تکام لێکرد نامەکەم بزر نەکرێت، چونکە دەمەوێتەوە بۆ پاراستن، ئەو نامەیەی بۆ (فاخیر)م نوسی بوو لێم وەرگرتەوەو بۆم ڕەوانە کرد، لە دواییدا

(مەلا ئەحمەد) گوتی: (هاورێ داوای لێبوردنت لێ دەکەین پاکی تۆ بەدیارکەوت‌و ناپاکی ئەوانیش بەرامبەر بەتۆو حزب بەدیارکەوت). ئەو دوو پێشمەرگەی نامەیان بۆ (فاخیر) بردبووە حافیز لە گەڕانەوەیان گوتیان کە نامەکەی خوێندەوە زۆر بەتوڕەیی هەستاو ڕۆیشتە خوارەوە بۆلای بەرزێوە، ئێوارەی هەمان ڕۆژی دوایی (ئەنوەری مام شریف بەگ) ڕاسپێردراوی عزەت بوو هاتە لام ناردبووی کە پێم بڵێت بۆچی خۆی لەکاری ئەوان دەگەیێنی خۆ ئەو لە حزب نەماوە با حەقی پێدانەبن. بە(ئەنوەر)م گوت: (بەعزەت بڵێ ئەو چەند لەغەمی هاو پەیمانەکەیەتی منیش ئەوەندە پەرۆشی بیرو باوەڕەکەمم زۆر شەرمە پارێزگاری لێ نەکەم). ئەو کێشەو بەسەرهاتانەی خرانە ڕوو ئەوکاتانەی بەبیر دەهێنامەوە کە(فاخیر) لەحزب دوورکەوتبوەوە وەك لەسەرەوەش باس کراوە کە بەڕێکەوت لە چۆمان مێوانی ماڵی (خاڵ حمد ئاغا) بووم ئەو شەوەی لەوێ بووم تەواو هەستم بەوە کرد (فاخیر) خەریکی جموجۆلێکە دیار بوو کۆمەڵە مرۆڤێکی بەدناوی ناپەسندی لە دەوری کۆبوبونەوەو فاخیر لەگەڵیان سەرقاڵ بوو ئاگاداری کەس نەبوو، کاتێك گەڕامەوە دەرگەڵە هەرچەندە پەیوەندیم بەحزبەوە نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا بەنامەیەك ئاگاداری هەرێمم کرد دەربارەی جموجۆڵەکانی (فاخیر)و چەند خاڵێکی تریش، هەروەکو لە پێشەوە نوسراوە (کەریم ئەحمەد) جموجۆڵەکەی بەهیچ هەڵ نەگرت کەچی زۆری نەخایاند کۆمەڵی (عزیز حاج) سەریان هەڵداو دەستەی (فاخیر)یش بەشداربوو ناوبراویش تێیدا کارگێڕ بوو دەوریشی پێ درابوو، لێرەدا بۆم هەیە بڵێم دەربارەی سەرکردەکانی حزبی شیوعی بەهەڵەدا نەچوو بووم کە هی ئەوە نین بتوانن هیواو ئاواتی خەڵکی ڕەنجدەرو زەحمەتکێش بەدی بێنن ئەوە بەدیارکەوت تەنیا خاوەنی قسەبوون‌و دوور لەکردار!.

لەدوای ئەوەی (فاخیر) سەرنەکەوت لەکارەکەی، شیوعیەکان لەدەرگەڵە کەوتنە هەوڵدان بۆ گەڕانەوەی من بۆ ڕیزی حزب بەشێوەیەکی تایبەت شیوعیەکانی دەرگەڵەو دەورو بەری‌و (باوکی شوان‌و جلال دەباغ) هەردووکیان خۆشەویستم بوون جیا لەحزبایەتی، هەوڵێکی زۆریاندا بۆ ئەوەی ڕازی ببم بگەڕێمەوە، هەروەها (ئەحمەد بانی خێلانی)یش پێی ڕاگەیاندم‌و گوتی: (ئەوەی دەربارەی تۆ کراوەو

نووسراوە بەدیارکەوت گشتی درۆ بووەو دوور لەڕاستیە تەنها کەیف پێ نەهاتن بووە).

ئەوەی ڕاستی بێت من بەقسەکانی (مەلا ئەحمەد) باوەڕم نەهات لەبەرئەوەی لەساڵی (١٩٦٤) (کەریم ئەحمەد)یش جۆرە ڕاگەیاندنێکی ئەوهای پێ ڕاگەیاندم کەچی زیاتر کەوتە ڕقەبەریو بەرهەڵست کاری، بەڵام ئەو هۆیەی هانی دام بگەڕێمەوە ئەوەبوو دەست درێژی دوژمنانی داخ لە دڵ بوو بۆسەر ئەو بیروباوەڕەی کە من باوەڕم پێی هەبوو، دەمبینی داخ لە دڵەکانی دژ بەو بیروباوەڕە گشتیان یەکیان گرتبووەوە بۆ لێدانو لەناو بردنی بیرو باوەڕەکەم، وایان دەزانی ئەو بیرو باوەڕە نەمرە لەناو دەچێت!.

خەونی دوژمنان پوچەڵ بووەوە لەمانگی دوازدەی (١٩٦٧) کۆنفرانسی سێی حزب لەناوچەی کۆیە لە گوندی (داربەسەر) بەسترا نوێنەرانی ڕواندزو باڵەکایەتی ئەمانەبوون (ئەکرەم ئاکرەیی، مەلا غفور ڕایەتی، زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، نجم الدین مامۆ حریری) لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی چەکدار، هەرلە دەرگەڵەوە بەپێیان ڕۆیشتین بەڕێگای وەرتێو بیتوێنو کۆیەدا بەرەو (داربەسەر) لە ڕێگادا لە سەروچاوە شەوێك میوانی (مامۆستا دڵزار)ی شاعر بووین شەوێکی خۆشمان لەگەڵی بەسەر برد.

چەند ڕۆژێك لە گوندی (دار بەسەر) لەماڵی (علی مولود) ماینەوەو بەشداری کۆنفرانسی سێ مان کرد لە کۆتاییدا بەهەمان ڕێگادا گەڕاینەوە بەدیوی ڕانیەدا. بەشەو دەڕۆیشتین، چونکە مەترسی ئەوە دەکرا حکومەت لەڕێگای خەلەکان هێرش بهێنێت. لەوکاتەی بەڕێ کەوتین کە بۆ کۆنفرانس بڕۆین بەهاوبەشی لەگەڵ (عزەتو علی خلیل) خەریکی دروست کردنی خانوێك بووم بۆ بنکەی تەندروستی لە دەرگەڵە، دروست کردنەکەی لەسەر شانی من بوو، تا تەواو بوو ئەزیەتێکی زۆر بەدواوە بوو، چونکە دەبوایە کەرستەکەی بەپشتی وەڵاخ لە حافیز بگوازرابایەوە بۆ دەرگەڵە سەرەڕای ئەو هەموو ماندوو بونەش لەزەرەر زیاتر هیچم پێ نەبڕا، ، تەنها ئەوەی دەستکەوت بووکلیلەکان لای من بوون، لە دوای تەواو بوونی ماوەیەك بەتاڵ بوو لەکاتی بەستنی کۆنگرەی یەکەمی هەرێم کلیلەکانم دایەدەستی (جلال دەباغ) بۆ ئەوەی کۆنگرەکەی تێدا ببەستن. لەکاتی ساردبوونەوەی مشتومڕی (عزیز حاج)

بەرێکەوت رۆژێك لەگەڵ باوکم رۆیشتمە (پاش کۆز) بۆ ماڵی (حمد ئاغای مێرگەسۆر)ی لەوێ لەگەڵ (فاخیر) بەیەك گەیشتین‌و ناوبراو دەستی کرد بەگلەیی‌و گازاندەو گوتی: (غەدرت کرد لەگەڵ من نەهاتی بەڵێنت پێ دەدەم تۆ سەد ساڵیش لەگەڵ ئەوان بیت بەو مەرامە ناگەیت کەتۆ هەوڵی بۆ دەدەی، بەهیچیش ناگەیت لەبەر ئەوە یەمین لەتۆو ئەوانەی وەك تۆن مەترسیان هەیە دڵنیابەرێگا نادەن ئەوەی مەرامتە بیکەیت، بەخۆڕایی خۆت ماندوو دەکەیت، ئەوە لەمن وەربگرە ئەوان پیاوی چالاك‌و چاو کراوەیان بەلاوە پەسند نییە، تۆ لە مێژە لە خاریجی قەوسی لەلای ئەوان!)، لەوەلأمدا گوتم: (کاك فاخیر لەگەڵ ئێوە بۆ ناو کێ هاتبام؟ بۆ ناو ئەوانەی لە دەوروبەری ئێوەبوون؟ ئەوانە کێن ناسنامەیان چییە؟ توخوا ئەوانەن نوێنەری چەپڕەوی عزیز حاج؟ بێ قەزا بیت بەڕاست ئەوانەی پاڵپشتی ئێوەیان دەگرت دڵسۆزی ڕێڕەوی چەپ بوون‌و لە غەمی چەپ دابوون‌و بەرهەڵستی یەمینیان دەرکرد؟ من هەموویان ناڵێم، بەلأم بەشی زۆریان دیاربوون) ناوبراو کەدیتی شتەکە لەوە گرانترە ئەوەی ئەو بەنیازی بوو لەسەری نەڕۆیشت تەنها ئەوەندەی گوت دوایی دەبینی.

لەدانیشتنەکەی نێوان باوکم‌و(حمد ئاغا) دیاربوو باوکم بە(حمد ئاغا)ی گوت: (وا دیارەو پێ دەچێت کە مەلامستەفا هیچی لەگەڵ فاخیر نەماوە بۆیە دەیەوێت کاری پێ بسپێرێت‌و باوەڕی پێ بکات)،

لەوەلأمدا (حمدئاغا) گوتی: (نا وەڵلا سلێمان بەگ بۆ ئەوەیەتی سەری بخاتە قوڕ، ئێوە خەراب تێ گەیشتوون، دەبینن چی بەسەر دێنێت) ئەوەی هەست دەکرا برایەکانیشی لە هەڵوێستی (فاخیر)نا ڕازی بوون.

# ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٦٨

لەسەرەتای بەهاری (١٩٦٨) بڕیار بوو کۆنفرانسی مەحەلی ببەسترێت لە هەمان گوند(داربەسەر) لەناوچەی کۆیە، جارێکی تر لە دەرگەڵە بەڕێ کەوتین لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی جاری پێشوو چووبووین بۆ کۆنفرانسی سێی حزب، هەمان ڕێگامان بڕی، ئەوەی جاری پێشو پێدا ڕۆیشتبووین، بەلاّم چی هەر لەدەرگەڵە دەرکەوتین باران لێی داین تا گەیشتینە ئەوێ. لەڕێگا دەڕۆیشتین ئێوارە بوو زۆر درەنگ گەیشتینە گوندی (کرۆژ) لە نزیك گوندی (سماقوڵی) ناچار شەو لەگوندی (کرۆژ)ماینەوە، گوندی ناوبراو سوتێنرابوو لە بەرامبەر خانوێکی لێ بوو گوتیان ئەوە چایخانەیە دیاربوو کەسی لێ نەبوو ناردمان خاوەنەکەی هات دەرگای بۆ کردینەوە، چایخانەکە ژورێکی بچوك بوو،جێگای چوار پێنج کەسی ئەگەر تێدابوبایەوە ئێمەش یانزە کەس بووین بارانیش بێ وەستان دەباری بەهەر شێوەیەك بوو بەقەڕاپەستانە دانیشتین بەبەرگی تەڕەوە تەنها بۆ ئەوەی زیاتر تەڕ نەبین، ئەوەی ڕاستی بێت لە بێ چارەیی بوو ئەگینا جێگای ئەوە نەبوو لێی بمێنیەوە، ئێمە لەوحاڵە ناخۆشە دابووین کۆمەڵێك لە پێشمەرگەکانی (عەریف علی خۆشناو) پەیدابوون بەهەموو عەقڵێکیان داوایان دەکرد دەبێ چایخانەکە بۆ ئەوان چۆڵ بکرێت لە دوای کێشەیەکی زۆر کەزانیان ئێمە پێشمەرگەی دەرگەڵەین زیاتر کێشەیان نەکردو ڕۆیشتن، ئەوەی ئەو شەوە دیمان لەیاد ناکرێت، بەیانی زوو بەرەو گوندی (داربەسەر) کەوتینە ڕێ بارانیش بێ وەستان دەباری‌و لاماندایە گوندی (گۆڕتەپە) ماوەیەك لەوێ ماینەوەو ڕۆیشتینە (داربەسەر)، کۆنفراسەکە ماوەی سێ ڕۆژی خایاند، دوای ئەو سێ ڕۆژە گەڕاینەوە، لەگەڕانەوەماندا کەگەیشتینە گوندی (هیزۆپ) ئاگادار کراین کە حکومەت بەنیازە هێرش بێنێت‌و خەڵك دەترسان‌و ئاڵۆزبوون، بەدرەنگەوە گەیشتینە گوندی (قەرەنیاغا) دیار بوو لەوێش خەڵك ئاڵۆز ببوون‌و دەترسان‌و پێشمەرگەش لەسەر ڕێگا بوون، لە گوندی ناوبراو کەمێك لە ماڵی هاوڕێیەك ماینەوەو دوایی ڕۆیشتین شەوێکی تاریك‌و ئەنگوستەچاو بوو لەبەر بارانی زۆریش هەموو ڕێگاکان ببونە قوڕ، بۆ بەیانی گەیشتینە گوندی (میرە بەگ) لە دوای حەسانەوەیەکی کورت بە(دوڵی

پڵینگاندا) بەڕێ کەوتین تا بەسەرکەوتینە سەر(زینی ئەستێرۆکان) لەوێ لاماندایە ماڵی منداڵەکانی شێخی، بۆ نیوەڕۆ میوانی ئەوان بووین، ئێوارە درەنگ گەیشتینەوە (ڕەژیکەریان) لەوێ (نجم الدین) ڕۆیشتەوە (ڕەزان) ماڵی لەوێ بوو، ئێمەش ڕۆیشتینەوە دەرگەڵەو دەبوایە بەیانی ڕێکەوتی (١٩٦٨/٣/٣١) لە (بەرسیرین) ئامادە بین بۆ ئاهەنگی دامەزراندنی حزب.

بێگومان ئێمە ئەندامانی لیژنەی قەزای ڕواندز کە ڕۆیشتین بۆ کۆنفرانس داوا لە (تحسین محمد خلیل) کرابوو کە نوێنەری قەزا بێت لە ئاهەنگی دامەزراندنی حزب، لەسەر ئەو ڕۆشناییە بەیانی لەگەڵ جەماوەر دەرۆیشتینە (بەرسیرین) کاتێك پێیان گوتم (نجم الدین) داوای کردووە مەکتەبی قەزا بچێتە لای کە چووم ناوبراو گوتی: (من شەو وتارم ئامادە کردووە خۆشم دەیخوێنمەوە گوێ بگرن با بۆتانی بخوێنمەوە) من گوتم: (لەگەڵ ئەوە نیم ئێوە بەپەلە ئامادەتان کردوە بیخوێنەوە با تحسین بەکارەکەی خۆی هەستێ) من بەنابەدڵی ڕۆیشتم. ئاهەنگ دەست پێکرا لەکاتێکا نۆرەی (نجم الدین) هات وتارەکەی خوێندەوە، ئەوەی شایانی باسە ئەوەندەی بەشەتوپەتیو ناڕێکی خوێندوە بەشێکی زۆری خەڵك بێزار بوونو هەستان ڕۆیشتن تا ئەو لە خوێندنەوەی ووتارەکەی تەواو بوو!.

لەسەردانێکم بۆ دۆڵی (سەکرانو زینویێو خەلان) لە گەڕانەوەمدا لامدایە (چۆمان) چوومە لای (حمدئاغا) لەوێ نەیانهێشت بگەڕێمەوە، ئەو شەوە لەوێ مامەوە دیاربوو (فاخیر)یش هاتبوەوە ناوبراو کەوتە قسەکردنو گوتی: (ئازیز تۆ هەڵەی نازانی بژی، پێم گوتی بڕۆ لای بارزانی لە گشت کێشەیەك ڕزگارت دەبێ، دەزانی چەند شت دەربارەی تۆ بەبارزانیو منداڵەکانی دەگات! بەڵام بەقسەی منت نەکردو زەرەرت کرد، کوڕە شۆڕش بارگەی عەتارە بارەکەی بەنرخەو لەگەڵی بڕۆ لە هەرجێگایەك بارەکە وەستا وەرەخوارو بەجێی بێڵە) لەولامدا گوتم: (کاکی برا ئێوە دەڵێن شۆڕش بارگەی عەتارەو بارەکەی بەنرخە ئەدی بیر لەوە ناکەیتەوە ئەو بارگەیە شتێکی ژەهراوی تێدا بێت! بەقوربان ئەو بارە بەمن هەڵناگیرێت هەرچەندی بەنرخیش بێت پیرۆزی ئەو کەسانە بێت کە پێیان هەڵ دەگیرێتو بێ ترس دەیخۆن کە دەشزانن ئەو بارگە سامانی کوردە!).

دیاربوو (خەلیل)ی ئامۆزای خۆی بەدەنگ هاتو گوتی (فاخیر ئەتۆ پێت ڕازەلیوە دەتەوێت کەسانی تریش لەگەڵ خۆت پاڵبدەی بۆ ئەوەی ڕابزەلن!) دیار بوو خەلیل پەست بوو ڕۆیشت.

لە(١٩٦٨/٧/١٧) حکومەتی (عارف) لەلایەن دارو دەستەی (عبدالرزاق الداودو ابراهیم النایف) بەبەشداری بەعسیەکان ڕوخێنراو جڵەوی دەسەلاتیان گرتە دەست، بەلام زۆری پێ نەچوو لە(٣٠/ ٧) بەعسیەکان (داود و نایف)و ئەوانەی لەگەڵیان بوون وەلایان نانو خۆیان جڵەوی دەسەلاتیان گرتە دەست، لەو دەمەش دا شەڕ گەرم بوو لەگەڵ پێشمەرگە، لەوکاتو ساتەدا زۆر تەنگاو بوون بەناچاری داوای ووتووێژیان کرد، بۆم هەیە بڵێم ئەو ووتو وێژانەی هەر لەسەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی کورد کران لەبێ توانایی ئەو دەسەلاتدارانە بووە ئەوانەی جڵەوی دەسەلاتیان دەگرتە دەست کاتێك جێ پێی خۆیان قایم دەکرد دەکەوتنەوە گەڕو بەبێ بەزەیی ئەوەی لەتوانایاندا هەبوو بەکاریان دەهێنا دژ بەکورد، هەر لەسەرەتای سالی (١٩٦٣) لەئەنجامی کودەتا ڕەشەکەی (١٤ی رەمەزان) ئەو بەعسییانە بوون بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کەوتنە ووتووێژ، ئەو ووتووێژە بەردەوام لەئارادا بوو تا ئەوکاتەی خۆیان قایم کردو سوودیان لەو سێ مانگەی وەستانی شەڕ وەرگرت، ئەوجا بەهەڕەشەو گوڕەشە داوایان لەشۆڕشگێڕانی کورد کرد لەماوەی چلو هەشت کاتژمێر چەکەکانیان بدەنە دەستەوە، ئەوان زۆر نامەردانە دەستیان لە شۆڕشگێڕان وەشاندو شەڕێکی خوێناویان بەرپاکرد تا ئەوکاتەی بەدەستی (عارف) نابووت کرانو پاشەکشەیان پێ کرا. لەگەڵ دەسەلاتی (عارف)یش لەسالی (١٩٦٤) کەوتنە ووتوێژو ڕێك کەوتنێك مۆرکرا لەبەر لاوازی ئەو ڕێك کەوتنە ناو دەبرا بەڕێك کەوتنی (سێوو پرتەقاڵ) لەدوای ماوەیەك بووەوە بەئالۆزیو لێکدان تا سەرکەوتنەکەی هەندرێن لە سالی (١٩٦٦)، لە ٢٩ی حوزەیران ڕێك کەوتنێك مۆرکرا ئەویش وەك دارێکی بێ سێبەر مایەوە تا سالی (١٩٧٠) ئەو بەزمە درێژەی کێشاو بەردەوام بوو، ئەوە بوو ڕێکەوتنەکەی ئادار مۆر کرا، لەو ڕێکەوتنەش بەعس ڕێگایەکی تری ڕەچاو کرد ئەویش ڕێگای تەڵەکە بازیو فرتوفێڵ بوو، ئەوەی دیاردەی هەمیشەیی بوو هەرجارەی ئالوگۆر دەبوو شەڕکەرەکان دەکەوتنە ووتووێژو شەڕیان بۆ ماوەیەك ڕادەگرت تا جێی پێی خۆیان قایم دەکردو دیسان ڕوویان

وەردەگێرایەوە بەچەکداریەتی کورد ڕازی نەدەبوونو شەڕیان دەست پێ دەکردەوەو دەکەوتنە بۆمبا باران کردنی کوردستان تا بێ توانا دەبوون، بەعسیەکان بەدرێژایی مێژوو زۆر بەتوندی دەستیان لە کورد وەشاندوە ئەوەی لە توانایان دابوە هەوڵیانداوە بۆ لێدانو نەمانی کورد، لە دوای زیانێکی زۆر ناچار کران کە ڕێکەوتن نامەی (ئادار) مۆر بکەن ئەویش لە دوای ئەو شکستەی لە شەڕە دژوارەکان توشی بوون کە بووە هۆی ئەوەی ملی پێ کەچ بکرێتو دان بەخواستی کورددا بنێتو شەڕ ڕابگرێت، زانیان ئیتر بەشەڕ سەر ناکەون، ئەو ڕێگایەی بەعس ڕەچاوی کرد ڕێگای فرتو فێڵو تەڵەکەبازی بوو، لەبەرئەوەی بۆیان بەدیارکەوت ناتوانن چەك بەکورد دابنێنو دیتیان پێشمەرگەی کورد دەستی دەگاتە هەر شوێنێك کە بیەوێ، وە بینیان لە ساڵی (١٩٦٩)دا چۆن لە دەزگا نەوتیەکانی کەرکوك درا.

بەعس هیچ چارەیەکی نەمابوو دەبوایە دان بنێت بەئۆتۆنۆمی لە کوردستاندا، بەلاّم بەپێی ئەو نەخشەیەی خۆیان کێشابویان ئەوەی لە دوای چوار ساڵ شەڕ وەستان ئەنجامی بەدیارکەوت! بەڵێ بەپێی ئەو پێکهاتنەی لە سەری ڕێك کەوتبوون دەبوایە چوارساڵ چاوەڕوان بن گوایا بەعس ئۆتۆنۆمی بەکورد دەدات، لە ماوەی ئەو چوار ساڵە بەعس بەئارەزووی خۆی کەوتە پیلان سازکردنو خۆئامادە کردن بۆ پێشێل کردنی بڕیارەکانی ڕێکەوتنەکەی (١١ی ئادار)و هەڵتەکاندنی بناغەی شۆڕش، یەکێك لەو پلانە گڵاوانەی بەعس بەڵگەی ڕاستیە کە کۆمەڵێك مەلایان ناردن لە ڕۆژی (٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١) بۆ حاجی ئۆمەران بەنیازی لەناو بردنی سەرکردەی شۆڕش بارزانی. دووەم پیلانیان هەر لەسەرەتای ڕێکەوتنەکەی ئادار بەعسیەکان کەوتنە هەوڵدان بۆ لێك ترازاندنی پارتیو هاوسەنگەرەکانی ئەوەبوو پارتیەکانی گوێ ڕایەڵی خۆیان هاندان لە دژی ئەوانەی لەناو یەك سەنگەردا دژ بەبەعس وەستابوون تا ئەو ڕۆژەی شۆڕش ملی بەبەعسیەکان شۆڕکردو داواکاریەکانی کوردی پەسند کرد، کەچی زوو کەوتنە بەرهەڵستی شیوعیەکان بەڵگەش بەدیارکەوت ئەو ڕۆژەی خەڵك دەڕۆیشتە پێشوازی (صدام) پێشوازیکەران هاواریان دەکرد: (پارتیو بەعس برایە شیوعی شوێنی نەمایە!). سێ یەم پیلانیان هەر زوو لە ڕێکەوتی (١٩٧٠/٣/٢١) لە حافیز ئەو دروشمانەی شیوعیەکان بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە هەڵیان واسیبوون لەلایەن ئەو جەماوەرەی کە دەچوونە چۆمان بۆ ئاهەنگی نەورۆز

دوویان لێ دڕاندن ئەگەر نەگەیشتبامێ گەورەترین ڕووداو ڕووی دەدا. چوارەم پیلانی بەعسیەکان: بەعس لە ڕێگای نێردراوەکانی بۆ کوردستانی ژێر دەسەلاتی شۆڕش توانی خەلکێکی زۆر بکڕێو زانیاری تەواویش لە بارەی هەموو شتێکەوە کۆبکاتەوە.

ئەوەی بەدیارکەوت بەعس بەبەرنامەیەکی قوڵەوە کەوتە کارکردنو پێویستی بەوە بوو شیوعیەکان دوور بخاتەوە لە پارتیو بیان قۆزێتەوە بۆئەوەی بیانخاتە ژێر باوەشی خۆیان، لێرەدا بەعس دوو ئامانجی هەبوو یەکەم: ئەوە بوو پارتی بێ پشتیوان بکات لەناوەوەو دەرەوە، دووەم: بەعس بەخۆی سوكو بەدناو بوو لە ناو کۆمەڵگای ناوەوەو دەرەوە پێویستی بەهاوپەیمانیەکی کاتی هەبوو لەگەڵ شیوعیەکان بۆ گەڕانەوەی باوەڕی چ لە ناوەوەو چ لە دەرەوە، کاتێك زانی شیوعیەکان لە پارتی دڵ ڕەنجاون یەکسەر توانی بۆلای خۆیان ڕابکێشێتو لەگەڵیان بڕوات تا ناوی خۆی پێ بەرزکردنەوەو زۆر شتیشیان لێ فێر بوون بۆ بەرژەوەندی خۆیانو بەهێز کردنی دەسەلاتیان، بەعسیەکان زۆر باش خۆیان قایم کرد. پاش ئەوەی مەرامی خۆیان جێ بەجێ کرد لە ڕێگای ئەوانەوە ناوی خۆیان گێڕایەوە ناو کۆمەڵگای ناوەوەو دەرەوەو زۆر شتیان نەدەزانی لێیان فێربوون، بێگومان بەبەدوورکەوتنەوەی شیوعیەکان لە پارتی ئەو جەماوەرەی لە ڕێگای ئەوانەوە پاڵپشتی پارتی بوون دورکەوتنەوە، ئەوەی دیار بوو بەعس لەهەردووکیان زیرەك تر بوو هەریەکەی بەلایەکدا پاڵدان تا مەرامی خۆی بەدی هات ئەوکاتە بەشیوعیەکانیشی گوت کش!! زیرەکی بەعس بەوە بەدیارکەوت لە ماوەی ئەو چوار ساڵەی شەڕ وەستان توانی خەلکێکی زۆر بۆلای خۆی ڕابکێشێتو ئەو دووحزبەش زۆر بەئاسانی بەهەڵەدا ببات‌و هەریەکەی بۆلایەك پاڵبداتو بەئارەزووی خۆی دەست لە هەردوکیان بوەشێنێو لە گۆڕەپانەکە تاکە سوار بێتو بەوان بڵێت خواتان لەگەڵ!! پارتی بەو هیوایە بوو بەهاوکاری شای دوژمنی کورد، کوردستان ئازاد بکاتو کورد بەمەرامی خۆی بگەیەنێ! شیوعیش لە ڕێگای بەعسی دوژمنەوە بەنیاز بوو بناغەی سۆسیالیزم لە عێراق دابڕێژێت لەگەڵ بەعس!!.

## بەشی دوازدەهەم

# ڕێککەوتنەکەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠

ئەوەی دیارە بەیانی ڕێککەوتن لە(١١ی ئادرای١٩٧٠) بلاوکرایەوە لەسەر ڕۆشنایی ئەو ڕێککەوتنەی لەسەری ڕێککەتبوون، لەگەڵ بلاوبوونەوەی بەیان بوو بەشادیو خۆشی جەماوەری کوردستان بەتێکڕایی، ئەوەش ئەوە دەگەێنێ کەکوردگەیشتە مەرامێك ئەویش ئۆتۆنۆمیە.

دوو ڕۆژ دوای بلاوبوونەوەی بەیانی ئادار باوکم ڕۆیشتە بەغدا، بەهۆی نەخۆشیەوە پێش ڕێکەوتنەکە ماوەیەك نەخۆش بوو، بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی (عزەت)ی لەگەڵ ڕۆیشتبوو، ماوەیەك لەوێ مانەوە.

لەگەڵ خۆشیو شادی ڕێکەوتنەکەی ئادار جەژنی نەورۆزیش نزیك بوو، خەڵکی ناوچە ئازاد کراوەکان خۆیان ساز دەکرد بۆ یادی بیرەوەری جەژنی نەورۆز، لەسەرەتاوە بەنیاز بوون لەیەك شوێن ئاهەنگی نەورۆزو ڕێککەوتن بەیەکەوە لەچۆمان بکرێت، بەلاّم لە دواییدا پارتی ڕای گۆڕیو ڕایان گەیاند کە ناتوانین لەگەڵ شیوعیەکان ئاهەنگ بگێڕین، دەترسین مەگەر حکومەت ڕازی نەبێت.

ئەگەرچی لەسەر بەنارمەیەك ڕێك کەوتبون بۆ ئاهەنگ گێڕان، بەلاّم بەو شێوەیە شیوعیەکان دڵ ڕەنجاوو نیگەران کران، ناچار بوون بکەونە دەستوبرد بۆ سازدانی ئاهەنگ، وەك هەموو ساڵەکانی پێشان لە(بەرزێوە) جێگای ئاهەنگ سازکرا، لەڕۆژی (١٩٧٠/٣/٢١)جەماوەر بەرەو شوێنە دیاریکراوەکان دەڕۆیشتن بۆ ئاهەنگ گێڕان ئەوەی دیاریدە بوو شیوعیەکان لە حافیز چەند دروشمێکی ڕازاوەی تەرزیان بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە هەڵواسی بوو، لەوکاتەی جەماوەری دەرگەڵە دابەزی بوونە سەر ڕێگای گشتی لە حافیز دەڕۆیشتن بۆ ئاهەنگ گێڕان، دیارە هەندێ لە پارتیە نەزانەکان پەلاماری دروشمە هەڵواسراوەکانیاندا بوو، یەك دوێکیان دڕاندبوون،

لەئەنجامی ئەو کارە نارێکە زۆری نەمابوو لەوێ بەگژ یەکدا بچن، بەلاّم زوو پێ ڕاگەیشتم توانیم لەیەکیان بەدوور بخەمەوە بەبێ ئەوەی کارێکی مەترسی دار ڕوو بدات، ئەوانەی دەڕۆیشتنە چۆمان بەڕێمان کردن، ئەوانەی دەچونە بەرزێوەش بەڕێمان کردن. بێگومان وەك بەرپرسێك ناوبژیم کردن، بەلاّم زیاتر لایەنی خزمایەتیم بەکارهێنا لەبەرئەوەی ئەوانەی کەسوور بوون هەموویان دەرگەڵەیی‌و خزمی یەکتربوون‌و هەمووشیان خزمی من بوون لەگەڵ ئەوەشدا پارتیەکان ڕۆیشتبوون بۆ لای بەرپرسەکانیان وایان نیشان دابوو گویا زرار بەو بیانوەوە لەپارتیەکانی داوەو بەرپرسەکانیش بەنیاز بوون من بگرن، بەلاّم گرتنی من ئەوەندە ئاسان نەبوو بۆیە ڕایان گرتبوو. کاتێك داوا لە(عولا ئاغا)ی فەرماندەی هێزی بالّەك دەکەن بۆ گرتنی من ناوبراو گوتبوی: (من ناتوانم زرار بگرم لەبەر ئەوهۆیانە): یەکەم ئەو پیاوە لەڕێ ڕۆیشتن لەگەڵ بارزانی بووە، دووەم: یەکێکە لە خۆبەختکەرانی هەندرێن: سێ یەم فەرماندەی هێزێکی چەکدارە، چوارەم: کوڕی سلێمان بەگە دەبێ پرس بەکاك ئیدریس بکرێت، لەبەر ئەوە ڕاوەستان هەتا باوکم دەگەڕێتەوە لە بەغدا. لەوکاتەی باوکم‌و عزەت گەڕانەوە پێش ئەوەی برۆنەوە دەرگەڵە ڕۆیشتنە(دیلمان) بۆ مالّی (بارزانی) یەك دوو ڕۆژ مانەوە لە دوای گەڕانەوەیان بۆ(دەرگەڵە) ئەوکاتە من لە بنکەی پێشمەرگەکانی (وارەکۆن) بووم، لە بارەگای (بارزانی) لەگوندی(قەسرێ) کاك (مسعود) ناردی برۆمە لای بەپێی نوسراوی ناردراو لەکاتی دیاریکراو لەوێ ئامادە بووم، بەدرێژایی ڕۆژانی بەهار چاوەڕێ بووم کە بانگ بکرێم بۆلای کاك (مسعود) هەربانگ نەکرام‌و دووسێ جاریش بە(مجید)ی کاتبی کاك (مسعود)م گوت، دواجار ئێوارەیەکی درەنگ بوو بەکاتبەکەم ڕاگەیاند من دەڕۆمەوە دوایی بەدواشمدا بنێرن نایەمەوە، دوای ئەم قسەیەم زۆری پێ نەچوو بانگ کرام، ئەوەی بەلامەوە زۆر سەیر بوو کە بانگ کرام بردمیان بۆ ژوورێك ئەو ژورە نەبوو کە کاك (مسعود) خۆی لێی دادەنیشت دیاربوو ڕئیس عورەفا(صالح ڕواندزی) لەوێ دانیشتبوو زۆری پێ نەچوو کاك (مسعود) هات‌و (فاخیرو فرنسۆ)ی لەگەڵدا بوون، بەخێرهاتنی لێکردم‌و دانیشت‌و گوتی: (دەزانی بۆچی ناردومانە بەدواتدا؟ چەند ئامۆژگاریەك هەیە پێت دەڵێین) منیش گوتم بەڵێ فەرموو، کاك (مسعود) گوتی: (ئەم حەز دکەین ئەتو خزمەتا میللەتێ خۆ بکەیت، یا دوویێ مرۆڤەکا عەجولی‌و

حەز ناکەین عەجولایەتی بکەیت، یا سێ پێ تۆ گوچکە خۆ بدە بابو برایێت خۆ).
لە دوای قسەکانی کاك (مسعود) پرسیم ڕێگا هەیە وەڵامی ئێوە بدەمەوە؟ گوتی بەڵێ بفەرموو، منیش گوتم: (ئێوە دەڵێن خزمەتا میللەتێ خۆ بکە، دیارە ئەو هەموو دەردەسەریو بەسەرهاتو ماڵ وێرانیەی پێیدا تێپەڕ بوومو ئێوەش باش دەیزانن ئەگەر ئەوە خزمەت نەبێ بەمیللەتم دەبێ لەوە زیاتر خزمەت چی بێت؟ دوەمیان بەدرێژایی ژیانم بەیادم نایەت زەللەیەکم لەکەس دابێتو دڵی کەسم لەخۆم ڕەنجاند بێت ئەوەی لە حافیزیش ڕوویدا وەك برایەك ناوبژیم کردوونو نەم هێشتوە کارەکە بگاتە ناخۆشی گەورە ئەوەیە عەجولی؟ ئەوەی تریان جەنابت دەڵێی گوێچکێ خۆ بدە بابو برایێت خۆ، وا بزانم ئێوەش باش دەزانن لەو ڕۆژەوەی چومەتە دەرەوەو چەکم هەڵگرتوە لە ژێر فەرمانی باوکمدا بوومە لەگیان بەخت کردن زیاتر چیدی هەیە؟ تەنیا ئەوەی بۆم نەکردوون بەروبومی گوندەکانم بۆ کۆنەکردونەتەوە باچاویان لەوە نەبێت، چونکە بۆیان ناکەم).

ئەوەی هەستم کرد کاك (مسعود) زۆر بەووردی گوێی لە قسەکانی من ڕاگرتبوو لە کۆتاییدا گوتی: (نابی دڵتەنگو نیگەران ببیت کە ناردومە بەدواتدا، تۆ لای ئێمە ڕێزت هەیەو یەکێکی لەوانەی لەگەڵ باوکم بوویت لە ڕێ ڕۆیشتنە مێژوویەکەی پەنجا ڕۆژی ئەوە کەم نیە). ئەمجارەیان(فرنسۆ) هاتە قسەکردنو گوتی: (بابو برات داوایان لێ کردووین کە بەروبومیان بۆ کۆبکەیتەوە، ئەوەی ئەتۆ گوتت شکایەتە لێیان دەکەی) یەکسەر پێم گوت: (کاکی برا تۆ بێ دەنگ بەئەوە کاری تۆ نیە خۆی تێ هەڵ دەکەی) لەوکاتەدا کاك (مسعود) هەستاو بە(فاخیر)ی گوت: (کاك زرار لەگەڵ خۆت بگەیەنە سەر پردی زەرد)، کاك (مسعود) ڕۆیشت، ڕۆژ درەنگ بوو تاریك داهاتبوو لەگەڵ (فاخیر) ڕۆیشتین تا سەر پردی زەرد ئەو دوو پێشمەرگەیەی لەگەڵم بوون (مینەی عولا)م ناردەوە (وارەکۆن)و(شێخۆ خدر)یشم لەگەڵ خۆم برد بۆ (دەرگەڵە) درەنگی شەو گەیشتینەوە (دەرگەڵە) هیچ ڕوناکیەك دیارنەبوو تەنیا لۆکسی ماڵی ئێمە دادەگیرسا کاتێك لە دەرگاکەماندا کچە ناوەندیەکەم گوێی لە دەنگی من بوو هاواری کرد: (دایە ئەوە باوکمە هاتەوە) ئەو هاوارەی کچەکەم زۆر سەرنج ڕاکێش بوو کە دانیشتین دایکی منداڵەکان زۆر بەئالۆزی گوتی: (لە بەیانیەوە ئێمە دەست لە ئەژنۆ دانیشتووینو ئەگرییێن، چونکە

مامیان عزەت گووتبوی زرار بانگی بارەگا کراوە لە قەسریّ دەگیریّو چەکیش دەکریّتو بەئیمەش چارەسەر ناکریّت !!) کە ئەمەم بیست ئەو کاتە تەواو بۆم ڕوون بوەوە کە بانگکردنی من لە سەر داوای ئەوان و ڕاسپاردەی ئەوان بووە زیاتر نا، بەلاّم ئەوەی جیّگای ڕەزامەندیم بوو کاك (مسعود) لەڕاستیەکان گەیشتو ئەوەی بۆ نەکردن ئەوەی مەرامو خواستیان بوو.

بەیانی لەگوند زاندرا کەوا زرار هاتۆتەوە، خەلّك دەهاتن بۆلاٌم سەردەمیّك دیار بوو (عزەت)یش پەیدا بوو، دیتی خەلّك دانیشتون کاتیّك هەستا گوتی: (کاکە ئەگەر ئەزیەت نەبیّت تا دەرەوە وەرە لەگەلّ چوونە دەرەوەمان پرسی: (ئەوە کاك مسعود بۆچی لە دوای ناردبووی؟) لەوەلاّمدا گوتم: (برا پیّویست دەکات بپرسیت لەسەر ڕاسپاردەی ئیّوە، ئەوەی داواتان لیّ کردبوون هیچی ترنا) دیاربوو عزەت دەستی کرد بەسوێند خواردن گوایا ئاگای لە هیچ نیە!

ئەوەی شایانی باس بیّت لەگەلّ ئەو بانگ کردنەی باس کراو کەوتمە بیرکردنەوەو ڕەئیم گۆڕا لەسەرەتادا بەنیاز نەبووم بگەڕیمەوە وەزیفە، بەلاّم بڕیارم دا بگەڕیمەوە وەزیفە، هەرچەندە باوەڕیشم بەحکومەت نەبوو، بەپیّی ڕیّکەوتننامەکەی ئادار داوا لە گشت فەرمان بەران کرابوو بگەڕیّنەوە سەرکارەکانیان، منیش گەیشتمە ئەو باوەڕە بگەڕیمەوە کەلەماموّستایەتی خزمەتی مندالّەکانم بکەم باشترە لەو مشتومڕەی منی تیّکەوتووم ئەگەر بیّنم تووشی بەلاّیەکیش دەکریّم، جا بۆیە باشترین ڕیّگا ئەوەیە دوور بکەومەوە. لەسەر ئەو ڕۆشنایيە ڕۆیشتمە هەولیّر بۆ ڕیّکخستنی ئیشو کارەکانم لە دوای تەواوکردنی پیّویستیەکان گەڕامەوەو هەولّمدا بڕۆمە دەرگەلّە، چونکە ئەوکاتە دەنگیّك هەبوو کەوا قوتابخانەی دەرگەلّە ناوەندیشی تیّدا دەکریّتەوە ئەوە ڕیّ خۆشکەر بوو بۆچوونی من بۆ دەرگەلّەو لەویّش مامەوە تا کۆتایی سالّی (١٩٧٣).

ئەوەی گرنگو پیّویستە ئەوەیە کە ڕیّککەوتننامەی(١١ی ئاداری ١٩٧٠) بەبیرو بۆچوونی خۆم هەلّبسەنگیّنم، ماوەی وەستانی شەڕ بۆ چوار سالّ ڕیّگادان بوو بەدوژمنانی جولاّنەوەی ڕزگاریخوازی کورد کەبەئارەزووی خۆیان بتوانن خۆیان کۆبکەنەوەو جیّ پیّی خۆیان قایم بکەن، بۆ ڕووبەڕوو بونەوەیەکی دژوارترو خویّناوی تر، ئەوەش بوو بەڕاستیەك لە ماوەی ئەو چوار سالّەدا توانیان ڕەگو ڕیشەی خۆیان

دابخەن‌و بچنە ناو ڕیزی کۆمەڵ‌و چەکدارانی کورد بەمەبەستی تێکدان‌و خراپەکاری ئەوەش ببوە دیاردەیەك‌و ناشاردرێتەوە. چوار ساڵ ماوە دان بەبەعس‌و شەڕ وەستان هەلێکی لەبار بوو توانیان زۆر لەسەرخۆ پرۆژەکانی خۆیان بەئارەزوی خۆیان دابڕێژن بۆ لێك ترازاندنی ڕیزەکانی پێشمەرگە، بەعس ماوەی دا بەبەرپرسانی پارتی‌و کاری دانە دەست، ئەوانیش وایان دەزانی ڕژێمی بەعس بەڕاستی لەگەڵیان ڕێك کەوتووەو ئیتر ئەوان بەو پلەو پایە گەیشتوون‌و ئەو پلەو پایەیان هەر دەمێنێ! هەرگیز بیریان لەوە نەدەکردەوە کە ئەمە دانەخۆرەیە!! ئەوەی کەوتە بەرچاوو بەدیارکەوت پلەو پایە وای لێکردن ئەو دەردەسەری‌و زەحمەتەی جەماوەریان لەیاد بچێ ئاوات‌و مەرامی خەڵکیش پشت گوێ خرا تا تەواو خەڵکیان بێزارو نیگەران کرد، بەکرداری ناپەسند هەڵ دەستان‌و جیاوازیان خستبووە ڕیزی کۆمەڵ‌و لەڕێگای ئەو جیاوازکاریە هەڵس‌وکەوت لەگەڵ ئەو خەڵکە دەکرا کەهەموو کاتێك لەگەڵیاندا بوون، لەشۆڕش‌و داواکارییەکانیشیان پشت گوێ دەخران، ئەمە زیانێکی گەورەی بە(پارتی) گەیاندو وای لێهاتبوو ئەگەر فەڕاشێك دابمەزرابوایە دەبوایە ببێ بە(پارتی) ئەگینا وەرنەدەگیرا، هەرگیز بیر لەوە نەدەکرایەوە ئاخۆ ئەوە بەکەڵکە یان نا؟ ئەوە کێیەو مەرامی چیە؟. خاڵە پرشنگدارەکە ئەوەیە خۆڕاگری‌و خواستی شۆڕشگێران ملیان بەبەعس شۆڕکردو وایان لێکرد دان بەمافی کوردا بنێت‌و ئۆتۆنۆمی بدات بەکوردستانی عێراق، کەبێگومان ئەوە دەسکەوتێکی زۆر گرنگ‌و بەرز بوو کە کورد بەدەستی هێنا، لەڕوویەکەوە بەعسی شۆڤێنی ڕەگەز پەرست ناچار کرا کە ئۆتۆنۆمی بەکورد بدات ئەگەر چی لەلای خۆیەوە فرت‌و فێڵ بوو، بەڵام ئەو دەنگە بەجیهان ڕاگەیەندرا، ئەوەی دیار بوو بەعس لەو ڕێك کەوتنە دوور بین بوو ئەویش بەوەی دەرکەوت یەك لە خاڵەکانی ڕێك کەوتنەکە ئەوەبوو دەبوایە هەموو فەرمانبەران بگەڕێنەوە سەرکارەکانیان کە ئەمەش بەعس بۆ مەرامێکی تایبەتی خۆی جێ بەجێی کرد ئەویش لە ڕێگای ئەوانەوە بەڵکو بتوانێ لەپیلان گێران دەست بەکار بێت، ئەوانەی لە نوێشەوە دادەمەزران دەبوایە لە ڕێگای پارتیەوە بێت، چوار ساڵ ڕێگا درا بەبەعس لەو ماوە درێژەدا چۆن ناتوانێ ئەوەی مەرامیەتی جێ بەجێی نەکات، پیاوەکانی بەعس زۆر بەووشیاری کەوتنە جوڵانەوەو توانیان ڕیزەکانی پێشمەرگە لێك بترازێنن‌و پیاوەکانی خۆشیان بنێرنە ناو ڕیزی چەکدارەکانی کورد بۆ

کاتی پێویستیان، خەڵك ئەوەیان باش دەزانی، بەلاَم کەس گوێی لە قسەی ئەوان نەدەگرت، پارتی هەرزوو بۆ ڕەزامەندی بەعسی خوێن ڕێژ هاوسەنگەرەکانی پشت گوێ خستو ڕێگای بۆ خۆشکردن لەگۆرەپانەکە بەئارەزووی خۆیان تەراتێن بکەن، ئەو خوێن ڕێژانە کە زانیان دەتوانن بەکاری دەست درێژی هەڵبستن هەوڵیاندا بۆ لەناو بردنی سەرۆکی شۆڕشو سەرکردەی هێزە چەکدارەکانی کورد(بارزانی) لە ڕێکەوتی (٢٩/٩/١٩٧١) لەحاجی ئۆمەران لە ڕێگای ناردنی چەند مەلایەك، بەلاَم سەرنەکەوتن، بەعس نیازی وابوو هەر بەلەناوبردنی (بارزانی) ئۆتۆنۆمیەکە پێشێل بکەن پێش ئەوەی چوار ساڵەکە تەواو بێت، ئەوە بوو پیلانی گلاَوی بەعسی شۆڤێنی.

## شیوعی و ڕێککەوتنەکەی ئاداری ١٩٧٠

لەدوای ڕێك کەوتنەکە زۆری پێ نەچوو پارتی داوای لە شیوعیەکان کرد چەکدارەکانیان لەسەر ڕێگا گشتیەکان دوور بخەنەوە دەترسن بەعس نارازی بێت لەبەرئەوەی دژی ئێوەن! لەهەمان کاتیشدا لە خوارووی عێراق خەڵکێکی زۆر بەکۆمەڵ ڕایان دەکرد لەدەستی بەعسیەکان دەهاتنە کوردستان، بنکەکانی حزبی شیوعی پڕ بوبوون لەڕاکردوەکان. لە دوای ڕێك کەوتنی ئادار حزبی شیوعی کەوتە دەستو بردو خۆ کۆکردنەوە بۆ بەستنی کۆنگرە لەوکاتوساتەشدا بوو خەڵکێکی زۆری خوارووی عێراق لەبەر زەبروزەگو ڕاوەدونان بەرەو کوردستان ڕایان دەکردو دەگەیشتنە بنکەکانی پێشمەرگە. لەسەرەتای هاوین (کریم ئەحمەد) بەرپرسی هەرێم لە(دەرگەڵە) داوای لێکردم کەلە شوێنێکی بەلاوەو دوور لەڕێگاکانی هاتوچۆ چەند کەپرێكو ساباتێکی گەورە دروست بکەین، پێی گوتم دروست کردنی ئەو کەپرو ساباتە بۆ بەستنی کۆنگرەیەو زۆر نهێنیەو نابێ دەربچێو تەنها لای خۆت بمێنێ، بۆ دۆزینەوەی شوێنێك چووینە گەڵی سەرەوەی گوند لە(کونێر) لەنزیك کانی (فەقێیان) شوێنمان دەست نیشان کردو لەوکاتەوە دروست کردنی کەپرو ساباتی خستە سەرشانی منو پارەی پێدامو کارەکانی بەمن سپارد، بێگومان دروست کردنی

چەند کەپرێك بۆ میوان بوو ساباتە گەورەکەش بۆگۆنگرە بوو ، هەروەها پارەی کڕین و دابین کردنی خواردنیشی پێدام لەگەڵ دیاریکردنی چەند ئافرەتێك بۆ نانکردنی ڕۆژانە ، هەر بەو شێوەیەش گواستنەوەی نوێنەرەکان لە حافیز بۆ شوێنی کۆنگرە بەمن سپێردرا.

هەرلەوکاتەوە دەست بەکار بووم و بۆکاتی دیاریکراو هەموو شتێك سازو ئامادە بوو، پەیتا پەیتا نوێنەرەکان دەگەیشتن، ئەو نوێنەرانە کە دەهاتن لە ژێر ناوی ڕاکردووەکانەوە دەگەیشتنە شوێنی کۆنگرە لە سەرووی گوندی دەرگەڵە لە (کونێر).

کۆنگرەی دووەمی حزبی شیوعی زۆر بەنهێنی بەسترا بەماوەی چەند ڕۆژێك کۆتایی بەکارەکانی هێناو لە دوای بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامەکانی کۆنگرە زاندرا کە کۆنگرە بەستراوەو کۆتایشی هاتووە، میوانەکانیش بەنهێنی بڵاوەیان لێ کردوو گەڕانەوە شوێنەکانیان بەبێ ئەوەی کۆسپ بخرێتە پێشیان، هەربەو شێوەیەش لەئایاری (١٩٦٩) کۆنگرەی یەکەمی هەرێم لەدەرگەڵە بەسترا لەو بنکە تەندروستیەی لەسەرەوە باسی کراوە کە کلیلەکانم دایە دەستی (جلال دەباغ) بۆ بەستنی کۆنگرەکەو ئەوەی لە تواناشدا هەبوو هاوکاریمان کرد تا کاتی تەواو بوونی کۆنگرە. ئەوەی دیاردەیە وەك لە سەرەوە نوسراوە هەر لەسەرەتای ڕوو وەرگێڕانی کاربەدەستانی (عبدالکریم) ڕۆژانی کودەتا ڕەشەکەی(١٤ی ڕەمەزانی خوێناوی ١٩٦٣) تا ڕۆیشتنم بۆ (بەغدا) لە کۆتایی (١٩٧٣) ئەوەندەی لە توانامدا هەبوو لە گشت رویەکەوە وێڕای منداڵەکانم یارمەتی دەری ئەو حزبەبووین کەسیش ناتوانێ ئەو ڕاستیە بشارێتەوە هەر لە سکرتێری یەکەمیانەوە تا بچوکترین ئەندامیان ئەوانەی لە (دەرگەڵە) بووینە لە نێوان ساڵانی (١٩٦٣ تا ١٩٧٣).

ئەوەی دیارەو ناشاردرێتەوە هەر لەو ڕۆژەی دەستم دایە چەك و لە ڕیزی هێزی لەشکری (سلێمان بەگ)ی باوکم دابووم هەردەم پارێزەری شیوعیەکان بویمە بەکردەوە وەك لە سەرەوە باس کراوە، هەر لەسایەی چالاکی دەست و بردی من ئەو ڕێکخراوەی لە دەرگەڵەو دەوروبەری هەبوو لەهیچ شوێنێکی تر نەبوو، ئەو چالاکی و دەست و بردە ببوە کۆسپ و دڵی زۆری کادیرانی خستبوە لەرزین هەر ئەوش وای کرد کادیرە بێ تواناکان بەهەموو توانایەکی لە رزۆکیانەوە کەوتبونە بەربەرەکانێ لەگەڵ من لەبەر ئەوەی ملکەچی فەرمانەکان نەبووم بەچاو بەستی لەبەر ئەو ڕاستیە بووین بە(مازی

کەری کون دەپاشۆڵی) ئەوەش ئەوە دەگەیەنیٚ کەوا بەرپرسانی سەرەوە گوێیان لەو ڕاپۆرتانە نەدەگرت کەلە خوارەوە بۆیان دەچوون لەلایەن خەڵکانی دڵسۆزی حزب، چونکە ئەوەی دەکرا دوور بوو لەهەموو خاڵەکانی پەیڕەوو پرۆگرام. ئەوەی جێگای سەرسوڕمانم بوو دەمدیت کاتێك نائب عەریفێك یان باش چاوەشێك ڕای دەکردو دەهاتە یەکێك لەبنکەکان گەرمتر بەپیریەوە دەچوون لەوەی مامۆستایەك یان یەکێکی ڕۆشنبیری هەست بەرز بهاتبایە بۆ لایان، ئەمە چی دەگەیەنیٚ؟ بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستیە ئەوەیە ئەوەندە ساڵانە لەگەڵ ئەو حزبەبووم زۆریان لە کادیرە بەرزەکان نەیان دەزانی کە دەرچوی زانکۆم ! تا ئەو کاتەی گەڕامەوە وەزیفە ئەوکاتە دەیان گوت: (چۆن زرار مامۆستایە؟!)

ئەوەی بۆم بەدیارکەوت ئەگەر نائب عەریفێك یان باش چاوەشێك بوومایە زۆر باشتر دەناسرامو زیاتریش ڕێزم لیٚ دەندرا لەبەرئەوەی ئەوان بەنەزانیو چاوبەسترایی ملکەچی کادیرە بەرپرسەکانن و باش دەزانن پۆستاڵ لێك بدەن، بێگومان پیاوی ڕۆشنبیر چاوپۆشـی لەکاری ناپەسندو ناڕەوا ناکات بۆیە لەلای ئەوان مرۆڤی ووشیارو چاوکراوە پەسند نەبوو، بەڵگەشم ئەوەیە ئەوەندە ساڵانەی لە ڕیزی ئەو حزبەبووم بۆ چەند جارێك دوور خراومەتەوە، تەنها لەبەر ڕوبەڕوبونەوەی کاروکرداری ناپەسندی بەرپرسانی بیٚ تواناو خۆپەرست، هەرچەندە زۆریش لێیان ناڕازی بووم، بەڵام ناچار دەبوایە لەگەڵیان بڕۆم، چونکە من خاوەن بیروباوەڕ بوومو ئەو دروشمانەی کە ئاواتی من بوون ئەوان بەرزیان کردبۆوە.

وەك بەدیارکەوت لە بەهاری (١٩٧١) گەڕانەوە سەر ئەو ڕایەی کە پێویستە خانوێکی سەربەخۆ دروست بکەن بۆ بارەگای هەرێم، دەست کرا بەکۆکردنەوەی کەڵو پەڵوکەرەستەی خانوو بۆ شوێنی دروست کردنی خانوەکەش (گردی هەمزە بەگ) دەست نیشان کراو دەست کرا بەدروست کردنی خانوو، بێگومان خانوێکی زۆر گەورە دروست کرا لە دەوروبەری خانوەکەش جۆرەها داروبەر چەقێندران هەرچوارلاشی پەرژین کراو ئاویشی بۆ ڕاکێشرا بەبۆڕی، ئەو خانوە شوێنی ڕاگەیاندنی هەرێمی تێدا بوو ڕۆژنامەی(ڕێگای کوردستان) لەویٚ دەردەکراو بڵاو دەکرایەوە لەگەڵ نوسینەکانی تر.

## کۆنگرەی مامۆستایان ساڵی ١٩٧٢

پێش نیوەی ساڵی (١٩٧٢) دەنگو باسی بەستنی کۆنگرەی مامۆستایان بڵاوکرایەوە وا بەدیارکەوت بەعس هەوڵی دەدا لەهەڵبژاردنی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان دەوری هەبێت، بێگومان (پارتی)ش باش دەیزانی شیوعیەکان لە ناو مامۆستایان جەماوەرێکی باشیان هەیە، ئەوانیش بەنیاز بوون لەدەوری شیوعیەکان کەم بکەنەوە، بۆ ئەوەی بەتەنیا بڕۆنە گۆڕەپان. بۆ ئەو مەبەستە (فرنسۆ هەریری) ئەوکاتە کرابووە، قائمقامی(گەلاڵە) دەستە دەستە مامۆستایانی بانگ دەکرد بۆ لای خۆیو هانی دەدان دەنگ بدەن بەلیستی (پارتی)و لە(شیوعی)ەکان دوور بکەونەوە، لەوکاتە مامۆستایانی دەرگەڵەشی بانگ کردبوون من نەچووم دەمزانی دەکەومە گفتوگۆ بۆیە وام بەباش زانی نەچم، دیاربوو زۆر قسەی کردبوو گوتبوی: (با زرار نەچێت بۆ هەولێر چوونی جێگای مەترسیە، حسێنی خدرئاغای بزانێ بەگرتنی دەدات لەبەر ئەوەی لەگەڵ عزەت نێوانیان خراپە!!) قسەکانی ناوبراو وای لەو مامۆستایانەش کردبوو کە لایەنگری ئێمەش بوون داوام لێ بکەن کە نەچم بۆ هەولێر، چونکە مەترسی دەبێ ! من دەمزانی ئەو پروپاگەندەیە چیەوچی لە دواوەیە! ئەوان دەیانزانی من لەناو مامۆستایان تا چ ڕادەیەك دەوردەبینم بۆ ئەوەیان بوو بەڵکو بترسێمو نەچم بۆ کۆنگرەی یەکێتی مامۆستایان، بەڵام من گوتم: (ئەگەر بزانم لەگەڵی علی بەگیش دەکوژرێم دەبێ هەربچم نابێ لەتوێژی خۆم کە مامۆستایانن دوور بکەومەوە). ئەوەی پێم ڕاگەیەندرا پێش بڕۆین بۆ کۆنگرەی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان ئەوە بوو کەرێککەوتنێك بووە لەنێوان پارتیو شیوعیەکانو چەند خاڵێکی تێدا دیارکرابوو بەتایبەتی ڕێك کەوتن بوون لەسەر لیستێکی هاوبەش بۆ کۆنگرەی گشتی لە بەغدا، لە کاتێکا گەیشتینە هەولێر بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان، لەیەك دوو دیدەنی بەشدار بووم شەوێك لە ماڵی (مامۆستا تاهیر) لەئازادیو شەوی دوایی لەماڵی (مامۆستا ئەحمەد شێخۆ) لەڕۆناکی، هەروەها لەگەڵ سەرۆکی یەکێتی مامۆستایان (کمال غەمبار)و ئەوانەی لەگەڵی بوون دانیشتین دەربارەی کۆنگرە قسەو باسمان ئاڵوگۆر کرد، ناوبراو ڕایگەیاند کە

(محەمەد ئیسماعیل) نوێنەری پارتی بەرپرسی مامۆستایانی پارتیە بەو ڕێکەوتنەی نێوان (پارتی‌و شیوعی) ڕازی نیەو کۆسپ دەخاتە پێشمان!

لەکاتی دیاریکراو کۆنگرەی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لە هۆڵی (گەل) لە هەولێر بەسترا، کۆنگرە ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام بوو، لەکۆتاییدا بۆمان دەرکەوت کە بەڕاست (محمد ئیسماعیل) بەو ڕێك کەوتنەی سەرەوە ڕازی نەبوو کە ئەوەی لەرێککەوتنەکەدا دیارکرابوو پێمان بدرێت، کە هەڵوێستی ناوبراومان بینی زۆر بەتوندی بەرپەرچمان دایەوەو پێمان ڕاگەیاندن ئێمە دەکشێینەوەو نایێن بۆ بەغدا، بۆ ئەو مەبەستە بڕیاردرا چەند مامۆستایەك دیاریکرێن‌و بڕۆن لەگەڵ بەرپرسانی پارتی دابنیشن بۆ ئەم کێشەیە، ئەوە بوو سێ مامۆستا دەست نیشان کران (ڕەئوف زوهدی) نوێنەری مامۆستایانی سلێمانی‌و(زرار سلێمان بەگ) نوێنەری هەولێرو مامۆستا (عبدالرحمان) نوێنەری دهۆك، ئەوکاتە(سامی عبدالرحمان‌و سالح یوسفی) هاتبوون بۆ چاودێری کۆنگرە، ڕۆیشتینە لای (سامی) لە میوانخانەی (هەورەمان) ناوبراو خەریکی ڕیش تاشین بوو، ئێمە هەڵوێستی (محمد ئیسماعیل)مان پێ ڕاگەیاندو پێمان گوت: (ئێمە نارەزامەندی خۆمان ڕادەگەیەنین کە بەو شێوەیە ڕێك کەوتنی سەرەوە پێ شێل دەکات، ئەگەر بەو شێوەیە بێت ئەوەی دەیڵێت ئەوا ئێمە دەکشێینەوەو بەشداری لە کۆنگرەی گشتی بەغدا ناکەین)، سامی گوتی: (چۆن دەکشێنەوە ئێوە حزبین دیارە دەتانەوێ ڕێك کەوتنەکە تێك بدەن‌و کۆنگرە نەکرێت!) منیش گوتم: (نەخێر محمد ئیسماعیل بەرێك کەوتنەکە ڕازی نیەو ڕێزی ناگرێ نەك ئێمە، ڕاستە ئێمە حزبین، بەڵام بەشی زۆری جەماوەری مامۆستایان حزبی نین بۆیە حزبیش ناتوانێ لەبەرژەوەندی مامۆستایانمان دوورمان بخاتەوەو ناچارمان بکات بەرژەوەندی زۆربەی زۆری مامۆستایانمان پشت گوێ بخرێت)، کە(سامی عبدالرحمان) بینی ئێمە توندین تەلەفۆنی بۆ مقدم (عزیز ئاکرەیی) کردو پێی گوت: (وەرە برادەرانی شیوعی هاتوون دیارە لەگەڵ محمد ئیسماعیل لێیان بووە بەکێشەو نەگەیشتونەتە یەك)، دوای ئەوەی (مقدم عزیز) هات شتەکەمان بەئەو ڕاگەیاند ئەوەبوو ناوبراو بانگی کردبوو، دیاربوو پاشەکشەی لەهەڵوێستەکەی کرد. لە دوای چارەسەری ناکۆکیەکان نوێنەرانی هەردوو لامان لە کاتی دیاریکراو بەرەو بەغدا ڕۆیشتن، شەوی دووەم لە بەغدا لە میوانخانە لەگەڵ (نامیق خورشید) کەوتمە کێشە،

ئێمە نوێنەرانی شیوعی لە مەترسی دابووین کەچی ناوبراو ئێوارەی ئەو ڕۆژە بەسەرخۆشی لە ناو میوانخانە دەگەڕاو داوای لە مامۆستایان دەکرد هەریەکەی سێ دیناری پێبدەن گوایا پیتاك بۆ حزب کۆدەکاتەوە بێ ئەوەی پرس بەکەس بکات، کاتێك هاتە ئەو ژوورەی ئێمەی لێبوین (منو کمال غەمبارو سلێمان شاکرو ئەنوەر سلێمان) دیاربوو وەك بەرپرسێکی حزبی دەدوا منیش پێم گوت: (کێ ڕای سپاردی بەوکارە هەڵبستی؟) ناچار بووم دەرم کردە دەرەوە، لەبەر ئەوەی پێش بگەڕێینەوە میوانخانە ئێوارەی ئەو ڕۆژە لە نزیك پردی هەڵواسراو (نامیق ئەفەندی)بەدەمانچە تەقەی کردبوو هیچیان پێ نەگوتبوو ئێمەش لەمەترسی دابووینو بەترسەوە دەگەڕاین، ئیتر لەوکاتەوە تەواو بووە جێگای شكو گومان بۆیە بڕیارماندا لەکاتی گەڕانەوەمان بۆ هەولێر لێی بدوێین. ئەوەندە ڕۆژانەی لە بەغدا بووین ئەوەی جێگای ڕەزامەندیو دڵخۆشیمان بوو دوو جار لەگەڵ (کمال غەمبارو محمد علی)خوارزای کاك (هەمزە عبدالله) ڕۆیشتینە ماڵی ناوبراو، بێگومان کاتێکی خۆشمان لەگەڵی بەسەربرد، دیدارەکانی ئەو پیاوە هەست بەرزە زۆر بەسود بوون بۆ ووشیارکردنەوەی من لە زۆر ڕووەوە، ئەو پیاوە ئەوەندەی بڵێی هەست بەرزو نیشتمان پەروەرو دڵسۆزی نەتەوەکەی بوو، ناوبراو زۆر بەپەرۆش بوو بۆ نەتەوەکەیو گەش بین نەبوو لە ڕێڕەوی کورد.

کۆنگرەی مامۆستایان لەبەغدا توشی گێروگرفت بوو، بەعس لەوکاتەوە دەیویست ناوی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان نەمێنێو بکەونە ژێر دەسەڵاتی بەغدا، ئەوەی بەعسی زۆر پێ تەنگاو ببوو مامۆستایانی کوردستان داوای گەڕانەوەی برا (فەیلیەکان)یان دەکرد بۆ سەر جێو ڕێی خۆیان، بۆ ئەم مەبەستە ڕوون کردنەوەیەکی دوورو درێژیان دایە کاربەدەستانی بەعس.

کە لە بەغدا گەڕاینەوە هەولێر ڕوونکردنەوەیەکمان دەربارەی هەڵوێستی (نامیق خورشید) دایە بەرپرسانی حزب بەناوی(کمال غەمبارو زرار سلێمان بەگو ئەنوەر سلێمانو سلێمان شاکر) کردارەکانی (نامیق)مان تێدا دیارکردنو ئاگادارمان کردن کەوا ئەو پیاوە جێگای گومانەو پیاوی بەعسە. جیا لەو ڕوونکردنەوەیە من خۆشم لەگەڵ بەرپرسی حزب لە هەولێر(مام قادر) کەوتمە کێشەو مشتومڕ لە سەر هەڵوێستی (نامیق)و کردارەکانی، ئەوەی بەدیارکەوت زۆری بەسەرنەچوو ئەوەی

دەربارەی ناوبراومان نیشاندا بوو هەمووی ڕاست دەرچوو، كە لە بەغدا گەڕاینەوە ڕۆژێكی زۆر تەڕ بوو هەر لە(كەركوك) بەفر دەباری تا گەیشتینەوە هەولێر، كە گەیشتینەوە هەولێر پێیان گوتین ڕێگای (ڕواندز) گیراوەو ئەوەندە بەفر باریبوو دوو ڕۆژ لە هەولێر ماینەوەو نەمانتوانی بگەڕێینەوە، كە ڕێگای (گەلی عەلی بەگ) كرایەوە ڕۆیشتینەوە (ڕواندز)، پێش ئەوەی لە هەولێر بگەڕێینەوە بیستبووم (وەهاب ئاغا) مردوە، مامۆستا (دلاوەر)ی برای لەگەڵ ئێمەدا بوو لەكۆنگرە، دڵم نەهات پێی بڵێم كاك (وەهاب) مردووە، هەربەم شێوەیەش دوو ڕۆژ لە (ڕواندز) مامەوەو نەمتوانی بڕۆمەوە دەرگەڵە، ئەوەندە بەفر كەوتبوو ئەو ڕۆژەی گەیشتمە حافیز هەر لەبەیانی لەوێ دەركەوتین دوو پێشمەرگەم لەگەڵ بوون ئێوارە بەدرەنگەوە گەیشتنەوە گوند.

ئەوەی زۆر خۆش بوو باوكی شوان (قادر ڕشید) باسی بەفرو ئەو ڕنوەی بۆ گێڕامەوە ئەوەی بەسەر ماڵی باوكم دا هاتبووە خوارەوەو دەوری (خلیل بەگ چی بوە؟).

(خەلیل بەگ) گەنجێكی كورتە باڵا بوو، ناوبراو شیوعیەكی زۆر دڵسۆز بوو لەسەر بیروڕای خۆی بەردەوام لەگەڵ (ئەبو شوان) دەدوا، ڕۆژێك (ئەبو شوان) پێی گوت (خەلیل بەگ غەمت نەبێت‌و شكی تێدا نییە نۆرەی من‌و تۆش دێت، دەبین بەئەندامی ئەنجومەنە كارتۆنیەكەی داندراوی بەعس!) خەلیل بەگ پەست بوو، یەكسەرگوتی: (قسەی قۆڕ توخوا ئەوەی نیشتمان پەروەر بێت لەگەڵ ئەو فاشیانە دادە نیشێ؟) ئەبو شوان گوتی: (باوكم ئەوە حزبمان لەگەڵیان دادەنیشێ، ئێمە چی بكەین) خەلیل بەگ زۆر بەڕووگرژی‌و تووڕەیی گوتی: (كاكە ئەگەر نۆرەمان هات تۆ بڕۆ من لەگەڵت نایەم) ناوبراو بەتووڕەیی هەستاو ڕۆیشت، پێمان نەگەڕایەوە.

### *ڕووداوەكانی ساڵی ١٩٧٣:*

لەسەرەتای ساڵی (١٩٧٣) لەبارەگای هەرێم لەدەرگەڵە لەخانوە نوێیەكە دەورەی كادیران كرایەوە بۆ پەروەردەو پێگەیاندنی كادیر، كۆمەڵێك مامۆستای پایەبەرزو بەتوانا هاتنە (دەرگەڵە) دووسێ یەكیان پلەی دكتۆرایان هەبوو وەك (دكتۆركازم حبیب‌و نەمیر عانی) ئەوجا یەكێك كرابووە بەرپرسی ئەم خولە بەرزە بەناوی عمر

الیاس (ئەبو ریاز)، ناوبراو ئەفسەرێکی سوپایی بوو ڕای کردبوو ئەو کارەی پێ سپێردرابوو، لە ڕاستیدا کاری ئەو نەبوو!!

بەڵێ لە هەموو لایەکەوە بۆ ئەو خولە کادیر هاتبوون لە جۆرەها کادیر، ئەوەی دەمەوێت دیاری بکەم ئەوەیە شەوێك درەنگ بوو هاتن بەدوامدا کە بڕۆمە بارەگا، چونکە ڕوداوێکی ناخۆشی ڕوویداوەو دوورنیە ئەو ڕووداوە زیاتر پەرەبسێنێ‌و ئاڵۆزتر ببێت، بەپەلە ڕۆیشتم بینیم یەکێك لە بەشداربوانی خولەکە کە بەغدایی بوو لەگەڵ کارمەندی بارەگا (عبدالله ڕوستایی) بەگژیەکدا چووبون، وا دیار بوو کارەکە بەوە گەیشتبوو بەماموستایەکانیش نەیانتوانی بوو پێکیان بێننەوەو بڕیارێك وەربگرن، (ئەبو ریاز)یش فەرمانێکی سەربازی دابووکە دەبێ هەر ئەم شەوە بڕواتو لەبارەگا نەمێنێ! (عبدالله) بەفەرمانی (ئەبو ریاز) لەبارەگا دانەندرابوو، لەبەرئەوەی پێی گوتبوو: (کێ منی لێرە داناوە با ئەو پێم بڵێ لێرە بڕۆ) ئەبو ریازیش وەك پیشەکەی خۆی هەر بەردەوام بووە لە سەر هەڵوێستەکەی‌و داوای کردبوو کە دەبێ هەر بڕوات.

کاتێك گەیشتمە ئەوێ بەماوەیەکی کورت توانیم پێکیان بینمەوەو هیچ لە گۆڕێ نەمێنێ‌و ناردم بەدوای(ئەبو ریاز)دا کە هات بینی کەوا ئەوانە پێك هاتونەتەوە زۆر بەتوڕەیی دەیگوت: (بڕیارم داوە دەبێ عبدالله بڕواتو نابێت لێرە بمێنێ)، بەڵام کە دیتی بەرپەرچی دراوەو فەرمانی سەربازی ناخوات ناچار بوو بەپێکهاتنەوەکە ڕازی ببێت.

***میوانداری:*** لەهاوینی (١٩٧٣) ڕۆژێك (ئەبو حکمت) بەرپرسی ئەوکاتەی هەرێمی حزبی شیوعی عێراقی هاتە لامو گوتی: (هاوڕێ، ئەوا مام جلالو برادەرەکانی ئەوم بانگ کردوەو دێنە ئێرە، خۆت دەزانی لەبارەگا ئەو ئازادیەمان نابێت کەدەمانەوێت، لەبەرئەوە بەباشی دەزانم کە ئێمە هەموو پێویستیەکانی میوانداریەکە بهێنین‌و لەماڵی ئێوەش بۆمان ئامادە بکرێتو هەرلەوێش دادەنیشین)، لە ڕۆژی دیاریکراودا کاتژمێر دەی بەیانی (مام جلالو عمر دەبابەو علی عەسکەری) لەگەڵ سێ چەکدار گەیشتنە دەرگەڵەو لەماڵی ئێمە دابەزین، لە دوای پشوێکی کورت ڕۆیشتینە بارەگا بەڕێگای ناو باخچەکاندا سەرکەوتین، ماوەیەك لە بارەگا دانیشتین لەگەڵ پێشمەرگەکانی بارەگا قسەیان کردو وەڵامی

هەندێ پرسیاریان دانەوە، بەتایبەتی دەربارەی گەڕانەوەیان، لە دواییدا بەرەو گوند گەڕاینەوە لە ناو گۆڕستانی (غەریبۆکان) گەیشتینە مامۆستایانی گوند کە هاتبوونە دیدەنی (مام جلال)و هاوڕێکانی، لە دوای بەیەك گەیشتن (مام جلال) زۆر هەوڵی دا کەبگەڕێنەوە بارەگاو لەگەڵیان دابنیشێ، بەڵام مامۆستایەکان گوتیان ئەوا ئێوەمان بینی سوپاستان دەکەین، ئەوان بەڕێگای (ئاوەڕێژ)دا گەڕانەوە گوند ئێمەش بەڕێگا (قافلی)دا گەڕاینەوە ماڵی ئێمە، مامۆستایەکانیش ئەمانە بوون (تەحسین محمد، حسێن ئەفەندی، خلیل ئەحمد بەگ، شێرزاد سلێمان بەگ، حاجی خلیل حاجی) ئەمانە هەمویان مامۆستایانی قوتابخانەی دەرگەڵە بوون.

دەتوانم بڵێم ئەو ڕۆژە زۆربەی کاتەکە لەماڵی ئێمە دانیشتینو قسەو باسێکی زۆرمان کرد لە هەموو ڕوویەکەوە، (علی عەسکەری) ڕاستەوخۆ گوتی: (ئەگەر دووسێ ساڵ پێش ئێستا ئەو کاك زرارەم کەوتبایە دەست لەوانە بوو خوێنی بمژم، هەرلەبەر ئەوەی دەیان گوت زرار هەموو خەڵکی قەزای ڕواندزی کردۆتە شیوعی، بەڵام وا دیارە بەهەڵەدا چووبووم، چونکە نەمناسی بوو وەك ئەوەی ئێستا دەیناسم)، هەروەها کاك (عمر دەبابە) ئەوەی خستەوە یاد کەلە(حافیز) لە ساڵی (١٩٥٩) لەگەڵ (هەمزە عبداللەو نوری شاوەیس) کە بەیەك گەیشتین ناوبراو گوتی: (بیرو بۆچونی کاك زرار زۆر ڕاست دەرچوو، خۆ سێ ساڵی تەواو نەکرد کە لێك ترازاینو ڕامان کردو کوردستانمان بەجێ هێشت)، ئەو ڕۆژەمان زۆر بەخۆشی بەسەر برد.

بەعسو شیوعی: وەك بەدیارکەوت بەعس سودێکی زۆر باشی لەو چوار ساڵەی شەڕ وەستان وەرگرت، لەساڵی (١٩٧٣) دەنگوباس بڵاوبوەوە کەوا شیوعیەکان کەوتونەتە ووتوێژ لەگەڵ بەعس وا خەریکن ڕێك دەکەون، لەو ڕێك کەوتنەی نێوان (بەعسو شیوعی)، بەعس دوو ئامانجی ڕەچاو کردبوو. یەکەمیان: بەنیاز نەبوو خاڵەکانی ڕێکەوتنی ١١ی ئادار جێ بەجێ بکات، دووەمیان: بەعس بەدناو بوو لەناو کۆمەڵگای ناوەو دەرەوە بۆ ئەو مەبەستە بەپێویستی دەزانی لەگەڵ شیوعیەکان ڕێك بکەویو زۆر بەئاسانی توانی شوعیەکان لەخشتە بباتو لە پارتیان دوور بخاتەوە بۆ ئەوەی لەکاتی پێویست دەست لە پارتی بوەشێنیو واش پیشان بدات گوایا لەبەرەیەکی یەکگرتودا لەگەڵ شیوعیەکان داواکاریەکانی گەلی عێراق دابین دەکەن، کەچی مەرامی بەعس ئەوەبوو لە ژێرناوی ئەو بەرەیە بێ سەروبنەو پڕوپوچە

تاوانەکانی داپۆشیێو بیشاریتەوە، کورد گوتەنی(ئاش لەخەیاڵەکیو ئاشەوان لەخەیاڵەکی تر)، بەعس لەژێر پیلانی فرتو فێڵ توانی پارتی هان بداتو دەست لە شیوعیەکان بوەشێنیێ، ئەوەی مەرامی بەعس بوو ئەوە بوو پارتیو شیوعی لەچەند شوێنیك بەگژیەکدا چوونو بەعس لەژێرەوە یارمەتی شیوعیەکانی دەداو هانی دەدان بەتەواوی لەپارتیان دووربخاتەوەو لەناو جەماوەریش سوكو بێ ڕێز بین، زیرەکی بەعس بەوە دەرکەوت توانی هەردوو دوژمنانی خۆی ئەوانەی لەناو یەك سەنگەر شەڕی ئەویان دەرکردو ملیان پێ کەچ کرد کە بەیانی ١١ی ئادار مۆر بکات بەگژ یەکتریان دا بباتو لەیەکیان دوور بخاتەوە، ئەوەیان پێ بکات کەپێی کردن! لەسەرەتای ئەو بەگژیەکدا چوونەدا مەترسیەکی زۆر پەیدا بوو، ڕۆژێك دیارکرا برۆمە ڕواندز لەسەر داوای ڕێکخراو ڕۆیشتم دیاربوو لەماڵی (خدر حوسێن) چاوەڕوانی من بوون (ئەبو دڵشادو وەستا کەریم) لە هەولێرەوە نێردرابوون، ناوبراو پێی ڕاگەیاندم کەهاتوەو چەکی هێناوە بۆ ئەوەی بەسەر شیوعیەکاندا دابەش بکرێت، ئەگەر زیاتریش پێویست بوو بۆتانی دەنێرین.

ئەوکاتە من بەرپرسی لیژنەی بەرگری هێزی نهێنی بووم، دەبوایە من ئەو چەکە وەربگرم، بەڵام بەئامادەبوونی(خدر حوسێنوحسێن عزیز) ئەندامانی لیژنەی باس کراو بە(ئەبو دڵشاد)م گوت(من ئەوچەکانە وەرناگرم لەبەر ئەوەی تاوانە شیوعی چەکی بەعس هەڵبگری، ئەو چەکەی بەهەزاران شیوعیو ئازادی خوازی پێ شەهید کراون) لەگەڵ ئەوەش من هەستامو ڕۆیشتم، دیاربوو بەدوای ڕۆیشتنی من دا بەنابەدڵی چەکەکانیان بردبوەوە هەولێر تەنها چەند دەمانچەیەکیان گێڕابوونەوە زۆر بەنهێنی درابوونە چەند کەسێك، لەوکاتانەشدا بوو پڕوپاگەندەی حکومەتی بەعسو ڕاگەیاندنی پارتی یەکتریان خستبووە بەر شاڵاوی ناڕەزاییو لۆمەکردن، وەزع ڕووی لەئاڵۆزیدا بوو، بەڵام دەنگی پێك هێنانی بەرەی نێوان بەعسو شیوعیەکان لەناو کۆمەڵ بەربڵاو بوو، ئەگەر چی بەشێکی زۆریش لە شیوعیەکان ئەو بەرەیەیان بەپەسند نەدەزانیو دەیان پرسی ئەو بەرەیە لەگەڵ کێ؟!. دەبێ ئەوەش بڵێین لەماوەی ئەو چوار ساڵەی شەڕ وەستان، پارتی ئەوەندە بەساردو سوکی سەیری شیوعیەکانی دەکرد جێگای پەرۆش بوو بەو شێوەیە پاڵی دان لەگەڵ دوژمنیان دەست بخەنە ناو دەست وای لێ کردن ئەو بەرە سوکە مۆر بکەن، کە لەشەرمەزاری زیاتر هیچی تری

پێوە دیار نەبوو، ئەوەی ئەوانی پەست کردبوو ئەوەبوو کە پارتی هیچ ڕێزێکی بۆ ئەو هاوکاریەو ئەو خوێنەی ناو سەنگەرەکانی دژی دوژمنانی کورد دانەنا، ئەو پەستیەش ئەوانی بەرەو هەڵدێر هانداو توشی نسکۆی کردن، بەو شێوەیە پارتیش پشتی چۆڵ کراو بەعس بەمەرام گەیشت، ئەو لەیەك دابڕانەی پارتی‌و شیوعی ئامانجی ڕەچاو کراوی خواستی بەعس بوو لەماوەی ئەوچوارساڵەی شەڕ وەستان دارێژرابوو جیّ بەجیّ کرا.

لەدوای ئەوەی کەبەعس بەمەرام گەیشت شیوعیەکانی کردە سەرینی ژێر سەری خۆی‌و لەگەڵ پارتی کەوتەکێشەو مشتومڕ ڕۆژ بەڕۆژ ئاڵۆزی نێوان پارتی بەعس توندتر دەبوو، وا پیّ دەچوو بۆنی هەڵگیرسانەوەی شەڕی لیّ بکرێت، تا بەوەگەیشت بەرپرسانی پارتی کەوتنە هەڕەشەو گوڕەشە کە بیّ منەتن لە حکومەت ئەویش بەوە بەدیارکەوت لە سەرەتای مانگی(١١ی ١٩٧٣) دکتۆر محمود عوسمان لە (ڕێزانی مەلا ئیسماعیل) لە لێدوانێکی درێژ لەگەڵ کادیرەکانی پێشمەرگە گوتی: (ئەگەر ئەوجارە شەڕ دەست پیّ بکاتەوە شەڕەکان دەکەونە ناوشارەکان‌و بەچیمان لیّ بدەن بەو چەکەلێیان دەدەینەوە!!) بەڵکو توند تریش دوا، وەك ناوبراو ڕایگەیاند بەهەر جۆرە چەکێك لێیان بدرێت بەو جۆرە چەکەش وەڵامیان دەدەنەوە، ئەوەی دیاربوو ئەو لێدوانەی (د.محمود) بەشێك بوو لەهەڕەشەو گوڕەشەی بیّ بناوان، تەنیا بۆ بەرزکردنەوەی وورەی پێشمەرگەکان بوو زیاتر نا!. ئەوەی ئەوان یانی پارتی بەپاڵ پشتی خۆی دانابوو (شا)ی ئێران بوو، کەسی هەست بەرز هەبوو (شا)ی نەناسیبیّ، چەند پەناو پشتی کوردە!؟.

ئاڵۆزی‌و پەشێوی لە ئارادابوو چەند ڕۆژێك لە دوای کۆبونەوەکەی (ڕێزان) لە ڕێکەوتی (١٢/١١/١٩٧٣) ئێوارەکەی باوکم ناردی بەدوامدا، کاتی چووم لە هەیوانەکە دانیشتبوو منی جیا کردەوەو پێی گوتم: (هەر ئەمڕۆوە تا دوو بەیانی برۆ خۆت ڕزگار بکە، دیارە لە شیوعیەکان دەدرێت‌و چەکیان دەکەن، تۆش لای ئەوان لە زووەوە تاوانباری‌و ڕقیان لە تۆیە، خۆ بارزانیش ئەگەر ڕقی لەکەسێك بووەوە وازی لیّ ناهێنیّ،ئەوجا برۆ من (حمد ئاغا)نیم خۆم ڕابگرم، توانای پێشانم نەماوە ئەوەی بمەوێت بیکەم، تۆ بەخۆت برۆ لەغەمی منداڵەکانت دامەبە، ئەگەر من بمێنم نایێڵم چیان بەسەر بێت، ئەگەر دەرچووی نەکەی بیر لەگەڕانەوە بکەیتەوە،

ئەوەی دێت بۆلات بەقسەیان نەکەی، ئەگەر دەستی منیشیان پێ بێت باوەڕ نەکەیت، نەك نامەی من، دوور نییە بەناچاری نامەشت بۆ بنێرم باوەڕی پێ نەکەیتو نەگەڕێیەوە، من لەبەر برایەکانت دەبی وا خۆم نیشان بدەم کە لێت نارازیمە).

دەتوانم بلێم گرانترینو تاڵترین کاتم ئەو دەمەبووکە لای باوکم دەرکەوتم، ئەوەبوو دەمم گیراو هیچ قسەم پێ نەکران ڕۆیشتمە دەرەوە، ئەوەی ڕاستی بێت لەوە دەترسام تووشی دڵ وەستان ببم هەر ئەو دەمە گەڕامەوە ماڵ ناردم لێژنەی ڕێکخستنی دەرگەڵەم کۆکردەوە ئەو ڕاگەیاندنەم پێ ڕاگەیاندنو پێم گوتن (من خۆم نادەمە دەست دەرۆم)، دیاربوو ئەوانیش لەگەڵ ئەوە بوون هەمووومان بەیەکەوە بڕۆین. هەر بەو شەوە نامەیەکمان نووسی بۆ (ملازم ئەحمەد جبوری) ناوبراو لە (بەرسیرین) بوو نامەکەم بە(قادری حمدئاغاو عبداللە روستایی) ڕەوانەکرد بەمەرجێ بەرێگای (بەربۆر)دا ڕۆیشتن کەزۆر جێگای مەترسیە بەڕۆژ نەك بەشەو، دەبوایە هەر بەوشەوەش بگەڕابانەوە، لەنامەکەدا ئەوەی باوکم پێی ڕاگەیاندم بەڕوونی بۆم نووسی، ئەو شەوە نەنوستم، لای بەیانی ڕاسپێردراوەکان گەڕانەوە نامەیەکی (ملازم)یان هێنابوو پڕ بوو لەقسەی باوەڕ پێ نەکراوی دوور لەڕاستی، وای دیارکردبوو کە هیچ لە گۆڕێ نییەو نووسی بووی: (ئەگەر نیازتان وابێت بەچەکەوە بڕۆن بەناوی حزب پێتان دەڵێم ئێمە ڕازی نین، ئەگەر بێن بۆ گرتنتان نابێ ڕابکەن، ئەگەر خەیاڵتان وابێت بەیاخی بوون بڕۆن داوامان لێ بکرێت لەگەڵیان دێین بۆ گرتنتان، نابێت بەکارێکی چەوت هەڵبستن).

ئەوەی جێگای سەر سووڕمان بوو، کاتێك نامەی (ملازم)م خوێندەوە بەتەواوی بۆم ڕوون بوەوە کەبەرپرسانی حزبی شیوعی کەس ئاگای لەکەس نەبوو، بەڵگەش ئەوەیە لە دەربەندیخانو ئەلقۆشو دەشتی هەولێر شیوعیەکان ڕاو دەنێن شەڕیان دەکەن هەڵوێستی (باش ملازم)یش بەم شێوەیە بوو، بەڕاستی ئەوەی هەشم بوو نەماو کەوتمە بیرکردنەوە گەیشتمە ئەو ئەنجامە، گەلۆ بۆچی خۆم بەهیلاك بدەم کە دەبینم وا لەناو گێژاوی گێرە شێوێنیدا دەسوڕێمەوە؟) بەبرادەرانم گوت: (ئەوە نامەی بەرپرسی حزبەنووسیویەتی، ئەگەر ئێوە بەنیازن بەچەکەوە بڕۆن داوامان لێ بکەن بۆ گرتنتان دێین، تکایە بەوکارە هەڵنەستن، ئەوەیە هەڵوێستی حزبەپێ کوتەکەی ئێمە کەلەپێناویدا خۆمان بەکوشت دەدەین، ئەوەش هەڵوێستی سەرپەرشتکارانە

کەدەبیینن، تکایە ئاگاداری خۆتان بن من بەیەکجاری دەڕۆم لەگەڵ ئەو ملکەچانە نامێنم، بەڵام هەر دەشڕۆم).

ئەوەبوو بەیانی ڕۆیشتمە قوتابخانە بەناوی نەخۆشی کتابێکم وەرگرت لەگەڵ (قادری حمد ئاغا) ڕۆیشتینە (بەرسیرین) کاتێك لە بەرسیرین دابەزین دیاربوو (ملازم ئەحمەدو محمد فەیلی) خەریك بوون بڕۆنە لای (ئیدریس بارزانی) گۆیا چەند برادەرێك لە دۆڵی ڕۆست گیاون، دەڕۆن بەریان بدەن، لەو بەیەك گەیشتنەدا لەگەڵ (ملازم) دووبارە شتەکانم پێ ڕاگەیاندەوەو پێم گوت (لە دوای خوێندنەوەی نامەکەتان شەوی ڕابردوو هیچ باوەڕیەکم بەکارو کرداری ئێوە نەماوە، لەبەر ئەوە لە ئێستاوە لەگەڵ ئێوەنیم لەبەر ئەوەی بۆم بەدیار کەوت، کە ئێوە دوورن لەو مەرامەی من بەدوای کەوتووم، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی باوەڕتان بەئاڵو گۆڕ نییە، بەدەستی خۆتان هەر ڕۆژەی مل کەچی دەسەڵاتێکن، ئەوەی بەدەستەوە مابێت بیرو باوەڕە هیچی تر نەماوە، من دەڕۆم هەر لەبەر ئەوەی نەڵێن زرار لەترسان سەری بۆ دەسەڵاتی بارزانی شۆڕ کرد، ئەگینا نەدەڕۆیشتم، گەیشتومەتە ئەو باوەڕە حزبی شیوعی ڕووی لە شۆڕشگێڕی وەرگێڕاوە!!).

لە دوای مشتو مڕ لەگەڵ ملازمی ناوبراو ئەوەندە بەگەرمی دەدوا وای دەزانی هیچ لە گۆڕێ نیە دەی گوت: (خۆ ئێمە وەك دەربەندیخانو ئەلقۆش دەستمان نەوەشاندوە لێمان بدەن)، ئەوە بیرو ڕای ملازم بوو، پێی وابوو هەر بەدەستو نوێژ دەمێنێ، زۆری هەوڵدا ڕازیم بکات کە هیچ لە گۆڕێ نیە، بەڵام گوێم نەدایە قسەکانی، لە بەرسیرین ڕۆیشتم دەبوایە بڕۆمە (ڕواندز) بەشێکی ماڵم لە (ڕواندز) بوو لەبەر منداڵەکان، چونکە لەدواناوەندی دەیان خوێند، بەڕێکەوتن لەگەڵ ئۆتۆمبێلی دابەش کردنی خۆراکی قوتابیان (خلیل عزیز) بەرپرسی دابەش کردنی خۆراك تا سەرپردی (خەلکان) ڕۆیشتم کە گەیشتینە بازگەی (بەرزێوە) دیاربوو شیوعیەکان بەنیاز بوون بڕۆنە ڕواندزو ڕێگایان نەدەدان، (مام الیاس) وەستابوو منیش ناوبراوم لەگەڵ خۆم برد، لەسەر پردی (خەلکان) دابەزین، چونکە ئەو ئۆتۆمبێلەی ئێمەی پێ چووبوین لای نەدایە (ڕواندز)، وا ڕێك کەوت (مام الیاس) لەگەڵ تەکسیەك ڕۆیشت منیش لەلای مامۆستایەکانی قوتابخانەی جوندیان مامەوە چاوەڕوانی ئۆتۆمبێلم دەکرد، لەوێ لەگەڵ مامۆستا (دلاوەر محمد علی ئاغا)

بێشوکی کەوتمە دوان دەربارەی ئەو شالاّوەی نێوان پارتی‌و بەعس‌و شیوعیەکان کە لە ئارادابوو، دیاربوو ڕۆژنامەکانیان لا بوون زۆر بەتوندیان لەسەر یەکتریان نوسی بوو، دلاوەر پرسی: (چۆنی تیّ دەگەی، تۆ وورد بینی دەزانی؟) پێم گوت: (برام بۆ مێژوو لەلای خۆتی بنوسە پارتی‌و شیوعی هەلّدێران‌و بەعس توشی هەلّدرێری کردن‌و ڕاست نابنەوە، لەبەر ئەوەی پارتی پالّپشتی شایەو شیوعیش پالّپشتی بەعسە، ئەوانەش هەردوکیان دوژمنی هەرە دژواری کوردن) دیاربوو(دلاوەر) ڕازی نەبوو بەوەی کە گوتم پارتی توشی هەلّدێر بووە، بەلاّم پێم گوت: (پشو درێژ بە تەنگاو مەبە ئاخیرە باخ) لەگەلّ کۆتایی قسەکان خواحافیزیم لیّ کردن‌و ئۆتۆمبێلێك پەیدا بوو ڕۆیشتم بۆ (ڕواندز)، لە کاولۆك لە نزیك مستەوسەف دیاربوو قوتابی دواناوەندی (عبدالله چیچۆ) زۆر بەئالۆزی لە(ڕواندز) دەهاتە خوارەوەو چاوی بەمن کەوت لەناو ئۆتۆمبێل دەستی ڕاوەشاندو ڕۆیشتە خوارەوە، ناوبراو زۆر بەتەنگاوی گوتی: (مامۆستا بۆ کویّ دەچی؟ لەڕواندز پارتی بەشی زۆری شیوعیەکانی گرت‌و بەڕێی کردن‌و کەس نازانیّ بۆ کویّ؟ مەڕۆ دەتگرن! من ڕام کردوە ئەوەی بکەوێتە دەستیان دەیگرن!!) ڕۆیشتمەوە ناو ئۆتۆمبێل‌و خۆم ئالۆز نەکرد بۆ ئەوەی نەزانن ئەو کوڕە چی پیّ گوتم، بەسەر کەوتین لە ڕاستی قائمقامیەت هاتمە خوارەوە بەو بیانوەی کە دەرمە دائیرە بۆ ئەوەی ئەوانەی ناو ئۆتۆمبێل هەست نەکەن من لەبەر چی دابەزیم، لەویّ ڕۆیشتمە نەخۆشخانە ئیجازەیەکی حەوت ڕۆژیم وەرگرت، بەڕێگای لاپەڕگە چوومەوە مالّ، کاتێك دایکی شادومان منی بینی بەسەر سامیەوە گوتی: (ئەوە لێرە چ دەکەی وا شیوعیەکان دەگرن بڕۆ خۆت بشارەوە!) لەدوای ئاگاداری دایکی شادۆ ڕۆیشتمە مالّی (هەلّگورد ئیبراهیم ئاغا)ی جیرانمان، ئەوکاتە چاودێرانی پەروەردەیی (عزالدین فەیزی‌و لەتیف نادر ئاغا) لەویّ بوون، شادومانیشم نارد ئۆتۆمبێلێك بێنیّ بۆ ئەوەی برۆمە هەولێر، لەوکات‌و ساتانەشدا بەبەردەوامی پۆلیس‌و چەکدارەکانی پارتی دەگەڕان بەدوای شیوعیەکان، بێگومان ئەوکاتە پۆلیس لەژێر فەرمانی پارتیدا بوو لە شوێنە کوردیەکاندا، شادومان زوو ئۆتۆمبێلی هێناو هاتە مالّی (هەلّگورد)و گوتی: (بابەوەرە مێوانمان هاتون) لەویّ مالّ ئاوایم لە وان کردو دەرکەوتم‌و کچە گەورەکەم (پاکیزە) لەگەلّ خۆم هەلّگرت بەبیانوی نەخۆشی ڕۆیشتم بەرەو هەولێر، ئەوەی پێم بوو تەنها دەمانچەیەکی لامەی

بچوك بوو، بڕیارم ئەوەبوو لە هەر شوێنێك ڕام بگرن‌و بیانەوێت بمگرن تەقەیان لێ دەكەم، ئەگەرچی ئەوەی بەبەردەكەوێت‌و دەكوژرێت تاوانی نیە، بەڵام ناچار بووم بۆ ئەوەی نەگیرێم‌و بێ سەروشوێن نەكرێم دەبوایە لەكاتی پێویستدا ئەو كارە بكەم. بەڵام ئەوەی جێگای خۆشحاڵیم بوو تا هەولێر توشی هیچ نەبووین، لەگەڵ داكەوتنی تاریكی گەیشتینە ناو شار بارانێكی بەتاویش دەباری، لە چەند شوێنێك دەنگی تەقە دەهات لە پۆلیسەكانی سەر شەقامەكانم پرسی: (ئەو تەقەیە چیە؟) وەڵامیان ئەوەبوو (ڕاوە شیوعیە!!).

بەهەمان ئۆتۆمبێل چوومە ماڵی خانەخوێمان (یوسف سەوزەچی)، بەڵام دوو كۆڵان دوور لەماڵیان دابەزیم بەپێیان ڕۆیشتین لەنزیك منارەی چۆلی، لەدوای پشوێكی كورت دەركەوتم ڕۆیشتمە نادی فەرمان بەران، لەوێ چاوم بەمامۆستا (لەشكری یابە) كەوت ناوبراو بەسەرسامیەوە پرسی (ئەوە لێرە چی دەكەیت؟ خۆ ئەگەر عبدالوهاب ئەتروشی بزانیت تۆ لەهەولێری دونیات لێ دەنگ دەدات ئەوەندە لەتۆ داخ لە دڵە!.)

پرسیم: (ماڵە نهێنیەكانمان كەسیان تێدا نەماوە چۆڵ‌و هۆڵن، چیان بەسەر هاتووە؟) مامۆستا لەشكر گوتی: (بەدوایاندا مەگەڕێ بڕۆ لە شوێنێك خۆت بشارەوە باشترە با نەگیرێی...) هەر ئەوكاتە گەڕامەوە ماڵی (كاك یوسف)، بەیانی (شێرزۆی) كوڕی ناوبراو چوو (پاكیزە) ی بەڕێ كردەوە ڕواندزو ئۆتۆمبێلی هێناو منیش ڕۆیشتم بۆ بەغدا ماوەیەك لەماڵی (موحسین عەلاوی) مامەوە، ئەوەی باش بوو ئەوە بوو ئەو بروسكەی بۆ گرتنی من لە لایەن پارتیەوە كرا بوو دانەیەكم دەست كەوت لەگەڵ ئیجازەی نەخۆشیەكەم بردن بۆ تەربیەو داواكاریەكم نووسی بۆ ئەوەی بەڵكو لە شوێنێكم دابمەزرێنن، لە دوای چەند ڕۆژێك بەپێی داواكاریم لە گەڕەكی (حەبیبیە) لە قوتابخانەیەك داندرام، هەر لەوێش خانوێكم گرت زۆری پێ نەچوو منداڵەكانم لە ڕواندز هاتنە بەغدا (عزیز عومەر) بەئۆتۆمبێلەكەی خۆی ئەوكەل‌و پەلانەی لە ڕواندزمان هەبوون بۆی هێناینە بەغدا،

*ژیانم لە بەغدا:* بەڵێ ماڵم گەیشتە بەغدا بەڵام هەرلەوکاتەوە توشی ماندوو بوون‌و بێزاری هاتم، هەرخۆم دەزانم ئەو دەردەسەریە چی بوو کە تێی کەوتبووم، (زەکیە)ی کچم لە نەخۆشخانەی (ثورة) کەوتبوو عەرەبیشی نەدەزانی، دەبوایە بەیانیان بیبەم بۆ نەخۆشخانەو لەدوای تەواو بوونی دەوامیش بیهێنمەوە ماڵەوە، بەهەمان شێوە ئیش‌و کاری بازاڕیش دەبوایە بۆیان بکەم، لە جیاتی دەوامی خۆم.

من لە ناوەڕاستی مانگی (١١/١٩٧٣) چوومە بەغدا هەر لەوکاتەوە تا بەهاری (١٩٧٤) مشت‌و مڕو هەلا لە نێوان پارتی‌و بەعس بەردەوام بوو، لەوماوەیەدا لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت ماڵەکەم لە (حبیبیە) گواستەوە بۆ (بغداد الجدیدە) لەوێ لەدواناوەندی کۆماری داندرام، بێگومان ئەوێم پێ خۆش بوو، لە کۆمەڵگای مامۆستایان خانوێکم گرت‌و تیایدا جێ نیش بووم‌و نزیکیش بومەوە لە هەندێ برادەرو دۆستی خۆشەویستی وەکو (حەسەنی حاجی تاهیری ڕواندزی‌و برایەکەی حسێن‌و جمال خورشید کۆیی‌و مامۆستای بەرێز تحسین محمد ئامێدی نەعمان ئەمین)و چەندانی تریش، بەڕێوەبەری دواناوەندیەکەمان (خالد سامەرائی) پیاوێکی وشیارو ڕۆشنبیر بوو، ناوبراو ڕیزێکی تایبەتی دەگرتم، لە دواناوەندیەکەمان چەند مامۆستایەکی کوردی لێ بوو (شوکر مستەفاو سامی زاخۆلی‌و علی بامەڕنی) کەببونە جێگای خۆشحاڵیم. ئەوەی جێگای نیگەرانی بوو مشت‌و مڕی نێوان بەعس‌و بارزانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ توندترو ئاڵۆزتر دەبوو، خەڵکیش بەگشتی دەترسان نەوەك ببێتەوە شەڕو خوێنێکی زۆرتر بڕژێت. لەوکاتانەدا دەنگ وباس بلاوبوەوە کەوا (ئیدریس بارزانی) دێتە بەغدا بۆ چارەسەری کێشەکانیان، بەو نیازەی شەڕ نەبێتەوە، بەیانی کاتێك گەیشتمە قوتابخانە بەڕێوەبەرەکەمان (خالد) بەزەردەخەنەوە پێمی گوت: (مامۆستا زرار ئەوە ئیدریس بارزانی دێتە بەغداو کێشەکە کۆتایی دێت‌و شەڕ نابێتەوە) لەوەلامدا پێم گوت: (مامۆستا خالد باوەڕت هاتوە بەهاتنی ئیدریس بارزانی کێشەکە کۆتایی دێت؟!) باش بزانە هیچ گۆڕانکاریەك نابێت‌و شەڕ هەر دەبێتەوە، ئەگەر کورسیەکەی (بەکر)یش بدرێتە (ئیدریس) ئەو کێشەیە کۆتایی نایەت، ئەو شەڕە دەبێ هەر بکرێت لەبەر ئەوەی بەدەستی ئەوان نیەولەوان هەورازترە).

لەوکاتەی من دەدوام هەستم دەکرد (خالد) گرژ ببوو وەك بڵێی قسەکانی منی بەدڵ نەبوو، زۆری پێ نەچوو لە دوای هاتنی (کاك ئیدریس) بۆ بەغداو گەڕانەوەی پڕوپاگەندەی هەردوولا لە دژی یەکتر زیاتر لە پێشان کەوتەوە گەڕ، ئەوجا (خالد) پێی گوتم: (مامۆستا ئەمجارە بۆم دەرکەوت کە تۆ مرۆڤێکی ووشیارو دووربینیو باش تێگەیشتوی).

ئەوەی جێگای یادەوەریە لەوماوەیەی لە بەغدا بووم پەیوەندیم بەزۆر لە کوردە ناسراوەکانەوە هەبوو جیا لەوانەی لە سەرەوە ناویان هاتوە، ئەوەی زۆر بەکەڵکم هات (بابکرئاغا)ی پشدەری بوو، کاتێك چوومە بەغدا ڕۆژێك لەگەڵ (کەریم خان) چوومە لای لەنووسینگەی پارێزەری خۆی، ئەو پیاوە بەدڵێکی پاکەوە لەگەڵم دوا، هەر بەودڵە پاکەشیەوە یارمەتی دام لەزۆر ڕوەوە، لەکاتێکدا کرا بەسەرۆکی ئەنجومەنە داتا شراوەکەی تەشریعی، لەوکاتەی هێرشە خوێناویەکەی سوپا بەرەو کوردستان دەکرا بەیارمەتی ئەو پیاوە توانیم برۆمەوە ڕواندزو دەرگەڵە، پێش ئەوەی سوپای هێرش بەر بگاتە گوندەکانمان نامەیەکی (بابکر ئاغا)م بۆ بەرپرسی سوپای هێرش بەر (کەریم حمدانی) برد لە خەلیفان، ڕۆیشتمە لای ناوبراو ئاگاداری ئەو لیوایەی کرد کە دەڕۆیشتە دەرگەڵەو گوندەکانی دەوروبەری، لەکاتی تێپەڕ بوون بەگوندەکانی ئێمەدا ئەوخەڵکانەی نەڕۆیشتبوون بۆ ئێران لە مەترسی دابوون، بۆ ئەوەی ئەزیەت نەدرێن ڕۆیشتمە دەرگەڵە یەك دوو ڕۆژ لەوێ بووم هەتا سوپا تێپەڕ بوو، لە دواییدا ڕۆیشتمە حاجی ئۆمەران ڕۆژی (١٩٧٥/٤/٢٢) ڕۆیشتمە (زینوە) لەوێ بووین هەتا ئێوارە چاوم بە(حاجی محمدی برادۆستو عومەری شێخ عبداللهو مەلا تەهای شێخ وەتمانی) کەوت، عومەر گوتی: (پێرێ شەو عزەت لای ئێمە بوو دیار بوو زۆرکزو داماو بوو، پێی ناخۆش بوو کە دەڕواتە ئێران، بەلاّم ناچاریش بوو، ڕۆژی (٤/٢٣) لە حاجی ئۆمەران بووین هەوڵم دەدا نامەیەك بەکەسێکی باوەڕ پێکراو بنێرم، ئەو ڕۆژە بارانێکی زۆر بەتاو دەباری، شەو لەماڵی (پورە فاتم) ماینەوە شەو لەگەڵ (صادق حریری)و منداڵەکانی پوورە فاتم بە(ئەبو غایب)مان ڕابوارد، نامەیەکی درێژم بۆ (عزەت)ی برام نوسیو بۆم بەڕێ کرد، بۆم نووسی (برام ئەو شوێنەی ئێوە پەناتان بۆ بردوە زۆر لە بەعس بەناموس تر نییە، زۆر دەترسێم

بەپیل بەستی تەسلیمی عێراقتان بکەنەوە، ئەوجا لەپەنا شیشە ئاسنەکانی بەندیخانە فرمێسك بۆیەکتر برێژین).

لەو گەشتەی بۆ سەرەوەم کرد هاوکاریەکی باش بوو بۆ گوندەکانمان، لەزۆر شتم دوور خستنەوە کە دەستیان لێ نەدرێت، هەر بەوشێوەیە چەند جاری دیکەش سەردانی سەرەوەم کرد بەتایبەتی لەوکاتەی کە پەیتا پەیتا ئاوارەکان لە ئێران دەگەڕانەوە، سەردانی ئەو خزمانەم دەکرد، ئەوانەی دەگەڕانەوە سەرجێو ڕێی خۆیان، ئەوانەی بەدرەنگەوەش گەڕانەوە بەڕێ کرانە خوارووی عێراقو دابەشی سەر پارێزگایەکان کران.

لەکاتێکدا (بابکر ئاغا) کار بەدەستی دەوڵەت بوو هەستم دەکرد خەریك بوو ڕوو لەهەندێ پڕۆژەی خزمەتگوزاری سوود بەخش بکات، بەلاّم ئەوەی بەنیاز بوو لەگەڵ مەرامی بەعس نەدەگونجا، ئەوکاتە زانی ئەوەی بەعس دەیلێت دەربارەی کورد گوتەیە کردار نییە! وەك دیار بوو ئەوەندە ڕازی نەبوو لە هەڵوێستی بەعس بەرامبەر کێشەی کورد، بەلاّم وەك بڵێیت ناچار بوو لەگەڵیان بڕوات لەبەر ئەوەی ڕای کردبوو.

ئەوەی جێگای ڕەزامەندیم بوو لەوکاتەی بووە وەزیر کۆمەڵێك کاری باشی بۆکردم زۆر برایانە بوو، وەك گەڕانەوەی هەندێ لەکوردە دوور خراوەکانو دامەزراندنەوەی هەندێکیان، ئەوەی زۆر گرنگ بوو لەکاتێکی زۆر بەرتەنگ بەهانام هات، بێگومان لەوکاتەی ئاوارەکان کە لەئێران دەگەڕانەوەو بەڕێ دەکرانە خواروی عێراق منیش بەردەوام ئەمنی گشتی (امن العام) دەی نارد بەدوامدا، ئەگەر (بابکر ئاغا) نەبوایە ئەودەمە شوێن بزر دەکرام! ئەو پیاوە لە دەستی بەعس نەجاتی دامو هەر بەو شێوەیەش لەکاتی گەڕانەوەم لە ساڵی (١٩٧٩) بۆ هەولێر بەیارمەتی ئەو نەبوایە ڕێگام نەدەدرا بگەڕێمەوە بۆکوردستان ئەگەر نەبووبامە گوێ بەدەستی بەعس، لەبەر ئەوەی هەوڵێکی زۆریاندا بڕۆمە ژێر باڵیان، بەلاّم بۆیان نەکرا بەڵگەش ئەوە بوو(سەعدون غیدان) ناردی بەدوامدا داوای دەکرد بکرێم بەقائمقامی ڕواندز، بەلاّم چەند مەرجێکم خستە پێشیان یەك لەو مەرجانە پێم گوتن: (ئەوەی دەکرێتە قائمقام دەبێ بەعسی بێت، منیش حزبایەتی ناکەم، ئەگەر حزبایەتیش بکەم شیوعی بووم دەگەڕێمەوە ناوحزبی شیوعی) ناوبراو بینی مەرجەکان لەگەڵ خواستی ئەوان ناگونجێن وازیان لێ هێنام. دەسەلاّتداریەتی بەعس لە ڕێگای دارو دەستەکەی

هەوڵدەر بوون ڕازیم بکەن لەگەڵیان بڕۆم لەوکاتەی ئەنجومەنە دەستکردە داتاشراوەکەی بەعسە نیەت گلاوەکان دایان نا زۆریان لە پیاوە مل هوڕە کوردەکان ئەوانەی مل کەچی ڕژێم بوون هەوڵیان دەدا لەگەڵ خۆیان ڕام بکێشنە ژێر باری مل کەچی، ئەوە بوو بەڕاسپاردەی ئەوان دەیانویست بڕۆمە ئەو ئەنجومەنە کارتۆنیە بێ بناغەیەی کە دەست کردی بەعسی دوژمن بەکورد بوو، دوور لە خواستو ویستی کورد بەتێکڕایی.

هەر بۆ ئەو مەبەستەو بەونیازەش (عبیداللە بارزانی) کە تازە کرابوە وەزیر بەتەلەفۆن بانگی کردم بڕۆمە لای کاتێك ئۆتۆمبێلەکەی خۆی نارد بەدوامدا ڕۆیشتمە لای لەقسەکانی گوتی: (بڵێ هەرچیەکی داوا دەکەی، ئامادەم بۆت بکەمو دەزانم باوکم غەدرێکی زۆری لەتۆ کردووەوحەقی تۆی ژێر پێ خستوە من بۆت پڕ دەکەمەوە).

لە وەڵامدا پێم گوت (زۆر سوپاستان دەکەم من هیچم ناوێت لەوە زیاتر ئەوەی هەمە، مامۆستام لە قوتابخانە دەرس دەڵێمەوە، بەحەقی خۆمی دەزانم). ناوبراو قسەکانی بڕیم دەستی کرد بەلۆمەی باوکی دەی گوت: (من باش دەزانم باوکم بەقسەی کێ ئەو غەدرەی لەتۆ کردوە، بەڵام دەبێ تۆڵەت بۆ بکەمەوە). ئینجا کۆمەڵێك وشەی پڕو پوچ و نالێوەشاوەی بێڕێزی لە دەمی دەرچوون، قسەکانی ناوبراوم زۆر بەپەرۆشی زانی بیرم لەوە نەدەکردەوە بەو شێوەیە بێت!.

ئەگەرچی وەڵامەکەم بۆ ئەوگران بوو گوتم: (یاشێخ من لەبەر باوکت ڕام کردوە و ئاوارەم لەگەڵ ئەوەشدا بەڕاستی نازانم ئێوە بەو شێوەیە لۆمەی دەکەیو بەسوکی ناوی دەبەیت، وام پێ خۆش بوو لەجیاتی لۆمەی باوکت نووسینەك بڵاوبکەیتەوە لەڕۆژنامەو گۆڤارەکان کارێکی پەسند ترەو ناوی ئێوەی پێ بەرز دەبێتەوە).

ماوەیەکی تەواو لەگەڵی دوام داوای لێ کردم لەسەر لیستی ئەو بڕۆمە ئەنجومەنە کارتۆنیەکەی دەست کردی بەعس، بەڵام بەسوپاسەوە وەڵامم دایەوە کەوا (بابەکر ئاغا)و حزبی شیوعیش داوایان لێ کردوم، بەڵام لەتوانام دانەبوو بڕۆم.

ماوەیەك بەسەر ئەو بەیەك گەیشتنەی لەگەڵ (عبیداللە) تێپەڕ بوو، کاتێك زانیمەوە لەیەکێ لەوکەسانەی لای ئەوبوون لە دوای دەرکەوتنی من بەتەلەفۆن لەگەڵ یەکێك لە بەعسیەکان (شعلان) ناوێك دوابوو، پێی گوتبوو: (ئێوە ڕاتان

گەیاند کەوا زرار لەبەر بارزانی ڕای کردوە و وازیشی لەحزبی شیوعی هێناوە، من ناردم بەدوایو لەگەڵی دوام زۆر بەدرێژی، ئەوەی لێی تێگەیشتوم زرار لەبەر مەلامستەفا ڕای نەکردوە، بەڵکو هەر شیوعیەو پیاوی (مەلامستەفا)شە.

بێ شکە ئەو تەلەفۆنەی عبیداللە سوود بەخش بوو بۆ من لەبەر ئەوەی ئەوکاتە (مەلا مستەفا)و شیوعیەکان دژی یەکتربون بێگومان دوانەکەی (عبیداللە) نەگونجاو بوو. چاوم بەکۆمەڵێك لە کەسایەتی نیشتیمان پەروەرو سیاسەتمەدار کەوت، چەند جارێك ڕۆیشتمەلای (هەمزە عبداللە) دامەزرێنەری پارتی دەتوانم بلێم لەزۆر ڕووەوە لەگەڵی دەدوام بەتایبەتی لە بارەی مێژوی بەسەرهاتەکانی سەرهەڵدانی ڕێرەوی کوردایەتی، ئەوەی بۆم بەدیار کەوت ئەو پیاوە وشیارو دوور بینە بەهیچ جۆرێك نایەوێت زیان بەنەتەوەکەی بگات، هەوڵ دەدات دوور بیت لە دوو بەرەکیو نێوان ناخۆشی کۆمەڵگای کوردەواری، ئەوەی ڕاستی بێت سودێکی پڕ بایەخم لە دیدەنیو ڕاسپاردەکانی ئەو مامۆستایە زانایە بینیو ئامۆژگاریەکانی بوونە جێگای ڕەزامەندیم، هەروەها دەبێ ئەوەش بلێم ئامۆژگاریەکانی ووشیارکردنەوە بوون بۆ ژیانی داهاتووم.

خۆشبەختانە هەر لەماڵی ئەو مرۆڤە بەرێزە چاوم کەوت بەبەڕێز (عبدالرحمان قاسملۆ) سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەوێ یەکترمان ناسی، ناوە ناوەش لەگەڵ (کەریمی حسامی) بەیەك دەگەیشتین چەند جارێك دەهاتە ماڵمان، جارێکیان لەگەڵ (حمدامین سیراجی) هاتن شەوێکی شادمان بەسەربرد، بێگومان لە زۆر شت دواین، بەتایبەتی دەربارەی برایانی دیموکرات دواین کەوا کەوتونەتە ژێر فەرمانی بەعسیە فاشیەکانی دوژمن بەکورد وا بەچاوی خۆیان دەبینن ئەو فاشیستانە بەچ شێوەیەك کورد دەکوژنو دەبڕن، برایانی دیموکرات دەبێ لەو باوەڕەدا بن کە ئەو بەعسە کورد کوژە لەگەڵ ئەوە بێت کورد لەودیو ئازاد بێت! پێم وایە نا، کەوا بێت بۆ بەرژەوەندی خۆیتیان دەست بەئێوە ڕادەگرن نەك بۆ ئازادی کوردان!!

دیاربوو ئاوارەکانی دیوی ئێران گەڕانەوە، ئەوانەی بەبەر لێبوردن کەوتن، بەشێك بەڕێ کرانە خوارووی عێراق وەك لە سەرەوەش نیشاندراوە، کۆمەڵێك لە خزمەکانی ئێمەش ڕاپێچی خوارووی عێراق کرانو بەپێویستم زانی سەردانیان بکەم، بۆ سەردانیان ڕۆیشتمە زۆر شوێن، لە سەرەتاوە ئێران هەندێکی لە ئاوارەکان دایەوە

دەستی حکومەت (جلال بەگ) کوڕی میری (دەرگەڵە) لەگەڵ ئەوانەدا بوو،عێراقیش یەکسەر بەڕێی کردنە پارێزگای (دیوانیە) لە شوێنێکی چۆل بەناوی (دەغارە) داندران، چەند جارێك چووین بۆ سەردانیان بۆ ئەو شوێنە چۆلە، دوای ئەوانیش خەڵکێکی زۆر لە وانەی دەگەڕانەوە یەکسەر بەڕێ دەکرانە خواروو پەرت وبڵاوی سەرپارێزگاکان دەکران، چەند جارێك ڕۆیشتمە (ناسریە)و لەوێش بۆ ناحیەی (بەتحەو ڕەفاعیو ئیسلاح)و لە(دیوانیە)ش (شەنافیە) لە بەغداش (محمودیە)، لەئەنجامی هاتووچۆم بۆ ئەو شوێنانەی ناویان هاتووە زۆری نەمابوو توشی نەمان ببم! بێشکە ئەگەر (بابکرئاغا) نەبوایە کارەکە بەوە گەیشتبوو کە شوێن بزر بکرێم.

سەردەمێك لە بەغدا زۆر لە پیاوە ناسراوەکانی کورد هاتوچۆیان دەکردمو دەهاتنە لام، (وەزیرەکانو شێخ عوسمان بارزانیو عزیز محمد)و زۆرانی تریش، لە هاموشۆی ئەو مرۆڤانە حکومەت کەوتبوە شكو زۆر بەووردی چاودێری دەکردم، ئەویش لەوە بەدیارکەوت بەرێکەوت ئەفسەرێکی کوردی برادەرم میوان بوو، وا بەدیارکەوت ئەو ئەفسەرە دڵپاکە یەکێك بوو لەوانەی بەردەوام بەرێ دەکرایە دەرەوە بۆ هێنانی دەزگا پێویستیەکانی نهێنی سەربازی، ئەو ئەفسەرە وەك دۆستێکی دڵپاك بەنهێنی بەمنی گوت: (کاك زرار تۆم خۆش دەوێتو مرۆڤێکی پاکی پێم خۆش نیە توشی هیلاکەت ببی بۆیە داوات لێ دەکەم ئەگەر زۆر وورپای خۆت نەبی حکومەت خەریکە بەووردی چاودێریت دەکات بۆ ئەوەی بزانێ تۆچی، ئێستا وا دەزانن شیوعی بویو وازت هێناوە، بەلام سەریان لەوە سوڕماوەو تەواو شێواون بەهاتنی ئەو جۆرە کەسایەتیانە بۆ لای تۆ!! ئەوان ئەوە نازانن کە تۆ مرۆڤێکی ناسراوی لەبەر ئەوە دێنەلات، دوور نیە بۆئەوەی بزانن ئەوانەی کە دێنە لات باسی چی دەکەن دەزگایەکی تەکنیکی بەکاربهێنن لە ڕێگای تەلەفۆنو دەزگای تایبەت گوێتان لێ ڕابگرن، هەربۆ ئەوەی بەڵکو شتێکت لێبگرنو بیکەن بەبیانوو بۆ توش بوونت). ئەفسەری ڕەوشت بەرز پلەکەی (عقید) روکن بوو وەهەروەها ئەندازیارێکی بەتواناش بوو لە (هـ . ل . س) دا .

(جلال بەگ) لە (دەغارە) نەفی بوو چەند جارێك چوومە لای، دیارە ناوبراو دۆستایەتی لەگەڵ (مەلاعەولا) مەلاماتۆر، هەبوو نامەیەکی بۆ نوسی، بۆ (مەلا ماتۆر)م بردو دامە دەستی پیاوەکانی، لەدوای ماوەیەك (جلال بەگ) هاتە (بەغدا)

لەسەر داوای (مەلاماتۆر) وا ڕێك کەوت لەگەڵ (جلال بەگ) چووینە لای (مەلاماتۆر) لە کۆشکی (تەختیت) لەکاتی قسەکردن ناوبراو گوتی: (یا ڕەبی خودا تەمەنی مەلامستەفا ئەوەندەی تر درێژ بکات، من لە سایەی ئەوەوە وەزیرم ئەوەندەی ناوی هێنامو جنێوی پێدام بەعس وای زانی من شتێکم بۆیە مەلامستەفا ئەوەندە بەخراپە باسم دەکات!) پێم گوت: (دەزانی خەڵك چیتان پێ دەڵێن!) یەکسەر گوتی: (ئەرێ وەڵا دەزانم ئەوەی قسەی ناشیرینە پێمان دەڵێنو هەزارجار ژنو منداڵمان دەدەنە بەرو دەڵێن لە سەرشانی ئێمە وەزیرنو هیچمان بۆ ناکەن)، ئەوەی ئێمە دەیزانین ئەوان نازانن ئێمە چ جۆرە وەزیرێکین!!) لە زۆر شتی تریش دواین.

بێگومان ئەو کاتەی لە(بەغدا) بوم چاوم بەو برادەرە عەرەبانە دەکەوت کەلە (دەرگەڵە) بوون بەشێوەیەکی تایبەت پەیوەندیم بە(علی حسێن ڕەشید) ناسراو بە(ئەبو نوال) بەردەوام بوو، ناوبراو یەکێك بوو لە خزمەکانی (ئەحمەدحسن بەکر) ئەو پیاوە زۆر بەوەفا بوو، کاتی خۆیشی لە ڕیزەکانی شیوعیدا بوو لەلای ئێمە، پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو، زوو زوو سەری لێ دەدامو منیش ناوە ناوە دەچوومە لای، زۆر بەیەکەوە دادەنیشتینو باسی زۆر شتمان دەکرد بەشێوەیەکی گشتی باسی دەسەڵاتەکەی بەعسمان دەخستە بەرهەڵسەنگاندنو دوا ڕۆژی ئەوانمان بەسەرپەلۆ بردنو شکانیانو نەمانیان دەخستە ڕوو، لەبەر ئەوەی جوڵانەوەکەیان دڕندانە بوو.

دیدەنی کوڕی ئەحمەد حسن بەکر: بەڕێککەوت ئێوارەی ڕۆژی (١٩٧٨/٢/٩) لە ماڵی (ئەبو نەوال) بووم لەوکاتەدا (محمدی کوڕی ئەحمەد حەسەن بەکر) هاتە ماڵیان، (ئەبو نەوال) یەکێك بوو لەخزمەکانی (ئەحمەد حەسەن بەکر)و خەزوری (هەیسەم)ی کوڕی بوو، لە ساڵی(١٩٦٤) لە دەرگەڵە بوو پیاوێکی ڕۆشنبیرو بەتوانا بوو لەدوای گەڕانەوەی بۆ (بەغدا) لە وەزارەتی کشتوکاڵ کرابوە چاودێریکەری کشتوکاڵی، ئەوەبوو لە ساڵی(١٩٧٣) چوومە بەغدا لەوێ هاتە لامو زوو زوو بەیەك دەگەیشتینوا ڕێککەوت ئەو ئێوارەیە (محمد) پەیدا بوو(ئەبو نەوال) زوو گوتی: (ئەوەی لە دڵت دایە بیڵێو لێی مەترسێ ئەو کوڕە لە هەموویان پاکترەو قسەی لەگەڵ دەکرێت). ئەوەبوو لەگەڵی کەوتمە دوان دیاربوو گەنجێکی لێهاتوی پێ گەیشتوو بوو، زۆر بەووردی لەسەرکێشەی کورد دواین، توانیم کاروکرداری ئەمنو ئیستخباراتی ئەوانەی دەهاتنە سەرەوە دیاریکەم، پێم گوت: (گەلی کورد بریندار

بوو، پێویستی بەدکتۆر بوو، چارەی برینەکەی بکات، بەڵام برینەکەی زیاتر کولایەوە)، هەندێ ڕوداوم بۆ گێڕانەوە، باوەڕی نەدەکرد وابێت، بەڵام (ئەبو نەوال) ئەو ڕاستیەی بۆ دەسەلماندو گوتی: (ئەو کێشەیە زیاتر پەرە دەسێنێو پێتان چارەسەر ناکرێت) لە دواییدا گەیشتە قەناعەتو گوتی: (باشە بەڕەئی ئێوە چی بکەین باشە؟) ئەبو نەوال گوتی: (پێویستە پەیوەندی بەبارزانیەوە بکەنو لەگەڵی بدوێنو عەفوێکی گشتیش دەربکەن با ئەو ئاوارانە بگەڕێنەوە سەر ماڵی خۆیانو یارمەتیان بدرێت بەکردەوە نەك بەفرتو فێڵ با ببنە جێگای باوەڕ)، محمد گوتی: (ئەو قسانەی تۆو مامۆستا زرار منی خستە بیرکردنەوەیەکی وورد پێویستە بەوکارە هەڵبستینو چاریشی بکەین) لە دوای دوانێکی درێژخایەن بە(ئەبو نوال)ی گوت: (باشە کێ بنێرین بۆلای بارزانی؟) ئەبو نەوال پێی گوت: (عزەتی برای مامۆستا زرار لە مێژ نیە لە ئێران گەڕاوەتەوە یەکێکە لە باوەڕ پێکراوانی بارزانی لە ڕواندزە بنێرن بەدوایداو لەگەڵی بدوێنو بەڕێی بکەن بەو مەرجەی ئێوە بەڕاستی بۆ کارەکان بڕۆن). ئەو شەوە تا درەنگی شەو دانیشتین کاتێك ویستم بڕۆمەوە (ئەبو نەوال) بەشوفێری (محمد)ی گوت: (بڕۆ مامۆستا زرار بگەیەنەوە ماڵیان لەگەڕەکی مامۆستایان)، (محمد) گوتی: (خۆم دەیگەیەنمەوە با ماڵیشی پێ بزانم، بەتەنیا لەگەڵم هات، نەیهێشت پاسەوانەکانیشی لەگەڵ بێن، شەو درەنگ بوو ئۆتۆمبێلەکەش (بیجۆ) یەکی سادە بوو، ڕۆژی دووەم (ئەبو نەوال) تەلەفۆنی بۆ کردمو گوتی: (بەپەلە بنێرە بەدوای عزەت با بێتە بەغدا)، لە سەرداوای (ئەبو نەوال) ڕۆژی (١٤/٢/١٩٧٨) بۆ ئێوارە (عزەت) گەیشتە بەغدا، ئێوارەی ڕۆژی (١٥/٢/١٩٧٨) لەماڵی (ئەبو نەوال) منو (عزەتوصلاح)ی برامان بەبەشداری (ئەبو نەوال) لەگەڵ (محمد ئەحمد حسن بکر) دانیشتین، لەو دانیشتنەدا بڕیاردرا (عزەت) بەڕێ بکرێتە لای (بارزانی)با بۆ ئەو مەبەستە خەریکی خۆ ئامادەکردن بێت، کە ئامادەبوو بڕوات داوام لێ کرد وەك قاسیدێك بڕواتە لای (بارزانی)و ئەوەی پێی دەدرێت بەئەمانەتەوە بیگەیەنێتە (بارزانی)و لەوێش چ وەلامێك هەبوو بەهەمان شێوە بۆیان بێنێتەوە، زیاترنا.

بۆ ئامادە کردنی کاروباری سەفەر ڕۆیشتینە لای کارمەندانی حکومەت، یەکێك پرسی (کاك عزەت ئەو برایە کێیە لەگەڵت؟) عزەت گوتی: (ئەوە برا گەورەمە

لەگەڵ ئێمە نەهاتە ئێران باوەڕی بەشا نەبوو). کارمەندەکە گوتی: (ئەی بۆ ئێمە نەمان ناسیوە؟) منیش زوو وەڵامم دایەوەو گوتم: (بۆ ئێوە پیاوی باش دەناسن؟) ئەوە بوو (عزەت) بەرێ کرا بۆ ئەمریکا لەوێش چاوی کەوتبوو بە(بارزانی)و ئەوەی (بارزانی) گوتبوی بۆ (محمد)ی هێنایەوە، بڕیار بوو جاری دوەمیش بڕواتەوە ئەمریکا، بەڵام پێ ڕانەگەیشت (محمد) لێدراو لە ناو بردرا، بەلێدانی ئەو ئێمە کەوتینە ژێر مەترسی، چاوەڕوان دەکرا بانگ بکرێین، بەڵام باش بوو بەسەرماندا تێپەڕ بوو.

ئەوەی ڕاستی بێت (صدام) زۆر بەزانایی دارودەستەی (ئەحمد حسن بكر)ی وەلاناو خۆی بووە سوار چاکی ئەو گۆڕەپانەو بووە خاوەنی دەسەڵاتی عێراقو دەستی لەزۆر کەس وەشاندو بەزەبری ئاگرو ئاسن خۆی سەپاند.

لەدوای بەیەك گەیشتنمان لەگەڵ (محمد)ی کوڕی (ئەحمد حسن بەکر) بەعس بۆی بەدیارکەوت کە ئێمە لەکوردستان بنەماڵەیەکی خاوەن جەماوەرینو توانای ئەوەمان هەیە خزمەت بەنەتەوەکەمان بکەین، ئەوش بەوە بەدیارکەوت کە من گەڕامەوە هەولێر لە نوسراوێکی نهێنیدا (موخابەراتی شیمالی) دەڵێت: (ئاگادار بن زرار لەبەغدا گەڕایەوە هەولێر دڵی مەشکێنن نەوەك بڕواتە دەرەوە، چونکە ئەوانە خاوەن خەڵکێکی زۆرن ئەگەر بڕۆنە ڕیزی یاخی بوەکان زیان بەدەوڵەت دەگەیەنن).

کە گەڕامەوە یەکەجار لە قوتابخانەی ناوەندی (قوتەیبیە) داندرام بۆ ماوەی چەند مانگێك دوایی گواسترامەوە بۆ ناوەندی (چیمەن) لەگەڕەکی (سەیداوە). ئەوکاتە خەریکی دروست کردنی خانوو بوم لە گەڕەکی (مامۆستایان) خانوێکی گەورەم دروست کردو لە سەرەتای (١٩٨٠) چوومە ناوی.

هاتنی مقدم عزیز ئاکرەیی بۆ بەغدا: دەنگێکی وا بڵاوبوەوە کەوا (مقدم عزیز) لە کوردستان ڕای کردوەو هاتۆتە بەغدا، بەرێککەوت ڕۆژێك لە گۆڕەپانی (ئەندەلوس) لەگەڵ ناوبراو بەیەك گەیشتین، هەر زوو گوتی: (خاڵ وا منیش بووم بەئاوارە دڵت بەخۆت نەسوتێ) لە دوای ئەوەی ماوەیەك لەگەڵی دوام ناوبراو گوتی: (بەعس بەڵێنی پێداوم یارمەتیم بدات بۆ ڕێکخستنی پارتی لەسەر تەرزێکی تازە بابەت دوور لە بیرو ڕای ئاکە کەسی)، وەك پێیەوە دیار بوو هانیان دابوو بۆ ئەو مەبەستەوکەوتبوە جموجۆڵ بەو نیازەی پارتێکی نوێ ڕێك بخات لە سەر بناغەی

توێخوازی ڕاستەقینەیی کوردایەتی بەیارمەتی‌و پیشتیوانی ئەو بەعسەی نەخشە دانەری لە ناوبردنی کوردو ڕەش کردنەوەی مێژوی کورد بوو!!

کە بینیم خاڵ (عزیز) زۆر دڵخۆشە بەبەڵێنی بەعسیە خوێن مژەکانی کورد پێم گوت: (خاڵ عزیز پێم وایە بەعس بەوە خۆشحاڵ نابێت تۆ ئەو جۆرە پارتیە ڕێك بخەیت‌و سەربگرێت)، لە دوای ماوەیەك (خاڵ عزیز) داوای لە منیش کرد کاری لەگەڵ بکەم لەو حزبەبێ بناغەیە کارتۆنیە کە ناوی پارتیە، بێگومان لەو مرۆڤە نەدەترسام‌و جێی باوەڕ بوو زۆریش خۆشم دەویست لەبەر ئەوەی دڵپاك‌و کورد پەروەر بوو ئەوەندەی بڵێی ڕەوشت بەرزو بەدەسەڵات بوو لە ڕووی سەربازیەوە شارەزای بووم، نەمویست ڕاستەوخۆ دڵ ڕەنجاوی بکەم‌و پێی بڵێم خاڵ عزیز خۆت ماندوو مەکە ئەوەی تۆی بەخەیاڵی‌و دەتەوێ بەعس بۆت ناکات ئەگەر بۆشت بکەن کاتیەو بۆ ئەوەیانە گوێ بەدەستی ئەوان بیت‌و لە دژی کورد بەکارت بێنن، تەنیا ئەوەندەم پێ گوت: (بەنیازنیم حزبایەتی بکەم، بەڕای من ئێوەش لەو هەوڵەدا سەرکەوتو نابن، بەعس خاوەنی ئەونانسنامەیە نیە وەك ئێوە باوەڕیتان پێی هاتووە لەو باوەڕەدا مەبەئەوەی دەتەوێت ڕێگات بدەن بیکەیت).

ئەوەی بەدیار کەوت کەسێك بەناوی (ئەبو ثاری)، ئەو پیاوە کوێر بوو وەك کارگێڕ دیار بوو لەگەڵ (مقدم عزیز) کاری دەکرد، جارێك هاتەلام بەناوی (مقدم عزیز) دەدوا زۆر بەگەرمی هەوڵی دەدا من ڕازی بکات ئیشیان لەگەڵ بکەم، بۆم بەدیار کەوت ئەو پیاوە هەر وازم لێ ناهێنێت ناچار پێم گوت: (ئازیز نەم ویستوە ببم بەخولام ئەگەر بش بم بەخولام نابمە خولامی خولامان ڕاستەوخۆ دەبمە خولامی ئاغا، ئەو ئاغایە منیش دەناسیت‌و دەزانێت من خولامەتی ناکەم).

لەگەڵ قسەکانی من (ئەبو ثاری) زیاتری لەسەر نەڕۆیی‌و مات بوو، لەکاتی قسەکانم لەگەڵ (ئەبو ثاری) دکتۆر(ئیبراهیم عزیز) ڕواندزی لەوێ بوو لە دوای ڕۆیشتنی (ئەبو ثاری) دکتۆر ئیبراهیم گوتی: (مامۆستا زرار نەترسای لە پێش ئەو پیاوە ئەوها دوای؟ ئاگاداربەلەو جۆرە کەسانە خۆت دوور بگریت باشە) لەگەڵ ئاگادار کردنەوەی د. ئیبراهیم بیرم لەوە کردەوە ئەو پیاوە نێردرا بوو، بەڵکو شت بزانن ئاخۆ من چیم بۆ ناچمە ژێر باریان، ئیتر لەو دەمەوە نەمویست زیاتر بیبینم، ئەوەی بەدیار کەوت زۆری پێ نەچوو ئەو پارتەی خاڵ عزیز بەنیازی بوو و گەلێك

خۆی بۆ ماندوو کرد، کەدیتیان (عەزیز) خەریکە لە دەستی بەعس دەردەچێ وەلایان ناو (هاشمی) گوێ بەدەستیان لە شوێنی ئەو دانا کردیان بەبەر پرسی ئەو پارتە کارتۆنیەی کە بۆ ناو سوك کردنی پارتی دروست کرابوو و بەس !؟.

هەوڵێکی تری بەعسیەکان ئەوەبوو لەرێگای برادەرێکی زۆر خۆشەویستم (تەحسین تاهیر ئامێدی)، ناوبراو مامۆستا بوو گەلێك جار دوو بەدوو دەرۆیشتینە گازینۆیەکانی سەر قەنات دەستمان دەکرد بەباسی باروو دۆخی کوردستانە شێواوەکەمانو رەوشتە ناپاکەکەی بەعسو زۆر شتمان دەخستە بەرباسو لێکۆڵینەوە، لەپڕێکا رۆژێك مامۆستا تەحسین گوتی: (کاك زرار راسپاردەیەکی زاوای مامم ماهیر تکریتیم پێیە) ناوبراو یەکێکە لە خزمەکانی (صدام)و دووسێ جار داوای کردوە لەگەڵ منو تۆ دابنیشێ پێم گوت: (تەحسین دەزانم کە داوامان لێ دەکەن ئیشیان لەگەڵ بکەین، من ئامادە نیم دەست بخەمە ناو دەستی ئەوان کە بەخوێنی رۆڵەکانی نەتەوەکەم سوورەو دوژمنی هەرە ترسناکی ئێمەن، ئەگەرچی دوریشم لە خزمەتی گەلەکەم، بەڵام ناپاکیشی لەگەڵ ناکەم، دەبێ ئەوەش بزانی ئەگەر گوڵیش نەبم ناشبمە درك، هیچی تێدانیە ئەگەر لەگەڵیشی دابنیشین، بەڵام باش بزانە نارۆمە ژێر باریان، دەبینی بزانە چی دەڵێت؟).

پاش ئەو داوایە کە بەرێز مامۆستا (تەحسین) پێشنیاری کرد رۆژێك رۆیشتینە لای (ماهیر) دیار بوو ناوبراو مرۆڤێکی زیرەكو کادیرێکی بەعسی بەتوانا بوو، بەرێزەوە پێشوازی لێ کردین، لە قسەکانی بەمنی گوت: (مامۆستا زرار دەربارەی تۆ هەندێ زانیاریم لایە لەبەر ئەوە ئارەزوو داوام ئەوەیە کە ئێوەی رۆشنبیر لەگەڵ ئێمە هاوکار بن بۆ ئەوەی کاری باشو بەدەسەلاتتان بدەینێ، ئەگەر رەزامەندیت لەسەر بێت تۆمان دیارکردووە کە بکرێیت بەقائمقامی رواندزو مامۆستا تەحسین بکرێتە قائمقامی ئامێدی). لەوەلامدا پێم گوت: (مامۆستا ماهیر زۆر سوپاستان دەکەم بۆ ئەو هەستەی هەتانە بەرامبەر ئێمە، لەوانەیە ئاگادار بیت وەزیری ناوەخۆش ئەو داوایەی لێکردوم، بەڵام رازی نەبوم لەبەر ئەوەی دەبێ ئەوەی دەکرێتە قائمقام بەعسی بێت، منیش کەلە حزبی شیوعی دوور کەوتومەتەوە، بەڵێنم داوە حزبایەتی نەکەم) ماهیر پیاوێکی تێگەیشتوو بوو زیاتر لەسەری نەرۆیشت.

لەگەڕانەوەمان لەڕێگا بەتەحسینم گوت: (مامۆستای بەڕێز ئەوانە لە خۆشەویستی ئەو داوایە لەئێمە ناکەن، بەڵکو زیاتر بۆ ئەوەیانە ناومان بەدو ناشیرین بکەن، تۆ باوەڕ دەکەی ئەوانە رێککەوتننامەی ١١ی ئادار جێبەجێ بکەن؟ من دەڵێم نەخێر، واهەست دەکەم بەعس ئەو رێککەوتننامەیە پشت گوێ دەخاتو شەڕیش دەست پێ دەکاتەوە)، ئەوەبوو زۆری بەسەر نەچوو شالاوی ڕاگەیاندنی هەردولا دەستی پێکردەوە.

وەك باسکراوە کاك (ئیدریس) هاتە بەغدا خەڵك زۆریان پێ خۆش بوو بەو ئومێدەی لە شەڕ دوور بکەونەوە، بەڵام لە دوای گەڕانەی کاك (ئیدریس) زۆری نەخایاند دەست کرایەوە بەپڕوپاگەندەی ناڕێك، پارتی لە دژی حکومەتی بەعسو بەعسیش لە دژی پارتی، هەردوکیان یەك لەوەی تر توندتر دادەبەزین، ئەوەبوو لەو توندو تیژەیەی هەردولا کار بەوە گەیشت کە شەڕ دەست پێ بکاتەوە، لە دوای چوار ساڵ شەڕ وەستانو بەرزکردنەوەی ناونیشانی ڕێکەوتن نامەی (١١ی ئادار) بەو شێوەیە ئەو ڕێك کەوتنە پێشێل کراو ئاشکرابوو بەعس تەنیا بۆ پڕوپاگەندە ناوی (١١ی ئادار)ی بەکاردەهێنا لە بنەڕەتدا لەگەڵی نەبووە.

کاتێك شەڕ دەست پێ کرایەوە بە(خالد سامەرائی)م گوت: (مامۆستا چیم پێ گوتی ئەوە شەڕ دەستی پێکردەوە، من پێم نەگوتی شەڕ دەبێتەوە، چونکە شەڕ بەدەستی ئەوان نیە؟).

لە ئەنجامی شەڕێکی دژوار لە نێوان حکومەتو پێشمەرگەکانی (بارزانی) لە ناوەڕاستی مانگی (٤/١٩٧٥) سوپای هێرش بەری بەعسی نیاز پیس بەرەو سەرو ڕۆیشت بەشێوەیەکی تایبەتی ڕووی لە ناوچەی (باڵەکایەتی) کرد، بەڕاستی زۆر ئالۆز بووم بیرم، لەوە دەکردەوە چۆن بتوانم برۆم بۆ ئەوەی بزانم کەس وکارم چیان بەسەر هاتوە، بۆ ئەو مەبەستە چوومە لای (بابکر ئاغا)و داوام لێکرد بەڵکو مۆڵەتێکم بۆ وەربگرێت بۆ ئەوەی بچمە (ڕواندزو دەرگەڵە)، ئەوەی جێگای ڕەزامەندیم بوو ناوبراو جگە لەوەرگرتنی مۆڵەت کورتە نامەیەکیشی دامێ بۆ سەرۆکی سوپای هێرش بەر(کریم حمدانی)، ڕۆژی (٢٠/٤/١٩٧٥) چومە هەولێر بەرێکەوت لە دوکانی (حاجی کریم قاسم) چاوم بە(ئەبو حکمت) کەوت، ناوبراو داوای لێکردم سەر بدەم لە بارەگاکەیان، بەڵام هەرئەوکاتە لەگەڵ (صادق هەریری)

ڕۆیشتینە (هەریر) ڕۆژی (٢١/٤/١٩٧٥) بەرەو (ڕواندز) ڕۆیشتین لەوێ چاوم بە(کانەبی) بەرپرسی پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی کەوت، ماوەیەکی زۆر لەگەڵی دوام کۆمەڵێك کەم وکوڕیمان خستنە بەر باس و لێکۆڵینەوە، بەناوبراوم گوت: (بەعس هەر ئەوەندەی کار بەئێوەیە تا کۆتایی بەشەڕ دێنێ زیاتر نا، ئەوەی بەلامەوە زۆر سەیرە لە هەولێر ئەبو حکمەتم دیت لە دوکانی حاجی کریم قاسم بەمنی گوت ئەگەر چویتە ڕواندز برۆ لای ئەبو مەیسون بەرپرسی بەعسی لە ڕواندز با بتناسێت! من کارم بەئەبو مەیسون چیە بیناسم یان نەیناسم! ئەوەی هەست دەکەم بونەتە گوێ بەدەستی بەعس ئەگەرچی لەگەڵیشتان نەماوم، بەڵام بۆتان بەپەرۆشم کە ئەوهاتان دەبینم)، لەو سەردانەمدا ماوەیەك لەوێ مامەوە زۆر شتمان بینی، ئەگەرچی خەڵکیش زۆرکەم مابوون لەگەڵ ئەوەشدا دڕندەکانی ئەمن‌و ئیستخبارات دەڕۆیشتنە بەر دەرگایەکان‌و جیا لە جنێوو خۆ تورە کردن ووشەی ناڕێك‌و نالەباریان پێ دەگوتن بۆ نمونە پێیان دەگوتن: (کاکی جوانی هەیە) بەمانای ئافرەتی جوانتان هەیە!! زۆربەی خەڵك لە کارو کردەوەکانی پیاوە دڕندەکانی ئەمن‌و ئیستخبارات ناڕازی بوون، بەتەواوی هەست بەپەستی‌و بێزاری دەکرا، لە گەڕانەوەم بۆ بەغدا لە هەولێر ئەو هەڵوێستە چەوت‌و ناڕێکانەی پیاوانی ئەمنم بۆ (بابکرئاغا) باس کردو پێم گوت: (ئەو ڕەوشتەی ئەمن‌و پۆلیسەکانی حکومەت زۆر ترسناکەو ئەو خەڵکە بەناچاری دەست دەکاتەوە چەك زۆر لەپێشان دژوارتر بەگژ بەعس‌و کادیرەکانیدا دەچن، زۆر بەباشی هەست دەکرێت ئەمن‌و ئیستخبارتەکانتان ڕێگا خۆشکەرن بۆ دەست دانەوەی چەك‌و شەڕێکی نوێ).

لەڕاستیدا ئەوەی من گوتم بەکردەوە بەدیار کەوت لە سەرەتای (١٩٧٦) لە زۆر شوێن دەست لە پیاوانی حکومەت وەشێندراو زۆریان کوشتن، ئەو چالاکیانە پەرەی سەندو بەعس کەوتە مەترسی، ئەوەی دیار بوو بەعس بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی بارودۆخە مەترسیدارەکە کەوتە بیر کردنەوەی ڕێکخستنی جاشەکان گوایا لە شێوازێکی نوێ‌و بەناوی(فەوجە خەفیفە)، پێش ڕێکخستنی جاشە تازەکان ڕۆژێك (ئەبو نەوال) منی بینی‌و پێی گوتم: (عبدالفتاح حمدامین ئێستا بەرپرسی کاروبارەکانی شیمالە کارەکان لەکوردستان بەو سپێردراوە، ناوبراو دەیەوێ تۆ ببینێ‌و لەگەڵت بدوێ، جا ئەگەر ناردی بەدواتدا برۆ بۆ لای‌و بێ ترس لەگەڵی

بدویّو ئەوەی بەدلّت نەبوو ڕازی مەبە، ئەو پیاوە خزمە باسی تۆم بۆ کردووە)، ئەوەبوو ئێوارەیەك ئەبو عەگالێك کە مرۆڤێکی چوار شانەی بەهەیبەتو هووت لەبەردەرگا پرسی: (ئێرە مالّی مامۆستا زرار سلێمان بەگە؟)گوتم (بەلّێ فەرموو)، ناوبراو گوتی: (من ڕاسپێردراوی عبدالفتاح حمدامینم هاتوم بەدوای مامۆستادا بچین بۆلای ئەو) هەر ئەوکاتە خۆم ئامادەکردو لەگەلّی ڕۆیشتم دیار بوو شوفێری لەگەلّ بوو بەسەر (قەنات)دا ماوەیەکی ڕۆیشتین کەوتمە بیر کردنەوە ئاخۆ بۆ کوێم دەبەن؟ ئەوەندە دوور بردنە خۆرایی نیە، لە دواییدا گەیشتینە (سەدری قەنات) لەوێ ڕۆیشتینە شوێنێك دیار بوو بەزمو هەلاّ بوو دەستە ئافرەتێکی ئەورووپی سەمایان دەکردو کەس بەکەس نەبوو، لەگەلّ ئەبو عەگال لە شوێنێك دانیشتین زۆری پێ نەچوو(عبدالفتاح) هات بەخێر هاتنی لێکردمو گوتی: (فەرموو دانیشە من میوانم هاتوە لە جیاتی من ئەو برادەرە هەندێ شت هەیە پێت دەلّێ لە دوایشدا خۆم دەنێرم بەدواتدا) ئەو بەخۆی ڕۆیشت ئەبو عەگال بانگی بۆیەی کردو پێی گوت (بزانە مامۆستا چی دەخواتەوە، وێسکی بۆ بێنە) منیش گوتم: (هیچ ناخۆم ساردیەکم بۆ بێنە زیاتر نا)، زۆر هەولّیدا ڕازی نەبوم جگە لە ساردی هیچیتر بخۆمەوە، لە دواییدا کابرا بینی بەو شێوە دەرنەچوم کە ئەوان بیریان لێکردبۆوەو لەگەلّیان بڕۆم، کابرا گوتی: (ناوی چەند کەسێکی کورد لەو لیستە نوسراونو ناوی تۆشی تێدایە کە لە هەولێر ئامادە بن بۆ ڕێکخستنی فەوجە خەفیفەکان ئەو فەوجانەی لە کوردە چەکدراەکان دروست دەکرێ، یەکێك لەو فەوجانە بەناوی تۆیە لەبەر ئەوە حەز دەکەین ڕۆژی دیاریکراو لە هەولێر ئامادە بیت)، لەولاّمدا پێم گوت: (دەبێ ببورن ئەوەی ئێوە مەرامتانە لە توانای مندا نیە لەبەر ئەوەی جەماوەرەکەی ئێمە زۆری پەرتو بلاّونو زۆریشیان لە دیوی ئێرانن و نەگەڕاونەتەوە، منیش مامۆستام کارو پیشەی من وانە ووتنەوەیە بەلای منەوە وانە ووتنەوە گرنگترە لە چەك هەلّگرتن). ئەبو عەگال کە ناودەبرا بە(ئەبو علی) کە لە من گەیشتو زانی لەگەلّیان ناڕۆم بۆ ئەو ملکەچیە بانگی شوفێری کردو پێی گوت: (مامۆستا بگەیەنەوە مالّێ) ئەوەی جێگای دلّخۆشیم بوو نەیان ناردەوە بەدوامدا.

ئەوەی لەیاد ناکرێت ئەوەیە لەوکاتەی شیوعیەکان لە سەرەوە دەرکران کۆمەلّێك لەشیوعیەکانی (دەرگەلّە) هاتبونە هەولێر لەژێر ناوی (ئەنسار) چەکیان بەشانەوە

بوو، لەوکاتەی پارتی لەدەشتی (هەولێر) کشانەوە بەرزابییەکان،هێزەکانی حکومەت چونە جێگای ئەوان وەك دیار بوو (ئەنسار)ە کانی شیوعیش ناردرابونە(بێستانە) لەوکاتانەدا بوو لەهەولێر ئیشم هەبوو لەگەڵ (مستەفا بەرسیرینی) چووم سەردانی خزمەکان بکەم، ئەوکات دیار بوو پیاوەکانیان لە بێستانە بوون، کاتێك چاوم پێیان کەوت ماڵو منداڵیان لە ژیانێکدا دەژیان کە هەرباسی ناکرێت، کە چوومە ماڵی (علی ئیبراهیم بەگ) ئەوەی زۆر دڵتەنگی کردم دیتم چوون لە ماڵی جیران ئاوی ساردیان بۆمن هێنا، هەربەو شێوەیەش چاوم بەمنداڵەکانی (قادری حمد ئاغا) کەوت زۆر بەنارێکی کەوتنە بەرچاوم، زۆریان بۆ بەپەرۆش بووم، ئەگەر بڵێم لە دەرگەڵە ماڵەکانی(علیو قادر) لەبنکەی حزبی شیوعی زیاتر یارمەتی دەری شیوعیەکان بوون بەهەڵەدا نەچوومە، ئەوەی زۆر پەستی کردم لەناو شار چاوم بە(عبدالله قۆریتانی) کەوت، ناوبراو زاوای دەرگەڵەییەکان بوو، ئەو پیاوە شیوعیەکی ناسراو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەسوکی گوتی: (بریا ئەو دەرگەڵەییانە هەرنەهاتبان بۆ هەولێر ئەوانە فێری شیوعیەت نەکراونو بەرەڵان).

زۆری لێ پەست بووم پێم گوت: (بەڵێ فێری ماستاو لێك دان نەبووین، فێری مل کەچی نەبووین، بەڵکو فێری ڕاستی بووین، پێم خۆش بوو یەکێکی وەك کانەبی لەم ڕووەوە بدوابایە نەك مام عولاَ لۆمەی دەرگەڵەییەکان بکات) دیار بوو تەنگاو بوو گوتی: (بۆ من چیم؟).

لەدوای گەڕانەوەم بۆ بەغدا نامەیەکی (قادری فقێ وەسمان)و برایەکەی(حمد)م پێگەیشت نوسی بویان: (کاکەگیان ئەوەی تۆ بەئێمەت دەگوتو ئێمەت پێ پەروەردە دەکرد ئەوەنییە کە ئێمەی تێ کەوتوین بەداخەوە).

بەرێککەوت ڕۆژێك میوانی بەرێز (هاوڕێ عزیز محمد) بووین لەگەڵ منداڵەکانم بەووردی ئەو شتانەم بۆ باس کردن، دیار بوو لەدوای ئەو ڕاگەیاندنەی من (جەلال دەباغ) نێردرابوە هەولێر لەو ڕووەوە دوا بوو و لێکۆڵینەوە کرابوو.

# سوپاس و پێزانین

بەدڵێکی پــڕ لە سۆزەوە سوپاسی هاوڕێی ئازیز و تێکۆشەر، نووسەرو ئەدیبی بەتوانا مامۆستا (جەلال دەباغ) دەکەم ، کە ئەرکی بەسەردا چوونەوەو سەرپەرشتی چاپکردنی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆی خۆی، کە توانی تواناو شارەزایی خۆی بەکار بهێنی بۆ زیاتر جوان کردنی ئەم پەرتووکە لەڕووی زمانەوانی و ئەدەبیەوە، کە شوێن پەنجەی بەسەر ئەم پەرتووکەوە دیارە، دووبارە لە دڵەوە سوپاسی دەکەم.

لەگەڵ ڕێزمدا..

زرار سلێمان دەرگەڵەیی

٢٠٠٣/١٠/٥



میرحمدامین دەرگەلەیی
هاوینی ١٩٥٩، دەرگەلە
لەتەمەنی ١٢٠ ساڵی دا.



شێخ مەلاصادق ماویلی



سمایل بەگ ڕواندزی ( ١٨٩٧- ١٩٣٣ )
ئەندامی ( مجلس النواب )ی عێراق و سەرۆکی
نوێنەرانی کوردستانی لە ئەنجومەن.



وریا امین ئەفەندی ١٩٥٢




حمدامین فقیٚ حەسەن،
زرار سلیٚمان بەگ،
رحمان گۆپتە پەیی.
١٩٥٢ فریٚڤسکی



اسماعیل شیٚخە حاجی ماویلی
ئەو کەسەی یارمەتی دام لە بردنی
چەکەکان.



شەهید عزەت عبدالعزیز



شەهید خیرالله عبدالکریم



دانیشتوو: شێخ احمد بارزانی
ڕاوەستاو: مەلامستەفا بارزانی



شێخ سلێمان بارزانی



زرار سلێمان بەگ
بەردەم کۆشکی کرێملین
ساڵی ١٩٥٨



حەمید خسروی زرار سلێمان بەگ ، کچەکوردێکی سۆڤیەتی، مەمۆشوان ئاغا شانەدەری



تاشکەند ١٩٥٤

ریزی یەکەم لە چەپ بۆ راست: سلێمان حەکیم، عەلی خەلیل، حوسێن فەقێ ئەحمەد.

ریزی دووەم لە چەپ بۆ راست: زرار سلێمان بەگ، بێجان جندی، مەمۆ شوان.

ریزی سێیەم لە چەپ بۆ راست: ویسی عەلی، سەعید عبدالوهاب، حمید خوسرەوی.

ریزی چوارەم لە چەپ بۆ راست: عبدالرحمان حەبیب، سیامەند عەزیز.



وەفدی ئاشتی خوازان بۆ مۆسکۆ کۆتایی ساڵی ١٩٥٨

لەراستەوە کەسی پێنجەم مەهدی حەمید

لە راستەوە کەسی حەفتەم شاعیری مەزنی کورد مامۆستا گۆران

لەراستەوە کەسی هەشتەم شێخ لەتیف حەفید

لەراستەوە کەسی دەیەم مەلا جمیل ڕۆژبەیانی



مەلکۆ زێرو، مەمۆ شوان ئاغا ١٩٥٥.



زرار سلێمان بەگ
تاشکەند ١٩٥٨



راوەستاو لە چەپ بۆ راست: میرحاج ئەحمەد، ئەنوەر دڵسۆز، عزەت عبدالعزیز، بارزانی، قەدری جان

دانیشتو لە چەپ بۆ راست: حەسۆ یوسف، وەهاب ئاغای جندیان.



لە لای چەپ بۆ راست: عەلی گەلاوێژ، رەحیم قازی، عبداللە رەزم ئۆمر، قادری مەحمود زادە، رەعنا مەحمود زادە (خێزانی قادر)، هەژار، حەمید محەممەد زادە (نوسەری ئازەر بایجانی) ۱۹۵۹.



دانیشتو حمدئاغای مێرگەسوری
راوەستاو لە لای چەپ بۆ راست:
عزەت سلێمان بەگ، خزمێکی
حمدئاغا، زرار سلێمان بەگ.
رواندز ۱۹٦۰



لە چەپ بۆ راست: زرار سلێمان بەگ، فاخر حمد ئاغا، عزیز سید ئاغا، شۆفێری
فاخر ئاغا سالّی ۱۹٥۹ حافیز.



راوەستاو لە راست بۆ چەپ: مامۆستا جەبار، حەسەن حاجی تاهیر، شێرزاد سلێمان بەگ.
دانیشتوو لە راست بۆ چەپ: کاکە سور( منداڵ )، ئەنوەر مصطفی ئەفەندی، کاکە ڕەش ( منداڵ )، عزەت سلێمان بەگ، زرار سلێمان بەگ. ساڵی ١٩٦١



لە راست بۆ چەپ: عەلی، حەسەن حاجی دەرگەلەیی، فاخر حمد ئاغا، سلێمان بەگ دەرگەلەیی کرمانج عزەت سلێمان بەگ، پ.م، عزەت سلێمان بەگ.



لە چەپ بۆ راست: مامەند مەسیح، سلێمان بەگ، ئەوانی تر نەناسراون ١٩٦٢ جندیان



زرار سلێمان بەگ دوای داستانی هەندرێن ساڵی ١٩٦٦.



راوەستاو لەڕاست: زرار سلێمان بەگ، حوسێن، هاشم ئاکرەیی، تەها بامەرنی، فاخر حمد ئاغا، حمد امین غەفور.
دانیشتوو لەڕاست: پیاوێکی عەباس ئاغا، وەستا ئەحمەد خەلکانی، شەهید یونس (لە هەندرێن شەهید بوو)، ئەوانی تر پیاوەکانی عەباس ئاغا.
رانیە ١٩٦٤



تەقاندنەوەی پردی هیزۆپ ١٩٦٤.



خۆ بەختکەرانی داستانی هەندرێن.



ئاهەنگی حیزبی شیوعی عێراق ـ نەورۆزی ١٩٧٠ ـ بەرزێوە



زرار سلێمان بەگ،
جەلال دەباغ
١٩٧١ دەرگەڵە



لە راست بۆ چەپ:
کەریم خان مەحمود خەلیفە برادۆستی،
بابکر ئاغا پشدەری.
ساڵی ١٩٧٧

УзССР

МИНИСТЕРСТВО ПРОСВЕЩЕНИЯ

# СВИДЕТЕЛЬСТВО

НАСТОЯЩЕЕ СВИДЕТЕЛЬСТВО ВЫДАНО
Зерар Сулейман
(фамилия, имя, отчество)
Бакирханович РОДИВШЕ 1926 В 1926 ГОДУ,
В ТОМ, ЧТО ОН ОБУЧАЛ В 1950 году
ШКОЛЕ № 9 им. Правды
ОКОНЧИЛ ПОЛНЫЙ КУРС СЕМИ КЛАССОВ ЭТОЙ ШКОЛЫ И ОБНАРУЖИЛ ПРИ ОТЛИЧНОМ ПОВЕДЕНИИ СЛЕДУЮЩИЕ ЗНАНИЯ:

| | | |
|---|---|---|
| ПО РОДНОМУ ЯЗЫКУ И ЛИТЕРАТУРНОМУ ЧТЕНИЮ | 5 | (пять) |
| ПО РУССКОМУ ЯЗЫКУ | 5 | (пять) |
| ПО АРИФМЕТИКЕ | 5 | (пять) |
| ПО АЛГЕБРЕ | 5 | (пять) |
| ПО ГЕОМЕТРИИ | 5 | (пять) |
| ПО ЕСТЕСТВОЗНАНИЮ | 5 | (пять) |
| ПО ИСТОРИИ | 5 | (пять) |
| ПО КОНСТИТУЦИИ СССР | 5 | (пять) |
| ПО ГЕОГРАФИИ | 5 | (пять) |
| ПО ФИЗИКЕ | 5 | (пять) |
| ПО ХИМИИ | 5 | (пять) |
| ПО ИНОСТРАННОМУ ЯЗЫКУ | 5 | (пять) |



Директор школы
Учителя:
М. П.
VII 1950 года.

بروانامەی دەرچوونی ناوەندی بە پلەی نایاب( ممتاز)



Ўзбекистон ССР
МАОРИФ МИНИСТРЛИГИ

Узбекская ССР
МИНИСТЕРСТВО ПРОСВЕЩЕНИЯ

МАҚТОВ ЁРЛИҒИ
ПОХВАЛЬНАЯ ГРАМОТА

Сыр-Дарьинский района
даги 9 мактабнинг
VII синф ўқувчиси Зерар
Сулейман Бакирханович га

VII · 195 0 й.

Выдана учени VII класса
школы № 9 им. „Правды" по Сыр-
Дарьинскому району
Ташкентской области
Зерар Сулейман Бакирханович

Мактаб директори (мудири)
Директор (зав.) школы

بــــرِوانــــامــەی ڕێــز لێنان

بسم الله الرحمن الرحيم

الجمهورية العراقية
وزارة التربية والتعليم
مديرية الشؤون الفنية العامة
مديرية الشهادات / التعادل



العدد ٩٩٢٠
التاريخ ٢٥/٨/١٩٧٠

الى / مديرية التربية والتعليم / لمحافظة اربيل
م/ معادلة شهادة

بناءً على الطلب المقدم الينا من السيد زرار سليمان بكرخان بتاريخ ٢٢/٨/١٩٧٠ الحاصل على شهادة الدبلوم بالتاريخ من كلية التاريخ في طاشقند في الاتحاد السوفيتي عام ١٩٦٤ علما بان معادلتها ان الشهادة الحاصل عليها هي شهادة اولية جامعية استنادا الى قرار مجلس التربية والتعليم بالجلسة المرقمة (٢) المنعقدة بتاريخ ٢١/٦/١٩٧٠ للتفضل بالعلم .

عبد المجيد النعيمي
م/ مدير الشؤون الفنية العام

نسخة منه الى /
محافظة اربيل
مديرية الشؤون الفنية العامة
سكرتير مجلس التربية والتعليم / كتابكم المرقم ٢٠٤١ في ٢٣/٦/١٩٧٠
مديرية الشهادات / التعادل
سكرتير لجنة معادلة الشهادات / السيد كاظم الجبيلي
السيد زرار سليمان بكرخان / محافظة اربيل

**بڕوانامەی بەرابەرکراو ( تعادل )**




زرار سلێمان بەگ ، جەلال دەباغ

# ناوەڕۆك



## نوسەر لەچەند دێڕێك دا

☆ لەساڵی ١٩٢٧ لە گوندی ماویلیان سەر بەقەزای ڕواندز لەدایك بووە، لە بەهاری ساڵی١٩٤٣ بووە بەسەرباز لە سوپای عێراق، لەساڵی ١٩٤٤ دادگای عورفی کەرکوك حوکمی دوو ساڵ زیندانی بەسەردا سەپاندوە، لەدوای دەرچوونی لە مانگی ١٩٤٦/٤ لەڕیزی سوپای عێراق ڕای کردوە، لەزارگەلی عەلی بەگ کۆمەڵێك چەکی بردون و چۆتە ڕیزی سوپای میللی کوردستان لە مەهاباد.

☆ دوای تێکچونی کۆماری کوردستان لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٦دا لەگەڵ پێشمەرگەکانی کۆماری کوردستان ڕووبەڕووی سوپای هێرش هێنەر وەستاوەو هەتا ١٩٤٧/٤/١٧ لەوێوە لەگەڵ بارزانی مستەفا بەرەو سۆڤیەت ڕۆیشتوە زیاتر لەدوازدە ساڵ لەسۆڤیات بووە، دەرچووی زانکۆی ئاسیای ناوەڕاستە، پسپۆڕە لەزانستە کۆمەڵایەتییەکان.

☆ لەساڵی ١٩٥٩ گەڕاوەتەوە نیشتمان لەڕواندز بۆتە مامۆستا، لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لەکاردەرکراوە وەك پێشمەرگە لەزۆربەی شەڕەکانی بەرگری لەخاك و نیشتمانەکەی بەشداری کردوە بەتایبەتی لەشەڕەکانی سپیلك ساڵی ١٩٦٣ کوڕەك ١٩٦٥ هەندرێن ١٩٦٦.

☆ لە دوای ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازای ١٩٧٠ گەڕاوەتەوە سەرکار لەهەردوو کۆنگرەی هەولێرو بەغدای یەکێتی مامۆستایانی کوردستانی بەشداری کردوە.

☆ لە ساڵی ١٩٧٣ لە کاتێکدا حزبی شیوعی لەگەڵ بەعسیەکان ڕێك کەوتون چۆتە بەغدا، بەڵام لەو دەمەوە پەیوەندی بەحزبی شیوعییەوە نەماوە .

☆ لە ساڵی ١٩٧٩ گەڕاوەتەوە هەولێر خۆی نەداوەتە دەست بەردەوام پەیوەندی بەکوردە نیشتمان پەروەرەکان هەبووە، لەڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١ بەشدارییەکی کاریگەری هەبووە لەتەك پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی لەڕزگارکردنی هەولێرو کەرکوك.

ماوەیەك ئەندامی بەرەی کوردستانی بووە لەسۆران وەکو نوێنەری حزبی شیوعی، لەڕێکوپێکی کارەکانی بەرە دەورێکی باشی هەبووە.

☆ لە ساڵی ١٩٩٣ لە کۆنگرەی یەکەمی پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی و دواییش بووە بەئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی کار هەتا هەڵوەشانەوی ئەو پارتە.

☆ لە زۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی کوردستان و عێراق وتارو لێکۆڵینەوەی مێژوویی و سیاسی بڵاوکردۆتەوە.

☆ نامیلکەیەکی بەناوی بنەماڵەی میرانی دەرگەلە بڵاو کردۆتەوە، چەندین دەستنوسی تریش تاکو ئێستا بەچاپ نەگەییون.